(کتێبی)

# ڕیسالەی قوشەیری

(لەزانستی تەصەوفدا)


نووسینی

ئیمام عبدالکریم قوشەیری

وەرگێڕانی

مامۆستا عبدالکریم فتاح



چاپی یەکەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز

**ناوی کتێب**:. کتێبی (ریسالەی قوشەیری).

**نووسینی**: ئیمام عبدالکریم قوشەیری

**وەرگێڕانی**: مامۆستا عبدالکریم فتاح.

**نەخشەسازی ناوەوە**: احمد خالد

**تایپ**: نووسەر.

**نۆرەو ساڵی چاپ**: یەکەم ٢٠١٦ زایینی.

**تیراژ**: (١٠٠٠) دانە.

**نرخ**: ( ١٥٠٠٠ ) دینار

**چاپخانە** :

**بەسەرپەرشتی**: **نەهرۆ محمود**

**ژمـــارەی ســـپاردن**: ( )ی ســـاڵی ٢٠١٦ لەبەڕێوەبەرایـــەتی گشـــتی کتێبخانـــە گشـــتیەکانی دراوەتێ.

**مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە**

نووری حەقیقەت

١٢

نووری حەقیقەت

Nuri.haqeeqat@gmail.com

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾

**العنكبوت: ٦٩**

# پێشەکی وەرگێڕ

حەمد و سەنای خودا دەکەم لە وەرگێڕانی ئەم ریسالەی ئیمامی قوشەیری سەرکەوتووی کردم و کۆمەکی و یارمەتی خۆی پێبەخشیم..

گومانی تێدا نییە ئەم ریسالەیە لە کۆن و نوێدا سەرچاوەیەکی بەپێز بووە بۆ پەروەردەی دڵ و دەروون و راستکردنەوەی ئەخلاق و دامەزرانی ئیمان و گەشی و گەرمی لە بەندایەتی بۆ خودا..

راستە ئیمامی قوشەیری یەکێك بووە لە سۆفییەکانی سەردەمی خۆی، بەڵام نابێت ئەوەش بە نادیدە تەماشا بکەین ئەو کەسێکی زانا و عاریف بووە و ئەم کتێبەی بۆ راستکردنەوەی ئەو لادانە داناوە کە سۆفییەکانی جیهانی ئیسلامی تێیکەوتوون، بۆیە لەم ریسالەدا هەوڵیداوە تەصەوفێکی ریشەداری سونیانە کۆبکاتەوە و بیخاتە بەردەم سۆفییەکانی ئەو سەردەمە و سەردەمانی دواتریش..

راستە ئەم کتێبە بە نەفەسێکی سۆفیگەری نووسراوە و هەندێ قسە و باس و دەروازەی جێگەی پرسیارە و هەندێکیش کاتیان بەسەرچووە و رۆحی ئەم سەردەمە کاڵیکردوونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ناتوانین ئەو مەنهەجە رۆحی و ئەخلاقی و پەروەردەییە لەم کتێبەدا بە کەم تەماشا بکەین و وەك سەرچاوەیەکی مەعنەوی مەزن تەماشا نەکرێت، بەتایبەت لە چاخێکدا کە مادە بەسەر هەموو رەهەندەکانی ژیانماندا زاڵ بووە..

### ئەم کتێبە پێك هاتووە لە حەوت دەروازە:

دەروازەی یەکەم/ زانستی یەکتاپەرستی.

دەروازەی دووەم/ باسی پیاوانی رێگە و ژیان و قسەکانیان لە بەمەزنڕاگرتنی شەریعەت.

بەشی سێیەم/ زاراوەکانی تەصەوف.

بەشی چوارەم/ حاڵەکان و مەقامەکان

بەشی پێنجەم/ کەرامەتی ئەولیا.

بەشی پێنجەم/ خەونی ئەم دەستەیە.

بەشی حەوتەم/ وەسێت بۆ موریدان و سەرنج و مەشخەڵ.

## کاری وەرگێڕ لەو کتێبە:

١. وەرگێڕانەکەی من لەسەر ئەو چاپەی ریسالەی قوشەیرییە کە ئیمام عبدالحلیم محمود و دکتۆر محمود شریف تەحقیقیان کردووە.

٢. بۆ دانانی سەربابەت و ناونیشان و پۆلێن لەکتێبی رسالەی قوشیری بەتەحیقی و ئامادەکردنی هەر یەك لە (**معروف زريق**) و (**علي عبدالحميد بلطەجي**) سوودم بینیوە/چاپی (دار الجيل- بيروت)

٣. ئەو فەرموودانەی کە دەرهێنراون و تەحقیقیان بۆ کراوە و لە پەراوێزی چاپە عەرەبییەکەدا دانراون، هەوڵمداوە بە کورتی لەبەردەم فەرموودەکەدا وەکو خۆی لە نێوان ئەم دوو جۆرە کەوانەدا {} دایبنێمەوە..

٤. گەر لە پەراوێزی چاپە عەرەبییەکەدا قسەیەك بوونی هەبوبێت خزمەت بە تێگەیشتنی دەقەکە بکات هەوڵمداوە لە نێوان ئەم دوو جۆرە کەوانەدا {()} و بەم شێوە دایبنێم...

٥. لە هەندێ جێگەدا وەك وەرگێڕێك پێویست بووە قسەم لەسەر رۆشنکردنەوەی دەقەکە هەبێت، بۆیە هەوڵمداوە لە نێوان ئەم جۆرە لە کەوانەدا( ) قسەکانی خۆم بنووسم..

پێموایە تا رادەیەك توانیبێتم وەرگێڕانێك بۆ ئەم کتێبە بکەم خوێنەر لەلای پاراو و رەوان بێت، داوامە لە خودا لە هەڵە و کەموکورییەکانم ببورێت و بیکات بە

تویێشوویەکی خێر بۆ دانەر و وەرگێڕ و هەموو ئەوانەی رۆڵێکیان لە ئامادەکردن و بەچاپگەیاندنی هەیە..

٦. بۆ سەرسوکی خوێنەر هەموو **"حدثنا"**کانم لابردووە...

٧. هەوڵمداوە ئەو رێکخستنەی لە چاپە عەرەبییەکەدا بۆ ریسالەی قوشەیری هاتووە سەرلەنوێ رێکبخەمەوە و بە شێوەیەکی ئاسانتر لەلای خوێنەر دایبڕێژمەوە.

٨. وەکو تێبینیەك لە دەروازەی پێنجەم کە باسی کەراماتی ئەولیایانە ئیمامی قوشەیری بۆ چەسپاندنی کەراماتی ئەولیا چەند چیرۆکێك یەك لە دوای یەك باس دەکات، ئێمە بۆ ئاسانکاری و زیاتر سودمەندبوون هەستاوین بە دانانی ناونیشان بۆ هەر یەك لە چیرۆکەکان.

**وصلى الله وسلم على سيدنا و حبيبنا محمد(صلى الله عليه وسلم)**

**والحمد لله رب العالمين..**

✍

وەرگێڕ

**سلێمانی**

٢٠١٦/٤/١٤

# بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**الحمد لله، أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن سيدنا محمدا عبده المصطفى، صلى الله عليه وعلى آله مصابيح الدجى، وعلى أصحابه مفاتيح الهدى، وسلم تسليما كثيرا.**

ئەم ریسالەیە هەژاری دەرگای خودا **"عبدالكريم بن هوازن القشيري"** بۆ دەستەیەك لە سۆفییەکانی ولاّتە ئیسلامییەکان لە ساڵی (٤٣٧ك) نووسیویەتی.

خوا لێتان رازی بێت، خودا(ﷻ) ئەم دەستەیەی کردووە بە دۆستە هەڵبژاردەکانی و فەزڵی ئەوانی داوە بەسەر هەموو بەندەکانی تردا -لە دوای پێغەمبەرانی(سەلامی خودایان لەسەر بێت)- دڵیان بووە بە کانزای نهێنییەکانی خودا و لەناو ئومەتدا بە هەڵهاتنی نوور لە ئاسۆی دڵیان تایبەتی کردوونەتەوە.

ئەوان بارانی رەحمەتن بۆ خەڵکی و لە کۆی حاڵەکانیاندا لەگەڵ حەق و بە حەقەوە دەسوڕێنەوە.

خودا ئەوانی لە چڵك و چەپەڵی مرۆیی خاوێن کردووەتەوە و بۆ مەقامی بینین(**مشاهدة**) ئەوانی بەرزکردووەتەوە، بەو بینینە راستەقینەی تاکوتەنهایی خودایان بۆ ئاشکرا بووە و سەرکەوتووی کردوون لە هەستان بە ئادابی بەندایەتی و گوزەرکردنی حوکمی پەروەردگاریی پێ نیشانداون، بۆیە هەستان بەوەی لەسەر شانیان بوو لە ئەرکەکان و بەدەستهێنانی ئەوەی خودا(ﷻ) دەیەوێت لە تاوتوێکردنی و شەنوکەوکردنی ناخ و دەروونیان.

پاشان بە نیشاندانی هەژاری راستگۆیانە و وەسفی گەردنکەچی بۆ لای خودا(ﷻ) گەڕانەوە، ئەوان شانیان دانەدا لەسەر ئەو کار و کردەوە باشانەی ئەنجامیان دا و ئەو حاڵە باڵانەی بەدەستیان هێنا، چونکە ئەوان زانستیان بەوە هەبوو خودا(ﷻ) هەرچی بوێت ئەنجامی دەدات و هەر بەندەیەکی بوێت هەڵیدەبژێرێت، دروستکراو ناتوانن بڕیار بەسەر خودادا دەربکات و مافێك بۆ خۆی لەسەر خودادا بڕیار بدات، پاداشت

فــەزڵ و چــاکەی خۆیــەتی، ســزاش بڕیــاری دادپەروەرانــەی خۆیــەتی، فەرمانــەکانی فەرمانی بڕاوە و یەکلابووەوەیە.

پاشان بزانن-خودا رەحمتان پێ بکات- گـەورەپیاوانی ئـەم رێگەیـە زۆربـەیان قڕیـان کردووە، لەم سەردەمەی ئێمەدا تەنها شوێنەوارەکانیان دەبینرێت، وەك وتراوە:

**أما الخيام فإنها كخيامهم        وأرى النساء الحي غير نسائها**

(رەشماڵیان هەڵدا هەروەکو جاران

بەڵام نابینم سیمای نازداران)

ساردی و خاوبوونەوە رووی لەم رێگەیە کردووە، بەڵکو لە راستیدا رێگەکـە کۆتـایی پێهاتووە، ئەو گەورەپیاوانەی هیدایەتیان لێوە وەردەگیرا رۆیشتن، ئەو گەنجانەی کە لـە ژیـان و هەڵوێسـتیان سەرمەشـقی وەردەگـیرا کەمبوونـەوە، وەرع نـەما و راخەرەکـەی پێچرایەوە، و چاوچنۆکی پەرەیسەند و هێز و زۆری پەیدا کرد.

حورمەتی شەریعەت لە دڵدا هەڵگیراوە، کەمی گرنگیدان بە ئایین بووە بـە باشـترین هۆکار بۆ گەیشتن بە مەرامی دونیـایی، خـەڵکی جیـاوازی ناکـەن لـە نێـوان حـەڵاڵ و حەرام، وازهێنـان لـە رێـز و فڕێـدانی حـەیا و شـەرم بـووە بـە دینـداری، هەسـتان بـە عیبادەتەکان بە کەم دەزانن، گاڵتە بە رۆژ و نوێژ دەکرێت، لە مەیدانی بێئاگاییەکاندا پێشبڕکێ دەکەن و پاڵیانداوە بە لای شوێنکەوتنی حەزەکانەوە، کەمی گوێـدان سـەری لە دەستبردن بۆ قەدەغەکراوەکانەوە دەرچووە، و سەرقاڵی ئەوان بووە بەوەی لە بازاڕ و ژنان و دەسەڵاتدارانەوە وەریدەگرن.

پاشان رازی نابن بەوەی ئەنجامی دەدەن لە کاری خراپە، بەڵکو ئامـاژە بـە بـاڵاترین حەقیقەت و حاڵ دەدەن، وا بانگەشە دەکەن ئـەوان لـە بەندایـەتی کۆتوبەنـد رزگاریـان بووە و حەقیقەتی دیدار و گەیشتنیان بەدەستهێناوە، و لەسـەر حـەق راوەسـتاون و بـە حەق هەڵدەسـتن و حوکمـەکانی حـەق بەسـەریاندا گـوزەر دەکـات، ئـەوان لـە حاڵـەتی "مەحو"دان بۆیە لەو شـتانەی ئـەنجامی دەدەن لەلایـەن خـوداوە لۆمـە و سەرزەنشـت ناکرێن، پێیانوایـە ئـەوان نهێنییـەکانی تاکوتـەنهاییان بـۆ ئاشـکرا بـووە و بەتـەواوی

زاڵبووه به سەریاندا و حوکمە مرۆییەکانی لە ئەوان سڕیوەتەوە، و لە دوای فەناکەیان بە ئەنواری صەمەدییەت بەبێ نەفس ماونەتەوە و کاتێك زمانیان دێتە گۆ قسەکەر بریتی نییە لە ئەوان، ئەوەی ئەنجامی دەدەن کەسێکی ترە جگە لە ئەوان ئەنجامی دەدات، بەڵکو ئەوان هەڵدەسوڕێنرێن.

کاتێك تاقیکردنەوەی ئەم سەردەمەی ئێمە درێژەی کێشاوە وەك ئاماژەم بە هەندێکی کرد لەم بەسەرهاتەدا، زمان درێژیم لەم بابەتەدا نەکرد ئەوەش وەك غیرەتێك بۆ ئەم رێگەیە تاکو ئەهلی رێگەکە بە خراپە ناونەهێنم و کەسێکی سەرپێچیکەر بەوان پاساو بۆ هێرشکردنە سەریان بەدەست نەهێنێت و قسەکانی من بەکار نەهێنێت، چونکە لەم وڵاتەی ئێمەدا سەرپێچیکەرانی ئەم رێگەیە(رێگەی ئەهلی تەصەوف) و نەرێکەرانی بوون بە بەڵایەکی گەورە.

کاتێك دەمەوێت مادەی ئەم ساردبوونەوە و خاوبوونەوەیە کۆتایی پێ بێت، رجام وایە خودا بە لوتفی خۆی ئەوانە ئاگادار بکاتەوە کە لە سوننەتی باڵا لایانداوە لە تیابردنی ئادابەکانی ئەم رێگەیە.

کاتێك سەردەم تەنها دژواری و گرانی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، زۆربەی ئەهلی سەردەم لەم وڵاتەدا پێ رادەکێشن لەو شتانەی دەقیان پێوەگرتووە و ئەوەی تێیکەوتوون و فریویان پێ خواردووە.

بەزەییم هاتەوە بەو دڵانەدا پێیان وابێت گەیشتن بە ئەهلی حەقیقەت و بەدەستهێنانی ئەحواڵ بەو جۆرە بانگەشانەیە و رێساکانی ئەم رێگە بەو جۆرە دامەزراوە و پێشینان لەسەر ئەمە هەنگاویان هەڵگرتووە.

بۆیە ئەم ریسالەم بۆ ئێوە کۆکردەوە-خودا پایەدارتان بکات- هەندێ لە سیرەی گەورەپیاوان و ئەخلاق و مامەڵە و بیروباوەری دڵیانم تێدا باس کردووە، هەروەها ئەوەی ئەوان ئاماژەی پێ دەکەن لە وەجدەکانیان و چۆنێتی بەرزبوونەوە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، بۆ ئەوەی بۆ موریدانی ئەم رێگەیە ببێت بە هێز و راستکردنەوەی لە ئێوەوە بۆ من ببێتە شەهادە و لە بڵاوەپێکردنی ئەم سکاڵایەدا دڵنەواییەك بوونی هەیە و چاکە و پاداشتیش تەنها لە خوداوەیە.

داوای کۆمەکی لە خودا دەکەم لەوەی باسی دەکەم، ئەو بۆ من بەسە و داوامە لێی لە هەڵە و تێکەوتن بمپارێزێت، داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەم و پەنای پێدەگرم، ئەو(ﷻ) شایستەی چاکەیە و هەر شتێکی بوێت دەتوانێ ئەنجامی بدات.

**باوکی قاسم**

**عبدالکریم موری هوازن قشەیری**

**٤٣٨ ھ/ ١٠٤٦م**

# دەروازەی یەکەم

# زانستی یەکتاپەرستی

((یەکەمین ئەرکێك خودا لەسەر دروستکراوەکانی داناوە

بریتییە لە مەعریفە))

# بەشی یەکەم

## لە ڕۆشنکردنەوەی بیروباوەڕی ئەم دەستەیە(ئەهلی تەصەوف) لە بابەتە ئوسوڵییەکاندا

بزانن(ڕەحمەتی خوداتان لێبێت) گەورەپیاوانی ئەم دەستەیە ڕێساکانی کاری خۆیان لەسەر ئوسوڵی دروست لە یەکتاپەرستی بیناکردووە، بەو ڕێسانەش بیروباوەڕی خۆیان لە بیدعە پاراستووە و نزیکبوونەتەوە لەوەی پێشین و ئەهلی سوننەت لەسەری بوون: لە یەکتاپەرستییەك کە نموونادن و پەکخستن(**تمثیل و تعطیل**)ی تێدا نەبێت، دەزانن مافی دێرین(حق القدم) مانای چییە، ئەوەی سیفەتی بوونە لە نەبوون لای ئەوان جیاکراوەتەوە و تیایدا قووڵبوونەتەوە.

**بۆ ئەو مەبەستە سەرداری ئەم ڕێگەیە(جونەید) دەڵێت:** ((یەکتاپەرستی تەنهاکردنەوەی دێرینە(خودا) لە ڕووداو(دروستکراو)))

ئەوان بنچینەکانی بیروباوەڕیان بە بەڵگەی ڕۆشن و شایەتی ئامادە دامەزراو کردووە.

**وەك ئەبو محەمەدی جەریری(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ((هەر کەس بە شایەتێك لە شایەتەکانی خوداوە لەسەر زانستی یەکتاپەرستی نەوەستێت هەنگاوی غروور دەیخاتە ناو چاڵی تیاچوونەوە))، ئەو بەو قسەیە مەبەستی ئەوەیە: هەر کەس لابکاتەوە بەلای چاولێکەریدا و لە بەڵگەکانی یەکتاپەرستی تێڕانەمێنێت لە سوننەتەکانی ڕزگاربوون بەردەبێتەوە و دەکەوێتە ناو کۆتوبەندی تیاچوونەوە.

هەر کەس سەرنج لە گوزارشتەکانی ئەم دەستەیە بدات و قسەکانیان تاوتوێ بکات لە کۆی وتە پەرشوبڵاوەکانیان تێڕامێنێت—بەو تێڕامانەی ئەنجامی دەدات- بۆی ساغ دەبێتەوە ئەم دەستەیە لە گەیشتن بە ئامانج کەمتەرخەمیان نەکردووە و لە بەرزبوونەوە بۆ داواکەیان بێباکیان نەنواندووە.

ئێمە لەم بەشەدا کۆمەڵە رستەیەك لە قسەی پەرشوبڵاویان بەبیردەهێنینــەوە لــەوەی پەیوەستە بە بابەتەکانی ئوسوڵەوە و پاشان بەدوایدا ئــەوەی پێویســتە لــەبیروباوەڕ بــە شێوەیەکی کورت و پوخت دەخەینە روو:

## ناسینی خودا:

**ئەبوبەکری شیبلی دەڵێت:** ((یەك: بریتییە لە زانراو(ناسراو) بــەر لــە ســنوورەکان و پیتەکان))، ئەمەش راشکاوانە-لە شیبلییەوە- دەریدەخات دێــرین(ﷻ) ســنوورێك بــۆ زاتی نییە و پیت بۆ کەلامی نییە.

**پرسیار لە "روەیم" کرا** دەربارەی یەکەمین فەرزێك خودا لەسەر دروستکراوەکانی پێویستی کردووە؟

وتی: مەعریفەت، لەبەر ئایەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ **الذاريات: ٥٦**، **ئیبن عەباس دەڵێت:** "إلا ليعبدون" مانای "إلا ليعرفون-تاکو بمناسن"ی هەیە.

**جونەید دەڵێت:** یەکەمین شتێك لە ملوانکەی حیکمەت بەندە پێویستییەتی ئەوەیە: دروستکراو دروستکەرەکەی بناسێت، رووداو رووداوەکــەی چۆنە، ئــەو کــات ســیفەتی خالق لە مەخلوق و سیفەتی دێرین لە رووداو جیابکاتەوە، هەوڵبدات بۆ چــوون بــەدەم بانگەکەیەوە و دانبنێت بە واجبوونی گوێڕایەڵی ئەودا، گەر خاوەن موڵك نەناسێت دان بەوەدا نانێت موڵك کێ خاوەنییەتی.

**ئەبو تەیبی مەراغی دەڵێت:** ئەقڵ بەڵگەی بۆ هەیە، حیکمەت ئاماژەی بۆ هەیــە، مەعریفە شایەتی بۆ هەیە، بۆیە ئەقڵ نیشــان دەدات، و حیکمــەت ئامــاژە دەکــات و مەعریفە شایەتی دەدات: پــاکی و بێگــەردی عیبــادەت تــەنها بــە پــاکی و بێگــەردی عیبادەتەوەیە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی یەکتاپەرستی؟**

**وتی:** تەنهاکەوتنەوەی یەکتاپەرست بە دەستەبەرکردنی تاکوتەنهایی ئەو بە کەماڵی یەکتایی ئەو: کە ئەو تاکە و لە کەس نــەبووەو کەســی لــێ نابێــت، بەنــەرێکردنی دژو

هاوتاو هاوشێوە، بەبێ تەشبیه و چۆناندن و وێناکردن و نواندن: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ١١﴾ الشورى: ١١

**پرسیار لە ئەبوبەکر زاهیر ئابادی کرا دەربارەی مەعریفە؟**

**وتی:** مەعریفەت ناوە، ماناکەی بوونی بەمەزنڕاگرتنی خودایە لە دڵدا بە جۆرێك ڕێگریت لێ بکات لە پەکخستن و تەشبیه کردن.

## سیفەتەکانی:

**ئەبو حەسەنی بۆشنجی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:**

**یەکتایی:** ئەوەیە بزانیت خودا بە شتەکان تەشبیه ناکرێت و سیفەتەکانی نەرێ ناکرێن.

**ئەبو نەصری ئەسفنجانی دەڵێت:** حوسەینی کوڕی مەنصور(حەلاج) دەڵێت: هەمووی(هەموو دروستکراوەکان) بە ڕووداو پابەندکردووە، چونکە دێرینی تەنها بۆ خۆیەتی، ئەوەی بە جەستە دەردەکەوێت سیفەتی لابەلا لەگەڵی دەبێت، ئەوەی کۆبوونەوەی بە ئامرازەوەیە هێزی ئامرازەکان کۆیدەکەنەوە، ئەوەی "کات"ێك کۆیدەکاتەوە کاتێك بڵاوەی پێ دەکات، ئەوەی کەسێکی تر ڕاوەستاوی دەکات زەرورەت پێیەوە لکاوە، ئەوەی وەهم کاری تێدەکات وێناکردن بۆ لای بەرزدەبێتەوە، هەرکەی جێگەیەك لە ئامێزی بگرێت "لەکوێ" پێیدەگات، هەرکەس ڕەگەزی هەبێت داواکەرەکەی "چۆنچۆنی" دەبێت.

ئەو(سبحانه وتعالى) "سەر" سێبەری بۆ ناکات، "ژێر" هەڵیناگرێت، "ئاراستە" ڕووبەڕووی نییە، "لەلا" تەکی پێ هەڵناچنێت، "لە دوا" چوارچێوەداری ناکات، "لە پێش" سنووری بۆ دانانێت، "بەر" ئەو دەرناخات، و "پاش" ئەو تیانابات.

**وەسفی ئەو:** چۆنێتی بۆ نییە، کاری ئەو: هۆی بۆ نییە، بوونی ئەو: کۆتایی بۆ نییە، لە حاڵ و باری دروستکراوەکانی پاك و بێگەردە، لە دروستکراوەکانی پێکنەهاتووە، لە کارەکانیدا ناوەندی بۆ نییە، بە دێرینی خۆی لەوان جیابووەتەوە، وەك چۆن بە سنوورداری خۆیان لە ئەو(سبحانه وتعالى) جیابوونەتەوە.

گەر بلێی: کەی؟

ئەوا پێش خودا دەخەی، گەر بلێی: "هو-ئەو" پیتی **"هاء"** و پیتی **"واو"** خەلقی ئەون(واتە دروستکراون)، گەر بلێی: لەکوێ؟

ئەوا شوێنت پێش خودا خستووە.

پیتەکان ئایەتەکانی ئەون، بوونی خودا بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودا، ناسینی خودا یەکتایی خودایە، یەکتایی خوداش جیاکردنەوەیەتی لە دروستکراوەکانی، ئەوەی ئەندێشەی مرۆڤ لەسەر خودا دەیگاتێ خودا پێچەوانەی ئەوەیە، چۆن شتێك تێکەڵ بە خودا دەبێت سەرەتاکەی لە خودی ئەوەوە نەبێت؟

یان بگەڕێتەوە بۆ ناوی لە کاتێکدا ئەو بەدیهێناوە؟ ب

ە چاوی سەر نابینرێت، و وەهم و ئەندێشە نایگاتێ، نزیکی لە ئەو ڕێزلێنانە لە بەندەکەی، دووری لە ئەو سوکی بەندەیە لەلای ئەو، بەرزی خودا مەزنی و شکۆدارییەتی، هاتنی خودا گواستنەوە نییە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

ئەو **"الأول و الآخر و الظاهر و الباطن"** و نزیك و دوورە، کەسێکە: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى: ١١

**لە یوسفی کوڕی حوسەینەوە، دەڵێت:** پیاوێك لە بەردەم "زو نونی مصری" ڕاستبوویەوە و وتی: دەربارەی یەکتاپەرستی قسەم بۆ بکە، یەکتاپەرستی چییە؟

ئەویش پێی فەرموو: توانا و دەسەڵاتی خودا لەناو شتەکاندا ببینی بەبێ ئەوەی وابزانیت خودا بەوانە تێکەڵ بووە، دروستکردنی خودا بۆ شتەکان ببینی بەبێ ئەوەی وا بزانی دانیشتووە و چارەسەری ئەو کارانەی کردووە، هۆی بوونی هەموو شتێك دروستکردنە لەلایەن خوداوە، بەڵام هۆیەك نییە ئەوی دروستکردبێت، لە ئاسمانە بەرزەکان و زەویە نزمەکاندا کارهەڵسوڕێنەرێك بوونی نییە جگە لە بوونی خودا، هەموو ئەوەی لە ئەندێشەی خۆتدا دەربارەی خودا وێنای دەکەیت خودا بەو جۆرە نییە.

**جونەید دەفەرمویێت: یەکتاپەرستی ئەوەیە:**

زانستت هەبێت و دان بەوەدا بنێیت کە خودا لە ئەزەلەوە تاك و تەنهایە، دووەمی لەگەڵ نییە و هیچ شتێك نییە کرداری وەك کرداری ئەو وابێت (یان کارەکانی ئەو بکات یان وەك ئەو کار بکات).

## ئیمان :

**ئەبو عەبدولاّ بن خەفیف دەڵێت:** ئیمان بریتییە لە بەڕاستگەڕاندنی دڵ(تصدیق القلب) بەوەی حەق(خودا) لە جیهانی پەنهان فێری کردووە.

**ئەبو عەباسی سەیاری دەڵێت: پێدان و بەخشینەکانی خودا دوو جۆرن:**

ڕێزلێنان و هەڵنان(إستدراج)، ئەوەی خودا بەسەرتەوە دەیهێڵێتەوە **ڕێزلێنانە**، ئەوەی لێت دەگرێتەوە **هەڵنانە**، بۆیە بڵێ: من-گەر خودا بیەوێت- باوەڕدارم، ئەبو عەباس شێخی سەردەمی خۆی بووە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** پیاوێك تانەی لە لاقەکانی ئەبی عەباسی سەیاری دا، ئەویش پێی وت: تانە لە لاقێك دەدەی لە هەموو تەمەندا هەنگاوم بەرەو یاخیبوون و گوناه پێهەڵنەگرتوون؟!

**ئەبوبەکری واسیتی دەڵێت:** هەر کەس بڵێت من بە حەق ئیمانم بە خودا هێناوە، پێی دەوترێت: حەقیقەت ئاماژە دەکات بۆ: بەسەرداڕوانین و ئاگاهی تەواو و ئابڵۆقەدان، هەر کەس ئەو سیانە لەدەستبدات بانگەشەکەی بەتاڵە.

**مەبەستی بەو قسە ئەوەیە ئەهلی سوننەت دەیڵێن:** باوەڕداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە بە بەهەشت بڕیاری بۆ دراوە، هەر کەس ئەوا لە نهێنی حیکمەتی خودا نەزانێت ئەوا بانگەشەکەی بەوەی ئەو باوەڕداری ڕاستەقینەیە نادروستە.

**سەهلی کوڕی عەبدولاّی توستەری دەڵێت:** تەماشای خودای موتەعال دەکرێت بە "بصر" بەبێ ئابڵۆقەپێکردن و پەیبردن بە کۆتایی.

**ئەبو حوسەینی نووری دەڵێت:** خودا تەماشای دڵەکانی کرد، هیچ دڵێکی نەبینییەوە پڕ شەوقتر بێت لە دڵی محمد(ﷺ) بۆیە بە میعراج ڕێزی لێنا وەك پێشخستنی بینین و گفتوگۆ.

**محەمەد بن مەحبوب دەڵێت:** ڕۆژێك ئەبو عوسمانی مەغریبی پێی وتم:

ئەی محەمەد، گەر ڕۆژێك یەکێك پێی وتی: مەعبوودی تۆ لە کوێیە؟

چی پێ دەڵێی؟

دەڵێ: وتم: وەك چۆن لە ئەزەلەوە بووە.

وتی: گەر پێتوترا لە ئەزەلەوە لە کوێ بوو؟ چی دەڵێیت؟

دەڵێت: وتم: وەك چۆن لە ئێستادا، واتە: وەك چۆن هەبووە و بەبێ شوێن، ئێستاش وەك چۆن بووە هەر بەو جۆرە.

دەڵێت: لەو قسەیەی من ڕازی بوو، کراسەکەی لەبەرکردەوە و پێشکەشی کردم.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** کاتی خۆی باوەڕم بە شتێك لە ئاراستە هەبوو(مەبەستی ئایەتی **"الرحمن على العرش استوى"**یە)، کە هاتمە بەغداد ئەوەم لە دڵدا نەما، بۆیە بۆ هاوەڵەکانم لە مەککە نووسی: من ئێستا لەسەر ئیسلامێکی نوێم.

**پرسیار لە ئەبو عوسمانی مەغریبی کرا دەربارەی "خەلق"، وتی:** قاڵب و شەبەحن و حوکمەکانی قودرەتیان بەسەردا گوزەر دەکات.

**واسیتی دەڵێت:** ((کاتێك ڕۆحەکان و جەستەکان بە خوداوە ڕاوەستاون و بەوەوە دەرکەوتوون نەك بە خودی خۆیانەوە، هەر بەو جۆرە خایلە و خوتوورەکانی دڵ و دەروون و جووڵە و بزوانەکان بە خوداوەیە نەك بە خودی خۆیانەوە، چونکە خایلەکان و جووڵەکان لق و پۆپی جەستە و ڕۆحەکانن)).

بەم قسەیە ڕاشکاوانە پێمان دەڵێت کەسبی بەندەکان دروستکراوی خودان، وەك خودا دروستکەری جەستە و تەنەکانە هەر بەو جۆرە دروستکەری سیفەتە لابەلاکانی ئەو تەنانەیە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** هەر کەس وا گومان ببات بە بەخشینی تێن و توانا دەگاتە داوایەکەی ئەوە خۆی ماندوو دەکات، هەر کەسیش پێی وابێت بەبێ تێکۆشان دەگات ئەو تەنها هیوا و ئاوات دەخوازێت.

## بێباوەڕی (الکفر):

**پرسیار لە واسیتی کرا دەربارەی بێباوەڕی بە خودا، وتی:** بێباوەڕی و ئیمان و دونیا و دواڕۆژ لە خوداوەن و بۆ لای خودان و بە خوداوەن و بۆ خودان، سەرەتا و سەرهەڵدان لە خوداوەیە، گەڕانەوە و کۆتایی بۆ لای خودایە، مانەوە و تیاچوون بە خوداوەیە، موڵك و خەلقیش بۆ خودایە.

**جونەید دەفەرمویت:** پرسیار لە یەکێك لە زانایان کرا دەربارەی یەکتاپەرستی، فەرمووی: بریتییە لە یەقین.

**پرسیارکەرێك پرسی:** بۆم ڕۆشنبکەرەوە یەکتاپەرستی چییە؟

فەرمووی: مەعریفەت هەبێت بەوەی جووڵە و وەستانی دروستکراوەکان تەنها بریتین لە کاری خودا(ﷻ) و لەو کارەدا هاوەڵی نییە، گەر ئەوەت ئەنجامدا ئەوا خودات تاك و تەنها(یەکتا) کردووە.

**پیاوێك هاتە لای "زو نونی مصری" و پێی وت دوعام لای خودا بۆ بکە، ئەویش پێی وت:** گەر بە "ڕاستگۆیی لە تەوحید"دا بە زانستی پەنهان پشتیوانیت لێبکرێت، ئەوا زۆرێك لە دوعای گیراوت بۆ ڕەوانە دەکرێت، ئەگینا هاوار و بانگ کەسی نوقم بوو لە ئاودا رزگار ناکات.

**واسیتی دەڵێت:** فیرعەون بەئاشکرا داوای پەروەردگاری دەکرد، موعتەزیلە بە نهێنی ئەو داوایە دەکەن و دەڵێن: هەرچیم بوێت دەیکەم.

**ئەبو حوسەینی نووری دەڵێت:** یەکتاپەرستی بریتییە لە هەر خایلە و خوتورەیەك ئاماژە بە خودا بکات لەدوای ئەوەی خایلە و خوتوورەکانی تەشبیه تەنگی پێهەڵنەچن.

**پرسیار لە ئەبو عەلی ڕۆزباری کرا دەربارەی تەوحید لە وەڵامدا وتی:**

**تەوحید:** بریتییە لە راستوەستانی دڵ بە دامەزراوی(جێگیربوونی) جیابوونەوە لە پەکخستن(**التعطیل**) و رەدکردنەوەی تەشبیهـ، تەوحید لە یەك وشەدایە: هەموو ئەوەی بیر و ئەندێشە وێنای دەکات خودا(**سبحانە**) بەو جۆرە نییە، بە ئایەتی:﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشوری: ١١

**ئەبو قاسمی نەصرئابادی دەڵێت:** بەهەشت بە هێڵانەوەی خودا دەمێنێتەوە، یادی خودا و بەزەیی و خۆشەویستی ئەو بۆ تۆ بە مانەوەی خودا دەمێننەوە، جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەوەی بە مانەوەی خودا دەمێنێتەوە لەگەڵ ئەوەی بە هێڵانەوەی خودا بۆی دەمێنێتەوە.

**ئەمەی ئەبو قاسمی نەصرئابادی دەیڵێت** لە لوتکەی تێگەیشتن و پێگەیشتندایە، ئەهلی حەق دەڵێن سیفەتە دێرینەکانی زاتی خودا -**سبحانە**- بە مانەوەی خودا دەمێننەوە، لەم بابەتە بەئاگابە بەراورد بەوەی بە هێڵانەوەی خودا دەمێنێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی سەرپێچیکەرانی ئەهلی حەق دەیڵێن، بۆیە ئەوانە سەرپێچییان لە حەق کرد.

**محەمەدی کوڕی حوسەین دەڵێت:** گوێم لە نەصرئابادی بوو دەیوت: تۆ لە نێوان سیفەتەکانی کردار و سیفەتەکانی زاتدا دێیت و دەچیت، هەردووکیان بە حەقیقەت سیفەتی خودان، گەر لە مەقامی پەرتبووندا سەرگەردانت بکات ئەوا هاوملت دەکات بە سیفەتەکانی کرداری خۆی، گەر تۆی گەیاندە مەقامی کۆکردنەوە هاوملت دەکات بە سیفەتەکانی زاتی خۆی. ئەبو قاسم نەصرئابادی شێخی سەردەمی خۆی بووە.

**ئەبو ئیسحاقی ئیسرافینی دەڵێت:** کە لە بەغدا گەڕامەوە لە زانکۆی نیساپوور بابەتی رۆحم دەوتەوە، ئەو قسەم لێکدەدایەوە کە رۆح دروستکراوە(مەخلوقە)، ئەبو قاسم نەصرئابادی دوور لە ئێمە دانیشتبوو، گوێی بۆ قسەکانم دەگرت، دوای ئەوە بە چەند رۆژێکی کەم لەگەڵمان تێکەڵ بوو و بە محەمەدی کوڕی فەرائی وتبوو: شایەتی دەدەم من سەر لە نوێ لەسەر دەستی ئەو پیاوە(ئاماژەی بە من کرد بوو) موسڵمان بوومەوە.

**ئیبراهیمی کوڕی فاتك دەڵێـت:** گـوێم لـە جونەیـدی بەغـدادی بـوو دەیـوت: چـۆن کەسێك هاوشێوە و هاوتای نەبێت(خودا) پەیوەست دەبێت بە کەسـێکەوە هاوشـێوە و هاوتای هەبێت(مرۆڤ)؟

ئەوە زۆر دوورە و گومانێکە جێگەی سەرسوڕمانە مەگەر بە لوتفی **"اللطیف"** لـەو شوێنەوە کە پەیبردن و ئەندێشە و ئابلۆقەدان بوونیان نییە، مەگەر ئامـاژەیەکی یـەقین و دەستەبەرکردنی ئیمان.

**بە یەحیای کوڕی مەعاز وترا:** دەربارەی خودا(ﷻ) هەواڵم پێبدە.

وتی: خودایەکی تاکوتەنهایە.

پێیوترا: ئەو چۆنە؟

وتی: مەلیکێکی بە توانا و بە دەسەڵاتە.

پێیوترا: ئەو لە کوێیە؟

فەرمووی: ئەو لە شکاردایە.

پرسیارکەرەکە وتی: پرسیاری ئەوەم لێ نەکردی..

وتی: جگە لەوە سیفەتی مەخلوقە، بەڵام سیفەتی خودا هەواڵم پێنەداوی دەربارەی.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** ئەوەی ئەندێشە بەنەزانی وێنای دەکات و پێیوایە خودا بەو جۆرەیە تەنها ئەندێشەیە و ژێری بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خودا پێچەوانەی ئەو ئەندێشەیە.

**ئیبن شاهین دەربارەی "لەگەڵبوون" پرسیاری لە جونەید کرد وتی:** "لەگەڵ" دوو مانای هەیە: لەگەڵ پێغەمبەران بە سەرخستن و لەنگەرپێگرتنیان، خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ٤٦﴾ طه: ٤٦، لەگەڵ خەڵکی بە گشتیش بە زانست و ئابلۆقەدان﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجۡوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمۡ وَلَا خَمۡسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمۡ وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمۡ أَيۡنَ مَا كَانُواْ﴾ المجادلة: ٧، **ئیبن شاهین وتی:** نموونەی وەك تۆ شایستەیە ببێت بە رێنیشاندەری ئومەت بۆ لای خودا.

**عەرش:**

**پرسیار لە "زو نونی مصری" کرا دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾** طه: ٥، وتی: زاتی خۆی جێگیرکردووە و شوێنەکەی نەرێ کردووە، ئەو(**سبحانە**) بوونی خۆی بە زاتی خۆیەوەیە، شتەکان بە حوکمی ئەو بوونیان هەیە بەو جۆرەی خودا (**سبحانە**) دەیەوێت.

**پرسیار لە شیبلی کرا دەربارەی ئایەتی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾** طه: ٥، "الرحمن" هەربووە، عەرش رووداوە، عەرش بە خوداوە راوەستاوە.

**پرسیار لە جەعفەری کوڕی نەصیر کرا دەربارەی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾**

**طه: ٥**، وتی: زانستی خودا بە هەموو شتێکەوە پەیوەست بووە، هیچ شتێك لە شتێکی تر لێیەوە نزیکتر نییە.

**ئیمام جەعفەری صادق دەڵێت:** هەر کەس بانگەشەی ئەوە بکات خودا لەناو شتێکدایە یان لە شتێکە یان لەسەر شتێکە هاوەڵی بۆ خودا بڕیارداوە، چونکە گەر خودا لەسەر شتێك بوایە هەڵگیراو دەبوو، گەر لەناو شتێکدا بوایە سنووردار دەبوو، گەر لە شتێك بوایە رووداو دەبوو.

**جەعفەری صادق لەسەر ئایەتی: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨﴾ النجم: ٨** دەڵێت: هەر کەس وا ئەندێشە بکات خودا بە خودی خۆی شۆڕبووەتەوە(نزیکبووەتەوە) ماوەی(دووری) داواتە پاڵ خودا، شۆڕبوونەوە ئەوەیە: تا لە بەندە نزیکتر ببێتەوە زیاتر دووری دەخاتەوە لە جۆرەکانی مەعریفە، نە شۆڕبوونەوە و نە دووری بوونیان نییە.

**تووڕەبوونی مامۆستا "ئەبو عەلی"م بینی کاتێك بە سۆفییەك وتی:** خودا لە کوێیە؟

ئەویش وتی: خودا ورد و خاشت بکات... لەگەڵ "عین(چاو یان خودی خودا)" چۆن داوای "لە کوێ" دەکەی؟

**خەراز دەڵێت:** راستەقینەی نزیکی(قرب) بریتییە لە: لەدەستدانی هەستکردن بە شتەکان لە دڵەوە و ئارامی ویژدان بۆ لای خودای موتەعال.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** چووم بۆ لای پیاوێك شەیتان ژێردەستەی کرد بوو، بانگم دا بە گوێیدا، شەیتان لە ناوەوەی کەسەکەدا بانگی کردم: لێمگەڕێ با بیکوژم، ئەمە دەڵێت: قورئان مەخلوقە.

**ئیبن عەتای رۆزباری دەڵێت:** خودا کاتێك پیتەکانی خولقاند کردنی بە نهێنی خۆی، کاتێك ئادەمی دروست کرد ئەو نهێنییەی تێدا بڵاوکردەوە، ئەو نهێنییەی بۆ هیچ کام لە فریشتەکانی بڵاوە پێنەکرد، پیتەکان بە هونەری جاریبوون و هونەری زمانەکان بەسەر زمانی ئادەمدا گوزەریان دەکرد، خودا وێنەی بۆ پیتەکان دروست کرد، ئیبن عەتا ئەوەی راشکاوانە راگەیاند پیتەکان دروستکراون.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** پیتەکان زمانی کردارن نەك زمانی خود(**ذات**)، چونکە ئەو پیتانە کارن لە بەرکار(مفعول)دا.

دەڵێت: ئەمەش راشکاوانە راگەیاندنێکە لەسەر ئەوەی پیتەکان مەخولقن.

**جونەید لە "جوابات مسائل الشامیین"دا دەڵێت:** تەوەکول کاری دڵە، یەکتاپەرستی(یەکتایی) کاری زمانە، دەڵێت: ئەمە قسەی خاوەن ئوسوڵەکانە، قسە مانایەکە لە ماناکانی ئەمر و نەهی و هەواڵ و هەوڵی بەدەستهێنانی هەواڵ کە لە دڵدا راستدەبێتەوە.

**هەروەها جونەید لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێت:** حەق(خودا) بە زانستی پەنهان تەنهاکەوتووە، ئەوەی بووە و ئەوەی دەبێ و ئەوەی نابێ خودا دەیزانێت، هەروەها ئەوەی دەبێت دەزانێت چۆن دەبێت(سەرئەنجامی چی دەبێت).

**حوسەینی کوڕی مەنصور دەڵێت:** (هەرکەس راستەقینەی یەکتاپەرستی بۆ دەربکەوێت "بۆچی؟" و "چۆن؟"ی نامێنێت

**هەروەها جونەید دەڵێت:** بەڕێزترین و باڵاترین دانیشتن بریتییە لە دانیشتن بە بیرەوە لە مەیدانی یەکتاپەرستیدا.

**واسـیتی دەڵێـت:** "خـودا هـیچ شـتێکی بەدینـەهێناوە بـەڕێزتر بێـت لـە "رۆح"، رایگەیاند رۆح مەخلوقە.

**حەق( سبحانه وتعالی ):**

**ئەبو قاسمی قوشەیری(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ئـەم قسـانە دەریدەخـەن بیروباوەڕی شێخانی ئەهلی تەصەوف لـە پرسـە ئوسـوڵییەکاندا لەگـەڵ قسـەی ئـەهلی حەقدا پێکدێتەوە.

بەم برِە رادەوەستین نەبادا دەربچین لەو رێگەیەی گرتوومانەتە بەر لە کورتکردنەوە و پوختەکردن لەم بابەتەدا.

# بەشی دووەم

## ڕۆشنکردنەوەی بیروباوەڕی کۆڵەکەکانی تەصەوف لە پرسەکانی یەکتاپەرستیدا

((لە دەسەڵاتیدا تەنها ئەوەی دەیەوێت جاری دەبێت.. لە موڵکیدا تەنها ئەوانە بەرهەم دێن بڕیاری لە پێشەوەیە..)).

**ئەبو قاسم دەڵێت:**

((ئەم بەشانە ڕۆشنکردنەوەی بیروباوەڕ لە پرسەکانی یەکتاپەرستی لەخۆ دەگرن، لەڕووی ڕێکخستنەوە باسیان دەکەین))

گەورەپیاوانی ئەم ڕێگەیە بەپێی قسە و دەستە و نووسینەکانیان دەربارەی یەکتاپەرستی دەڵێن:

حەق(ﷻ) هەبووە(هەیە) و دێرینە و یەکە و دانایە و بەتوانایە و زانایە و زاڵە و بەبەزەییە و بەویستە و بیسەرە و شکۆدارە و بەرز و بڵندە، قسەکەرە، سەرخەرە، موتەکەبیرە، بەدەسەڵاتە، زیندووە، تاکوتەنهایە، دەمێنێتەوە، پشتیوان و بەمەبەستگیراوە(الصمد)ە.

ئەو(ﷻ) بەزانست زانایە، بە توانا بەتوانایە، بە ویست بەویستە، بیسەرە و دەبیستێ، بینەرە و دەبینێ، بە قسە قسەکەرە، بە زیندەگی زیندووە، بە مانەوە دەمێنێتەوە.

دوو دەستی هەیە کە سیفەتن، هەرچییەکی بوێت(سبحانە) بەو دوو دەستە دروستی دەکات لەسەر تایبەتکردن.

خودا رووی(**الوجه**) هەیە و سیفەتەکانی زاتی خودا تایبەتن بە زاتی خوداوە، ناوترێت ئەو سیفەتانە ئەوە(**هي هو**)، هەر بەو جۆرە ناوترێت ئەو سیفەتانە نەیار و نامۆن بە خودا، بەڵکو ئەوانە سیفەتی ئەزەلی و هەتاهەتایین، ئەو(سبحانە) زاتی تاك و تەنهایە، لە شتێك لە دروستکراوەکانی ناچێت، شتێك لە دروستکراوەکان لەو ناچن، ئەو جەستە و جەوهەر و بوونی لابەلا(**أعراض**) نییە، هەر بەو جۆرە سیفەتەکانیشی بوونی لابەلا نین، بە ئەندێشە وێنا ناکرێت، ئەقڵ ناتوانێت ئەندازەگیری بۆ بکات، ئاراستە و شوێنی بۆ نییە، کات بەسەریدا تێناپەڕێت، زیاد و کەم بۆ وەسفی خودا رێگەپێنەدراوە، رووالەت و چۆنێتی و بڕ تایبەت نیین بە خودا، کۆتایی و سنوور سنووری بۆ دانانێن، روودا و بەدینەهێناوە، هاندەر هانی نادات بۆ ئەنجامدانی کار، رەنگ و شێوە بۆ ئەو دروست نییە، کۆمەك و یارمەتی ئەو سەرناخات، هیچ لە دەسەڵاتی بەدەر نییە، هیچ بەدیهاتوویەك لە بڕیاری دەرناچێت، زانراوێك لە زانستی ئەو دەرناچێت، ئەو چۆنی بوێت و چی بوێت لەسەر کارەکانی لۆمە ناکرێت، دەربارەی ناوترێت:

لە کوێ؟ بە چ شێوازێك؟ چۆن؟

سەرەتایەك بۆ بوونی نییە و بوترێت: کەی بووە؟

مانەوەی کۆتایی پێ نایەت، و بوترێت ماوە و کاتی تەواوو بووە، هەروەها ناوترێت: ئەوەی کردی بۆچی کردی؟

چونکە عیللەت بۆ کارەکانی بوونی نییە، ناوترێت: ئەو چییە؟

چونکە رەگەزێکی نییە و بە نیشانەکەیدا لە هاوشێوەکانی جیابێتەوە، دەبینێت نەك بە هۆی بەرانبەری و رووبەڕووبوونەوە، جگە لە خۆی دەبینێت نەك بە هۆی کەمی و سنوورداری خۆیەوە، دروست دەکات نەك بە دەستبۆبردن و سەرقاڵبوون و خەریکبوون، کۆمەڵێك ناوی جوان و سیفەتی بەرز و بڵندی بۆ هەیە، ئەوەی دەیەوێت ئەنجامی دەدات و بەندەکانی ملکەچی بڕیارەکانی دەبن، تەنها ئەوەی دەیەوێت لە قەڵەمڕەوی رەهایی ئەودا روودەدات، تەنها ئەوە لە مولکیدا بەرهەم دێت بڕیار

پێشـــیکەوتووە، ئـــەوەی لـــە زانســـتی خودادایـــە رووبـــدات و روودەدات ویســـتوویەتی رووبدات، ئەوەش لە زانستی خودادایە روونادات و دەگونجێ رووبدات ئەو ویستوویەتی روونەدات، دروستکەری کەسپی بەندەکانە: بـە خێـر و بـە شـەڕیەوە، داهێنـەری شـتە بەرجەستەکان و ئاسارەکانیانە: کـەمی و زۆرییـان، رەوانەکـەری پێغەمبەرانـە بـۆ لای گەلانی سەر زەوی بەبێ ئەوەی لەسەری پێویست بێت.

لەسەر زمانی پێغەمبەران(سەلامی خودایان لەسەر بێت) مرۆڤایەتی ملکەچ و ژێربار کردووە بۆ خۆی، بەوەی هیچ کەسێك رێگەی لۆمە و بەرهەڵستکاری بەرانبەر بە خودا بۆ نییە، پشتیوانی پێغەمبەری(ﷺ) ئێمەی کردووە بە موعجیزەی دیار و ئایەتی رۆشن، بە جۆرێك بیانووی هەموو لایەکی بڕیوە و یەقینی دەرخستووە و تەمومژی رەواندووەتەوە، لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) ئیسلامی راست و رەوانی بە خەلیفەکانی راشیدین پاراست، پاشان بە بەڵگەی ئایینی لەسەر زمانی دۆستانی پارێزگاری لێکرد و سەریخست، ئومەتی حەنەفی پاراست تاکو لەسەر گومڕایی کۆنەبنەوە، بەو بەڵگانەی راستی کردوونەتەوە باتڵی پووچ کردەوە، ئەوەی بەڵێنی دابوو لە سەرخستنی ئایین لەم ئایەتەدا هێنایە دی: ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ۝٩﴾ الصف: ٩.

**ئەم بەشانە بەکورتی ئاماژە بەو بنەڕەتانە دەکەن پیاوانی ئەم رێگەیـە لەسـەری کۆبوونەتەوە. داوای کۆمەکی هەر لە خودایە.**

۞ ۞ ۞

# باسی پیاوانی ئەم ڕێگەیە و ئەوەی لە ژیان و وتەکانیان بەڵگەیە لەسەر بەمەزنڕاگرتنی شەریعەت

بزانن(خودا ڕەحمتان پێ بکات) لەدوای پێغەمبەری خودا(ﷺ) موسڵمانان چاکانیان بە ناوێك ناو لێ نەناوە، تەنها ناوی "هاوەڵانی پێغەمبەر"یان بۆ بەکاربراوە، چونکە هیچ ناوێك ناکەوێتە سەر ئەم ناوەوە، بۆیە پێیان وترا: هاوەڵان.

کاتێك ئەهلی چاخی دووەم بە هاوەڵان گەیشتن ئەوانەی هاوەڵی ئەوانیان کرد پێیان وترا "شوێنکەوتووان"، ئەو ناوەشیان بە باڵاترین ناو دادەنا، پاشان ئەوانەی بە دوای شوێنکەوتواندا هاتن ناونران "شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان".

پاشان خەڵکی جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە و پلە و پایەکان گۆڕانیان بەسەردا هات، ئەوانەی خەڵکانێکی تایبەت بوون و گرنگیان بە ئایین دەدا بە "زاهیدان" و "عابیدان" ناونران.

پاشان بیدعە سەریهەڵدا و ململانێ کەوتە نێوان دەستەکانەوە، هەر دەستەیەك بانگەشەی ئەوەی دەکرد زاهیدان لەناو ئەواندایە.

تایبەتکراوان لە ئەهلی سوننەت، ئەوانەی هەناسەیان لەگەڵ خودادایە و پارێزگاری لە دڵیان دەکەن تا بێئاگایی تەقە نەدات لە دەرگای دڵیان بە "تەصەوف" ناوزەدکران.

پێش سەدەی دووی کۆچی مەزنانی ئەو ڕێگەیە بەو ناوە ناونراون.

ئێمە لەم دەروازەیەدا ناوی مەزنانی دەستەیەك لە پیاوانی ئەم ڕێگەیە دەهێنین، پیاوانی چینی یەکەم تا سەردەمێکی دواتر لە ئەوان، هەندێ لە ژیانیان باس دەکەین و وتەکانیان ئاماژە پێ دەدەین تاکو-گەر خودا بیەوێت- ببێتە ئاماژە بۆ سەر بنەڕەت و بنچینە و ئەدەبیان.

# ١. ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم

**ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی کوڕی مەنصووره** ئیبراهیم(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) خەڵکی ناوچەی بەڵخە.

له نەوەی مەلیکەکانی ئەو ناوچەیە بوو، ڕۆژێك ڕۆیشتە دەرەوە بۆ ڕاوکردن، شوێنی ڕێویەك(یان کەروێشکێك) کەوت و بە دوایدا دەگەڕا، لەناکاو گوێی لە دەنگێك بوو: ئەی ئیبراهیم، ئایا تۆ بۆ ئەو کارە دروستکراوی، یان بە ئەو کارە فەرمانت پێکراوە؟

پاشان بانگی لێکردەوە: بەرزی زینی ئەسپەکەت: سوێند بە خودا بۆ ئەوە دروست نەکراوی و بەوەش فەرمانت پێنەکراوە.

ئیبراهیم لە ئەسپەکەی دابەزی.

ڕێیکەوت لە شوانێکی باوکی، کەڕەك(کەپەنك)ی شوانەکەی-کە لە خوری دروستکرابوو- وەرگرت و لەبەری کرد و ئەسپەکە و ئەوەی لەگەڵی بوو دای بە شوانەکە، دەشت و سارای گرتەبەر، پاشان خۆی گەیاندە مەککە و بوو بە هاوەڵی سوفیانی سەوری و فوزەیلی کوڕی عەیاز، پاشان ڕووی لە شام کرد و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

ئیبراهیم کەسێك بوو تەنها لە کار و کەسابەتی دەستی خۆی شتی دەخوارد، وەك کاری جوتیاری و باخەوانی و پیشەی تر.

ڕۆژێك پیاوێکی لە دەشت و سارادا بینی ناوی مەزنی خودا(**إسم الله الأعظم**)ی فێر کرد، لەدوای ئەوە بەو ناوە داوای لە خودا کرد و بە خزمەتی "**خضر**"(سەلامی خودای لەسەر بێت) گەیشت و پێی وت(واتە "**خضر**" پێی وت): ئەو کەسە داود بوو(سەلامی خودای لەسەر بێت) کە ناوی مەزنی خودای فێرکردی.

**ئیبراهیمی کوڕی بەشار دەڵێت:** بووم بە هاوەڵی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و پێم وت:

دەربارەی سەرەتای گەڕانەوەی خۆت بۆ لای خودا باسم بۆ بکە، ئەویش ئەو ڕووداوەی بینینی "**خضر**"ی بۆ گێڕامەوە.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم** لە دەروازەی وەرعدا پلە و پایەی زۆر مەزن بوو، دەگێڕنەوە وتویەتی: خواردن و خواردنەوەت پاك و حەڵاڵ رابگرە شتێکت لەسەر نابێت گەر شەو نوێژ نەکەی و رۆژ بە رۆژوو نەبیت.

**وتراوە زۆوربەی دوعاکانی ئەمە بووە:**

((**أللهم انقلني من ذل معصيتك إلى عز طاعتك**-خودایە لە سەرشۆڕی یاخیبوونەوە بمگوێزەرەوە بۆ سەربەرزی گوێڕایەڵی خۆت))

**بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وترا: گۆشت گران بووە..**

وتی: هەرزانی بکەن، واتە مەیکڕن، لەم بارەیەوە لە دێڕێك هۆنراوەدا دەڵێت:

**وإذا غلا شيء علي تركته فيكون أرخص ما يكون إذا غلا**

(گەر شتێك گران بوو وازلێهێنانی لەسەرمە، ئەو کات هەزانترین شتێکە کاتێك گران دەبێت)

**لە تەوافدا ئیبراهیم بە پیاوێکی وت:**

**بزانە ناگەیت بە پلە و پایەی صالحان تا شەش کۆسپ نەبڕیت:**

**یەکەم:** دەرگای نیعمەت دابخەی و دەرگای توندی و نەبوونی بکەیەوە.

**دووەم:** دەرگای لوتبەرزی دابخەی و دەرگای زەلیلی بکەیەوە.

**سێیەم:** دەرگای ئیسراحەت دابخەی و دەرگای کۆشان و ماندووبوون بکەیەوە.

**چوارەم:** دەرگای نووستن دابخەی و دەرگای بەئاگایی شەو بکەیەوە.

**پێنجەم:** دەرگای دەوڵەمەندی دابخەی و دەرگای هەژاری بکەیەوە.

**شەشەم:** دەرگای هیوا و ئاوات دابخەی و دەرگای خۆئامادە کردن بۆ مردن بکەیەوە.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم باخەوانی باخێکی ترێ بوو، سەربازێك بە پاڵیدا تێپەڕی و وتی:** هەندێکمان لەم ترێیە پێ بدە، ئەویش وتی: خاوەنەکەی فەرمانی پێ نەکردووم بەو کارە، سەربازەکە بە قەمچی دەستی بە لێدانی ئیبراهیم کرد، ئەویش سەریداخست و وتی: بە قەمچی بکێشە بە سەرێکدا کە بەردەوام لە خودا یاخی بووە، پیاوەکە لە لێدانی وەستا و رۆیشت.

**سەهلی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت:** بووم بە هاوەڵی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و نەخۆش کەوتم، بە پارەی خۆی خەرجی بـۆ کـردم، حـەز و ئـارەزووی شـتێکم بـۆ دروسـت بـوو گوێدرێژەکەی بۆ فرۆشتم و پارەکەی بۆ خەرج کردم، کاتێك چاکبوومەوە وتم: ئیبراهیم: کوا گوێدرێژەکە؟

وتی: فرۆشتمان، وتم: ئەی من سواری چی بم؟

وتی: برام بە کۆڵ دەتگێڕم، ئیبراهیم هەڵیدامە ناو سێ پلە و پایەی بەرزەوە.

# ٢. زنونی میصری

**أبو الفيض ذو النون المصري** ناوی: سەوبانی کوڕی ئیبراهیمە، وتراویشە فەیزی کوڕی ئیبراهیم، باوکی لە باشووری میسر نیشتەجێ بووبوو، ساڵی ٢٤٥ی کۆچی مردووە، شانوشکۆیەکی مەزنی لەم مەیدانەدا هەیە، ناوازەی سەردەمی خۆیەتی لە زانست و وەرع و حاڵ و ئەدەبدا.

لای موتەوەکیل (خەلیفەی عەباسی) سکاڵایان لەسەر تۆمار کرد ، ئەویش لە میسرەوە بانگهێشی کرد بۆ بەغداد، کاتێك چووە لای موتەوەکیل زۆر ڕێزی لێگرت و بە مەزن تەماشای کرد، موتەوەکیل دەستی بە گریان کرد و بە ڕێزەوە ڕەوانەی کردەوە بۆ میسر، کاتێك یەکێك لە ئەهلی وەرع لە بەردەم موتەوەکیل ئامادە بوو دەستی بە گریان دەکرد و دەیوت: ئەگەر باسی ئەهلی وەرع کرا سەرەتا با بە **"ذي النون"** دەست پێبکەن.

پیاوێکی جەستە باریك و لاواز بوو، ڕەنگی مەیلەو سوور بوو، ریشی سپی نەبوو بوو.

**ذو النون دەڵێت:** قسە(قسەی ئەهلی ئەم ڕێگە) لەسەر چوار خولگە دەسوڕێتەوە:

خۆشەویستی خودا، ڕقبوونەوە لە کەم(لە دونیای کەم و کورت)، و شوێنکەوتنی قورئان و ترسان لە لادان و ساردبوونەوە.

**هەروەها دەڵێت:** لە نیشانەکانی خۆشەویستی خودا: شوێنکەوتنی خۆشەویستەکەی خودایە(پێغەمبەر(ﷺ)): لە ئەخلاق و کردار و فەرمان و سونەتەکانیدا.

**دەربارەی گێل پرسیارکرا لە "زو نونی مصری" وتی:** ئەو کەسەیە ڕێگەی ڕۆیشتن بۆ لای خودا نازانێت و ناشیەوێت بیناسێت(بیدۆزێتەوە).

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** ڕۆژێك لە مەجلیسێکی **"ذو النون"**دا ئامادە بووم، سالم مەغریبی هات بۆ لای و پێیوت: باوکی فەیز هۆی تەوبەکردنەکەت چی بوو؟ وتی: شتێکی سەیرە و ناچێتە باوەڕەوە، وتی: سوێندت دەدەم بە پەرستراوت بۆم باس بکە.

**"ذو النون" وتی:** ویستم لە میسرەوە بەرەو هەندێ گوند دەربچم، لە ڕێگەدا و لەو دەشت و سارایە لە بن درەختێك خەوم لێکەوت، دواتر چاوم کردەوە، و بینیم باڵندەیەکی کوێر لە هێلانەکەی کەوتووەتە خوارەوە، زەویەکە شەقی برد و دوو دەوری(یان قاپ) لێ هاتە دەرەوە، یەکێکیان زێڕ و ئەویتریان زیو، لە یەکێکیاندا کونجی هەبوو، ئەویتریان ئاوی تێدا بوو، باڵندەکە لەمە و لەوەشی دەخوارد.

وتم: ئەمە بەسە بۆ من، تەوبەم کرد و گەڕامەوە، لە دەرگای خودا ڕاوەستام تا خودا(ﷻ) قبووڵی کردم.

**هەروەها دەڵێت:** حیکمەت لە گەدەیەکدا نیشتەجێ نابێت لە خواردن پڕ بووبێت.

دەربارەی تەوبە پرسیار لە **"ذو النون"** کرا، وتی:

تەوبەی خەڵکی ڕەشۆکی لە گوناهانە، تەوبەی تایبەتکراوان لە بێئاگاییە.

# ٣. فوزەیلی کوڕی عەیاز

**ئەبو عەلی فوزەیلی کوڕی عەیاز**

فوزەیل خەڵکی خوراسانە لە ناوچەی مەرو، وتراویشە لە سەمەرقەند لەدایك بووە و لە ئەبیوەرد گەورە بووە و لە شاری مەککە لە موحەڕەمی ١٨٧ی کۆچی مردووە.

فوزەیل کەسێکی ڕێگر(چەتە) بوو، لە نێوان ئەبیوەرد و "سەرەخس"دا ڕێگەی لە خەڵکی دەگرت و ماڵ و سامانەکەی دەبردن، هۆی تەوبەکەی ئەوە بوو: فوزەیل عاشقی کەنیزەکێك بووبوو، کاتێك بە دیواردا سەردەکەوت بۆ لای، گوێی لە قورئان خوێنێك بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ **الحديد: ١٦**، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی ئیمانیانیان هێنا دڵیان بۆ یادی خودا بێتە جۆش؟ وتی: پەروەردگار ئیتر کاتی هاتووە.

گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، شەوەکەی رووی لە وێرانەیەك کرد، بینی چەند کەسێك لەوێن، هەندێکیان بە هەندێکیانی دەوت: با بڕۆین و کاروانییەکە بخەینەگەڕ، هەندێکی تریان دەیانوت: با ڕۆژمان لێ بێتەوە، چونکە فوزەیل ڕێگەمان لێ دەگرێت.

فوزەیل تەوبەی کرد و ئاسایشی بۆ ئەوان گێڕایەوە و بوو بە جیرانی ماڵی خودا تا کۆچی دوایی کرد.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست خەم و پەژارەی زیاد دەکات، گەر رقی لە بەندەیەك بوو دونیای بۆ فراوان دەکات.

**ئیبن موبارەك دەڵێت:** گەر فوزەیل بمرێت حوزن هەڵدەگیرێت(بەهۆی ئەو حوزنە زۆرەی هەمیشە داگیری کرد بوو)

**هەروەها فوزەیل دەڵێت:** گەر هەموو دونیام بۆ بخرێتە روو و لەسەریشی دادگایی نەکرێم بە قێزەونی دەزانم وەك چۆن یەکێك لە ئێوە لاکە تۆپیوێك بە قێزەون دەزانێت و خۆی لێ لا دەدا تاکو پۆشاکەکەی پیس نەبێت.

**هەروەها دەڵێت:** گەر سوێند بخۆم من ریابازم لام خۆشترە لەوەی سوێند بخۆم ریاباز نیم.

**هەروەها دەڵێت:** وازهێنان لە کار لە پێناوی خەڵکیدا ریایە، کارکردن لە پێناوی خەڵکیدا هاوەڵدانانە.

**ئەبو عەلی رازی دەڵێت:** سی ساڵ هاوەڵی فوزەیلم ئەکرد نەمبینی پێبکەنێت، تەنانەت نەمبینی بزەیەك بکەوێتە سەر لێوی، تا ئەو رۆژەی کوڕەکەی کە ناوی عەلی بوو مرد(ئەو رۆژە پێکەنی)، منیش لەو بارەیەوە پرسیارم لێ کرد، وتی: خودا بەندەیەکی خۆشدەوێت، منیش ئەوەم پێخۆش بوو(واتە خودا بەندەیەکی خۆش دەوێت لە کاتی بەلاّ و ناخۆشیدا پێبکەنێت، منیش ئەوەم پێخۆش بوو)

**هەروەها دەڵێت:** من کاتێك لە خودا یاخی دەبم ئاسارەکەی لە رەفتاری گوێدرێژەکە و خزمەتکارەکەمدا دەبینم.

۞ ۞ ۞

# ٤. شێخ مەعروفی کەرخی

**ئەبو مەحفوز مەعروفی کوڕی فەیروزی کەرخی(شێخ مەعروفی کەرخی)**

لە پیاوانی مەزنی ئەم ڕێگەیە، کەسێك بوو لەلای خودا دوعای گیرابوو(داوای شیفا لە خودا دەکرێت لە پەنای گۆڕەکەیدا)

**بەغدادییەکان دەڵێن:** گۆڕەکەی شێخ مەعروف دەرمانێکی ئەزموونکراوە(مەبەست پێی داواکردنە لە خودا لەلای گۆڕەکەی، بەشێك لە زانایان (بەتایبەت مەدرەسەی زاهیری) ئەو کارە بەشەرعی نابینن) .

یەکێك بوو لە مەوالییەکانی عەلی کوڕی موسا(ئیمام ڕەزا)(خوا لێی ڕازی بێت)، ساڵی ٢٠٠ی کۆچی مردووە، وتراویشە ٢٠١ی کۆچی.

شێخ مەعروف مامۆستای **"السري السقطي"** بوو، ڕۆژێك پێی وت: گەر پێویستییەك بۆ لای خودا هەبوو بە من سوێند لەسەر خودا بخۆ (واتە بڵێ: **"**خودایە بە حورمەت و پلە و پایەی شێخ مەعرووفی کەرخی لەلات داوات لێ دەکەم ئەو کارەم بۆ بکەی**"**.

هەندێ لە زانایان لە ژیانی کەسەکەدا (کە دەکرێت بە وەسیلە) کارەکە بە شەرعی دەبینن، بەڵام لەدوای مردنی بە شەرعی نازانن)

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** مەعروفی کەرخی باوك و دایکی نەصرانی بوون، مەعروفیان ڕادەستی ئەدەبدادەرەکەی کرد، ئەو کاتێك منداڵ بوو، ئەدەبدادەرەکەی پێی دەوت: خودا یەکێکە لە سیانەکە(مەبەست پێی: الله، و ڕۆحی قدس، و کوڕە)، ئەویش دەیوت: ئەو تاکوتەنهایە، ڕۆژێك مامۆستاکەی زۆر بە خراپی لێیدا، مەعروف هەڵهات، دایك و باوکی دەیانوت: خۆزگە بگەڕابایەتەوە بۆ لامان لەسەر هەر ئایینێك بوایە کێشە نەبوو ئێمە دەچووینە سەر ئایینەکەی ئەو.

پاشان لەسەر دەستی عەلی کوڕی موسا(ئیمام ڕەزا) موسـڵمان بـوو و گەڕایـەوە بـۆ ماڵ خۆیان.. تەقەی دا لە دەرگا، وترا: کێ لە دەرگایە؟ وتی: مەعروف، وتیان: لەسەر کام ئایین بۆ لای ئێمە گەڕایتەوە؟

وتی: لەسەر ئایینی حەنەفی، بۆیە دایك و باوکی موسڵمان بوون.

**سڕی سەقەتی دەڵێت:** لە خەوندا مەعروفی کەرخیم بـینی وام زانـی لـەژێر عەرشـی خودادایە، خودا دەیفەرموو بە فریشتەکانی: ئەم کەسە کێیە؟

دەیانوت: تۆ زاناتری ئەی پەروەردگار، ئەویش دەیفەرموو: ئەمە مەعروفی کەرخییە، بە خۆشەویستی من مەست بوو، تەنها بە گەیشتن پێم هۆشدەکاتەوە.

**شێخ مەعروف دەڵێت:** هەندێ لە هاوەڵانی داوودی تـائی پێیـان وتم: هـەرگیز واز لـە کـردار مەهێنە، چونکە کردارە لە ڕازیبوونی مەولا نزیکت دەکاتەوە، وتم: ئەو کردارە کامەیە؟

وتی: بەردەوامبوون لە گوێڕایەڵی خودا و خزمەتی موسڵمانان و ئامۆژگاری کردنیان.

**محەمەدی کوڕی حوسەین دەڵێت:** گوێم لە باوکم بوو دەیوت: شێخ مەعروفی کەرخیم لەدوای مردنی لە خەوندا بینی و پێم وت: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: لێمخۆش بوو، وتم: بە زوهد و وەرعت؟

وتی: نەخێر، بە قبووڵ کردنی ئامۆژگاری ئیبن سەماك و پابەندبوون بە هەژارییەوە و خۆشەویستی هەژاران و نەداران.

**ئامۆژگارییەکەی ئیبن سەماك ئەوەیە شێخ مەعروف دەیلێت:**

بە کوفەدا تێپەڕیم، ڕۆیشتم بۆ لای پیاوێك ناوی ئیبن سەماك بوو، ئـەو ئامۆژگـاری خەڵکی دەکرد، لە درێژایی قسەکانیدا وتی: هەر کەس بـە هـەموو بـوون و ژیانییـەوە پشتی لە خودا کرد خودا بەتەواوی پشتی تێدەکات، هەر کـەس بـە دڵ ڕوو لـە خـودا بکات خودا بە بەزەیی خۆی ڕووی لێ دەکات و خـەڵکی لـە هـەموو ڕوویەکـەوە ڕووی لێدەکەن، هەر کەس جار جارێك ڕوو لە خودا بکات، خوداش هەندێ کات بەزەیی پـێ دەکات، قسەکانی چوونە ناو دڵمەوە، بۆیە ڕووم لە خودا کرد و هەموو ئەوەی لەسەری بووم بەجێمهێڵا، جگە لە خزمەت کردنی گەورەم عەلی کوڕی موسا(ئیمام ڕەزا).

ئەو قسانەی ئیبن سەماکم بۆ گەورەم(ئیمام رەزا) باس کرد ئەویش فەرمووی: ئەوە بەسە بۆ تۆ وەك ئامۆژگاری گەر بتەوێت وەریبگریت.

**سرِی سەقەتی دەڵێت:** بۆ خۆم گوێم لە مەعروفی کەرخی بوو ئەو رووداوەی گێڕایەوە.

لە نەخۆشی مردنەکەیدا بە مەعروفی کەرخی وترا: وەسێتمان بۆ بکە.

وتی: هەرکات مردم ئەم کراسەی لە بەرمدایە بیکەن بە صەدەقە بۆم، چونکە دەمەوێت بەڕووتی دونیا بەجێبهێڵم، وەك چۆن بە رووتی هاتینە دونیاوە.

**مەعروفی کەرخی بە پاڵ ئاوبەخشێکدا تێپەڕی دەیوت:** رەحمەتی خودا لەو کەسەی ئاو دەخواتەوە، شێخ مەعروف بەرۆژوو بوو(رۆژووی سوننەت)، ئاوەکەی لەدەست گرت و خواردییەوە، پێیوترا: ئەی بەرۆژوو نەبووی؟

وتی: با، بەڵام رجای دوعاکەیم کرد(واتە بەر رەحمی خودا بکەوم).

# ٥. سري سقطي

**أبو الحسن سري بن المفلس السقطي** خاڵی جونەید و مامۆستاکەی.

قوتابی شێخ مەعروفی کەرخی بوو، لە وەرع و ئەحواڵی سوننەتی و زانستەکانی یەکتاپەرستیدا ناوازەی سەردەمی خۆی بوو.

**ئەبو عەباسی کوڕی مەسروق دەڵێت:** هەواڵم پێگەیشت سرِی سەقەتی لە بازاڕدا بازرگانی دەکات، ئەو یەکێك بوو لە هاوەڵەکانی مەعروفی کەرخی، ڕۆژێك مەعروف هات بۆ لای و منداڵێکی بێبابی لەگەڵ بوو، پێی وت: ئەم منداڵە پۆشتە بکەوە، سرِی سەقەتی دەڵێت: پۆشتەم کردەوە، مەعروف زۆر پێی دڵخۆش بوو، وتی: خودا دونیات لەبەرچاو بخات و لەوەی تێیکەوتووی ئاسوودە ببیت.

**"السری" دەڵێت:** لە دوکانەکە هاتمە دەرەوە هیچ شتێك نەبوو بە ئەندازەی دونیا رقم لێی بێت، هەموو ئەوەی من تێیدام لە بەرەکەتی مەعروفەوەیە.

**جونەید دەفەرموێت:** کەسم نەبینیوە بە ئەندازەی "السری" بەندایەتی بکات، تەمەنی گەیشتە نەوەد و هەشت ساڵ نەمبینی لە جێگەدا رابکشێت، تەنها لە نەخۆشی مردنەکەیدا لە جێگەدا راکشا.

**لە "السری"ەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: تەصەوف ناوێکە بۆ سێ مانا:**

**یەکەم:** ئەوەیە نووری مەعریفەت نووری وەرعی خامۆش نەکات.

**دووەم:** لە شاراوەیەك(ناوەوە) قسە نەکات ئاشکرای قورئان و فەرموودە هەڵیدەوەشێننەوە.

**سێیەم:** کەرامات هەڵینەنێت بۆ پەردە لادان لەسەر حەرامکراوەکانی خودا.

"السری" ساڵی ٢٥٧ی کۆچی مردووە.

**جونەید(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ڕۆژێك "السری" پرسیاری مانای "خۆشەویستی" لێکردم، وتم: **دەستەیەك دەڵێن:** بریتییە لە ڕێکەوتن(تەبایی لەگەڵ

ئەمر و نەهییەکان)، **دەستەیەکیش دەڵێت:** بریتییە لە ئیسار(الإيثار)، **دەستەیەکیش دەڵێن:** ئەوە... و ئەوە.... "السری" پێستی دەستی خۆی راکێشا، نەهات بە دەستییەوە، پاشان وتی: بە عیززەتی خودا، گەر بڵێی: ئەم پێستە بەهۆی خۆشەویستی خوداوە بەم ئێسکەوە وشك بووەتەوە، راستت وتووە، پاشان بوورایەوە، روخساری وەك مانگی چواردە گەشایەوە، لە کاتێکدا "السری" کەسێکی رەنگ ئەسمەر بوو.

**لە "السری"ەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** سی ساڵە لە "إستغفار"دام بۆ وتنی "الحمد لله"یەك.

وتیان ئەوە چۆن بوو؟

وتی: ئاگرێك لە بەغداد کەوتەوە، پیاوێك بەرەو رووم هات و وتی: دوکانەکەی تۆ نەسووتاوە، منیش وتم: الحمد لله، سی ساڵە من پەشیمانم لەو قسەیەم، چونکە خێرێکم بۆ خۆم ویست لەوەی بەسەر موسڵمانانددا هاتبوو.

**ئەبوبەکر حەربی دەڵێت:** گوێم لە "السری" بوو ئەو قسەی دەکرد.

**لە "السری"ەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە رۆژێکدا چەندین جار (لە ئاوێنەدا) تەماشای لوتم دەکەم بزانم رەش نەبووە، ئەوەش وەك ترسان لە خودا بەهۆی کەمتەرخەمییەکانمەوە نەبادا وێنەم بشێوێنێت.

**جونەید دەڵێت:** گوێم لە "السری" بوو دەیوت: رێگەیەکی کورت دەزانم راستەوخۆ مرۆڤ بە بەهەشت دەگەیەنێت، وتم: ئەو رێگەیە کامەیە؟

وتی: هیچ شتێك داوا لە هیچ کەس مەکە، شتێکت لەلا نەمێنێتەوە لێی ببەخشی بە خەڵکی.

**دیسان جونەید دەڵێت:** گوێم لە "السری" بوو دەیوت: حەز دەکەم لە شوێنێکی تر بمرم جگە لە بەغداد، پێیوترا: بۆچی؟

وتی: دەترسم قەبرەکە نەمگرێتە خۆ و رسوا و شەرمەزار ببم.

**هەروەها جونەید دەڵێت:** گوێم لە "السری" بوو دەیوت: خودایە چەندە سزام دەدەی سزام بدە، بەڵام بە زەلیلی حیجاب(پەردەی نێوان بەندە و خودا) سزام مەدە.

**هەروەها جونەید دەڵێت:** رۆژێك چووم بۆ لای **"السري السقطي"** بینیم دەگری، وتم: بۆ دەگریت؟

وتی: دوێنیٚ کچە منداڵەکەم هات بۆ لام و وتی: باوکە، ئەم شەو گەرمە، ئەم کوپە ئاوە بەو جێگەدا هەڵواسە، پاشان چاوم زۆری بۆ هێنام و خەوم لێکەوت، بینیم ئافرەتێك کە جوانترین روخساری هەبوو لە ئاسمانەوە دابەزی، وتم: تۆ هی کێیت؟

وتی: هی ئەو کەسەم ئاوی ساردی کوپە ناخواتەوە، بۆیە کوپەکەم هێنا و کێشام بە زەویدا و شکاندم.

**جونەید دەڵێت:** پارچەکانی کوپەکەم بینی نە کۆی دەکردنەوە و نە بەرزی دەکردنەوە تا کەوتنە ژێر خاك و خۆڵەوە.

# ٦. بیشری حافی

**أبو نصر بشر بن الحارث الحافي**، خەڵکی مەروە و لە بەغداد نیشـەجێ بـووە و هـەر لەوێش مردووە، خوشکەزای عـەلی کـوڕی خەشـرەمە، سـاڵی ٢٢٧ی کۆچـی مـردووە، کەسێکی شانوشکۆ مەزن بوو.

**هۆی تەوبەکردنەکەی:** بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت پارچە کاغەزێکی بینی ناوی خودای لەسەر نووسرا بوو، خەڵکی پێیان پیادەنا، کاغەزەکەی هەڵگرتەوە و بە درهەمێك-کە زۆری پێویست بوو- بۆنێکی پـێ کـڕی و کاغەزەکـەی پـێ بۆنخۆش کـرد و لـە کـونی دیوارێکدا هەڵیگرت، لە خەوندا بینی کەسێك پێی وت: ئەی بیشر تۆ ناوەکـەی منـت بۆنخۆش کرد منیش لە دونیا و دواڕۆژدا ناوی تۆ پاك و بۆنخۆش دەکەم.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لـێ بێـت) دەڵێـت:** بیشـر بـە پـاڵ کۆمەڵێك خەڵکدا تێپەڕی، وتیان: ئەم پیاوە هەموو شـەو بەئاگایـە و ناخـەوێت، سـێ ڕۆژ جارێك ڕۆژوو دەشکێنێت، بیشر دەستی بە گریان کرد، لەو بارەوە پرسـیاریان لـێ کرد، وتی: بیرم نایـە شـەوێك بـە تـەواوی بـەئاگا بـووبم، ڕۆژێکـیش بـەڕۆژوو نـەبووم شەوەکەی نەیشکێنم، بەڵام خـودا زیـاتر لـەوەی بەنـدە ئـەنجامی دەدات دەیخاتـە دڵـی خەڵکییـــەوە، ئـــەوەش وەك لوتـــف و بەخشـــندەییەك بەرانبـــەرم، پاشـــان ســـەرەتای تەوبەکردنی خۆی باس کرد بەو جۆرەی ئاماژەمان پێدا.

**بیشر حافی دەڵێت:** لە خەوندا پێغەمبـەرم(ﷺ) بـینی، پێـی فـەرمووم: ئـەی بیشـر، دەزانی بۆچی خودا لە نێوان هاوەڵاندا(هاوەڵانی بیشر) تۆی بـەرزکردەوە، وتم: نـەخێر، ئـەی پێغەمبـەری خـودا، فـەرمووی: بـەهۆی شـوێنکەوتنت بـۆ سـوننەتەکانی مـن و خزمەتکردنی صاڵحان و ئامۆژگاریت بۆ براکانت و خۆشەویستیت بۆ هـاوەڵانی مـن و ئەهلوبەیتی من، ئەوە ئەوەیە تۆی گەیاندۆتە پلە و پایەی ئەبرار.

**"بلال الخواص" دەڵێت:** لە سارای سینادا بووم، پیاوێکم بـینی لەگـەڵم دەڕۆیشـت، زۆرم لا سەیر بوو، پاشان ئیلهامم بۆ هات ئەو پیـاوە **"خضر"**ە(سـەلامی خـودای لـێ

بێت)، وتم: بە حەقی حەق سوێندت دەدەم تۆ کێیت؟ وتی: برای تۆ "**خضر**"، وتم: دەمەوێ لێت بپرسم، وتی: بپرسە، وتم: چی دەڵێی دەربارەی شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت)، وتی: یەکێکە لە کۆڵەکەکان. وتم: چی دەڵێت دەربارەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(خوا لێی رازی بێت)؟ وتی: پیاوێکی صدیقە.

وتم: چی دەڵێی دەربارەی بیشری حافی؟

وتی: دوای ئەو کەسێکی نموونەی ئەو دروست نابێتەوە.

**ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** بیشری حافی هات بۆ ماڵی "**المعافی بن عمران**"، و تەقەی دا لە دەرگا، وترا: کێیە؟ وتی: بیشری حافی، کچۆڵەیەك لە ژوورەوە وتی: گەر نەعلێکت بە دوو دانق(دانقێك شەش یەکی درهەمێکە) بکڕیبایە ئەوا ناوی "حافی-پێپەتی"ت لێ دەکرایەوە.

**ئەبو عەبدوڵای کوڕی جەلا دەڵێت: "ذا النون"**م بینی گوزارە و دەربڕینی هەبوو، سەهلم بینی ئاماژەی هەبوو، بیشری حافیم بینی خاوەنی وەرع بوو.

پێیوترا مەیلت بە لای کامیاندایە؟ وتی: بیشری حافی مامۆستامانە.

**وتراوە:** چەندین ساڵ حەزی بە پاقلە بوو، بەڵام نەیخوارد، لەدوای مردنی لە خەوندا بینرا و پێیوترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: لێمخۆش بوو، فەرمووی: بخۆ، ئەی ئەو کەسەی خۆت دەگرتەوە لە خواردن، بخۆرەوە ئەی ئەو کەسەی خۆت دەگرتەوە لە خواردنەوە.

**بیشری حافی دەڵێت:** چل ساڵە حەزم لە برژاوە نرخێکی پاك(پارەیە پاك)م بۆ کڕینی بەدەستنەهاتووە.

**هەروەها دەڵێت:** حەڵاڵی رووت دەگمەنە.

لە خەوندا بیشر بینرا و پێیوترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لێمخۆش بوو و نیوەی بەهەشتی بۆ ئاوەڵا کردم و پێی فەرمووم: ئەی بیشر، گەر لەسەر پشکۆ سوژدەم بۆ ببەی شوکری ئەو خۆشەویستییەت نەکردووە لە دڵی خەڵکیدا بەرانبەر بە تۆ دامناوە.

**هەروەها دەڵێت:** پیاوێك پێیخۆش بێت خەڵکی بیناسن تامی شیرینی دواڕۆژی نەکردووە.

# ٧. حارس موحاسبی

**أبو عبدالله الحارث بن أسد المحاسبي**، له سەردەمی خۆیدا لەڕووی زانست و وەرع و مامەڵە و حاڵەوە هاوشێوەی نەبووە.

به ئەسڵ خەڵکی شاری بەصرەیە، ساڵی ٢٤٣ی کۆچی له بەغداد کۆچی دوایی کردووه.

**وتراوه** له باوکییەوه حەفتا هەزار درهەمی بۆ بەجێما، هیچی وەرنەگرت، وتراوه: چونکه باوکی له قەدەرییەکان بوو، بۆیه بە وەرعی دەبینی هیچ لە میراتەکەی وەرنەگرێت، دەڵێت: **لە پێغەمبەری خوداوه**(ﷺ) **ریوایەت کراوه:** ((ئەهلی دوو میللەت(دوو ئایین) میرات له یەکتری نابەن)

**محەمەدی کوڕی مەسروق دەڵێت:** حارسی کوڕی ئەسەدی موحاسبی مرد ئاتاج بوو به درهەمێك، له کاتێکدا له باوکییەوه ماڵ و سامان و زەوی و زاری بۆ بەجێمابوو و هیچی وەرنەگرت.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق دەڵێت:** حاریسی موحاسبی کاتێك دەستی بۆ خواردنێك درێژ دەکرد گەر شوبهەی تێدابوایە رەگێك له پەنجەیدا لێیدەدا و رێگری دەکرد له خواردنی.

**عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** پێنج لە گەورەکانمان بکەن بە پێشەوای خۆتان و ئەوانیتر رادەستی حاڵی خۆیان بکەن:

حاریسی کوڕی ئەسەدی موحاسیبی و جونەیدی کوڕی محەمەد، و ئەبو محەمەدی روەیم و ئەبو عەباسی کوڕی عەتا و عەمری کوڕی عوسمانی مەکی، چونکه زانست و حەقیقەتیان له خۆیاندا کۆکردبووەوه.

**حاریسی موحاسیی دەڵێت:** هەر کەس ناوەوەی به چاودێری و ئیخلاص بێته راسته خودا دەرەوەی به تێکۆشان و شوێنکەوتنی سوننەت دەڕازێنێتەوه.

**جونەید دەڵێت:** حاریسی موحاسیبی به لامدا تێپەڕی ئەسەری برسێتیم به روخسارییەوه بینی، بۆیه وتم: مامه گیان وەره ژوورەوه و شتێك لەلامان بخۆ؟

وتی: باشە، هاتە ژوورەوە و داوای شتێکم لە خانەوادەکەم کرد تاکو پێشکەشی بکەم، لەماڵمان خواردنێك هەبوو کە لە ئاهانگی ژنگواستنەوەوە هاتبوو، هێنایان و پێشکەشمان کرد، پارووییەکی خستە ناو دەمی و زۆر لە دەمیدا هاتوچۆی پێ کرد، پاشان هەستا و ڕۆیشت لە چاڵێك تفی کردەوە و ڕۆیشت.

پاش ماوەیەك بینیمەوە و لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد، ئەویش وتی:

من برسیم بوو، ویستم بەو خواردنەم لەلات دڵت خۆش بکەم، بەڵام لە نێوان من و خودادا نیشانەیەك هەیە تاکو پارووییەك نەخۆم شوبهەی تێدا بێت، بۆیە نەمتوانی قووتی بدەم، ئەو خواردنەت لە کوێ هێنا بوو؟

وتم: لە ماڵێکی نزیکمانەوە کە زەماوەندیان هەبوو بۆمان هاتبوو، پاشان وتم: ئەمڕۆ دێیە ژوورەوە؟

وتی: بەڵێ، پارچەیە نانی وشکم پێدا کە هی خۆمان بوو، ئەویش خواردی و وتی: گەر شتێکت بە هەژارێك بەخشی نموونەی ئەمەی پێ بدە.

# ٨. داودی طائي

**أبو سليمان داود بن نصـير الطـائي**، کەسـێکی خـاوەن شانوشـکۆ بـوو، یوسـفی کـوڕی ئەسبات دەڵێت: داودی تائی بیست دیناری بە میرات بۆ بەجێما لە بیست ساڵدا خواردی.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لـێ بێـت) دەڵێـت**: هـۆی زوهـدی داودی تائی: ڕۆژێك بە بەغدادا تێدەپەڕی، خەڵکێکی زۆری بینی کە "داود"یـان پـاڵ دەنا و لەبەردەم خۆیان لایان دەدا تاکو بگەن بە **"حمید الطوسـي"**، داود لایکـردەوە و حەمیدی بینی و بە خۆی وت: ئۆف لە دونیایەك، حەمید تیایدا پێش من بکەوێت.

بۆیە لە ماڵەکەی خۆیدا گۆشەنشین بوو و چووە ناو تێکۆشان و عیبادەتەوە.

لە بەغدا لە هەنـدێ خـەڵکی هـەژارم بیسـت دەیـانوت: هـۆی زوهدەکـەی بـۆ ئـەوە دەگێڕێتەوە، گوێی لە مردوولاوێنێك بوو دەیوت:

**بأي خديك تبدي البلى وأي عينيك إذا سالا)** (لەسـەر کـام ڕوومـەتت ڕزیـن دەسـت پێدەکات و کامە چاوت کاتێك فرمێسك دەڕێژن)

**وتراویشە**: هـۆی زوهدەکـەی ئـەوە بـوو لـەلای ئـەبو حەنیفـە(خوا لێـی ڕازی بێـت) دادەنیشت، ڕۆژێك ئەبو حەنیفە پێیوت: ئەی بـاوکی سـولەیمان ئامڕاز(زانسـت) ئێمـە توندوتۆڵمان کردووە، داود وتی: ئەی چی ماوەتەوە؟ ئەبو حەنیفە وتی: کارپێکردنی.

**داود دەڵێ**: نەفسم بۆ گۆشەگیری لەگەڵم کێبەکێی دەکرد، بۆیە بە نەفسی خۆم وت: لەگەڵیان دابنیشە و قسە لە هیچ شتێك مەکە.

دەڵێت: یەك ساڵ لەگەڵیان دانیشتم قسەم لەسەر هیچ بابەتێك نەکرد، هەندێ بابەت بەسەرمدا تێدەپەڕی من بە قەدەر تینوویەك بۆ ئـاوی سـارد حـەزم لـە قسـەکردن بـوو بەڵام قسەم لەسەر نەدەکرد. پاشان کارەکەی بەوە گەیشت کە پێیگەیشت.

**هەروەها وتـراوە** داود لای "جنیـد الحجـام" کەڵەشـاخی گـرت، و دینـارێکی دا بـە کەڵەشاخگرەکە، پێیوترا: ئەو کارە ئیسرافە، ئەویش وتی: عیبادەت بۆ کەسێك نییـە جوامێری و پیاوەتی لێ نەوەشێتەوە.

**شـــەوان هەڵدەســتا و دەیــوت:** خودایــە پــەژارە بــۆ تــۆ هــەموو پــەژارەی دونیــای پەکخستووە و ناهێڵێت لەناو جێگەدا رابکشێم.

کەنیزەکەکەی بە داودی دەوت: حەزت لە نان نییە؟

لـە وەڵامـدا دەیـوت: لـە نێـوان جـوینی نانێـك و خـواردنی پەلکـە نـانی تریتکـراو خوێندنـەوەی پـەنجا ئایـەت هەیە(واتـە جـوینی نانەکـە کـاتی زۆر دەبـات و تریتەکـە خواردنی ئاسانە).

کاتێك داود کۆچیدوایی کرد هەندێ لە چاکان لە خەوندا بینییان هەڵدەهات، پێیـان وت: چیتە؟

وتی: ئێستا لە بەندیخانە رزگارم بوو.

پیاوەکە لە خەو بەئاگا هات و گوێی لە هـاوار و گریـانی خـەڵکی بـوو و دەیـانوت: داود مردووە.

**پیاوێك پێیوت:** وەسێتم بۆ بکە، وتی: سەربازەکانی مردن چاوەڕوانی تۆن.

هەندێك کەس چوونە ژوورەوە بۆ لای، جەوەندەیە ئاویان بینی خـۆری لـێ کـەوتبوو، وتیان: بۆ نەیبەینە بەر ئەو سێبەرە؟

وتی: کاتێك دامنا خۆرەتاو نەبوو، من شەرم دەکەم خودا لە کارێکدا ببینێت بەشی نەفسی خۆمی تێدا بێت.

**کەسێك چــووە ژوورەوە بــۆ لای:** زۆر ســەرنجی داودی دا، ئــەویش پێیــوت: دەزانــی پیاوانی ئەم رێگەیە زیادە سەرنجدانیان لا پەسەند نەبوو وەك چۆن زیادە قسەکردنیان لا پەسەند نەبوو؟

**ئەبو رەبیعی واسیتی دەڵێت:** وتم بە داودی تائی وەسێتم بۆ بکە.

ئەویش وتی: لە دونیا بەڕۆژوو بە و رۆژووشکاندنت با مردن بێت، لە خەڵکی هەڵبێ وەك چۆن لە دڕندە هەڵدێیت.

# ٩. شەقیقی بەڵخی

**أبو علي شقيق بن إبراهيم البلخي**، لە گەورە پیاوانی خوراسان بوو، قسـەی تایبـەتی لەسەر تەوەکول هەیە، مامۆستای **"حاتم الأصم"** بووە.

**وتراوە هۆی تەوبەکەی:** کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، بۆ کاری بازرگانی رووی لـە زەوی تورکان کرد، ئەو هێشتا تـازە لاوێـك بـوو، چـووە بتخانەیـەك، لـەوێ زەیـەوانی بتخانەکەی بینی، سەر و ریشی تاشی بوو و پۆشاکێکی سووری لەبەرکردبوو، شـەقیق وتی بە زەیەوانەکە: تۆ خالقێکی زیندووت هەیە، زانا و بەتوانایـە و بیپەرسـتە.. ئـەم بتانە مەپەرستە کە زیان و قازانج ناگەیەنن.

ئەویش وتی: گەر بەو جۆرەیە کەوابوو خودا دەتوانێت لە وڵاتی خۆت رۆزیـت بـدات ئیتر بۆچی خۆت ماندوو دەکەی و بۆ بازرگانی رووت لێرە کردووە؟

شەقیق لەو قسەیەوە بەئاگا هات و رێگەی زوهدی گرتەبەر.

**وترایشە هۆی زوهدەکەی:** بەندەیەکی بـینی لـە سـاڵێکی گرانیـدا یـاری دەکـرد و خۆشی دەردەبڕی و خـەڵکیش گرنگیـان پێـدەدا و سـەرنجیان دەدا، شـەقیق وتـی: ئـەم هەموو چالاکییە چییە لە تۆدا؟ نابینی خەڵکی تووشی سیاساڵی و گرانی بوون؟

بەندەکە وتی: جا مـن چـیمە لـەوە، دێیـەك مـوڵکی گەورەکـەی منـە و هـەر کـات بمانەوێت رووی لێ دەکەین و هەر شتێکمان پێویسـت بێـت لـەوێ دەسـتمان دەکـەوێت، شەقیق بەم قسە بەئاگا هات و هۆشـی کـردەوە، گـەر گـەورەی ئـەو بەندەیـە دێیـەکی بەدەست بێت و کەسێکی دروستکراوی هـەژاریش بێـت، پاشـان ئـەو بۆخـۆی خـاوەنی رۆزی خۆی نییـە، ئـیتر چـۆن دەبێـت موسـڵمان خـەمی رۆزییەکـەی دایبگرێتـەوە لـە کاتێکدا گەورەکەی کە خودایە رۆزیدەری راستەقینەیە؟!

**ئەحمەدی کوڕی محەمەدی بوخاری دەڵێت: "حاتم الأصـم"** وتـی: شـەقیق پیـاوێکی دەوڵەمەند بوو، کاری هەرزانە(گەنجانە)ی ئەنجام دەدا و تێکەڵ بە گـەنجان دەبـوو، لـەو

کاتـەدا عـەلی کـوڕی عیسـای کـوڕی ماهـان ئـەمیری بـەڵخ بـوو، زۆر سـەگی راوی خۆشدەویست، یەکێك لە سەگەکانی بزر کـرد، هـەواڵیان بـە ئـەمیر دا لای پیاوێکـە، پیاوەکە لە پەنای شەقیقدا دەژیا، ئەمیر ناردی بەدوای پیاوەکەدا و ئەویش لـە ترسـان هەڵهات و خۆی خستە ماڵ شەقیق و پەنای پێگرت، شەقیق چوو بۆ لای ئەمیر و وتی: واز لەو پیاوە بهێنـە سـەگەکەت لای منـە و پـاش سـێ رۆژی تـر بـۆت دەگێڕمـەوە، ئەوانیش دەستیان لە پیاوەکە هەڵگرت، شەقیق رۆیشـت بـەلای بەڵێنەکـەی خۆیـەوە، کاتێك رۆژی سێیەم هات یەکێك لە دۆستەکانی شەقیق کە بە سەفەرێك شاری بەڵخی بەجێهێڵابوو لەسەر رێگـەی گەڕانـەوەی لـە سـەفەر سـەگێك دەبینێـت ملوانکـەی لـە ملدایە، سەگەکە دەگرێت و دەڵێت دەیبـەم و هەدیـەی شـەقیقی دەکـەم، چـونکە ئـەو کاری راوکردنی پێخۆشە، سەگەکەی بۆ هێنا، شـەقیق بـینی سـەگەکەی ئـەمیرە، زۆر بەوە دڵخۆش بوو، سەگەکەی برد و رادەستی ئـەمیری کـردەوە و لـەو دەسـتەبەرکردنە رزگاری بوو، لەو رووداوەوە خودا ئاگاهی پێبەخشی، و تەوبـەی کـرد و بـۆ لای خـودا گەڕایەوە و رێگەی زوهدی گرتەبەر.

**"حاتم الأصم" دەگێڕێتەوە و دەڵێت:** لەگەڵ شـەقیق لـە سـوپایەکدا دژ بـە تورکـان دەجەنگاین، ئەو رۆژە رۆژێك بوو سەری تێداپەڕی و تـیر و رمـەکانی تێـدا دەبـاری، و شمشێر گەردنی دەپەڕاند، شەقیق پێی وتم: ئەی حاتەم، ئەمڕۆ خۆت چۆن دەبینی؟ ئایا وەك شەوی زاوایی لات خۆش و شیرینە؟

وتم: نە، سوێند بە خودا، وتی: بەڵام سوێند بـە خـودا مـن ئـەمڕۆ لام هـەروەك ئـەو شەوە خۆش و شیرینە، حاتەم دەڵێ: پاشان شەقیق قەڵغانەکەی نایـە ژێـر سـەری و لـە نێوان دوو سوپاکەدا خەوی لێکەوت تا گوێم لە پرخەکردنی بوو.

**شەقیق دەڵێ:** گەر دەتەوێ پیاوێك بناسیت، تەماشای ئەوە بکە خودا بەڵێنی لەسەر داوە و ئەوەی خەڵکی بەڵێنیان لەسەر داوە.

**هەروەها دەڵێت:** تەقوای پیاوێك لە سێ شتدا دەردەکـەوێت: وەرگـرتن و پێنـەدان و قسەکردنی.

# ١٠. ئەبو یەزیدی بوستامی

**أبو يزيد طيفور بن عيسى البسطامي**، باپیری پیاوێکی مەجووسی بوو، پاشان موسڵمان بوو.

سێ برابوون: ئادەم و تەیفوور و عەلی، هەر سێکیان زاهید و عابید بوون.

وتراوە: ٢٦١ی کۆچی مردووە، وتراویشە: ٢٣٤ی کۆچی مردووە.

**حەسەنی کوڕی عەلی دەڵێت:** پرسیار لە ئەبو یەزید کرا: بە چی ئەم مەعریفەت بەدەستهێنا؟

وتی: بە سکێکی برسی و لاشەیەکی بێ پۆشاك.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** سی ساڵ خەریکی موجاهەدە بووم، هیچ شتێکم نەبینییەوە لە زانست(شەریعەت) و شوێنکەوتنی زانست سەخت و دژوارتر بێت، گەر جیاوازی زانایان نەبوایە دەمامەوە(واتە لەناو موجادەدا دەمامەوە)، جیاوازی زانایان ڕەحمەتە، تەنها لە یەکلابوونەوەی یەکتاپەرستیدا نەبێت.

**وتراوە:** ئەبو یەزید لە دونیا دەرنەچوو تا هەموو قورئانی بە دڵ لەبەرکرد.

**پیاوێك دەڵێت: ئەبو یەزید پێی وتم:** هەستە با بچین بۆ لای ئەو پیاوەی ویلایەتی(وەلیبوونی) خۆی ڕاگەیاندووە، کەسەکە پیاوێکی بەناوبانگی زاهید بوو خەڵکی ڕوویان لێ دەکرد، هەستاین و چووین بۆ لای، کاتێك لەماڵەوە دەرچووین و ڕوومان لە مزگەوت کرد ئەو پیاوەمان بینی ڕوو بە قیبلە لاقەکانی ڕاکێشا بوو، ئەبو یەزید پیاوەکەی بەجێهێڵا و پشتی تێکرد و سەلامی لێ نەکرد و وتی: ئەو پیاوە گەر خۆی بە ئەدەبێك لە ئەدەبەکانی پێغەمبەر(ﷺ) نەڕازاندبێتەوە لە کوێ ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکات جێی متمانەیە؟!

ئەبو یەزید دەڵێت: خەریك بوو داوا لە خودا بکەم خەمی دووشتم لە کۆڵ بکاتەوە: خواردن و ئافرەت، پاشان بە خۆمم وت: ئایا دروستە شتێك لە خودا داوا بکەم

پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە خودا نەکردبێت؟ بۆیە داوام لێ نەکرد، پاشان خودا(ﷻ) حەزی ئافرەتی تێدا نەهێڵام، تا وام لێهاتووە ئافرەتێك رووم لێ بکات یان دیوارێك گوێی پێ نادەم.

**حەسەنی کوڕی عەلی دەڵێ:** گوێم لە مامم بوو دەیوت: باوکم بۆی گێڕامەوە و دەیوت: پرسیارم لە ئەبو یەزید کرد دەربارەی سەرەتاکانی و گرتنەبەری رێگەی زوهد، ئەویش وتی: زوهد مەنزیلە نییە، وتم: بۆچی؟

وتی: لەبەر ئەوەی من سێ رۆژ لە زوهددا بووم.. کاتێك پێمنایە رۆژی چوارەم لێی هاتمە دەرەوە: رۆژی یەکەم: زوهدم کرد لە دونیا و ئەوەی لە دونیادایە، رۆژی دووەم: زوهدم کرد لە دوارۆژ و ئەوەی تێیدایە، رۆژی سێیەم: زوهدم کرد لە هەموو شتێك جگە لە خودا، کاتێك پێمنایە رۆژی چوارەم تەنها خودام بۆ مابوویەوە، تێگەیشتم و گوێم لێ بوو دەنگێك دەیوت: ئەی ئەبا یەزید لەگەڵمان بەرگە ناگریت، وتم: هەر ئەوەم دەوێت، گوێم لێ بوو کەسێك دەیوت: بینیتەوە، بینیتەوە.

**وترا بە ئەبو یەزید:** چەندە لە پێناوی خودادا ئازارت چەشتووە؟ وتی: وەسف ناکرێت.

**وترا:** ئاسانترین شتێك نەفست رووبەڕووی بووبێتەوە؟ وتی: ئەمەیان باشە، بانگی نەفسی خۆم کرد بۆ گوێڕایەڵی وەڵامی نەدامەوە، بۆیە ساڵێك ئاوم لێ قەدەغە کرد.

ئەبو یەزید دەڵێت: بۆ سی ساڵ دەچێت من نوێژ دەکەم و سەیر کردنم بۆ نەفسی خۆم وەك سەیر کردنی کەسێکی مەجووسی وایە دەیەوێت حەز و ئارەزووەکانی کۆتا پێ بهێنێت.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** گەر پیاوێکتان بینی ئەوەندە کەراماتی هەبوو تا بە هەوادا بەرز دەبوویەوە و تێدەپەڕی بەو کەسە فریو مەخۆن تا دەزانن حاڵ و باری چۆنە لە ئەمر و نەهی و پارێزگاری لە سنوورەکان و جێبەجێکردنی شەریعەتدا.

**دەگێڕنەوە شەوێك ئەبو یەزید** دەچێتە سەنگەرەکانی جیهادەوە تاکو یادی خودا بکات لەو سنوورانەوە، هەتا بەیانی بەبێ یادکردن مایەوە، لەو بارەوە پرسیاری لێکرا، وتی: قسەیەکی کاتی منداڵیم هاتەوە یاد کە بە زمانمدا گوزەری کرد، بۆیە نەمویست یادی خودا بەسەر ئەو زمانەدا(دوای ئەو وشەیە) جاری ببێت.

# ١١. سەهلی توستەری

**أبو محمد سهل بن عبدالله التستري**، یەکێکە لە ئیمامانی ئەم دەستەیە، لە سەردەمی خۆیدا لە مامەڵە و وەرعدا نموونەی نەبووە.

خاوەنی کەرامات بووە، ئەو ساڵەی رۆیشت بۆ حەج بە **"ذا النون"**ی میسری گەیشتووە.

وەك وتراوە: (٢٨٣ ك) کۆچی دوایی کردووە، وتراویشە (٢٧٣ ك) کۆچی دوایی کردووە.

**سەهل دەڵێت:** منداڵێکی سێ ساڵان بووم، شەوان هەڵدەستام بۆ ئەوەی تەماشای خاڵم بکەم(**محمد** بن سوار)، ئەو شەوان هەڵدەستا، هەندێ جار پێی دەوتم: سەهل بڕۆ بنوو، دڵم پێتەوە سەرقاڵە.

**عەمری کوڕی واصلی بەصری دەڵێت:** سەهل دەیوت: رۆژێك خاڵم پێی وتم: ئایا یادی ئەو خودایە ناکەی کە دروستی کردووی؟

وتم: چۆن یادی خودا بکەم؟ وتی: کاتێك دەچییە ناو جێگەی نووستن بەدڵ-بەبێ ئەوەی زمانت بجووڵێنی- سێ جار بڵێ: خودا لەگەڵ منە، خودا تەماشام دەکات، خودا لەسەرم شاهیدە.

ئەوەم سێ شەو ئەنجامدا و پاشان خاڵم ئاگادار کرد، پێی وتم: هەموو شەوێك حەوت جار ئەوە بڵێ، ئەوەم وت و خاڵم ئاگادار کردەوە، وتی: هەموو شەوێك یازدە جار، ئەوەم ئەنجامدا و شیرینی ئەو یادە لە دڵمدا سەریهەڵدا.

پاش ئەوەی ساڵێك تێپەڕی خاڵم پێی وتم: ئەوەی فێرم کردی بیپارێزە و بەردەوام بە لەسەری تا دەچییە ناو گۆڕ، چونکە ئەو یادە لە دونیا و دوارۆژدا سوودت پێ دەگەیەنێت.

چەندین ساڵە لەسەر ئەو یادەم هەست بە شیرینییەکەی دەکەم لە ناخ و پەنهانمدا.

پاشان خاڵم ڕۆژێك پێی وتم: ئەی سەهل، هەر کەس خودای لەگەڵ بێت و تەماشای بکات و شاهید بێت لەسەری ئایا لە خودا یاخی دەبێت؟ ئاگات لە گوناه و یاخیبوون بێت.

**سەهل دەڵێت:** من تەنهایی و گۆشەگیریم هەڵبژارد بوو، بەڵام ناردمیان بۆ قورئان خوێندن، منیش وتم: دەترسم ئەم حاڵ و لێبڕانەم نەمێنێت، بۆیە لەسەر مامۆستاکە بە مەرجیان گرت تاوێك بچمە لای و قورئان فێر ببم و پاشان بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.

ڕۆیشتم بۆ خوێندنی قورئان و هەموو قورئانم لەبەر کرد لەو کاتەدا شەش ساڵ یان حەوت ساڵ تەمەنم بوو، هەموو ڕۆژەکان بەڕۆژوو بووم، خواردنم نانی جۆ بوو، تا تەمەنم گەیشتە دوازدە ساڵان، بابەتێکم بۆ هاتە پێش کە ئەو کات تەمەنم گەیشتبووە سیازدە ساڵ، داوام لە خانەوادەکەم کرد بمنێرن بۆ بەصرە تا پرسیاری ئەو بابەتە بکەم، هاتم بۆ بەصرە و پرسیاری زانایانم کرد، هیچ کامیان چارەسەری پرسیارەکەی منیان لەلا نەبوو!!

لە بەصرە بەرەو عەبادان بەڕێکەوتم و ڕۆیشتم بۆ لای پیاوێك ناوی: **"أبي حبيب حمزة بن عبدالله العباداني"** بوو، پرسیارەکەم لێ کرد و وەڵامی دامەوە، ماوەیەك لەلای مامەوە و سوودم لە قسەکانی بینی و بە ئەدەبی جوانی خۆم ڕازاندەوە، پاشان گەڕامەوە بۆ "تستر"، کارم دەکرد بۆ ئەوەی چەند درهەمێك پەیدا بکەم و مەنێك جۆم پێ دەکڕی و دەمهاڕی و دەیانکردە نان بەبێ خوێ و پێخۆر و تەنها پارشێوم پێ دەکردەوە، واتە پارشێوان ڕۆژووم پێ دەشکاند، بۆیە درهەمێك بەشی ساڵێکی دەکردم.

پاشان بڕیارم دا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم و شەوی چوارەم ژەمێك خواردن بخۆم، پاشان پێنج ڕۆژ، پاشان حەوت ڕۆژ، پاشان بیست و پێنج ڕۆژ، لەسەر ئەو بارە بیست ساڵ مامەوە، پاشان چەندین ساڵ بەسەر زەویدا دەستم بەگەڕان کرد، پاشان گەڕامەوە بۆ "تستر" و هەموو شەوەکەی بەئاگا دەبووم(واتە شەوەکەی بە نوێژ و یادی خودا زیندوو دەکردەوە)

سەهل دەڵێت: هەر کارێك بەبێ شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بەندە ئەنجامی بدات گوێڕایەڵی بێت یان یاخیبوون ئەوە بریتییە لە حەزی نەفس، هەر کارێك کەسەکە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامی بدات بریتییە لە سزا بۆ سەر نەفس.

# ١٢. ئەبو سولەیمانی دارانی

**أبو سليمان عبدالرحمن بن عطية الداراني**، "داران" گوندێکە لە گوندەکانی دیمەشـق، ئەبو سولەیمان ساڵی ٢١٥ك کۆچی دوایی کردووە.

**"أحمد بن أبي الحواري" دەڵێت:** گوێم لە ئەبو سولەیمان بوو دەیوت: هـەر کـەس لـە رۆژەکەیدا باش ئەنجام بدات شەوەکەی پاداشت دەدرێتەوە، هەر کەسیش لە شەوەکەیدا باش ئەنجام بدات رۆژەکەی پاداشت دەدرێتەوە، هـەر کـەس لـە وازهێنـان لـە حـەزێك دەستبەردار ببێت خودا ئەو حەزە لە دڵی دەردەکات، خودا بەخشندەترە لـەوەی دڵێـك ئازاربدات بە حەزێك لە پێناوی ئەودا وازی لێ هێنراوە.

**هەروەها دەڵێت:** گـەر دونیـا لـە دڵێکـدا نیشـتەجێ بـوو دوارِۆژ کـۆچ و بـاری لـێ دەکات.

**جونەید دەڵێت:** ئـەبو سـولەیمان دەڵێـت: هەنـدێ جـار چـەندین رۆژ حیکمـەتێك لـە حیکمەتی ئەم دەستەیە(ئەهلی زوهد) دەکەوێتە ناو دڵمەوە، بەڵام لێی قبووڵ ناکەم بە دوو شاهیدی راسترِەو نەبێت: قورئان و فەرموودە.

**هەروەها دەڵێت:** باشترین کار و کردەوە سەرپێچییە لە ئارەزوی دەروون.

**هەروەها دەڵێت:** بۆ هەموو شتێك نیشانە هەیـە، نیشـانەی قبـووڵ نـەبوونی کـار و کردەوەکان وازهێنانە لە گریان.

**هەروەها دەڵێت:** هەمـوو شتێك ژەنگی تایبەت بـە خـۆی هەیـە، ژەنگـی نـووری دڵ پرِکردنی سکە لە خواردن.

**هەروەها دەڵێت:** هەر شتێك لە خودا خەریکت بکات لە خانەوادە و ماڵ و سامان و منداڵ ئەوا لەسەر تۆ شوومییە.

**هەروەها دەڵێت:** شەوێکی سـارد لـە میحرابـدا بـووم، سـەرماکە نیگـەرانی کـردم، یەکێك لە دەستەکانم لـە سـەرمادا شـاریییەوە و ئـەویتریانم بـەرز کردبـووەوە و دوعـام

دەكرد، چاوەكانم زاڵ بوون بەسەرمدا و گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت: ئەی ئەبو سولەیمان ئەو دەستەی بە دەرەوە بوو بەشێكمان تێدا دانا، گەر ئەویتریش بەدەرەوە بوایە بەشی خۆیمان تێدەكرد، بۆیە سوێندم خوارد لەسەر خۆم هەمیشە لە دوعاكانمدا هەردوو دەستم بەرزبكەمەوە، دونیا سەرما بێت یان گەرما.

**هەروەها دەڵێت:** لەو ویردەی بڕیارم دابوو بیخوێنم خەوم لێ كەوت، لە خەوندا ئافرەتێكی حۆریم بینی پێی وتم: دەخەویت و من پێنج سەد ساڵە بۆ تۆ ئامادەكراوم!!

"**أحمد بن أبي الحواري**" دەڵێت: رۆژێك چووم بۆ لای ئەبو سولەیمان بینیم دەگری، وتم: بۆ دەگریت؟ وتی: ئەحمەد، بۆ نەگریم؟! كاتێك شەو دادێت و چاوەكان دەچنە خەو و هەر خۆشەویستێك دەچێت بە لای خۆشەویستی خۆیەوە و ئەهلی خۆشەویستی پێیەكانیان درز دەبات و فرمێسكەكانیان بە گۆنایاندا دێنە خوارەوە و تنۆك تنۆك دادەبارێنە سەر زەوی، ئا لەو كاتەدا خودا(ﷻ) تەماشا دەكات و بانگ لە جیبریل(ﷺ) دەكات: ئەی جبریل ئەوانە دەبینم چێژ لە كەلامەكەی من وەردەگرن و بە یادی من ئارامیان بۆ دێت، لە پەنهان و تەنهاییاندا تەماشایان دەكەم، گوێم لە ناڵە و گریانیانە.. ئەی جبریل بۆ بانگیان لێ ناكەی و پێیان بڵێی ئەو گریانەتان لە چییە و بۆ دەگرین؟! ئایا خۆشەویستێك ئازاری خۆشەویستانی خۆی داوە؟ كەی بۆ من جوان و شیاوە دەستەیەك سزا بدەم كاتێك شەو دادێت هەڵدەستن و لێم دەپاڕێنەوە و تكام لێ دەكەن، سوێندبێت بە خۆم: ئەوانە لە رۆژی دواییدا كاتێك دێنەوە بۆ لام رووی بەخشندەیی خۆمیان بۆ دەردەخەم تا تەماشام بكەن و تەماشایان بكەم.

# ١٣. حاتم الأصم

**أبو عبدالرحمن حاتم بن علوان**، پێشی دەوترێت **"حاتم بن يوسف الأصم"** لـە گـەورە پیاوانی خوراسانە، قوتابی شەقیقی بەڵخی بوو، مامۆستای **"أحمد بن خضرويه"** بوو، وتراوە حاتەم کەڕ(**الأصم**) نەبووە، بەڵکو جارێك وای نیشانداوە کەسێکی کەڕە و هیچ نابیستێت، بۆیە بەو ناوە ناونراوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** ئافرەتێك هات بۆ لای حاتەم پرسیارێکی لێکرد، وا ڕێکـەوت لـەو کاتـەدا ئافرەتەکـە بایەکی لێ بەربوو و هەستی بە شەرمەزاری کرد.

حاتەم وتـی: دەنـگ بـەرز بکەرەوە(واتـە گـوێم لـە قسـەکانت نییـە)، وای نیشـاندا کەسێکی کەڕە، ئافرەتەکەش بەوە دڵخۆش بوو و وتـی: دەنگەکـەی نەبیسـتووە، بۆیـە ناوی کەڕ(**الأصم**) بەسەر حاتەمدا بڕا.

**حاتەم دەڵێت:** هەموو بەیانییەك شەیتان پێم دەڵێت: چی دەخۆی و چی دەپۆشـی؟ و لە کوێ نیشتەجێ دەبیت؟

منیش پێی دەڵێم: مردن دەخۆم، کفن دەپۆشم، و لە گۆڕدا نیشتەجێ دەبم.

**بە حاتەم وترا:** حەزت لە هیچ نییە؟

وتی: حەزم بە سەلامەتی ڕۆژێکە تا ئێـوارە، وتـرا: بۆچـی هـەموو ڕۆژەکـان بـۆ تـۆ سەلامەتی و عافیەت نین؟

وتی: سەلامەتی و عافیەتم ئەوەیە ئەو ڕۆژە گوناه نەکەم.

**لە حاتەمەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە غەزایەکدا بووم، پیاوێك گرتمی و پاڵیخسـتم بۆ سەربڕین، دڵم بە هیچ شـێوەیەك بـاکێکی نـەبوو، بـەڵکو سـەرنجم دەدا خـودا چـیم لەگەڵ دەکات، لە کاتێکدا بەدوای چەقۆکەیدا دەگەڕا تیرێـك لـە شـوێنێکی نادیـارەوە هات و کەسەکەی کوشت و کەوت بە لادا و منیش هەستامەوە.

**حاتەم دەڵێت:** هەرکەس دێتە ناو ئەم مەزهەبی ئێمەوە با چوار خەسڵەتی مردن بەسەر نەفسیدا بهێنێت:

١. **مردنێکی سپی:** کە بریتییە لە برسێتی.

٢. **مردنێکی رەش:** کە بریتییە لە هەڵگرتنی ئازاری خەڵکی.

٣. **مردنێکی سوور:** ئەوەش بریتییە لە کار و کردەوەی پوخت و پاڵفتەکراو لە حەز و ئارەزوو بۆ خودا.

٤. **مردنێکی سەوز:** ئەوەش پینەکردنی پۆشاکەکانە پینە لەسەر پینە.

# ١٤. یەحیای کوڕی مەعاز

**أبو زكريا يحيى بن معاذ الرازي الواعظ**، ناوازەی سەردەمی خۆی بووە، لە رجادا قسەی تایبەت و لە مەعریفەدا وتەی بەناوبانگی هەیە، رێگەی چوون بۆ بەڵخی گرتەبەر و ماوەیەك تیایدا ژیاوە، پاشان گەڕایەوە بۆ نیسابوور و ساڵی ٢٥٨ك تیایدا کۆچی دوایی کردووە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** چۆن کەسێك وەرعی نەبێت دەبێت بە زاهید؟ سەرەتا لەو شتەی هی تۆ نییە وەرعت هەبێت پاشان زوهد بکە لەو شتەی هی تۆیە.

**هەروەها دەڵێت:** برسێتی تەوبەکاران ئەزموونە، برسێتی زاهیدان رامهێنانی دەروونە، برسێتی صدیقان رێز و خەڵات و پایەیە.

**هەروەها دەڵێت:** تیاچوون(لەدەستچوون) لە مردن دژوارترە، چونکە تیاچوون دابڕانە لە حەق و مردن دابڕانە لە خەڵك.

**هەروەها دەڵێت:** زوهد(واتە نیشانەکانی زوهد) سێ شتە: کەمی(کەمی دونیا)، و تەنهایی و برسێتی.

**هەروەها دەڵێت:** گەورەترین قازانجی تۆ ئەوەیە نەفست بە شتێکەوە خەریك بکەیت کە پێی لەپێشترە.

**وتراوە:** یەحیای کوڕی مەعاز لە بەڵخ دەربارەی فەزڵی دەوڵەمەندی بەسەر هەژارییدا قسەی کرد و سی هەزار درهەمی پێدرا، هەندێ لە گەورە پیاوانی بەڵخ وتیان: خودا بەرەکەت نەخاتە ناو ئەو ماڵ و سامانەوە، یەحیا لە بەڵخ بەرەو نیسابوور کەوتەڕێ و لە رێگە دز رێگەیان پێگرت و پارەکەیان لێ وەرگرت..

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس لە نهێنی و پەنهاندا ناپاکی لە خودا بکات لە ئاشکرادا پەردەی لەسەر لادەدات و رسوای دەکات.

**هەروەها دەڵێت:** تەزکیەی خەڵکی خراپ بۆ تۆ ناشیرینی و ناتەواوییە بۆ تۆ، خۆشەویستیان بۆت نەنگییە لەسەر تۆ، تا وات لێ دێت کەسێك پێت ئاتاج بێت سووك تەماشای دەکەیت.

# ١٥. ئەحمەدی کوڕی خەزرەوەی

**أبو حامد أحمد بن خضروية البلخي**، لە گەورە پیاوانی خوراسان بـوو، هـاوەڵی ئـەبو تورابی نەخشەبی کردووە.

سەردانی نیسابووری کردووە و چووە بۆ لای ئەبو حەفص، پاشان رۆیشت بـۆ بوسـتام بۆ سەردانی ئەبو یەزیدی بوستامی کرد، کەسێکی مەرد و جوامێر بووە.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** کەسم نەبینیوە وەك ئەحمەدی خەزرەوەی خاوەن لێـبڕان بێـت و حاڵی راستگۆیانەی هەبێت.

**ئەبو یەزید دەیوت:** مامۆستامان ئەحمەد.

**محەمەدی کوڕی حامید دەڵێت:** لەلای ئەحمەدی کوڕی خەزرەوەی دانیشـتبووم، ئـەو لە سەرەمەرگدا بوو، تەمەنی نەوەد و پێنج ساڵ بوو، هەنـدێ لـە هـاوەڵانی پرسـیاری بابـەتێکیان لێکـرد، ئـەویش چـاوەکانی پڕبـوون لـە فرمێسـك و وتـی: کـوڕی خـۆم، دەرگایەك نەوەد و پێنج ساڵە لێی دەدەم، سات نا ساتێك بە روومدا دەکرێتەوە نـازانم بە بەختەوەری لـێم دەکرێتـەوە یـان بـە بەدبـەختی؟ مـن چۆن دەتـوانم وەڵامـی ئـەوە بدەمەوە؟

**دەڵێت:** حەوتسەد دینار قەرزار بوو، قەرزارەکان هەموو لـەوێ بـوون، تەماشـایەکی کردن و وتی: خودایە، من بارمتە(رەهن)کانم کردووە بە متمانەی قـەرزەکانم، خودایـە متمانەکەیان لەدەست وەربگەرەوە و قەرزەکەم بدەرەوە.

**دەڵێت:** یەکێك تەقەی دا لە دەرگـا و وتـی: خـاوەن قـەرزەکانی ئەحمـەد لـە کـوێن؟ هەموو قەرزەکانی گێڕایەوە، دوای ئەوە گیـانی دەرچـوو، سـاڵی ٢٤٠ك کۆچـی دوایـی کرد(رەحمەتی خودای لێ بێت)

**ئەحمەد دەڵێت:** هیچ خەوێك بە ئەندازەی بێئاگایی قورس نییـە، هـیچ ئاواتێـك بـە ئەندازەی حەز سووك و نەرم نییە، گەر قورسی بێئاگایی نەبوایە سووکی و نەرمی حەز زەفەری پێ نەدەبردی.

# ١٦. ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری

أبو **الحسين أحمد** بن أبي **الحواري**، لە ئەهلی دیمەشقە، هاوەڵی ئەبو سولەیمانی دارانی و کەسانی تری کردووە، ساڵی ٢٣٠ك کۆچی دوایی کردووە، جونەید دەیفەرموو: ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری ڕێحانەی شامە.

**ئەحمەد دەڵێت:** هەر کەس بە ویست و خۆشەویستییەوە سەرنجی دونیا بدات خودا نووری یەقین و زوهد لە دڵی دەردەکات.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس کارێك ئەنجام بدات بەبێ شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کارەکەی پووچ و بێبنەمایە.

**هەروەها دەڵێت:** باشترین گریان گریانی بەندەیەکە بەهۆی ئەوەی لەدەستی چووە لە تەبایی لەگەڵ خودا.

**هەروەها دەڵێت:** خراپترین شتێك مرۆڤ پێیەوە گرفتار ببێت بێئاگایی و دڵڕەقییە.

# ١٧. عمر حداد

**أبو حفص عمر بن مسلمة الحداد**، سەر بە گوندێك بوو ناوی **"**كوردئاباد**"** بوو، نزيك بە دەروازەی نيسابوور لەسەر رێگەی بوخارا، يەكێكە لە ئيمامان و سەردارانی ئەم رێگەيە، دەورەبەری ساڵی ٢٦٠ك كۆچی كردووە.

**أبو حفص دەڵێت:** گوناه پۆستەچی بێباوەڕییە، وەك چۆن **"**تا**"** پۆستەچی مردنە.

**هەروەها دەڵێت:** گەر موريدێكت بينی حەزی بە گوێگرتن بوو لە گۆرانی بزانە هێشتا بێكاری و بەتاڵی تێدا ماوە.

**هەروەها دەڵێت:** ئەدەبی جوانی دەرەوە ناونيشانی ئەدەبی جوانی ناوەوەيە.

**هەروەها دەڵێت:** جوامێری بريتييە لە پێدانی ويژدان بە كەسی بەرانبەر بەبێ ئەوەی بۆ خۆت داوای ويژدان بكەيت لە بەرانبەر.

**هەروەها دەڵێت:** هەر كەس حاڵ و كرداری لە هەموو دەمێكدا بە قورئان و فەرموودە نەپێوێت و خايلە و ختوورەكانی بير و ناخی تۆمەتبار نەكات ئەوا لە ديوانی پياوان سەرژمێری مەكە.

# ١٨. ئەبو تورابی نەخشەبی

أبو تراب عسكر بن حصين النخشي، هاوەڵی **"حاتم الأصم"** و **"أبا حاتم العطار المصري"**ی کردووە. لە ساڵی: ٢٤٥ك کۆچی دوایی کردووە.

**دەڵێن** لە دەشت و سارادا مرد و دڕندەکان گۆشتەکەیان خوارد.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** هاوەڵی شەش سەد کەس لە گەورە پیاوانم کرد، هیچ کامیان وەك ئەم چوار کەسە نەبوو: یەکەمیان: ئەبو تورابی نەخشەبی.

**ئەبو توراب دەڵێت: هەژار کەسێکە:** ڕۆزییەکەی ئەوەیە دەیبینێتەوە، و پۆشاکەکەی ئەوەیە دایدەپۆشێت، و شوێنەکەشی ئەوەیە تیایدا دەمێنێتەوە.

**هەروەها دەڵێت:** گەر بەندە لە کارەکانیدا ڕاستگۆ بوو بەر لەوەی ئەنجامیان بدات هەست بە شیرینییەکەیان دەکات، کاتێك ئیخلاصی تێدا ئەنجامدا شیرینییەکەی و تام و چێژەکەی لە کاتی ئەنجامدانیدا دەبینێتەوە.

**"إسماعيل بن نجيد" دەڵێت:** کاتێك ئەبو تورابی نەخشەبی شتێکی ناباشی لە هاوەڵانی خۆی ببینیبایە کۆشانی زۆرتری دەکرد و تەوبەی نوێ دەکردەوە و دەیوت: شومی منە پاڵیان دەنێت بۆ ئەو کارە ناباشە، چونکە خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾، دەڵێت: دیسان گوێم لێ بوو بە هاوەڵانی خۆی دەوت: هەر کەس پۆشاکی پینەدار بپۆشێت داوای لە خەڵکی کردووە، هەر کەس لە خانەقا و مزگەوت دابنیشێت داوای لە خەڵکی کردووە، هەر کەس قورئان لە مەسحەفدا بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بیبیستێت داوای لە خەڵکی کردووە.

**دەڵێت:** دیسان گوێم لێ بوو دەیوت: لە نێوان من و خودادا پەیمانێك هەیە هەر کات دەست بۆ حەرام ببەم دەستمی لێ کورت دەکاتەوە.

**ڕۆژێك ئەبو توراب** سەرنجی یەکێك لە موریدانی خۆیدا دەستی بۆ توێکڵە کاڵەکێك برد کە پێچی خواردبوو و بۆ سێ ڕۆژ لەوەوبەر دەگەڕایەوە.

ئەبو توراب پێیوت: دەست بۆ توێکڵی کاڵەك دەبەیت؟ ڕێگەی تەصوف بۆ تۆ شیاو نییە، بڕۆ کاری بازاڕ بکە.

**ئەبو توراب دەڵێت:** هەرگیز نەفسم ئاواتی بۆ هیچ شتێك نەخواستووە تەنها یەك جار نەبێت: داوای نان و هێلکەی لێکردم، من ئەو کاتە لە سەفەردا بووم، لە ڕێگە لامدا و چوومە ئاوەدانییەك، پیاوێك لێم راپەڕی و گرتمی و وتی ئەم پیاوە لەگەڵ دزەکانە، خستمیان بە رووداو حەفتا داریان لێدام، دەڵێت: پیاوێکی سۆفی لەسەرمان وەستا و هاواری کرد و پێیوتن: هاوار بۆ ئێوە، ئەو پیاوە ئەبو تورابی نەخشەبییە، وازیان لێ هێنام و داوای لێبوردنیان کرد، دواتر پیاوێك خولکی کردم و بردمی بۆ ماڵەوە و لەوێ نان و هێلکەی دەرخوارد دام، منیش بە نەفسی خۆمم وت: بخۆ دوای لێدانی حەفتا دار.

**ئیبن جەلا دەگێڕێتەوە:** ئەبو توراب بە دەروونێکی ئاوەڵا و نەفسێکی تێرەوە هاتە ناو مەککە، وتم: مامۆستا لە کوێ نانت خواردووە؟

وتی: ژەمێك لە بەصرە و ژەمێك لە نەباج و ژەمێکیش لێرە.

۞ ۞ ۞

# ١٩. عبدالله كوری خبیق

**أبو محمد عبدالله بن خبيق**، لە زاهیدە سۆفییەکانە، هاوەڵی یوسفی کوڕی ئەسباتی کردووە، بە ئەسڵ خەڵکی کوفە بوو، بەڵام لە ئەنتاکییە نیشەجێ بووە.

**فەتحی کوڕی شەخرەف دەڵێت:** یەکەمین کەسێك پێیگەیشتم **"عبدالله بن خبیق"** بوو، پێی وتم: ئەی خوراسانی، ئەم ڕێگەیە چوارە و پێنجی نییە: چاو و زمان و دڵ و ئارەزووو: مەهێڵە چاوت تەماشای حەرام بکات، سەرنجی زمانت بدە شتێکی پیادا جاری نەبێت خودا لە دڵی تۆدا پێچەوانەی ئەوە ببینێت، سەرنجی دڵت بدە رق و کینەی بەرانبەر موسڵمانێك تێدا نەبێت، سەرنجی ئارەزووت بدە حەزی شتێك لە شەڕ و خراپە نەکات، گەر ئەم چوار خەسڵەتەت تێدا نەبوو ئەوا خۆڵەمێش بەسەر خۆتدا بکە، چونکە بەدبەخت بوویت.

**هەروەها "ابن خبیق" دەڵێت:** تەنها خەم بۆ شتێك بخۆ سبەینێ زیانت پێ بگەیەنێت، تەنها بە شتێك دڵخۆش ببە سبەی دڵخۆشت بکات.

**هەروەها دەڵێت:** نامۆیی بەندەکان لە حەق دڵانی لێ نامۆکردووە، گەر هۆگری پەروەردگاریان بن هەموان پێیانەوە هۆگر دەبن.

**هەروەها دەڵێت:** بەسوودترین ترس ئەوەیە لە گوناهان دەتگێڕێتەوە و حوزن و دڵتەنگیت بۆ ئەوەی لەدەستت چووە درێژە پێ دەدات، و پابەندت دەکات بە ئاگایی و بیرهێنانەوە لەو تەمەنەی کە ماوە، باشترین رجاش ئەوەیە کارت لەسەر ئاسان دەکات.

**هەروەها دەڵێت:** درێژەکێشانی گوێگرتن لە شتی پووچ(باتڵ) شیرینی گوێڕایەڵی لە دڵدا خامۆش دەکات.

## ٢٠. أحمد الأنطاكي

**أبو علي أحمد بن عاصم الأنطاكي**، له هاودەمانی بیشری حافی و سرِی سەقەتی و حاریسی موحاسیبی بوو.

ئەبو سولەیمانی دارانی بە نهێنگری دڵ ناوی دەبرد، ئەوەش بەهۆی تیژی فیراسەتییەوە.

**ئەحمەدی کوڕی عاصم دەڵێت:** گەر دەتەوێ دڵت چاك بكەیت بە پارێزگاری لە زمانت کۆمەکی بکە.

**هەروەها دەڵێت:** خودا(سبحانه وتعالى) دەفەموێت:﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ ﴾التغابن: ١٥، کەچی ئێمە دەچین لەو فیتنەیە بۆ خۆمان زیاد دەکەین.

❋ ❋ ❋

# ٢١. نصوری کوری عمار

**أبو السري منصور بن عمار**، خەڵکی ناوچەی مەروە سەر بە گوندێك كە پێی دەوترا: "يرانقان"، وتراویشە خەڵکی "بۆشنج"ە و لـە بەصـرە نیشـتەجێ بـووە و لـە واعیـزە مەزنەکان بووە.

**مەنصووری کوڕی عەمار دەڵێت:** هەر کەس لە موسیبەتەکانی دونیـا نیگـەرانی و پەرێشانی رووی لێ بکات موسیبەتەکەی بەسەر دینیدا وەردەگەڕێت.

**هەروەها دەڵێت:** باشترین پۆشاکی بەندە بریتییە لە تەوازوع و گەردنکەچبوون، باشترین پۆشاکی عاریفیش بریتییە لە تەقوا، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾الأعراف: ٢٦

**وتراوە:** هۆی تەوبەکەی ئەوە بـووە لەسـەر رێگـە پارچـە پێسـتێك(یان کاغـەزێك)ی بینیوەتەوە لەسـەری نوسـراوە "بسـم الله الـرحمن الـرحيم" هەڵیگرتۆتـەوە، شـوێنێکی نەبینیوەتەوە تیایدا دابنێت بۆیە خواردوویەتی، لە خەوندا کەسێك دەبینێت پێی دەڵێت: خودا دەروازەی حیکمەتی بە رووی تۆدا والاّ کرد بەهۆی رێزلێنانت لەو پارچە کاغەە.

**"أبو الحسن الشـعراوي"(ڕەحمەتی خودای لێ بێـت) دەڵێـت:** مەنصـووری کـوڕی عەمارم لە خەوندا بینی، پێم وت: خودا چی لەگەڵ کـردی؟ وتـی: پێـی فـەرمووم: تـۆ مەنصووری کوڕی عەماری؟ وتم: بەڵێ، ئەی پەروەردگار، فەرمووی: تـۆ ئـەو کەسـەی خەڵکیت فێری زوهد دەکرد لە دونیـا و ئـارەزووی دواڕۆژت لا دروسـت دەکـردن؟ وتم: بەڵێ، ئەی پەروەردگار، ئەوە بەو جۆرە بـوو، بـەلاّم لـە هـەر مەجلیسـێکدا دانیشـتبم یەکەمجار حەمد و سەنای تۆم دەکرد و دووەمجار صەڵەواتم لەسـەر پێغەمبەرەکـەت(صلى الله عليه وسلم) لێ دەدا و سێیەمجار ئامۆژگـاری بەنـدەکانی تـۆم دەکـرد، فـەرمووی: راسـت دەکـات، کورسییەکی بۆ دابنێن، با لەناو فریشتەکانمدا مەجد و سـەنام بکـات وەك چـۆن لـەناو بەندەکانمدا مەجد و سەنای منی دەکرد.

# ٢٢. ئەبو صالح قەصار

**أبو صالح حمدون بن أحمد بن عمارة القصار**، خەڵکی نیسابووره، لە ئەوەوە مەزهەبی مەلامەتی لە نیسابوور بڵاوبوویەوە، (دەستەیەك بوون بۆ شاردنەوەی چاکە و باشی خۆیان هەندێ کاریان ئەنجام دەدا کە خەڵکی رەشۆکی ئەنجامیان دەدا، ئەمەش وەك پارێزگاری لە ئیخلاص و تێکەڵ نەبوونی ریا بە کارەکانیان و دوورکەوتنەوە لە ناوبانگ)

هاوەڵی سالم باروسی و ئەبو تورابی نەخشەبی کردووە. ساڵی ٢٧١ك کۆچی دوایی کردووە.

**پرسیار لە حەمدون کرا:** چ کاتێك دروستە کەسێك قسە بۆ خەڵکی بکات؟

وتی: گەر هەستان بە فەرزێك لە فەرزەکانی خودا لەسەری پێویست بوو، یان بەهۆی بیدعەیەکەوە لە تیاچوونی کەسێك بترسێت و رجای وابێت خودا ئەو بکات بە هۆی رزگاربوونی ئەو کەسە لە بیدعەکە.

**هەروەها دەڵێت:** هەرکەس وا گومان ببات نەفسی ئەو لە نەفسی فیرعەون باشترە لوتبەرزی نیشانداوە.

**هەروەها دەڵێت:** لەو کاتەوەی دەزانم بۆ سوڵتان فیراسەتی هەیە لە خراپەکاراندا، ترسی سوڵتان لە دڵم دەرنەچووە.

**هەروەها دەڵێت:** گەر سەرخۆشێکت بینی خۆتی لێ لا بدە، بۆ ئەوەی دەستدرێژی نەکەیە سەری و پاشان تۆش بە هەمان گوناه گرفتار ببیت.

**عەبدوڵڵای کوڕی مەنازیل دەڵێت:** وتم بە ئەبی صالح(حەمدون) وەسێتم بۆ بکە(ئامۆژگاریم بکە).

لە وەڵامدا وتی: گەر دەتوانی بۆ شتێك لە دونیا تووڕە نەبیت ئەنجامی بدە.

دۆستێکی حەمدون لە سەرەمەرگدا بوو، حەمدون لەسەری ئامادە بوو، کاتێك کەسەکە مرد حەمدون چراکەی کوژاندەوە، پێیان وت: لەم کاتانەدا پێویستە چراکە

بگرێت و سووتەمەنی زۆرتری تێبکرێت، وتی: تۆزێك بەر لـە ئێسـتا سـووتەمەنییەکە ماڵی خۆی بوو، بەڵام لەو کاتەوەی مرد سووتەمەنییەکە بەشی میراتگرانییەتی.

**هەروەها حەمدون دەڵێت:** هەر کەس لە ژیانی پێشینان ورد ببێتەوە کەمتەرخـەمی و دواکەوتنی خۆی بۆ گەیشتن بە پلەی پیاوان لا ئاشکرا دەبێت.

**هەروەها دەڵێت:** نهێنی کەسێك بڵاو مەکەوە، گەر نهێنی تۆ بێت حەزدەکەی بـۆت بپۆشن.

۞ ۞ ۞

# ٢٣. جونەیدی بەغدادی

**أبو القاسم الجنید بن محمد**، سەردار و ئیمامی ئەم دەستەیە بوو.

ریشەی بنەماڵەکەی بۆ نەهاوەند دەگەڕێتەوە و لەدایکبوون و گەورەبوونی لە عێراقدا بووە، باوکی شووشەفرۆش بوو، بۆیە بە **"القواريري-شووشەچی"** بەناوبانگ بووە.

فەقیهێکی مەزنی **"أبي ثور"** بووە، لە ئەڵقەی دانیشتنەکەیدا لە تەمەنی بیست ساڵیدا فتوای داوە، هاوەڵی خاڵی خۆی (سرِی سەقەتی) و محەمەدی کوڕی عەلی قەساب کردووە.

ساڵی ٢٩٠ك کۆچی دوایی کردووە.

**پرسیار لە جونەید کرا: عاریف کێیە؟**

**وتی:** ئەو کەسەیە لە نهێنییەکانی تۆ قسە دەکات و تۆش بێدەنگی.

**هەروەها دەڵێت:** تەصەوفمان لە وتی وتییەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو لە برسێتی و وازهێنان لە دونیا و بڕینی هۆگربوونەکان و ئالوودەبوونەکان و حەزلێکراوەکان.

**پیاوێك لای جونەید باسی مەعریفەی کرد و وتی:** ئەهلی مەعریفە بە خودا دەگەنە وازهێنان لە جوولە و بزوان(واتە وازهێنان لە کردار) لە دەروازەی چاکە و نزیکبوونەوە لە خودا (ﷻ).

**جونەید وتی:** ئەوە قسەی کەسانێکە باوەڕیان بە وازهێنانە لە کار و کردەوەکان، ئەو کارە لەلای من خراپترین کارە، ئەو کەسەی دزی دەکات و زینا دەکات حاڵی باشترە لەو کەسەی ئەو قسەیە دەکات، عاریفان بە خودا کار و کردەوەکانیان لە خوداوە وەرگرتووە و بەو کار و کردەوانەشەوە بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، گەر تەمەنم هەزار ساڵ بێت بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە کاری چاکە کەم ناکەمەوە، مەگەر رێگەم لێبگیرێت و نەتوانم ئەنجامیان بدەم.

**هەروەها دەڵێت:** گەر تەنها کاری قوڕ(دروستکردنی گۆزە و فەخفوری) دەزانیت لە ماڵەکەتدا دایبنێ و پێیەوە خەریك بە.

**هەروەها دەڵێت:** هەرچی ڕێگەیە بۆ لای خودا لە خەڵکی داخراوە، جگە لە هەڵگرتنی شوێنپێی پێغەمبەری خودا(ﷺ)

**هەروەها دەڵێت:** گەر کەسێکی صادق هەزار ساڵ ڕوو لە خودا بکات، پاشان ساتێك پشت لە خودا بکات، ئەوا ئەوەی لەدەستی چووە زۆرترە لەوەی بەدەستی هێناوە.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس قورئان لەبەر نەکات و فەرموودە نەنووسێتەوە لەم مەیدانەدا وەك پێشەنگ تەماشا ناکرێت، چونکە ئەم زانستەمان بە کیتاب و سوننەت کۆتوبەندکراوە.

**هەروەها دەڵێت:** ئەم مەزهەبەمان بە کیتاب و سوننەت کۆتوبەندکراوە.

**هەروەها دەڵێت:** ئەم زانستەمان بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بیناکراوە.

**عەلی کوڕی ئیبراهیمی حەداد دەڵێت:** لە دانیشتنی قازی ئەبی عەباسی کوڕی شورەیح ئامادەبووم، دەربارەی ئوسوڵ و لقەکان قسەی زۆر نایابی کرد، کاتێك سەرسوڕمانی منی هەست پێکرد وتی: دەزانی ئەم زانستەم لە کێ وەرگرتووە؟

وتم: لە کوێوە؟

وتی: ئەم زانستە بە بەرەکەتی ئەبو قاسم جونەید بەدەستم هێناوە.

وترا بە جونەید: لە کوێوە ئەم زانستەت بەدەستهێنا؟

وتی: بەهۆی سی ساڵ دانیشتنەمەوە لەبەردەستی خودادا لەژێر ئەو قادرمە، ئاماژەی بە قادرمەیەك کرد لە ماڵەکەیدا.

**ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** تەزبێحێك بە دەستی جونەیدەوە بینرا و پێیوترا: تۆ لەگەڵ پلە و پایەی خۆتدا تەزبێح بەدەستەوە دەگریت؟

وتی: ڕێگەیەکە بەهۆیەوە گەیشتم بە خودا بۆیە لێی جیانابمەوە.

**هەروەها ئەبو عەلی دەڵێت:** جونەید هەموو ڕۆژێـك دەڕۆیشـت بـۆ دووکانەکـەی و پەردەی دادەدایەوە و چوارسەد ڕکەعەت نوێژی دەکرد و پاشان بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە.

**ئەبوبەکری عەتەوی دەڵێت:** لەلای جونەید بووم کاتێك مرد، بینـیم قورئـانی خـەتم کرد و پاشان لە سورەتی **"البقرة"**ەوە دەستی پێکردەوە و حەفتا ئایەتی لە سـورەتەکە خوێندەوە و پاشان کۆچی دوایی کرد.

# ٢٤. سعيدى جبرى

**أبو عثمان سعيد بن اسماعيل الجبري**

له نیسابوور نیشتەجیٚ بووە، کاتی خۆی له "ڕەی" بووە.

هاوەڵی شاهی کەرەمانی و یەحیای کوڕی مـەعازی رازی کـردووە، و پاشـان لەگـەڵ شاهی کەرەمانی هاتووە بۆ نیسابوور.

لای ئەبی حەفصی حەداد خوێندوویەتی و ماوەتـەوە تـا خوێنـدنی تـەواو کـردووە و پاشان ئەبو حەفص کچەکەی خۆی کردووە به هاوسەری.

ساڵی ٢٩٨ك کۆچی دوایی کردووە، لەدوای ئەبی حەفص سی و ئەوەندە ساڵێك ژیاوە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** ئیمانی کەسێك تەواو نابێت تـا چـوار شـت لـە دڵیـدا راسـت نەبێتەوە: گرتنەوە و بەخشین و عیززەت و زەلیلی.

**هەروەها دەڵێت:** ماوەیەك هاوەڵی "ئەبو حەفص"م کرد، لەو کاتەدا مـن لاو بـووم، جارێك دەریکردم و وتی: لام دامەنیشە، منیش هەسـتام و پشـتم تێنـەکرد و پاشـە و پاش چوومە دەرەوە و رووم لە ئەو بوو، بڕیارم دا چاڵێك لە بەردەم ماڵەکەی هەڵبکەنم و خۆمی تێبنێم و نەیەمە دەرەوە بە فەرمانی ئەو نەبێت، کە ئەوەی لێ بینیم لە خۆی نزیك کردمەوە و بووم بە یەکێك لە کەسە تایبەتەکانی.

**وتراوە:** لە دونیادا(و لە سەردەمی خۆیاندا) سیٚ کـەس هـەبوون و چـوارەمیان نییـە: ئەبو عوسمان لە نیسابوور و جونەید لە بەغداد و ئەبو عەبدوڵای کوڕی جەلا لە شام.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** بۆ چل ساڵ دەچێت خودا لە حاڵێکـدا داینـەناوم پـێم نـاخۆش بووبێت و نەیگواستوومەتەوە بۆ بارێك لێی بێزاربووبم.

کاتێك حاڵی ئـەبو عوسمـان گۆڕا(بـە نەخۆشـی) کوڕەکـەی کـە نـاوی ئەبوبـەکر بـوو کراسەکەی بەر خۆی دڕی، ئەبو عوسمان چاوەکانی کردەوە و وتی: کوڕی خۆم ئـەوە لـە ئاشکرایدا پێچەوانەی سوننەتە و لە شاراوەیدا ریایە.

**هەروەها دەڵێت:**

**هاوەڵی لەگەڵ خودا:** بە جوانی ئەدەب و بەردەوامی هەیبەت و چاودێری.

**هاوەڵی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ):** بە شوێنکەوتنی سوننەتەکانی و پابەندبوون بە ئاشکرای زانستەوە.

**هاوەڵی لەگەڵ دۆستانی خودا:** بە ڕێزگرتن و خزمەتکردن.

**هاوەڵی لەگەڵ خانەوادە:** بە ئەخلاق و ئاکاری جوان.

**هاوەڵی لەگەڵ برایان:** بە بەردەوامی ڕووخۆشی گەر گوناهی تێدا نەبێت.

**هاوەڵی لەگەڵ نەزانان:** بە دوعا بۆ کردن و بەزەیی پیاداهاتنەوە دەبێت.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس سوننەت بەسەر گوفتار و کرداری خۆیدا بسەپێنێت زمانی بەحیکمەت دەکرێتەوە، هەرکەسیش ئارەزوو بکات بەفەرمانڕەوا بەسەر گوفتار و کرداریدا زمانی بە بیدعە دەکرێتەوە(دەپژێت) خودا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ النور: ٥٤.

# ٢٥. ئەبو حوسەینی نووری

**أبو الحسين أحمد بن محمد النوري**، لە دایکبوون و گەورەبوونی لە شاری بەغداد بووە.

هاوەڵی سەرِی سەقەتی و ئەحمەدی کوڕی حەواری کردووە و هاودەمی جونەیدی بەغدادی بووە.

ساڵی ٢٩٥ك کۆچی دوایی کردووە، کەسێکی خاوەن پلە و پایە بووە، کەسێکی مامەڵە جوان و زمان شیرین بووە.

**ئەبو حوسەینی نووری دەڵێت:** دەگمەنترین شت لەم سەردەمەی ئێمەدا دوو شتە: زانایەك کار بە زانستەکەی خۆی بکات و عاریفێك قسە لە حەقیقەت بکات.

**هەروەها دەڵێت:** گەر کەسێکت بینی بانگەشەی بۆ حاڵێك دەکرد لە سنووری زانستی شەرعی بەدەر بوو لێی نزیك مەبەرەوە.

**جونەیدی بەغدادی دەڵێت:** لەو کاتەوەی "نووری" مردووە هیچ کەس دەربارەی حەقیقەتی صدق گوزارشی نەکردووە.

**ئەبو ئەحمەدی مەغازلی دەڵێت:** هیچ کەسم نەینیوە لە "النوری" عابیدتر بێت، وترا: لە جونەیدیش؟ وتی: لە جونەیدیش.

**هەروەها "النوری"**: دەڵێت: کاتی خۆی پینە پۆشەرێك بوو بەسەر دوڕ و مرواریدا، بەڵام ئێستا زبڵ و خاشاکە بەسەر لاکەتۆپیودا.(باس لە تێکچوونی حاڵی ئەو کەسانە دەکات جلی پیناوی لەبەر دەکەن)

**هەروەها وتراوە:** هەموو رۆژێك لە ماڵەوە دەردەچوو، خواردنی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت و لە رێگە دەیبەخشی بە هەژاران و دەچووە مزگەوتێك تا نزیك نیوەڕۆ نوێژی تێدا دەکرد، پاشان لە مزگەوتەکە دەچووە دەرەوە و دەرگای دوکانەکەی دەکردەوە و بەرۆژوو بوو، خانەوادەکەی وایان دەزانی لە بازاڕ نان دەخوات، خەڵکی بازاڕیش وایان دەزانی لە ماڵەوە نان دەخوات، لە سەرەتاوە تا نزیکەی بیست ساڵ لەسەر ئەو کارەی بەردەوام بوو.

# ٢٦. ئیبن جەلا

**أبو عبدالله أحمد بن يحيى الجلاء**، خەڵكی بەغداد بووە، لە رەمڵە و دیمەشق نیشتەجێ بووە، لە گەورە پیاوانی شامە..

هاوەڵی ئەبو توراب و **"ذا النون"** و ئەبو عوبەیدی بوسری و باوكی(یەحیای كوڕی جەلا) كردووە.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** وتم بە باوك و دایكم پێمخۆشە بمبەخشن بە خودا(ﷻ)، ئەوانیش وتیان: ئەوا تۆمان بەخشی بە خودا(ﷻ)، ماوەیەك خۆم لێیان بزر كرد، كاتێك گەڕامەوە شەوێكی باراناوی بوو، تەقەم دا لە دەرگا، باوكم وتی: كێیە؟ وتم: كوڕی خۆت ئەحمەد، وتی: كاتی خۆی كوڕێكمان هەبوو، بەڵام بە خودامان بەخشی، ئێمەی عەرەب ئەوەی بەخشیمان وەریناگرینەوە، بۆیە دەرگاكەی بۆ نەكردمەوە.

**هەروەها دەڵێت:** هەر كەس مەدح و زەمی لا یەكسان بێت ئەو كەسە زاهیدە، هەر كەس پارێزگاری لە نوێژەكان بكات لە كاتی خۆیاندا ئەو كەسە عابیدە، هەر كەس هەموو كردارەكان لە خوداوە ببینێت ئەو كەسە یەكتاپەرستە و تەنها یەك كەس دەبینێت.

كاتێك ئیبن جەلا مرد تەماشایان كرد پێدەكەنێت، پزیشكەكە وتی: ئەم پیاوە زیندووە، پاشان لێی وردبوویەوە وتی: مردووە، پاشان تەماشای روخساری كرد وتی: نازانم ئەم پیاوە مردووە یان زیندووە.

لەناو پێستكەیدا رەگێك هەبوو لە شێوەی "لله-واتە بۆ خودا"(چونكە دایك و باوكی بە خودایان بەخشی بوو)

**هەروەها ئیبن جەلا دەڵێت:** لەگەڵ مامۆستاكەم دەڕۆیشتم، كەسێكی لاوی جوانم بینی و وتم: مامۆستا ئایا خودا ئەم شێوە جوانە سزا دەدات، مامۆستاكەم وتی: بۆ تەماشات كرد؟ سەرئەنجامەكەی دەبینی، لە دوای ئەوە بیستساڵ قورئانم لەبیرچوویەوە.

# ٢٧. رووەیم کوری أحمد

**أبو محمد رويم بن أحمد**، خەڵکی بەغدادە و لە مەزنترین گەورەپیاوانی ئەو شارەیە، ساڵی ٣٠٣ك کۆچی دوایی کردووە.

کەسێکی قورئانخوێن بوو، فەقیهێکی مەزن بوو لەسەر مەزهەبی داوود.

**رووەیم دەڵێت:** لە حیکمەتی حەکیمان ئەوەیە حوکمەکان بۆ براکانی بەرین بکات و لەسەر نەفسی خۆی توندی بکاتەوە، چونکە فراوانکردن بۆیان شوێنکەوتنی زانستە و توندکردنەوە لەسەر نەفسی خۆ حوکمی وەرعە.

**ئەبو عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** پرسیارم لە رووەیم کرد و داوام لێکرد ئامۆژگاریم بکات، ئەویش وتی: ئەم کارە بە بەخشینی گیانە، گەر دەتوانی بەو جۆرە هەنگاو بۆ ناوی هەڵبگرە، ئەگەر نە، خۆت بە تورەهاتی سۆفییەکانەوە خەریك مەکە.

**هەروەها رووەیم دەڵێت:** دانیشتنت لەگەڵ هەموو چینەکان لە خەڵکی سەلامەتترە لە دانیشتن لەگەڵ سۆفییەکان، هەموو خەڵکی لەسەر داب و نەریت(کاری ئاشکرا) دادەنیشن، بەڵام ئەم دەستەیە لەسەر حەقیقەتەکان دادەنیشن، هەموو خەڵکی بە شەرع داوا لە خودی خۆیان دەکەن، بەڵام ئەوانە بە حەقیقەتی وەرع و بەردەوامی صدق داوا لە خۆیان دەکەن، هەرکەس لەگەڵیان دابنیشێت و لە شتێکدا سەرپێچییان لێ بکات کە بەدەستیان هێناوە خودا نووری ئیمان لە دڵی دادەڕنێت.

**هەروەها دەڵێت:** لە کاتی نیوەڕۆدا بە بەغدادا گوزەرم دەکرد، زۆرم تینوو بوو، داوای ئاوم لە ماڵێك کرد، کچێکی منداڵ دەرگاکەی کردەوە و کۆزەیە ئاوی پێ بوو، کاتێ منی بینی وتی: سۆفییە و بە رۆژدا ئاو دەخواتەوە. لە دوای ئەو رۆژە هەرگیز رۆژووم نەشکاندووە(واتە هەمیشە بەڕۆژوو بووە).

**هەروەها دەڵێت:** گەر خودا گوفتار و کرداری پێ بەخشیت و گوفتاری لێ وەرگرتییەوە و کرداری بۆ هێڵایتەوە ئەوا تۆ لەسەر نیعمەتی، گەر کرداری لێ وەرگرتییەوە و گوفتاری بۆ هێڵایەوە ئەوە موسیبەتێکی گەورەیە، گەر هەردووکیانی لێ وەرگرتییەوە ئەوە نەقمەت و سزایە.

## ٢٨. ئەبو عبدالله بەڵخی

أبو عبدالله **محمد بن الفضل البلخي**، لـە سـەمەرقەند نیشـتەجێ بـووە، لـە بنەڕەتـدا خەڵکی بەڵخە و ئـەوێی بـەجێهێڵاوە و رووی لـە سـەمەرقەند کـردووە و هـەر لـەوێش کۆچی دوایی کردووە، هاوەڵی ئەحمەدی کوڕی خەزرەوەی و کەسانی تری کردووە، ئەبو عوسمانی حیری زۆر مەیلی بە لایدا بووە، ساڵی ٣١٩ك کۆچی دوایی کردووە.

**ئەبوبەکری کوڕی عوسمان دەڵێت:** ئـەبو عوسـانی حـیری نامەیـەکی بـۆ محەمـەدی کوڕی فەزڵ نووسی و تیایدا پرسی: نیشانەکانی بەدبـەختی چین؟ ئـەویش لـە وەڵامـدا بۆی نووسییەوە: **سێ شتن:**

زانستی پێ دەدرێت و لە کار بێبەش دەبێت، کاری پێ دەبەخشرێت و لـە ئـیخلاص مەحرووم دەبێت، هاوەڵی صاڵحانی پێ دەدرێت و رێزیان لێ ناگرێت.

**ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت:** محەمەدی کوڕی فەزڵ پیاوناس بوو.

**هەروەها دەڵێت:** ئاسوودەیی لە بەندیخانەدا(دونیا) لە ئاواتەکانی دەروونە.

**هەروەها دەڵێت:** ئیسلام لە چوار شتەوە نامێنێت: کار ناکەن بـەوەی دەیـزانن، کـار دەکەن بەوەی نایزانن، ئەوەی نایزانن فێری نابن، رێگری دەکەن لە فێربوونی خـەڵکی. سەرسوڕمان لەو کەسەی ئەو گشتە رێگەیـە دەبڕێـت تـا دەگاتـە ماڵەکـەی خـودا بـۆ ئەوەی ئاساری پێغەمبەرایەتی ببینێت، کەچـی نـەفس و ئـارەزووی خـۆی نابڕێـت تـا بگاتە دڵ و ئاساری خودا(ﷻ) ببینێت؟!

**هەروەها دەڵێت:** گەر موریدێکت بینی دونیای بۆ خۆی زیاد دەکـرد ئـەوە نیشـانەی پشتکردنییەتی لە رێگە.

**دەرباری زوهد پرسـیاری لێکـرا وتـی:** سـەیرکردنی دونیـا بـە چاوی ناتـەواوی و پشتتێکردن لێی بە عیززەت و سەربەرزی و شەرەفەوە.

# ٢٩. ئەبوبەكری زەقاق

**أبوبكر أحمد بن نصر الزقاق الكبير،**

لە هاودەمانی جونەید بوو، لە گەورەپیاوانی میسرە.

**"الكتاني" دەڵێت:** كاتێك "أبوبكر الزقاق" كۆچی دوایی كرد بیانووی هەژاران بۆ چوونە میسر كۆتایی پێهات.(واتە هەژاران حەزیان بە سەردانی میسر بوو، بۆ ئەوەی بیانوو بۆ سەردانەكیان بیننەوە دەیانوت بۆ لای ئەبوبەكری زەقاق دەچین، بەڵام مەبەستی تریان هەبوو)

**"أبوبكر الزقاق" دەڵێت:** پازدە رۆژ لە سارای وێڵبوونی بەنی ئیسرائیلدا وێڵ و سەرگەردان بووم، كاتێك لەسەر رێگە كەوتم سەربازێك بەرەو رووم هات، هەندێ ئاوی پێدام، سیساڵ دڵڕەقی ئەو ئاوە دایگرتمەوە.

# ٣٠. ئەبو عبداللەی مەکی

**أبو عبدالله عمرو بن عثمان المكي**، بە **"أبو عبدالله النباجي"** گەیشتووە و هاوەڵی أبو سعیدی خەراز و کەسانی تری کردووە.

لە گەورەپیاوانی ئەم دەستەیە و ئیمامی هەموانە لە ئوسولْ و تەریقەتدا.

ساڵی ٢٩١ك لە شاری بەغداد کۆچی دوایی کردووە.

**"أبو عبدالله عمرو بن المكی" دەڵێت:** هەرچی دڵت ئەندێشەی دەکات و بە مەجرای بیردا گوزەر دەکات یان دێتە سەر دڵت لە جوانی و قەشەنگی و هۆگری و پێکەوتووی و شەبەح و نوور و کەس و ئەندێشە بزانە خودا دوورە لە هەموو ئەوانە، گوێت لەم ئایەتانە بووە کە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١، هەروەها: ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾﴾ الإخلاص: ٣-٤.

**هەروەها دەڵێت:** زانست پێشەوایە، ترس لێخۆڕی نەفسی مرۆڤە، نەفسیش لە نێوان ئەو دوانەدایە: سەرکێشە، فێڵبازە، پێچلێدەرە، بە رامهێنانی زانست لێی ئاگادار بە، و هەڕەشەی ترسی دەرخوارد بدە، ئەوەی دەتەوێ بۆت ئەنجام دەدات.

# ٣١. سمنونی کوڕی حەمزە

کونیەکەی "أبو الحسن"ە و پێشی دەوترا "أبو القاسم".

هاوەڵی سرِی سەقەتی و ئەبو ئەحمەدی قولانسی و محەمەدی کوڕی عەلی قیسار و کەسانی تری کردووە.

**وتراوە:** ئەم دێڕە هۆنراوەی وتووە:

**ولیس لي في سواك حظ فكیفما شئت فاختبرني**

(جگە لە تۆ(خۆت) هیچ بەشێکی ترم ناوێت، چۆنت دەوێ تاقیمبکەرەوە)

هەر لە دوای ئەوە میزی بۆ نەدەکرا، بەسەر قوتابخانەکاندا دەگەرا و دەیوت: دوعا بۆ مامە درۆزنەکەتان بکەن.

**وتراوە:** ئەم دێڕە هۆنراوەی وتووە، هەندێ لە هاوەڵانی بە هەندێکی تریان دەوت: دوێنێ لە فلان شوێن گوێم لە دەنگی مامۆستامان سمنون بوو، لەبەر خودا دەپاڕایەوە و گەردنکەچی بۆ دەنواند و داوای لێ دەکرد شیفای بۆ بنێرێت، یەکێکی تریان وتی منیش لە فلان شوێن بینیم دوعای دەکرد، هەر بەو جۆرە کەسی سێیەم و چوارەم، ئەو هەواڵە بە سمنون گەیشت، پێشتر تووشی میزگیران بووبوو، ئارامانە شانی دابوویە ژێری و بۆی نیگەران نەبوو، کاتێك گوێی لێی بوو هاوەڵانی ئەو قسەیە دەکەن و ئەو لە هیچ شوێنێك دوعای نەکردووە و لە هیچ جێگەیەك باسی نەکردووە، تێگەیشت مەبەست لەو رووداوە ئەوەیە نیگەرانی نیشان بدەی وەك ئەدەبێك لە بەندایەتیدا بۆ خودا و شاردنەوەی حاڵی خۆ، بۆیە بەسەر قوتابخانەکاندا دەگەڕا و دەیوت: دوعا بۆ مامە درۆزنەکەتان بکەن.

**"أبو أحمد المغازلي" دەڵێت:** پیاوێك لە بەغداد هەبوو چل هەزار درهەمی بەسەر هەژاراندا دابەش کرد، سمنون پێی وتم: ئەی باوکی ئەحمەد نابینی ئەو پیاوە چۆن ئەو برِە پارەی بەسەر هەژاراندا دابەش کرد و ئەو کارەی ئەنجامدا؟

ئێمەش هیچ شتێکمان نییە.. برۆ با بچین بۆ شوێنێك بەرانبەر هەر درهەمێکی ئـەو پیاوە یەك رکات نوێژ بکەین، بۆیە چووین بۆ مەدائین و چل هەزار نوێژمان کرد.

سمنـون پیـاوێکی ئـەخلاق جـوان و نـەرمونیان بـوو، زۆربـەی قسـەکانی دەربـارەی خۆشەویستی بوو، کەسێکی خاوەن پلە و پایە بوو، وەك وتراوە بەر لە جونەیـد کۆچـی دوایی کردووە.

# ٣٢. ئەبو عوبەیدی بوسری

**أبو عبيد البسري**، لە شێخە پێشینەکانە، ئیبن جەلا دەڵێت: بە حەوتسەد گـەورەپیاو گەیشتم، چوار لەوانە نموونەیان نییە، **"زو نونی مصری و بـاوکم و أبـو تـراب و أبـو عبيد البسري"**

**"أبو زرعة الحسني" دەڵێت:** ئەبو عوبەیدی بوسری رۆژێك لەسەر کاری جەنجەڕ بـوو گەنمی دەکوتی(گێرەی گەنمی دەکرد)، لە نێوان ئەو و حەجدا سێ رۆژ ماوە هەبوو، دوو پیاو هاتنە لای و پێیان وت: ئەی ئەبو عوبەید چالاکی بۆ حەجکردن(واتە دەتوانی بـە حەج بگەیت)؟

وتی: نەخێر.

پاشان لای بە لامدا کردەوە و وتی: شێخەکەت(واتە خۆی) بە تواناترە لەو دوانە.

# ٣٣. شاهی کەرەمانی

**أبو الفوارس شاه بن شجاع الكرماني**، لە نەوەی پادشایان بوو.

هاوەڵی ئەبو تورابی نەخشەبی و ئەبو عوبەیدی بوسری کردووە، ئەوانە یەك چین بوون و لە سەردەمێکدا دەژیان.

لاوێکی جوامێر و خاوەن شانوشکۆ بوو، بەر لە ٣٠٠ك کۆچی دوایی کردووە.

**شاهی کەرەمانی دەڵێت:** نیشانەی تەقوا بریتییە لە وەرع، نیشانەی وەرعیش بریتییە لە وەستان لە دەستبردن بۆ شوبوهات.

**بە هاوەڵانی خۆی دەوت:** لە درۆ و ناپاکی و غەیبەت دووربکەونەوە و پاشان هەرچیتان دەوێت ئەنجامی بدەن.

**هەروەها دەڵێت:** هەرکەس چاوی لە حەرام دابخات و نەفسی لە حەزەکان بگرێتەوە و ناوەوەی بە بەردەوامی چاودێری و دەرەوەی بە شوێنکەوتنی سوننەت ئاوەدان بکاتەوە و حەڵاڵ بخوات هەگیز فیراسەتی بە هەڵەدا ناچێت.

# ٣٤. يوسف كوری حسینی رازی

**يوسف بن الحسين**، شێخی ناوچەی ڕەی و چیاکانییەتی.

کەسێك بوو دوور لە خۆنمایش کردن و نیشاندانی عیبادەت و کاری چاکە.

زانایەکی ئەدیب بوو، هاوەڵی **"ذا النون المصري و أبا تراب النخشي"** کردووە و دۆستایەتی لەگەڵ ئەبو سەعیدی خەرازدا هەبووە.

ساڵی ٣٠٤ك کۆچی دوایی کردووە.

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** گەر بە هەرچی گوناهەوە بە خودا بگەم لام باشترە بە خۆنمایشکردن(ریا) بە خزمەتی بگەم.

**هەروەها دەڵێت:** گەر موریدێکت بینی بە ڕوخسەتەوە خۆی سەرقاڵ دەکرد بزانە ئەو کەسە هیچی لێ سەوز نابێت.

**یوسفی کوڕی حوسەین بۆ جونەیدی نووسی:** داوامە لە خودا تامی نەفسی خۆت دەرخوارد نەدات، چونکە گەر تامی نەفسی خۆتت کرد لەدوای ئەوە تامی خێر ناکەی.

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** ئافەتی سۆفی لە چەند شتێکدایە: هاوەڵی منداڵ و تێکەڵی لەگەڵ دژەکان و دڵنەرمی ژنان(شت وەرگرتن لە ژنان).

# ٣٥. محمد ترمزی

**أبو عبدالله محمد بن علي الترمذي**، له گەورەپیاوانە، و چەندین دانـراوی لـە زانسـتی ئەم دەستەیەدا هەیە.

هاوەڵی **"أبا تراب النخشبي و أحمـد بـن خضـرويه و ابـن الجـلاء"** و کەسـانی تـری کردووە.

**پرسیار لە محەمەدی کوڕی عەلی کـرا دەربـارەی سـیفەتی مـرۆڤ، وتـی:** لاوازی دەرەوە(ئاشکرا) و بانگەشەی دوورودرێژ.

**هەروەها دەڵێت:** یەك پیتم بە تەگبیرەوە نەنووسیوە و بـۆ ئـەوەم نەنووسـیوە بدرێتـە پاڵ من، بەڵکو کاتێك کاتەکانم لێ توند دەبێتەوە بە نووسینیان خۆشی وەردەگرم.

# ٣٦. ئەبوبەکری وەراق

**أبوبكر محمد بن عمر الوراق الترمذي**، لە بەڵخ نیشتەجێ بووە.

هاوەڵی **"أحمد بن خضرويه"** و کەسانی تری کردووە، چەندین دانـراوی لـە بیرکاریـدا هەیە..

**ئەبوبـــەکری وەراق دەڵێـــت:** هـــەر کـــەس ئەندامـــەکانی بـــە حـــەزەکان رازی بکات(تێربکات) درەختی پەشیمانی لە دڵیدا سەوز دەبێت.

**هەروەها دەڵێت:** گەر بە تەماع و هەڵپەکردن بوترێت باوکت کێیە، دەڵێـت: شـك و گومان لەوەی خودا بۆ مرۆڤی بڕیوەتەوە.

**گەر پێی بوترێت:** پیشەت چییە؟

دەڵێت: کەسابەتی زەلیلی.

**گەر پێی بوترێت:** ئامانجت چییە؟

دەڵێت: بێبەشبوون.

**ئەبوبەکری وەراق رێگری دەکرد لە هاوەڵانی سـەفەربکەن و بگـەڕێن و دەیـوت:** کلیلی هەموو بەرەکەتێك بریتییە لە ئارامگرتن لە شوێنی ویست و ئاکاردا تا ویستت بـۆ دێتـە راسـتە، گـەر ویسـتت بـۆ هاتـە راسـتە ئـەوا سـەرەتاکانی بەرەکـەتت بـۆ دەردەکەوێت.

# ٣٧.ئەبو سەعیدی خەراز

**أبو سعيد بن عيسى الخراز**، لە ئەهلی بەغدادە.

هاوەڵی **"ذا النون المصري و النباجي و أبا عبيد البسري و السري و بشر الحافي"** و کەسانی تری کردووە.. ساڵی ٢٧٧ك کۆچی دوایی کردووە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** هەر پەنهان و شاراوەیەك پێچەوانەی ئاشکرا و دەرەوە بێت پووچ و بێ ئەرزشە.

**هەروەها دەڵێت:** ئیبلیسم لە خەوندا بینی بە لامدا تێدەپەڕی(لێم دووردەکەوتەوە)، پێم وت: وەرە، چیتە؟

وتی: چی لە ئێوە بکەم، ئەوەی خەڵکی پێ فریو دەدەم ئێوە لە نەفس دوورتان خستووەتەوە، وتم: ئەوە چییە؟

وتی: دونیا.کاتێك پشتی تێکردم، لای بە لامدا کردەوە، و وتی: بەڵام هێشتا شتێکی فریودەرم لەلای ئێوە ماوە، وتم: ئەوە چییە؟

وتی: هاوەڵی منداڵ.

**هەروەها دەڵێت:** بە درێژای ئەو تەمەنەی هاوەڵی سۆفییەکانم کردووە ناکۆکی و جیاوازیم لەگەڵیان نەبووە.

وتیان: بۆچی؟

وتی: لەبەر ئەوەی دژ بە نەفسی خۆم لەگەڵ ئەوان بووم.

# ٣٨. محمدی کوری مەغربی

**أبو عبدالله محمد بن إسماعيل المغربي**، مامۆستای ئیبراهیمی کوڕی شەیبانە و قوتابی عەلی کوڕی رەزینە.

سەد و بیست ساڵ ژیاوە و ساڵی ٢٩٩ك کۆچی دوایی کردووە.

شانوشکۆی سەرسوڕهێنەر بووە، تەمەنێکی دوورودرێژ ئەوەی دەستی مرۆڤی پێگەیشتووە نەیخواردووە، رەگ و ریشەی گژوگیای دەخوارد.

**ئەبو عەبدوڵای مەغریبی دەڵێت:** باشترین کار بریتییە لە ئاوەدان کردنەوەی کاتەکان بە تەبایی بوون لەگەڵ خودا.

**هەروەها دەڵێت:** گەورەترین زەلیلی زەلیلی کەسێکی هەژارە کە بۆ دەوڵەمەند دەچەمێتەوە، یان تەوازوعی بۆ دەنوێنێت، گەورەترین عیززەت عیززەتی کەسێکی دەوڵەمەندە کە بۆ هەژاران دەچەمێتەوە و رێزیان لێ دەگرێت.

۞ ۞ ۞

# ٣٩. ئەحمەدی کوری مەسروق

**أبو العباس أحمد بن محمد بن مسروق**، خەڵکی تووس(طوس)ە و لە بەغداد نیشتەجێ بووە و هاوەڵی حاریسی موحاسیبی و سرِی سەقەتی کردووە، ساڵی ٢٩٨ یان ٢٩٩ك لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە.

**ئیبن مەسروق دەڵێت:** هەر کەس لە خایلە و خوتوورەکانی دڵیدا چاودێری خودا بکات ئەوا خودا لە جووڵەی ئەندامەکانیدا پارێزگاری لێ دەکات.

**هەروەها دەڵێت:** پارێزگاری حورمەتی باوەڕداران پارێزگاریە لە سنوورەکانی خودا، بەوەش بەندە دەگاتە حەقیقەتی تەقوا.

**هەروەها دەڵێت:** درەختی مەعریفە بە ئاوی بیرکردنەوە ئاو دەدرێت، درەختی خۆشەویستیش بە ئاوی رێکەوتن و تەبایی لەگەڵ خودا ئاودەدرێت.

**هەروەها دەڵێت:** هەرکات هەڵپەت بۆ مەعریفە هەبوو، پێشتر پلەکانی ویستت تێدا بەکار نەهێنابێت ئەوا تۆ لە نەزانیدای، هەر کات داوای ویستت کرد و مەقامی تەوبەت راست نەکردەوە ئەوا تۆ بێئاگای لەوەی داوای دەکەی.

# ٤٠. علی ئەسفهانی

**أبو الحسن علي بن سهل الأصفهاني**، لە هاودەمانی جونەید بووە.

عەمری کوڕی عوسمان بۆ پێدانەوەی قەرزێکی کە سی هەزار درهەم بوو رووی لە "أبو الحسن علی کوڕی سەهل" کرد ئەویش هەمووی بۆ دایەوە.

بە ئەبو تورابی نەخشەبی و هاوچەرخانی ئەو گەیشتووە.

**عەلی کوڕی سەهل دەڵێت:** دەستبردن بۆ کار و کردەوەی باش لە نیشانەکانی سەرفەرازییە، وازهێنان لە سەرپێچییەکان لە نیشانەی ریعایەتی باشە، رەچاوکردنی نهێنییەکان لە نیشانەکانی بەئاگاییە..

دەرخستنی بانگەشە لە حەزە مرۆییەکانە، هەر کەس ویستی سەرەتاکەی نەیەتە راستە لە کۆتایی سەرئەنجامیدا سەلامەت نابێت.

# ٤١. ئەبو محمدی جریری

**أبو محمد أحمد بن محمد بن الحسين الجريري**، لـه گـەورەپیاوانی هـاوەڵانی جونەیـدە، هاوەڵی سەهلی کوڕی عەبدوڵای کردووە، لە دوای جونەید لە شـوێنەکەی دانیشـتووە، کەسێکی زانا بووە بە زانستەکانی ئەم دەستەیە، حاڵێکی مەزنی بـووە، سـاڵی ٣١١ك کۆچی دوایی کردووە.

**"أحمد بن عطاء الروزباري" دەڵێت:** "**الجريري**" ساڵی قڕکردنەکە کۆچی دوایی کرد، دوای ساڵێك لە خەوندا بینیم دانیشتبوو، ئەژنۆکانی لە بـاوەش گرتبـوو و بـە پەنجـەی ئاماژەی بۆ یەکتاپەرستی خودا دەکرد.

**"الجريري" دەڵێت:** هەر کەس نەفسی زاڵ ببێت بەسەریدا ئەوا دەبێتە دیلی حەزەکانی و لە بەندیخانەی ئارەزوودا یەخسیر دەبێت و خودا دڵی لە سوودەکان بێبەش دەکات، بۆیە چێژی قسەی حەق ناکات با بەزۆریش بەسەر زمانیدا گوزەر بکات، خودا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەفەرموێت: ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِىَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ الأعراف: ١٤٦.

**هەروەها دەڵێـت:** بینـینی ئوسـوڵ(بنەڕەت یـان بنچـینە) بـە بـەکارهێنانی لقـەکان دەبێت، راستکردنەوەی لقەکانیش بەوە دەبێت بەسەر ئوسوڵدا نمایش بکرێن، رێگەیەك نییە بۆ مەقامی بینینی ئەسڵەکان مەگەر بە مـەزنڕاگرتنی ئـەوەی خـودا بـە مـەزنی راگرتووە لە ناوەندەکان و لقەکان.

## ٤٢. ئەبو عەباسی کوڕی عطائی ئادەمی

**أبو العباس أحمد بن محمد بن سهل بن عطاء الأدمي**، لە گەورەپیاوانی سۆفییەکان و زانایانە، **"الخراز"** شانوشکۆی بە مەزن تەماشا دەکرد.

لە هاودەمانی جونەیدە و هاوەڵی ئیبراهیمی مارستانی کردووە، ساڵی ٣٩٩ك کۆچی دوایی کردووە.

**سەهلی کوڕی عەتا دەڵێت:** هەرکەس نەفسی خۆی پابەند بکات بە ئادابی خواردنەوە خودا دڵی بە نووری مەعریفە نوورانی دەکات، هیچ مەقامێك لە مەقامی شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) مەزنتر و باڵاتر نییە، لە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی و کردارەکانی و ئەخلاقەکانی.

**هەروەها دەڵێت:** گەورەترین بێئاگایی بێئاگایی بەندەیە لە پەروەردگاری(ﷻ) و بێئاگایی لە فەرمانەکانی و نەهییەکانی و بێئاگایی لە ئادابی مامەڵەکردنی.

**هەروەها دەڵێت:** هەر پرسیارێکت لێکرا لە مەیدانی زانستدا بە دوایدا بگەڕێ، گەر نەتبینییەوە لە مەیدانی حیکمەتدا، گەر نەتبینییەوە بە یەکتاپەرستی هەڵیبسەنگێنە، گەر لەو سێ شوێنە نەتبینییەوە بیدە بە رووی شەیتاندا.

# ٤٣. ئەبو ئیسحاقی خواص

**أبو إسحاق إبراهیم بن أحمد الخواص**، لە هاودەمانی جونەید و **"النوري"**ە، لە تەوەکول و وەرزشی دەروونیدا بەشێکی گەورەی هەبووە.

لە "رەی" ساڵی ٢٩١ك کۆچی دوایی کردووە.

نەخۆشی ناوسکی هەبوو(سکچوون)، هەر کات هەڵدەستا دەستنوێژی دەگرتەوە و دەگەڕایەوە بۆ مزگەوت و دوو رکات نوێژی دەکرد، جارێك لە جارەکان کەوتە ناو ئاو و خنکا و کۆچی دوایی کرد(رەحمەتی خودا لیّ بێت)

**"أبو إسحاق الخواص" دەڵێت:** زانست بە زۆری ریوایەت نییە، بەڵکو زانا ئەو کەسەیە شوێنی زانست دەکەوێت و بەکاریدەهێنێت و شوێنی سوننەتەکان دەکەوێت با زانستیشی کەم بێت.

**هەروەها دەڵێت: دەوای دڵ پێنج شتە:**

١. خوێندنی قورئان بە تێڕامانەوە.
٢. و سکی خاڵی.
٣. و هەستانی شەو(شەونوێژ).
٤. و پاڕانەوەی بەرەبەیان.
٥. و دانیشتن لەگەڵ صاڵحان.

# ٤٤. ئەبو محمد خراز

**أبـــو محمـــد عبـــدالله بـــن محمـــد الخـــراز**، خـــەڵكی "رەی"ە و جیرانیـــی مەككـــەی شكۆمەندی كردووە.

هاوەڵی **"أبا حفص و أبا عمران الكبير"**ی كردووە.

یەكێكە لە مەزنە خاوەن وەرعەكان و بەر لە **٣١٠**ك كۆچی دوایی كردووە.

**"الدقي" دەڵێت:** چووم بۆ لای عبدالله الخراز بۆ چوار رۆژ دەچوو هیچم نەخوارد بوو، وتی: یەكێك لە ئێوە چوار رۆژ برسی دەبێت و رۆژی لێ دەبێتەوە برسـێتی بـانگی لـێ دەكات.

**پاشان وتی:** چی دەبێت گەر هەر نەفسێكی لەدایك بوو سەرنجی ئـەوە بـدات لـەلای خودا بۆی دانراوە، ئایا ئەوەی ئەنجامی دەدات(بەراورد بـەوەی بـۆی دانـراوە) بـەزۆری دادەنێت؟

**هەروەها دەڵێت:** برسێتی خۆراكی زاهیدانە و یادی خودا خۆراكی عاریفانە.

# ٤٥. ئەبو حەسەن حمال

**أبو الحسن بنان بن محمد الحمال**، بە ئەسڵ خەڵکی واسیتە.

لە میسر نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش لە ساڵی ٣١٦ك کۆچی دوایی کردووە.

کەسێکی خاوەن شانوشکۆ بووە و کەراماتی زۆری لێبینراوە.

**پرسیار لە بەنان کرا دەربارەی باڵاترین حاڵی سۆفی، وتی:** متمانە بە رۆزی خودا و هەستان بە فەرمانەکان و پاراستنی نهێنی دڵ و دوورکەوتنەوە لە کوفییەکان.

**أبو علی رۆزباری دەڵێت:** بەنانی حەماڵ خرایە بەردەم دڕندە، دڕندەکە بۆنی پێوە دەکرد و هیچ زیانێکی پێنەگەیاند.

**کاتێك هێنرایە دەرەوە پێیوترا:** کاتێك دڕندەکە بۆنی پێوە دەکردی چی لە دڵتدا بوو؟ وتی: بیریم دەکردەوە لە جیاوازی زانایان دەربارەی بەرماوەی دڕندە.

# ٤٦. ئەبو حەمزە بغدادی ئەلبەزاز

**أبو حمزة البغدادي البزاز**، بەر لە جونەید مردووە و یەکێك بـووە لـە هاودەمـەکانی، هاوەڵی **"السري السقطي و الحسن المسوحي"** کردووە، کەسێکی فەقیـە و زانـابوو بـە جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان.

لە نەوەی عیسای کـوڕی ئـەبان بـوو، ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل لـە هەنـدێ بابەتـدا پرسیاری لێ دەکرد و دەیوت: سۆفی، تۆ چی لەسەر ئەم بابەتە دەڵێی؟

**وتراوە:** ڕۆژێك لە دانیشتنێکیدا قسەی دەکرد و حاڵی گۆڕا و لەسـەر کورسـییەکەی بەربوویەوە و لە هەینی داهاتوودا کۆچی دوایی کرد.

وتراوە ساڵی ٢٨٩ك کۆچی دوایی کردووە.

**ئەبو حەمزە دەڵێت:** هەر کەس ڕێگەی بەرەو حەق بناسێت گرتنەبەری لەسەر ئاسان دەبێت، بەڵگە لەسەر گرتنەبـەری ڕێگـەی بەرەوخوداچـوون بریتییـە لـە شـوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە حاڵ و کردار و گوفتاریدا.

**هەروەها دەڵێت: هەر کەس سێ شتی پێ بدرێت لە ئافەت ڕزگاری بووە:**

١. سکێکی خاڵی و دڵێکی ڕازی.

٢. هەژارییەکی بەردەوام و زوهدێکی ئامادە.

٣. ئارامییەکی کامڵ و یادێکی هەمیشەیی.

# ٤٧. ئەبوبەكری واسیتی

**أبوبكر بن موسى الواسطي**، بە ئەسڵ خۆراسانییە، لە ناوچەی "فەرغانـە"، هـاوەڵی جونەید و نووری كردووە.

زانایەكی شانوشكۆ مەزن بوو، لە "مەرو" نیشتەجێ بوو بـوو، هـەر لـەوێش سـاڵی ٣٢٠ك كۆچی دوایی كرد.

**"الواسطي" دەڵێت:** ترس و رجا دوو پـارێزەرن رێگـری دەكـەن لـە ئـەدەبی خراپـی بەندە.

**هەروەها دەڵێت:** چاوەڕوانی پاداشت لەسەر كارە باشەكان لە لەبیرچوونی فەزڵـەكانی خودایە.

**هەروەها دەڵێت:** گەر خودا سووكی بەندەیەكی ویست هەڵیدەداتە ناو ئەو بۆگەنی و لاكەتۆپییوانە، پاشان هاوەڵی منداڵان دەكات.

**هەروەها دەڵێت:** خراپی ئـەدەبی خۆیـان كـردووە بـە ئـیخلاص، و حـەزی نەفسـیان كردووە بە كرانەوە، و پەستی و بێ ویستیان كردووە بە بەجەرگی، بۆیـە رێگـەیان لـێ بزر بوو و تەنگەڕێگەیان گرتەبەر، ژیان لە موشاهەدەیان سەوز نابێت و عیبـادەت بـە ئامادەبوونیان پاك نابێتەوە، كاتێك قسە دەكەن بە تووڕەییـەوە قسـە دەكـەن، كاتێـك گفتوگۆ دەكەن بە لوتبەرزی گفتوگۆ دەكەن، باوێشكی دەروونیان پیسی ناخیان نیشان دەدات، حەزی زۆریان لە خواردن ئەوەی لە قوڵایی پەنهانیاندایە ئاشكرا دەكات، خودا بیانكوژێت بۆ درۆ و فریویان.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق دەڵێت:** كەسێكی صەیدەلانی دەڵێت: رۆژێكی هـەینی **"الواسطي"** بـە بـەردەم دووكانەكەمـدا گـوزەری كـرد و بـەرەو مزگـەوت دەڕۆیشـت، نەعلەكەی پچڕا، منیش وتم: مامۆستا رێگە دەدەی من نەعلەكەت بۆ چاك بكەم؟

وتی: چاكی بكە.

منیش نەعلەکەم بۆ چاك کردەوە، وتی: دەزانی بۆ نەعلەکەم پچڕا؟

وتم: بۆچی؟

وتی: چونکە بۆ جومعە خۆم نەشۆری بوو!!

وتم: گەورەم لێرە حەمامێك هەیە دەتەوێ خۆت بشۆی؟

وتی: بەڵێ، منیش بردم بۆ حەمامەکە و غوسلی جومعەی دەرکرد.

## ٤٨. ئەبو حەسەنی کوڕی صائغ

ناوی: علی کوڕی سەهلی دەینووری.

لە میسر نیشتەجێ بووە و لەوێش مردووە، یەکێك بووە لە گەورەپیاوان.

**"أبو عثمان المغربي"** دەڵێت: هیچ کەسم نەبینیوە لە **"أبي يعقوب النهرجوري"** نوورانی تر بێت و لە **"أبي الحسن بن الصائغ"** بە هەیبەتتر بێت.

ساڵی ٣٠٣ك کۆچی دوایی کردووە.

**پرسیار کرا لە "ابن الصائغ" دەربارەی بەڵگەهێنانەوە بە ئامادە(دیار) لەسەر نادیار، وتی:** چۆن بەڵگە بە سیفەتی کەسێك دەهێنرێتەوە کە نموونە و هاوشێوەی هەیە لەسەر کەسێك شێوە و نموونەی نییە؟

**دەربارەی سیفەتی مورید پرسیاری لێکرا، وتی:** ئەوەیە خودا دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ﴾ التوبة: ١١٨

**هەروەها دەڵێت:** حاڵەکان وەك بروسکە وان، کاتێك جێگیر دەبن(دەوەستن) دەبنە قسەی دەروون و پابەندبوونی سروشت.

# ٤٩. ئیبراهیمی رەقی

**أبو إسحاق إبراهيم بن داود الرقي**، لە گەورەپیاوانی شامە.

هاودەمی جونەید و ئیبن جەلایە.

تەمەنێکی درێژی هەبووە و تا ساڵی٣٢٦ك ژیاوە.

**ئیبراهیمی رەقی دەڵێت:** مەعریفە بریتییە لە سەوزبوونی حەق وەکو خۆی، بەدەر لە هەرشتێکی ئەندێشەکراو.

**هەروەها دەڵێت:** دەسەڵات ئاشکرایە، چاوەکان کراوەن، بەڵام نووری بینین لاواز بووە.

**هەروەها دەڵێت:** لاوازترین بەندە ئەو کەسەیە ناتوانێت حەزەکانی بەرپەرچ بداتەوە(لەغاو بکات)، بەهێزترین بەندەش ئەو کەسەیە هێزی بەرپەرچدانەوەی حەزەکانی لەلایە.

# ٥٠. ممشادی دینوری

**ممشاد الدينوري**، لە گەورەپیاوانی رێگەیە، ساڵی ٢٩٩ك کۆچی دوایی کردووە.

**"ممشاد"** دەڵێت: ئەدەبی مورید لە پابەندبوون بە سنوورەکانی گەورەپیاوان و خزمەتی برایان و دەرچوون لە هۆکارەکان و پارێزگاری ئادابی شەرعە لەسەر نەفسی خۆ.

**هەروەها دەڵێت:** هەرکات دەچمە لای یەکێك لە مامۆستایانم لە هەرچی شتە خۆم خاڵیدەکەمەوە چاوەڕوانی بەرەکەتی بینین و قسەی ئەو دەکەم بە سەرمدا داببارێت، هەر کەس بە حەزی خۆیەوە بچێتە لای یەکێك لە گەورەپیاوان بێبەش دەبێت لە بەرەکەتی بینین و دانیشتن و قسەکانی.

# ٥١. خير النساج

هاوەڵی ئەبو حەمزەی بەغدادی کردووە و بە **"السري"** گەیشتووە، لە هاودەمانی **"أبي الحسن النوري"** بووە، بەڵام تەمەنێکی درێژی هەبووە، وەك دەوترێت سەد و بیست ساڵ ژیاوە.

لەسەر دەستی ئەو **"الشبلي و الخواص"** تەوبەیان کردووە، مامۆستای ئەم دەستەیە بووە.

وتراوە ناوی **محمدی** کوڕی ئیسماعیل بووە، خەڵکی شاری سامەڕە بووە، بۆیە ناونراوە "خير النساج" چونکە دەچێت بۆ حەج، لە دەروازەی کوفە پیاوێك دەیگرێت و پێی دەڵێت: تۆ بەندەی منی و ناوت خەیرە.

-ئەو پیاوێکی رەشپێست بوو- سەرپێچی نەکرد لە قسەی پیاوەکە، ئەو کەسە لە چنینی ئاورشمدا خەیری(محەمەدی کوڕی ئیسماعیل) بەکارهێنا، پیاوەکە بانگی دەکرد بە "ئەی خەیر" ئەویش دەیوت: بەڵی گەورەم.

پاش چەندین ساڵ پیاوەکە وتی: من بە هەڵەداچووم، تۆ بەندەی من نیت و ناویشت خێر نییە.

ئەویش پیاوەکەی بەجێهێڵا و وتی: ناوێك ناگۆڕم پیاوێکی موسڵمان لە منی ناوە.

**"خير النساج" دەڵێت:** ترس قەمچی خودایە نەفسگەلێکی پێ راست دەکاتەوە کە لەسەر بێئەدەبی بارهاتووە(خۆی راهێناوە).

**ئەبو حەسەنی مالیکی دەڵێت:** لە حەزرەمەوت پرسیاری حاڵ و باری "خير النساج"م کرد، کاتێك نوێژی مەغریب هات بوورایەوە، پاشان چاوی کردەوە و ئاماژەی کرد بە لایەکی ماڵەکە و وتی: بوەستە، خودا راوەستاوت بکات، تۆ بەندەیەکی فەرمانت پێکراوە(مەبەستی فریشتەی گیانکێشانە) و منیش بەندەیەکم فەرمانم پێکراوە، ئەوەی بە تۆ فەرمانکراوە لە دەستت دەرناچێت و جێبەجێی دەکەی،

بەڵام ئەوەی بە من فەرمان کراوە لە دەستم دەچێت، داوای ئاوی کرد بۆ دەستنوێژ و نوێژی کرد و پاشان ڕاکشا و چاوەکانی لێکنا و شایەتمانی هێنا و گیانی سپارد، لە خەوندا بینرا و پێیوترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی بە پرسیارکەرەکە پرسیاری ئەوەم لێ مەکە، بەڵام لە دونیا قێزەونەکەی ئێوە ڕزگارم بوو.

## ٥٢. ئەبو حەمزەی خوراسانی

أبو حمزة الخراساني، لە نیسابوور ژیاوە لە گەڕەکی "ملقاباد"، لە هاودەمانی "جونەید و الخراز و ئەبو تورابی نەخشەبی"یە، پیاوێکی خاوەن وەرعی بەدین بووە.

**ئەبو حەمزە دەڵێت:** هەرکەس هەستی بە یادی مردن کرد ئەوا خودا ئەو شتانەی دەمێننەوە لای خۆشەویست دەکات و ئەو شتانەی تیادەچن لای ناشیرین دەکات.

**هەروەها دەڵێت:** کەسی عاریف ژیانی ئەمڕۆ بۆ سبەینێیە، ئەمڕۆ بە سبەینێ پاڵ پێوە دەنێ و ئەمڕۆ بۆ سبەینێ بەدەست دەهێنێت.

پیاوێك پێی وت: ئامۆژگاریم بکە.

وتی: توێشوو -کە لەبەردەستدایە- ئامادە بکە بۆ سەفەر.

**هەروەها دەڵێت:** بە عەبایەك ئیحرامم دەبەست و هەموو ساڵێك هەزار فرسەخ ڕێگەم دەبڕی، خۆرم لێ هەڵدەهات و لێم ئاوا دەبوو، هەرکات ئیحرامم بشکاندبایە جارێکی تر دەمبەستەوە.

ساڵی ٢٩٠ك کۆچی دوایی کردووە.

# ٥٣. ئەبو بەكری شیبلی

**أبوبكر دلف بن حجدر الشبلي**، لەدایكبوون و گەورەبوونی لە بەغداد بووە، ریشە و بنەچەی بۆ **"أسر وشنة"** دەگەڕێتەوە.

هاوەڵی جونەید و ئەوانەی لە چاخی ئەودا بوون كردووە، لە رووی حاڵ و ئاكار و زانستەوە مامۆستای سەردەمی خۆی بووە، لەسەر مەزهەبی مالیكی بووە، هەشتا و حەوت ساڵ ژیاوە، ساڵی ٣٣٤ك كۆچی دوایی كردووە و گۆڕەكەی لە بەغدادە.

كاتێك شیبلی لە ئەڵقەی دانیشتنی "خير النساج"دا تەوبەی كرد، هات بۆ دەماوەند و وتی: من والی شارەكەی ئێوە بووم گەردنم ئازاد بكەن.

لە سەرەتاوە تێكۆشانەكانی لە سنووربەدەر بوون.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق دەڵێت:** هەواڵم پێگەیشت چاوی ئەوەندە جار بە خوێ رشتووە بۆ ئەوەی لەسەر نەخەوتن رابێت و نەخەوێت، بۆ مەزنڕاگرتنی شەرع ئەوەندە بەسە **"بكران الدينوري"** لە كۆتاییەكانی تەمەنیدا دەربارەی شبلی باسی دەكات.

**"أبو العباس البغدادي" دەڵێت:** شبلی(رەحمەتی خودا لێ بێت) لە كۆتا رۆژەكانی تەمەنیدا دەیوت:

**وكم من موضع لومت فيه لكنت به نكالا في العشيرة**

(لە زۆر شوێن(مەقام)دا لۆمە كراوم، بەو مەقامە بووم بە نەگبەتی هۆزەكەم(دەستەكەم))

كاتێك رەمەزان دەهات زیاتر لە هەر كەسێك شبلی خۆی توند دەكردەوە و خۆی ماندوو دەكرد و دەیوت: ئەمە ئەو مانگەیە پەروەردگارم بەمەزنی راگرتووە، من یەكەمین دەبم لە بەمەزنڕاگرتنی.

# ٥٤. عبدالله کوڕی محمد مرتعش

**أبو محمد عبدالله بن محمد المرتعش**، خەڵکی نیسابوور بووە لە گەڕەکی **"الحیرة"** وتراویشە لە گەڕەکی "ملقاباد"

هاوڕێیەتی "أبا حفص"ی کردووە و چاوی بە جونەید کەوتووە، کەسێکی خاوەن شانوشکۆ بووە.

لە مزگەوتی **"الشونزیە"** دەمایەوە، ساڵی ٣٢٨ك لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە.

**"المرتعش" دەڵێت:** ویست بریتییە لە بەندکردنی نەفس لە مەبەستەکانی و ڕووکردنە فەرمانەکانی خودا و ڕازیبوون بەوەی لەلای خوداوە بەسەر ئەودا دێت.

**پێیوترا:** فلان کەس بەسەر ئاودا دەڕوات، وتی: لەلای من ئەو کەسەی خودا توانای پێداوە سەرپێچی ئارەزووکانی بکات لە ڕۆیشتن بەسەر ئاودا مەزنترە.

# ٥٥. ئەبو عەلی رۆزباری

**أبو علي أحمد بن محمد الروزباري**، خەڵکی بەغدادە، لە میسر نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش لە ساڵی ٣٢٢ك کۆچی دوایی کردووە، هاوەڵی جونەید و نووری و ئیبن جەلا و هاودەمانی ئەوانی کردووە.

ناوازەترین و زاناترین کەس بووە بە رێگەکە.

**وتیان بە أبو عەلی کەسێك گوێ لە دەنگ و ئاوازی بێئاگاکەر دەگرێت و دەڵێت:** بۆم حەڵاڵە، چونکە گەیشتوومەتە پلەیەك کار ناکاتە گۆڕینی حاڵم، وتی: بەڵێ گەیشتووە، بەڵام بۆ سەقەر.

**پرسیاری لێکرا دەربارەی تەصەوف، وتی:** ئەم مەزهەبە هەمووی سووربوون و تێکۆشانە، بۆیە تێکەڵی مەکەن بە شتێك لە گاڵتە.

**هەروەها دەڵێت:** لە نیشانەکانی فریوخواردن ئەوەیە خراپە بکەی و خودا چاکەت لەگەڵ بکات، ئەو کات پاڕانەوە و تەوبە وازلێ بهێنیت، بەو گومانەی گوایە خودا لە هەڵەکانی تۆ بووراوە، بۆیە چاکەت لەگەڵ دەکات و دەرگات بەڕوودا دەکاتەوە.

**هەروەها دەڵێت:** مامۆستام لە تەصوفدا جونەید بوو، لە فیقهدا أبو العباسی کوڕی شریح، لە ئەدەبدا **"ثعلب"** و لە فەرمووددەدا **إبراهیم الحربي**.

❁ ❁ ❁

# ٥٦. عبدالله گ كوڕی منـازل

**أبو محمد عبدالله بن منازل**

پێشـەوای مەلامەتییەکانـە، نـاوازەی سـەردەمی خـۆی بـووە، هـاوەڵی حەمـدونی قەصاری کردووە.

کەسێکی زانا بوو، فەرموودەی زۆری نووسیوە.

ساڵی ٣٢٩ك یان ٣٣٠ك لە نیسابوور کۆچی دوایی کردووە.

**"عـبدالله بن مـنازل" دەڵێت:** هەر کەس فەرزێك لە فەرزەکان لەدەست بـدات خـودا بە وازهێنان لە سوننەت گیرۆدەی دەکات، هەر کەس بە وازهێنان لە سوننەت گرفتـار ببێت بە کەوتنە ناو بیدعەوە گرفتار دەبێت.

**هـەروەها دەڵێـت:** باشـترین کـات ئـەو کاتەیـە لـە خایلـە و ختوورەکـانی نەفسـت سەلامەت بوویت، هەروەها ئەو کاتەیە لە گومانی خراپ رزگارت بووە.

۞ ۞ ۞

# ٥٧. محمد ثقفي

**أبو علي محمد بن عبدالوهاب الثقفـي**، ئیمـامی سـەردەمی خۆیـەتی، هـاوەڵی ئـەبو حەفص و حەمدونی قەصاری کردووە.

بـەهۆی ئـەوەوە تەصـەوف لـە نیسـابوور دەرکـەوتووە، سـاڵی ٣٢٨ك کۆچـی دوایـی کردووە.

**ئەبو عەلی دەڵێت:** گەر کەسێك هەرچی زانستە کۆی بکاتەوە و هاوەڵی کۆمـەڵێك لە پیاوان بکات تەنها بـە وەرزش دەگاتـە پلـە و پایـەی پیاوان(مورشـید و پێشـەوا و ئەدەبدادەر و ئامۆژگاریکەر)، هـەر کـەس لـە مامۆسـتایەکەوە ئـەدەب وەرنـەگرێت و نەنگی کردارەکانی خۆی و حەزەکانی دەروونی لە ئەوەوە پەی پێ نەبات دروست نییـە لە راستکردنەوەی مامەڵەکاندا بکرێتە پێشەنگ.

**هەروەها دەڵێت:** رۆژگارێك بەسەر ئومەتەدا تێدەپەڕێت گـوزەرانی کەسـی بـاوەڕدار نایەتە راستە مەگەر کەسێکی دووڕوو بکات بە پشتیوانی خۆی.

**هەروەها دەڵێـت:** ئـۆف لـە سـەرقاڵییەکانی دونیـا کـاتێ دێنـە بـەرەوە، ئـۆف لـە حەسرەتەکانیان کاتێك پشتت تێدەکەن، کەسی ژیرمەند ئەو کەسـەیە مـەیل نـەدا بـە دونیا کاتێك رووی تێدەکات و حەسرەتی بۆ نەخوات کاتێ پشتی تێدەکات.

# ٥٨. أبوالخير الأقطع

**أبوالخير الأقطع**

خەڵکی مەغریبە، لە "تینات" نیشتەجێ بووە، کەراماتی زۆری هەبووە و خاوەنی فیراسەتێکی تیژ بووە، کەسێکی شکۆدار بووە، دەوروبەری ساڵی ٣٤٠ك کۆچی دوایی کردووە.

**"أبو الخير" دەڵێت:** هیچ کەس ناگاتە حاڵەتە بەرز و بڵندەکان تا کارەکانی تەبا نەبن لەگەڵ شەریعەت، دەستەملانی ئەدەب ببێت و فەرزەکان جێبەجێ بکات و هاوەڵی صاڵحان بکات.

# ٥٩. ئەبوبەکری کەتانی

**أبوبكر محمد بن علي الكتاني(ئەبوبەکری کەتانی)**

بە ئەسڵ خەڵکی بەغدادە، هاوەڵی جونەید و خەراز و "النوري"ی کردووە.

جیرانی مەککەی شکۆمەندی کردووە تا لە ساڵی ٣٢٢ك کۆچی دوایی کردووە.

**ئەبوبەکری رازی دەڵێت:** "کەتانی" تەماشای پیاوێکی کرد سەر و ریشی سپی بوو سواڵی دەکرد، وتی: ئەم پیاوە لە گەنجێتیدا مافی خودای تیابردووە خوداش لە پیریدا ئەوی تیابرد.

**هەروەها "کەتانی" دەڵێت:** حەزەکان رەشۆی شەیتانن، هەرکەس رەشۆکەی بەدەست شەیتانەوە بێت بەندەی شەیتانە.

❁ ❁ ❁

# ٦٠. إسحاق کوڕی محمد النهرجوری

**أبو يعقوب إسحاق بن محمد النهرجوري**

هاوەڵی **"أبا عمرو المكي و أبا يعقوب السوسي و الجنيد"** و کەسانی تری کردووە، لە ساڵی ٣٠٠ك لە مەککە کۆچی دوایی کردووە.

**"النهرجوری" دەڵێت:** دونیا دەریایەکە و دوارۆژ کەناری رزگارییە، تەقوا کەشتییە و خەڵکیش لە سەفەردان.

**هەروەها دەڵێت:** پیاوێکم لە تەواف بینی، یەك چاوی هەبوو، دەیوت: پەنا دەگرم بە خۆت لە خۆت، وتم: ئەم دوعایە چییە؟

وتی: رۆژێك تەماشای کەسێکم کرد و لام جوان بوو، لەناکاو دەستێك کێشای بە چاومدا و چاوم پەردەی بەسەردا هات، گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت: زللەیەك بە سەیرکردنێك.. گەر زیادت بکردبایە بۆمان زیاد دەکردی.

**هەروەها دەڵێت:** باشترین حاڵ ئەوەیە لەسەر زانست(شەریعەت) راستبوو‌بێتەوە.

# ٦١. علی کوڕی محمد المزين

**أبو الحسن علي بن محمد المزين**

خەڵكی بەغداد بوو، لە هاوەڵانی سەهلی کوڕی عەبدوڵا و جونەید و هاودەمانیان بوو، لە ساڵی ٣٢٨ك لە مەککە کۆچی دوایی کردووە.

کەسێكی خاوەن وەرعی مەزن بووە.

**"المزين" دەڵێت:** گوناه لە دوای گوناه سزای گوناهی یەکەمە، چاکە لە دوای چاکە پاداشتی چاکەی یەکەمە.

**پرسیار لە "المزين" کرا دەربارەی یەکتاپەرستی، وتی:** ئەوەیە بزانین ئەوصافەکانی خودا لە ئەوصافی دروستکراوان جیاوازە، خودا بە سیفەتە دێرینەکانی لەوان جیاوازە، وەك چۆن ئەوان بە سیفەتە سەرهەڵدراوەکانیان(رووداوەکان) لە خودا جیاوازن.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس بە خودا بێنیاز نەبێت لە خەڵکی خودا ئاتاجی دەرگای خەڵکی دەکات، هەر کەسیش بە خوداوە بێنیاز بێت خودا خەڵك بەو ئاتاج دەکات.

# ٦٢. ئەبو علی کوڕی الکاتب

**أبو علي بن الكاتب**

ناوی "الحسن بن أحمد"ە، هاوەڵی ئەبو عەلی رۆزباری و ئەبوبەکری مصری و کەسانی تری کردووە، کەسێك بووە لە حاڵدا زۆر مەزن بووە، دەوروبەری ساڵی ٣٤٠ك کۆچی کۆچی دوایی کردووە.

**"إبن الكاتب" دەڵێت:** کاتێك ترس لە دڵدا نیشتەجێ بوو، زمان قسەیەك ناکات پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت.

**هەروەها دەڵێت:** موعتەزیلە لەڕووی ئەقڵەوە خودایان بە پاك راگرت، سۆفییەکان لەڕووی زانستەوە(شەریعەتەوە) خودایان بە پاك راگرت، بۆیە سۆفییەکان حەقیان بەدەستهێنا.

# ٦٣. مظفر القرمسيني

**مظفر القرمسيني**

له گەورەپیاوانی لاپاڵەکانی چیای قاسیۆنە، هاوەڵی عەبدوڵا خەراز و کەسانی تری کردووە.

**موزەفەر دەڵێت: ڕۆژوو سێ ڕووی هەیە:**

١. **ڕۆژووی ڕۆح** بە کورتی هیوا و ئاوات.

٢. و **ڕۆژووی ئەقڵ** بە سەرپێچیکردن لە ئارەزوو.

٣. و **ڕۆژووی نەفس** بە خۆگرتنەوە لە خواردن و حەرامکراوەکان.

**هەروەها دەڵێت:** خراپترین هەدیە و پێدان وەرگرتنی هەدیەی ژنانە لە هەر ڕوویەکەوە بێت.

**هەروەها دەڵێت:** گەر قەناعەت کۆمەکی برسێتی بکات دەبێتە کێڵگەی بیر و سەرچاوەی حیکمەت و زیندەگی هۆشمەندی و زیرەکی و چرای ڕۆشنی دڵ.

**هەروەها دەڵێت:** باشترین کاری بەندەکان بریتییە لە پارێزگاری کاتەکان لە ئێستادا، ئەوەش ئەوەیە کەمتەرخەمی لە کارێکدا نەکەن و سنوورێك تێنەپەڕێنن(نەشکێنن).

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس ئەدەب لە حەکیمێکەوە وەرنەگرێت ئەدەبی موریدی پێ دانادرێت.

# ٦٤. عبدالله کوڕِی طاهر الأبهري

**أبوبكر عبدالله بن طاهر الأبهري**

له هاوده‌مانی شیبلی بووه له گه‌وره‌پیاوانی لاپاڵه‌کانی چیای قاسیۆنه.

زانایه‌کی خاوه‌ن وه‌رع بووه، هاوه‌ڵی یوسفی کوڕی حوسه‌ین و که‌سانی تری کردووه.

نزیك به ساڵی ۳۳۰ك کۆچی دوایی کردووه.

"**أبوبكر بن طاهر**" **ده‌ڵێت:** له حوکمه‌کانی هه‌ژاری ئه‌وه‌یه هیچ حه‌زێکی نه‌بێت، گه‌ر ناچاربوو ئه‌وا حه‌زی له ئاتاجی تێپه‌ڕنه‌بێت(واته ئه‌وه‌نده به‌ده‌ست بهێنێت که پێی ئاتاجه)

**هه‌روه‌ها ده‌ڵێت:** گه‌ر برایه‌کت له‌به‌ر خودا خۆشویست له دونیادا تێکه‌ڵی له‌گه‌ڵ که‌مبکه‌ره‌وه.

# ٦٥. ئەبو الحسن کوڕی بنـان

**أبو الحسن بن بنان**

ڕێگە و سلوکی دەچێتەوە سەر **"أبي سعيد الخراز"** و لە گەورەپیاوانی میسر بووە.

ئیبن بەنان دەڵێت: هەر سۆفییەك خەمی ڕۆزی لە دڵدا ڕاست بووبێتەوە پابەندبوون بە کارەوە(کەسابەت) بۆ ئەو لەپێشترە.

**هەروەها دەڵێت:** لە ڕەوشتی نزم دووربکەونەوە وەك چۆن لە حەرام دووردەکەونەوە.

# ٦٦. إبـراهيم کوڕی شيبـان القرمسينی

**أبو إسحاق إبراهيم بن شيبان القرمسيني**

مامۆستای سەردەمی خۆی بووە، هاوەڵی ئەبو عەبدوڵای مەغریبی و خەواص و کەسانی تری کردووە.

**ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەڵێت:** هەر کەس دەیەوێت دەست بەتاڵ بێت و بە پڕوپووچەوە خەریك بێت با دەستبداتە ڕوخسەت وەرگرتن.

**هەروەها دەڵێت:** زانستی فەنا و بەقا بە دەوری ئیخلاص لە یەکتاپەرستی و دروستی بەندایەتیدا دەسوڕێتەوە، هەر شتێکی تر جگە لەمە هەڵە و زەندەقەیە.

**هەروەها دەڵێت:** گەمژە ئەو کەسەیە لە خودا یاخی دەبێت.

# ٦٧. حسين كوڕی علی ئیبن یزدانیار

**أبوبكر الحسين بن علي بن يزدانيار**

خەڵكی ئەرمینیایە، ڕێگەیەكی تایبەت بە خۆی لە تەصەوفدا هەبوو.

زانایـــەكی خـــاوەن وەرع بـــوو، گـــوزارە و قســـەی هەنـــدێ لـــە عاریفـــانی ڕەد دەكردەوە(چونكە پێی وابوو پەردەلادانە لەسەر نهێنی ئەم ڕێگەیە، بۆیـە دەڵێـت: تـۆ دەمبینی دژ بە تەصەوف و سۆفییەكان قسە دەكەم، سـوێند بـە خـودا لـە غـیرەتم بـۆ ئەوان ئەو قسـانە دەكـەم، چـونكە نهێنییـەكانی حـەقیان بـڵاوە پێكـردووە و نیشـانی كەسانی نائـەهلیان داوە، ئـەوەش پاڵینـام بـۆ غـیرەت لەسـەریان و قسـە دەربارەیـان، ئەگینا ئەوانە سەردارانن و بە خۆشەویستی ئەوان لە خودا نزیك دەبمەوە)

**ئیبن یەزدانیار دەڵێت:** هەرگیز بە تەمای هۆگری مەبە بە خـوداوە لـە كاتێكـدا تـۆ هۆگریت بە خەڵكەوەیە.

هەرگیز بەتەمای خۆشەویستی خودا مەبە لە كاتێكدا حەزت لە زیادە دونیایە.

هەرگیز بەتەمای پلە و پایە مەبە لەلای خودا لە كاتێكدا عەودالی خۆشەویستی پلە و پایەی لە دڵی خەڵكیدا.

# ٦٨. ئەبو سعید الأعرابي

**أبو سعيد الأعرابي**

ناوی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی زیادی بەصرییە.

جیرانی حەرەمی کردووە و ساڵی ٣٤١ك کۆچی دوایی کردووە.

هاوەڵی جونەید و عەمری کوڕی عوسمانی مەکی و "النوری" و کەسانی تری کردووە.

**ئیبن ئەعرابی دەڵێت:** گەورەترین زیانۆمەند ئەو کەسەیە کردەوە باشەکانی نیشانی خەڵکی دەدات و بە کردەوە خراپەکانی زۆرانبازی لەگەڵ کەسێکدا دەکات لە رەگی بناگویێ لەو نزیکترە(واتە خودا).

## ٦٩. محمد كوڕی إبراهيم الزجاجی النيسابوری

أبو عمرو **محمد** بن إبراهيم الزجاجي النيسابوري

ساڵانێکی زۆر جیرانی مەککەی کردووە و هەر لەوێش مردووە.

هاوەڵی "جونەید و أبو عوسمان و النوری و الخواص و الرويم"ی کردووە.

ساڵی ٣٤٨ك کۆچی دوایی کردووە.

**پرسیار لە ئەبو عەمری زوجاجی کرا:** بۆچی لە "الله أكبر"ی یەکەمی نوێژە فەرزەکاندا ڕەنگت دەگۆڕێت؟

وتی: چونکە دەترسم بە پێچەوانەی صدقەوە سەرەتای نوێژەکەم دەست پێبکەم، هەرکەس دەڵێت: "ألله أكبر" و لە خودا گەورەتر لە دڵیدا شتێك بوونی هەبێت، یان کەسێکی جگە لە خودا بەدرێژایی کات بە گەورە دانابێت ئەوا لەسەر زمانی خۆی خۆی بەدرۆخستۆتەوە.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس قسە لە حاڵێك بکات خۆی پێی تێنەنابێت قسەکانی دەبن بە فیتنە بۆ ئەو کەسانەی دەیبیستن.

ساڵانێکی زۆر جیرانی مەککەی کردووە و لە ناو مەککە دا نەچووەتە سەر پێشاو، بەڵکو دەچووە دەرەوەی مەککە و خۆی پاك دەکردەوە و دەستنوێژی هەڵدەگرت.

# ٧٠. جەعفەری کوڕی محمد کوڕی نصیر

**أبو محمد جعفر بن محمد بن نصير**

له بەغداد لەدايك بووه و گەوره بووه.

هاوەڵی جونەیدی کردووه و لە ڕێگە و سلوکدا شوێنی ئەو کەوتووه، هەروەها هاوەڵی **"النوري و رويم و سمنون"** و هاودەمانی ئەوانی کردووه، ساڵی ٣٤٩ك لە بەغداد کۆچی دوایی کردووه.

**جەعفەری کوڕی محمد دەڵێت:** بەندە لەگەڵ چێژی نەفس چێژی مامەڵە لەگەڵ خودا ناکات، چونکە ئەهلی حەقیقەت پەیوەندی خۆیان بە وابەستەکانەوە بڕیوه لە پێناوی حەقدا، بەر لەوەی وابەستەکان پەیوەندی خۆیان لەگەڵ بچڕن.

**هەروەها دەڵێت:** لە نێوان بەندە و بووندا جێگیربوونی تەقوا هەیە لە دڵیدا، کاتێك تەقوا لە دڵیدا نیشتەجێ بوو بەرەکەتی زانست بەسەریدا دادەبارێت و حەزی دونیای لێ جیادەبێتەوە.

## ٧١. ئەبو العباس السياری

**ناوی قاسمی کوڕی قاسمی کوڕی مەهدییە.**

خەڵکی مەروە، هاوەڵی **"الواسطي"** کردووە، زانستی ئەم دەستەیەی لە ئەوەوە وەرگرتووە، کەسێکی زانا بووە، ساڵی ٣٤٢ك کۆچی دوایی کردووە.

**پرسیار لە ئەبو عەباسی سەیاری کرا:** مورید بە چی نەفسی خۆی باربهێنێت؟

وتی: بە ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراوەکان و هاوەڵی صاڵحان و خزمەتی هەژاران.

**هەروەها دەڵێت:** کەسی ژیر و هۆشمەند بەتەنها بینینی حەق چێژ وەرناگرێت، چونکە بینینی حەق فەنایە و چێژی تێدا نییە(مەبەستی ئەوەیە لە فەنادا کەسێك نامێنێتەوە چێژ وەربگرێت، بۆیە چێژ بوونی نییە).

## ٧٢. محمد کوڕی داود الدینوری

أبوبكر **محمد بن داود الدينوري**، بە **"الدقي"** ناسراوە.

لە شام نیشتەجێ بووە و زیاتر لە سەد ساڵ تەمەنی درێژبووە.

لە دوای ٣٥٠ك لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کردووە.

هاوەڵی ئیبن جەلا و زەقاقی کردووە.

**"أبوبكر الدقي" دەڵێت:** گەدە شوێنێکە خواردن کۆدەکاتەوە، گەر حەڵاڵی تێبکرێت ئەندامەکانی جەستە بە کاری چاکە هەڵدەستن، گەر خواردن و خواردنەوەی شوبهەی تێکرد ڕێگەی بەرەو خوداچوونی لێ تاریك و لێڵ دەبێت، گەر حەرامی تێکرد ئەوا پەردە لە نێوان ئەو و خودادا پەیدا دەبێت.

# ٧٣. عبدالله کوڕی محمد الرازی

**أبو محمد عبدالله بن محمد الرازي**

هاوەڵی ئەبو عوسمانی خەیری و جونەید و  یوسفی کوڕی حوسەین و ڕوەیم و سمنون و کەسانی تری کردووە.

ساڵی ٣٥٣ك کۆچی دوایی کردووە.

**پرسیار لە عەبدوڵای کوڕی محمدی رازی کرا:** ئەو خەڵکانە بۆ نەنگی و ناتەواوییەکانی خۆیان دەبینن و ناگەڕێنەوە بۆ لای خودا؟

وتی: چونکە بە زانست سەرقاڵی خۆنمایش کردنن و سەرقاڵ نین بە بەکارهێنانی زانستەوە، خۆیان بە ڕواڵەتەوە خەریك کردووە و ئادابی ناوەوەیان وازلێهێناوە، بۆیە خودا چاوەکانی کوێرکردوون و ئەندامەکانی لە ئەنجامدانی عیبادەتەکان کۆتوبەند کردوون.

# ٧٤. ئەبو عەمر إسماعيل كوڕی نجيد

**أبو عمرو إسماعيل بن نجيد**

هاوەڵی ئەبو عوسمانی کردووە و بە جونەید گەیشتووە، کەسێکی خاوەن شانوشکۆ بووە.

دواین کەسێك بووە لە هاوەڵانی عوسمان لە ساڵی ٣٦٦ك لە مەککە کۆچی دوایی کردووە.

**أبو عەمر دەڵێت:** هەموو حاڵێك لە زانستەوە سەرچاوەی وەرنەگرتبێت زیانەکەی لەسەر خاوەنەکەی لە قازانجەکەی زۆرترە.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس لە کاتێك لە کاتەکاندا فەرزێك لەو فەرزانەی خودا پێویستی کردوون تیا ببات لە چێژی ئەو فەرزە بێبەش دەبێت، با زۆریش بخایەنێت.

**پرسیاری لێکرا دەربارەی تەصەوف، وتی:** بریتییە لە ئارامگرتن لەژێر فەرمان و نەهیدا.

**هەروەها دەڵێت:** ئافەتی بەندە ئەوەیە رازی بێت بەوەی تیایدایە.

# ٧٥. على كوڕى أحمد كوڕى سهل البوشنجى

**أبو الحسن علي بن أحمد بن سهل البوشنجي**

یەکێك بووە لە لاوەکانی خۆراسان.

بە **"أبا عثمان و ابن عطاء و الجريري و أبا عمرو الدمشقي"** گەیشتووە.

ساڵی ٣٤٨ك كۆچی دوایی كردووە.

پرسیار لە بۆشەنچی کرا دەربارەی جوامێری و پیاوەتی، وتی: بریتییە لە وازهێنان لە بەکارهێنانی ئەوەی لەسەرت حەرامکراوە لەگەڵ فریشتەی نووسینی کار و کردەوەکان.

**کەسێك پێی وت:** دوعام بۆ بکە، وتی: خودا لە فیتنەکانی خۆت بتپارێزێت.

**هەروەها دەڵێت:** سەرەتای باوەڕ بە کۆتایی باوەڕەوە پەیوەستکراوە.

# ٧٦. ئەبو عبدالله محمد ئیبن خفیف الشیرازی

هاوەڵی روەیم و جەریری و ئیبن عەتا و کەسانی تری کردووە.

ساڵی ٣٧١ك كۆچی دوایی كردووە.

مامۆستای مامۆستایان و ناوازەی سەردەمی خۆی بووە.

**ئیبن خەفیف دەڵێت:** بەردەوامبوون بریتییە لە زەحمەتکێشانی بەردەوام و وازهێنـان لە پشوو.

**هەروەها دەڵێت:** هیچ شتێك بـە ئەنـدازەی لێبـووردن لـە نـەفس-لـە دەسـتبردن بـۆ روخسەت و قبووڵی تەئویل- بۆ سەر مورید زیانبەخشتر نییە.

**پرسیاری نزیکی(القرب) لێکرا، وتی:** نزیکی لە خـودا بـە تـەبایی دەبێـت لەگـەڵ خودا و بەردەوامی کۆمەك و یارمەتی خودایی.

**هەروەها دەڵێت:** لە سەرەتای تەوبە و گەڕانەوەم بۆ لای خودا لە یەك رکـات نوێـژدا دە هەزار جار "قل هو الله أحد"م دەخوێند، هەندێ جار لە یەك رکات نوێژدا هـەموو قورئانم دەخوێند، هەندێ جاریش لە نیوەڕۆوە بۆ عەسر هەزار رکات نوێژم دەکرد.

**أبو أحمد الصغیر دەڵێت:** رۆژێـك پیـاوێکی هـەژار هـات بـۆ لای **"أبـا عبـدالله بـن خفیف"** و پێی وت: وەسوەسەم هەیە.

**ئەویش پێی وت:** مـن وا سۆفییەکانم ناسیوە گاڵتە بە شەیتان دەکەن، کەچی ئێسـتا دەبینم شەیتان گاڵتەیان پێ دەکات.

**هەروەها ئیبن خەفیف دەڵێت:** لە هەستان بە سوننەتەکان لاواز بووم(بە هۆی پیری و نەخۆشییەوە)، بۆیە لە جێگەی هەر رکاتێك دوو رکاتم بە دانیشتنانەوە دەکرد، ئەوەش **لەبەر ئەو ریوایەتەی کە دەڵێت:** ((نوێژی کەسی دانیشتوو نیوەی نوێژی ئەو کەسەیە بە پێوە نوێژ دەکات))[١].

---

[١] رواه أحمد والنسائي و ابن ماجة والطبراني.

# ٧٧. بەنداری کوڕی حوسەین شیرازی

**أبو الحسين بندار بن الحسين الشيرازي**

زانا بوو بە ئەسڵەکان و کەسێکی خاوەن حاڵی مەزن بوو.

هاوەڵی شیبلی کردووە.

ساڵی ٣٥٣ك لە ئەرجان(شارێکە نزيك بە شیراز) کۆچی دوایی کردووە.

**بەنداری کوڕی حوسەین دەڵێت:** نەیاری و ململانێی خودی خۆت مەکە چونکە تۆ خاوەنی نیت، لێیگەڕێ بۆ خاوەنەکەی هەرچییەکی دەوێ پێی بکات.

**هەروەها دەڵێت:** هاوەڵی ئەهلی بیدعەت پشت هەڵکردن لە حەق(یان خودا) بەرهەم دەهێنێت.

**هەروەها دەڵێت:** واز لەوە بهێنە ئارەزووی دەکەی بۆ ئەوەی ئاواتی بۆ دەخوازی.

# ٧٨. ئەبو بكر الطمستاني

أبو بكر الطمستاني

هاوەڵی ئیبراهیمی دەباغ و کەسانی تری کردووە.

لەڕووی زانست و حاڵەوە ناوەزەی سەردەمی خۆی بووە، ساڵی ٣٤٠ك لە نیسابوور کۆچی دوایی کردووە.

**"أبوبكر الطمستاني" دەڵێت:** مەزنترین نیعمەت بریتییە لە دەرچوون لە نەفس، نەفس مەزنترین پەردەی نێوان تۆ و خودایە.

**هەروەها دەڵێت:** کاتێك خەم بۆ دونیا دڵ دادەگرێتەوە لە هەمان ئەو کاتەدا سزا دەدرێت(واتە خەمەکە بۆ خۆی سزایە)

**هەروەها دەڵێت:** ڕێگە ڕۆشنە و قورئان و فەرموودە لەناوماندا راوەستاون و گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرایە بەهۆی کۆچکردن و هاوەڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەرکەس لە ئێمە هاوەڵی قورئان و فەرموودەی کرد و لە نەفسی خۆی و لە خەڵکی بزر بوو و بەدڵ کۆچی بۆ لای خودا کرد ئەو کەسە راستگۆیە و ڕێگەی راستی گرتۆتەبەر.

# ٧٩.أحمد كوڕی محمد الدینوری

**أبو العباس أحمد بن محمد الدينوري**

هاوەڵی یوسفی کوڕی حەسەن و جەریری و ئیبن عەتای کردووە.

زانایەکی مەزن بوو، رووی لە نیسابوور کرد و ماوەیەك تیایدا مایەوە، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد و بە زمانی مەعریفە قسەی دەکرد، پاشان رۆیشت بۆ سەمەرقەند و لەدوای ساڵی ٣٤٠ك لەوێ کۆچی دوایی کرد.

**ئەبو عەباسی دەینووری دەڵێت:** کەمترین یاد ئەوەیە هەرچی لەخوار خوداوەیە لەبیریان بکەیت، کۆتایی یادیش ئەوەیە یادکەر لەناو یاددا لە یاد بزر ببێت.

**هەروەها دەڵێت:** زمانی ئاشکرا(دەرەوە) حوکمی ناوەوە ناگۆڕێت.

**هەروەها دەڵێت:** پایەکانی تەصەوفیان هەڵوەشاندەوە(واتە بەناو سۆفییەکان) و رێگەکەیان وێران کرد و ماناکانیان بە کۆمەڵێك ناویتر کە دایانهێنابوو گۆڕی، "تەماع و هەڵپە"یان ناو نا "زیادە"، "بێئەدەبی"یان ناو نا "ئیخلاص"، دەرچوون لە حەقیان ناو نا وڕێنە(**الشطحات**)، چێژوەرگرتن لە شتی ناپەسەندیان ناو نا خۆشی، شوێنکەوتنی ئارەزوویان ناو نا تاقیکردنەوە، گەڕانەوە بۆ لای دونیایان ناو نا گەیشتن، ناشیرینی رەوشتیان ناو نا زاڵبوون، چرووکیان ناو نا بەجەرگی، سواڵیان ناو نا کار، زمان پیسیان ناو نا لۆمە، ئەمە رێگەی پیاوانی ئەم دەستەیە نییە.

# ٨٠. سعید کوڕی سلام المغربی

**أبو عثمان سعيد بن سلام المغربي**

ناوازەی سەردەمی خۆی بووە، بەر لە ئەو هیچ کەس بەو جۆرە وەسف نەکراوە.

هاوەڵی ئیبن کاتب و حەبیبی مەغریبی و ئەبو عەمری زوجاجی کردووە و چاوی بە نەهرجوری و ئیبن سائغ و کەسانی تر کەوتووە.

لە نیسابوور ساڵی ٣٧٣ك کۆچی دوایی کردووە.

وەسیێتی کرد ئیمام ئەبوبەکری کوڕی فۆرك(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) نوێژی لەسەر بکات.

**گوێم لە ئەبو عوسمانی کوڕی فۆرك بوو دەیوت:** لە سەرەمەرگدا لەسەر ئەبو عوسمانی مەغریبی بووم، من لە قسەکردندا بووم، کاتێك بینیم حاڵی گۆڕا بێدەنگبووم، ئەبو عوسمان چاوەکانی کردەوە و وتی: بۆ شتێك دەربارەم ناڵێییت؟

وتم بە هەندێ لەوانەی لەوێ دانیشتبوون، پرسیاری لێ بکەن گوێگر لە چ بارێکدا دەبیستێت، من لەم حاڵەیدا شەرمی لێ دەکەم، ئەوانیش پرسیاریان لێکرد، وتی: بەو جۆرە دەبیستێ کە دەبیستێ(واتە بەو جۆرەی خودا لە ئەو دەبیستێ، گەر لە مەقامی ترسدا بێت ترس لە خوداوە دەبیستێ، گەر لە مەقامی ڕەجادا بێت ڕجا دەبیستێ)

ئەبو عوسمان لە کارکردن لەسەر خۆ و ڕامهێنانی نەفسیدا کەسێکی خاوەن شانوشکۆ بوو.

**دەیوت:** تەقوا ئەوەیە لە سنوورەکاندا بوەستی، نە کەمتەرخەمی بکەیت نە زیادەڕەوی.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس هاوەڵی دەوڵەمەندان بەسەر هاوەڵی هەژاراندا هەڵببژێرێت خودا بە مردنی دڵ تووشی دەکات.

# ٨١. إبراهيم كوڕی محمد النصرابادی

**أبو القاسم إبراهيم بن محمد النصراباذي**

له سەردەمی خۆیدا شێخی خۆراسان بووە.

هاوەڵی "شیبلی و ڕۆزباری و مورتەعیش"ی کردووە.

ساڵی ٣٦٦ك جیرانی مەککەی کردووە و هەر لەوێش لە ساڵی ٣٦٩ك کۆچی دوایی کردووە، کەسێکی زانا بووە بە فەرمووده و ریوایەتی زۆری هەبووە.

**نەصرابادی دەڵێت:** گەر شتێك لە حەقت بۆ دەرکەوت لەگەڵیدا لا بەلای بەهەشت و دۆزەخدا مەکەرەوە، گەر لەو حاڵە گەڕایتەوە ئەوەی خودا بە مەزنی ڕاگرتووە بە مەزنی ڕابگرە.

**محەمەدی کوڕی حوسەین دەڵێت:** وترا بە نەصرابادی هەندێ کەس لەگەڵ ژنان دادەنیشن و دەڵێن ئێمە لە سەیرکردنیان بێگوناهین.

**وتی:** هەتا شەبەح(جەستە) بوونی هەبێت فەرمان و نەهیکردن بوونی هەیە و حەڵاڵ و حەرام ڕوو لە مرۆڤ دەکات، هەر کەس بوێری هەبێت ڕوو لە شوبوهات بکەت کەوتۆتە ناو حەرامەوە.

**هەروەها دەڵێت:** بنچینەی تەصوف پابەندبوونە بە کیتاب و سوننەتەوە و وازهێنان لە ئارەزوو و بیدعە و مەزنڕاگرتنی حورمەتی گەورەپیاوان و بینینی پاساوی مەردوومان و بەردەوامبوون لەسەر ئەورادەکان و وازهێنان لە دەستبردن بۆ ڕوخسەت و تەئویلکردن.

# ٨٢. علی کوڕی إبراهیم الحصری البقری

**أبو الحسن علي بن إبراهيم الحصري البقري**

له بەغداد نیشتەجێ بووە، زمان و حاڵی جێگەی سەرسامی بوو، شێخی سەردەمی خۆی بووە.

خۆی دەداتە پاڵ ئەبوبەکری شیبلی(واتە لە ڕێگە و سلوکدا)

لە شاری بەغداد ساڵی ٣٧١ك کۆچی دوایی کردووە.

**"الحصري" دەڵێت:** خەڵکی دەڵێن حوصەری پابەند نییە بە سوننەتەکانەوە، لە گەنجێتییەوە کۆمەڵێك ئەوراد و سوننەتم لەسەرە گەر یەك ڕکاتی وازلێبهێنم سزا دەدرێم.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس بۆ شتێك لە حەقیقەت بانگەشە بکات گەواهییەکانی پەردەلادان لەسەر بەڵگەکان بەدرۆی دەخەنەوە.

## ٨٣.احمدی کوڕِی عطاء ڕۆزبـاریية

**أبو عبدالله أحمد بن عطاء الروزباري**

خوشکەزای شێخ ئەبو عەلی ڕۆزبارییە.

لە سەردەمی خۆیدا شێخی شام بووە لە "صور" ساڵی ٣٦٩ك کۆچی دوایی کردووە.

**"أحمد بن عطاء الروزباري" دەڵێت:** سواری حوشترێك بووبووم، دوو لاقی حوشترەکە لـە رەملـدا نـوقم بـوون، وتم: گەورەیی(مـەزنی) بـۆ خـودا، حوشـترەکەش وتـی: گەورەیی(مەزنی) بۆ خودا.

ئەبو عەبدولای ڕۆزباری کاتێك بۆ خواردن بانگهێش دەکرا هاوەڵانی خۆی بـانگهێش دەکـرد، خـەڵکانی تـر جگـە لـە ئـەهلی تەصـەوف نەیاندەویسـت هـەژاران بـە بانگهێشکردنەکان بزانن، بەڵام کاتێك دەچوون بۆ بانگهێشکردنەکە هاوەڵانی خۆی فێر دەکرد زۆر بە کەمی دەست بۆ خواردنەکە ببەن، ئەمەش لەبەر ئەوەی خەڵکی گومانی خراپ بەم دەستەیە نەبات و بەهۆیەوە گوناهبار بن.

**وتراوە:** ئـەبو عەبـدولای ڕۆزبـاری ڕۆژەڕێیـەك بـەدوای هەژارێکـدا دەڕۆیشـت، ئـەو ڕەوشتی بەو جۆرە بوو لەگەڵ هەژارانـدا ڕۆژەڕێیـەك هەنگاوهـەڵبگرێت (ئەمـەش وەك تـەوازوع لەگـەڵیان)، ڕۆژێـك ڕۆیشـتن بـۆ بانگهێشـکردنێك کەسێك وتـی: ((ئەمانـە مفتەخۆرن و خواردنی ماڵی خەڵکی حەڵاڵ دەکەن، یەکێك لەوانـە سـەد درهـەمی لـێ قەرز کردووم و تاکو ئێستا بۆم ناگێڕێتەوە و منیش نازانم لـە کێـی داوا بکەمـەوە))، کاتێك ڕۆیشتنە خانەی دەعوەتەکە ئەبو عەبدولا وتی بە خـاوەن ماڵەکـە-کـە یـەکێك بوو لە خۆشەویستانی ئەو دەستەیە- سەد درهەمم بۆ بهێنە گەر دەتەوێ دڵم ئارامی بۆ بێت، ئەویش ڕاستەوخۆ بۆی هێنا، وتی بە یەکێك لە هاوڕێیانی: ئەم پارەیە ببە بۆ فلان بەقاڵ و پێی بڵێ: ئەمە ئەو سەد درهەمەیە کە هەندێ لە هاوەڵانی ئێمە لە تۆی قەرز کرد بوو، بەهۆی بیانوویەکەوە گێڕانەوەکەی دواکەوت، ئێستا بۆتی گێڕاوەتەوە و عوزرەکەی قبووڵ بکە..

پیاوەکە ڕۆیشت و کارەکەی ئەنجامدا، کاتێك لە دەعوەتەکە گەڕانەوە بە بەردەم دوکانی بەقاڵەکەدا گوزەریان کرد، گوێیان لیّ بوو مەدحی ئەوانی دەکرد و دەیوت: ئەمانە جێمتمانە و ئەمین و صاڵحن، و هاوشێوەکانی ئەم قسانە.

**هەروەها ئەبو عەبدولاّی ڕۆزباری دەڵێت:** ناشیرینترین ناشیرین بریتییە لە سۆفییەکی چرووك.

۞ ۞ ۞

## لێكدانەوەی ئەو وشانەی لەناو ئەم دەستەیەدا تاوتوێ دەكرێن و ڕۆشنكردنەوەی ئەو تەمومژانەی لەسەریانە

**بزانە ئەوەی ئاشكرایە:** ئەوەیە هەر دەستەیەك لە زانایان كۆمەڵێك وشە و گوزارەی تایبەت بە خۆیان هەیە و لـە نێـوان خۆیانـدا بـەكاری دەهێـنن، بـەو وشـە و زاراوە و گوزارانە لە زانایانی تـر جیادەبنـەوە، لەسـەریان ڕێكـەوتوون، ئەمـەش بـۆ كۆمـەڵێك مەرام كە تیاندا بە مەبەستیان گرتووە: لە نزیكردنەوەی ماناكـان بـۆ گـوێگر لـەڕووی تێگەیشتنەوە، یان ئاسانكاری ئەو زانستە بۆ وەستان لەسەر ماناكانی و بـەكاربردنی، ئەم دەستەیەش كۆمەڵێك گوزارەیان هەیە لە نێوان خۆیاندا بەكاریدەهێنن، مەبەستیان پێیان پەردە لادانە لەسەر ماناكانیان بۆ خۆیـان و پوختـەكردن و خـۆ جیاكردنـەوە لـە ڕێگەی ئەوانەی لەوان جیاوازن تاكو مانای وشەكانیان لـە كەسـانی بێگانـە شـاراوە و ناڕوون بێت، ئەمـەش وەك غیرەتێـك بـۆ نهێنییـەكانی خۆیـان تـاكو بـەناو خـەڵكانی ناشایستەدا بڵاونەبنەوە، حەقیقەتەكانی ئەم دەستەیە دوورن لە زۆرلـەخۆكردن، بـەڵكو كۆمەڵێك مانایە خودا لە دڵی گەورە عاریفانی ئەم ڕێگەیەدا دایناون و نهێنییەكانیان پوختەی حەقیقەتی ئەو مانانەن.

ئێمە بە لێكدانەوەی ئەم زاراوانە دەمانەوێت ئاسانكاری بكەین بۆ سـالیكانی ڕێگـە و شوێنكەوتوانی ئەوان تاكو بتوانن بە دروستی هەنگاوەكانیان هەڵبگرن.

لەو زاراوانە:

# ١. كات

راســتەقینەی کــات لای ئــەهلی ڕێگــە بریتییــە لــە ڕووداوێکــی ئەندێشــەکراو کــە بەدەستهێنانی پەیوەستە بە ڕووداوێکی بەدیهاتووەوە، ڕووداویی بەدیهاتوو دەبێتە کاتی ڕووداوی ئەندێشەکراو، دەوترێت: سەری مــانگ دێمــە لات، هاتنەکــە ئەندێشــەکراوە، سەری مانگ ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە، بۆیە سەری مانگ کاتی هاتنەکەیە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خــودای لــێ بێــت) دەیــوت:** کات: ئەوەیە تۆی تێدایە، گەر لــە دونیــادا بیــت کاتــت بریتییــە لــە دونیــا، گــەر لــە دواڕۆژدا بیت کاتت بریتییە لە دواڕۆژ، گەر لە ئاســوودەییدا بیــت کاتــت بریتییــە لــە ئاسوودەیی، گەر لە دڵتەنگیدا بیت کاتت بریتییە لە دڵتەنگی.

**مەبەستی بەم قسەیە ئەوەیە:** کات ئەو دۆخ و بارەیە کە زاڵ دەبێت بەسەر مرۆڤدا.

**هەندێ جار مەبەستیان بە کات ئەوەیە کاتی تێدایە، دەستەیەك دەڵێن:** کات ئەوەیــە دەکەوێتــە نێــوان دوو دەمــەوە، مەبەســتیان دەمــی ڕابــردوو و دەمــی داهاتووە(کــەوابوو مەبەستیان بە کات دەمی ئێستایە، ئەو چرکەسات و هەناسانەی موریدی تێدا دەژی).

**هەروەها دەڵێن:** سۆفی ڕۆڵەی کاتی خۆیەتی، مەبەستیان بەوە: ئەوەیە سۆفی سەرقاڵە بەوەی لەپێشترە بۆی لە عیبادەتــەکان لــە ئێســتادا، دەمودەســت هەڵدەســتێت بــەوەی داوای لێکراوە.

**هەروەها وتراوە:** هەژار(سۆفی، مورید) ڕابردووی کات و داهاتووی کات لەلای گرنگ نییە، بەڵکو گرنگ لــەلای ئــەو ئــەو کاتەیــە تیایــدا دەژی(واتــە ژیــان لــە ئێســتادا و لەبیربردنەوەی ڕابردوو و داهاتوو).

**بــۆ ئــەو مەبەســـتە وتــراوە:** ســەرقاڵبوون بــە لەدەستچــوونی کــاتی ڕابــردوو تیــابردنی کــاتێکی تــرە.(وەك چــۆن ســەرقاڵبوون بــە دەمــی داهــاتوو لــە ئێســـتادا تیابردنی ئێستایە)

هەندێ جار مەبەستیان بە کات ئەو بار و رووداوانەیە لەلایەن خوداوە بەسەریاندا دێت بەبێ ئەوەی خۆیان شتێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن.(واتە مەبەستیان بە کات ناوەرۆکی کاتە، ئەو شتانەی لەناو کاتدا لە ئەوان روودەدات)

**دەڵێن:** فلان کەس بە حوکمی کات، واتە: خۆی رادەستی ئەو پەنهانە کردووە بۆی ئاشکرا بووە بەبێ ئەوەی هەڵبژاردنی ئەوی تێدا بێت.

ئەمە لە بارێکدایە کاتەکە تایبەت نەکرابێت بە فەرمانێکی خودایی یان بە نەهییەکی خودایی، چونکە لەو بارەدا رەوانەکردنی کات بۆ خەملاندنی پەنهان کەمتەرخەمی و دەرچوونە لە ئایین.

**هەروەها لە قسەکانیان:** کات شمشێرە، واتە وەك چۆن شمشێر بەبڕشتە هەر بەو جۆرە کاتیش بەوەی خودا تێیدەپەڕێنێ و گوزەری پێ دەکات.

**وتراوە:** دەسکی شمشێر نەرمە و دەمەکەی تیژە، هەر کەس لەگەڵی نەرم بێت سەلامەت دەبێت و هەر کەس بە زبری مامەڵەی بکات دەیبڕێت، کاتیش هەر بەو جۆرەیە هەر کەس خۆی رادەستی کات بکات رزگاری دەبێت و هەر کەسیش بەرهەڵستی بکات رووبەرووی شکست و هەڵدێر دەبێتەوە.

**گوێم لە مامۆستا "أبا علي الدقاق" بوو دەیوت:** کات ناتسرێتەوە، بەلام تێکت دەشکێنێت.

واتە: گەر بتسرێتەوە و فەنات پێ بکات کاتێك فەنا دەبیت رزگارت دەبێت، بەلام لێت وەردەگرێت و بە تەواوی ناتسرێتەوە، لەم بارەوە دێڕێك هۆنراوە وتراوە:

**كل يوم يمر يأخذ بعضي     يورث القلب حسرة ثم يمضي**

(هەر رۆژێك گوزەر دەکات بەشێکم دەبات و پەشیمانی لە دڵدا سەرهەڵدەدات و پاشان دەڕوات)

**هەروەها وتراوە:**

**كأهل النار إن نضجت جلود     أعيدت للشقاء لهم جلود**

(وەك ئـەهلی دۆزەخ کاتێـك پێسـتیان هەڵدەقرچـێت جـارێکی تـر بـۆ بەدبـەختی پێستەکەیان دروست دەبێتەوە)

**هەروەها:**

**لیس من مات فاستراح بمیت     إنما المیت میت الأحیاء**

(ئەو کەسەی مرد و ئاسوودە بوو مردوو نییە، بەڵکو مردوو زیندە مردووەکانن)

**کەسی ژیر و هۆشمەند:** ئـەو کەسـەیە بـەپێی حـوکمی کـات دەژی، گـەر کاتەکـەی ئاگایی بوو ئەوا هەستانی بە شەریعەتە، گەر کاتەکەی سڕانەوە(**محو**) بێت زاڵ بەسەریدا حوکمەکانی حەقیقەتە.

## ٢. مەقام

مەقام ئەو ئادابانەیە بەندە پێیان تێدەنێت و دەستەبەریان دەکات و بە جۆرێك لە هەڵسوکەوت پێیان دەگات، ئەو مەقامانە لە سەرەتاوە زۆر لەخۆکردن و چەشتنی ماندووبوونیان گەرەکە.

**مەقامی هەر کەسێك:** بریتییە لە شوێنی مانەوەی کەسەکە لەو جێگەدا و سەرقاڵبوون بە خۆ رامهێنانەوە تیایدا.

**مەرجەکەی:** ئەوەیە لە مەقامێکەوە نەچێت بۆ مەقامێکی تر تا حوکمەکانی ئەو مەقامە بە تێر و تەواوی جێبەجێ نەکات، هەر کەس قەناعەتی نەبێت تەوەکولی بۆ نایەتە راستە، هەر کەس تەوەکولی نەبێت خۆڕادەستکردنی بۆ نایەتە راستە، هەر بەو جۆرە هەر کەس تەوبەی نەبێت ئینابە(**إنابة**)ی بۆ نایەتە راستە و هەر کەس وەرعی نەبێت زوهدی بۆ نایەتە راستە.

مەقام بۆ نیشتەجێبوون و مانەوەیە(**مقام للإقامة**)، وەك "**مدخل**" بە مانای "إدخال"، هەروەها "**مخرج**" بە مانای "إخراج"، تا هاوەڵی خودا لەو مەقامەدا نەبینێت دابەزین تیایدا دروست نابێت و بینای کارەکەی لەسەر بنچینەیەکی پتەو و راست و رەوان نابێت.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** کاتێك "**الواسطي**" چووە نیسابوور پرسیاری لە هاوەڵانی ئەبو عوسمان کرد: شێخەکەتان بە چی فەرمانی پێ دەکردن؟

وتیان: فەرمانی پێ دەکردین بە پابەندبوون بە عیبادەت و کارە چاکەکان و گوێڕایەڵییەکان و بینینی کەمتەرخەمی تیایاندا.

(لێرەدا قسەیەکی "**الواسطي**" دەبێ بوونی هەبێت، بەڵام نەهاتووە، وەك ئەوەی پێی وتبێ: ئەبو عوسمان وبیستوویەتی وەم مەجووسیتان لێ نەیەت، بینا لەسەر ئەو

پەراوێزەی دوو **"محقق"**ەكە(عبدالحلیم **محمود** و الدكتور **محمود** بن شریف) دەربارەی ڕووداوەكە پەراوێزیان بۆ داناوە)

**"الواسطي"** بەو كارە دەیویست: لە خۆپەسەندی بیانپارێزێت، نەك بە ناتەواوی و كەمتەرخەمییەوە بیانەوێت بەرزببنەوە یان ئەدەبێك لە ئەدەبەكان پێشێل بكەن.

# ٣. حاڵ

حاڵ لای ئەم دەستەیە مانایەکە دێتە سەر دڵ بەبێ ئەوەی بەمەبەستیان گرتبێت یان بیانەوێت رایبکێشن بۆ سەر دڵیان یاخود بیانەوێت بەدەستی بهێنن لە خۆشی یان دڵتەنگی، کرانەوە یان گرژبوون، شەوق یان بێزاری، و ترس یان رجا یان بوونی پێویستی.

حاڵەکان بەهرە و بەخشینن و مەقامەکان بەدەستهێنراون.

حاڵەکان لە چاوگەی بەخشندەییەوە دێن و مەقامەکانیش بەدەستهاتوون بە بەخشینی کۆشش و ماندووبوون.

خاوەنی مەقام لە مەقامەکەیدا دامەزراوە، خاوەنی حاڵیش لە حاڵەکەیدا بەرزدەبێتەوە.

**پرسیار لە "ذا النون المصري" کرا دەربارەی کەسی عاریف، وتی:** کاتی خۆی لێرە بوو، رۆیشت.(مەبەستی ئەوەیە عاریف بوون حاڵە و قسە نییە، هەر کە ویستت بیکەی بە قسە عاریف نامێنێت، هەتا لە بێدەنگیدا بێت دەمێنێتەوە)

**هەندێ لە گەورەپیاوان دەڵێن:** حاڵەکان وەك تیشك وان، گەر بمێننەوە دەبن بە قسەی دەروون(**حديث النفس**)

**هەروەها دەڵێن:** حاڵ وەك ناوەکەی وایە، واتە حاڵ وەك چۆن بەسەر دڵدا دادەبارێت لە هەمان کاتدا کۆتایی پێ دێت.

**دەستەیەك ئاماژەیان بە مانەوەی حاڵ و بەردەوامبوونی کردووە، و دەڵێن:** گەر حاڵ بەردەوام نەبێت و بەدوای یەکدا نەیەت ئەوا بریتییە لە دەرکەوتە و ناکاوگیری، و هێشتا خاوەنەکەی نەگەیشتووەتە حاڵ، گەر ئەو سیفەتە مایەوە لەو بارەدا پێی دەوترێت حاڵ.

**ئەوەتە ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت:** ماوەی چل ساڵە خودا لە حاڵێکدا داینەناوم پێم ناخۆشبووبێت.

ئاماژە بە بەردەوامی رازیبوون دەکات، رازیبوونیش یەکێکە لە حاڵەکان.

**پێویست لەمەدا ئەوەیە بوترێت:** ئەو کەسەی ئاماژە دەکات بۆ مانەوەی حاڵ دروستی وتووە، چونکە ماناکەی بۆ ئەو بووە بە مەشرەب و مەقام و تیایدا بەرزدەبێتەوە.

بەڵام بۆ خاوەنی ئەم حاڵە کۆمەڵێك حاڵی تر هەیە ئەم کۆمەڵە حاڵە بریتین لە تەقەلێدەرەکان (واتە حاڵ بە مانای دەربڕینی دەستەی یەکەم) ئەم کۆمەڵە حاڵە بەردەوام نابن وەك حاڵە تایبەتەکەی خۆی(کە بریتییە لە مەقام بە مانای دەربڕینی دەستەی یەکەم)، گەر ئەم تەقەلێدەرانە بەردەوام بوون-وەك چۆن حاڵەکانی پێشو بەردەوامبوون- ئەوا کەسەکە بەرزدەبێتەوە بۆ حاڵێکی تر لەسەرو ئەوەوە و وردتر و ناسکتر لەوەی یەکەم، بۆیە بە بەردەوامی لە بەرزبوونەوەدایە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ((إنه ليغان على قلبي حتى أستغفر الله تعالى في اليوم سبعين مرة**-لێڵی و تەمومژێك روو لە دڵم دەکات تا لە رۆژێکدا حەفتا جار **"أستغفر الله"** دەکەم)) دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) لە حاڵەکانیدا بەبەردەوامی لە بەرزبوونەوەدا بوو، کاتێك لە حاڵێکەوە بەرزدەبوویەوە بۆ حاڵێکی تری-بەرزتر لەوەی پێشتر تیایدا بوو- لەوانەیە سەرنجی بۆ دروست بووبێت لەسەر ئەوەی پێشتر تیایدا بووە و لێیەوە بەرزبووەتەوە، بۆیە بەدوایدا **"غین"** دروستبووە بەراورد بەوەی پێی تێناوە و بۆی بەرزبووەتەوە، ئەو(ﷺ) بەهەمیشەیی حاڵەکانی لە زیادبووندا بووە.

براوەکانی خودا لە **"ألطاف"**ەکان کۆتاییان پێ نایەت، گەر مافی خودای موتەعال بریتی بێت لە دەگمەنی(العز) ئەوا گەیشتن پێی و بەدەستهێنانی محاڵ دەبێت، بۆیە بەندە بەهەمیشەیی لە حاڵەکانیدا لە بەرزبوونەوەدایە.

هەر مانایەك دەگاتە ئەو سیفەتی دەگمەنییە لە توانای خودادا بەرزتر و باڵاتر بوونی هەیە و بۆ گەیشتن پێی دیاریدەکات، لەسەر ئەم مانایە لێکدانەوەیان بۆ **"حسنات الأبرار سيئات المقربين"** کردووە، پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی ئەمە وتی:

**طوارق الأنوار تلوح إذا بدت فتظهر كتمانا وتخبر عن جمع**

(نووره تەقەلێدەرەکان گەر بەدەربکەون دەدرەوشێنەوە، شاراوەیەك دەردەخەن و هەواڵ لەمەڕ کۆ دەدەن)

## ٤. گرژبوون و کرانەوە( القبض والبسط )

ئەمە دوو حاڵەتە لەدوای بەرزبوونەوەی بەندە لە حاڵی ترس و رجا.

گرژبوون بۆ عاریف وەك ترس وایە بۆ کەسی سەرەتا(مورید).

کرانەوەش بۆ عاریف وەك رجا وایە بۆ کەسی سەرەتا(مورید).

بۆ جیاکاری نێوان "گرژبوون و ترس"، و "کرانەوە و رجا":

**ترس:** لە شتێکە لە داهاتوودایە، جا یان لە لەدەستچوونی خۆشەویست دەترسێت یان لە هاتنی ئەوەی خۆی لێ لادەدات.

**هەر بەو جۆرە رجا:** هیوایە بە خۆشەویست لە داهاتوودا، یان پێشبینی کردنی سڕانەوەی ترس و هەڕەشە و شتە ناخۆشەکانە بۆ کەسی سەرەتا.

**گرژبوونیش:** بۆ مانایەکە لە ئێستادا بەدەستهاتووە، بە هەمان شێوە **کرانەوەش،** بۆیە خاوەنی ترس و رجا لە هەردوو حاڵەکەدا دڵی وابەستەیە بەوەی دواتر رووی لێ دەکات، بەڵام خاوەنی گرژبوون و کرانەوە دڵی وابەستەیە بەوەی لە ئێستادا بەسەریدا زاڵ بووە.

پاشان وەسفیان بۆ گرژبوون و کرانەوە جیاوازی تێدایە، ئەمەش بەپێی جیاوازی حاڵی هەر یەکێك لەوان:

هاتوو(وارد) بەپێی گرژبوون کە رێگە بە شتی تر دەدات، چونکە بەتەواوی بەدەستی نەهێناوە، ئەو کەسەش بە تەواوی گرژ دەبێت رێگە بە هاتووی تر نادات، چونکە بەتەواوی لێی وەرگیراوەتەوە بەهۆی هاتنی گرژبوونەوە.

**وەك چۆن دەڵێن:** من لوولکراوم، واتە جێگەی هیچ شتێکی ترم تێدا نابێتەوە.

هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی دەکرێتەوە: لەوانەیە کرانەوەیەکی تێدا بێت هەموو خەڵکی بگرێتەوە و لە زۆربەی شتەکان نامۆیی بۆ دروست نابێت و بە جۆرێك کراوەیە لە هیچ رێگەیەکەوە هیچ شتێك کاری تێناکات.

گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت: کەسێك چووە لای **"أبوبكر القحطي"**، کوڕێکی هەبوو ئەوەی گەنجان دەیانخواردەوە ئەویش دەیخواردەوە، ڕاڕەوی ئەو چوونە ژوورەوە بەسەر کوڕەکەدا دەڕۆیشت، بینی لەگەڵ هاوەڵەکانی سەرقاڵی کاری پڕپووچی خۆیانن، کەسەکە دڵی تەنگ بوو و ئازاری خوارد بۆ **"القحطي"** و وتی: داما و هەژار ئەم شێخە مەزنە، چۆن بە ئازاری ئەم کوڕەی گیرۆدە بووە، کاتێك چووە ژوورەوە بۆ لای **"القحطي"** بینی وەك ئەوەی هیچ هەواڵێکی نەبێت لەوەی دەگوزەرێت لە بەزم و خواردنەوە، ئەویش زۆر سەریسوڕما و وتی: بە فیدات بم ئەی ئەو کەسەی وەك شاخی دامەزراو هیچ شتێك کارت تێناکات.

**"القحطي"** وتی: ئێمە لە ئەزەلەوە لە کۆیلایەتی شتەکان رزگارمان بووە.

**لە کەمترین پێویستییەکانی گرژبوون:** ئەوەیە هاتوویەك روو لە دڵی بکات ئاماژە بێت بۆ سەرزەنشت و هێما بێت بۆ ئەدەبدادان، لەو بارەدا گرژبوون لە دڵدا سەرهەڵدەدات و رووی لێ دەکات.

هەندێ جار پێویستییەکانی هاتوو ئاماژەیە بە نزیککردنەوە یان روو لێکردن بە جۆرێك لە لوتف و دڵاوایی، بۆیە کرانەوە لە دڵدا سەرهەڵدەدات.

**پوختەی قسان:** گرژبوونی هەر کەسێك بەپێی کرانەوەکەیەتی و کرانەوەکەشی بەپێی گرژبوونەکەیەتی.

هەندێ جار هۆی گرژبوونەکە لای خاوەنەکەی تەمومژاوییە، لە دڵدا گرژبوونێك دەبینێت نازانێت لە کوێوەیە و هۆیەکەی چییە، ڕێگەی بەردەم خاوەنی ئەم گرژبوونە تەنها خۆڕادەستکردنە تا ئەو کاتەی بەسەردا گوزەر دەکات، چونکە گەر بە ویستی خۆی هەوڵی نەرێکردنی بدات یان روو لە کاتێکی تر بکات بەر لەوەی هێرش بهێنێت بۆ سەری گرژبوونەکەی زیاد دەکات، لەوانەیە لەدوای ئەوە کەم ئەدەبی لێ روربدات.

گەر خۆی رادەستی بڕیاری کات(واتە بێتەوە ناو ئێستا) بکات لە کەمترین ماوەدا گرژبوونەکە دەسڕێتەوە، چونکە خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ﴾ البقرة: ٢٤٥.

هەندێ جار لەناكاو كرانەوە روودەدات، لەپڕ شتێكی لێ دەوەشێتەوە كـە هۆیەكـەی نازانێـت، كرانەوەیـەك خاوەنەكـەی دەهـەژێنێت و هەڵیـدەنێت، رێگـەی خـاوەنی ئـەو كرانەوەیە بریتییە لە ئارامی و رەچاوكردنی ئەدەب، چونكە ئەو كاتی كرانـەوە ترسـی مەزنی لە پشتەوەیە، بۆیە دەبێ خاوەنەكەی لە فێڵی شاراوە خۆی بپارێزێت.

**وەك هەنـدێكیان دەڵـێن:** دەروازەیـەك لـە كرانـەوەم بـەڕوودا كرایـەوە و هەڵـە و تێكەوتنێكم ئەنجامدا بۆیە بێبەش بووم لە مەقامەكەم، لەم بارەیەوە وتویانـە: لەسـەر راخەرەكە بوەستە و ئاگاداری كرانەوە بە.

ئەهلی رێگە دوو حاڵەتی گرژبوون و كرانەوەیان لەو شتانە داناوە كە پەنا دەگـرن بـە خودا لێیان، چونكە بەراورد بە حاڵەتەكانی سەروو ئەو دوو حاڵەتە-كـە بەنـدە دەبەنـە ناو حەقیقەتەوە- هەژاری و زیانپێكەوتنە.

**جونەید دەڵێت:** ترس لە خودا گرژم دەكات، رجاش لای خودا كرانەوەم بـۆ دروسـت دەكات، حەقیقەتیش كۆم دەكاتەوە، حەقیش پەرشوبڵاوم دەكات، گەر بە تـرس گـرژی كردم بە فەنا لێم جیادەكاتەوە، گەر بە رجا كرانەوەی بۆ دروسـت كـردم دەمگێڕێتـەوە بەسەر خۆمدا، گەر بە حەقیقەت كۆیكردمەوە ئامادەییم بۆ دروست دەكات، گـەر بـە حەق پەرشوبڵاوی كردم جگە لە خۆم كەسان و شتانی ترم پێ موشاهەدە دەكات و من لە خۆی دادەپۆشێت، خودا(ﷻ) لـە هـەموو ئەوانـەدا بزوێنـەری منـە و رامناگرێـت، نامۆكەری منە نەك هۆگركەر بە شتانی ترەوە، من بە ئامادەبوون چـێژی بـوونی خـۆم دەكـەم، خۆزگـە فـەنای بكردبایـە لـێم و چـێژی پێبدامایـە یـان لێمـی بزربكردبایـە و ئاسوودەی بكردمایە.

# ٥. هەیبەت و هۆگری

ئەم دوانە لەسەرو گرژبوون و کرانەوەن، وەك چۆن گرژبوون لەسەرو ترسەوەیە و کرانەوە لەسەرو رجاوەیە.

**هەیبەت:** بالآترە لە گرژبوون و هۆگری تەواوترە لە کرانەوە، پێدانی مافی هەیبەت بریتییە لە بزربوون، چونکە هەر کەس هەیبەتی لا دروست بێت بزر دەبێت.

خاوەن هەیبەتەکان لە هەیبەتدا جیاوازیان هەیە بەپێی جیاوازیان لە بزربووندا، هەیانە بزربوونەکەی درێژە دەکێشێت و هەشیانە بۆ ماوەیەکی کەمە.

**مافی هۆگریش** بریتییە لە ئاگاهی بە حەقەوە، هەموو هۆگرێك بەئاگایە.

پاشان هۆگران بەپێی جیاوازیان لە بەشەکەیان جیاوازن.

**بۆیە وتویانە:** نزمترین جێگەی هۆگری ئەوەیە گەر هەڵبدرێتە ناو کلپەی ئاگرەوە هۆگرییەکەی لێڵ نابێت.

**جونەید (رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** گوێم لە **"السري"** بوو دەیوت: بەندە دەگاتە ئاستێك گەر بە شمشێر بدەن لەڕووی هەستی پێ ناکات.

لە دڵمدا شتێك دەربارەی ئەم قسەیە بوونی هەبوو تا بۆ خۆم دەرکەوت بەو جۆرەیە.

**باوکم لە "مقاتل المكي"ەوە دەگێڕێتەوە وتویەتی:** چوومە لای شیبلی مووی بە مووکێش لە دوو برۆکەی هەڵدەکەند، وتم: گەورەم تۆ ئەو کارە بە خۆت دەکەی، بەڵام ئازارەکەی دەگاتە دڵی من! وتی: هاوار بۆ تۆ، حەقیقەتم بۆ ئاشکرا بووە و منیش ناتوانم شانبدەمە ژێری، بۆیە ئازار بە خۆم دەگەیەنم تاکو هەستی پێ بکەم و ئاگاهیم بۆی هەبێت و لا بەلایدا بکەمەوە، بەڵام هەست بە ئازار ناکەم بۆیە ئاگاهیم پێی نییە و ناتوانم شان بدەمە ژێری.

ئەهلی حەقیقەت حاڵی هەیبەت و هۆگری-هەرچەند بەرز و بڵندن- بە ناتەواو دادەنێن، چونکە گۆڕان بەسەر بەندەدا دەهێنێت، ئەهلی دامەزران حاڵیان لە گۆڕان

بەرزبووەتەوە و گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەوان لە بوونی سەرچاوەدا مەحو بوونەتـەوە، نە هەیبەتیان هەیە و نە هۆگری، نە زانستیان هەیە و نە هەستپێکردن.

**لە "أبي سعيد الخراز"ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** جارێك وێڵی دەشت و سارا بووبووم، دەموت:

**أيا من يرى الأسباب أعلى وجوده ويفرح بالتيه الدني وبالأنس**

**فلو كنت من أهل الوجود حقيقة لغبت عن الأكوان والعرش والكرسي**

**وكنت بلا حال مع الله واقفا تصان عن التذكار للجن والإنس**

(ئەی ئەو کەسەی هۆکار بە باڵاترین بوون دەبینێت، بە وێڵبـوونی نـزم و هۆگرییـەوە دڵخۆش دەبێت، گەر تۆ بە راستەقینە لە ئەهلی وجود بوویتایە ئەوا لە گەردوونەکان و عەرش و کورسی بزر دەبووی، ئەو کات بەبێ حاڵ لەگەڵ خودا راوەستاو دەبووی و لـە بیرخستنەوەی جن و ئینس پارێزراو دەبووی )

بەندە بە "بوون-وجود" لەم حاڵەتە بەرز دەبێتەوە.

## ٦. بانگەشەی وەجد(التواجد)، وەجد، بوون(وجود)

**بانگەشەی وەجد:** هەوڵدانە بۆ وەجد بە ڕێگەیەك لە هەڵبـژاردن، کەسـەکە کـەماڵی وەجدی بەدەست نەهێناوە، چونکە گەر کەماڵی وەجدی بەدەسـت بهێنابایـە دەبـوو بـە "خاوەن وەجد"، لـە زمـانی عـەرەبیـدا دەروازەی "تفاعـل(وەك تواجـد)" زۆربـەی بـۆ دەرخستنی سیفەتێکە کە کەسەکە بەو جۆرە نەبێت.

شاعیرێك دەڵێت:

**إذا تخازرت وما بي من خزر ثم كسرت العين من غير ماعور**

(کاتێـك چـاو بچـووك دەکەمـەوە کـە لـە بنەڕەتـدا چـاوم بچـووك نییـە، لێـرە چـاو دەشکێتەوە بەبێ لەدەستدانی هیچ چاوێك)

**دەستەیەك دەڵێن:** بانگەشەی وەجد بۆ خاوەنەکەی وەجدی بەدەستنەهێناوە، چـونکە زۆرلەخۆکردن و دوورکەوتنەوەی تێدایە لە حەقیقەت.

**دەستەیەکیش دەڵێن:** بۆ هەژارانی داڕنراو لە دونیا بەدەست دێت، ئەوانـەی دەچـنە شکار بۆ بینینەوەی ئەم مانانە، بنچینەی قسەکەیان فەرموودەکـەی پێغەمبـەرە(ﷺ): ((بگرین، گەر گریانتان نەهات خۆتان بهێننە گریان(تباكوا)))

**بەسەرهاتێکی بەناوبانگ لە "أبي محمد الجريري"وە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەگێڕنەوە، وتویەتی:** لەلای جونەید بووم، ئیبن مەسروق و کەسانی تریش لەوێ بوون، شایەرێك(قوال) لەوێ بوو، ئیبن مەسروق و ئەوانیتر هەستان و ڕۆیشتن، جونەید ئارام دانیشتبوو، وتم: گەورەم چیتە دەبینم گوێ دەگریت؟! جونەید وتی: ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾، پاشان وتی: ئەی ئەبو محەمەد ئەی تۆ چیتە بۆ گوێ دەگریت؟!

**وتم:** گەورەم، گەر لە جێگەیـەك ئامـادە بم دەنـگ و گـۆرانی تێـدا بێـت و جێگـەی حەیاکردن بێت، وەجدەکەم لە نەفسم دەگیرێتەوە، کاتێك تەنهاکەوتمەوە وەجدەکـەم بـۆ ڕەوانە دەکرێتەوە و مـنیش هەوڵی بەدەستهێنانەوەی وەجد دەدەم(تواجدت).

لەم بەسەرهاتەدا وشەی "تواجد(هـەوڵی بەدەسـتهێنانەوەی وەجـد)"ی بـەکارهێنا و جونەید کارەکەی بە ناپەسەند و نەشیاو نەزانی.

**لە ئەبو عەلی دەقاقم بیست(ڕەحمەتی خودای لـێ بێـت) دەیـوت:** کاتێـك ئـەبو محەمەد لە بیستندا ڕەچاوی حاڵی گەورەکانی کرد خودا پارێزگـاری لـە کاتەکـەی کـرد بەهۆی بەرەکەتی ئەدەبەوە، هەتا دەڵێت: وەجدەکەم لە نەفسـم دەگیرێتـەوە، تـا تـەنها دەکەوم بۆم ڕەوانە دەکرێتەوە و منیش هـەوڵی بەدەسـتهێنانەوەی دەدەم چـونکە دوای ڕۆیشتنی کات و زاڵبوونەکانی گەر بتەوێ ناتوانی وەجدەکە ڕەوانە بکەیەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕەچاوکردنی ئادابی گەورەپیاواندا کەسێکی ڕاستگۆ بووە خودا کاتەکەی بۆ پاراستووە تا لە باری تەنهاییدا وەجدەکەی بۆ ڕەوانە کرووەتەوە.

**کەوابوو بانگەشەی وەجد:** سەرەتای وەجدە بەو جۆرەی باسمان کرد، لـە دوای ئـەمـە وەجد سەرهەڵدەدات.

**وەجد:** ئەوەیە لە دڵت دەدات و دێتە سەر دڵت بەبێ ویست و زۆرلەخۆکردن.

بۆیە گەورەپیاوان دەڵێن: وەجد فەزڵی خودایە و بەری کار و کردەوە باشەکانە.

هەر کەس کار و کردەوەی چاکی زۆرتر بێت لوتفی خودا بۆی زۆرتر دەبێت.

گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:

**ئەوراد:** هەر کەس لە ئاشکرایدا ویـردی نـەبێت لـە پەنهانیـدا ویـردی نابێـت، هـەر وەجدێك شتێکی خاوەنەکەی تێدا بێت وەجد نییە.

وەك چۆن هەستان بە مامەڵە ئاشکراکان لەلایەن بەندەوە شـیرینی لـە کـاروکردەوەی چاکەدا دروست دەکات هەر بەو جـۆرە ئـەوەی بەنـدە پێـی تێـدەنێت لـە حوکمـەکانی ناوەوە(پەنهان) وەجدی بۆ دروست دەکات.

شیرینییەکان بەری مامەڵەکانن، و وەجدیش بەرهەمی تێکۆشانەکانە.

**بوونیش(وجود):** دوای بەرزبوونەوە لە وەجد بەدەستدێت.

بوونی نووری حەق دوای خامۆشبوونی سیفەتی مرۆیی سەرهەڵدەدات، چونکە لەگەڵ دەرکەوتنی دەسەڵاتی حەقیقەتدا مرۆییبوون بوونی نامێنێت.

**ئەمەش مانای قسەکەی "أبي الحسن النوري" کە دەڵێت:** بۆ ماوەی بیست ساڵە لەنێوان وەجد و بزربووندام، واتە کاتێك پەروەردگارم دەبینمەوە دڵم بزر دەکەم، کاتێکیش دڵم دەبینمەوە پەروەردگارم بزر دەکەم.

**هەر ئەمەش مانای قسەکەی جونەیدە:** زانستی یەکتاپەرستی جیایە لە بوونی یەکتاپەرستی، بوونی یەکتاپەرستیش جیایە لە زانست بە بوونی(مەبەستەکە ئەوەیە بەندە بەهۆی بەڵگەهێنانەوە بە ئاسار(گەردوون) زانا دەبێت بە یەکتاپەرستی، بەڵام نابێتە بینەرەوە بۆی، چونکە لەگەڵ بوونی ئەودا هەستی بەندە بە خودی خۆی ناهێڵێت چجای زانست پێی و بەڵگەهێنانەوە لەسەری)

لەم بارەیەوە لە دێڕە هۆنراوەیەکدا دەڵێن:

**وجودي أن أغيب عن الوجود　　بما يبدو علی من الشهود**

(بوونم ئەوەیە لە بوون بزر ببم بەوەی لە بینین بەسەرماندا دەردەکەوێت)

بانگەشەی وەجد سەرەتایە و بوون کۆتاییە و وەجدیش ناوەندە لە نێوان سەرەتا و کۆتاییدا.

**گوێم لە کامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** بانگەشەی وەجد "لەئامێزگرتن-إستيعاب"ی بەندەیە، وەجد "نغرۆبوون-إستغراق"ی بەندەیە، و بوونیش "تیابردن-إستهلاك"ی بەندەیە.

ئەم سێ بارە وەك ئەو کەسە وایە یەکەمجار دەریا دەبینێت و دواتر سواری کەشتی دەبێت بۆ ناو دەریا و لە کۆتاییدا کەشتییەکە لە دەریادا نغرۆ(نوقم) دەبن.

ڕێکخستنی ئەم سەفەرە یەکەمجار مەبەست و مەرامە و ئەوجا کەوتنەگەڕ و هاتنە و دواتر بینینە و پاشان لە جووڵەکەوتنە و لە کۆتاییدا خامۆشبوونە.

**بە ئەندازەی بوون خامۆشبوون روودەدات، کەسی خاوەن بوون:** ئاگاهی و مەحوی بۆ هەیە، حاڵی ئاگاهییەکەی مانەوەیە بە حەقەوە، حاڵی مەحوەکەی سڕانەوەیە بە حەقەوە.

ئەم دوو بارە بە هەمیشەیی بەدوای یەکتردا بەسەریدا دادەبارێن.

گەر ئاگاهی بە حەقەوە بەسەریدا زاڵ بوو بە خوداوە دەڕوات و بـە خـوداوە دەڵێـت، **پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمویێت: خودا دەفـەرمویێت:** ((بـە من دەبیستیٚ و بە من دەبینێت))

**مەنصووری کوڕی عەبدولاّ دەڵێت:** پیاوێك لە ئەڵقەی دانیشتنی شبلیدا پرسی: ئایا ئاساری ئاگاهی بوون لەسەر خاوەن وەجدەکان دەردەکەوێت؟

وتی: بەڵیٚ، نوورێکە دەدرەوشێتەوە هاوتا بە گڕی تامەزرۆبوون، ئاسـارەکەی بەسـەر پەیکەرەکان(کەسەکان)دا دادەبارێت، وەك ئیبن موعتەز دەڵێت:

**وأمطر الكأس ماء من أبارقها فأنبت الدر في الأرض من الذهب**

**وسبح القوم لما رأوا عجبا نورا من الماء في نار من العنب**

**صلافة ورثها عاد عن إرم كانت ذخيرة كسرى عن أب فأب**

(پیاڵەکە ئاوی لە بریسکانەوەی خـۆی داباراند و دوڕ و ئـاڵتوونی لـە زەوی رواند، خەڵکی "سبحان الله"یان کرد کاتێك ئـەو شـتە سەرسـوڕهێنەیان بـینی، نوورێـك لـە ئاوەوە لە ئاگرێك لە ترێوە، حیکمەتێکە عاد لە ئیرەمەوە بە میراتـی گرتـووە، کـاتی خۆی زەخیرەی کیسرا بووە لە باوك و باپیرانەوە)

**وترا بە ئەبوبەکری دوقی:** "جەهمی دوقی" لە حاڵی بیستن و هەڵچـوونیدا درەختێکـی گرتووە بـە دەسـتییەوە و بـە رەگ و ریشـکەوە هەڵیکێشـاوە، هـەردوو لـە بانگهێشـێکدا کۆبوونەوە، ئەبوبەکری دوقی کەسێکی نابینا بـوو، جـەهمی دوقـی لـە بـاری هەڵچـوونیدا هەستا بە سوڕانەوە، بۆیە ئەبوبەکری دوقی وتی: گەر لێم نزیك ببێتەوە پێی نیشان دەدەم.

جەهمی دوقی کەسێکی لاواز بـوو بـە پـاڵ ئەبوبـەکردا تێپـەڕی کاتێـك لێـی نزیـك بوویەوە پێیان وت: ئەمە ئەو کەسەیە.

ئەبوبەکری دوقی لاقی جەهمی گرت و رایوەشاند بۆیە نەیتوانی بجولێت.

جەهم وتی: گەورەم، تەوبە، تەوبە، ئەویش وازیلیٚهێنا و رێگەی دا بڕوات.

**مامۆستا قوشەیری(خودا پایەداری بکات) دەڵێت:** هەڵچـوونی جـەهم لـە حەقـدا بـوو، گـرتنی لاقـی لەلایـەن ئەبوبـەکرەوە بـە حـەق بـوو، کاتێـك جـەهم زانـی حـاڵی

ئەبوبەکری دوقی لەسەرو حاڵی ئەوەوەیە گەڕایەوە بۆ ویـژدان و خۆڕادەستکردن، هـەر بەو جۆرە ئەو کەسەی کە بـە حـەق هـیچ شـتێکی لـێ یـاخی نابێـت، بـەڵام گـەر زاڵ بەسەریدا بریتی بێت لە مەحو ئەوا زانین و ژیری و تێگەیشتن و هەست بوونیان نییە.

**"أبـو عبـدالرحمن السـلمي"(رەحمـەتی خـودای لـێ بێـت) بـە سـەنەدی خـۆی دەڵێـت:** ئـەبو عـەقالی مـەغریبی چـل سـاڵ لـە مەککـە نیشـتەجێ بـوو خـواردن و خواردنەوەی نەخوارد تا مرد.

**هەژارێك چووە لای ئەبو عەقال، پێی وت:** سلام علیکم، ئەبو عەقال وتی: علـیکم السلام، پیاوەکە وتی: من فلان کەسم، ئەبو عەقال وتی: تۆ فلانی، حالت چۆنە؟

دواتر لە حاڵی خۆی بزر بوو، ئەو پیاوە وتی: جارێکی تر پێم وت: سلام علیکم، وتی: علیکم السلام وەك ئەوەی هەرگیز منی نەبینی بێت، چەندین جار ئەو کارەم ئەنجامـدا تێگەیشتم ئەم کەسە لەناو خۆیدا نغرۆ بووە، بۆیە وازم لێهێنا و لەلای هاتمە دەرەوە.

**عمر بن محمد دەڵێت:** گوێم لـە ژنەکـەی "أبـی عبـدالله التروغنـدی" بـوو دەیـوت: ڕۆژگاری گرانی و سیاساڵی خەڵکی لە برسان دەمردن أبو عبدالله دوو مەن گـەنمی لـە ماڵەوە هەبوو، وتی: خەڵکی لە برسان دەمرن و لە ماڵەکەی مندا گەنم هەیە..

دواتر لە برسان هۆشی لەبەر خۆی نەمابوو، تەنها لە کاتی نوێژە فەرزەکاندا بۆ نوێـژ بەئاگا دەهاتەوە پاشان دەگەڕایەوە سەر حاڵەکەی خۆی، ئەو حاڵی بـەو جـۆرە بـوو تـا گیانی سپارد..

ئەم بەسەرهاتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەو پیـاوە پارێزگـاری لـە ئـادابی شـەریعەت کردووە لەباری زاڵبوونی حوکمەکانی حەقیقەتیشدا، ئەمە بریتییە لە سـیفەتی ئـەهلی حەقیقەت، پاشان هۆی بزربوون و نغرۆبوونەکەی لـە جیاکردنەوەیـدا کاتێـك بـەزەیی و سـۆزی بەرانبـەر موسـڵمان نیشـان دەدا، ئەمـەش بـەهێزترین خەسـڵەتێکە لـە بەدەستهێنانی حاڵی خۆی.

# ٧. کۆبوون و جیابوون

وشەی "کۆبوون و جیابوون" بەزۆری بەسەر زمانیاندا گوزەر دەکەن.

**ئەبو عەلی دەقاق دەڵێت:** جیابوون: ئەوەیە دەدرێتە پاڵ تۆ، کۆبوون: ئەوەیە لە تۆ داگیر دەکرێت.

**ماناکەی:** ئەوەی بەدەستهێنانی بەندەیە لە هەستان بە ئەرکی بەندایەتی و ئەوەی شایستەیە بە حاڵی مرۆیی بریتییە لە جیابوون.

ئەوەی لەلایەن حەقەوەیە لە نیشاندانی مانا و دەرخستنی لوتف و چاکە ئەوە بریتییە لە کۆبوون.

ئەمە نزمترین حاڵی ئەو دەستەیەیە لە کۆبوون و جیابووندا، چونکە لە بینینەکانی حاڵە، هەر کەس خودا(ﷻ) کردارەکانی خۆی(کردارەکانی مرۆڤ) پێ نیشان بدات لە کار و کردەوەی چاکە و گوێڕایەڵی و خراپە و یاخیبوون ئەوا ئەو کەسە لە وەسفی جیابووندایە، هەر کەسیش خودا(ﷻ) کردارەکانی خۆی(کردارەکانی خودا) پێ نیشان بدات ئەوا ئەو بەندەیە کۆبوون دەبینێت.

جێگیرکردنی دروستکراوەکان لە دەروازی "جیابوون"ە، جێگیرکردنی حەق لە دەروازەی وەسفی "کۆبوون"ە.

هەر دەبێ بەندە کۆبوون و جیابوونی هەبێت، هەر کەس جیابوونی نەبێت بەندایەتی نابێت، هەر کەسیش کۆبوونی نەبێت مەعریفەی نابێت، بۆیە "إياك نعبد" ئاماژەیە بە جیابوون و "إياك نستعين" ئاماژەیە بە کۆبوون.

هەر کات بەندە گفتوگۆی لەگەڵ حەقدا(ﷻ) کرد بە زمانی ئاخافتن: جا یان وەك داواکەر یان بانگکەر یان هەردووکیان یان وەك دەربڕینی شوکر یان وەك وەك خۆداڕنین لە گوناهانی یان وەك ئیبتیهال ئەوا لە مەقامی جیابووندا راستبووەتەوە.

کاتێك نهێنی و پەنهانی بەندە گوێی بۆ ئەوە گرت کە مەولای خۆی ئاخافتنی لەگەڵ ئەو پێ دەکات و بەدڵ گوێی لەوە گرت گفتوگۆی لەگەڵ دەکات، لە بارێکدا بانگی لێ

بکات یان ئاخافتنی لەگەڵ بکات یان مەعریفەی پێبدات یان ئاماژە بە دڵی بدات و بیەوێت ئەوا بەندە لە موشاهەدەی کۆبووندایە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** کەسێکی شایەر لەبەردەم مامۆستا **"أبي سهل الصعلوكي"** دەیوت: **"جعلت"**(**بفتح التاء**) نەصرئابادی وتی: **"بل جعلت"**(**بضم التاء**)، مامۆستا أبو سهل وتی: ئایا سەرچاوەی کۆبوون تێر و تەواوتر نییە، نەصرئابادی بێدەنگ بوو.

**گوێم لە شێخ "عبدالرحمن السلمي" بوو بەسەرهاتێکی لەم شێوەی گێڕایەوە..**

مانای ئەم قسەیە: ئەو کەسەی دەڵێت: **"جعلت"**(**بضم التاء**) هەواڵ لە حاڵی نەفسی خۆی دەدات، وەك ئەوەی بەندە بڵێ ئەمە لەلایەن خۆمەوەیە، کاتێکیش دەڵێت: **"جعلت"**(**بفتح التاء**) وەك ئەوەی خۆی دابڕنێت لەوەی ئەو ئەنجامیداوە، بەڵکو گفتوگۆ لەگەڵ مەولای خۆی دەکات و دەڵێت: ئەوە تۆی منت بەو کارە تایبەت کردووە نەك من بە هەوڵ و کۆشکردنم.

**یەکەمیان** لە بارێکی ترسناکدایە بەهۆی بانگەشەکەیەوە(چونکە حاڵ و مەقام دەداتە پاڵ هەوڵ و کۆششی خۆی).

**دووەمیان** بە وەسفی خۆداڕنین لە هەوڵ و کۆشانی خۆی داندەنێت بە چاکە و دەستی کۆمەکی خودابیدا، جیاوازی نێوان ئەو کەسەی دەڵێت: بە هەوڵ و کۆششی خۆم دەتپەرستم لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەڵێت بە فەزڵ و لوتف و چاکەی تۆ موشاهەدەت دەکەم جیاوازییەکی گەورەیە.

## کۆبوونی کۆبوون

کۆبوونی کۆبوون لەسەرو ئەوەوەیە(واتە لەسەرو "کۆبوون"ەوەیە).

خەڵکی بەپێی جیاوازی حاڵ و جۆراوجۆری پلـە و پایـەیان لـەم گوزارەیـەدا(کۆبوونی کۆبوون) جیاوازیـان هەیـە، هەرکـەس خـۆی و دروسـتکراوەکان جـێگیر بکـات، بـەڵام هەموو ئەوانەی بینی بە حەقەوە(ﷻ) راوەستاون ئەمە بریتییە لە "کۆبوون".

گەر بینینی دروستکراوەکانی لێوەرگیرایەوە و لە خودی خۆی بێئاگا بوو و بەتەواوی هەسـتی بـە شـتەکان نـەما، هـەروەها هەسـت بەوانـەی دەرکـەوتوون، بـە دەسـەڵاتی حەقیقەت داگیر کرا ئەوە بریتییە لە "کۆبوونی کۆبوون".

بۆیە **جیابوون:** بریتییە لە بینینی نەیار(ئەغیار) بۆ خودا(ﷻ)

**کۆبوون:** بریتییە لە بینینی نەیار(ئەغیار) بە خودا(ﷻ).

**کۆبـوونی کۆبـوونیش:** بریتییـە لـە تیاچـوون و نغرۆبـوونی تـەواو، و فـەنابوونی هەستەکان لە هەر شتێکی جگە لە خودا(ﷻ) لەباری زاڵبوونی حەقیقەتدا.

لەدوای ئەمە حاڵێکی دەگمەن و نایاب هەیە پێی دەوترێت:

## جیابوونی دووەم

ئەوەش ئەوەیە بەندە بگەڕێتەوە بۆ ئاگاهی لە کاتی جێبەجێ کردنی فەرزەکاندا، بۆ ئەوەی هەستان بە فەرزەکان لە کاتەکانی خۆیاندا بەسەریدا گوزەر بکات، ئەو کات گەڕانەوەکە بۆ خودا دەبێت بە خوداوە، نەك بۆ بەندە بە بەندەوە.

بەندە لەم حاڵەدا خۆی دەخوێنێتەوە لە هەڵسوڕاندنەکانی حەق(ﷻ)، دەستپێکەر(بزوێنەر)ی خودی خۆی و چاوگەی دەسەڵاتی دەبینێت، هەر بەو جۆرە جاریبوونی کردارەکان و حاڵەکان بەسەریدا ئەوەش بە زانست و ویستی حەق(ﷻ).

هەندێك لە پیاوان ئاماژەیان بۆ "کۆبوون و جیابوون" کردووە لە هەڵسوڕاندنی کارەکان لەناو هەموو دروستکراوەکاندا لەلایەن حەقەوە(ﷻ)

کۆبوونی هەموو لە وەرگێڕان و هەڵسوڕاندا: لەو رووەوە کە بەدیهێنەری خودی ئەوانەیە و سیفەتەکانی پیایاندا جاری دەبن، پاشان لە جۆراوجۆریدا جیایکردوونەتەوە: دەستەیەکی بەختەوەر کردووە و دەستەیەکیشی دوورخستووەتەوە و بەدبەختی کردوون، دەستەیەکی هیدایەت داوە و دەستەیەکیشی گومڕا و کوێر کردووە، دەستەیەکی بێبەش کردووە لە خۆی و دەستەیەکیشی لە خۆی نزیك کردووەتەوە، دەستەیەکی بە هۆگربوون بە خۆی گەیاندووە و دەستەیەکیش لە بەزەیی ئەو بێبەش بوون، دەستەیەك بە کۆمەکی ئەو(ﷻ) رێزدار و پایەدار بوون و دەستەیەکیشی دوورخستووەتەوە بە هۆی پشتهەڵکردنیان لە حەقیقەت، دەستەیەکی بەئاگا کردووە و دەستەیەکیشی مەحو کردووەتەوە، دەستەیەکی رزگار کردووە و دەستەیەکی تری نغرۆ کردووە، دەستەیەکی نزیك کردووەتەوە و ئامادەی کردوون و پاشان شەرابی خۆشەویستی پێ نۆش کردوون و مەست و سەرگەردانی کردوون و دەستەیەکیش بەدبەختبوون و دواکەوتوون پاشان دوورخراونەتەوە و کۆچیان لێکراوە.

جۆرەکانی کرداری خودا نایەنە هەژماردن و باس و شرۆڤە و لێکدانەوە ناتوانن هەمووی بخەنە روو، لەسەر مانای کۆبوون و جیابوون جونەید لە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

**و تحققتك في سري فناجاك لساني**

**فاجتمعنا لمعاني وافترقنا لمعاني**

**إن يكن غيبك التعظيم عن لحظ عياني**

**فقد صيرك الوجد من الأحشاء داني**

(له نهێنی و پەنهاندا تۆم دەستەبەر کرد و زمانم موناجاتی کردی، بۆ کۆمەڵێك مانا کۆبووینەوە و بۆ کۆمەڵێك مانا جیابووینەوە، گەر بزربوونت بەمەزنڕاگرتن بێت له سەرنجی بینینم ئەوا وەجد تۆی له پەڕەی دڵم نزیك کردووەتەوە)

هەروەها له هۆنراوەیەکدا وتراوە:

**إذا ما بدا لي تعاظمته فأصدر في حال من لم يرد**

**جمعت وفرقت عني به ففرد التواصل مثنى العدد**

(کاتێك نووری حەقم بۆ دەردەکەوێت بەمەزنی رادەگرم، دەگەڕێمەوە بۆ حاڵی ئەو کەسەی پاراو نەبووە، بەو نوورە کۆمدەکاتەوە و جیامدەکاتەوە لێی، له گەیشتنندا تاك و له ژمارەدا جووت)

# ٨. فەنا و بەقا

**مەبەستیان بە فەنا:** بریتییە لە بەربوونەوە و لێبوونەوەی سیفەتە ناپەسەندەکان.

**مەبەستیان بە بەقا:** بریتییە لە راستبوونەوەی سیفەتە پەسەندەکان.

گەر بەندە لە یەکێك لەم دوو بەشە بەدەر نەبێت ئەوا ئاشکرایە: گەر یەکێك لە بەشەکان بوونی نەبوو ئەوا ئەویتریان بێ هیچ چەندوچوونێك جێگەی دەگرێتەوە، هەر کەس لە سیفەتە ناپەسەندەکانی فەنا بکات ئەوا سیفەتە پەسەندەکانی لەسەر دەردەکەوێت، هەرکەسیش سیفەتە ناپەسەندەکان زاڵ ببێت بەسەریدا سیفەتە پەسەندەکانی لێ دەشارێتەوە.

**بزانە ئەوەی بەندە پێی دەڕازێتەوە:** کردار و ئەخلاق و حاڵە.

**کردارەکان** بریتین لە هەڵسوکەوتەکان بە هەڵبژاردەی خۆی.

**ئەخلاقیش** تیایدا ریشەدارە و لەگەڵ هەویری بوونیدایە، بەڵام بەپێی بەردەوامی خو خدە(عادەت) تیایدا گۆڕانیان بەسەردا دێت.

**حاڵەکانیش:** لە سەرەتاوە روو لە بەندە دەکەن، بەڵام پاکێتی حاڵەکان لەدوای پاکی و خاوێنی کار و کردەوەکان دێن.

حاڵەکان لەم رووەوە وەك ئەخلاق وان، چونکە کاتێك بەندە بە دڵ دەگاتە مەنزڵی ئەخلاق و بە تێکۆشان ئەخلاقی نزم و کەم بایەخ لە خۆی دەکاتەوە خودا بە چاککردنی ئەخلاق منەت بەسەریدا دەکات، هەر بەو جۆرە گەر بە هەوڵ و کۆشان بەردەوام بێت لە پاککردنەوەی کار و کردەوەکانی خودا حاڵەکانی بۆ پاك و پاڵفتە دەکات، بەڵکو حاڵەکانی بۆ تێر و تەواو دەکات.

هەر کەس کارە ناپەسەندەکانی بە زمانی شەریعەت وازلێهێنا دەوترێت: ئەو کەسە لە حەزەکانی فانی بووە.

کاتێك لە حەزەکانی فانی بوو بە نیێت و ئیخلاصەوە لە بەندایەتیدا دەمێنێتەوە.

هەر کەس بەدڵ لە دونیا زوهد بکات دەوترێت لە حەزەکانی فانی بووە.

کاتێك لە حەزەکانی فانی بوو بە صدقی گەڕانەوە بۆ لای خوداوە دەمێنێتەوە.

هەر کەس ئەخلاقی خۆی چارەسەر کرد ئەوا حەسەد و کینـە و چـرووکی و ژەنـگ و ژار و تووڕەبوون و لوتبەرزی و هاوشێوەکانی ئەمانە لە لادانەکانی نەفس لە دڵی فانی دەبن، دەوترێت لە خراپی ئەخلاق فانی بووە.

کاتێك لە خراپی ئەخلاق فانی بوو بە جوامێری و صدقەوە دەمێنێتەوە.

هەر کەس جـاریبوونی دەسـەڵاتی خـودا لـە هەڵسـوڕاندنی بڕیارەکانـدا ببینێـت دەوترێت: لە دیدەگرتنی دوو رووداوەکە(رابردوو و داهاتوو) لەناو دروستکراوەکاندا فانی بووە، کاتێك لە ئەندێشـەی ئاسـار(مەخلوقات)-کـە نـەیارن- فـانی بـوو بـە سیفەتەکانی حەقەوە دەمێنێتەوە.

هەر کەس دەسەڵاتی حەقیقەت بەسەریدا زاڵ ببێت تا لە نەیار هیچ شتێك نـەبینێت نە بە چاو نە بە شوێنەوار، نە بە وێنە و نە بە سێبەر، دەوترێـت: لـە دروسـتکراوەکان فانی بووە و بە حەقەوە ماوەتەوە.

فانی بوونی بەندە لە کـار و کـردەوە ناپەسـەندەکانی و حاڵـە نـزم و پەسـتەکانی بـە نەبوونی ئەو کار و کردەوە خراپانەوەیە.

فانی بوونی لە خودی خۆی و لە دروستکراوەکان بە سڕانەوەی هەسـتەکانی دەبێـت، واتە هەستەنەکردن بە خودی خۆی و بە دروستکراوەکان.

کاتێك لە کردارەکان و ئەخلاق و حاڵەکان فانی بوو ئەوا ئەوەی لێی فانی بووە نابێت بوونی بمێنێت.

**گـەر وتـرا:** لـە نەفسـی خـۆی و لـە دروسـتکراوەکان فـانی دەبێـت و نـەفس و دروستکراوەکانیش بوونیان هەیە و نەسڕاونەتەوە، بەڵام نە زانست و نـە هەسـت و نـە هـەواڵی بـە خـودی خـۆی و بـە دروسـتکراوەکان هەیـە، نـەفس بـوونی هەیـە و دروستکراوەکان بوونیان هەیە، بەڵام لـە نەفسـی خـۆی و لـە هـەموو دروسـتکراوەکان بێئاگایە و هەست بە خۆی و بەوان ناکات.

پیاوێك دەبینین دەچێتە لای دەسەڵاتدارێك و لە خۆی و لەوانەی لە خزمەتی ئـەودان بێئاگا دەبێت ئەمەش بەهۆی ترس و هەیبەتێکەوە کـە دەچـێتە گیانییـەوە، تەنانـەت کاتێك دەچێتە دەرەوە گەر پرسیاری لیٚ بکرێت: کێ لەلای ئەو دەسـەڵاتدارە بـوو، لـە پیاوانی مەجلیس و دەست و پێوەندەکانی؟ ناتوانێت هـەواڵت پـێ بـدات بـەهۆی ئـەو ترس و هەیبەتەوە بەسەریدا هاتووە.

خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾ یوسف: ٣١

کاتێك ئافرەتەکان بۆ یەکەم جار چاویان بە یوسف(ﷺ) کەوت هەستیان بە ئازاری بڕینی دەستی خۆیان نەکرد، ئەوان لەگەڵ لاوازی خۆیان وتیان: ((ئەمە مرۆڤ نییە)) لە کاتێکدا یوسف مرۆڤ بوو، وتیان: ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴾ -ئەمە فریشتەیەکی ڕێزدار و خاوەن پلە و پایەیە، بەڵام یوسف فریشتە نەبوو.

ئەمە بێئاگایی دروستکراوێکە لە حاڵی خـۆی لـە بارێکـدا بـە دروسـتکراوێکی تـر دەگات، ئەی دەبیٚ حاڵی چۆن بێت بە موشاهەدەی سیفەتەکانی حەق(ﷻ)؟

گەر لە خۆی و لە هەموو خەڵکی بێئاگا ببێت دەبیٚ چ سەرسوڕمانێکی تێدا بێت؟

هەر کەس لە نەزانی فەنا ببێت بە زانستەوە دەمێنێتەوە، هەر کەس لـە حـەزەکانی فەنا بکات بە گەڕانەوە بۆ لای خوداوە دەمێنێتەوە، هەر کەس لە ڕەغبەتەکانی فـانی ببێت بە زوهدگەرایی خۆیەوە دەمێنێتەوە، هەر کەس لـە ئاواتـەکانی فـەنا ببێـت بـە ویستی خوداوە(ﷻ) دەمێنێتەوە، هەر بەو جۆرە لە هەموو سیفەتەکانیدا.

گەر بەندە لە سیفەتی خۆی فانی بوو-بەوەی باس دەکرێت- لەوەوە بە فـەنای خـۆی بەرز دەبێتەوە لە بینینی فەناکەی، لەسەر ئەم مانایە وتویانە:

**فقوم تاه في أرض بفقر وقوم تاه في ميدان حبه**

**فأفنوا ثم أفنوا ثم أفنوا وأبقوا بالبقا من قرب ربه**

(دەستەیەك وێڵبوون بە زەویدا بە هەژارییەکەوە، دەستەکیش وێڵبـوون لـە مەیـدانی خۆشەویستی ئەودا، فانیبوون و فانیبوون و پاشان فانیبوون، ئەوجا مانەوە بە مانەوەی نزکی لە پەروەردگارەوە )

**یەکەمیان** لە نەفسی خۆی و سیفەتەکانی فانی بوو بە هۆی مانەوەی بە سیفەتەکانی حەقەوە.

**پاشان فەنابوونی** لە سیفەتەکانی حەق بە بینینی حەق(سبحانه وتعالی).

**پاشان فەنابوونی** لە بینینی فەنابوونەکەی بە نغرۆبوونی لە بوونی حەقدا.

# ٩. بزربوون و ئامادەبوون

**بزربوون:** بریتییە لە بزربوونی دڵ لە زانینی ئەوەی لە حاڵ و باری دروستکراوەکاندا جاری دەبێت، ئەوەش بەهۆی سەرقاڵبوونی هەستەوە بەوەی بەسەریدا داباریوە(بەسەریدا زاڵ بووە)، پاشان لە هەستکردنی بە خۆی و دەرەوەی خۆی بزر دەبێت، ئەوەش بە هاتووی هێنانەوەبیری پاداشت یان بیرکردنەوە لە سزا.

**وەك ریوایەتکراوە:** جارێکیان **"ربیع بن الخیثم"** دەچوو بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەسعود(خوا لێی رازی بێت) بە پاڵ دوکانی ئاسنگەرێکدا گوزەری کرد پارچە ئاسنێکی بینی لە کورەکەدا، یەکسەر بوورایەوە، تا سبەینێ هۆشی نەکردەوە، کاتێك بەئاگاهاتەوە پرسیاری ئەوەی لێکرا وتی: بیری حاڵی ئەهلی دۆزەخم کردەوە لەناو دۆزەخدا.

ئەم بزربوونە لە رادەی خۆی تێپەڕاندووە تا بووە بە بوورانەوە.

**لە عەلی کوڕی حوسەینەوە(خوایان لێ رازی بێت) دەگێڕنەوە:** لە سوژدەدا بوو ئاگرێك لە ماڵەکەی بەربوو، نوێژەکەی نەبڕی، پرسیاری ئەو حاڵەی لێکرا، وتی: ئاگرە گەورەکە لەم ئاگرە بچووکە بێئاگای کردم.

لەوانەیە بزربوون لە هەستەکانی بەهۆی مانایەکەوە بێت کە خودا(ﷻ) پەردەی لەسەر لا دەدات.

پاشان ئەهلی ئەم رێگەیە بەپێی حاڵەکانیان لەمەدا جیاوازیان هەیە.

**ئەوەی بەناوبانگە:** ئەوەی لە سەرەتای حاڵی **"أبي حفص النیسابوري الحداد"**ەوە وایکرد واز لە پیشەکەی بهێنێت ئەوە بوو: رۆژێك لە دوکانەکەی بوو کەسێك ئایەتێك لە قورئانی خوێند، شتێك هاتە سەر دڵی "ئەبی حەفص" و وایکرد لە هەستەکانی بێئاگا بێت، بۆیە دەستی خستە ناو ئاگرەکەوە و ئاسنە سوورەکەی بەدەستی خۆی دەرهێنا، قوتابییەکی ئەوەی بینی و وتی: مامۆستا ئەوە چییە و چ کارێکە؟ ئەبو حەفص سەرنجی ئەوەیدا لەسەر دەستی روویداوە، بۆیە پیشەکەی وازلێهێنا و لە دوکانەکەی چووە دەرەوە.

**جونەیــد** دانیشــتبوو ژنەکــەی لــەلای بــوو، ئەبوبــەکری شــیبلی هــات بــۆ لای، ژنەکـەی ویسـتی خـۆی پۆشـتەبکاتەوە جونەیـد پێـی وت: شـیبلی ئاگـای لـە دەوروبـەر نییە، دابنیشـە، جونەیـد دەسـتی کـرد بـە قسـەکردن بـۆ شـیبلی تـا شـیبلی دەسـتی بـە گریـان کـرد، کاتێـك کەوتـە گریـان جونەیـد وتـی بـە ژنەکـەی ئێسـتا خـۆت پۆشـتە بکەرەوە، شیبلی لە بێئاگاییەکەی بەئاگاهاتەوە.

**لـە نیسـابوور گـوێم لـە "أبـا نصـر المؤذن" بـوو-کـە پیـاوێکی صـاڵح بـوو- دەیـوت:** لـە دانیشـتنێکی ئـەبو عـەلی دەقاقـدا-کـە ئـەو کـات لـە نیسـابوور بـوو- قورئـانم دەخوێنـد، ئـەبو عـەلی زۆر قسـەی لـە حـەج دەکـرد، قسـەکانی چـووە نـاو دڵمــەوە، بۆیــە ئــەو ســاڵە رۆیشــتم بــۆ حــەج و دوکانەکــە و پیشــەکەم وازلێهێنــا، مامۆسـتا ئـەبو عـەلی دەقـاقیش هـەمان سـاڵ بـۆ حـەجکردن کەوتـەڕێ، ئـەو ماوەیـە لـە نیسـابوور بـوو خزمـەتم دەکـرد و لـە دانیشـتنەکانیدا بـەردەوام قورئـانم دەخوێنـد، رۆژێــك لــە بادیــە بینــیم: خــەریکی خۆپاککردنــەوە و دەســتنوێژ بــوو.. ئــەو حەوجۆشـەی(دەفرێك بـووە لـە ئاسـن یـان مـس دوو قـوڵفی بـووە) بەدەسـتییەوە بـوو لـەبیری چـوو، منـیش هـەڵمگرت، کاتێـك هاتـەوە بـۆ لای کاروانەکـە دامـەوە دەستی، ئـەویش وتـی: خـودا پاداشـتت بداتـەوە کـە ئەمـەت بـۆ هـەڵگرتم، پاشـان ماوەیـەك بـە قــوولّی ســەرنجیدام وەك ئــەوەی هــەرگیز مــنی نــەبینیبێت و وتــی: مــن جارێــك تــۆم بینیوە، تۆ کێی؟

وتم: پـەنا هـەر بـۆ لای خودایـە! مـن ماوەیـەکی زۆر هـاوەڵی تـۆم کـردووە و وڵات و خانـەوادەم بـەهۆی تـۆوە بـەجێهێڵاوە، ئـەم هـەموو رێگەیـەم بـە تـۆوە بڕیـوە، ئێسـتا تۆ دەڵێی من جارێك تۆم بینیوە!!

**ئامادەبوونیش:** هەنـدێ جـار بـە حەقـەوە ئامادەیـە، چـونکە گـەر لـە دروسـتکراوەکان بزربوو بـە حەقـەوە ئامـادە دەبێـت، لەسـەر مانایـەك وەك ئـەوەی ئامـادە بێـت، ئـەوەش بـە هـۆی زاڵبـوونی یـادی حـەق بەسـەر دڵیـدا، ئـەو بـە دڵ لـە بـەردەم پەروەردگاریـدا ئامادەیــە، ئامــادەبوونی بــە حەقــەوە بــەپێی بزربوونیــەتی لــە دروســتکراوەکان، گــەر بەتەواوی بزر بوو ئامادەبوونی تێر و تەواو دەبێت بەپێی بزربوونەکەی.

گەر وترا فلاّن ئامادەیە واتە ئەو کەسە بەدڵ بۆ پەروەردگاری ئامادەیە، و لێی بێئاگا نییە و لەبیری نەچووەتەوە، و یادی ئەو لەلای بەردەوامە، پاشان بەپێی پلە و پایەی خۆی لە ئامادەبوونەکەیدا خودا(ﷻ) پەردە لەسەر کۆمەڵێك مانا لادەدات بۆی.

هەندێ جاریش بە گەڕانەوەی بەندە بۆ هەستکردن بە حاڵی خۆی و حاڵی دروستکراوەکان دەوترێت ئەو ئامادە بووە، واتە لە بزربوونەکەی گەڕاوەتەوە، ئەمەیان ئامادەبوونە بە دروستکراوەکانەوە و ئەوەی یەکەمیان ئامادەبوونەوە بە حەقەوە(ﷻ).

هەندێ جار حاڵیان لە بزربووندا لەیەکتر جیاوازە، هەندێکیان بزربوونەکەی درێژەناکێشێت و هەندێکی تریان درێژە دەکێشێت.

**دەگێڕنەوە "زو نونی مصری" کەسێکی هاوڕێی خۆی نارد بۆ لای "أبي یزید البسطامي"** تا سیفەتی ئەبو یەزیدی بۆ بگوێزێتەوە، کاتێك پیاوەکە هات بۆ **"بسطام"** پرسیاری ماڵی ئەبی یەزیدی کرد و ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای، ئەبو یەزید پێی وت: چیت دەوێ؟

وتی: ئەبو یەزیدم دەوێت، وتی: ئەبو یەزید کێیە؟

ئەبو یەزید لە کوێیە؟ من بەدوای ئەبو یەزیددا دەگەڕێم، پیاوەکە هاتە دەرەوە و وتی: ئەم پیاوە شێتە.

کەسەکە گەڕایەوە بۆ لای **"ذي النون"** و ئەوەی بینی بووی بۆی باس کرد، **"ذو النون"** دەستی بە گریان کرد و وتی: برام ئەبو یەزید لەگەڵ موسافیراندا سەفەری کردووە بۆ لای خودا.

# ١٠.بەهۆشی و مەستی

**بەهۆشی:** بریتییە لە گەڕانەوە بۆ هەستکردن لەدوای بزربوون.

**مەستی:** بزربوونێکە بەهۆی هاتوویەکی بەهێزەوە.

مەستی لەڕوویەکەوە زیادبوونێکە لەسەرو بزربوونەوە، ئەوەش وا دەکات خاوەنی مەستی هەندێ جار کراوە بێت گەر لە حاڵی مەستبوونەکەیدا تەواو نوقم و نغرۆ نەبووبوو، هەندێ جار هەڕەشە و ترسی شتەکان لە حاڵی مەستیدا لە دڵیدا نامێنێت، ئەوە بریتییە لە حاڵی کەسێك لە سەرەتای مەستیدایە کە هاتووەکە بۆ سەری تێر و تەواو نەبێت، بۆیە بۆ هەستکردن رێگەیەك ماوەتەوە، هەندێ جار مەستبوونەکەی بەهێز دەبێت تا لە بزربوون زیاتر دەبێت، هەندێ جاریش خاوەن مەستی بزربوونەکەی توندترە لە خاوەنی بزربوون کاتێك مەستبوونەکەی بەهێز دەبێت، هەندێ جاریش خاوەن بزربوون لە بزربوونەکەیدا تەواوترە لە خاوەنی مەستی گەر لە سەرەتای مەستیدا بێت و مەستییەکەی تێر و تەواو نەبێت.

**بزربوون** هەندێ جار بۆ عابیدانە بەوەی بەسەر دڵیاندا زاڵ دەبێت بەپێی داواکاری رەغبەت و رەهبەت و داخوازییەکانی ترس و رجا.

بەڵام مەستبوون تەنها بۆ خاوەن وەجدەکانە.

کاتێك بە سیفەتی جوانی پەردە لەڕووی بەندە لا دەدرێت مەستبوون سەر هەڵدەدات و رۆح دەکەوێتە سەما و باڵەتەپێ و دڵ عەوداڵ دەبێت.

**وتراوە:**

**سكران: سكر هوى وسكر مدامة فمتى يفيق فتى له سكران**

(دوو مەستبوون: مەستبوونی ئارەزوو و مەستبوونی بەردەوامبوون، لاوێك چۆن هۆشدەکاتەوە دوو مەستبوونی هەبێت)

بزانە بەهۆشی بەپێی مەستییەکەیە، هەر کەس مەستبوونەکەی بە حەق بێت ئەوا بەهۆشییەکەی بە حەق دەبێت.

هەر کەس مەستبوونەکەی بە بەش و حەزێك تێکەڵ بێت ئەوا بەهۆشییەکەی بە حەز و بەشێك هاوملە.

هەر کەس لە حاڵێدا تێر و تەواو بێت ئەوا لە مەستیدا خاوەن بەشێکی گەورە دەبێت.

مەستبوون و بەهۆشی ئاماژە بە لایەکی جیابوون دەکەن.

گەر لە دەسەڵاتی حەقیقەتەوە زانستێك بەدەرکەوت ئەوا سیفەتی بەندە نغرۆبوون و نوقم بوونە.

لەو بارەیەوە وتویانە:

**إذا طلع الصباح لنجم راح تساوي فيه سكران و صاح**

(گەر بەیانی بۆ ئەستێرەیەکی ئاوابوو هەڵهات، مەست و بەهۆشی تێدا یەکسان دەبێت)

خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ﴾ الأعراف: ١٤٣

ئەمە(موسا) لەگەڵ پەیامداری و دەسەڵاتی گەورەیدا بوورایەوە، ئەوەش(چیاکە) لەگەڵ رەقی و توندوتۆڵی و هێزی مەزنیدا پارچە پارچە و تەختی زەوی بوو.

بەندە لە باری مەستبوونیدا موشاهەدەی ئەو حاڵەی کردووە.

لە حاڵی بەهۆشیشدا موشاهادەی زانست دەکات.

بەڵام لە باری مەستبوونیدا لەلایەن خوداوە پارێزگاری لێکراوە زۆرلەخۆکردنی تێدا نییە.

لەباری بەهۆشیشدا بە هەڵسوکەوتەکانی پارێزراوە.

بەهۆشی و مەستی لەدوای چێژ و نۆش دێن.

# ١١. چێژ و نۆش

لەو قسانەی بەسەر زمانی ئەهلی ئەم ڕێگەدا گوزەر دەکات بریتییە لە چێژ و نۆش.

مەبەستیان بەو دوو گوزارەیە ئەو بەر و بەرهەم و واریداتانەیە لە جیلوەکردن و پەردە لەسەر لادانەوە سەرهەڵدەدەن.

سەرەتای ئەو کارە بریتییە لە چێژ و پاشان نۆش و ئەوجا پاراوبوون.

پاکێتی مامەڵەکانیان چێژی مانایان بۆ دەستەبەر دەکات.

تێر و تەواوی مەنزیلەکانیان نۆشیان بۆ دەستەبەر دەکات.

بەردەوامی تەکان و گەردەشیان پاراوبوونیان بۆ دەستەبەر دەکات.

کەسی خاوەن چێژ لە سەرەتای مەستبووندایە، کەسی خاوەن نۆشیش مەستبووە و کەسی پاراویش بەهۆش هاتووەتەوە.

هەر کەس خۆشەویستییەکەی بەهێز بێت نۆشکردنەکەی بەردەوام دەبێت، گەر ئەو سیفەتەی لەگەڵ بەردەوام بوو نۆشکردنەکە مەستی ناکات، بۆیە بە حەقەوە بەهۆشە، و لە هەموو حەز و بەشێکی خۆی فانی بووە، و بەوەی بۆی دێت لە واریدات کاریگەر نابێت و بەوەی رووبەڕووی بووەتەوە گۆڕانی بەسەردا نایەت.

هەر کەس نهێنی و پەنهانی پاك و پاڵفتە بێت نۆشکردنی لێ لێڵ نابێت، هەر کەسیش نۆشکردن بۆی ببێت بە خۆراك ئۆقرە(ئارام) ناگرێت لێی و بەبێ ئەوە ناژی.

**وتویانە:**

**وإنما الكأس رضاع بيننا فإذا لم نذقها لم نعش**

(ئەم کاسە شیردانی نێوانمانە، گەر نەینۆشین ناژین و زیندەگیمان نابێت)

**هەروەها وتویانە:**

**عجبت لمن يقول ذكرت ربي فهل أنسى فأذكر ما نسيت**

**شربت الحب كأسا بعد كأس فما نفد الشراب ولا رويت**

(سەرم سوڕدەمێنیٚ لە کەسێك دەڵێت خودام بەیاد کرد، بۆ خودام لەبیردەچێت تا یادی بکەمەوە، پیاڵەی خۆشەویستیم یەك لەدوای یەك خواردەوە، نە شەرابەکە تەواو بوو نە پاراو بووم)

**وتراوە یەحیای کوڕی مەعاز نامەیەکی بۆ ئەبو یەزیدی بوستامی نووسی و وتی:** ((ئا لێرەدا هەر کەس پیاڵەیەك لە خۆشەویستی نۆش بکات هەرگیز تینووی نابێت))

**ئەبو یەزید لە وەڵامیدا نووسی:** ((لە لاوازی حاڵی تۆ سەرم سوڕدەمێنێت.. هەر کەس دەریاکانی گەردوون دەنۆشێت و دەمی کردۆتەوە داوای زیاتر دەکات، بزانە پیاڵەکانی نزیکی لە پەنهانەوە دەردەکەون و تەنها لەسەر نهێنی ئازادکراو و رۆحی رزگاربوو لە کۆتوبەند دەخولێنەوە)).

# ١٢. سڕینەوە و جێگیرکردن

**سڕینەوە:** هەڵگرتنی وەسفەکانی خو و خدەیە.

**جێگیرکردن:** هەستانە بە حوکمەکانی عیبادەت.

هەر کەس خەسڵەتە ناپەسەندەکان لە خۆی بکاتەوە و لە جێی ئەوانە کردار و حاڵە پەسەندەکان بڕوێنێت ئەو کەسە خاوەنی سڕینەوە و جێگیرکردنە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** یەکێك لە گەورەپیاوان بە کەسێکی وت: چی دەسڕیتەوە؟ و چی جێگیر دەکەی؟

کەسەکە بێدەنگ بوو، ئەویش پێی وت: تۆ ئەوەت زانیوە کات بریتییە لە سڕینەوە و جێگیرکردن، چونکە هەر کەس سڕینەوە و جێگیرکردنی نەبێت کەسێکی بەتاڵ و کەمتەرخەمە.

**سڕینەوە دابەش دەبێت بۆ:**

١. سڕینەوەی هەڵە و گوناهان لە ئاشکرا و دەرەوە .

٢. و سڕینەوەی بێئاگایی لە ناخ و ناوەوە.

٣. و سڕینەوەی دەرد و نەخۆشی لە پەنهان و نهێنییەکان.

- لە سڕینەوەی هەڵە و گوناهدا: مامەڵەکان جێگیر دەکرێن.
- و لە سڕینەوەی بێئاگاییدا مەنزیلەکان جێگیر دەکرێن.
- و لە سڕینەوەی دەرد و نەخۆشی نهێنی و پەنهاندا گەیشتنەکان جێگیر دەکرێن.

ئەمە بریتییە لە سڕینەوە و جێگیربوون بە مەرجی بەندایەتی.

بەڵام حەقیقەتی سڕینەوە و جێگیربوون لە تواناوە دەردەچن، بۆیە سڕینەوە: ئەوەیە حەق دایپۆشیوەو کۆتایی پێهێناوە،و جێگیرکردنیش ئەوەیە حەق ئاشکرای کردووەو دەریخستووە.

سڕینەوە و جێگیربوون لەسەر ویست وەستاون، خودا(سبحانە وتعالی) دەفەرمویێت:﴿ **يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ** ﴾الرعد: ٣٩

**وتراوە:** یادی جگە لە خودا لە دڵی عاریفاندا دەسڕێتەوە، و یادی خودا لەسەر زمانی موریدان جێگیر دەکات، سڕینەوە و جێگیربوون لە لایەن خوداوە بۆ بەندەکەی بەپێی حاڵی بەندەکەیە.

هەر کەس حەق(سبحانە وتعالی) لە بینینی کار و کردەوەکانی خۆی بیسڕێتەوە ئەوا بە نووری حەقیقەت جێگیری دەکات.

هەر کەس حەق(سبحانە وتعالی) لە جێگیربوونەکەی بیسڕێتەوە دەیگێڕێتەوە بۆ بینینی نەیار(جگە لە خودا) و لە دۆڵی جیابووندا جێگیری دەکات.

**پیاوێك وتی بە شیبلی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت):** چییە دەبینم نیگەرانی، ئایا ئەوت لەگەڵ نییە و تۆ لەگەڵ ئەو نیت؟

شیبلی وتی: گەر من لەگەڵ ئەو بوومایە ئەوا من خۆم دەبووم، بەڵام لەوەی ئەودا سڕاومەتەوە.

هاڕین لەسەرو سڕانەوەوەیە، چونکە سڕینەوە ئەسەرێکی دەمێنێت، بەڵام هاڕین ئەسەری نامێنێت.

ئامانجی کۆشان و لێبڕانی ئەم دەستەیە ئەوەیە حەق(سبحانە وتعالی) لە بینینی کار و کردەوەکان بینهاڕێت و پاشان نەگەڕێنەوە بۆ بینینی لەدوای ئەوەی لێی بزربوون.

# ١٣. دا پۆشین و جیلوەکردن

خــەڵکی ڕەشــۆکی لــەناو پۆشــەری داپۆشــیندان، تایبــەتانیش لــە بــەردەوامی جیلوەکردندا.

**لە ڕیوایەتێکدا:** ((خودا کاتێك بۆ شتێك جیلوە دەکات ئەو شتە بۆی گەردنکەچ دەبێت))

خاوەنی داپۆشین لـە وەسـفی بینینـدایـە، و خـاوەنی جیلـوەش هەمیشـە لـە وەسـفی گەردنکەچبووندایە.

داپۆشین بۆ خەڵکی ڕەشۆکی سزایە، و بۆ کەسی تایبەت بەزەییە، چونکە گەر ئەوەی پەردەی لەسەر لادەدات لێیان دانەپۆشێت لە ژێر دەسەڵاتی حەقیقەتـدا بـوونی خۆیـان بزر دەکرد، بەڵام وەك چۆن بۆیان دەردەخات لێشیان دادەپۆشێت.

**گوێم لە "منصور المغربي" بوو دەیوت:** پیاوێکی هەژار بە گەڕەکێکی عەرەبدا گوزەری دەکرد، گەنجێك میوانداری لێ کرد، کاتێـك گەنجەکـە سـەرقاڵی خزمـەتی هەژارەکـە بـوو بوورایەوە(لە هۆش خۆی چوو)، پیاوە هەژارەکە پرسـیاری حـاڵی گەنجەکـەی کـرد، وتیـان: کچێکی مامی هەیە و دڵـی پێیــەوە گرێـدراوە، لـە خێمەکـەی خۆیـدا هاتووچـۆی دەکـرد گەنجەکە چاوی لە تۆزی بەرپێی ئافرەتەکە بوو بۆیە بوورایەوە، پیاوە هەژارەکە ڕۆیشـت بـۆ دەرگای خێمەکە و وتی: کەسی غەریب لەلای ئێوە ڕێز و پەنای هەیە، هاتووم بۆ تکاکردن بۆ ئەو گەنجە، سۆز و بەزەییەکت بەو گەنجە هەبێت لەوەی تێیکەوتووە لە ئارەزووی بۆ تـۆ، ئافرەتەکە وتی: سبحان الله! تۆ پیـاوێکی خـاوەن دڵـی، ئـەو ناتوانێـت تـەپوتۆزی بـەرپێم ببینێت و دەبوورێتەوە، ئیتر چۆن دەتوانێت هاوەڵی من بکات؟!

خەڵکی ڕەشۆکی ناو ئەم دەستەیە زیندەگی خۆیان لە جیلوەکردندا دەبیـنن و بـەڵای خۆیان لە داپۆشیندا تەماشا دەکەن.

بەڵام کەسانی تایبەت لە نێوان هەڵچوون و زیندەگیدان، چونکە کاتێك جیلوەیان بـۆ دەکرێـت هەڵدەچـن و کاتێـك لێیـان دادەپۆشـرێت دەگەڕێنــەوە بـۆ بەشـی خۆیـان و بەسەربردنی زیندەگی.

**وتراوه: خودا(سبحانه وتعالى) به موسای فەرموو: ((﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ۝١٧ ﴾ طه: ١٧** -ئەوه چییه به دەستی راستتەوه ئەی موسا)) بۆیه ئەو پرسیارەی لێکرد تاکو ئەوەی له موکاشەفه به بیستن بۆی دەرکەوتبوو هەندێکی لیٚ داپۆشێت و لەو کاره ناکاوه ئارامی بکاتەوه.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((إنه ليغان على قلبي حتى أستغفر الله في اليوم سبعين مرة))**

داوای لێخۆشبوون(**الإستغفار**) داوای داپۆشینه، چونکه مانای **"الغفر"** بریتییه له **"الستر"** لەو بارەوەیه وتراوه **"غفر الثوب"** هەروەها **"مغفر"** و کۆمەڵێك وشەی تریش، وەك ئەوەی پێمان بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) داوای داپۆشین دەکات بۆ دڵی بەهۆی دەسەڵاتی حەقیقەتەوه، چونکه دروستکراوەکان به ئامادەبوونی حەق مانەوەیان لەدەست دەدەن، له ریوایەتێکدا: ((گەر رووی خۆی دەربخات سوبوحاتی(نووری مەزنی خودا) رووی پاکی هەتا چاو هانا بکات دەیسووتێنێ))[٢]

[٢] {(له دونیادا هەر کەس بەپێی بەصیرەتی خۆی پەردەی بۆ لا دەدرێت، مەبەست به **"مکاشفة"** و **"مشاهدة"** و هاوشێوەی ئەم زاراوانه بریتی نییه له بینینی زاتی خودای موتەعال، چونکه ئەوه له دونیادا روونادات(**الشيخ زكريا الأنصاري**))}.

# ١٤. ئامادەبوون و پەردەلادان و بینین

سەرەتا ئامادەبوون و پاشان پەردەلادان و ئەوجا بینین.

**ئامادەبوون:** بریتییە لە ئامادەبوونی دڵ، هەندێ جار بە بەڵگەی بڕاوە، ئەو هێشتا لەدوای داپۆشینەوەیە، با ئامادەش بێت بە زاڵبوونی دەسەڵاتی یاد.

**پاشان پەردەلادانە:** ئەوەش ئامادەبوونە بە وەسفی رۆشنکردنەوە، لەم بارەدا ئاتاج نییە بە تێڕامانی بەڵگە و گەڕان بەدوای رێگەدا، لە بانگکەرەکانی شك پەنا ناگرێت و لە وەسفی پەنهان بێبەش ناکرێت.

**پاشان بینینە:** ئەوەش ئامادەبوونی حەقە بەبێ مانەوەی گومان.

کاتێك ئاسمانی نهێنی و پەنهان سامالْ بوو و دوور بوو لە هەوری داپۆشین ئەوا خۆری بینین لە بورجی مەزنی و گەورەییەوە هەڵدێت، حەقیقەتی بینین ئەوەیە جونەید(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیڵێت: بوونی حەق لەگەڵ بزربوونی تۆ[٣] ئەو کەسەی ئامادە دەبێت بە ئایەتەکانییەوە گرێدراوە، کەسی خاوەن پەردەلادانیش بەڕووی سیفەتەکانیدا کراوەتەوە، خاوەنی بینینیش خراوەتە بەردەم زاتی خودا(ﷻ)، خاوەنی ئامادەبوون: ئەقڵی رێنموونی دەکات، خاوەنی پەردەلادان زانستەکەی نزیکی دەکاتەوە، و خاوەنی بینینیش مەعریفەکەی دەیسڕێتەوە.

هیچ کەس وەك عەمری کوڕی عوسمانی مەکی(رەحمەتی خودای لێ بێت) راستەقینەی بینینی رۆشن نەکردووەتەوە.

**مانای ئەوەی وتوویەتی:** نووری جیلوەکردن بەدوای یەکدا روو لە دڵ دەکەن و بەسەریدا دادەبارێن بەبێ ئەوەی پۆشەر و بڕین بکەوێتە نێوانیەوە، وەك چۆن گەر شەوی تاریك بە بەردەوامی رۆشنایی رووی لێ بکات دەگۆڕێت بۆ رۆژ دڵیش هەر بەو جۆرەیە گەر بە بەردەوامی جیلوە رووی لێ بکات دەگۆڕێت بۆ رۆژ و شەوی تێدا دەپێچرێتەوە، وتویانە:

---

[٣] {(واتە فەنابوون لە هەموو شتێك جگە لە خودا)}.

**ليلي بوجهك مشرق وظلامه في الناس ساري**

**والناس في سدف الظلام ونحن في ضوء النهار**

(شەوم بە رووی تۆ رۆشنە و تاریکی شەویش بەسەر خەڵکیدا باڵیکێشاوە، خەڵکی لە رەهێڵەی شەودان و ئێمە لەبەر تیشکی رۆژ)

"النوری" دەڵێت: بینین بۆ بەندە نایەتە راستە تا رەگێکی تێدا مابێت.

هەروەها دەڵێت: گەر رۆژبوویەوە خەڵکی لە چرا بێنیاز دەبن.

هەندێك ئەندێشەی ئەوەیان بۆ دروست بووە بینین(**مشاهدة**) ئاماژە بە لایەکی "جیابوون" دەکات، چونکە کێشی "**المفاعلة**" لە زمانی عەرەبیدا لە نێوان دوواندایە، ئەمە ئەندێشەیەکە لە هەندێك کەسەوە، چونکە لە دەرکەوتنی حەقدا(ﷻ) تیاچوونی خەلق سەرهەڵدەدات، هەموو کێشەکانی "**المفاعلة**"ش داوای هاوبەشی نێوان دووان ناکەن، وەك "**سافر، طارق النعل**" و هاوشێوەکانیان.

پیاڵەیەك، چ پیاڵەیەك! پێیەوە هەڵدەکزێن و فەنایان دەکات و لە هۆشی خۆیان دەبات و نایانهێڵێت، پیاڵەیەك.. هیچ ناهێڵێتەوە و هیچ بەجێناهێڵێت، بەتەواوی دەیانسڕێتەوە و پشکۆیەك لە ئاساری مرۆیی نامێنێتەوە، وەك دەڵێت: رۆیشتن، نە وێنە و نە ئەسەر نەمایەوە.

# ١٥. سپێدە، درەوشانەوە، هەڵهاتن

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ئەم وشانە لە مانادا لە یەکترەوە نزیکن، لە نێوانیاندا جیاوازی زۆر نییە، ئەمانە حاڵ و سیفەتی ئەو کەسانەن هێشتا لە سەرەتادان و تازە دڵیان دەستی بە بەرزبوونەوە کردووە، لە دوای رۆشنایی خۆری مەعریفە ئەمانە بەردەوام نابن.

بەڵام حەق(ﷻ) رۆزی دڵی ئەوان لە هەموو کات و لە هەموو بارێکدا دەدات، خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾﴾ مريم: ٦٢، هەتا ئاسمانی دڵ بە هەوری حەزەکان لێیان تاریك ببێت سپێدەی پەردەلادان و بریسکانەوە و درەوشانەوەی نزیکیان بۆ دەردەکەوێت، ئەوان لە سەردەمی داپۆشینیاندا چاوەڕوانی سپێدەی لەناکاو دەکەن.

**وەك شاعیرێك دەڵێت:**

**يأيها البرق الذي يلمع    من أي أكناف السما تسطع**

(ئەی ئەو تیشکەی دەبریسکێیەوە لە کام سووچی ئاسمانەوە پەرشدەبییەوە)

دەرکەوتووەکان یەکەمجار سپێدەن و دواتر درەوشانەوە و ئەوجا هەڵهاتن.

سپێدە وەك تیشك وایە، دەردەکەوێت و دادەپۆشرێتەوە، وەك وتراوە:

**افترقنا حولا فلما التقينا    كان تسليمه علي وداعا**

(ساڵێك لەیەکتر دابڕاین کاتێك بەیەکتر گەیشتینەوە سەلام کردنەکەیماڵئاوایی بوو)

**هەروەها وتراوە:**

**ياذا الذي زار ومازارا كأنه مقتبس نارا**

**مر بباب الدار مستعجلا ما ضره لو دخل الدارا؟**

ئەی ئەو کەسەی سەردانی کرد، بەڵام سەردانی نەکرد، وەك ئەوەی ئاگر بخوازێت(بە پەلە گەڕایەوە)، بە پەنای ماڵەکەدا بەپەلە گوزەری کرد، چ زیانێکی پێ دەگەیشت گەر بهاتبایە ژوورەوە؟)

**درەوشانەوەش:** لە سپێدە رۆشنترە، بەو خێراییە ناسڕێتەوە، دوو سات و سێ سات دەمێنێتەوە، بەڵام وەك وتویانە:

**والعين باكية لم تشبع نظرا**(چاوەکان دەگرین و لە دیمەنەکە تێرنەبوون)

هەروەها وتراوە:

**لم ترد ماء وجهه العين     إلا شرقت قبل ريها برقيب**

(هەر کات چاو چووبێتە سەر ئاوی روخساری بەرلە پاراوبوون ناحەزێك دەرکەوتووە)

کاتێك دەدرەوشێتەوە لێت دەبڕێت و کۆتدەکاتەوە لەگەڵی، بەڵام هەر کات نووری رۆژی ئەو داگیری دەکات سەربازەکانی شەو پەلاماری دەدەن، ئەوانە لە نێوان ئاسوودەیی و ناڵە و گریاندان، چونکە لە نێوان پەردەلادان و داپۆشیندان.

وەك دەڵێن:

**فالليل يشملنا بفاضل برده     والصبح يلحفنا رداءا مذهبا**

شەو بە چاکەی سەرماکەی دامانده‌گرێتەوە و رۆژیش پۆشاکێکی زێڕینمان لەبەر دەکات)

**هەڵهاتنیش:** کاتی زۆرترە و دەسەڵاتی زیاتر و بەردەوامییەکەی دەخایەنێت و تاریکی زۆرتر دەسڕێتەوە و ئەندێشەی زۆرتر کۆتایی پێ دەهێنێت، بەڵام هێشتا لەبەر مەترسی ئاوابووندایە، زۆر سەرنەکەوتووە و بڵند لێی نەوەستاوە، و مانەوەکەی هەمیشەیی نییە، پاشان کاتەکانی بەدەستهێنانی رۆیشتنئامێزە و باری ئاوابوونی درێژخایەنە.

ئەم مانانە کە بریتین لە <u>**سپێدە و درەوشانەوە و هەڵهاتن**</u> لە هەندێ پرس(حوکم)دا جیاوازن، هەیانە گەر لە دەستی چوو هیچ ئەسەرێکی بۆ نامێنێتەوە، وەك شەوقێك ئاوا ببێت، وەك ئەوەی شەو هەمیشەیی بێت، هەیانە ئەسەر بەجێ دەهێڵێت با ئاواش بووبێت، بەڵام کاریگەرییەکەی هەر ماوە، خاوەنەکەی لەدوای خامۆشبوونی هاتنەکوڵ لەبەردەم رۆشنایی بەرەکەتەکەیدا دەژی، تا سپێدەیەکی تر چاوەڕوان دەبێت و هیوای بە کاتی هەڵهاتنی هەیە و وەك ئەوەی لەو کاتەدا بژی کە هەڵهاتووە.

# ١٦. ناكاوگیر و هێرش

**ناكاوگیر:** ئەوەیە لە پەنهانەوە لەپڕ و لەناكاو و بێ بوونی پێشبینی بەسەر دڵدا دادەبارێت، جا یان دڵخۆشی و ئاسوودەییەك سەرپێهەڵدەدات یان خەم و دڵتەنگی.

**هێرش:** ئەوەیە بە هێزی كات بەسەر دڵدا دادەبارێت بەبێ زۆر لەخۆكردن لە تۆوە.

بەپێی هێز و لاوازی هاتووەكە جۆرەكانیان جیاوازە.

هەیانە ناكاوگیر دەیگۆڕێت و هێرشیش هەڵیدەسوڕێنێت.

هەیانە لەڕووی حاڵ و هێزەوە لەسەرو ئەوەوەیە كە پێشبینی بۆ نەكراوە، ئەوانە بریتین لە سەروەرانی كات.

# ١٧. ڕەنگگرتن و دامەزران

**ڕەنگگرتن:** سیفەتی خاوەن حاڵەکانە.

**دامەزران:** سیفەتی ئەهلی حەقە.

هەتا بەندە لە ڕێگەدا بێت ئەو خاوەنی ڕەنگگرتنە، چونکە لە حاڵێکەوە بەرز دەبێتەوە بۆ حاڵێکی تر، و لە وەسفێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ وەسفێکی تر، و لە قۆناغێکەوە کۆچ دەکات بۆ قۆناغێکی تر، دەگاتە وەرزی بەهاری خۆی و کاتێک گەیشت دەگاتە دامەزران.

**وتویانە:**

**مازلت أنزل في ودادك منزلا تتحير الألباب دون نزوله**

(بەردەوام لە خۆشەویستی تۆدا نیشتەجێبووم، خاوەن هۆشەکان بەبێ نیشتەجێبوونی سەرگەردان بوون)

خاوەنی ڕەنگگرتن بە هەمیشەیی لە زیادبووندایە، خاوەنی دامەزرانیش گەیشتووە و پاشان پەیوەست بووە.

نیشانەی ئەوەی پەیوەست بوو بێت: ئەوەیە بەتەواوی لە تەواوی خۆی هاتبێتە دەرەوە.

**هەندێ لە گەورەپیاوان پێیانوایە:** سەفەری موریدان بە سەرکەوتن بەسەر نەفسیاندا کۆتایی پێ دێت، کاتێك بەسەر نەفسیاندا سەرکەوتن ئەوا گەیشتوون.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت** مەبەستی ئەوەیە حوکمە مرۆییەکان بچنەدواوە و دەسەڵاتی حەقیقەت زاڵ ببێت، گەر ئەم حاڵەتە بۆ بەندە بەردەوام بوو ئەوا دەبێت بە خاوەنی دامەزران(تمكين).

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** موسا(سەلامی خودای لەسەر بێت) خاوەن ڕەنگگرتن بوو، لە بیستنی کەلام گەڕایەوە و پێویستی بە

داپۆشینی رووی خۆ بوو، چونکە حاڵەکە کاری تێکردبوو، بەڵام پێغەمبەرمان(ﷺ) خاوەنی دامەزران بوو وەك چۆن رۆیشت بوو ئاوا گەڕایەوە، چونکە ئەوەی لەو شەوەدا بینی بووی کاری تێنەکرد بوو.

دەربارەی ئەمە ئەبو عەلی بەڵگەی بە چیرۆکەکەی یوسف(عليه السلام) دەهێنایەوە: ئەو ژنانەی یوسفیان(عليه السلام) بینی دەستی خۆیان بڕی بەهۆی ئەوەی لە ناکاو بینینی یوسفەوە(عليه السلام) کاتێك رووی لێکردن، ژنەکەی عەزیز لە تووشبوونی بە خۆشەویستی یوسف تەواوتر و کاملتر بوو لەوانی تر، ئەو رۆژە موویەکیشی گۆڕانی بەسەردا نەهات، چونکە خاوەنی دامەزران بوو لە گفتوگۆ لەگەڵ یوسف.

**مامۆستا دەڵێت:** بزانە ئەو گۆڕانەی روو لە بەندە دەکات بەهۆی یەکێك لەم دوو خاڵەوەیە:

یان بەهۆی بەهێزی هاتووەکەوە یان بەهۆی لاوازی خاوەنەکەیەوە.

ئارامی لە خاوەنەکەیەوە بۆ یەکێك لەم دوو خاڵە دەگەڕێتەوە: بەهێزی کەسەکە یان لاوازی هاتووەکە بۆ سەری.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** بنەڕەت و بنچینەکانی ئەهلی ئەم رێگەیە لە گونجاوی بەردەوامی دامەزران(تمكين) لە دوو رووەوە دەردەچێت:

**یەکەمیان:** هیچ رێگەیەك بوونی نییە بۆی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:((گەر ئەوەی ئێوە لەسەرینی تیایدا بمێننەوە تەوقەتان لەگەڵ فریشتەکاندا دەکرد))، هەروەها لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((کاتێکم هەیە جگە لە پەروەردگارم(عزوجل) هیچ کەس شیاو نییە لەلام بێت))، دەربارەی کاتێکی تایبەتکراو هەواڵی راگەیاند.

**رووی دووەم:** بەردەوامبوونی حاڵەکان دروستە، چونکە ئەهلی حەقیقەت لە وەسفی کاریگەربوون بە تەقەلێدەرەکان(**طوارق**) بەرزبوونەتەوە،، لە ریوایەتەکەدا هاتووە: ((تەوقە لەگەڵ فریشتەکان دەکەن)) کارەکەی پەیوەست نەکرد بە بارێکی محاڵەوە،

تەوقەی فریشتەکان جیایە لەوەی-بۆ ئەهلی سەرەتا- **پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((فریشتەکان باڵەکانیان رادەخەن بۆ زانستخوازان وەك رازیبوونێك بەوەی ئەنجامی دەدەن))

**ئەوەی دەفەرموێت:** ((کاتێکم هەیە..)) ئەوە بەپێی بیستنی گوێگر قسەکەی کردووە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو بارەکانیدا بە حەقیقەتەوە راستبووەتەوە.

**لەپێشترە بوترێت:** هەتا بەندە لە بەرزبوونەوەدا بێت خاوەنی رەنگگرتن لە وەسفیدا زیادکردنی حاڵەکان و کەمکردنی حاڵەکان دروستە، کاتێك گەیشتە حەق بە چوونەدواوەی حوکمە مرۆییەکان خودا(سبحانه وتعالى) دامەزرانی پێ دەدات، بەوەی نەیگێڕێتەوە بۆ نەخۆشییەکانی دەروون، ئەو لە حاڵی خۆیدا دامەزراوە، بەپێی شوێن و جێگە و شایستەیی خۆی.

ئەوەی خودا لە هەر نەفسێکدا هەڵیدەگرێت سنوورێك بۆ رادە و بڕی نییە، ئەو لە زیادکردندا رەنگاوڕەنگە، بەڵکو هەمەرەنگە و لە بنچینەی حاڵەکەیدا دامەزراوە، ئەو بەهەمیشەیی لە حاڵێکدا دامەزراو دەبێت باڵاترە لەوەی پێشتری، پاشان لێی بەرز دەبێتەوە بۆ باڵاتر و بەرزتر لەو حاڵە، ئیتر بەم جۆرە کۆتاییەك بوونی نییە.

بەڵام ئەوەی بەردەوامە لە بینینی و هەستەکانی بەتەواوی نغرۆبوون ئەوا بۆ مرۆییبوون رادە و سنوورێك بوونی هەیە، گەر لە هەموو شتەکان و خودی خۆی و هەستی و تەواوی بوونەوەرەکانی تر دابڕا و ئەو بزربوونە تیایدا بەردەوام بوو ئەوە بریتییە لە سڕینەوە، بۆیە دامەزران و رەنگگرتن و مەقام و حاڵی بۆ نییە.

گەر لەو وەسفەدا بمێنێتەوە ئەوا تەشریف و داوا بوونیان نییە، مەگەر شتێکی بەسەردا گوزەر بکات بەبێ ئەوەی هیچ لە ئەوەوە بێت، بۆیە ئەو بەندەیە لە ئەندێشەی خەڵکدا خاوەنی هەڵسوکەوتە و لە بەدەستهێنانیشدا رۆچووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ ﴾الكهف: ١٨

# ١٨. نزیکی و دووری

**یەکەمین پلە لە نزیکی** بریتییە لە نزیکی لە گوێڕایەڵی خودا و خۆڕازاندنەوە بە عیبادەتکردنی لە هەموو کاتەکاندا.

**بەڵام "دووری" بریتییە** لە پیسبوون بە سەرپێچی کردن لە خودا و پشتکردنە گوێڕایەڵی کردنی.

**یەکەمین دووری** دوورییە لە کۆمەکی و پاشان دووری لە بەدەستهێنان، بەڵکو دووری لە کۆمەکی دوورییە لە بەدەستهێنان، **پێغەمبەر**(ﷺ) **لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت:** ((خودا دەفەرموێت: بەندەکەم بە شتێك لێم نزیك نابێتەوە خۆشەویستتر بێت لەلام بەوەی لەسەری فەرزم کردووە، بەندەکەم بەردەوام لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشمدەوێت، کاتێك خۆشمویست دەبم بەو گوێیەی پێی دەبیستێ، دەبم بەو چاوەی پێی دەبینێ..))[٤]

**نزیکی بەندە** یەکەمجار نزیکییە بە باوەڕ و بەڕاستزانین، پاشان نزیکی بە ئیحسان و بەدەستهێنان و گەیشتن.

**نزیکی خودا** بۆ ئەو لە دونیادا ئەوەیە کە تایبەتی کرد بە ناسین و عیرفان، لە دوارۆژیشدا ئەو ڕێز و پلە و پایەیە لە خزمەتی خودادا بەدەست دەهێنێت، لە نێوان ئەو دوو پلەدا چەندین رووی لوتف و چاکەی خودا بوونیان هەیە.

نزیکی بەندە بە خوداوە بە دووری بەندە لە خەڵکەوە گرێدراوە، ئەمانە لە سیفەتەکانی دڵن بەبێ حوکمەکانی رووڵەت(دەرەوە) و گەردوون.

نزیکی حەق(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) بە زانست و دەسەڵات گشتییە بۆ هەموان، بە لوتف و سەرخستنیش تایبەتە بە باوەڕدارانەوە، پاشان بە تایبەتکردنی هۆگری تایبەتە بە دۆستانی خودا، خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) دەفەرموێت:﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ ﴾ ق: ١٦، هەروەها ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ

[٤] {فەرموودەکە بە تەواوی: "**البخاري**" ریوایەتی کردووە}.

﴿إِلَيْهِ مِنكُمْ﴾ الواقعة: ٨٥، هەروەها﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ الحديد: ٤، هەروەها﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا﴾المجادلة: ٧

هەركەس نزیكی لە حەق(ﷻ) بەدەست بهێنێت كەمەكەی ئەوەیە بە بەردەوامی چاودێری ئەوی لەگەڵدایە، چونكە چاودێری تەقوای لەسەرە، پاشان چاودێری پارێزگاری و وەفا و ئەوجا پارێزگاری حەیا.

یەكێك لە گەورە پیاوان قوتابییەكی خۆی بە رووتێكردن و گرنگیپێدان تایبەت كردەوە، هەندێ لە هاوەڵانی پرسیاری ئەوەیان لێ كرد، ئەویش باڵندەیەكی دا بە هەریەكەیان، و پێی وتن: هەریەك باڵندەكەی خۆی لە شوێنێك سەربیڕێت كەس چاوی لێی نەبێت، هەریەكەیان باڵندەكەی خۆی لە شوێنێكی چۆڵدا سەربڕی... بەڵام ئەو قوتابییەیان باڵندەكەی بۆ مامۆستا گێڕایەوە و سەرینەبڕی بوو، مامۆستاكەی پرسیاری لێكرد، ئەویش وتی: تۆ فەرمانت پێكردم لە شوێنێك سەریببڕم كەس نەیبینێت، شوێنێك بوونی نەبوو خودا(ﷻ) نەیبینێت، مامۆستاكە وتی: بۆ ئەو مەبەستەیە لە ئێوە زیاتر گرنگی پێ دەدەم و پێشی دەخەم، ئێوە قسەی خەڵكی زاڵە بەسەرتاندا، بەڵام ئەمە بێئاگا نییە لە حەق(ﷻ).

بینینی نزیكی پەردەیە بۆ نزیكی، هەر كەس جێگەیەكی بۆ خۆی بینییەوە یان نەفسێكی بە خۆی ڕەوا بینی ئەو كەسە فێڵلێكراوە.

بۆیە وتویانە: خودا لە نزیكی خۆی نامۆییت بۆ دروست بكات: واتە لە بینینی نزیكی لە خوداوە، هۆگری بە نزیكی خوداوە لە خەسڵەتەكانی عیززەتە بە ئەوەوە، چونكە حەق(ﷻ) لە پشتی هەموو هۆگربوونێكەوەیە.

بابەتەكانی حەقیقەت سەرسامی و سڕینەوە پێویست دەكەن.

نزیك بەم مانایە وتراوە:

**محنتي فيك أنني ما أبالي بمحنتي**

**قربكم مثل بعدكم فمتى وقمت راحتي**

(میحنەتی لە تۆدا ئەوەیە گویّ بە میحنەتەکەم نادەم، نزیکی ئێوە وەك دووریتان وایە، هەرکات ئاسوودەیت لیّ هەڵگرتم)

مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق زۆرجار دەیوت:

**ودادكم هجر وحبكم قلي    وقربكم بعد وسلمكم حرب**

(لوتکەی خۆشەویستی و بەزەییتان کۆچکردنە و خۆشەویتیتان رقە، نزیکیتان دووری و ئاشتیتان جەنگە)

**"أبو الحسين النوري" یەکێك لە هاوەڵانی "أبي حمزة"ی بینی و وتی:**

تۆ لە هاوەڵانی ئەبی حەمزەیت کە ئاماژە بە نزیکی دەکات؟ گەر پێی گەیشتی پێی بڵیّ: ئەبو حوسەینی نووری سەلامی لیّ دەکردی و پێی دەوتی: نزیکی نزیکی-کە ئێمە تێیداین- دووری دوورییە.

**نزیکی بە زاتیش:** پاکێتی و شکۆمەندی بۆ خودا لەوەی سنوور و شوێنێك بیگرێتە خۆ و رادە و کۆتاییەکی بۆ هەبێت، هیچ دروستکراوێك پەیوەست نییە بە خوداوە(لەڕووی زاتەوە)، رووداوێك لێی رووینەداوە پێشی کەوتبێت، بەرز و بڵندی و مەزنی بۆ ئەو(ﷻ) لە قبووڵکردنی پەیوەستبوون و جیابوونەوە.

نزیکی بە زات لە ئەوەوە لە دروستکراوەکانەوە محاڵە، نزیکی لە سیفەتەکانیدا پێویستە و بریتییە لە نزیکی زانست و بینین.

نزیکی ئەو لە وەسفیدا گونجاوە و هەندیّ لە بەندەکانی پیّ تایبەت دەکات، ئەوەش بریتییە لە نزیکی چاکە و لوتفی ئەو(ﷻ).

# ١٩. شەریعەت و حەقیقەت

**شەریعەت:** فەرمانی کردووە بە پابەندبوون بە بەندایەتی.

**حەقیقەت** بینینی پەروەردگارییە(**الربوبیة**).

هەر شەریعەتێك بە حەقیقەت پشتیوانی نەکرابێت قبووڵکراو نییە.

هەر حەقیقەتێك بە شەریعەت کۆتوبەند نەکرابێت قبووڵکراو نییە.

بۆیە شەریعەت هاتووە بە داواکردن لە مرۆڤ و حەقیقەتیش هەواڵدانە لە گەردەشەکانی حەق.

شەریعەت بۆ ئەوەیە بیپەرستی و حەقیقەتیش بۆ ئەوەیە بیبینی.

شەریعەت هەستانە بەوەی فەرمانی پێکردووە، حەقیقەتیش بینینی ئەوەیە بڕیاری لێداوە و بڕیویەتەوە، و شاردوویەتەوە و دەریخستووە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** "إیاك نعبد" پارێزگارییە لە شەریعەت، و "إیاك نستعین" داننانە بە حەقیقەتدا.

بزانە شەریعەت حەقیقەتە لەو ڕووەوە بە فەرمانی شەریعەت پێویست بووە.

حەقیقەتیش شەریعەتە لەو ڕووەوە مەعریفە بە خودا(سبحانه وتعالى) لە ڕێگەی حەقیقەتەوەیە.

## ٢٠. نەفەس( هەناسە )

**نەفــەس:** ئارامیدانــە بــە دڵان بــە لوتفــەکانی پــەنهان، خــاوەنی نەفــەس ناســکتر و پاڵفتەترە لە خاوەنی حاڵ، چونکە خاوەنی کات لە ســەرەتادایە و خــاوەنی نەفــەس لــە کۆتاییدایە، و خاوەنی حاڵیش لە نێوان ئەو دوانەدایە.

حاڵەکان ناوەندن و هەناسەکان(نەفەسەکان) کۆتایی بەرزبوونەوەن.

کاتەکان بــۆ خــاوەن دڵانــە، و حاڵــەکان بــۆ خــاوەن رۆحــان و نەفەســەکان بــۆ خــاوەن نهێنییەکان.

**وتویانە:** باشترین بەندایەتی ژماردنی هەناسەکانە لەگەڵ خودادا(ﷻ).

**هەروەها وتویانــە:** خــودا دڵانــی دروســت کــرد و کردنــی بــە کــانزای مەعریفــەت، نهێنییــەکانی لــە پشــتی دڵانــەوە خولقانــد و کردنــی شــوێنگەی یەکتاپەرســتی، هــەر هەناسەیەك بەبێ بەڵگەی مەعریفە و ئاماژەی یەکتاپەرستی لەســەر راخــەری ناچاری بەرهەم بێت ئەوە بێگیان و مردووە و خاوەنەکەی بەرپرسیارە بەرانبەری.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقــاق بوو(رەحمــەتی خــودای لــێ بێــت) دەیــوت:** عــاریف نەفەسی بۆ نییە، چونکە مەودایەك نییە لەگەڵی گــوزەر بکــات، بــەڵام موحیــب هــەر دەبێ نەفەسی هەبێت، چونکە گــەر نەفەســی نــەبێت دەســڕێتەوە و کۆتــایی پــێ دێــت بەهۆی نەبوونی تواناوە.

## ٢١. خایله( خوتووره )

گوتارێکـه روو لـه نـاخ دەکـات، هەنـدێ جـار بـەهۆی هەڵدانەوەیـە لەلایـەن فریشتەیەکەوە، هەندێ جاریش هەڵدانێکە لەلایەن شەیتانەوە، دەشبێت قسەی دەروون بێت، دەشگونجێت لە لای حەقەوە(ﷻ) بێت.

گەر لە فریشتەوە بێت بریتییە لە ئیلهام.

گەر قسەی دەروون بێت پێیدەوترێت خایلە(هاجس).

گەر لە شەیتانەوە بێت پێی دەوترێت: وەسوەسە.

گەر لەلای خوداوە بێت(ﷻ) و هەڵیبداتە ناو دڵەوە ئەوە ختوورەی حەقە.

هەموو ئەو جۆرانەی ختوورە لە شێوەی قسەدایە.

گەر لەلایەن فریشتەوە بوو ئەوا راستییەکەی بـە تـەبایی لەگـەڵ زانست(شـەریعەت) دەزانرێت، بۆیـە وتویانـە: هـەر ختوورەیـەك ئاشـكرا شـایەتی بـۆ نـەدا ئـەوە پـووچ و بێبنەمایە.

گەر لەلایەن شەیتانەوە بێت زۆرینەی بانگ بۆ یاخیبوون و تاوان دەکات.

گەر لەلایەن نەفسەوە بێت زۆرینەی بانگ دەکـات بـۆ حـەز و هەسـتی لوتبـەرزی و ئەوەی لە تایبەتمەندییەکانی سیفەتی نەفسە.

گەورەپیاوان کۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی هـەر کـەس خـواردنی لـە حـەرام بێـت جیاکاری پێ ناکرێت لە نێوان ئیلهام و وەسوەسەدا.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:**

هەر کەس رۆزییەکەی شوبهە و حەرام بێت ناتوانێت جیاکاری بکات لە نێوان ئیلهام و وەسوەسەدا، هەر کەسیش خایلەی نەفسی دامرکابێتەوە بەهۆی صدقی تێکۆشـانەوە زمانی دڵی دێتە گۆ بەهۆی ئازاری تێکۆشانەوە.

گەورەپیاوان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئـەوەی دەروون(نفـس) راسـت ناکـات و دڵـیش درۆ ناکات.

**هەندێ لە عاریفان دەڵێن:** نەفست راستت لەگەڵ ناكات و دڵت درۆت لەگەڵ ناكات، گەر هەموو هەوڵێكت بەگەڕ بخەی رۆحت قسەت لەگەڵ بكات قسەت لەگەڵ ناكات.

**جونەید جیاوازی كردووە لە نێوان خایلەی نەفس و وەسوەسەی شەیتان بەوەی:** كاتێك نەفس داوای شتێكت لێ دەكات پێداگری دەكات.. بەردەوام هەوڵت لەگەڵ دەدات با ماوەیەكیش بخایەنێت تا دەگات بە مەرامی خۆی و مەبەستەكەی بەدەست دەهێنێت، مەگەر صدقی تێكۆشان هەمیشەیی و بەردەوام بێت، پاش ئەوەش هەوڵدەدات و هەوڵدەدات.

بەڵام گەر شەیتان بانگی كردی بۆ هەڵە و تێكەوتنێك و تۆش سەرپێچیت لێكرد بە وازهێنان لەو كارە، ئەوا وەسوەسەت بۆ هەڵە و تێكەوتنێكی تر لا پەیدا دەكات، چونكە هەموو لادان و سەرپێچییەكان لای شەیتان یەكسانن، ئەو دەیەوێت هەڵەیەك بكەی، ئیتر هەڵەكە هەرچییەك بێت لەلای گرنگ نییە، و هیچ مەرامێكی لە تایبەت كردنی گوناهێكدا نییە لەگەڵ گوناهێكی تردا.

**بۆیە وتراوە:** هەر ختوورەیەك لەسەر رێگە لەوانەیە خاوەنەكەی تەبا بێت لەگەڵی و لەوانەشە سەرپێچی لێ بكات، هەر ختوورەیەكیش لە خوداوە(ﷻ) بێت پێچەوانەی ئەوانە لە بەندەوە بەرهەم نایەت.

**عاریفان** دەربارەی ختوورەی دووەم قسەیان كردووە، گەر هەردوو ختوورەكە لە خوداوە(ﷻ) بێت ئایا دووەم لە یەكەم بەهێزترە؟

**جونەید دەڵێت:** ختوورەی یەكەم بەهێزترە، چونكە گەر بمێنێتەوە خاوەنەكەی دەگەڕێتەوە بۆ تێڕامان، ئەمە بە مەرجی زانست، بۆیە وازهێنان لە یەكەم دووەم لاواز دەكات.

"**ابن عطاء الله**" دەڵێت: دوەم بەهێزترە، چونكە بە یەكەم هێزی زیاتر دەبێت.

**عەبدولای كوڕی خەفیف لە پاشینەكان دەڵێت:** هەردووكیان یەكسانن چونكە هەردووكیان لە حەقەوەن، بۆیە هیچ تایبەتمەندییەك بۆ یەكێكیان نییە لەسەر ئەویتریان.

یەكەم بە بوونی دووەم نامێنێتەوە، چونكە ئاسار مانەوەی بۆ شیاو نییە.

# ٢٢. زانینی یەقین، بینینی یەقین حەقی یەقین

ئەمانە کۆمەڵێك گوزارەن دەربارەی زانستێکی بەرز و باڵا.

یەقین: بریتییە لە زانینێك کە بە ڕەهایی شك و گومانی لەگەڵ ناچێتە ژوورەوە بۆ خاوەنەکەی.

لە وەسفی حەقدا(ﷻ) بەکارناهێنرێت لەبەر نەهاتنی و نەشیاوی بۆی.

بۆیە زانینی یەقین بریتییە لە یەقین، هەر بەو جۆرە بینینی یەقین بریتییە لە خودی یەقین و حەقی یەقینیش بریتییە لە راستەقینەی یەقین.

١. **زانینی یەقین**-بەپێی زاراوەکانیان- ئەوەیە بە مەرجی بورهانە.

٢. **بینینی یەقینیش** ئەوەیە لە حوکمی والآبوون و رۆشنبووندایە.

٣. **حەقی یەقینیش** ئەوەیە لە وەسفی بەرجەستە و بەرچاودایە.

- زانینینی یەقین بۆ خاوەن ئەقڵەکانە.
- و بینینی یەقین بۆ خاوەن زانستەکانە.
- و حەقی یەقینیش بۆ خاوەنی مەعریفەکان.

قسەکردن لە دەربڕینی ئەمە لەباری هاتنەدیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە باسمان کرد، بەم ئەندازەیە دەوەستین تەنها وەك ئاگادارکردنەوەیەك.

# ٢٣. وارید( هاتوو )

لە قسەکانیاندا زۆر باسی واریدات(هاتووەکان) دەکەن.

**وارید:** ئەوەیە دادەبارێتە سەر دڵ لە ختوورەی پەسەند و بە هەوڵ و کۆششی بەندەکە نییە، ئەوەش کە لە شێوەی ختوورەدا نییە دیسان پێی دەوترێت وارید.

پاشان هەندێ جار وارید لە حەقەوە نییە، وەك چۆن هەندێ جار وارید لە زانستەوە نییە.

**واریدات** لە ختوورەکان گشتگیرترن، چونکە ختوورەکان تایبەتن بە جۆرێك لە گوتار، یان ئەوەی ماناکەی لەئامێز دەگرێت.

**واریدات** بۆی هەیە واریدی سروور یان دڵتەنگی یان واریدی گرژبوون یان واریدی کرانەوە یان مانای تر بن.

# ٢٤. شایەت

زۆرجار وشەی شایەت بەسەر زمانیاندا دێت:

فلآن بە شایەتی زانست، فلآن بە شایەتی وەجد، هەروەها فلآن بە شایەتی حاڵ.

**مەبەستیان بە گوزارەی شایەت:** ئەوەیە لە دڵی مرۆڤدا ئامادە دەبێت، ئەوەش بەسەر دڵدا زاڵ دەبێت، تا وەك ئەوەی بیبینێت و تەماشای بکات، با کەسەکەش نوقم و نغرۆ بووبێت، یادی هەر شتێك دەستبگرێت بەسەر دڵی خاوەنەکەیدا دەبێتە شایەت بۆی، گەر زاڵ تیایدا زانست بێت ئەوە دەبێتە شایەتی زانست، گەر زاڵ بەسەریدا وەجد بێت دەبێتە شایەتی وەجد.

مانای شایەت واتە ئامادە، هەر شتێك ئامادەی دڵت بێت ئەوە شایەتی تۆیە، پرسیار لە شیبلی کرا دەربارەی "موشاهەدە" وتی: لە کوێوە موشاهەدەی حەق بکەین؟ لە کاتێکدا حەق بۆ ئێمە شایەتە.

بە شایەتی حەق ئاماژەی بۆ ئەوە کرد دەست بەسەر دڵدا دەگرێت، زاڵ بەسەریدا لە یادیدا بریتییە لە حەق و ئامادەبوو لە دڵیدا هەمیشە لە یاددا بریتییە لە حەق.

**هەرکەس لەگەڵ مەخولقێکدا پەیوەستبوونی بەدڵ بۆ بەرهەم بێت، دەوترێت:** ئەوە بریتییە لە شایەتی، واتە: ئەوە لە دڵیدا ئامادەیە، خۆشەویستی بەردەوامی یادی خۆشەویست و دەستگرتن بەسەریدا پێویست دەکات.

**هەندێکیان لە ڕەچاوکردنی ئەم داتاشراوانەدا زیادەڕەویان کردووە و دەڵێن:**

بۆیە ناونراوە شایەت چونکە لە "شەهادە"وە وەرگیراوە، وەك ئەوەی کاتێك تەماشای کەسێك دەکات بە وەسفی جوانی گەر مرۆڤبوونی لێ بووبێتەوە و بینینی ئەو کەسە لەو حاڵەی ئەو تیایدایە سەرقاڵی نەکات و لە هیچ ڕوویەکەوە هاوەڵییەکەی خەریکی نەکات ئەوا ئەو شایەتە بۆی لە فەنای نەفسی خۆیدا.

هەرکەس ئەوە کاری تێبکات ئەوە شایەتە لەسەری لە مانەوەی نەفسی خۆیدا.

هەستان بە حوکمە مرۆییەکان یان شایەتە بۆی یان شایەتە لەسەری.

**لەسەر ئەم مانایە لێکدانەوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا**(ﷺ) **کراوە:** ((لە شەوی میعراجدا لە جوانترین وێنەدا پەروەردگاری خۆمم بینی))، واتە: جوانترین وێنەیەك لەو شەوەدا بینیبێتم لە بینینی پەروەردگارم سەرقاڵی نەکردووم، بەڵکو وێنەکێشەکەم لە وێنەکەدا بینی، بەدیهێنەرەکەم لە بەدیهێنراوەکەدا بینی، مەبەستی ئەوە بینینی زانستە نەك پەیبردنی بە چاو.

# ٢٥. نەفس

**نەفسی شتێك** بریتییە لە بوونی شتەکە.

لای ئەم دەستەیە بەکارهێنانی نەفس بە مانای بوون نییە، هەروەها مەبەستیشیان قاڵبی جەستە نییە، بەڵکو مەبەستیان بە نەفس: ئەو بەشە نەخۆشەی مرۆڤە کە ناپەسەندە لە ئەخلاق و کردار.

بەشە نەخۆشەکەی مرۆڤ دوو جۆرە:

**یەکەم:** ئەوەی بەرهەمی دەستی خۆیەتی، وەك یاخیبوون و سەرپێچییەکانی.

**دووەم:** رەوشتی نزم و پەست، ئەوانە لە خودی خۆیاندا ناپەسەندن، گەر بەندە چارەسەریان بکات وبەرانبەریان بکۆشێت، ئەو کات ئەو ئەخلاقانەی بەپێی تێکۆشانی بەردەوام قەلاچۆ دەکرێن.

**بەشی یەکەم** لە حوکمەکانی نەفس ئەوانەن نەهیان لێکراوە بە نەهی حەرامکردن یان نەهی کەراهەت.

**بەڵام بەشی دووەم لە دوو بەشەکەی نەفس:** بریتییە لە ئەخلاقە پەست و نزمەکان.

ئەمە رادە و سنووریەتی بەگشتی، **پاشان درێژەپێدانی بریتییە لە:** لوتبەرزی و تووڕەیی و حەسوودی و ئەخلاقی ناشیرین و کەمی بەرگەگری و شتانی تر لە ئەخلاقی ناپەسەند.

**توندترین حوکمی نەفس و گرانترینیان:** ئەندێشەکردنێکە پێیوابێت ئەو ئاکارانە لە ئەو جوانن و ئەو شایەنی رێز و گەورەییە، ئەوەش وەك هاوەڵدانانی بچووك سەرژمێر دەکرێت.

چارەسەری ئەخلاق لە وازهێنانی نەفس و تێکشکاندنی تێر و تەواوترە لە ئازارەکانی برسێتی و تینوێتی و شەونخوونی، ئەمانە و تێکۆشانگەلێکی تر کە هێزی مرۆڤ بەردەبنەوە، هەرچەند ئەوانە لە ریزی وازهێنانە لە نەفس، دەشگونجێ نەفس شتێکی لەتیفی دانراو بێت لە قاڵبی جەستەدا کە جێگەی ئەخلاقی ناپەسەندە.

وەك چۆن رۆح بوونێكی لەتیفی دانراوە لەم قالبەدا كە شوێنی ئەخلاقی پەسەندە.

هەموو ئەوانەش هەندێكیان بۆ هەندێكیان بارهاتوون و بە هەموویان مرۆڤیان پێكهێناوە.

رۆح و نەفس لە شێوەدا لە جەستە لەتیفەكانن وەك فریشتە و شەیتان بە سیفەتی لەتافەت، وەك دروستە چاو جێگەی بینین و گوێ جێگەی بیستن و لوت جێگەی بۆنكردن و دەم جێگەی چەشتن بێت، بینەر و بیسە و بۆنكەر و تامكەر بە هەموویان بریتین لە مرۆڤ، هەر بەو جۆرە دڵ و رۆح جێگەی كۆمەڵێك وەسفی چاك و پەسەندن وەك چۆن نەفس جێگەی كۆمەڵێك سیفەتی ناپەسەندن.

نەفس بەشێكە لەو كۆیە و دڵ بەشێكە لەو كۆیە، حوكمی هەر ناوێك دەگەڕێتەوە بۆ كۆیەكە.

## ٢٦. رۆح

رۆحەکان لەلای ئەهلی تەحقیقی ئەهلی سوننەت جیاوازن.

**هەندێکیان دەڵێن:** رۆح بریتییە لە زیندەگی(ژیان)

**هەیانە دەڵێت:** کۆمەڵێك مانای دانراون لەو قاڵبانەدا.

**لەتیفە:** خودا سوننەتی وایە ژیان لە قاڵبەکاندا دروست دەکات هەتا رۆحەکان لە جەستەکاندا بن، مرۆڤ زیندووە بەهۆی زیندەگییەوە، بەڵام رۆحەکان لە قاڵبەکاندا دانراون، لەباری نووستندا بەرزبوونەوەیان بۆ هەیە و لە جەستە جیادەبنەوە و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ناو جەستەکان.

**مرۆڤ:** بریتییە لە رۆح و جەستە، چونکە خودا بۆ یەکتری رامهێناون، حەشریش بە هەردووکیانە و پاداشت و سزاش بۆ هەردووکیانە.

**رۆحەکان دروستکراون:** هەر کەس پێیوایە هەرهەری و دێرینن ئەوە خۆی رووبەڕووی هەڵەکایەکی گەورە دەکاتەوە.

ریوایەتەکان ئاماژە بەوە دەکەن رۆحەکان کۆمەڵێك بەرجەستەی لەتیفن.

# ٢٧. نهێنی

بۆی هەیە لەتیفەیەکی دانراوبێت لە قاڵبی جەستەدا هەروەك رۆح.

ئوسوڵی ئەهلی ئەم رێگەیە باس لەوە دەکات نهێنی جێگەی موشاهەدە بێت، وەك چۆن رۆحەکان جێگەی خۆشەویستین و دڵانیش جێگەی مەعریفەن.

**دەڵێن:** نهێنی ئەوەیە روانینت هەیە بەسەریدا، بەڵام نهێنی نهێنی ئەوەیە کە بەسەریدا ناڕوانێت جگە لە حەق(سبحانه وتعالى).

**لەلای ئەم دەستەیە:** بەپێی زاراوە و ئوسوڵەکانیان نهێنی لە رۆح لەتیفترە، رۆحیش لە دڵ بەرز و باڵاترە.

**دەڵێن:** نهێنییەکان لە کۆتوبەندی نەیار لە ئاسار و شتەکانی تر رزگاریان بووە.

وشەی **"نهێنی"** بۆ ئەو حاڵ و واریداتە بەکاردەهێنرێت کە شاراوە و نادیارە و دەکەوێتە نێوان بەندە و حەقەوە(سبحانه وتعالى)، قسەی ئەو کەسەی دەڵێت: نهێنییەکانمان پاکیزەیە و ئەندێشەی ئەندێشکەرانیان ناگاتێ.

**هەروەها دەڵێن:** سینەی ئازادان گۆڕی نهێنییەکانە.

**هەروەها دەڵێن:** گەر ئێسکی ژێر دڵم بە نهێنیم بزانێت فڕێی دەدەمە دەرەوە.

ئەمە بەشێکە لە لێکدانەوەی بەکارهێنانەکانیان و رۆشنکردنەوەی گوزارەکانیان لەوەی پێی تەنهابوونەتەوە لە وشە و زاراوە کە بە کورتی ئاماژەمان پێکردن.

* * *

لێرە بەدواوە چەند دەروازەیەك لە لێکدانەوەی مەقامەکان کە بریتین لە مەداریجەکانی ئەهلی سلوك باس دەکەین.

پاشان چەند دەروازەیەك لە درێژەدان بە حاڵەکان و مەقامەکان، داوامانە لە خودا بە فەزڵ و چاکەی خۆی کارمان بۆ ئاسان بکات.

١

# تەوبە

((هیچ کەسێك خۆشەویستتر نییە لەلاي خودا لە لاوێکي تەوبەکار... تەوبە یەکەمین مەنزیلەیە لە مەنزیلەکاني کەسي سالیك... و یەکەمین مەقامي داواکارانە))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:**

﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾ النور: ٣١

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تەوبەکار لە گوناھ وەك ئەوە وایە گوناھی نەکردبێت، گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست گوناھ زیانی پێ ناگەیەنێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢﴾ البقرة: ٢٢٢، وترا ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نیشانەی تەوبە چییە؟ فەرمووی: پەشیمانی))[٥].

هەروەها لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((هیچ شتێك لەلای خودا خۆشەویستتر نییە لە لاوێکی تەوبەکار))[٦]

بۆیە تەوبە یەکەمین مەنزیلەیە لە مەنزیلەکانی سالیکان و یەکەمین مەقامە لە مەقامەکانی داواکاران.

[٥] {قال السيوطي رواه أيضا ابن النجار، وقد روى أوله ابن ماجة}.

[٦] {ذكره السيوطي في جامعه}.

راستەقینەی تەوبە لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە گەڕانەوە، دەوترێت: "تاب" واتە "رجع-گەڕایەوە"

بۆیە تەوبە گەڕانەوەیە لەوەی ناپەسەندە لەڕووی شەرعەوە بۆ لای ئەوەی پەسەندە لە شەرعدا.

**هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویت:** ((پەشیمانی بریتییە لە تەوبە))

خاوەن ئوسولْ لە ئەهلی سوننەت دەڵێن:

**مەرجی تەوبە-بۆ ئەوەی تەوبەکە دروست بێت- سێ شتە:**

- پەشیمانی لەوەی ئەنجامیداوە لە گوناه و سەرپێچی.
- یەکسەر وازهێنان لەو هەڵە و گوناهە.
- بوونی ویست و لێبڕان بۆ ئەوەی نەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو گوناه و یاخیبوونە.

ئەم سێ پایەیە هەر دەبێ ببێت تاکو تەوبەکەی دروست بێت.

**دەڵێن:** ئەوەی لە ریوایەتەکەدا هاتووە: ((پەشیمانی بریتییە لە تەوبە)) باس لە بەشێکی گەورە و گرنگی تەوبە دەکات، وەك لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((حەج بریتییە لە عەرەفە)) واتە پایەی گەورە و سەرەکی حەج بریتییە لە عەرەفە، واتە وەستان لە عەرەفە، نەك ئەوەی هیچ پایەیەکی تر لە حەجدا بوونی نەبێت جگە لە وەستان لە عەرەفە، بەڵام گەورەترین پایەی بریتییە لە وەستان لە عەرەفە.

**هەر بەو جۆرە:** ((پەشیمانی بریتییە لە تەوبە[٧] واتە پایەی گرنگ و گەورەی بریتییە لە پەشیمانی.

**هەندێ لە گەورەپیاوان دەڵێن:** تەنها پەشیمانی بەسە بۆ هاتنەدی تەوبە، چونکە دوو پایەکەی تر شوێنی پەشیمانی دەکەون، محاڵە کەسێك لەگەڵ پەشیمانیدا بەردەوام بێت لەسەر گوناهەکە یان لەگەڵ پەشیمانیدا بیەوێت جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر گوناهەکە.

ئەمە بە کورتی و بە پوختی بریتییە لە مانای تەوبە.

---

[٧] {رواه أحمد وابن ماجة والحاكم والبيهقي في الشعب}.

**لەڕووی شرۆڤەکردن و ڕۆشنکردنەوەوە: هۆ و ڕێکخستن و بەش بۆ تەوبە هەیە.**

**سەرەتای تەوبە:** بریتییە لە بەئاگاهاتنی دڵ لە خەوی بێئاگایی، و بینینی ئەو کارە خراپەی لەسەریەتی لەلایەن بەندەوە.

بە کۆمەکی گوێگرتن لەوەی بە ناخیدا گوزەر دەکات لە لۆمە و دەموکوتکردنی لەلایەن حەقەوە(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) بەندە بە پەشیمانی(تەوبە) دەگات، دڵی لۆمە و دەمکوتکردنەکە دەبیستیٚ، **لە ریوایەتێکدا هاتووە:** ((ئامۆژگاریکەری خودایی لە دڵی هەموو مرۆیەکی موسڵماندا بوونی هەیە))

**هەروەها لە ریوایەتێکدا:** ((لە جەستەدا پارچە گۆشتێك بوونی هەیە گەر هاتە راستە هەموو جەستە دێتە راستە گەر رووبەڕووی تێکچوون و لادان بوویەوە هەموو جەستە رووبەڕووی تێکچوون لادان دەبێتەوە، دەزانن ئەو پارچە گۆشتە بریتییە لە دڵ))[٨].

گەر بەدڵ بیری لە کارە خراپەکانی خۆی کردەوە و ئەوەی بینی کە ئەو لەسەریەتی لە کار و کردەوەی دزێو و ناپەسەند ئەوا لە دڵیدا ویستی تەوبە سەرهەڵدەدات و لەو مامەڵە ناشیرینانە دەگەڕێتەوە و خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) بە راستکردنەوەی ویست و لێبڕان کۆمەکی دەکات و دەگەڕێتەوە سەر کار و کردەوە جوان و شیرینەکان و خۆ ئامادەکردن

## بۆ هۆیەکانی تەوبە:

**سەرەتای ئەوەش:**

کۆچکردن لە دۆستانی خراپ، چونکە ئەو جۆرە دۆستانەن هەوڵی پاشگەزبوونەوەی دەدەن و دروستی ئەو سووربوون و لێبڕانەی لیٚ دەشێوێنن.

ئەوەش بە بەردەوامبوون دەبێت لەسەر بینینی ناپەسەندی کاری خۆی و بینینی کار و کردەوە شیرین و پەسەندەکان کە حەزی تەوبەی بۆ زیاد دەکات و پاڵنەرەکانی بەهێزتر دەکات تاکو سووربوون و لێبڕانی لەسەر تەوبە تەواو بکات، ئەوەش ترس و رجای زیاد دەکات، و لەوێوە گرێی سووربوون لەسەر کار و کردەوەی ناپەسەند لە دڵیدا دەکرێتەوە، لە دەستبردن بۆ قەدەغەکراوەکان دەوەستێت و لەغاوی نەفسی خۆی

[٨] {رواه الشيخان وأصحاب السنن}.

دەكات لە شوێنكەوتنی حەز و ئارەزووەكانی و خێرا لە هەڵەكان جیادەبێتەوە و ویست و لێبڕانی بۆ دروست دەبێت تاكو لە داهاتوودا نەگەڕێتەوە سەر هاوشێوەكانی ئەو جۆرە كارانە.

گەر بەپێی مەبەست و مەرامی خۆی هەنگاوی هەڵگرت و بەپێی سووربوون و لێبڕان كۆشانی ئەنجامدا ئەوا ئەو كەسێكی راستگۆی كۆمەكراوە.

گەر جارێك و دووجار تەوبەكەی شكاند و ویستی جارێكی تر بۆ تەوبەكردن هانیدەدا و هەڵیدەنا نموونەی ئەوانە زۆرن بۆیە نابێت رجای ببڕێت لەو تێكەوتنانەدا، چونكە بۆ هەر ماوەیەك نووسراوێك بوونی هەیە.

**لە ئەبو سولەیمانی دارانییەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** چوومە دانیشتنی یەكێك لە واعیزەكان و قسەكانی كاری كردە سەر دڵم، كاتێك هەستام هیچ لە دڵمدا نەمایەوە.. بۆیە جارێكی تر گەڕامەوە ئەم جارە كاریگەری قسەكەی لە دڵمدا مایەوە تا گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بۆیە ئامراز و ئامێرەكانی گوناه و سەرپێچیم شكاند و پابەندبووم بەم رێگەیەوە.

**ئەم چیرۆكەش لە "یحیی بن معاذ" دەگێڕنەوە، وتویەتی:** چۆلەكەیەك بازێكی راوكرد، مەبەستی بە چۆلەكەكە واعیزەكە بووە و مەبەستی بە بازەكە ئەبو سولەیمانی دارانی بووە.

**لە "أبي حفص الحداد"ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** ئەوەندە جار وازم لە كار هێنا و گەڕامەوە سەری، پاشان كار وازی لێهێنام و لەدوای ئەوە نەگەڕامەوە سەری.

**وتراوە:** ئەبو عەمری كوڕی نوجەید لە سەرەتای گەڕانەوەی بۆ لای خودا دەچوو بۆ ئەڵقەی دانیشتنەكانی ئەبو عوسمان، قسەكانی كاری تێكرد و تەوبەیكرد و گەڕایەوە.

پاشان ساردبوونەوەیەك رووی لێكرد و لە ئەبو عوسمان هەڵدەهات كاتێك دەیبینی، و لە ئەڵقەی دانیشتنەكانی دوادەكەوت، رۆژێك ئەبو عوسمان بەرەو رووی هات و ئەبو عەمر لە رێگەكە لایدا و رێگەیەكی تری گرتەبەر، ئەبو عوسمانیش شوێنی كەوت.. تا پێیگەیشت و پێی وت: ئەی كوڕی خۆم، هاوەڵی ئەوانە مەكە تەنها بەبێ گوناهی تۆیان خۆشدەوێت، لەم حاڵەدا تەنها ئەبو عوسمان سوود بە تۆ دەگەیەنێت، دەڵێ: ئەبو

عەمری کوڕی نوجەید دوای ئەوە تەوبەی کردەوە و گەڕایەوە بۆ سەر ویست و لێبڕان و لەو مەیدانەدا نغرۆ بوو.

**گوێم لە شێخ ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) دەیوت:** یەکێك لە موریدان تەوبەی کرد و پاشان ساردبوونەوە رووی تێکرد، ماوەیەك بیری دەکردەوە گەر دیسان تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە حوکمەکەم چی دەبێت؟ بانگکەرێك بانگی لێکرد: ئەی فلاّن، گوێڕایەڵی ئێمەت کرد ئێمەش شوکرمان کردی، پاشان وازت لێهێنایین ئێمەش ماوە و مۆڵەتمان خستە بەردەمت، گەر بگەڕێیەوە بۆ لامان قبوولّت دەکەین، گەنجەکە گەڕایەوە بۆ ویست و لێبڕان و لەو مەیدانەدا نوقم بوو.

کاتێك گوناه و یاخیبوون واز لیٚ دەهێنێت و گرێی سووربوون لەسەر گوناهان لە دلێدا دەکرێتەوە، و بڕیار دەدات نەگەڕێتەوە سەر گوناهان لەو بارەدا پەشیمانی راستەقینە لە دلێدا سەرهەلّدەدات، و بۆ کار و کردەوە خراپەکانی خەم دایدەگرێت و پەژارە لەسەر حالّی خراپی تەنگەتاوی دەکات و بۆ کردارە ناپەسەندەکانی نیگەران دەبێت، بۆیە تەوبەکەی تێر و تەواو دەبێت، و تێکۆشانەکەی راستەقینە دەردەچێت، تێکەلّی بە کەنارگیری ئالّوگۆڕ دەکات و وەحشەتی لە دۆست و هاوڕێی خراپ بۆ دروست دەبێت، و لێیان گۆشەگیر دەبێت، و شەو و رۆژی بە تامەزرۆبوونەوە دەداتە دەم یەك و بە راستگۆیی پەشیمانی لە کار و کردەوە خراپەکانی دوور دەکەوێتەوە، بە فرمێسکەکانی ئاساری هەلّە و گوناهان دەسڕێتەوە، و بە باشی تەوبەکەی برینی گوناهان سارێژ دەکات و لە نێوان هاودەمەکانیدا کزی رووی لێدەکات و تێر و تەواوی جەستەی دەگۆڕێت بۆ لاوازی.

هەموو ئەمانەی بۆ بەدەست نایەت تا ئەوانەی ستەمی لێکردوون و مافی پێشێل کردوون رازی نەکات و لەو ستەمانە دەرنەچێت لەو ئەوانی کردووە، یەکەمین مەنزیلەی تەوبە بریتییە لە رازیکردنی نەیارەکان بە هەر رێگەیەك بتوانێت رازیان بکات، گەر دەستی گەیشتە خاوەن مافەکان پێویستە مافەکانیان بۆ بگێڕێتەوە یاخود بە دلێکی گوشادەوە گەردنی ئازاد بکەن، ئەگەر نە، دەبێت سووربێت لەسەر گێڕانەوەی مافەکانیان لە بارێکدا توانا و دەسەلاّتی هەبوو، لەگەلّ ئەوەش پێویستە راستگۆیانە لەبەر خودا بپاڕێتەوە و دوعایان بۆ بکات.

**کۆمەڵێك سیفەت و حاڵ بۆ تەوبەکاران بوونیان هەیە:**

ئەوانە لە خەسڵەتەکانی ئەوانن و بە کۆی تەوبە دادەنرێن، چونکە لە سیفەتەکانیانە نەك لە مەرجەکانی دروستی تەوبە بن، قسەی گەورە پیاوان ئاماژە بۆ مانای تەوبە دەکات:

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** سەرەتاکەی تەوبەیە، ناوەندەکەی ئینابەیە و کۆتاییەکەی ئەوبەیە.

تەوبەی کرد بە سەرەتا و ئەوبەی کرد بە کۆتایی و ئینابەشی کرد بە ناوەندیان.

هەر کەس لە ترسی سزا تەوبە بکات ئەو کەسە خاوەنی تەوبەیە.

هەر کەس بۆ پاداشت تەوبە بکات ئەو کەسە خاوەنی ئینابەیە.

هەرکەس وەك گوێڕایەڵی و ڕەچاوکردنی فەرمانی خودایی بگەڕێتەوە نەك لە ترسی سزا و خۆشەویستی پاداشت ئەو کەسە خاوەنی ئەوبەیە.

هەروەها دەوترێت: تەوبە سیفەتی باوەڕدارانە، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور: ٣١

ئینابە سیفەتی دۆستانی خودا و نزیکانە لە خودا، خودا(سبحانەوتعالی) دەفەرموێت: ﴿ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ ق: ٣٣

ئەوبەش سیفەتی پێغەمبەرانە، خودادەفەرموێت:﴿ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾ ص: ٣٠

**جونەید دەفەرموێت: تەوبە سێ مانای هەیە:**

**یەکەمیان:** پەشیمانی.

و **دووەمیان:** بوونی ویست و لێبڕان بۆ وازهێنان لەوەی لەسەری راهاتووە.

و **سێیەمیان:** هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی مافەکان.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** تەوبە بریتییە لە وازهێنان لە دواخستن یاخود پاشخستن(تسویف).

**حاریسی موحاسیبی دەڵێت:** هەرگیز نەموتووە: "خودایە من تەوبەت لێ داوا دەکەم"، بەڵکو دەڵێم: "خودایە داوای حەزی تەوبەت لێدەکەم".

**جونەید دەڵێت:** ڕۆژێـك ڕۆیشـتم بـۆ لای **"السـري السـقطي"** و بینـیم روخسـاری گۆڕاوە، وتم: چیتە؟ وتی: گەنجێك هات بۆ لام و پرسیاری تەوبەی لێکـردم، وتم: تەوبـە ئەوەیە گوناهەکانت لەبیرنەچنەوە، ئەویش بەرهەڵسـتی قسـەکەی کـرم و وتـی: بـەڵکو تەوبە ئەوەیە گوناهەکانت لەبیربچنەوە.

**منیش وتم:** تەوبە لەلای من ئەوەیە ئەو گەنجە دەیڵێت.

پرسی: بۆچی؟

وتم: گەر لە حاڵی جەفادا بم و بمگوێزێتەوە بۆ حاڵی وەفا، ئەوا یادی جەفا لـە حـاڵی وەفادا جەفایە، ئەویش بێدەنگ بوو.

**پرسیار لە سەهلی کوڕی عەبدوڵا کرا دەربارەی تەوبە، وتی:** ئەوەیـە گوناهـەکانت لەبیرنەکەی.

**لە جونەید پرسیاری تەوبە کرا وتی:** ئەوەیە گوناهەکانت لەبیربکەی.

**ئەبو نەصری سەراج دەڵێت:** سەهلی کـوڕی عەبـدوڵا ئاماژەی بـە حـاڵی موریـدان کردووە، جارێك بۆیان و جارێك لەسەریان، بەڵام جونەید ئامـاژە بـە تەوبـەی عاریفـان دەکات، ئەوان یادی گوناهەکانی خۆیان ناکەنەوە بەهۆی زاڵبوونی سیفەتی شکۆمەندی خودا بەسەر دڵیاندا و بەردەوام بوون لە یادی ئەو(سبحانه وتعالى).

**دەڵێت:** ئەوەش وەك ئەوە وایە لـە ڕوەیـم پرسـیاریان کـرد دەربـارەی تەوبـە و وتـی: بریتییە لە تەوبە لە تەوبە.

**لە "زو نونی مصری" دەربارەی تەوبە پرسیار کرا، وتی:** تەوبەی خەڵکی ڕەشۆکی لە گوناهانە و تەوبەی تایبەتان لە بێئاگاییە.

**ئەبو حوسەینی نووری دەڵێت:** تەوبـە ئەوەیـە لـە هەرچـی شـتە تەوبـە بکەی(واتـە بەجێیان بهێڵی) جگە لە خودا(عز وجل)

**عەبدوڵای کوڕی عەلی کوڕی محەمەدی تەمیمی دەڵێت:** جیـاوازی زۆرە لـە نێـوان تەوبەکارێك لە هەڵە و گوناهان دەگەڕێتەوە و تەوبەکارێك لە بێئاگاییەکان دەگەڕێتەوە لەگەڵ تەوبەکارێك لە بینینی چاکەکانی خۆی تەوبە دەکات.

**"الواسطي" دەڵێت:** تەوبەی نەصوح ئەوەیە ئەسەری گوناهان لە پەنهان و ئاشکرادا نەمێنێتەوە، هەر کەس تەوبەکەی نەصوح بێت گوێ نادا بەوەی چۆن ئێوارەی لێ دێ و چۆن ڕۆژی لێ دەبێتەوە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** خودایە، ناڵێم تەوبەم کرد، و ناشگەڕێمەوە بۆ سەر ئەو ڕەوشتانەی کە خۆم دەیزانم، دەستەبەری وازهێنان لە گوناهیش ناکەم بەهۆی ئەو لاوازییەی لە خۆمدا دەیبینم، تەنها دەڵێم: ناگەڕێمەوە بۆ سەر گوناهان، بەڵکو بەر لەوەی بگەڕێمەوە بۆ سەر گوناه بمرم.

**"ذو النون" دەڵێت:** داوای لێخۆشبوون بەبێ دەستکێشانەوە لە گوناه تەوبەی درۆزنانە.

**پرسیار لە ئیبن یەزدانیار** کرا دەربارەی بەندەیەك کە دەیەوێت بۆ لای خودا هەنگاو هەڵبگرێت، لەسەر چ بنچینەیەك هەنگاو هەڵدەگرێت؟

وتی: لەسەر ئەوەی نەگەڕێتەوە سەر ئەوەی وازی لێ هێناوە، و ڕەچاوی هیچ کەسێك نەکات جگە لەو کەسەی لە پێناویدا و بۆ لای هەنگاوی هەڵگرتووە، و نهێنی و پەنهانی بپارێزێت لە سەرنجدان لەو شتانەی خۆی لێ داڕنیوە.

**پێیوترا:** ئەمە حوکمی ئەو کەسەیە لە بوونی گوناهان دەرچووە، ئەی حوکمی ئەو کەسە چییە لە نەبوونی گوناه دەرچووە؟

وتی: بوونی شیرینی لە کەسی تێهەڵکەرەوەی تەوبە لە جێگەی تاڵاو لە کەسی پێشوودا(واتە کەسێك یەکەمجار تەوبە دەکات هەست بە تاڵاوی گوناه دەکات، بەڵام ئەو کەسەی گوناهێکی نییە و جارێکی تر تەوبە دەکات هەست بە شیرینی دەکات).

**پرسیار لە بۆشنچی کرا دەربارەی تەوبە، وتی:** کاتێك یادی گوناهەکەت کرد و شیرینیت لە گوناهەکە نەهاتە بەرهەست ئەوە بریتییە لە تەوبە.

**"ذو النون" دەڵێت:** ڕاستەقینەی تەوبە ئەوەیە دونیات بەم فراوانییە لێ بەرتەسك ببێتەوە، تا وات لێ بێت ئۆقرە و ئارامیت لێ ببڕێت، پاشان دەروون لەسەرت بێتەوە یەك، وەك خودا(سبحانه وتعالى) لە کتێبەکەیدا هەواڵیداوە و دەفەرموێت: ﴿**وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا**﴾التوبة: ١١٨

## ئیبن عەتا دەڵێت:

**تەوبە:** دوو تەوبەیە: ئینابە و وەڵامدانەوە(**إستجابة**).

**تەوبەی ئینابە:** ئەوەیە بەندە لە ترسی سزای خودا بگەڕێتەوە(پێشتر عاریفێک تەوبەی ئینابەی بەوە لێکدایەوە بۆ پاداشتی بەهەشت بۆ لای خودا بگەڕێتەوە)

**تەوبەی وەڵامدانەوە:** ئەوەیە بەهۆی شەرم و حەیا لە بەخشندەیی خودا بۆ لای خودا بگەڕێتەوە.

**وترا بە ئەبی حەفص:** بۆچی تەوبەکار رقی لە دونیا دەبێتەوە؟

وتی: چونکە خانەیەکە گوناهی تێدا ئەنجامداوە.

پێی وترا: بەڵام دونیا خانەیەکە خودا تیایدا بە تەوبەکردن رێزی لێناوە؟وتی: لە گوناهەکانی لەسەر یەقینە، بەڵام لە قبووڵ بوونی تەوبەکەی لەبەر مەترسیدایە.

**"الواسطي" دەڵێت:** خۆشحاڵی و سرووری داوود(عليه السلام) بەوەی تێیدا بوو لە شیرینی گوێڕایەڵی رووبەڕووی حوزنێکی درێژخایەنی کردەوە، ئەو لە حاڵی دووەمدا تەواوتر بوو لەوەی یەکەم.

**هەندێکیان دەڵێن:** تەوبەی درۆزنان لەسەر زمانیانە، واتە وتنی: **"أستغفر الله"**.

**پرسیار لە ئەبو حەفص کرا دەربارەی تەوبە وتی:** لە تەوبەدا هیچ شتێك بۆ بەندە نییە، چونکە تەوبە بۆ لای خودایە نەك لە لای ئەوەوە(لەلای بەندەوە).

**وتراوە:** خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ ئادەم(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: ئەی ئادەم ماندبوون و پەشیمانیت کرد بە بەشی نەوەکانت، منیش تەوبەم کرد بە بەشیان، هەر کەس بە داواکەی تۆ داوام لێ بکات وەك چۆن وەڵامی تۆم دایەوە وەڵامی ئەویش دەدەمەوە، ئەی ئادەم تەوبەکاران لە گۆڕەکانیان زیندوو دەکەمەوە مژدە بە یەکتر دەدەن و پێدەکەنن، دوعاکانیشیان وەڵام دەدرێنەوە.

**پیاوێك وتی بە رابیعەی عەدەوی:** من گوناه و یاخیبوونی زۆرم ئەنجامداوە، گەر تەوبە بکەم ئایا خودا تەوبەم لێ قبووڵ دەکات؟ وتی: نەخێر، گەر تەوبەت لێ قبووڵ بکات تەوبەت دەکرد.

بزانە خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمویت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة: ٢٢٢

هەر کەس گوناهێك ئەنجام بدات ئەو لە گوناهەکەی خۆی لەسەر یەقینە، گەر تەوبەی کرد لە قبوولّ بوونی تەوبەی لە گوماندایە، بەتایبەت گەر لە مەرج و مافی تەوبە ئەوە بێت شایستە بێت بە خۆشەویستی حەق(سبحانه وتعالى)، تا کەسی یاخیبوو دەگاتە جێگەیەك نیشانەی خۆشەویستی خودای لەسەر دەربکەوێت ماوەیەکی دوور و درێژی گەرەکە، بۆیە پێویستە لەسەر بەندە گەر زانی تاوانێکی ئەنجامداوە و تەوبەی پێویستە بە بەردەوامی گەردنکەچ بێت بۆ خودا و لە گوناهەکانی هەڵبێت و داوای لێخۆشبوون بکات، وەك دەڵێن: ((پڕبوون بە ترس و لەرز هەتا مردن))، خودا(عز وجل) دەفەرمویت:
﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١

بەردەوامی لە ئیستیغفار(داوای لێخۆشبوون) لە سوننەتی پێغەمبەری خودایە(صلى الله عليه وسلم) **وەك دەفەرمویت:** ((تەمێك بەسەر دڵمدا دێت لە ڕۆژێکدا حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم))

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** یەك هەڵەی دوای تەوبە لە حەفتا هەڵەی پێش تەوبە ناشیرینترە.

**ئەبو عوسمان دەربارەی ئایەتی:** ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾﴾ الغاشية: ٢٥ دەڵێت: "إيابهم" واتە گەڕانەوەیان، با لە سەرپێچی و یاخیبوونیشدا ڕۆچووبن.

**عەلی کوڕی عیسای وەزیر** لە کەژاوەیەکی شکۆمەنددا گوزەری کرد، خەڵکی هەژار دەیانوت: ئەوە کێیە؟ ئەوە کێیە؟

ژنێك کە لەسەر ڕێگەکە وەستا بوو وتی: تا کەی دەڵێن: ئەوە کێیە؟ ئەوە کێیە؟ ئەوە بەندەیەکە لەبەرچاوی خودا کەوتووە و ئا بەوە تووشی کردووە کە ئێوە دەیبینن، عەلی کوڕی عیسا گوێی لەو قسەیە بوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و وازی لە وەزیرییەکەی هێنا و ڕۆیشت بۆ مەککە و بوو بە جیرانی ماڵی خودا.

٢

# تێکۆشان

**((نەفس هەمووی تاریکییە.. چراکەی بریتییە لە نهێنییەکەی.. و نووری چراکەی بریتییە لە کۆمەکی خودایی.. هەر کەس لە نهێنییەکەیدا کۆمەکی لە پەروەردگارەوە بەدەست نەهێنابێت ئەوا هەمووی تاریکییە))**

**خودا(ﷻ) دەفەرمویێت:﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت: ٦٩**

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە دەفەرموێ:** پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی باشترین تێکۆشان(جهاد)، فەرمووی: ((وتنی قسەیەکی حەق لای دەسەڵاتێکی ستەمکار)) هەردوو چاوی ئەبو سەعید پڕبوون لە فرمێسك.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** هەر کەس ئاشکرای بە تێکۆشان بڕازێنێتەوە خودا نهێنی و پەنهانی بە موشاهەدە جوان دەکات، خودا(ﷻ) دەفەرمویێت:﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا ﴾

بزانە هەر کەس لە سەرەتاوە خاوەنی تێکۆشان نەبێت بۆنی ئەم ڕێگەیەی پێ ناکرێت.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** هەر کەس وا گومان ببات شتێك لەم ڕێگەیەی بە ڕوودا دەکرێتەوە یان شتێکی لا ئاشکرا دەبێت بەبێ پابەندبوون بە تێکۆشانەوە ئەوە لە هەڵەدایە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:**

هەر کەس لە سەرەتایەوە ڕاستبوونەوەی لەگەڵ نەبێت لە کۆتاییەکەیدا ئەڵقەی دانیشتنی نابێت.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:**

ئەو قسەی کە دەڵێت حەرەکەت بەرەکەتی تێدایە: جووڵەی دەرەوە دەبێتە هۆی بەرەکەتی ناوەوە.

**ئەبو یەزیدی بوستامی دەڵێت:** دوازدە ساڵ ئاسنگەری نەفسی خۆم بووم، پێنج ساڵ ئاوێنەی دڵی خۆم بووم، ساڵێکیش تەماشای نێوان ئەو دوانەم دەکرد بینیم پەتێکی ئەستووری ئاشکرا لەناو قەدمدایە دوازدە ساڵ خەریکی بڕینی بووم، پاشان تەماشام کرد بینیم لە ناوەوەم پەتێکی تر هەیە پێنج ساڵ خەریکی بڕینی ئەویش بووم، تەماشام دەکرد چۆن خەریکی بڕینیم و پەردەم لەسەری بۆ لادەدرا، دواتر تەماشای خەڵکیم کرد بینیم مردوون، بۆیە چوار "ألله أكبر"ی نوێژی مردووم لەسەر خوێندن.

**جونەید دەڵێت:** گوێم لە **"السري"** بوو دەیوت: ((ئەی کۆمەڵی لاوان، تێکۆشان بکەن و بکۆشن بەر لەوەی تەمەنتان وەك تەمەنی منی لێ بێت، لاواز دەبن و کەمتەرخەم دەبن وەك چۆن من لاواز و کەمتەرخەم بووم)) لەو کاتەدا عیبادەتی **"السري"** عیبادەتی هیچ گەنجێکی پێ نەدەگەیشت.

**حەسەنی قەزاز دەڵێت:** ئەم کارە لەسەر سێ شت بیناکراوە: تەنها لە کاتی برسێتیدا خواردن بخۆی، و لە کاتی زاڵبوونی خەوندا بخەویت و لە کاتی زۆر پێویستدا قسە بکەی.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێت:** پیاو ناگاتە پلەی صالحان تا شەش کۆسپ نەبڕێت:

**یەکەم:** دەرگای نیعمەت دابخەی و دەرگای توندی و نەبوونی بکەیەوە.

**دووەم:** دەرگای لوتبەرزی دابخەی و دەرگای زەلیلی بکەیەوە.

**سێیەم:** دەرگای ئیسراحەت دابخەی و دەرگای کۆشان و ماندووبوون بکەیەوە.

**چوارەم:** دەرگای نووستن دابخەی و دەرگای بەئاگایی شەو بکەیەوە.

**پێنجەم:** دەرگای دەوڵەمەندی دابخەی و دەرگای هەژاری بکەیەوە.

**شەشەم:** دەرگای هیوا و ئاوات دابخەی و دەرگای خۆئامادە کردن بۆ مردن بکەیەوە.

**ئەبو عەمری کوڕی نوجەید دەڵێت:** هەر کەس نەفسی خۆی لا بەڕێز بێت قەرزارباری لا سەخت و دژوارە.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** گەر لە دوای پێنج رۆژ نان نەخواردن سۆفی بڵێت: من برسیمە ئەوا رەوانەی بازاڕی بکەنەوە، و فەرمانی پێ بکەن کەسابەتی دونیایی بکات.

بزانە بنچینەی تێکۆشەر و دامەزرانی بریتییە لە لەغاوکردنی نەفس لەو شتانەی هۆگریان بووە و هەڵنانی بۆ شاندانە ژێر پێچەوانەی ئارەزووەکانی لە هەموو کاتەکاندا.

**نەفس دوو سیفەتی هەن کە رێگرن لە خێر:** رۆچوون لە حەزەکاندا و خۆگرتنەوە لە گوێڕایەڵی و کاری چاکە، گەر نەفس سەرپێچی کرد بە سواربوونی ئەسپی ئارەزوو ئەوا بە لەغاوی تەقوا لەغاوی بکە، گەر لە کاتی هەستان بە کارە چاکەکان لایدا پێویستە بە پێچەوانەی ئارەزووی ئەوەوە لێی بخوڕیت، کاتێك لە باری تووڕەبووندا هەڵدەچێت پێویستە رەچاوی حاڵی بکەی، هیچ زۆرانێك سەرئەنجامی بە قەدەر ئەو تووڕەبوونە باش نییە بە ئەخلاقی باش و جوان دەسەڵاتەکەی تێکبشکێنیت و ئاگرەکەی بە نەرمونیانی خامۆش بکەی، گەر ویستی شەرابی کەمتەرخەمی نۆش بکات و تەنگی پێهەڵچنیت و دەیویست کردارە جوانەکانی خۆی دەربخات و خەڵکی سەرنجی بدەن و ببینن ئەوا پێویستە رێگەی لێبگریت و بە سزای زەلیل کردن سزای بدەی، ئەوەش بە بیرخستنەوەی سنوور و رادەی ئەو نەفسە و نزمی بنچینە و بنەڕەتی و پیسی کردارەکانی.

تێکۆشانی خەڵکی رەشۆکی بۆ تێر و تەواوکردنی کار و کردەوەکانە، مەبەستی تایبەتان(دۆستانی خودا) پاڵفتەکردنی حاڵەکانیانە، ئازارەکانی برسێتی و نەخەوتن ئاسانە، بەڵام چارەسەری ئەخلاق و پاککردنەوە لە سیفەتە ناپەسەندەکان سەخت و دژوارە.

**لە لێڵی و نادیارییەکانی ئافەتی نەفس:** حەزکردنە لە مەدح کردنی، هەر کەس قومێکی لێ بخواتەوە ئاسمانەکان و زەوی بە برژانگێکی هەڵدەگرێت، نیشانەی ئەوە: گەر ئەو شەرابەی لێ بگریتەوە حاڵی بەرەو تەمبەڵی و شکست دەڕوات، یەکێك لە گەورەپیاوان بۆ چەندین ساڵ لە مزگەوتەکەی خۆیدا لە ریزی یەکەم نوێژی دەکرد، رۆژێك گرفتێکی بۆ هاتە پێش لە ریزی دواوە نوێژی کرد، لەدوای ئەوە ماوەیەك نەبینرا، پرسیاری هۆیەکەی لێکرا، وتی: ئەوەندە نوێژم بە قەزا گێڕایەوە بۆ ئەوەندە ساڵ، من وام دەزانی نوێژەکانم بۆ خودا ئەنجامداوە، کەچی رۆژێك لە مزگەوت

دواکەوتم و لە ریزی دواوە نوێژم کرد، کە خەڵکی منی دەبینی لەو ریزەدا شەرمەزار دەبووم تێگەیشتم لەو تەمەنە دوورودرێژەدا چالاك بوونی من بینینی ئەوان بووە بۆ کارەکەم بۆیە نوێژەکانم قەزا کردەوە.

**لە ئەبی محەمەدی مورتەعیشەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** ئەوەندە و ئەوەندە حەجم کرد بەبێ ئەوەی خواردن و خواردنەوە و پارە لەگەڵ خۆم هەڵبگرم، دواتر بۆم دەرکەوت هەموو ئەو حەجانە بە حەزی نەفسم تێکەڵ بوون، ئەوەش: رۆژێك دایکم داوای لێکردم جەوەندەیە ئاوی بۆ بهێنم ئەو داوایە لەسەر نەفسم گران بوو لەوێوە بۆم دەرکەوت گوێڕایەڵی نەفسم بۆ ئەو حەجانە بۆ حەزێك بووە تێکەڵ بە نەفسم بووە، چونکە گەر نەفسم فەنای بکردبایە ئەوەی لە شەرعدا حەقە لەلای گران نەدەبوو.

**پرسیار لە ئافرەتێکی پیری بەتەمەن کرا دەربارەی حاڵی**، وتی: لە کاتی گەنجیدا چالاکی و حاڵم لە نەفسی خۆم دەبینی و وام گومان دەبرد هێزی حاڵ بێت کاتێك چووم بە ساڵدا چالاکی و حاڵم نەما بۆیە زانیم ئەوە هێزی لاوێتی بوو، وام گومان بردبوو حاڵی ئیمانە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیفەرموو:** هەر کەس بەسەرهاتی ئەم پیرەژنەی بیستبێت دڵی بۆی پڕ بووە، دەیفەرموو: ئافرەتێکی خاوەن ویژدان بووە.

"زو نونی مصری" دەڵێت: گەورەترین عیززەت خودا بە بەندەیەکی بدات ئەوەیە فێری بکات چۆن نەفسی خۆی زەلیل دەکات، گەورەترین زەلیلی خودا بەسەر بەندەیەکدا بیهێنێت ئەوەیە لە زەلیل کردنی نەفسی خۆی بێئاگای بکات.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** هەر شتێك نەفسم لێی بێزار بووبێت گرتوومەتە بەر.

**محەمەدی کوڕی فەزڵ** دەڵێت: تێکۆشان بریتییە لە رزگاربوون لە ئاواتەکانی نەفس.

**مەنصوری عەبدولا دەڵێت:** گوێم لە ئەبو عەلی رۆزباری دەیوت: ئافەت لە سێ رێگەوە دێتە ناو خەڵکی:

نەخۆشی سروشت، و پەیوەستبوون بە عادەتەوە و هاوەڵی کردنی خراپ.

پرسیم: نەخۆشی سروشت چییە؟

وتی: خواردنی حەرام.

وتم: پەیوەستبوون بە عادەتەوە مانای چییە؟

وتی: نەزەری حەرام و چێژوەرگرتن لە حەرام و غەیبەت.

وتم: هاوەڵی کردنی خراپ چییە؟

وتی: هەرکاتێك حەزێك لە دەروونندا سەرهەڵبدات شوێنی بکەویت.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** گوێم لە نەصرابادی بوو دەیوت: بەندیخانەی تۆ بریتییە لە نەفست، گەر لە نەفست هاتییە دەرەوە دەکەوییە ناو ئاسوودەییەکی هەتاهەتاییەوە.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت: ئەبو حوسەنی وەراق دەڵێت:** گەورەترین پایەی کارمان لە سەرەتای کارمانەوە لە مزگەوتی ئەبو عوسمانی حیری بریتی بوو لە ئیسار بەوەی بەڕووماندا دەکرێتەوە(واتە بەخشینی ئەوەی بۆیان دەهێناین)، و نەنوین بەسەر شتێکدا خاوەنی بین(واتە بەر لەوەی بنوین شتەکە ببەخشین)، هەر کەس خراپەی لەگەڵ کردین تۆڵە بۆ نەفسی خۆمان نەکەینەوە، بەڵکو بیانووی بۆ دەهێنینەوە و داوای لێبوردنی لێ دەکەین و تەوازوعی بۆ دەنوێنین، گەر بەرانبەر بە کەسێك شتێکی ناباش کەوتە دڵمانەوە هەڵدەستین بە خزمەت کردنی و چاکە لەگەڵی تا لە دڵماندا دەسڕێتەوە.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** نەفس هەمووی تاریکییە، چراکەی بریتییە لە نهێنییەکەی، نووری چراکەش بریتییە لە کۆمەکی خودایی، هەر کەس لە نهێنی و پەنهانیدا کۆمەکی پەروەردگاری لەگەڵ نەبێت هەموو بوونی دەبێت بە تاریکی.

**لێرەدا مامۆستای مەزن ئیمامی قوشەیری دەڵێت:**

**مانای ئەو قسەی "چراکەی بریتییە لە نهێنییەکەی" مەبەست پێی:** نهێنی بەندە کە لە نێوان ئەو و خودادایە(ﷻ)، ئەوەش بریتییە لە جێگەی ئیخلاصی، بەوەش بەندە تێدەگات ڕووداوەکان بە خوداوەیە نەك بە نەفسی و لە نەفسییەوە، تاکو لە درێژایی کاتەکانیدا لە هەوڵ و کۆشانی خۆی خۆیدابڕنێت، پاشان بە کۆمەکی خودایی پەنادەگرێت لە شەڕەنگیزی نەفسی خۆی، هەرکەس کۆمەکی خودایی نەگاتێ

زانستەکەی سوودێك بە خۆی ناگەیەنێت، هەر بەو جۆرە ملکەچی ناکات بۆ پەروەردگاری، بۆیە گەورەپیاوان وتویانە: هەرکەس نهێنی نەبێت لەسەر سەرپێچی گوناهـ بەردەوامە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** هەرکەس نەنگی نەفسی خۆی ببینێت هیچ شتێك لە نەفسی خۆی بەباش نابینێت، کەسێك نەنگی نەفسی خۆی ببینێت لە هەموو بارەکاندا تۆمەتباری دەکات.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** چەندە خێرایە تیاچوونی ئەو کەسەی نەنگی نەفسی خۆی ناناسێت، گوناهـ و یاخیبوون ڕێگەی بێباوەڕین.

**ئەبو سولەیمان دەڵێت:** شتێکم لە نەفسم بە چاك نەبینی شانی لەسەر دابدەم.

**"السری" دەڵێت:** خۆتان بپارێزن لە جیرانی دەوڵەمەند و قورئانخوێنی بازاڕ و زانای بەردەرگای دەسەڵاتداران.

**"زو نونی مصری" دەڵێت:** لە شەش ڕێگەوە تێکچوون ڕووی لە خەڵکی کردووە:

**یەکەم:** لاوازی نییەت بە کاری دواڕۆژ.

**دووەم:** جەستەیان بووە بە بارمتەی حەزەکانیان.

**سێیەم:** درێژی هیوا و ئاوات زاڵبووە بەسەریاندا لەگەڵ تەمەنێکی کەم و کورت.

**چوارەم:** ڕازیبوونی بەندەکانیان بەسەر ڕازیبوونی خودادا هەڵبژاردووە.

**پێنجەم:** شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) وازلێهێناوە و هەڵیانداوەتە پشتیانەوە.

**شەشەم:** کەمێك لە هەڵە و تێکەوتنی پێشینیان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان و زۆرێك لە چاکەکانی ئەوانیان ژێرخاك کردووە.

٣

# خەڵوەت و گۆشەنشینی

**((خەڵوەت تەنها بە خواردنی حەلاڵ دەبێت.. خواردنی حەلاڵیش تەنها بە جێبەجێ کردنی مافی خودا دروست دەبێت..))**

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرموی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:**

((خێرترین ژیان و گوزەرانی هەموو خەڵکی ژیانی پیاوێکە جڵەوی ئەسپەکەی لە پێناوی خودادا گرتووە، گەر ترس و هێرشێك بدرێت بە گوێیدا لەسەری پشتی ئەسپەکەیەتی و بەدوای مردن یان کوشتندا دەگەڕێ لەو پێناوەدا، یان پیاوێك لە غەنیمەتێکدایە لەسەر چیایەك لەو چیایانە یان لە دۆڵێك لەو دۆڵانەدا نوێژەکانی دەکات و زەکات دەدات و پەروەردگاری دەپەرستێ تا یەقینی بۆ دێت، تەنها لە خێردا تێکەڵ بە خەڵکی دەبێت))[٩]

**مامۆستا قوشەیری دەفەرموێت:** خەڵوەت سیفەتی ئەهلی پاڵفتەی هەڵبژێرراوە، گۆشەنشینیش لە نیشانەکانی ئەهلی گەیشتن.

لە سەرەتای حاڵی موریدەوە هەر دەبێت گۆشەنشین ببێت لە هاوڕەگەزەکانی خۆی، پاشان لە کۆتاییەکەیدا دەبێت خەڵوەتی هەبێت بەهۆی بۆ بەدەستهێنانی هۆگری بە خوداوە.

گەر بەندە گۆشەنشینی هەڵبژارد پێویستە باوەڕی وابێت بەو گۆشەنشینییە دەیەوێت شەڕی خۆی لە خەڵکی بگرێتەوە، نەك خۆی لە شەڕی خەڵکی بپارێزێت، چونکە **یەکەمیان** لە بچووك تەماکردنی نەفسی خۆیەوە سەرچاوە وەردەگرێت، و **دووەمیان:**

---

[٩] {رواه مسلم بنحوه}.

له خۆجیاکردنەوە و خۆ بالاَکردن بەسەر خەڵکیدا سەرچاوە وەردەگرێت، هەر کەس نەفسی خۆی بە کەم و بچووك تەماشا بکات ئەو کەسە کەمنەفسی(تەوازوع) هەیە، هەرکەسیش تایبەتمەندییەك بە نەفسی خۆی بدات ئەو کەسە لوتبەرزە.

**راهیبێك بینرا و پێیوترا:** تۆ راهیبی.

وتی: نەخێر، بەڵکو من پاسەوانی سەگم، نەفسم سەگێکە گاز لە خەڵکی دەگرێت لە خەڵکم دوور خستووەتەوە تاکو لێی سەلامەت بن.

کەسێك بە لای پیاوێکی صاڵحدا تێپەڕی، پیاوە صاڵحەکە جلوپۆشاکەکانی خۆی لە کەسەکە کۆکردەوە، پیاوەکە پرسی: بۆ جلوپۆشاکەکانت لە من کۆدەکەیەوە، خۆ پۆشاکەکەی بەری من پیس نییە؟

پیاو چاکەکە پێی وت: لە گومانەکەتدا بە هەڵەداچووی، پۆشاکەکانی من پیسن کۆمکردەوە بۆ ئەوەی بەر تۆ نەکەوێت و پۆشاکەکانت پیس نەبن نەك لەبەر ئەوەی پۆشاکەکانی من پیس بن.

**له ئادابەکانی گۆشەنشینی:**

ئەوەندە زانست بەدەستبهێنێت بیروباوەڕی یەکتاپەرستی پێ ڕاست بکاتەوە، بۆ ئەوەی شەیتان بە وەسوەسەکانی رووبەڕووی هەڵدێری نەکاتەوە، پاشان ئەوەندە زانستی شەرعی بەدەست بهێنێت فەرزەکانی پێ جێبەجێ بکات تاکو بینای کارەکەی لەسەر بنچینەیەکی توندوتۆڵ بێت، گۆشەنشینی لە راستەقینەدا: بریتییە لە گۆشەگیری لە خەسڵەتە ناپەسەندەکان، کاریگەری گۆشەنشینی بۆ گۆڕینی سیفەتە ناپەسەندەکانە بە پەسەند، نەك بۆ ئەوە بێت لە زێدی خۆت دووربکەویەوە، بۆیە وترا: عاریف کێیە؟ وتیان: لەگەڵ بوو و لەگەڵ نەبوو، واتە: لەگەڵ خەڵکیدا بە جەستە بوونی هەیە، بەلاَم بە ناخ و پەنهان لێیان جیابووەتەوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** ئەوەی خەڵکی دەیپۆشێت بیپۆشە، ئەوەی خەڵکی دەیخوات بیخۆ، تەنها بە نهێنی و پەنهانت لێیان جیاببەرەوە(واتە ئەوەی لە نێوان تۆ و خودادایە).

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** کەسێك هات بۆ لام و وتی: لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هاتووم بۆ لات، پێم وت: ئەم کارەی ئێمە بڕینی ڕێگەی دوور و سەفەری دوور ودرێژ نییە، یەك هەنگاو لە نەفس خۆت بەدووربگرە مەبەستەکەت بەدەست دەهێنیت.

**لە ئەبی یەزیدەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** لە خەوندا پەروەردگاری خۆمم بینی، پێم وت: چۆن بتبینمەوە؟

فەرمووی: لە نەفس خۆت بەدووربگرە و وەرە.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** هەر کەس خەڵوەتی بەسەر هاوەڵیدا هەڵبژارد پێویستە لە هەموو یادێك خاڵی بووبێتەوە جگە لە یادی پەروەردگاری، لە هەرچی ویستە خاڵی بووبێتەوە جگە لە ڕازیبوونی پەروەردگاری، هەروەها خاڵیبووبێتەوە لە هەر هۆیەك نەفس داوای دەکات، گەر لەو سیفەتە فانی نەبووبێت خەڵوەتەکەی ڕووبەڕووی فیتنە یان بەڵای دەکاتەوە.

**هەروەها وتراوە:** تەنهاکەوتنەوە لە خەڵوەتدا بانگکەرەکانی دڵنەوایی کۆدەکاتەوە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** سەرنجی هۆگری خۆت بدە بە خەڵوەتەوە یان هۆگریت بە ئەوەوە(ﷻ) لە خەڵوەتدا، گەر هۆگریت بە خەڵوەتەوە بێت کاتێك لە خەڵوەت دێیە دەرەوە هۆگریت نامێنێ، گەر هۆگریت لە خەڵوەتدا بە ئەوەوە(ﷻ) بێت لە دەشت و سارادا شوێنەکانت لا یەکسان دەبێت.

**گوێم لە محەمەد ئیبن حامد بوو دەیوت:** پیاوێك هات بۆ زیارەتی ئەبوبەکری وەراق، کاتێك ویستی بگەڕێتەوە پێی وت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش وتی: خێری دونیا و دواڕۆژم لە خەڵوەت و کەمی لە دونیادا بەدەستهێناوە، هەموو شەڕی دونیا و دواڕۆژیش لە زۆری دونیا و تێکەڵاویدایە.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** پرسیار لە جەریری کرا دەربارەی گۆشەنشینی، وتی: بریتییە لە چوونە ناو قەرەباڵغی، ڕێگری لە نهێنی و پەنهانی خۆت بکەیت تەنگەتاوت نەکات و نەفست لە گوناه و خراپە بپارێزیت و نهێنی و پەنهانت بە حەقەوە پەیوەست بێت.

**وتراوه:** هەر کەس دڵی لە سەرقاڵی خاڵی بکاتـەوە بـا تێکـەڵیش بێـت بـە خـەڵکی بەرهەمی خەڵوەنشینی بەدەست دەهێنێت (واتە خاڵیبوونەوەی دڵ لە خـەڵکی بـەهۆی پەیوەندی بە خوداوە).

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** خـەڵوە تـەنها بـە خـواردنی حـەڵاڵ بەرهـەم دێـت، خواردنی حەڵاڵیش تەنها تەنها بە هەستان بە مافەکانی خودا راست دەبێتەوە.

**"زو نونی مصری" دەڵێت:** هـیچ شـتێك بـە ئەنـدازەی خەڵوەنشـینی ئـیخلاص بەرهەم ناهێنێت.

**ئەبو عەبدوڵای رەملی دەڵێت:** با هاوەڵت خەڵوەنشینی بێت، خۆراکەکەت برسـێتی بێت، و قسەکردنت موناجات بێت یان دەمریت یان بە خودا(ﷻ) دەگەیت.

**"ذو النون" دەڵێت:** ئەو کەسەی بە خەڵوەت خۆی لە خەڵکی دابڕێت وەك ئەو کەسە نییە بە خوداوە خۆی لە خەڵکی دادەبڕێت.

**جونەید دەڵێت:** ئازاری گۆشەنشینی ئاسانترە لە مەداراتی تێکەڵاوبوون.

**مـــەکحول دەڵێـــت:** گـەر لـە تێکـەڵاوی خەڵکیـدا خێـر بـوونی هـەبێت ئـەوا لـە گۆشەنشینیدا سەلامەتی بوونی هەیە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** تەنهایی هامنشینی صادیقانە.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** گوێم لـە شـیبلی بـوو دەیـوت: خەڵکینـە، ئیفلاس... ئیفلاس.

**پێی وترا:** ئەی ئەبوبەکر نیشانەی ئیفلاس چییە؟

وتی: لە نیشانەکانی ئیفلاس هۆگربوونە بە خەڵکییەوە.

**"يحيى بن أبي كثير" دەڵێت:** هەر کەس تێکەڵ بە خەڵکی بێت دەبێـت موداراتیـان بکات، هەر کەس موداراتیان بکات دەبێت ریابازییان بۆ بکات.

**شوعەیبی کوڕی حەرب دەڵێت:** چوومە لای مالیکی کوڕی مەسعود لـە کوفـە، بینـیم لە ماڵەکەیدا تەنهایە، پێم وت: هەست بە نامۆیی و بێزاری ناکەیت لەم تەنهاییەدا؟

وتی: کەسێکم نەبینیوە لە خودا نامۆ و بێزار بێت.

**جونەید دەڵێت:** هەر کەس دەیەوێت دینەکەی سەلامەت بێت و جەستە و دڵی ئاسوودە بێت با لە خەڵکی کەنارگیر ببێت، ئەم سەردەمە سەردەمی نامۆبوونە، کەسی ژیر ئەو کەسەیە تەنهایی تێدا هەڵدەبژێرێت.

**ئەبو یەعقوبی سوسی دەڵێت:** تەنها بەهێزەکان بەرگەی تاکبوونەوە(تەنهایی) دەگرن، لای هاوشێوەکانی وەك ئێمە کۆبوونەوە باشتر و بەسوودترە، هەندێکیان کاری هەندێکی تریان دەبینن و ئەوەش هانیان دەدات بۆ ئەوەی لە کاری چاکەدا چاو لەیەکتری بکەن.

**ئەبو عوسمانی دامغانی دەڵێت شیبلی ئامۆژگاری کردم و وتی:** پابەند ببە بە تەنهاییەوە، ناوی خۆت لەلای ناسراوان بسڕەوە، روو لە دیوار{(قیبلە)} بکە تا دەمریت.

**پیاوێك هات بۆ لای شوعەبیی کوڕی حەرب، ئەویش پێی وت:** چی تۆی هێناوە بۆ لام؟

وتی: لەگەڵت دەبم.

وتی: برام، عیبادەت بە شەریکی ناکرێت، هەر کەس هۆگری بە خوداوە نەبێت هۆگری بە هیچ شتێکەوە پەیدا ناکات، دەگێڕنەوە کەسێك پێی وتووە: چ شتێك لە گەشت و گەڕانت زۆر جێگەی سەرسوڕمان بووە؟

پێی وتن: گەیشتم بە **"خضر"**، داوای هاوەڵی لێکردم: ترسام تەوەکولم بە خودا لێ تێکبدات(بۆیە نەمویست هاوەڵی بکەم، چونکە شانم لەسەر تواناکانی ئەو دادەدا، ئەمەش تەوەکولی بە خودا لێ تێکدەدام).

بە هەندێکیان وترا: ئایا لێرەدا شتێك هەیە پێیەوە هۆگر بیت؟

وتی: بەڵێ، دەستی برد بۆ قورئانەکەی لەئامێزی گرت و وتی: ئەمە.

لە مانای ئەوەدا وتویانە:

**وكتبك حولي لا تفارق مضجعي وفيها الشفاء الذي أنا كاتم**

(نووسینەکەت لەلامە، لە جێگەکەم جیانابێتەوە، ئەو شیفایەی تێدایە من دەیشارمەوە)

**پیاویك وتی بە "زو نونی مصری": کەی گۆشەنشینیم بۆ دروست دەبێت؟**

وتی: گەر توانیت لە نەفسی خۆت گۆشەنشین ببیت.

**بە ئیبن موبارەك وترا:** دەوای دڵ چییە؟

وتی: کەمی گەیشتن بە خەڵکی.

**وتراوە:** گەر خودا ویستی بەندە لە زەلیلی یاخیبوونەوە بۆ عیززەتی گوێڕایەڵی بگوێزێتەوە تەنهایی لا شیرین دەکات و بە قەناعەت دەوڵەمەندی دەکات و نەنگییەکانی خۆی دەخاتە پێش چاوی، هەر کەسیش ئەوەی پێدرا خێری دونیا و دوارۆژی پێدراوە.

٤

# تەقوا

((هەر كەس دەیەوێ تەقوای بۆ بێتە راستە با واز لە هەموو گوناهان بهێنێت..))

**خودا (ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ الحجرات: ١٣

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خودا لێی رازی بێت) وتـی:** پیاوێـك هـات بـۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خـودا(ﷺ) ئامۆژگـاریم بكـە، **ئـەویش فەرمووی:** ((ئامۆژگاریت دەكەم بە تەقوای خودا، تەقوا كۆكەرەوەی هەموو خێرێكە، هـەروەها وەسـێتت بـۆ دەكـەم بـە جیهـاد چـونكە ئـەوە رەهبانییـەتی موسـڵمانە، ئامۆژگاریت دەكەم بە یادی خودا، چونكە ئەوە دەبێتە نورێك بۆت))[١٠]

**لە ئەبو هورمزەوە دەڵێت:** گوێم لە ئەنەسـی كـوڕی مالیـك بوو(خـودا لێـی رازی بێـت) دەیوت: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئالی محەمەد كێن؟ فەرمووی: هەموو تەقوادارێك.

تەقوا كۆكەرەوەی هەموو خێرێكە.

**راستەقینەی "الإتقاء-خۆپارێزی"** بریتییە لە پەنابردن بۆ گوێڕایەڵی كردنی خودا لە سزای خودا، دەوترێت **"اتقی فلان** بترسە-بە قەڵغانەكەی خۆی پاراست"

**ریشەی تەقوا:** لە خۆپارێزییەوە هاتووە لە هاوەڵدانان پاشان لەدوای ئەوە خۆپـارێزی لە یاخیبوون و خراپە، پاشان خۆپارێزی لە شوبوهات، پاشان دووركەوتنەوە لە خـەوش و خاشاك(شتە كەم بایەخەكان).

---

[١٠] {رواه أبو يعلى في مسنده}.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** بۆ هەریەك لەم بەشانە دەروازەیەك هەیە، لە تەفسیری ئایەتی:﴿ **يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ** ﴾ **آل عمران: ١٠٢** هاتووە: ماناکەی ئەوەیە گوێڕایەڵی لە خودا بکرێت و لێی یاخی نەبن، و یادی بکرێت و لەبیرنەکرێت، و شوکری بکرێت و کوفر بە نیعمەتەکانی نەکرێت.

**ئەحمەدی کوڕی عاصم دەڵێت:** گوێم لە سەهلی کوڕی عەبدوڵا بوو دەیوت: تەنها خودا یارمەتیدەرە، و تەنها پێغەمبەر(ﷺ) ڕێنیشاندەرە و تەنها تەقوا توێشووە، هەموو کارێك ئارامگرتن لەسەری پێویستە.

**جەریری دەڵێت:** هەر کەس لە نێوان خۆی و خودادا تەقوا و چاودێری نەکات بە حەکەم ناگاتە پەردە لەسەرلادان و بینین(**الكشف والمشاهدة**).

**نەصرابادی دەڵێت: تەقوا:** ئەوەیە بەندە لە هەموو شتێك جگە لە خودا(ﷻ) خۆی بپارێزێت.

**سەهل دەڵێت:** هەر کەس دەیەوێت تەقوای بۆ بێتە ڕاستە با واز لە هەموو گوناهان بهێنێت.

**هەروەها نەصرابادی دەڵێت:** هەر کەس پەیوەست بێت بە تەقواوە تامەزرۆیی بۆ جیابوونەوە لە دونیا بۆ دروست دەبێت، چونکە خودا(ﷻ) دەفەموێت: ﴿ **وَلَلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (٣٢)** ﴾ **الأنعام: ٣٢**

**هەندێکیان دەڵێن:** هەر کەس تەقوا لە دڵیدا بەدیهات خودا پشتهەڵکردن لە دونیا لەسەر دڵی ئاسان دەکات.

**ئەبو عەبدوڵای ڕۆزباری دەڵێت: تەقوا:** بریتییە لە خۆلادان لە شتێك لە خودات دووربخاتەوە.

**"زو نونی مصری" دەڵێت:** تەقوا: ئەوەیە دەرەوەی بە گوناهان پیس نەکات و ناوەوەی بە نەخۆشییەکان گرفتار نەکات و هەمیشە لەگەڵ خودادا تەبا بێت.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** تەقوا دەرەوە و ناوەوەی هەیە، دەرەوەی: بریتییە لە پارێزگاری کردن لە سنوورەکانی خودا، ناوەوەی: بریتییە لە نیەت و ئیخلاص.

**"ذو النون" دەڵێت:**

**ولا عيش إلا مع رجال قلوبهم     تحن الى التقوى وترتاح للذكر**

**سكون الى روح اليقين وطيبه     كما سكن الطفل الرضيع الى الحجر**

(ژیان نییە جگە لە ژیان لەگەڵ کۆمەڵێك پیاودا کە دڵیان تامەزرۆی تەقوایە و بە یادی خودا ئاسوودە دەبن، سوکناییان هەیە بۆ لای رۆح و خۆشی یەقین وەك چۆن منداڵێکی شیرەخۆر لە باوەشی دایکیدا ئارام دەگرێت)

**وتراوە: سێ شت دەکرێنە بەڵگەی تەقوای کەسێك:**

١. باشی تەوەکول بۆ ئەو شتانەی بەدەستی نەهێناوە.

٢. باشی رازیبوون لەوەی بەدەستی هێناوە.

٣. باشی ئارامگرتن لەوەی لەدەستی چووە.

**"طلق بن حبيب" دەڵێت:** تەقوا: کارکردنە بە گوێڕایەڵی کردنی خودا لەسەر نوورێك لە خوداوە بەهۆی ترسان لە سزای خودا.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** تەقوا بە حەڵاڵی تەواو دەبێت نەك بە شتێکی تر.

**هەروەها ئەبو حوسەینی زنجانی دەڵێت:** هەر کەس سەرمایەکەی بریتی بێت لە تەقوا زمان لە وەسفی قازانجەکەی دەستەوسانە.

**"الواسطي" دەڵێت:** تەقوا: ئەوەیە لە تەقواکەی خۆپارێزی بکات، واتە لە بینینی تەقواکەی، کەسی تەقوادار وەك ئیبن سیرین چل فەردە کونجی کڕی، منداڵەکەی مشکێکی لە یەکێك لە فەردەکان دەرکرد، ئەویش پرسیاری لێ کرد: لە کام فەردە دەرتکرد؟ وتی: نازانم.. ئەویش هەمووی هەڵڕژاندە سەر زەوی.

**هەروەها نموونەی ئەبو یەزیدی بوستامی:**

لە هەمەدان فەردەیەك قورتومی(بەرێکی تایبەتە) کڕی، و شتێکی لێ زیاد بوو، کاتێك گەڕایەوە بۆ بوستام دوو مێروولەی تێدا بینی، گەڕایەوە بۆ هەمەدان و دوو مێروولەکەی کێشا.

**دەگێڕنەوە ئەبو حەنیفە لەبەر سێبەری داری قەرزدارەکەیدا دانەدەنیشت و دەیفەرموو:** لە ریوایەتێکدا هاتووە: ((هەر قەرزێك سوودێکی لێوە بەدەست بێت دەبێتە سوو))

**هەروەها وتراوە:** ئەبو یەزید لە سارادا لەگەڵ هاوەڵەکەی جلوپۆشاکەکانی شۆری، هاوەڵەکەی پێی وت: جلەکانت بەو دیواری باخە ترێدا هەڵبخە.

وتی: نەخێر، مێخ دامەکوتە بە دیواری خەڵکیدا.

وتی: بە درەختەکەدا هەڵیدەخەین.

وتی: نەخێر، لق و پۆپەکانی دەشکێنێت.

وتی: بەسەر ئەو گژوگیادا هەڵیدەخەین.

وتی: نەخێر، ئەوە ئالفی ئاژەڵانە، لێیانی دامەپۆشە.

پشتی کردە خۆر و کراسەکە بە پشتییەوە بوو تا روویەکی وشك بوویەوە، پاشان هەڵیگێڕایەوە بۆ رووەکەی تری تا ئەو رووەش وشك بوویەوە.

**وتراوە:** رۆژێك ئەبو یەزید رۆیشتە ناو مزگەوتێکەوە، عەساکەی چەقاندە ناو زەوی و لە دەستی بەربوویەوە و کێشای بە عەسای پیاوێکی تردا کە لە تەنیشتییەوە بوو و عەساکەی لە دەست بەربوویەوە، پیاوەکە چەمایەوە و عەساکەی خۆی هەڵگرتەوە، ئەبو یەزید رۆیشت بۆ ماڵی پیاوەکە و گەردنی خۆی پێ ئازاد کرد و وتی: چەمانەوەی تۆ بۆ بەرزکردنەوەی عەساکەت بەهۆی عەساکەی منەوە بوو کە ناچاری کردی بچەمییەوە.

**"عوتبەی غولام"**یان لە شوێنێك بینی وەرزی زستان بوو، بەڵام ئارەق هەموو گیانی تەڕکرد بوو، پرسیاری ئەوەیان لێکرد، وتی: ئەمە شوێنێکە گوناهم تێدا ئەنجامداوە و لە پەروەردگاری خۆم یاخی بووم.

پرسیاری گوناهەکەیان لێکرد، وتی: لەو دیوارە پارچە گڵێکم کردەوە تا میوانەکەم دەستی پێ بشوات، گەردنی خۆم بە خاوەنەکەی ئازاد نەکردووە.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێت:** شەوێك لەژێر بەردەکەی "بیت المقدس"دا مامەوە، کە بەشێك لە شەو گوزەری کرد دوو فریشتە دابەزین، یەکێکیان پرسی لەویتریان: ئەوە کێیە لێرە؟

ئەویتر وتی: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمە.

وتی: ئەمە ئەوەیە خودا پلەیەك لە پلەكانی دابەزاندووە.

ئەویتر وتی: بۆچی؟

وتی: لەبەر ئەوەی لە بەصرە خورمای کـڕی، دەنکـە خورمایـەکی خـاوەن دوکانەکـە کەوتە ناو خورماکەی نەیگێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی.

ئیبراهیم دەڵێت: گەڕامەوە بۆ بەصرە خورمام لەو پیاوە کڕی و خورمایەکم خستە ناو فەردە خورماکەی و گەڕامەوە بۆ "بيت المقدس" و شەوێکی تر لەژێر بەردەکەدا نووستم.

کاتێك هەندێ لە شەو گوزەری کرد دوو فریشتەکە لە ئاسمانەوە دابەزین.

یەکێکیان بە هاوەڵەکەی وت: ئەمە کێیە لێرە؟

وتی: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمە.

وتی: ئەو پیاوەی خودا پلەکەی بۆ گێڕایەوە و پلەیەك بەرزی کردەوە.

**وتراوە:** تەقوا چەند جۆرێکی هەیە.

**بۆ خەڵکی بەگشتی:** خۆپارێزییە لە هاوەڵدانان، بۆ تایبەتان: خۆپارێزییە لـە خراپـە و تاوان و گوناهان، بۆ دۆستانی خودا: خۆپارێزییـە لـە بـە وەسیلەکردنی کردارەکـان، تەقوای پێغەمبەرانیش(**علیهم الصلاة والسلام**): خۆپارێزییە لە دانەپاڵی کردارەکان بۆ لای خۆیان، تەقوایان لە خوداوەیە بۆ لای خودا.

لـە ئـەمیری باوەڕدارانـەوە عـەلی(خودا لێـی رازی بێـت) دەفـەرموێت: سـەروەرانی خەڵکی لە دونیادا دڵگوشادەکانن، سەروەرانی خەڵکی لە دوارِۆژیشدا تەقوادارانن.

**لە "أبي أمامة"وە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە**(ﷺ) **فـەرمووی:** ((هـەر کـەس تەماشـای جـوانی ئـافرەتێکی کـرد و یەکـەمجار چـاوی داخسـت خـودا عیبادەتێکی پێ دەبەخشێت شیرینییەکەی لە دڵیدا دەبینێتەوە))[11]

[11] {رواه أحمد}.

**جونەید دەڵێت:** هەر کەس رزگاری بووە بە صدقی پەناگرتن رزگاری بووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ التوبة: ١١٨

**رووەیم(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** هەر کەس رزگاری بووبێت بە صدقی تەقوا رزگاری بووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ بِمَفَازَتِهِمۡ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الزمر: ٦١

**جەریری دەڵێت:** هەر کەس رزگاری بووبێت بە رەچاوکردنی وەفاداری رزگاری بووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الرعد: ٢٠

**ئیبن عەتا دەڵێت:** هەر کەس رزگاری بووبێت بە بەدەستهێنانی حەیا لە خودا رزگاری بووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ العلق: ١٤

**مامۆستای ئیمام(القشيري) دەڵێت: هەر** کەس رزگاری بووبێت بە خۆڕادەستکردن بۆ بڕیار و قەزای خودایی رزگاری بووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ الأنبياء: ١٠١

**هەروەها دەفەرموێت:** هەر کەس رزگاری بووبێت بە هەڵبژاردن لەلای خوداوە رزگاری بووە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٨٧﴾ ﴾ الأنعام: ٨٧.

# ٥

# وەرع

((لە خەوندا سوفیانی سەورییان بینی.. دوو باڵی هەبوو بەناو بەهەشتدا لەم دارەوە بۆ ئەو دار دەفڕی.. پێی وترا: بە چی ئەمەت بەدەستهێنا؟ وتی: بە وەرع))

**لە "أبي ذر"ەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:**
((لە باشێتی موسڵمانی کەسێك وازهێنانە لەوەی پەیوەندی بەوەوە نییە))[١٢]

**مامۆستای ئیمام(قوشەیری)-خودا لێی رازی بێت- دەڵێت:**
ئەوە بریتییە لە وازهێنان لە شوبوهات(ئەو گوفتار و رەفتار و خواردن و خواردنەوانەی حەڵاڵبوونیان لێڵ و ناڕوونە، وەك چۆن حەرامبوونیان لێڵ و ناڕوونە، واتە دەکەونە نێوان حەڵاڵ و حەرامەوە).

**هەر بەو جۆرە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێت:** وەرع بریتییە لە وازهێنان لە شوبهە، "وازهێنان لەوەی پەیوەندی بە تۆ نییە" بریتییە لە وازهێنان لە زیادە.

**ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی رازی بێت) دەڵێت:** ((حەفتا دەرگای حەڵاڵمان واز لێ دەهێنا لە ترسی ئەوەی بکەوینە ناو دەرگایەك لە حەرام))، هەروەها **پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبو هورەیرە(خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێت:** ((ببە بە کەسێکی بەوەرع دەبیت بە باشترین بەندەی خودا لەناو خەڵکیدا))[١٣]

---

[١٢] {رواه الترمذي وابن ماجة وغيرهما بسند صحيح}.

[١٣] {البيهقي في الشعب}.

**جونەید دەفەرموێت: گوێم لە "السري" بوو دەیوت:** ئەهلی وەرع لە سەردەمی خۆیاندا چوار کەسن: **"حذيفة المرتعش، ويوسف بن أسباط، وإبراهيم بن أدهم وسليمان الخواص"** لە وەرع وردبوونەوە، کاتێك کارەکانیان لێ بەرتەسك بوویەوە پەنایان برد بۆ کەمکردنەوە(واتە ئەوەندەیان لە دونیا لە خۆیان کۆکردەوە پێی بژین و دڵنیابن کە حەڵاڵە)

**شیبلی دەڵێت:** وەرع ئەوەیە لە هەرچی شتە جگە لە خودا(ﷻ) وەرع بکەیت.

**ئیسحاقی کوڕی خەلەف دەڵێت:** وەرع لە گوفتاردا دژوارتر و سەختترە لە وەرع لە زیو و زێڕ، زوهد لە دەسەڵات و پلە و پایەی دونیایی لە زوهد لە زیو و زێڕ سەختتر و دژوارترە، چونکە زیو و زێڕ لە پێناوی بەدەستهێنانی پلە و پایەدا خەرج دەکرێن.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** وەرع: سەرەتای زوهدە، وەك چۆن قەناعەت: سەرەتای رازیبوونە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** پاداشتی وەرع سووك و ئاسانی دادگاییکردنی خودایە بۆ کەسەکە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** وەرع بریتییە لە وەستان لە سنوور و رادەی زانستدا بەبێ تەئویل کردن.

**عەبدوڵای کوڕی جەلا دەڵێت:** کەسێك دەناسم سی ساڵ لە مەککە نیشتەجێیە تەنها بە دەفر و حەبلی خۆی ئاوی زەمزەمی هەڵگۆزیوە و خواردوویەتەوە، و خواردنی هاتووی هیچ شارێکی نەخواردووە.

**عەلی کوڕی موسا دەڵێت:** فلسێك لە عەبدوڵای کوڕی مەروانەوە کەوتە ناو ئاوێکی پیس، سیازدە دیناری تێدا خەرج کرد تا دۆزرایەوە و دەریهێنا، لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرد، وتی: فلسەکە ناوی خودای(ﷻ) لەسەر بوو.

**دیسان یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** وەرع دوو رووی هەیە:

**وەرعی دەرەوە(ئاشکرا):** ئەوەش ئەوەیە تەنها بۆ خودا(ﷻ) بجوڵێت.

**وەرعی ناوەوە(پەنهان):** ئەوەش ئەوەیە هیچ کەس و شتێك جگە لە خودا نەچێتە ناو دڵیەوە.

**هەروەها دەڵێت:** هەر کەس لە وردەکارییەکانی وەرع وردنەبێتەوە ناگاتە بەشە مەزنەکانی پێبەخشین.

**وتراوە:** هەر کەس بە وردی لە ئایینی خۆی وردببێتەوە ترسی دوارۆژی لەسەر کەم دەبێتەوە.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** هەر کەس لە هەژاریدا تەقوا هاوەڵی نەبێت ئەو حەرامە دەخوات دەقی لەسەرە.

**یونوسی کوڕی عوبەید دەڵێت:** وەرع بریتییە لە دەرچوون لە هەموو شوبهەیەك و دادگاییکردنی نەفس هەموو چاوتروکانێك.

**سوفیانی سەوری دەڵێت:** هیچ شتێکم بە ئەندازەی وەرع ئاسان نەبینیوە، هەر شتێك سینەت ختوورەی کرد وازی لێ بهێنە.

**مەعروفی کەرخی دەڵێت:** زمانت لە مەدح بپارێزە وەك چۆن لە زەم دەیپارێزیت.

**بیشری حافی دەڵێت: سێ کار گرانترین کارن:**

١. بەخشندەیی لە کاتی کەمی و نەداریدا.

٢. وەرعکردن لە تەنهاییدا.

٣. وتنی قسەیەکی حەق لەلای ئەو کەسەی ترست لێی هەیە یان رجات لای هەیە.

**وتراوە:** خوشکەکەی بیشری حافی هات بۆ لای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(خوایان لێ رازی بێت) و وتی: ئێمە لەسەر سەربانەکانمان خەریکی چنینین، سەرقاڵی بەسەرماندا گوزەر دەکات تا دونیا تاریك دەبێت، رووناکی ماڵەکانی دەوروبەر سەربانەکە رۆشن دەکاتەوە، ئایا دروستە لەبەر روناکییەکەیدا خەریکی چنین بین؟

**ئەحمەد فەرمووی:** تۆ کێی؟ خودا عافییەت و سەلامەتیت پێ ببەخشێت.

وتی: خوشکی بیشری حافیم.

ئەحمەد دەستی بە گریان کرد و وتی: وەرعی راستگۆیانە لەناو ئێوەدا سەرهەڵدەدات، لەبەر روناکییەکەیدا مەچنە.

**"علي العطار" دەڵێت:** لە بەصرە بە شەقامێکدا گوزەرم کرد، بینیم پیرەکان دانیشتبوون و منداڵەکان یاریان دەکرد، وتم بە منداڵەکان: ئێوە شەرم ناکەن لەو پیاوە بەتەمەنانە؟

منداڵێك لەناویاندا وتی: ئەو پیرانە وەرعیان کەم بووەتەوە بۆیە هەیبەت و ڕێزیان کەم بووەتەوە.

**هەروەها وتراوە:** مالیکی کوڕی دینار چل ساڵ لە بەصرە مایەوە و لای دروست نەبوو شتێك لە خورمای بەصرە بخوات تا مرد و تامی نەکرد.

کاتێك وەرزی کردنەوەی خورما بەسەردەچوو دەیوت: ئەی ئەهلی بەصرە، ئەوە سکی من هیچی کەم نەکردووە و ئێوەش هیچتان زیاد نەکردووە.

**وترا بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم:** لە ئاوی زەمزەم ناخۆیەوە؟

وتی: گەر دەفرێکم بوایە پێی هەڵبگۆزم لێم دەخواردەوە.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** حاریسی موحاسبی کاتێك دەستی بۆ خواردن درێژ دەکرد و شوبهەیەکی تێدا بوایە ڕەگێک لەسەر پەنجەی لێی دەدا و دەیزانی خواردنەکە حەڵاڵ نییە(یان شوبهەی تێدایە).

**دەڵێن بیشری حافی** بۆ دەعوەتێك بانگهێش کرا، دەستی خستە ناو خواردنەکەوە، دواتر زۆری لە خۆی دەکرد دەستڕابکێشێتەوە بۆ خواردنەکە، بەڵام نەیتوانی و دەستی ڕانەکێشا، ئەو کارەی سێ جار ئەنجامدا هەر بەو جۆرە بوو، پیاوێك کە ئەوەی هەستی پێکرد وتی: دەستی بۆ خواردنێك درێژ ناکات شوبهەی تێدا بێت، خاوەنی ئەم دەعوەتە پێویستی بەوە نەبوو ئەم پیاوە مەزنە بانگهێش بکات.

**پرسیار لە سەهلی کوڕی عەبدولا کرا** دەربارەی حەڵاڵی پاڵفتە، وتی: ئەوەیە تیایدا لە خودا(سبحانه وتعالى) یاخی نابێت.

**هەروەها سەهل دەڵێت:** حەڵاڵی پاڵفتە ئەوەیە تیایدا خودامان لەبیرناچێت.

**شێخ حەسەنی بەصری** چووە ناو مەککەوە، منداڵێکی لە نەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالب(خودا لێی ڕازی بێت) بینی پشتی نابوو بە کەعبەوە و ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، حەسەن لێی ڕاپەڕی و لێی پرسی: هەموو ئایین بریتییە لە چی؟

وتی: وەرع، پێی وت: ئافەتی ئایین لە چیدایە؟

وتی: تەماع.. حەسەن سەریسوڕما لەو مندالە.

**هەروەها شێخ حەسەن دەڵێت:** گەردیلەیەك لە وەرعی دروست لـە هـەزار گەردیلـە ڕۆژو و نوێژ باشترە.

**خودا(ﷻ) وەحی بۆ موسا(عليه السلام) نارد و پێـی فـەرموو:** باشـترین شـتێك نزیکـان بەهۆیەوە لێم نزیك ببنەوە بریتییە لە وەرع و زوهد.

**ئەبو هورەیرە(خودا لێی رازی بێت) دەڵێت:** ئەهلی مەجلیسی خودا سبەینێ بریتین لە: ئەهلی وەرع و زوهد.

**سەهلی کوڕی عەبدولا دەڵێت:** هەر کەس وەرع هاوەڵی نەکات سەری فیل دەخوات و تێر ناخوات.

**وتراوە:** میسکی غەنیمەتیان برد بۆ لای عومەری کوڕی عبدالعزیز، لوتی خۆی گرت و وتی: ئەم میسکە سوودەکەی بریتییە لە بۆنەکەی، من پێم باش نییە بۆنەکەی بەبێ موسڵمانان بێت بە سەرمدا.

**پرسیار لە ئەبو عوسمانی حیری کرا** دەربارەی وەرع، وتی: "أبو صالح حمدون" لە لەلای دۆستێکی بوو کە لە سەرەمەرگدا بوو، پیاوەکە مرد، ئەبو صـالح فـووی لـە چراکە کرد و کوژاندییەوە، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکـرا، وتـی: تـا ئێسـتا ڕۆنـی چراکە بۆ ئەم پیاوە دەگەڕایەوە، بەڵام لێرە بەدواوە بـۆ میراتگرانـی دەگەڕێتـەوە، ڕۆنی تری بۆ بهێنن.

**"کهمـس" دەڵێـت:** گونـاهێکم ئەنجامـدا چـل سـاڵە بەسـەریدا دەگـریم، ئـەوەش ئـەوە بـوو: برایـەکم سـەردانی کـردم، بـە پارەیـەکی کـەم ماسـی بـرژاوم بـۆ کـڕی، کاتێـك تـەواو بـوو پارچـە گڵێکم لـە دیـواری جیرانەکـەمان کـردەوە تـا دەسـتی پـێ بشۆرێت، بەڵام گەردنی خۆم بە خاوەنەکەی ئازاد نەکرد.

**وتراوه:** پیاوێك لاپەڕەی بە کرێ دەنووسی، ئەو لە ماڵێکی کرێدا بوو، ویستی لە خۆڵی دیواری ماڵەکە بۆ کارەکەی بەکاربهێنێت، بەڵام هات بە بیریدا خانووەکە کرێیە و نابێت ئەو کارە بکات..

دواتر هاتە سەر ئەوەی هیچی تێدا نییە گەر بەکاریبهێنێت، لەو کاتەدا گوێی لە دەنگێك بوو دەیوت: ئەو کەسەی خۆڵی ئەو ماڵەی بەکارهێنا سبەینێ تێدەگات ڕووبەڕووی چ دادگاییەکی دوورودرێژ دەبێتەوە.

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل** سەتڵێکی لەلای بەقاڵێك لە مەککە بە بارمتە(ڕەهن) دانا، کاتێك هاتەوە بۆ وەرگرتنەوەی بەقاڵەکە دوو سەتڵی خستە بەردەمی و وتی: کام سەتڵیان سەتڵەکەی تۆیە هەڵیبگرە، ئەحمەد وتی: لێم تێکچووە کام سەتڵیان سەتڵەکەی منە، سەتڵەکە و پارەکەش بۆ خۆت.

بەقاڵەکە وتی: سەتڵەکەی تۆ ئەمەیانە تەنها ویستم تاقیتبکەمەوە.

ئەحمەد وتی: وەریناگرمەوە، ڕۆیشت و سەتڵەکەی بۆ بەجێهێڵا.

**وتراوە:** ئیبن موبارەك وڵاخێکی گرانبەهای لێ بزربوو، نوێژی نیوەڕۆی کرد و بینی وڵاخەکەی لەناو لەوەڕگای ئاوەدانییەکی سوڵتانیدایە(واتە لەوەڕگای دەوڵەت)، ئیبن موبارەك وڵاخەکەی وازلێهێنا و نەیگێڕایەوە و سواری نەبوو.

**وتراوە:** ئیبن موبارەك لە "مەرو"ەوە گەڕایەوە بۆ شام بەهۆی قەڵەمێکەوە کە خواستبووی و لەبیریچووبوو بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

نوخەعی وڵاخێکی بە کرێ گرت، قەمچییەکەی لەدەست بەربوویەوە، دابەزی و وڵاخەکەی بەستەوە و بە ڕێگەکەدا گەڕایەوە قەمچییەکەی هەڵگرتەوە، پێیوترا: دەتتوانی بە سواری وڵاخەکەوە بگەڕێیەوە بۆ ئەو شوێنەی قەمچییەکەت لێ کەوتبوو، ئەوەش بۆ تۆ ئاسانتر بوو.

لە وەڵامدا وتی: من ئەم وڵاخەم بە کرێگرتووە بۆ ئەوەی بەم ئاراستەیەدا بڕۆم، نەك بە پێچەوانەوە.

**ئەبوبەکری دەقاق دەڵێت:** پازدە رۆژ بە سارای وێڵبوونی بەنی ئیسرائیلدا وێڵ و عەودالّ بووم، کاتێك رێگەکەم دۆزییەوە سەربازێك هات بەرەو رووم و هەندێ ئاوی پێدام، کاریگەری ئەو ئاوە سی ساڵ دڵی رەق کردم و ئازارم پێوە خوارد.

**وتراوە:** رابیعەی عەدەوی دڕاوییەکی لە کراسەکەیدا لەبەردەم رۆشنایی مۆمەکانی ماڵی دەسەڵاتدارێکدا دووریییەوە سەردەمێك دڵی خۆی بزر کرد، تا بیریکەوتەوە چی ئەنجامداوە، بۆیە کراسەکەی دڕی و دڵی خۆی بینییەوە.

**لە خەوندا سوفیانی سەوری بینرا** دوو باڵی هەبوو لە بەهەشتدا لەم درەختەوە بۆ ئەو درەخت باڵیدەگرتەوە.

پێیوترا: بەچی ئەمەت بەدەستهێنا؟ وتی: بە وەرع.

**حەسانی کوڕی ئەبی سنان سەردانی هاوەڵانی حەسەنی کرد و پرسی:** چ شتێك لەسەرتان زۆر گرانە؟

وتیان: وەرع.

ئەویش وتی: هیچ شتێك بە قەدەر ئەوە لەسەر من ئاسان نییە.

وتیان: چۆن؟

وتی: چل ساڵە لە رووبارەکەی ئێوە خۆم نەشۆریەوە.

**حەسانی کوڕی ئەبی سنان** لە کاتی خەودا رانەدەکشا و خواردنی چەوری نەدەخوارد و بۆ ماوەی شەست ساڵ ئاوی ساردی نەدەخواردەوە، لەدوای مردنی لە خەوندا بینرا و پێیوترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: خێر و چاکە، بەڵام رێگە نادەن بچمە بەهەشتەوە بەهۆی دەرزییەکەوە کە خواستبووم و نەمگێڕایەوە.

**عبدالواحدی کوڕی زەید** گەنجێکی لەلا بوو چەند ساڵێك خزمەتی کرد، چل ساڵ خودای پەرست، لە سەرەتای تەوبەکردنیەوە کێشانە و پێوانەی بۆ خەڵکی دەکرد، کاتێك مرد لە خەوندا بینییان، پێیوترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: خێر و چاکە، بەڵام ڕێگەم نادەن بچمە بەهەشتەوە بەهۆی چل مەن تۆزەوە کە بە درێژایی کارەکەم لەسەر ترازووەکە نیشتووە و پێوانەی بۆ خەڵکی کەم کردووە.

**عیسای کوڕی مەریەم**(عليه السلام) بە پاڵ گۆڕستانێکدا گوزەری کرد، بانگی لە یەکێك لە مردووەکان کرد و خودا بۆی زیندوو کردەوە، پرسی تۆ کێی؟

وتی: من پیشەم حەماڵی بوو، شتم بۆ خەڵکی دەگواستەوە، ڕۆژێك دارم بۆ کەسێك گواستەوە، پارچەیەکم لێکردەوە و ددانم پێ پاك کردەوە من لەو کاتەوە ئەو داوایەم لەسەرە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەربارەی وەرع قسەی دەکرد..** عەباسی کوڕی موهتەدا بە پاڵیدا تێپەڕی و وتی: ئەی ئەبا سەعید تۆ شەرم ناکەیت، لەژێر سێبەری خانووی ئەبی دەوانیقدا دادەنیشی و لە گۆمە ئاوی زوبەیدە دەخۆیەوە و مامەڵە بە درهەمی تەزویر دەکەی، کەچی دەربارەی وەرع قسە دەکەی؟

٦

# زوهد

((زوهد سەرنجدانە لە دونیا بە چاوی تیاچوونەوە، بۆ ئەوەی لەبەرچاوت بچووك ببێتەوە و پشتهەڵکردن لە دونیا لەسەرت ئاسان ببێت..))

**لە "أبي خلاد"ەوە(خودا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:**

((گەر پیاوێکتان بینی زوهدی لە دونیا پێدرابوو و خاوەنی زمان بوو لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەو کەسە حیکمەت دەڵێتەوە))[١٤]

**مامۆستای ئیمام ئەبو قاسمی قوشەیری(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** خەڵکی دەربارەی زوهد جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە:

**هەیانە دەڵێت:** زوهد لە حەرامە، چونکە حەڵاڵ لەلای خوداوە(ﷻ) موباحکراوە، گەر خودا بە ماڵێکی حەڵاڵ نیعمەتی خۆی دا بە بەندەکەی و بە شوکردن لەسەری بەندایەتی خودای کرد، ئەوا دەستگرتن بە ماڵەکەوە و وازهێنان لێی لەلای یەکسانە و تەنها بە مۆڵەتی ئەو دەستێوەردانی بۆ دەکات.

**هەیانە دەڵێت:** زوهد لە حەرام پێویستە، و لە حەڵاڵ پەسەندە، کەمکردنەوەی ماڵ و سامان-بەندەکە ئارامگر بێت لەسەر حاڵی خۆی و رازی بێت بەوەی خودا بۆی بڕیوەتەوە و قانع بێت بەوەی پێیدراوە- باشترە لە فراوانکردن و پێڕاکێشان لە دونیا، خودا داوای زوهدی لە مرۆڤ کردووە بە ئایەتی:﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ **النساء:** ٧٧، ئەمانە و زۆرێکی تر لە ئایەتی هاتوو لە زەمی دونیا و زوهدکردن لێی.

---

[١٤] {رواه ابن ماجة بنحوه}.

**هەيانە دەڵێت:** گەر بەندە ماڵەكەی لە خێر و چاكە و گوێڕایەڵیدا خەرج كرد و ئارامی گرت لەسەر حاڵی خۆی و لەباری هەژاری و دەستتەنگیدا وازی لەوە هێنا شەرع نەهی لێكردووە، لەو بارەدا زوهدەكەی لە ماڵی حەڵاڵ تێر و تەواوترە.

**هەيانە دەڵێت:** پێویستە بەندە بە زۆرلەخۆكردن واز لە حەڵاڵ نەهێنێت، هەروەها داوای زیادە نەكات لەوەی پێی ئاتاج نییە، و ڕەچاوی بەشی خۆی بكات، گەر خودا(سبحانه وتعالى) ڕۆزییەكی حەڵاڵی بۆ ڕەوانە كرد شوكری خودا بكات، گەر ئەوەندەی پێ بەخشی بەشی بكات ئەوا هەڵپە بۆ ماڵی زۆرتر و زیاتر نەكات، بۆیە ئارامگرتن بۆ كەسی هەژار باش و گونجاوە و شوكركردنیش بۆ خاوەنی ماڵی حەڵاڵ باش و شیاوە.

## قسەی زۆریان لەسەر زوهد كردووە:

هەر یەكێك لە كات و سەردەم و دۆخی خۆی قسەی كردووە.

**سوفیانی سەوری دەڵێت:** زوهد كەمی و كورتی هیوا و ئاواتە، نە خواردنی خۆراكی زبر و ناخۆشە، نە لەبەركردنی عەبایە.

**جونەید دەفەرموێت:** گوێم لە **"السري"** بوو دەیوت: خودا(سبحانه وتعالى) دونیای لە دۆستانی خۆی گرتووەتەوە، و هەڵبژاردەكانی خۆی لە دونیا پاراستووە و لە دڵی ئەهلی خۆشەویستی خودا(سبحانه وتعالى) دەریكردووە، چونكە ڕازی نەبوو دونیا بەشی ئەوان بێت.

**وتراوە:** زوهد لەم ئایەتە پیرۆزەدایە: ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ **الحديد: ٢٣** (لەڕاستیدا زانایان ئاماژە بە ئایەتێكی تر دەكەن كە ئاشكرا ئاماژەی زوهدی تێدایە ئەوەش: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ **القصص: ٨٣**).

بۆیە كەسی زاهید بە شتێك لە دونیا دڵخۆش نابێت و بە لەدەستچوونیشی خەم و پەژارە ڕووی لێ ناكات.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** زوهد ئەوەیە واز لە دونیا بهێنی و گوێنەدەی بەوەی كێ دەستی بۆ بردووە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** زوهد ئەوەیە دونیا وەکو خۆی بەجێبهێڵیت، نەڵێیت من بەهۆی دونیاوە سەنگەر لە دوژمن دەگرم یان مزگەوتێکی پێ دەکەمەوە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** زوهد بەخشندەیی لە ماڵ و ساماندا دروست دەکات، خۆشەویستیش بەخشندەیی لە بەخشینی ڕۆحدا دروست دەکات.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** زوهد سەیرکردنی دونیایە بە چاوی تیاچوونەوە، بۆ ئەوەی لەبەرچاوت بچووك ببێتەوە و پشتهەڵکردنت لێی لەسەر ئاسان بێت.

**ئیبن خەفیف دەڵێت:** نیشانەی زوهد: بوونی ئاسوودەییە لە دەرچوون لە موڵك و دەسەڵات.

**هەروەها دەڵێت:** زوهد: بریتییە لە خۆشحاڵی دڵ لە لێبوونەوەی هۆکارەکان و دەستکێشانەوەی مرۆڤ لە ماڵ و موڵك.

**وتراوە: زوهد:** بریتییە لە کەنارگیری نەفس لە دونیا بەبێ زۆرلەخۆکردن.

**نەصرابادی دەڵێت:** زاهید کەسێکە لە دونیا غەریبە، و عاریفیش کەسێکە لە دواڕۆژ غەریبە.

**هەروەها وتراوە:** هەر کەس لە زوهدەکەیدا ڕاستگۆ بێت دونیا بەبێ ویستی ئەو ڕووی لێ دەکات.

**بۆیە وتراوە:** گەر مێزەرەیەك لە ئاسمانەوە بەربێتەوە بۆ سەر زەوی تەنها دەکەوێتە سەر ئەو کەسەی نایەوێت.

**هەروەها جونەید دەڵێت:** زوهد بریتییە لە خاڵیبوونی دڵ لەوەی دەستی لێ خاڵی بووەتەوە.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** خوری نیشانەیەکە لە نیشانەکانی زوهد، نابێت کەسی زاهید خورییەك لەبەر بکات بە سێ درهەم لە کاتێکدا ئارەزووی پۆشینی خوری پێنج درهەمی دەکات.

**پێشین دەربارەی زوهد جیاوازیان هەیە:**

**سوفیانی سەوری و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و عیسای کوڕی یونس و کەسانی تر دەڵێن:** زوهد لە دونیا بریتییە لە کورتی هیوا و ئاوات.

ئەوەی وتویانە هەڵدەدرێتە سەر نیشانەکانی زوهد و هۆکارە هاندەرەکانی و مانا پێویستەکان بۆی.

**عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەڵێت: زوهد:** بریتییە بە متمانە بە خودا(ﷻ) لەگەڵ خۆشەویستی هەژاری.

**شەقیقی بەلْخی و یوسفی کوڕی ئەسباتیش** هەمان قسەیان کردووە، ئەمەش دیسان لە نیشانەکانی زوهدە، چونکە بەندە بە متمانە بە خودا دەتوانێت بەرگەی زوهد بگرێت.

**عبدالواحد بن زید دەڵێت:** زوهد بریتییە لە وازهێنان لە دینار و درهەم.

**هەروەها ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** زوهد بریتییە لە وازهێنان لە هەر شتێك لە خودا سەرقاڵ و خەریکت بکات.

**ڕوەیم پرسیاری زوهدی لە جونەید کرد ئەویش لە وەڵامدا وتی:** بریتییە لە بچووك تەماشاکردنی دونیا و سڕینەوەی ئاساری لە دڵدا.

**"السري" دەڵێت:** ژیان و زیندەگی زاهید خۆشنابێت گەر بە شتێکەوە جگە لە نەفسی خۆی خەریك بێت، ژیان و زیندەگی عاریفیش خۆش نابێت گەر بە خۆیەوە خەریك بێت.(واتە بەهۆی سەرقاڵی بە نەفسی خۆیەوە مەولای(ﷻ) لەبیربچێت).

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی زوهد، وتی:** خاڵیبوونی دەست لە موڵك و ماڵ و خاڵیبوونی دڵ لە چاوتێبڕین.

**پرسیار لە شیبلی کرا دەربارەی زوهد، وتی:** ئەوەیە لە هەرچی شتە جگە لە خودا(ﷻ) زوهد بکەی.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت: هیچ کەس ناگاتە ڕاستەقینەی زوهد تا سێ خەسڵەتی تێدا نەبێت:**

١. کارێك بەبێ پەیوەندی(واتە تەنها بۆ خودا بێت).

٢. قسەیەك بەبێ تەماع.

٣. عیززەتێك بەبێ سەرۆکایەتی.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** زوهد تەنها لە حەڵاڵدایە، حەڵاڵ لە دونیادا نییە بۆیە زوهدی تێدانییە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** خودا زیادتر لەوەی زاهید دەیەوێت پێی دەبەخشێت، ئەو کەسەش حەزی هەیە کەمتر لە حەزەکەی پێ دەبەخشێت، بە کەسی ڕاستوەستاویش چەندی بوێت پێی دەبەخشێت.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** زاهید سرکە و ڕەشکە دەکاتە لوتت، عاریفیش بۆنی میسك و عەنبەرت بۆ دەنێرێت.

**حەسەنی بەصری دەڵێت:** زوهد لە دونیا ئەوەیە ڕقت ببێتەوە لە ئەهلی دونیا و ئەوەی لە دونیادایە.

**بە هەندێ لە گەورەپیاوان وترا:** زوهد لە دونیا چییە؟

وتی: وازهێنانە لەوەی تێیدایە بۆ ئەوانەی تێیدان.

**پیاوێك وتی بە "ذي النون المصري":** کەی زوهد لە دونیا بکەم؟

وتی: گەر لە نەفسی خۆت زوهدت کرد.

**محەمەدی کوڕی فەزڵ دەڵێت:** ئیساری (واتە پێشخستنی کەسی تر بەسەر خۆیدا) زاهید لە کاتی بێنیازبووندایە، بەڵام ئیساری جوامێری لە کاتی پێویستیدایە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾الحشر: ٩

**"الكتـاني" دەڵێـت:** ئـەو شـتەی کوفییـەکان و مەدینەییـەکان و عێراقییـەکان و شامییەکان جیاوازیان تیایدا نییە بریتییە لە:

١. زوهد لە دونیا.

٢. سەخاوەتی دەروون.

٣. ئامۆژگاری خەڵکی.

واتە ئەم شتانە هیچ کەس ناڵێت پەسەند نین.

**پیاوێك بە یەحیای کوڕی مەعازی وت:** کەی دەچمە نـاو حـانووتی پشتبەسـتن بـە خودا (تەوەکول) و پۆشاکی زاهیدان دەپۆشم؟

وتی: کاتێك لە ناخەوە گەیشتییە حاڵەتێك گەر خودا سێ رۆژ رۆزیت لێ بگرێتـەوە لاوازی روونەکاتە دەروونت.

تا نەگەیە ئەم پلەیە دانیشتنت لەسەر فەرشـی زاهیـدان نەزانییـە، پاشـان لەوانەیـە لەناویاندا رووبەڕووی حەیاچوون ببیەوە.

**بیشری حافی دەڵێت:** زوهد فریشتەیەکە تەنها بەسـەر دڵێکـەوە دەنیشـێتەوە خـاڵی بێت لە هەموو شت.

**"محمد بن أشعث البيكندي" دەڵێت:** هەر کەس قسە لە زوهد بکات و ئامۆژگـاری خەڵکی بکات و لەگەڵ ئەوەش حەز لـە مـاڵ و سـامانیان بکـات خـودا خۆشەویسـتی دوارۆژ لە دڵیان دەردەکات.

**وتراوە:** گەر بەندەیەك لە دونیا زوهدی کرد خودا فریشتەیەکی پـێ تایبـەت دەکـات حیکمەت لە دڵیدا بچێنێت.

**بە هەندێکیان وترا:** بۆچی لە دونیا زوهدت کرد؟

وتی: لەبەر ئەوەی زوهدی لێم کرد.

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: زوهد سێ جۆرە:**

**وازهێنان لە حەرام**، ئەمەش بریتییە لە زوهدی خەڵکی رەشۆکی.

دووەم: **وازهێنان لە زیادەی حەڵاڵ**، ئەوەش بریتییە لە زوهدی تایبەتان.

سێیەم: **وازهێنان لەوەی بەندە سەرقاڵ دەکات لە خودا**(ﷻ) ئەوەش بریتییە لە زوهدی عاریفان.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** بە یەکێك لە پیاوانی ئەم دەستەیە وترا: بۆچی زوهدت لە دونیا کرد؟

وتی: کاتێك زوهدم لە زۆرینەی کرد پێمخۆش نەبوو زوهد لە کەمینەکەشی نەکەم.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** دونیا وەك بووکی رازاوە وایە، هەر کەس بەدوایدا بڕوات قژی بۆ شانە دەکات، زاهید لە دونیاش رووی ئەو بووکە رەش دەکات و پرچی دەڕنێت و پۆشاکەکەی بەری دەسوتێنێت، عاریفیش بە خوداوە(ﷻ) سەرقاڵە و لا بەلای دونیادا ناکاتەوە.

**جونەید دەڵێت:** گوێم لە "السری" بوو دەیوت: هەموو شتێکم لەمەڕ زوهد جێبەجێ کرد، ئەوەی ویستم لێیەوە بەدەستم هێنا، جگە لە زوهد لە خەڵکی: نە توانیم بگەمە ئەم زوهدە و نە توانیم تەڵاقی بدەم.

**وتراوە:** زاهیدان لە دونیا دەردەچن(زوهد دەکەن) بۆ لای نەفسی خۆیان، چونکە ئەوان نیعمەتێکی تیاچوویان وازلێهێناوە بۆ نیعمەتێکی هەتاهەتایی.

**نەصرابادی دەڵێت:** زوهد نەڕژانی خوێنی زاهیدان و رژانی خوێنی عاریفانە.

**"حاتم الأصم" دەڵێت:** زاهید ئەدەب و ئەقڵی پەروەردە دەکات بەر لە دەروونی، بانگەشەکەری زوهدیش بەر لە ئەدەب و ئەقڵ سەرقاڵی دەروونی دەبێت.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** خودا هەموو شەڕی لە ماڵێکدا داناوە و کلیلەکەی کردووە بە خۆشەویستی دونیا، هەموو خێریشی لە ماڵێکدا داناوە و کلیلەکەی کردووە بە زوهد.

٧

# بێدەنگی

**((فێری بێدەنگی ببە.. وەك چۆن فێری قسەکردن دەبیت.. گەر قسەکردن ڕێنموونیت بکات ئەوا بێدەنگی دەتپارێزێت..))**

**لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:**

((هەر کەس باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری جیرانەکەی نەدات، هەر کەس باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، هەر کەس باوەڕی بە خودا ڕۆژی دوایی هەیە با خێر بڵێت یان بێدەنگ بێت))[١٥]

**لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە(خودا لێی ڕازی بێت) وتی:** وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕزگاری لە چیدایە؟

فەرمووی: زمانت بپارێزە، و با خانووەکەت بەشت بکات(لە ئامێزت بگرێت) و بگری بەسەر گوناهەکانتدا))

**مامۆستا قوشەیری(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرموێت:** بێدەنگی سەلامەتییە و بنەڕەت و بنچینە بێدەنگییە نەك قسەکردن، پەشیمانی لەسەر پەیدا دەبێت گەر قسەیەك بێت هەڕەشەی لەسەر هاتبێت، واجب تیایدا ئەوەیە ڕەچاوی شەرع و ئەمر و نەهی بکرێت تیایدا.

**بێدەنگی لە کاتی خۆیدا:** سیفەتی پیاوانە، وەك چۆن قسەکردن لە کاتی خۆیدا لە بەرزترین خەسڵەتەکانە.

---

[١٥] {رواه الشيخان وغيرهما}.

گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت: هەر کەس لە حەق بێدەنگ بێت شەیتانێکی لاڵە.(هاوشێوەی مانای ئەم قسەیە فەرموودە هاتووە)

بێدەنگی لە ئادابەکانی ئامادەبوونی دڵە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمویێت: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠٤

هەروەها خودا(سبحانه وتعالى) لەو دەستە جنەوە هەواڵ دەدا کە لە خوێندنی قورئانی پێغەمبەردا(ﷺ) ئامادەبوون:﴿ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ﴾الأحقاف: ٢٩

**هەروەها دەفەرمویێت:**﴿ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ ﴾ طه: ١٠٨

جیاوازیێکی زۆر هەیە لە نێوان بێدەنگبوونێك بۆ ئەوەی خۆی لە درۆ و غەیبەت بپارێزێت لەگەڵ بێدەنگبوونێك دەسەڵاتی خودایی زاڵ بێت بەسەریدا، بۆیە وتراوە:

**أفكر ما أقول إذا افترقنا وأحكم دائبا حجج المقال**

**فأنساها إذا نحن التقينا فأنطق حين أنطق بالمحال**

(کاتێك لەیەکتر جیادەبینەوە بیر لەوە دەکەمەوە کە دەیڵێم، بەهەمیشەیی بەڵگەی وتنەکان ریشەدار دەکەم، کاتێك بەیەکتر دەکەین ئەو لەبیر دەکەم دێمە گۆکردن و قسەکردن کاتێك بە محاڵ قسە دەکەم)

**هەروەها وتراوە:**

**فياليل كم من حاجة لي مهمة إذا جئتكم لم أدر يا ليل ماهيا**

(ئەی لەیل چەندین پێویستی گرنگم هەبوو کاتێك دێمە لاتان ئەی لەیل نازانم پێویستییەکانم چین)

**هەروەها:**

**وكم حديث لك حتى إذا مكنت من لقياك أنسيته**

(زۆرێك لە قسە بۆ تۆ کاتێك بە لیقات گەیشتم لەبیرمچوویەوە)

**هەروەها:**

**رأيت الكلام يزين الفتى والصمت خير لمن قد صمت**

**فكم من حروف تجر الحتوف ومن ناطق ود أن لو سكت**

(قسەم بینی لاوی جوان دەکرد، بێدەنگی باشترە بۆ کەسێك بێدەنگ بێت، چەند پیتێك الحتوف دەهێنێت، چەندین قسەکەریش ئاوات دەخوازن بێدەنگبوونایە)

## بێدەنگی دوو جۆرە:

١. بێدەنگی دەرەوە.

٢. بێدەنگی زمان و ناخ.

"کەسی پشتبەستوو بە خودا" دڵی بێدەنگ دەبێت لەمەڕ بڕانەوەی ڕۆزی.

"**عاریفیش**": دڵی بێدەنگ دەبێت بەرانبەر حوکمێك بە وەسفی تەبایی.

ئەمەیان بە کاری جوان و چاکەی خودایی متمانەدارە و ئەوەیان بە حوکمەکانی قەناعەتدارە.

لەوانەیە هۆی بێدەنگبوونەکە سەرسامی بەڵگەنەویست بێت، کاتێك پەردەی بۆ لادەدرێت و غافڵگیر دەکرێت لەو بارەدا زمان لاڵ دەبێت، هیچ دەربڕین و گوزارەیەك بوونی نامێنێت و بەڵگە و بورهان لەو شوێنەدا دەکوژێنەوە، بۆیە زانست و هەستیش بوونیان نامێنێت. خودا(ﷻ) دەفەرمویت:﴿ **يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ** ﴾ المائدة: ١٠٩

**خاوەن تێکۆشان بێدەنگی هەڵدەبژێرێت:** چونکە دەزانن لە قسەکردندا چەندە ئافەت بوونی هەیە، پاشان بوونی حەزی دەروون لە قسەکردندا، و دەرخستنی سیفەتی مەدح و بوونی مەیلێك بۆ خۆجیاکردنەوە لە هاودەمانی خۆی، ئەمەش بە گوزارەی باش و ڕازاوە، ئەمانە و زۆرێکی تر لە نەخۆشی لەناو خەڵکیدا، بێدەنگی سیفەتی خاوەن تێکۆشانە و یەکێکە لە پایەکانیان لە حوکمی زۆرانبازی و پاڵفتەکردنی ئەخلاقدا.

**وتراوە:** کاتێك داودی تائی ویستی لە ماڵەکەی خۆیدا گۆشەنشین ببێت پێیوابوو لە دانیشتنەکانی ئەبی حەنیفەدا(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) ئامادە ببێت، چونکە یەکێك بوو لە شاگردانی ئەبی حەنیفە، پێی باش بوو لەگەڵ هاودەمان و هاوڕێیانی خۆی لە زانایان یەك ساڵ بە بێدەنگی دابنیشێت و قسە لە هیچ بابەتێك نەکات، کاتێك یەك

ساڵی تەواو نەفسی لەسەر ئەم خەسڵەتە راهێنا و دەروونی بەهێز بوو لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشت و کەنارگیر و گۆشەنشینی هەڵبژارد.

بیشری کوڕی حافی دەڵێت: گەر بە قسەکردن سەرسام بوویت بێدەنگ بە، گەر بە بێدەنگی سەرسام بووی قسە بکە.

**سەهلی کوڕی عەبدولا دەڵێت:** بێدەنگی بۆ هیچ کەس نایەتە راستە تا نەفسی خۆی بە خەڵوەت پابەند نەکات.

**ئەبوبەکری فارسی دەڵێت:** هەر کەس بێدەنگی نەکات بە نیشتمانی خۆی لە زیادەڕۆییدایە با بێدەنگیش بێت، بێدەنگی تەنها بە زمانەوە پەیوەست نییە، بەڵکە پەیوەندی بە دڵ و هەموو ئەندامەکانەوەیە.

**هەندێکیان دەڵێن:** هەر کەس بێدەنگی بەشی نەبێت کاتێك قسە دەکات قسەکانی ژاوەژاوە.

**مەمشاد دەینووری دەڵێت:** حەکیمان حیکمەتیان بە بێدەنگی بیرکردنەوە بەدەستهێنا.

**پرسیار لە ئەبوبەکری فارسی کرا** دەربارەی بێدەنگی نهێنی و پەنهانی مرۆڤ وتی: بریتییە لە وازهێنان لە خەریکبوون بە رابردوو و داهاتووەوە.

**هەروەها ئەبوبەکری فارسی دەڵێت:** گەر بەندە لەو شتانەی پەیوەندی بە ئەوەوە هەیە قسە بکات، یا بەو شتەی هەر دەبێ قسەی لەسەر بکات ئەوا ئەو لەناو سنووری بێدەنگیدایە.

**لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە** ریوایەتکراوە(خودا لێی رازی بێت) دەڵێت: لەگەڵ خەڵکیدا کەم قسە بکە و لەگەڵ پەروەردگارت زۆر قسە بکە، بەڵکو دڵت خودا(ﷻ) ببینێت.

**بە "ذي النون المصري" وترا:** کێ لە هەموو کەس زیاتر دڵی خۆی دەپارێزێت؟ وتی: ئەو کەسەی زۆرتر زمانی خۆی دەگرێت.

**ئیبن مەسعود (خودا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:** هیچ شتێك بە ئەندازەی زمان پێویستی بە بەندکردن نییە.

**عەلی کوڕی بیکار دەڵێت:** خودا بۆ هەموو شتێك دوو دەرگای داناوە، بۆ زمان چوار دەرگای داناوە، دوو لێوی کراوە و دوو ڕیزی دانی سەروخواری کراوە.

**وتراوە:** ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی ڕازی بێت) ئەوەندە ساڵ چەوی لە دەمی خۆی دەکرد تاکو قسە کەم بکات.

**وتراوە:** ئەبو حەمزەی بەغدادی(رەحمەتی خودای لێ بێت) کەسێکی قسە خۆش و زمان شیرین بوو، ڕۆژێك بانگکەرێك بانگی لێ کرد و پێی وت: قسەت کرد و جوانت وت، ماوەتەوە بێدەنگ بیت و باش بیت لە بێدەنگیدا، لەدوای ئەوە قسەی نەکرد هەتا مرد.

هەندێ جار بێدەنگی بەسەر قسەکەرێکدا دێت وەك ئەدەبدادانی، چونکە لە شتێك کەم ئەدەبی بەخەرجداوە.

**شیبلی** کاتێك لە ئەڵقەی دانیشتنەکەیدا دادەنیشت و پرسیاریان لێ نەدەکرد ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَوَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِم بِمَا ظَلَمُواْ فَهُمۡ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ **النمل: ٨٥**

لەوانەیە بێدەنگی بێت بەسەر کەسێکی قسەکەردا چونکە لەناویدا کەسێکی تر بوونی هەیە لەپێشترە بە قسەکردن.

**گوێم لە ئیبن سەماك بوو دەیوت:** لە نێوان شاهی کەرەمانی و یەحیای کوڕی مەعازدا دۆستایەتی هەبوو، شارێك هەردووکیانی کۆکردەوە، شاهی کەرەمانی ئامادەی دانیشتنەکانی یەحیای کوڕی مەعاز نەدەبوو، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: دروست ئەوەیە(واتە دروست ئەوەیە ئامادە نەبم)، بەردەوام داوایان لێ دەکرد تا ڕۆژێك ئامادە بوو، لە سوچێکەوە دانیشت و یەحیا هەستی پێ نەکرد، کاتێك یەحیا دەستی بە قسە کرد لەناکاو بێدەنگ بوو، و وتی: لەم مەجلیسەدا کەسێك هەیە لە من لەپێشترە بە قسەکردن، دەنگە دەنگ لە دانیشتنەکە بەرزبوویەوە، شاهی کەرەمانی وتی: دروست ئەوەیە ئامادەی دانیشتنەکەی نەبم.

لەوانەیە یبێدەنگبوون بێت بەسەر قسەکەردا بـەهۆی مانایەکـەوە لـە ئامادەبوانـدا، ئەوەش ئەوەیە یەکێك بوونی هەبێت ئەهلی گوێگرتن نـەبێت لـەو قسـانە، خـودا(ﷻ) زمانی قسەکەرەکە دەپارێزێت وەك غیرەتێـك بـۆ پارێزگـاری لێـی تـاکو بـۆ خـەڵکانی ناشایستە قسە نەکات.

لەوانەیە هۆی بێدەنگبوون کە بەسەر کەسێکدا دێت ئەوە بێت زانراوی خودا(ﷻ) لـە حاڵی ئەو کەسـانەی ئامـادەبوون ئەوەیـە قسـەکە ببێتـە فیتنـە بـۆی، یـان پێیوابێـت قسەکردن حاڵی ئەوە و دەبێت قسە بکات بەڵام بەو جۆرە نەبێت، یـان شـتێك دەخاتـە سەر نەفسی کە نایتوانێ، بۆیە خودا(ﷻ) بـەزەیی پیایـدا دێتـەوە بـەوەی گـوێی لـەو قسەیە بپارێزێت جا یان وەك پارێزگاری لێی یان پارێزگاری لە هەڵە و تێکەوتنی.

**پیاوانی ئەم رێگەیە دەڵێن:** لەوانەیە هـۆی بێـدەنگ بـوون ئامـادەبوونی کەسـانێك بێت لە جن کە ئەهلی بیستنی ئەو قسانە نین، چونکە ئەڵقەی دانیشتنی ئەم دەستەیە خاڵی نییە لە ئامادەبوونی جن.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** جارێك لە مەرو تووشی نەخۆشـی بـووم، تامـەزرۆبووم بگەڕێمـەوە بـۆ نبسـاپوور، لـە خەوندا بینیم وەك ئـەوەی یـەکێك پـێم بڵێـت: نـاتوانی لـەم شـارە دەربچـیت، چـونکە دەستەیەك لە جن سوودیان لە قسەی تۆ بینیوە، و لە دانیشـتنەکانتدا ئامـادە دەبـن، بۆیە لە پێناوی ئەواندا لێرە بمێنەوە.

**هەندێ لە حەکیمان دەڵێن:** یەك زمان و دوو چاو و دوو گوێ بۆ مرۆڤ دروستکراوە، بۆ ئەوەی بیستن و وردبوونەوەی لە قسەکردن زۆرتر و زیاتر بێت.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم** بانگهێش کرا بۆ دەعوەتێك، کاتێك دانیشت دەستیان بە غەیبەت کرد، وتی: لەلای ئێمە گۆشت لەدوای نان دەخۆرێت، بەڵام لێرە بە خواردنی گۆشت دەستتان پێ کرد! ئاماژەی بۆ ئایەتی: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ الحجرات: ١٢

**هەندێکیان دەڵێن:** بێدەنگی زمانی حیلمە.

**هـــەروەها دەڵـــێن:** فێـری بێـدەنگی ببـە، وەك چـۆن فێـری قسـەکردن دەبیـت، گـەر قسەکردن ڕێنموونیت بکات ئەوا بێدەنگی دەتپارێزێت.

**وتراوە:** پاکێتی زمان بریتییە لە بێدەنگبوونی.

**هـــەروەها وتـــراوە:** نموونـەی زمـان وەك دڕنـدە وایـە گـەر کۆتوبەنـدی نەکـەی هێـرش دەکاتە سەرت.

**پرسیار لە ئـەبو حـەفص کـرا:** کـام لـەم دوو حاڵـە بـۆ وەلـی باشـترە؟ بێـدەنگی یان قسەکردن؟

وتی: گەر قسەکەر بیزانیبایە ئافەتی قسەکردن چییە ئەوا بە درێژایی تەمەنی نـووح بێـدەنگی هەڵدەبـژارد گـەر بیتوانیبایـە، گـەر کەسـی بێـدەنگ بیزانیبایـە ئافـەتی بێەنگبوون چییە، ئەوا دوو ئەوەندەی تەمەنی نووح داوای لە خودا(ﷻ) دەکرد تا قسە بکات[١٦].

**وتــراوە:** بێـدەنگبوونی خـەڵکی ڕەشـۆکی بـە زمانیانـە، بێـدەنگبوونی عاریفـان بـە دڵیانـــە، بێـــدەنگبوونی خۆشەویســـتانیش پارێزگـــاری کردنـــە لـــە ختـــوورەی نهێنییەکانیان.

بە هەندێکیان وترا: قسە بکە، وتی: زمانم نییە تا قسەی پێ بکەم.

پێیوترا: گوێبگرە: وتی: شوێنێك لەناو مندا نەماوە تا گوێبگرم.

**هەندێکیان دەڵێن:** سی ساڵ مامەوە زمانم تەنها لە دڵمەوە دەیبیست، پاشان سـی ساڵ مامەوە دڵم تەنها لە زمانمەوە دەیبیست.

**هەندێکیان دەڵێن:** گەر زمانت بێدەنگ بکەی لە قسەی دڵت ڕزگارت نابێت، گـەر ببیت بە خۆڵەمێش لە قسەی دەروونت ڕزگارت نابێت، گەر هەموو هـەوڵت بخەیەگـەڕ ڕۆحت نایەتە قسە، چونکە داپۆشەری نهێنییە.

**هەروەها وتراوە:** زمانی نەزان کلیلی تیاچوونییەتی.

---

[١٦] {واتە هەردوو حاڵەتەکە ئافەتی تایبەت بە خۆی هەیە}.

**وتراوه:** خۆشەویست گەر بێدەنگ بێت تیادەچێت، عاریفیش گەر بێدەنگ بێت بەدەستی دەهێنێت و دەبێتە خاوەنی.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** هەر کەس قسەکانی بە کار و کردەوە تەماشا بکات قسەی کەم دەبێتەوە مەگەر لە شتانێکدا پێویست بێت و پەیوەندی بە ئەوەوە هەبێت.

٨

# ترس

((ترس لە خودا فریشتەیەکە تەنها لە دڵێکی تەقواداردا نیشتەجێ دەبێت))

﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ السجدة: ١٦

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((ئەو کەسەی لە ترسی خودا دەگری ناچێتە دۆزەخەوە تا شیر دەگەڕێتەوە بۆ ناو گوان، تەپوتۆزی مەیدانی کۆشان لە پێناوی خودا و دووکەڵی دۆزەخ لە لووتی بەندەیەکدا هەرگیز کۆنابێتەوە))[١٧]

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((گەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیبایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان))[١٨]

**دەڵێم: ترس:** مانایەکی پەیوەستە بە داهاتووەوە، چونکە دەترسێت ناخۆشی و ناڕەحەتییەك رووی لێ بکات یان شتێك کە خۆشی دەوێت لەدەستی دەربچێت، ئەمانەش تەنها بۆ شتێك دەبن لە داهاتوودا بەدیبێت.

بەڵام ئەوەی لە دەمی ئێستادا بوونی هەیە ترس پێیەوە پەیوەست نابێت.

**ترسان لە خودا:** ئەوەیە بترسێت لەوەی خودا لە دونیادا یان لە دوارۆژدا سزای بدات.

خودا لەسەر بەندەکانی پێویست کردووە لێی بترسن و دەفەرموێت: ﴿وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ آل عمران: ١٧٥

---

[١٧] {رواه الترمذي وقال حسن صحيح}.

[١٨] {رواه أحمد والشيخان والترمذي وابن ماجة}.

﴿ فَإِيَّٰىَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ ﴾ النحل: ٥١ ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ ﴾ النحل: ٥٠

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) دەیوت:** ترس چەند ئاستیٚکی هەیە: "**الخوف**" و "**الخشية**" و "**الهيبة**".

"**الخوف**": لە مەرجی باوەڕ و پرسی باوەڕە:﴿ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٧٥

"**الخشية**": لە مەرجی زانستە، خودا(ﷻ) دەفەرمویٚت: ﴿ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾فاطر: ٢٨

"**الهيبة**" لە مەرجی مەعریفەیە، خودا(ﷻ) دەفەرمویٚت:﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥ ﴾آل عمران: ٢٨

**ئەبو حەفص دەڵیٚت:** ترس قەمچی خودایە ویٚڵبوان ڕاست دەکاتەوە بۆ سەر ڕیٚگەی خودا.

"**أبو القاسم الحكيم" دەڵیٚت:** ترس دوو جۆرە: "رهبة" و "خشية"

**خاوەنی ڕەهبەت** پەنا بۆ هەڵهاتن دەبات کاتیٚك دەترسیٚت، **خاوەنی خەشیە** پەنا بۆ پەروەردگار دەبات.

**هەروەها (ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) دەڵیٚت:** "رهب" و "هرب" دروستە بوتریٚت یەك مانان، هەروەك "**جذب**" و "**جبذ**".

کاتیٚك هەڵدیٚت بەپیٚی داوای ئارەزووی کیٚش دەکریٚت، وەك ڕاهیبەکان کە شویٚنی ئارەزووی خۆیان کەوتن، کاتیٚك لەغاوی زانست لەغاوی دەکات و حەقی شەرع دەدات ئەوە بریتییە لە خەشیە.

**ئەبو حەفص دەڵیٚت:** ترس چرای دڵە، بەو چرایە خیٚر و شەڕی تیٚدا دەبینریٚت.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) دەیوت:** ترس ئەوەیە بیانوو بۆ نەفست نەهیٚنیتەوە بە "**عسى**" و "**سوف**".

**ئەبو عومەری دیمەشقی دەڵیٚت:** کەسی خاوەن ترس ئەو کەسەیە لە نەفسی خۆی زیاتر دەترسیٚت تا لە شەیتان.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** کەسی خاوەن ترس ئەو کەسەیە ترسەکان نابنە هەڕەشە بۆ سەری.

**وتراوە:** ترساو ئەو کەسە نییە دەگری و فرمێسکەکانی دەسڕێتەوە، بەڵکو ئەو کەسەیە واز لەو کار و کردەوانە دەهێنێت لەسەریان سزا دەدرێت.

**وترا بە فوزەیل بۆچی لەم سەردەمەدا کەسی خاوەن ترس نابینین؟**

وتی: گەر ئێوە خاوەن ترس بوونایە خاوەن ترستان دەبینی، کەسی خاوەن ترس تەنها خاوەن ترسەکان دەیبینن، جەرگسووتاو حەز دەکات نزیك بێت لە جەرگسووتاو.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** ڕۆڵەکانی ئادەم داماون، گەر بە ئەندازەی ترسی لە هەژاری لە ئاگر بترسابایە دەچووە بەهەشتەوە.

**شاهی کەرەمانی دەڵێت:** نیشانەکانی ترس: حوزنی بەردەوامە.

**"أبو القاسم الحكيم" دەڵێت:** هەر کەس لە شتێك بترسێت لێی هەڵدێت، هەر کەس لە خودا(سبحانه وتعالى) بترسێت بۆ لای خودا هەڵدێت.

**پرسیار لە "زو نونی مصری" کرا(ڕەحمەتی خودای لێ بێت):** کەی ڕێگەی ترس بۆ بەندە ئاسان و فەراهەم دەبێت؟

وتی: گەر خۆی وەك نەخۆش تەماشا بکات، لە هەرچی شتە خۆی دەپارێزێت لە ترسی درێژەکێشانی نەخۆشییەکەی.

**مەعازی کوڕی جەبەل(خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت:** کەسی باوەڕدار دڵی ئارام نابێت و ترسی نانیشێتەوە تا پردی دۆزەخ لەدوای خۆیەوە بەجێنەهێڵێت.

**بیشری حافی دەڵێت:** ترس لە خودا فریشتەیەکە تەنها بە دڵی پاکەوە دەنیشێتەوە.

**ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت:** نەنگی کەسی خاوەن ترس لە ترسەکەیدا بریتییە لە پاڵدانەوە و سوکنایی بۆ لای ترسەکەی، چونکە کارێکی شاراوەیە.

**"الواسطي" دەڵێت:** ترس پەردەیەکە لە نێوان خودا و بەندەدا.

ئەم گوزارەیە تەمومژی پێوە دیارە و ماناکەی: کەسی خاوەن ترس چاوەڕوانی کاتی دووەمە.

ڕۆڵەکانی کات[19] هیچ چاوەڕوانییەکیان نییە لە داهاتوو، چاکەی چاکان خراپەی نزیکانە.

**"النـــوری" دەڵێـــت:** کەســی خــاوەن تــرس لــە پــەروەردگاری هەڵــدێت بــۆ لای پــەروەردگاری. (ئەمــەش مانــای ئــەم دوعایــە: **وأعــوذ بــك منــك**-پــەنا دەگــرم لــە خۆت بە خۆت)

**هەنــدێکیان دەڵــێن:** نیشــانەی تــرس بریتییــە لــە: سەرســامی و وەســتان لەبــەر دەرگای پەنهاندا.

**پرسیار لە جونەید کـرا دەربـارەی تـرس، وتـی:** پێشـبینی کردنـی سـزایە لەگـەڵ گوزەرکردنی هەناسەکان.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** ترس لە هەر دڵێك جیابێتەوە ئەو دڵە وێران دەبێت.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** ڕاستگۆیی لە ترسدا بریتییە لە وەرع کردن لە گوناه و خراپـە لە دەرەوە و لە ناوەوە.

**"ذو النون" دەڵێت:** خەڵکی لەسەر ڕێگەی خودان گەر ترس لە دڵیان نەسڕابێتەوە، کاتێك ترس لە دڵیان هەڵگیرا ڕێگەکەیان لێ بزر دەبێت.

**"حاتم الأصم" دەڵێت:** هەموو شتێك جوانی خۆی هەیە، جـوانی عیبـادەت ترسـە، نیشانەی ترسیش کورتی هیوا و ئاواتە.

**پیاوێك وتی بە بیشری حافی:** دەبینم لە مردن دەترسی..

وتی: ڕۆیشتن بۆ لای خودا(ﷻ) تەنگانەیەکی گەورەیە.

**گوێم لە مامۆستا ئـەبو عـەلی دەقـاق بـوو دەیـوت:** لـە کـاتی گەڕانـەوەم ڕۆیشـتم بـۆ لای **"الإمـام أبـي بکـر بـن فـورك"**، کاتێـك مـنی بـینی چـاوەکانی پڕبـوون لـە فرمێسـك، پـێم وت: **إنشـاء الله تعـالى** خـودا عافییـەتت پـێ دەبەخشـێ و شـفات بـۆ ڕەوانە دەکات.

ئەویش پێی وتم: پێتوایە لە مردن دەترسم؟ لەوەی دوای مردن دەترسم..

---

[19] {ئەهلی تەصەوف}.

**له عائشەوە(خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێ:** وتم، **ئەی پێغەمبەری خودا**(ﷺ) ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ﴾ ئایا ئەوە پیاوێکە دزی دەکات و زینا دەکات و شەراب دەخواتەوە؟

**فەرمووی:** نەخێر، بەڵکو کەسێکە بەڕۆژوو دەبێت و نوێژ دەکات و صەدەقە ئەنجام دەدات و دەترسێت خودا لێی قبووڵ نەکات.

**ئیبن موبارەك(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ئەوەی ترس گەشە پێ دەدات تا هەموو دڵ داگیر بکات بریتییە لە بەردەوامی چاودێری لە پەنهان و ئاشکرادا.

**عەلی کوڕی رازی دەڵێت:** گوێم لە ئیبن موبارەك بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) ئەو قسەی کرد.

**ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەڵێت:** کاتێك ترس لە دڵدا نیشتەجێ دەبێت شوێنی حەزەکان دەسوتێنێت و حەزی دونیایی لە دڵ دەردەکات.

**وتراوە:** ترس بریتییە لە هێزی زانست بە گوزەرکردنی حوکمەکان.

**هەروەها وتراوە:** ترس بریتییە لە جووڵەی دڵ لە گەورەیی و شکۆمەندی خودا.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** پێویستە دڵ تەنها ترس بەسەریدا زاڵ بێت، چونکە گەر رجا بەسەر دڵدا زاڵ بێت دڵ تێکدەدات.

پاشان وتی:

**يا أحمد بالخوف ارتفعوا فإن ضيعوه نزلوا**

(ئەی ئەحمەد بە ترس بەرزبوونەوە، گەر ترسیان لەدەستدا دەڕوخێن)

**"الواسطي" دەڵێت:** ترس و رجا دوو پارێزەری دەروونەکانن تاکو نەفس لانەدات بە لای حەزەکانیدا.

**هەروەها دەڵێت:** کاتێك حەق(ﷻ) لەسەر پەنهان دەردەکەوێت، ئەوا پاشماوەی ترس و رجا لە دڵدا نامێنێت.

**مامۆستا "أبو القاسم القشيري" دەڵێت:** ئەمە تەمومژی تێدایە و ماناکەی: کاتێك شاهیدەکانی حەق(سبحانه وتعالى) لە دڵدا راستدەبنەوە ئەوا بیری داهاتوو و رابردووی تێدا نامێنێت، ترس و رجاش لە ئاساری مانەوەی هەستکردنە بە حوکمە مرۆییەکان.

**حوسەینی کوڕی مەنصور دەڵێت:** هەر کەس بێجگە لە خودا لە شتێك بترسێت یان رجای بە شتێك ببێت جگە لە خودا دەرگای هەموو شتێکی لێ دادەخرێت، و ترسی شتەکان زاڵ دەبن بە سەریدا و بە حەفتا پەردە دڵی دادەپۆشرێت کە ئاسانەکەیان شك و گومانە، ئەوەی وا دەکات ترس زیاد بکات بیرکردنەوەیانە لە سەرئەنجام و ترسان لە گۆڕانی حاڵیان، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾﴾ الزمر: ٤٧، هەروەها دەفەرموێت:﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ﴿١٠٤﴾﴾ الكهف: ١٠٣ - ١٠٤

خەڵکانێکی زۆر هەن ئاوات بە حاڵ و باریان دەخوازرا و حاڵیان پێچەوانە بوویەوە و تێکەڵ بە کاری خراپە بوون و هۆگرییان بۆ وەحشەت و نامۆبوون گۆڕا و ئامادەبوونی دڵیان بوو بە بزربوون.

گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) زۆرجار ئەم دوو دێڕە هۆنراوەی دەخوێندەوە:

**أحسنت ظنك بالأيام إذ حسنت ولم تخف سوء ما يأتي به القدر**

**وسالمتك الليالي فاغتررت بها وعند صفو الليالي يحدث الكدر**

(گومانی باشت بە رۆژگار برد کاتێك باشگەڕا، بەڵام نەترسای لەوەی قەدەری خراپ دەیهێنێت، شەوان لەگەڵت ئاشت و تەبابوون و فریوت پێخوارد، لە خۆشی و بێمەینەتی شەوەکاندا لێڵی و ناخۆشی روودەدات)

**گوێم لە مەنصوری کوڕی خەلەفی مەغریبی بوو دەیوت:**

بۆ ماوەیەك دوو پیاو لە ویستدا هاوەڵی یەکتریان کرد، پاشان یەکێکیان سەفەری کرد و لە هاوەڵەکەی جیابوویەوە.. ماوەیەك بەسەریدا تێپەڕی و هیچ هەواڵێکی لە دۆستەکەی

نەبوو، لە کاتێکدا ئەویتریان لەناو سوپایەکدا غەزای ڕۆمەکانی دەکرد پیاوێك هاتە دەرەوە لە سوپای ڕۆمەکان بۆ جەنگان دژ بە پاڵەوانێك لە موسڵمان کە روخساری خۆی داپۆشی بوو، پاڵەوانێك لە موسڵمانان بۆی دابەزی و ڕۆمییەکە کوشتی..

پاشان لە ریزی موسڵمانان دانەیەکی تری بۆ هاتە دەرەوە و ئەویشی کوشت، سێیەمی بۆ هاتە دەرەوە و ئەویشی کوشت...

پاشان لە ریزی موسڵمانان کەسێکی تری بۆ هاتە دەرەوە و دەستیان بە شەڕەشمشێر و زۆرانبازی کرد، ناچار کەسە ڕۆمییەکە دەمامکی لە روخساری خۆی لادا موسڵمانەکە بینی ئەو پیاوەیە لە لێبڕان و تێکۆشان و عیبادەتدا چەندین ساڵیان بەسەر برد.

پێی وت: تۆ بۆ وات بەسەرهاتووە؟

وتی: لە ئیسلام پاشگەزبوومەوە و تێکەڵ بەم ڕۆمانە بووم و منداڵم لێیان بووە و ماڵی زۆرم کۆکردووەتەوە.

پێی وت: تۆ بە چەندین شێواز قورئانت دەخوێند، بۆ وات بەسەرهاتووە؟

وتی: تەنها پیتێکیم لەبیر نەماوە.

پیاوە سۆفییەکە پێی وت: وا مەکە و بگەڕێرەوە سەر ئیسلام.

وتی: ناتوانم، ماڵ و سامان و پلە و پایەی زۆریان پێداوم، تۆش بڕۆ و لێم دووربکەوەرەوە ئەگینا چیم بەوانە کرد ئەوەش بە تۆ دەکەم.

سۆفییەکە پێی وت: دەزانم سێ کەست لە موسڵمانان کوشتووە، و لوتبەرزی مەکە و تۆ پشتهەڵبکە و بڕۆ، من ڕێگەت پێ دەدەم و ناتکوژم.

پیاوەکە پشتی هەڵکرد و گەڕایەوە... سۆفییەکە لەدواوە شوێنیکەوت و شمشێرێکی لێدا و کوشتی.

سەرنج بدە دوای ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشان و عیبادەتە لە پێناوی نەصرانییەتدا موسڵمانانی دەکوشت.

**وتـــراوه:** کاتێـــك ئـــەوەی روویـــدا لـــە ئیبلـــیس روویـــدا، جبریـــل و میکائیـل(ســەلامی خودایان لەسەر بێت) ماوەیەکی زۆر گریان.

خودا وەحی بۆ هەردووکیان نارد: بۆچی ئەو هەموو ماوەیە هەردووکتان دەگرین؟

وتیان: پەروەردگار لە مەکری تۆ دڵنیانین.

خودا(ﷻ) پێی فەرموون: ئا بەو جۆرە بن، لە مەکری من دڵنیامەبن.

**لە "السري السقطي"ەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە رۆژێکدا ئەوەندە جار تەماشای لوت و روخسارم دەکەم دەترسم رەش بووبێت، چونکە لە سزای خودا دەترسم!!

**ئەبو حەفص:** ماوەی چل ساڵە بـاوەڕم وایـە خـودا(ﷻ) بـە چـاوی رقـەوە تەماشـام دەکات و کارەکانم بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

**"حاتم الأصم" دەڵێت:** بە شوێنی چاك و پاك و پیرۆز فریو مەخۆ، چونکە شـوێنێك نییە لە بەهەشت چاکتر و پاکتر بێت، بەڵام ئەوە بەسەر ئادەمدا هات کە هات..

بە زۆری عیبادەت فریو نەخۆی، چونکە لەدوای عیبادەتێکی زۆر و دوورودرێژ ئـەوە بەسەر ئیبلیس هات کە هات..

بە بینینی صالڵحان فریو مەخۆ، چونکە هیچ کەسێك لە پێغەمبەر چـاکتر و مـەزنتر نییە، بەڵام دوژمنانی و کەسوکاری بێباوەڕی سوودێکیان لە بینینی نەبینی.

**رۆژێك ئیبن موبارەت هاتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانی و وتی:** دوێنێ بوێریم دایـە بـەر خۆم و داوای بەهەشتم لە خودا(ﷻ) کرد.

**وتراوە:** عیسا رۆژێك هاتە دەرەوە و صالڵحێك لە صالڵحەکانی بـەنی ئیسـرائیلی لەگەڵ بوو، پیاوێکی هەڵـەکاری بـە خراپـە و لادان بـەناوبانگ شـوێنیان کـەوت، پیاوەکە دانیشت و زۆر بە خۆبەکەمزانین و دڵشکاویەوە داوای لە خودا(ﷻ) کرد و وتی: خودایە لێمخۆش ببە.

**پیاوە صالڵحەکەش دوعای کرد و وتـی:** خودایـە سـبەینێ مـن لەگـەڵ ئـەو پیـاوە یاخییەدا کۆمەکەرەوە.

**خودا وەحی بۆ عیسا**(عليه السلام) **نارد و پێـی فـەرموو:** مـن وەڵامـی تـەواوی دوعـای هەردووکیانم دایەوە، ئەو صاڵحەم ناوێت و لەو تاوانکارە خۆشبووم.

**"زو نونی مصری" دەڵێت:** وتم بە "سولەیم" بۆ پێت دەوترێت شێت؟

ئەویش وتی: کاتێك دابڕانم لێی(واتە لە خودا) درێژەی کێشا بووم بـە شـێت بـەهۆی ترسی دابڕانم لێی لە ڕۆژی دواییدا.

**هەندێکیان دەڵێن:** هیچ پیاوێکم نەبینیوە لە ئومەتدا رجای زۆرتر و ترسـی تونـدتر بێت لە "ئیبن سیرین".

**هەروەها وتراوە:** سوفیانی سەوری نەخۆش کەوت و نیشانەکانی بۆ پزیشك باسـکرا، وتی: ئەو پیاوە ترس جگەری بڕیوە.

پاشـان پزیشـکەکە هـات و پشـکنینی لێـدانی دڵـی بـۆ کـرد و وتـی: وانـازانم لـە حەنەفییەکاندا کەسێکی وەك ئەم پیاوە بوونی هەبێت.

**پرسیار لە شیبلی کرا:** بۆچی خۆر لە کاتی ئاوابووندا زەردهەڵدەگەڕێت؟

وتی: چونکە لە شوێنی کەماڵ و تێر و تەواو کەنارگیرکراوە، بۆیە بـۆ ترسـی مـەقام ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوە.

هەر بەو جۆرە کەسی باوەڕدار کاتێك دەرچوونی لە دونیا نزك دەبێتەوە ڕەنگـی زەرد هەڵدەگەڕێت، چونکە لە مەقام دەترسێت.

کاتێـك خـۆر هەڵـدێت دەدرەوشـێتەوە، بـاوەڕداریش هـەر بـەو جۆرەیـە، کاتێـك لـە گۆڕەکەی زیندوو دەبێتەوە دێتە دەرەوە و روخساری دەدرەوشێتەوە.

**دەگێڕنەوە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:**

داوام لە پەروەردگارم(عز وجل) کـرد دەرگایـەکی ترسـم بـەڕوودا بکاتـەوە، ئـەویش بـۆی کردمەوە، ترسام ئەقڵم لەدەست بدەم.

بۆیە وتم: پەروەردگار، ئەوەندە ترسم پێبدە بتوانم شان بدەمـە ژێـری، بۆیـە لەسـەرم ئارام بوویەوە.

# ٩

# رجا

((شیرینترین بەخشش لە دڵمدا رجای تۆیە.. شیرینترین قسە لەسەر زمانم مەدح و سەنای تۆیە.. خۆشەویستترین سات لەلام ئەو ساتەیە بە خزمەتی

**خودا (ﷻ) دەفەرمویت:** ﴿مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأَتٍ﴾ العنكبوت: ٥

**عەلائی کوڕی زەید دەڵێت:** چووم بۆ لای مالیکی کوڕی دینار بینیم شەهری کوڕی حەوشەب لەوێیە، کاتێك لەلای هاتینە دەرەوە وتم بە شەهر: خودا رەحمت پیێ بکات، لەوەی پێیبەخشیت پێمببەخشە(واتە لە زانست).

وتی: پوورم **(أم الدرداء)(خودا لێی رازی بێت) لە "أبي الدرداء"**وە**(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لە جبریلەوە(عليه السلام) بۆی گێڕامەوە فەرمووی:** ((پەروەردگاری ئێوە(عزوجل) دەفەرموێت: بەندەکەم هەتا بمپەرستی و رجات لەلام بێت و شتێکم بۆ نەکەی بە هاوەڵ ئەوەی لێت دەوەشێتەوە(لە خراپە) لێتخۆشدەبم، گەر بە پڕ بە زەویەوە لە هەڵە و گوناهەوە رووم لێ بکەیت منیش پڕ بە زەوی لە لێخۆشبوون پێشوازیت لێ دەکەم، و لێت خۆشدەبم و باکێکم نییە))[٢٠]

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((خودا(سبحانه وتعالى) لە رۆژی دواییدا دەفەرموێت: هەر کەس بە ئەندازەی دەنکە جۆیەك ئیمان لە دڵیدایە لە دۆزەخ دەریبهێنن، پاشان دەفەرموێ: بە عیززەت و جەلالی خۆم سوێند دەخۆم ئەو کەسەی ساتێك لە رۆژێك ئیمانی پێهێنابم وەك ئەو

[٢٠] {رواه الطبراني بسند حسن، والترمذي بنحوه وقال حسن}.

کەسە مامەڵەی لەگەڵ ناکەم ئیمانی پێ نەهێناوم))[٢١]

**رجا:** بریتییە لە پەیوەستبوونی دڵ بە خۆشویستراوەوە لە داهاتوودا.

وەك چۆن ترس دەکەوێتە دەمی داهاتوو هەر بەو جۆرە رجاش بۆ ئەو شتانەیە هیوای بۆ دەخوازرێ لە داهاتوودا بەدیبێت لە زیندەگی دڵ و بوون بە خاوەنی پاداشت.

**جیاوازی نێوان رجا و خۆزگە و ئـاوات ئەوەیـە، خۆزگـە و ئـاوات:** تەمبـەڵی بـۆ خاوەنەکەی دروست دەکات و رێگـەی کۆشـان و لێـبڕان ناگرێتـە بـەر، بـە پێچـەوانەی خاوەنی رجاوە، رجا پەسەندە و خۆزگە و ئاوات ناتەواوە.

**قسەی زۆر لەسەر رجا کراوە:**

**شاهی کەرەمانی دەڵێت:** نیشانەی رجا بریتییە لە گوێڕایەڵی باش.

**ئیبن خەبیق دەڵێت:** رجا سێ جۆرە:

**پیاوێك چاکەی ئەنجامداوە** و رجای قبوولبوونی هەیە.

**پیاوێك خراپەی ئەنجامداوە** و تەوبەی لێکردووە و رجای لێخۆشبوونی خودای هەیە.

**سێیەمیان:** پیاوێکی درۆزن لە گوناهدا پێڕادەکێشـێ و دەڵێـت رجـای لێخۆشـبوونم هەیە.

هەرکات نەفسی خۆی بە خراپە بینییەوە دەبێت ترسی لە رجای زۆرتر و زاڵتر بێت.

**هەروەها وتراوە:** رجا متمانەی بەخشندەییە لە بەخشندەیەکی خاوەن بەزەییەوە.

**هەروەها وتراوە:** بینینی جەلالە(مەزنی و شکۆمەندی خودا) بە چاوی جەمال(جوانی و بەبەزەیی خودا)

**هەروەها وتراوە:** بریتییە لە نزیکی دڵ لە لوتفی پەروەردگارەوە.

**هەروەها وتراوە:** سرووری دڵ بە سەرئەنجامی باشی دوارۆژ.

**هەروەها وتراوە:** بریتییە لە سەرنجدان لە بەرینی بەزەیی خودا (سبحانه وتعالی).

---

[٢١] {سەرەتاکەی لە دوو سەحیحەکەدایە}.

**ئەبو عەلی ڕۆزبـاری دەڵێـت:** تـرس و ڕجـا وەك دوو بـاڵی باڵندەیـەك وان کاتێـك یەکسان بوون باڵندەکە یەکسان و هاوسەنگ لێی دەوەستێت و فڕینی دروست دەبێـت، گەر باڵێکی ناتەواو بوو ناتـەواوی دەکەوێتـە نـاو فڕینییـەوە، گـەر هـەردوو باڵەکـەی نەمان باڵندەکە وەك مردووی لێ دێت.

**له ئەحمەدی کوڕی عاصمی ئەنتاکی پرسیارکرا:** نیشانەی ڕجا لە بەندەدا چییە؟

وتی: ئەوەیە گەر چاکە ئابلۆقەی دا ئیلـهام بکرێـت بـە شـوکر و لـە دونیـادا ڕجـای تەواوی نیعمەتی بێت لە خوداوە(ﷻ) و تەواوی لێبووردی خودا لە دوارۆژدا.

**عەبــدوڵای کــوڕی خــەفیف دەڵێــت:** ڕجـا داوای مژدەیــە بــە بــوونی فــەزڵی و چاکەی خودا(ﷻ).

**هەروەها وتراوە:** ئاسوودەیی دڵە بۆ بینینی بەخشندەیی ڕجالێکراو و خۆشەویست.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێـت:** هـەر کـەس نەفسـی خـۆی هەڵبداتـە سـەر ڕجـا پەکیدەکەوێت، هەر کەسیش نەفسی خۆی هەڵبداتە سەر تـرس بێهیـوا دەبێـت، بـەڵام جارێك لەمەیان و جارێك لەوەیان.

**"بكر بن سليم الصواف" دەڵێت** ئەو ئێوارەیەی مالیکی کوڕی ئەنەس کۆچی دوایی کرد ڕۆیشتینە لای، وتمان: باوکی عەبدوڵا لە چ حاڵێکدای؟

وتی: نازانم چیتان پێ بڵێم، هەر ئەوەندە دەڵێم ئەوەندە لێبووردنی خودا دەبینـن کە بیرتان لێ نەکردۆتەوە(بە خەیاڵتاندا نەهاتووە) پاشان بەجێمان نەهێڵا تا کۆچی دوایی کرد و چاوەکانیمان لێکنا.

**یەحیای کوڕی مەعاز- لە مناجاتێکـدا- دەڵێـت:** خەریکـە ڕجـام بـە تـۆ لەگـەڵ گوناهان زاڵ دەبێت بەسەر ڕجام بە تۆ لەگەڵ بوونی کار و کردەوەی چاکە، چـونکە لـە کار و کردەوەکانمدا شانم لەسەر ئیخلاص و پارێزگاری لە ئیخلاص داداوە و منیش بـە ئافەت ناسراوم.. بەڵام لە گوناهاندا شانم لەسەر لێبووردنی تۆ داداوە، چۆن لە گوناهان خۆشنابیت لە کاتێکدا تۆ بە بەخشندەیی بەناوبانگی؟!

له سەرەمەرگدا قسەیان لەگەڵ **"ذي النون المصري"** کرد، وتی: سەرقاڵ و خەریکم مەکەن، لە زۆری لوتفی خودا لەگەڵم سەرمسوڕماوە.

**لە هەندێ تەفسیردا هاتووە:** پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای هاوەڵانی لە دەرگای بەنی شەیبەوە، بینی پێدەکەنن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێدەکەنن؟

گەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیبایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان)) پاشان تێپەڕی، ئەوجا بەرەوپشت گەڕایەوە و فەرمووی: جبریل(عليه السلام) دابەزی بۆ سەرم و ئەم ئایەتەی هێنا:﴿ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ ﴾ الحجر: ٤٩

**لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت) وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو فەرمووی:** ((خودا(سبحانه وتعالى) پێدەکەنێت لە بێهیوابوون و دەستەئەژنۆیی بەندەکانی و نزیکی بەزەیی خودا لەوانەوە، وتم: باوك و دایکم فیدات بێت، بۆ پەروەردگارمان(عز وجل) پێدەکەنێ؟

فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەو پێدەکەنێ، عائشە دەفەرموێ (رەزاو رەحمەتی خوای لێبێت): گەر پەروەردگار پێبکەنێت لە هیچ خێرێکمان کەم نابێت))

بزانە پێکەنین لە وەسفی پەروەردگاردا لە سیفەتی کردارەکانی خودان، ئەوەش بریتییە لە دەرخستنی خێر و چاکەی خۆی، وەك وتراوە: **"ضحكت الأرض بالنبات**-زەوی بە رووەکەوە پێکەنی"، پێکەنینی پەروەردگار لە بێهیوابوونی بەندەکانی دەرخستنی هاتنەدی چاکە و فەزڵی خۆیەتی کە بەندەکانی لە چاوەڕوانی کردنی لاواز بوون.

**وتراوە:** کەسێکی مەجووسی داوای لە ئیبراهیم خەلیل کرد میوانداری بکات، ئیبراهیم فەرمووی: گەر موسڵمان ببیت میوانداریت لێ دەکەم، بابای مەجووسی وتی: گەر موسڵمان ببم چ منەتێکت لەسەرم دەمێنێت؟

بۆیە پشتی هەڵکرد و رۆیشت، خودا وەحی بۆ ئیبراهیم(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: تەنها بە گۆڕینی دینەکەی خواردنی پێ دەبەخشی؟

ئێمە حەفتا ساڵە بەبێ باوەڕییەوە خواردنی پێ دەدەین، گەر تەنها شەوێك میوانداریت لێ بکردبایە چی دەبوو؟

ئیبراهیم بە دوای مەجووسییەکەدا گەڕا و دۆزییەوە و میوانداری لێ کرد، مەجووسییەکە پێی وت: هۆی چی بوو رای خۆت گۆڕی؟

ئەویش بۆی باس کرد، مەجووسییەکە وتی: خودا ئاوا مامەمەڵەم لەگەڵ دەکات؟ پاشان وتی: باسی ئیسلامم بۆ بکە و موسڵمان بوو.

**گوێم لە شێخ ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** مامۆستا ئەبو سەهلی سەعلوکی(رەحمەتی خودای لێ بێت) ئەبا سەهلی زەجاجی لە خەوندا بینی-ئەو باوەڕی بە هەڕەشەی هەتاهەتایی هەبوو(واتە گەر خودا لەسەر گوناهێك هەڕەشەی سزادان بکات هەر دەبێ رووبدات)- پێیوت: حاڵت چۆنە؟

وتی: کارەکە لەوە ئاسانتر بوو ئێمە خەیاڵمان دەکرد.

**ئەبوبەکری کوڕی ئەشکیب دەڵێ:** لە خەوندا ئەبا سەهلی سەعلوکیم بینی کە لەسەر شێوەیەکی زۆر جواندا بوو و وەسف ناکرێت، وتم: مامۆستا بە چی ئەمەت بەدەستهێنا؟

وتی: بە گومانی باشم بە پەروەردگارم.

**لە خەوندا مالیکی کوڕی دینار لە خەوندا بینرا، پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: بە گوناهێکی زۆرەوە هاتم بۆ لای پەروەردگارم(ﷻ) بەهۆی گومانی باشم بە خودا هەمووی لەسەر سڕیمەوە.

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ریوایەتکراوە فەرموویەتی:** ((خودا(ﷻ) دەفەرموێت: لەگەڵ گومانی بەندەکەمدام بە من، من لەگەڵ ئەوم کاتێك یادم دەکات، گەر لە نەفسی خۆیدا یادم بکات لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، گەر لەناو کۆمەڵێکدا یادم بکات لەناو کۆمەڵێك چاکتر لەو کۆمەڵە یادی دەکەم، گەر بستێك لێم نزیك ببێتەوە باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، گەر باڵێك لێم نزیك ببێتەوە دوو باڵ لێی نزیك دەبمەوە، گەر هاتن بێت بۆ لای من بە راکردن دەچم بە پیرییەوە))[٢٢]

---

[٢٢] {رواه الشيخان بنحوه وابن ماجة}.

**له ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) هـەمان فەرمودەی فەرمووە.**

**هەروەها وتراوە:** جارێکیان ئـیبن موبـارەك جـەنگی لەگـەڵ خۆرپەرسـتێکدا دەکـرد، کاتی هاتنی نوێژی خۆرپەرستەکە هات، داوای لە ئیبن موبارەك کرد تا مۆڵەتی بدات نوێژەکەی بکات، ئەویش مۆڵەتی دا.

کاتێك سوژدەی برد بۆ خۆر ئیبن موبارەك ویستی بە شمشێر لێی بدات لە هەواوە گوێی لە کەسێك بوو دەیوت:﴿ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴾ بۆیە گەڕایەوە و کارەکەی نەکرد، کاتێك خۆرپەرستەکە سەلامی دایەوە، وتی: بۆ گەڕایتەوە لەوەی ویستت ئەنجامی بدەی؟

ئەویش ئەوەی بیستبووی بۆی باس کرد، خۆرپەرستەکە پێی وت: باشترین پەروەردگارە، لۆمەی دۆستەکەی خۆی دەکات لەسەر دوژمنەکەی، بۆیە موسڵمان بوو و بە ئیسلامێکی باش و جوان.

**هەروەها وتراوە:** کاتێك ناوی خۆی نا "العفو-لێبووردە" ئەوانی خستە ناو گوناهەوە.

**هەروەها وتراوە:** گەر بیوتبایە لە گوناهان نابوورم هەرگیز موسڵمان گوناهی نەدەکرد، وەك چۆن کاتێك فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ ﴾

هەرگیز موسڵمان هاوەڵی بۆ بڕیار نادات، بەڵام کاتێك فەرمووی:﴿ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾تەماعیان بۆ لێبووردنی خودا بۆ دروست بوو.

**لە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمەوە(خودا لێی رازی بێت) دەگێڕنەوە فەرموویـەتی:** ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی ئەوە بووم تەوافکردنم بۆ چۆڵ بێت و بەتەنها تـەواف بکـەم، لە شەوێکی زۆر تاریکدا کە بـارانێکی لێزمـە دەبـاری لـە تـەواف کـردن تەنهاکـەوتم، چوومە نـاو تەوافـەوە، تیایـدا دەمـوت: "خودایـە لـە گوناهـان بمپـارێزە، خودایـە لـە گوناهان بمپارێزە" گوێم لە دەنگێك بوو پێـی وتم: ئـەی کوڕەکـەی ئەدهـەم، تـۆ داوای بێگونـاهی لـە مـن دەکـەی، هـەموو خـەڵکی داوای بێگونـاهیم لـێ بکـەن و منـیش بێگوناهیان بکەم ئەی ڕەحم بە کێ بکەم؟!

**وتراوه: "أبو العباس بن شريح"** لە نەخۆشی مردنەکەی خەونی بینی وەك ئەوەی قیامەت هەستا بێت، خودا(ﷻ) دەیفەرموو: زانایان لە کوێن؟

دەڵێ: زانایان وەڵامی خودایان دایەوە، پاشان فەرمووی: چ کارێکتان بە زانستەکەتان کرد؟

دەڵێ: وتمان پەروەردگار کەمتەرخەمیمان نواند و خراپەمان ئەنجامدا.

دەڵێ: پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، وەك ئەوەی لە وەڵامەکە رازی نەبێت و وەڵامێکی تری بوێت.

من وتم: من لە لاپەڕەکەمدا هاوەڵدانان بوونی نییە، تۆش بەڵێنت داوە لە خوار ئەوەوە لێی ببووری.

**خودا فەرمووی:** بڕۆن ئەوا لێتان خۆشبووم، لەدوای ئەوە بە سێ شەو کۆچی دوایی کرد.

**وتراوه:** پیاوێکی شەرابخۆر هاودەمەکانی خۆی کۆکردەوە، چوار درهەمی دا بە غولامێکی و فەرمانی پێکرد هەندێ میوە بۆ دانیشتنەکەی بکڕێت، گەنجەکە بە دەرگای دانیشتنی مەنصووری کوڕی عەماردا گوزەری کرد کە داوای کۆمەکی دەکرد بۆ کەسێکی هەژار و دەیوت: هەر کەس چوار درهەمی پێ بدات چوار دوعای بۆ دەکەم.

دەڵێت: گەنجەکە چوار درهەمەکەی پێدا، مەنصوور پێی وت: دەتەوێ چ دوعایەکت بۆ بکەم؟

گەنجەکە وتی: گەورەیەکم هەیە دەمەوێ رزگارم بێت لەدەستی.

مەنصوور دوعای ئەوەی بۆ کرد و وتی: دوعای ترت؟

گەنجەکە وتی: خودا بەرانبەر چوار درهەمەکە شتێکم پێبدات، ئەو دوعایەشی بۆ کرد و وتی: دوعایەکی تر؟

گەنجەکە وتی: خودا گەورەکەم وا لێ بکات تەوبە بکات و تەوبەی لێ قبووڵ بکات، مەنصوور ئەو دوعایەشی بۆ کرد و وتی: دوعاکەی ترت؟

خودا لە من و گەورەکەم و تۆ و ئەم خەڵکە خۆشببێت، مەنصوور دوایین دوعای بۆ کرد.

گەنجەکە گەڕایەوە بۆ لای گەورەکەی، ئەویش لێی پرسی: بۆ دواکەوتیت؟

گەنجەکە چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، گەورەکەی وتی: چ دوعایەکی کرد، وتی: داوای ئازادکردنی خۆم کرد، گەورەکەی وتی: بڕۆ تۆ ئازادیت، پرسی دووەم دوعا چی بوو؟

وتی: داوام کرد بەرانبەر ئەو چوار درهەمە خودا شتێکم پێ بدات، گەورەکەی وتی: ئەوە چوار هەزار درهەم بۆ تۆ، دوعای سێیەم چی بوو؟

وتی: داوام کرد خودا وات لێ بکات تەوبە بکەی، وتی: ئەوە بڕیارم دا بۆ لای خودا بگەڕێمەوە و تەوبە لە گوناهان بکەم، دوعای چوارەم چی بوو؟

داوام کرد خودا لە تۆ و لە من و لەو خەڵکە خۆشببێت، گەورەکەی وتی: ئەمەیان بەدەستی من نییە، کاتێك شەوی بەسەردا هات پیاوەکە لە خەوندا بینی یەکێك پێی دەوت: تۆ ئەوەی لەسەرتە ئەنجامت دا، پێت وایە من ناتوانم ئەوەی لەسەرمە ئەنجامی بدەم، لە تۆ و لەو گەنجە و لە مەنصووری کوڕی عەمار و لەوانەی لەوێ ئامادەبوون خۆشبووم.

**وتراوە "رباح القيسي" حەجی زۆری کردووە، رۆژێك کە لەژێر پلوسکی بانی کەعبەدا وەستابوو وتی:** خودا ئەوەندە و ئەوەندە لە حەجەکانم بەخشی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و دەیان بۆ دە هاوەڵەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و دوانین بۆ باوك و دایکم و ئەوانیتر بۆ هەموو موسڵمانان، هیچ حەجێکی بە خۆی نەبەخشی، لەو کاتەدا گوێی لە بانگکەرێك بوو بانگی لێکرد و وتی: ئەو پیاوە سەخاوەت لەسەرمان دەنوێنێت، لە تۆ و دایك و باوکت خۆشدەبم، هەروەها لە هەموو ئەوانەی بە حەق شەهادەت دەهێنن.

**لە "عبدالوهاب بن عبدالمجید الثقفي"ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** جەنازەیەکم بینی سێ پیاو و ژنێك هەڵیانگرتبوو، دەڵێ: چوومە شوێنی ئافرەتەکە و هەڵمانگرت بۆ گۆڕستان و نوێژمان لەسەر کرد و شاردمانەوە، وتم بە ئافرەتەکە: ئەم کەسە چی تۆیە، وتی: کوڕمە، وتم: ئەی جیرانتان نەبوو لەگەڵتان بێت؟

وتی: با هەمانبوو، بەڵام بە کەم تەماشایان دەکرد، وتم: بـۆ ئـەم کەسـە چـی بـوو؟ وتی: نێرەمووك بوو، دەڵێ: بەزەییم پیایدا هاتەوە و بردمەوە بۆ ماڵەوە و هەندێ پارە و گەنم و جلوبەرگم پێدا.

ئەو شەوە نووستم، بینیم کەسێك هات بۆ لام وەك مانگی چواردە وابوو، پۆشاکێکی سپی لەبەردا بوو، شوکری دەکردم، پێم وت: تۆ کێی؟

وتـی: ئـەو کەسـە نێرەمووکـەم کـە ئـەمڕۆ بـە خاکتـان سـپاردم، بـە چـاوی سـووك تەماشاکردنم لەلایەن خەڵکییەوە خودا رەحمی بە من کرد.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** رۆژێـك **"أبـو عمـرو البيكنـدي"** بـە گەڕەکێکـدا گـوزەری کـرد، دەسـتەیەکی بـینی دەیانویست گەنجێك بـەهۆی رەوشـتخراپییەوە لـە گەڕەکەکـە دەربکـەن، ئـافرەتێکیش دەگریا، وترا ئەوە دایکییەتی، ئەبو عەمر بەزەیی بە گەنجەکەدا هاتـەوە، بۆیـە تکـای لەلای خەڵکەکە بۆ کرد، دەڵێ: پاش چەند رۆژێك بەو گەڕەکەدا گوزەری کرد گوێی لە گریانی پیرەژنەکە بـوو لـە پشـت دەرگـاوە، لـە دڵـی خۆیـدا وتـی: لەوانەیـە گەنجەکـە گەڕابێتەوە سەر کارە خراپەکانی خۆی و لە گەڕەکەکە دەرکرابێت، بۆیە تەقـەی دا لـە دەرگا و پرسیاری حاڵی گەنجەکەی لێ کرد، پیرەژنەکە پێی وت: کوڕەکەم مرد.

**پرسیاری حاڵی گەنجەکـەی لـێ کـرد، پیرەژنەکـە وتـی:** کاتێـك مـاوەی مردنـی نزیکبوویـەوە وتـی: هـەواڵی مردنەکـەم بـە جیرانـەکان مـەڵێ، چـونکە ئـازارم داوم و خۆشحاڵی بە مردنەکەم نیشان دەدەن، کاتێك منت بە خاك سپارد ئەم ئەنگوستیلەیە "بسم الله"ی لێ نووسراوە لەگەڵم بیشارەوە، کـە تـەواوبووی لـە شـاردنەوەم شـفاعەتم لەلای پەروەردگارم(ﷻ) بۆ بکە.

ژنەکە وتی: منیش وەسێتەکەم جێبەجێ کرد، کاتێك گۆڕەکـەم بـەجێهێلا گـوێم لـە دەنگی بوو دەیوت: دایە گیان برۆ، من هاتووم بۆ لای پەروەردگارێکی بەخشندە.

**وتراوە:** خودا وەحی بۆ داود(الطَّيْئِلاً) نارد و پێی فەرموو: پێیان بڵێ من ئەوانم دروست نەکردووە تا قازانجیان لێوە بەدەست بهێنم، بەڵکو دروستم کردوون بـۆ ئـەوەی قـازانجم لێوە بەدەست بهێنن.

**"إبراهيم الأطروش" دەڵێ:** لە بەغداد لە ڕۆخی دیجلەدا لەلای مەعرووفی کەرخی دانیشتبووین، دەستەیە گەنج لە بەلەمێکدا بە پاڵماندا گوزەریان کرد، دەفیان لێ دەدا و دەیانخواردەوە و یاریان دەکرد، وتمان بە شێخ مەعرووف: نابینی چۆن بەئاشکرا لە خودا یاخی دەبن و گوناھ ئەنجام دەدەن؟ دوعایەکیان لێ بکە.

ئەویش دەستی هەڵبڕی و وتی: خودایە وەك چۆن لە دونیا دڵخۆشت کردن لە دوارۆژیش دڵخۆشیان بکە.

ئەوانەی لەگەڵی بوون وتیان: ئێمە داوامان لێکردی دوعایان لێ بکەی نەك دوعایان بۆ بکەی.

وتی: گەر لە دوارۆژدا دڵخۆشیان بکات ئەوا تەوبەیان لێ قبووڵ دەکات.

**"أبو عبدالله الحسين بن عبدالله بن سعيد" دەڵێت:** دۆستایەتیم لەگەڵ قازی یەحیای کوڕی ئەکتەم هەبوو، خۆشیدەویستم و خۆشمدەویست، یەحیا کۆچی دوایی کرد، ئارەزووم بوو لە خەوندا بیبینم و پێی بڵێم: خودا چی لەگەڵ کردی، شەوێك لە خەوندا بینیم، پێم وت: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: لێمخۆش بوو، بەڵام سەرزەنشتی کردم، و پاشان پێی وتم: لە خانەی دونیادا کار و کردەوەکانت بەسەر مندا تێکەڵ کرد.

وتم: ئەی پەروەردگار، پشتم بە فەرموودەیەك بەستووە **"أبو معاوية الضرير"** لە **"الأعمش"**ەوە لە **"أبي صالح"**ەوە لە **"أبي هريرة"**ەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەفەرموێت: تۆ فەرمووتە: ((من شەرم دەکەم کەسی سەرسپی و ریش سپی(واتە پیر) لە ئاگردا بسووتێنم)) خودا فەرمووی: ئەوا لێت خۆشبووم ئەی یەحیا و پێغەمبەر(ﷺ) راستی فەرمووە، بەڵام لە خانەی دونیادا کار و کردەوەکانت بەسەر مندا تێکەڵ کرد)).

**١٠**

# حوزن

**((حوزن له هەموو روخسارێكدا چاكەیە گەر بە هۆی خراپە و تاوانەوە نەبێت..))**

**خودا (ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ﴾ فاطر: ٣٤

**له "أبی سعید الخدری"ەوە(خودا لێی رازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێت:** ((هەر شتێك تووشی بەندەیەكی باوەڕدار ببێت لە نەخۆشی یان ماندووبوون یان دڵتەنگی یان شتێك گوێی پێ نەدات خودا بە هۆیەوە لە گوناهەكانی هەڵدەوەرێنێت))[٢٣]

**حوزن:** حاڵێكە دڵ گرژدەكات لە جیابوونەوە لە دۆڵەكانی بێئاگایی.

حوزن لە خەسڵەتەكانی ئەهلی سلوكە.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** خاوەنی حوزن بە مانگێك ئەوەندە رێگەی خودا دەبڕێت كە كەسی بێ حوزن بە چەندین ساڵ نایبڕێت.

**لە ریوایەتێكدا هاتووە:** ((خودا هەموو دڵێكی حەزینی خۆشدەوێت))

**لە تەوراتدا هاتووە:** ((گەر خودا بەندەیەكی خۆشویست شیوەنگێڕێك لە دڵیدا دادەنێت، گەر رقی لە بەندەیەك بوو ئاهەنگێڕێك لە دڵیدا دادەنێت))

**ریوایەتكراوە:** پێغەمبەر(ﷺ) حوزنی بەردەوام بوو، بیركردنەوەی هەمیشەیی بوو.

[٢٣] {رواه الترمذي}.

**بیشری کوڕی حافی دەڵێت:** حوزن مەلیکە گەر لە شوێنێکدا نیشتەجێ بوو رازی نابێت کەسی تری لەگەڵ نیشتەجێ ببێت.

**وتراوە:** دڵ گەر حوزنی تێدا نەبێت وێرانەیە، وەك چۆن خانوویەك گەر کەسی تێدا نیشتەجێ نەبێت وێران دەبێت.

**"أبو سعيد القرشي" دەڵێت:** گریانی حوزن چاو کوێر دەکات، گریانی شەوقیش پەردە بەسەر چاودا دەهێنێت بەڵام کوێری ناکات، خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ٨٤﴾ یوسف: ٨٤

**ئیبن خەفیف دەڵێت:** حوزن بریتییە لە بەندکردنی نەفس لە هەستان بە خۆشی و شادی.

**رابیعەی عەدەوی گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت:** هاوار ئەم حوزنە مەزنە، ئەویش پێی وت: بڵێ، هاوار بۆ ئەم حوزنە کەمە، چونکە گەر دڵتەنگ بوویتایە نەتدەتوانی هەناسە بدەی.

**"سفيان بن عيينة" دەڵێت:** گەر دڵتەنگێك بۆ ئومەتێك بگری خودا رەحم بەو ئومەتە دەکات.

**"داود الطائي" هەمیشە حوزن زاڵ بوو بەسەریدا، لە شەودا دەیوت:** خودایە، خەمی تۆ هەموو خەمەکانی راگرتووم و ناهێڵێت تاوێك رابکشێم و خەو بچێتە چاوانم.

**هەروەها دەیوت:** کەسی حەزین چۆن دەتوانێ خۆشی ببینێت لە کاتێکدا بەردەوام موسیبەتی بۆ نوێ دەبێتەوە؟!

**وتراوە:** حوزن رێگرە لە خواردن، ترسیش رێگرە لە گوناه.

**پرسیار لە هەندێکیان کرا:** بە چیدا بەڵگە لەسەر حوزنی کەسێك دەهێنرێتەوە؟ وتی: بەناڵە و نرکەی زۆری.

**"السري السقطي" دەڵێت:** هیوام خواست حوزنی هەموو خەڵکی بدرێت بەسەر مندا.

**خەڵکی قسەیان لە حوزن کرد، هەموویان وتیان:** تەنها حوزنی دوارۆژ پەسەندە، بەڵام حوزنی دونیا ناپەسەندە.

بەڵام ئەبو عوسمانی حیری وتی: هەموو جۆرەکانی حوزن چاکەیە و بۆ باوەڕدار زیادەیەکە گەر بەهۆی گوناهەوە نەبێت، چونکە گەر تایبەتکردن پێویست نەکات پاڵفتەکردن پێویست دەکات.

لە هەندێ لە گەورە پیاوانەوە کاتێك یەکێك لە هاوەڵانی سەفەری دەکرد پێی دەوت: گەر کەسێکی دڵتەنگت بینی سەلامی منی لێ بکە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** هەندێ لە گەورە پیاوان لە کاتی خۆرئاوابووندا بە خۆریان دەوت: ئایا لە کاتی هەڵهاتنەوە تا ئاوابوون دڵتەنگێکت بینیوە؟

**هەر کەس حەسەنی بەصری** دەبینی وایدەزانی تازە موسیبەتێکی بەسەردا هاتووە.

**وەکیع دەڵێت:** کاتێك فوزەیل مرد حوزن لەو ڕۆژەدا زەوی بەجێهێڵا.

**هەندێ لە پێشین دەڵێن:** گەورەترین چاکە لە لاپەڕەی باوەڕداردا بریتییە لە خەم و دڵتەنگی.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەفەرموێ:** پێشین دەڵێن: هەموو شتێك زەکاتی لەسەرە، زەکاتی ئەقڵ بریتییە لە حوزنی دوورودرێژ.

**ڕۆژێك پرسیار کرا لە ئەبو عوسمانی حیری دەربارەی حوزن وتی:** کەسی دڵتەنگ کاتی نییە داوای حوزن بکات، هەوڵبدە بۆ داوای حوزن پاشان داوا بکە.

١١

# برسێتی و وازهێنـان له حەز

((برسێتی نووره.. تیری ئاگره.. حەزەکان وەك دار و چیلکه وان و گڕ و سووتانیان لێوه پەیدا دەبێت، ئاگرەکەی ناکوژێتەوه تا خاوەنەکەی نەسووتێنێ.))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ﴾ البقرة: ١٥٥، پاشان له کۆتایی ئایەتەکەدا فەرمووی: ﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾ مـژدەی پێـدان بـه پاداشـتی چـاکه بەهۆی ئارامگرتنیان لەسەر تاڵاوی برسێتی.

هەروەها خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾الحشر: ٩

**له ئەنەسی کوڕی مـالیکەوه(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:** ((فاتیمه(خودا لێی رازی بێت) پارچه نانێکی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبـەر(ﷺ) پرسـی: ئـەم پارچـه نانه چییه ئەی فاتیمه؟

فەرمووی: چەند دەنکه گەنمێك بوو کردم به نان، دڵم ئاسووده نـەدەبوو گـەر ئـەوەت بۆ نەهێنم.

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ئەمه یەکەمین خۆراکه له دوای سێ رۆژ دەمی بۆ دەبەم.

له هەندێ ریوایەتدا فاتیمه(خودا لێی رازی بێت) به هەندێ دەنکـه جـۆوه هـات بـۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)

بۆ ئەو مەبەستەیه برسێتی سـیفەتی ئـەهلی ئـەم رێگەیـە و یەکێکـه لـه پایـەکانی تێکۆشان، ئەهلی سلوك قۆناغ به قۆنـاغ خۆیـان لەسـەر برسـێتی و دەسـتگرتنەوه لـه

خۆراك راهێناوه، سەرچاوەكانی حیكمەتیان له برسێتیدا بینیوەتەوه و بەسەرهاتی زۆر لەو بارەیەوه خراونەته روو.

**ئیبن سالم دەڵێت:** ئەدەبی برسێتی ئەوەیە لێی كەم نەكەیەوه مەگەر بە ئەندازەی گوێی پشیلەیەك.

**وتراوه:** سەهلی كوڕی عەبدولا پازده رۆژ جارێك نانی دەخوارد، كاتێك دەچووه مانگی رەمەزان هیچی نەدەخوارد تا مانگی یەك شەوەی دەبینییەوه(واته تا رەمەزان تەواو دەبوو)، هەموو شەوێك بە ئاوێكی تنۆكاو رۆژووی دەشكاند.

**یەحیای كوڕی مەعاز دەڵێت:** گەر برسێتی له بازاڕ بفرۆشابا داخوازیكەرانی دوارۆژ كاتێك دەچوونە بازاڕ تەنها برسێتیان دەكڕی.

**سەهلی كوڕی عەبدولا دەفەرموێت:** كاتێك خودا دونیای دروست كرد یاخیبوون و نەزانی له تێرێتیدا دانا و زانست و حیكمەتی له برسێتیدا دانا.

**یەحیای كوڕی مەعاز دەفەرموێت:** برسێتی بۆ موریدان وەرزشە و بۆ تەوبەكاران ئەزموونە و بۆ زاهیدان رامهێنانە، و بۆ عاریفان رێزلێنانە.

**گوێم له مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** هەندێكیان چوونە لای شێخێكی مەزن، بینیان دەگری، پێیان وت: بۆ دەگریت؟

وتی: برسیمە.

وتیان: بۆ كەسی وەك تۆ له برسێتیدا دەگری؟!

وتی: بێدەنگ بە، ئەی نازانی مەبەستی ئەو(ﷻ) له برسێتی من ئەوەیە بگریم.

**موخەلەد دەڵێت:** حەجاجی كوڕی فەرافسە له شام لەگەڵمان بوو پەنجا شەو مایەوه ئاوی نەخواردەوه و پڕ بە سكی خۆی تێری نەدەخوارد لەوەی دەخرایه بەردەستی.

**ئەبو عەبدولا ئەحمەدی كوڕی یەحیای جەلا دەڵێت:** ئەبو تورابی نەخشەبی لە سارای بەصرەوه رۆیشت بۆ مەككە، پرسیاری خواردنمان لێكرد، وتی: لە بەصرە دەرچووم لە ئاوەدانی "**نەباج**" خواردنم خوارد، پاشان له ئاوەدانی "**ذات عرق**" لەوێشەوه بۆ لای ئێوه

(واتە مەککە)، ئەو سارایەی بە دوو ژەم خۆراك بڕی بوو.

**"عبدالعزيز بن عمير" دەڵێت:** جۆرێك لە باڵندە چل بەیانی برسی بوون، پاشان بە هەوادا فڕین، پاش چەند رۆژێك گەڕانەوە بۆنی میسکیان لێ بەرزدەبوویەوە.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا** کاتێك برسی دەبوو بەهێز دەبوو، کاتێکیش شتێکی دەخوارد لاواز دەبوو.

**ئەبو عوسمانی مەغریبیی دەڵێت:** کەسی رەبانی لە چل رۆژدا هیچ ناخوات، بەڵام کەسی صەمەدانی لە هەشتا رۆژدا هیچ ناخوات.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** کلیلی دونیا بریتییە لە تێری، کلیلی دوارۆژیش بریتییە لە برسێتی.

## بە سەهلی کوڕی عەبدوڵایان وت:

- کەسێك لە شەو و رۆژێکدا یەك ژەم خواردن دەخوات؟

+ وتی: ئەوە خواردنی صدیقانە.

- وتیان: دوو ژەم خواردن بخوات؟

+ وتی: خواردنی باوەڕدارانە.

- وتیان: سێ ژەم؟

+ وتی: بە خانەوادەکەی بڵێت ئاخوڕێکی بۆ دروست بکەن.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** برسێتی نوورە، و تێری ئاگر، حەزیش وەك دار و چیلکە وایە ئاگری لێوە پەیدا دەبێت، ئاگرەکەی ناکوژێتەوە تا خاوەنەکەی دەسووتێنێ.

**"أبو نصر السراج الطوسي" دەڵێت:** رۆژێك پیاوێکی صۆفی رۆیشت بۆ لای شێخێك، لەوێ خواردنی پێشکەش کرا..

پاشان پێی وت: چەند رۆژە خواردنت نەخواردووە؟

وتی: پێنج ڕۆژە، شێخەکە پێی وت: برسێتییەکەت برسێتی کەسێکی دەستنووقاوە، پۆشاکت بە بەرەوەیە و خۆت برسی دەکەی؟

ئەوە برسێتی هەژاری نییە!!

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** گەر بۆ ژەمی ئێوارە پاروویەك خواردن واز لێ بهێنم لەلام باشترە هەموو شەوەکەی شەونوێژ بکەم.

**"أبو القاسم جفر بن أحمد الرازي" دەڵێت: "أبو الخير العسقلاني"** چەندین ساڵ بوو حەزی لە ماسی بوو، پاشان لە جێگەیەکی حەڵاڵەوە بۆی ڕەوانە کرا، کاتێك دەستی بۆ درێژ کرد بۆ ئەوەی لێی بخوات دڕکێکی ماسییەکە چوو بە دەستیدا، بەهۆی ئەوەوە دەستێکی لەدەستدا، پاشان وتی: ئەی پەروەردگار، ئەمە بۆ کەسێك بە حەزی حەڵاڵ دەستی بۆ دەبات، ئەی دەبێ ئەو کەسەی بە حەزی حەرام دەستی بۆ دەبات حاڵی چۆن بێت؟!

**گوێم لە مامۆستا ئەبوبەکری کوڕی فۆرك بوو دەیوت:** ماڵ و منداڵ کە بەرهەمی حەزێکی حەڵاڵن مرۆڤ سەرقاڵ دەکەن، دەبێ گومانت چی بێت بە بابەتی حەزی حەرام؟!

**گوێم لە ڕۆستەمی شیرازی صۆفی بوو دەیوت:** ئەبو عەبدوڵای کوڕی خەفیف بانگهێش کرا بۆ دەعوەتێك، یەکێك لە هاوەڵانی بەر لە شێخ دەستی بۆ خواردنەکە برد، ئەوەش بە هۆی برسێتی زۆرەوە، هەندێ لە هاوەڵانی شێخ ویستیان سەرزەنشتی بکەن بەهۆی خراپی کارەکەیەوە، چونکە بەر لە شێخ دەستی بۆ خواردنەکە بردووە، بۆیە شتێك خرایە بەردەم کەسە هەژارەکە، ئەویش زانی ڕەخنە لە خراپی ئەدەبی گیراوە، بڕیاریدا پازدە ڕۆژ هیچ نەخوات وەك سزادانی نەفسی خۆی و ئەدەبدادانی و دەرخستنی تەوبەکەی لەو کەم ئەدەبییەی ئەنجامیداوە، بەر لەو پازدە ڕۆژەش لە ئەوپەڕی برسێتیدا بوو.

**جەعفەری کوڕی سولەیمان دەڵێت:** گوێم لە مالیکی کوڕی دینار بوو دەیوت: هەر کەس حەزە دونیاییەکان واز لێ بهێنێت شەیتان لە سێبەرەکەی هەڵدێت.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** گەر صۆفی لە دوای پێنج رۆژ هیچ نەخواردن بڵێت من برسیمە رەوانەی بازاڕی بکەنەوە و فەرمانی پێبکەن کاسبی بکات.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو-کە لە هەندێ گەورە پیاوانەوە دەیگێڕایەوەو- دەیوت:** ئەهلی دۆزەخ حەزەکانیان زاڵ بوو بەسەر خۆپارێزی ئەواندا، بۆیە رسوابوون.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** بە یەکێك لە پیاوانیان وت: حەز لە چی دەکەی؟ وتی: حەزم هەیە بەڵام خۆم دەپارێزم.

**هەروەها دەیوت: بە یەکێکیان وترا:** حەز لە هیچ ناکەی؟ وتی: حەز دەکەم حەز نەکەم، ئەمەش تێر و تەواوترە.

**ئەبو نەصری تەمار دەڵێت:** ئێوارەیەك بیشری حافی هات بۆ لام، وتم: حەمد بۆ ئەو خودایەی تۆی هێناوە بۆ لام، لە خۆراسانەوە لۆکەمان بۆ هاتووە، کچەکەم رستوویەتی و فرۆشتوویەتی و گۆشتی پێ کڕیوە، بۆیە لەلامان بەربانگ بکەرەوە.

لە وەڵامدا وتی: گەر لەلای کەسێك نانم بخواردبایە لەلای ئێوە نانم دەخوارد، پاشان وتی: چەندین ساڵە حەزم لە باینجانە بۆم رێنەکەوتووە بیخۆم، وتم: ژەمەکە باینجانی حەڵاڵی تێدایە، وتی: با حەزی باینجانم بۆ پاڵفتە ببێت ئەوکات دەیخۆم.

**"أبو أحمد الصغير" دەڵێت:** ئەبو عەبدوڵای کوڕی خەفیف فەرمانی پێکردم ئێوارەیەك دە دەنك مێوژی بۆ ببەم بۆ ئەوەی بەربانگی پێ بکاتەوە، ئەو شەوە سۆز و بەزەییم بۆی جووڵا و پازدە دانەم بۆ برد، سەرنجیدام و وتی: کێ فەرمانی پێکردی بەم کارە؟

دە دانەی لێخوارد و ئەوانیتر وازلێهێنا.

**ئەبو تورابی نەخشەبی دەڵێت:** تەنها یەك جار رێگەم لە نەفسی خۆم نەگرتووە، ئاواتی نان و هێلکەم خواست، من لە سەفەردا بووم، بۆیە لامدایە گوندێك، یەکێك هەستا و پێمەوە نووسا و وتی: ئەمە لەگەڵ دزەکانە، ئەوانیش گرتمیان و حەفتا داریان لێدام.

پاشان پیاوێك لەوان منی ناسییەوە و وتی: ئەمە ئەبو تورابی نەخشەبییە، بۆیە داوای لێبوردنیان لێکردم، پاشان یەکێك لەو پیاوانە منی بردەوە بۆماڵەوە، ئەوەش وەك ڕێزلێنان و بەزەییەك بەرانبەرم.. لەوێ نان و هێلکەی دەرخواردم، بە نەفسی خۆمم وت: بخۆ لە دوای حەفتا دار!!

## ١٢

# خوشوع و تەوازوع (کەمنەفسی)

**((کەسی خاشیع ئەو کەسەیە ئاگری حەزەکانی خامۆش بووە و دووکەڵی سینەی ئارام بووەتەوە و نووری بەمەزنڕاگرتنی خودا لە دڵیدا دەدرەوشێتەوە، بۆیە حەزەکانی مردوون)).**

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ۝٢ ﴾ المؤمنون:١-٢

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((هەر کەس گەردیلەیەك لوتبەرزی لە دڵیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە، هەر کەس گەردیلەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت ناچێتە ئاگرەوە، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێك پێیخۆشە جلوبەرگەکەی جوان بێت، فەرمووی: خودا(ﷻ) جوانە و جوانی خۆشدەوێت، لوتبەرزی وەرنەگرتنی حەق و سووك تەماشاکردنی خەڵکییە))

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:** ((پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی نەخۆشی دەکرد و جەنازەی بەڕێ دەکرد و سواری گوێدرێژ دەبوو، و دەچوو بە دەم بانگهێشی بەندەیەکەوە، لە ڕۆژی غەزوەی **"بني قريظة و بني نضير"**دا لەسەر گوێدرێژێك بوور ڕەشۆیەکی ریشاڵی لە ملدا بوو، کورتانێکی ریشاڵی لەسەر پشت بوو.

**خوشوع:** ملدان و گەردنکەچبوونە بۆ حەق.

**تەوازوعیش(کەمنەفسی):** بریتییە لە خۆڕادەستکردن بە حەق و وازهێنان لە بەرهەڵستکاری حوکم(واتە بڕیارە خوداییەکان)

**پرسیار لە هەندێکیان کرا دەربارەی خوشوع، لە وەڵامدا وتی:**

**خوشوع:** راستبوونەوەی دڵە لەبەردەم حەقدا(ﷻ) بە لێبڕانێکی مەزنەوە.

**هەروەها وتی:** لە نیشانەکانی خوشوعی بەندە ئەوەیە: کاتێك تووڕە دەکرێت یان سەرپێچی لێ دەکرێت یان بەڕوویدا دێنەوە قبووڵی بکات.

هەندێکیان دەڵێن: خوشوعی دڵ کۆتوبەندکردنی چاوە لە روانین.

**"محمد بن علي الترمذي" دەڵێت:** کەسی خاشع ئەو کەسەیە ئاگری حەزەکانی خامۆش بووە و دووکەڵی سینەی دامرکاوەتەوە و نووری بەمەزنڕاگرتنی خودا لە دڵیدا هەڵهاتووە، بۆیە حەزەکانی مردوون و دڵی زیندووبووەتەوە و ئەندامەکانی خوشوع رووی لێکردوون.

**حەسەنی بەصری دەڵێت: خوشوع:** ترسێکی هەمیشەیی پەیوەستە بە دڵەوە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی خوشوع، فەرمووی:** زەلیل بوونی دڵانە بۆ خودای زانا بە پەنهان.

**خودا(ﷻ) دەفەرمویت:**﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا ﴾ **الفرقان: ٦٣**، گوێم لە **مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** مانای "هونا" واتە بە تەوازوع و خوشوعەوە.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** ئەوانە ئەو کەسانەن کاتێك دەڕۆن نازانن بە نەعلەکانیانەوە خۆیان بابدەن.

**هەموو لەسەر ئەوە کۆدەنگیان هەیە جێگەی خوشوع بریتییە لە دڵ.**

یەکێکیان پیاوێکی بینی لە رواڵەتدا گرژ و مۆن بوو، چاوەکانی داخست بوو، دوو شانی خۆی کۆکردبووەوە، پێی وت: خوشوع لێرەدایە(ئاماژەی کرد بە سینەی) نەك ئا لەو جێگەدا(ئاماژەی بۆ هەردوو شانی کرد).

**ریوایەت کراوە پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی بینی لە نوێژەکەیدا یاری بە ریشی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** گەر دڵی ئەو کەسە خاشیع بوایە ئەندامەکانی خاشیع دەبوون))

**وتراوە:** مەرجی خوشوع لە نوێژدا ئەوەیە لەلای راست و چەپییەوە کەس نەناسێت و هەستیان پێ نەکات.

**مامۆستای ئیمام(ئیمامی قوشەیری) دەڵێت:** ئەگەری ئەوە هەیە بوترێت:

**خوشوع:** سەرداخستنی نهێنی و پەنهانە بە مەرجی ئەدەب بە بینینی **حەقەوە**(ﷻ).

**هەروەها دەوترێت:** خوشوع: کزی و ژاکانێکە روو لە دڵ دەکات لەباری دەرکەوتنی پەروەردگار(ﷻ) (واتە دەرکەوتنی نووری ناو و سیفەتەکانی نەك دەرکەوتنی زاتی خودای موتەعال).

**هەروەها دەوترێت:** خوشوع: توانەوەی دڵ و بزربوونیەتی لەباری دەرکەوتنی دەسەڵاتی حەقیقەتدا.

**هەروەها وتراوە:** خوشوع پێشەکییە بۆ زاڵبوونەکانی هەیبەت(پێشتر باسی هەیبەت کرا لە دەروازەی "ترس"دا)

**هەروەها وتراوە: خوشوع:** لەپڕ گرژبوونێکە لەباری پەردەلادان لەسەر حەقیقەت و دەرکەوتنی روو لە دڵ دەکات.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** کاتی خۆی ناپەسەند بوو پیاوێك زیاتر لەناو دڵی خوشوع لەسەر دەرەوەی نیشان بدات.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** گەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە لە شوێنیکدا دامبنێن جیا لەوەی نەفسی خۆمم تێدا داناوە ناتوانن.

**هەروەها وتراوە:** هەر کەس لەلای نەفسی خۆی کەمنەفس نەبێت لەلای کەسانی تر کەمنەفس نابێت.

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(رەحمەتی خودای لێ بێت)** تەنها لەسەر خۆڵ سوژدەی دەبرد.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە**(ﷺ) **دەفەرموێت:**((ناچێتە بەهەشتەوە هەرکەس گەردیلەیەك لوتبەرزی لەناو دڵیدا بێت))[٢٤]

[٢٤] {رواه مسلم}.

**موجاهد(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** کاتێك خودا قەومی نوحی نوقم کرد چیاکان سەری خۆیان بەرز تەماشا دەکرد، بەڵام چیای جودی سەری خۆی نەویکرد، بۆیە خودا(ﷻ) کردی بە شوێنی لەنگەرگرتنی کەشییەکەی نوح(علیه السلام).

**عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێی ڕازی بێت)** لە ڕۆیشتندا خێرا بوو، دەیوت: ئەمە بۆ پێویستییە و دووریشمان دەخاتەوە لە خۆنمایش کردن.

**شەوێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)** شتێکی دەنووسی و میوانێکی لەلا بوو، چراکە بەرەو کوژانەوە دەڕۆیشت، میوانەکە وتی: هەستم چراکە ڕۆشن بکەم؟

فەرمووی: نەخێر، بەخشندەیی نییە میوان بەکاربهێنی.

وتی: ئەو گەنجە ئاگادار بکەمەوە چاکی بکات؟

وتی: نا، چونکە تازە خەوی لێکەوتووە.

خۆی هەستا و ڕۆنی کردە چراکە، میوانەکە وتی: خۆت بە کارەکە هەستای ئەمیری باوەڕداران!!

وتی: ڕۆیشتم عومەر بووم و گەڕامەوە عومەر بووم.

**ئەبو سەعیدی خودری(خودا لێی ڕازی بێت) ریوایەتی کردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ):** ئالفی بە حوشتر دەدا، گسکی لە ماڵەوە دادا، و نەعلەکانی خۆی چاك دەکردەوە، و جلی خۆی پینە دەکرد و مەڕی دەدۆشی و لەگەڵ خزمەتکارەکە نانی دەخوارد، لەگەڵ خزمەتکارەکە گەنمی دەهاڕی گەر ماندووبوایە، شەرمی نەدەکرد گەر لە بازاڕەوە شتومەکی بۆ خانەوادەکەی هەڵبگرتبایە، لەگەڵ هەژار و دەوڵەمەند تەوقەی دەکرد، یەکەمجار ئەو سەلامی دەکرد، ئەو شتەی بۆی بانگهێش دەکرا بە کەم تەماشای نەدەکرد با خورمایەکی نەگەیویش بووبێت، کەسێکی بێ داوا بوو، ئەخلاقی نەرمونیان بوو، بەسروشت کەسێکی بەخشندە بوو، تێکەڵاوی جوان و باش بوو، روخسارێکی گەشاوە و کراوەی هەبوو، بزە لەسەر لێوانی بوو بێ پێکەنین، حوزن لە روخساریدا دەبینرا بەبێ گرژبوو، کەسێکی کەمنەفس بوو بەبێ زەلیلی، کەسێکی

دەستکراوە بوو بەبێ زیادەڕەوی، خاوەنی دڵێکی نەرم بوو، بەبەزەیی بوو بەرانبەر هەموو موسڵمانێك، قورقێنەی نەبوو بەهۆی تێرییەوە، دەستی بۆ تەماعێك درێژنەکردووە))

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** خوێنەرانی رەحمان(ﷻ) ئەوانەن خاوەنی خوشوع و کەمنەفسین، خوێنەرانی دەسەڵاتدارانیش خاوەنی خۆپەسەندی و لوتبەرزین.

**هەروەها فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** هەر کەس نرخ و بەهایەك بۆ نەفسی خۆی دابنێ لە تەوازوعدا هیچ بەشێکی نییە.

**پرسیار لە فوزەیل کرا دەربارەی تەوازوع وتی:** بچیتە ژێر حەقەوە و بۆی ملکەچ ببیت و هەر کەس حەقی وت تۆ لێی وەربگریت.

**هەروەها فوزەیل دەڵێت:** خودا(ﷻ) وەحی بۆ چیاکان نارد: مـن لەسەر یەکێك لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەرێك قسە دەکەم..

چیاکان هەموو گەردنی خۆیان بەرزکردەوە، بەڵام چیای سینا گەردنی خۆی کەچکرد، بۆیە خودا(ﷻ) لەسەر ئەو لەگەڵ موسا(ﷺ) قسەی کرد بەهۆی تەوازوعەکەیەوە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی تەوازوع وتی:** باڵی بەزەیی بۆ خەڵکی رابخەی و لەگەڵیان نەرمونیان بیت.

**وەهب دەڵێت:** لە هەندێ لەو کتێبانەی خودا دایبەزاندوون نووسراوە: ((من لە پشتی ئادەم نەوەکانیم دەرهێناوە، هیچ دڵێکم نەبینییەوە لە دڵی موسا(ﷺ) تەوازوعی زیاتر بێت بۆیە هەڵمبژارد و قسەم لەگەڵ کرد))

**ئیبن موبارەك دەڵێت:** لوتبەرزی بەسەر دەوڵەمەندانـدا و تەوازوع بۆ هەژاران جۆرێکە لە تەوازوع.

**وترا بە ئەبی یەزید:** کەی کەسێك دەبێت بە کەسێکی کەمنەفس؟

وتی: گەر مەقام و حاڵی بۆ نەفسی خۆی نەبینی و پێیوابوو لەناو خەڵکیدا کەسێکی تر بوونی نییە لەو خراپتر بێت.

**وتراوە:** تەوازوع نیعمەتێکە حەسودی لەسەر ناکرێت، لوتبەرزی بەڵایەکە رەحمەتی لەسەر ناکرێت، عیززەت لە تەوازوعدایە، هەر کەس لە لوتبەرزیدا داوای عیززەت بکات نایبینێتەوە.

**ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەڵێت:** گەورەیی و مەزنی لە تەوازوعدایە، عیززەت لە خۆپارێزیدایە، ئازادیش لە قەناعەتدایە.

**سوفیانی سەوری دەڵێت:** بە عیززەترین و بەڕێزترین دروستکراو پێنج نەفسە:

زانایەکی زاهید، و فەقیهێکی سۆفی، و دەوڵەمەندێکی کەمنەفس و هەژارێکی شوکرکار و کەسێکی شکۆمەند و دەسەڵاتدار لەسەر رەوگە و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەنگاوهەڵبگرێت.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** تەوازوع لە هەموو کەسێکە جوانە، بەڵام لە دەوڵەمەند جوانترە، لوتبەرزی لە هەموو کەس ناشیرینە، بەڵام لە کەسێکی هەژار ناشیرینترە..

**ئیبن عەتا دەڵێ:** تەوازوع وەرگرتنی حەقە لە هەر کەسێکەوە بێت.

**وتراوە:** زەیدی کوڕی سابت(خودا لێی رازی بێت) سواری ئەسپێك بووبوو، عەبدولای کوڕی عەباس(خوایان لێ رازی بێت) لێی نزیك بوویەوە تاکو رەشۆی ئەسپەکەی بۆ بگرێت، ئەویش پێی وت: چی دەکەی کوڕی مامەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، عەبدولا فەرمووی: بەم جۆرە فەرمانمان پێکراوە لەگەڵ زانایانمان مامەڵە بکەین)).

**زەیدی کوڕی سابت دەستی ئیبن عەباسی گرت و ماچی کرد و وتی:** ئێمەش بەم جۆرە فەرمانمان پێکراوە لەگەڵ خانەوادەی پێغەمبەرەکەمان مامەڵە بکەین.

**عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێت:** عومەری کوڕی خەتابم بینی جەوەندەیە ئاوی لەسەر شان بوو، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەو کارە بۆ تۆ شیاو نییە!!

فەرمووی: کە وەفدەکان هاتن و گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆیان بۆم نیشاندا شتێك لە لوتبەرزی چووە ناو نەفسمەوە ویستم بیشکێنم.. جەوەندە ئاوەکەی برد بۆ ژووری ئافرەتێکی ئەنصاری و لە دەفەرێکیدا بۆی رِۆ کرد.

**"أبو نصر السراج الطوسي" دەڵێت:** ئەبو هورەیرە بینرا -کە ئەو کات ئەمیری مەدینە بوو- کۆڵێك دار بە پشتییەوە بوو و دەیوت: رێگە بکەنەوە و خۆتان لادەن بۆ ئەمیر.

**عەبدوڵای کوڕی رازی دەڵێت:** تەوازوع وازهێنانە لە جیاکاری لە خزمەتدا.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** هەر کەس بەها و نرخێك بۆ نەفسی دابنێت شیرینی خزمەت نابینێتەوە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** لوتبەرزی بەرانبەر ئەو کەسەی بە ماڵەکەی لوتبەرزی دەنوێنێت بەرانبەرت تەوازوعە.

**ئەبوبەکری شیبلی(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** زەلیلی من زەلیلی یەهودی پەکخستووە[٢٥].

**پیاوێك هات بۆ لای و شیبلی(رەحمەتی خودای لێ بێت) پێی وت:** تۆ چیت؟

وتی: گەورەم، ئەو خاڵەم لەژێر پیتی "باء"دایە.

وتی: تۆ خاوەن حاڵێکی راوەستاوی، چونکە مەقامت بە خۆت نەبەخشی.

**ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) دەڵێت:** خواردنەوەی ئاوی بەرماوەی براکەت جۆرێکە لە تەوازوعی پیاو.

**بیشر دەڵێت:** سەلام بکەن لە ئەهلی دونیا بە وازهێنان لە سەلامکردن لێیان.

شوعەیبی کوڕی حەرب دەڵێت: لە کاتی تەوافدا کەسێك بە ئەنیشکی لێیدام، منیش لامکردەوە بە لایدا، بینیم فوزەیلی کوڕی عەیازە، وتی: ئەی باوکی صالح گەر وا گومان دەبەی لەم مەوسیمی حەجەدا کەسێك بوونی هەیە لە من و تۆ خراپتر بێت ئەوا خراپترین گومانت بردووە.

**هەندێکیان دەڵێن:** لە تەواف کەسێکم بینی، دەستەیەك لە پیاوانی لە پێشییەوە بوون رێگەیان بۆ دەکردەوە و لە پێناوی ئەودا رێگریان دەکرد لە خەڵکی.. پاشان ئەو

---

[٢٥] {(ئاماژە بەو ئایەتە دەکات دەربارەی یەهود هاتووە:﴿ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوا إِلَّا بِحَبْلٍ مِنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِنَ النَّاسِ وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ ﴾آل عمران: ١١٢)}.

پیاوەم لەسەر پردی بەغداد بینی سواڵی دەکرد، سەرم لێی سوڕما.. ئەویش پێی وتم: من لە شوێنێکدا لوتبەرزیم نواند خەڵکی تیایدا تەوازوع دەنوێنن(واتە ماڵی خودا)، بۆیە خودا تاقیکردمەوە بە زەلیلی لە شوێنێکدا خەڵکی تیایدا لوتبەرزی دەنوێنن(سەر پردی بەغداد).

**هەواڵ بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گەیشت** یەکێك لە کوڕەکانی ئەنگوستیلەیەکی بە هەزار درهەم کڕیوە.. عومەریش بۆی نووسی: هەواڵم پێگەیشت ئەنگوستیلەیەکت بە هەزار درهەم پێگەیشتووە، کاتێك ئەم نووسراوەی منت پێگەیشت ئەنگوستیلەکە بفرۆشە و هەزار سکی پێ تێر بکە، و ئەنگوستیلەیەکی دوو درهەمی بکڕە و بەردە بەنرخەکەی ناوی با ئاسنی چینی بێت، لەسەریشی بنووسە: ((رەحمەتی خودا لە کەسێك رێزی نەفسی خۆی دەزانێت)).

**وتراوە:** کەسێکی بەندە بۆ هەندێ لە ئەمیرەکان بە نرخی هەزار درهەم خرایە روو، کاتێك پارەکەی هێنا نرخەکەی لا زۆر بوو بۆیە پەشیمان بوویەوە و پارەکەی گێڕایەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت، بەندەکە پێی وت: گەورەم بمکڕە چونکە بەرانبەر هەر درهەمێك لەو درهەمانە خەسڵەتێکم تێدایە هەزار درهەم دەهێنێت، ئەویش وتی: ئەوانە چین؟ وتی: کەمترین و نزمترینی ئەوەیە گەر بمکڕی و پێشکەشم بکەی بە هەموو بەندەکانی تر لە ناخەوە نیگەران نابم و دەزانم من بەندەی تۆم، بۆیە ئەمیرەکە کڕی.

**دەگێڕنەوە "رجاء بن حیوة" وتویەتی:** پۆشاکەکانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزم بە دوازدە درهەم خەملاند کاتێك لە خوتبەدا بوو: عەبایەك و عەمامەیەك و کراسێك و شەرواڵێك و دوو خوف و مێزەرێك بوو.

**وتراوە:** عەبدوڵای کوڕی محەمەدی کوڕی واسع بە شێوەیەك دەڕۆیشت بە رێگەدا کە پەسەند نەبوو، بۆیە باوکی پێی وت: دەزانی دایکتم بە چەند درهەم کڕی؟ بە سێ سەد درهەم، باوکیشت-خوا نموونەی زۆر نەکات لەناو موسڵماناندا- منم، کەچی تۆ بەم شێوەیە دەڕۆی بە رێگەدا ؟!.

**"حمدون القصار" دەڵێت:** تەوازوع ئەوەیە کەسێك نەبینی لە دین یان لە دونیا ئاتاج بە تۆ بێت.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێت:** لە موسڵمانبوونمەوە سێ جار سروور رووی لێ کردووم:

**جارێکیان لە کەشتییەکدا بووم پیاوێکی شۆخیکەری تێدا بوو دەیوت:** کاتی خۆی کۆیلەکانمان بەم جۆرە لە وڵاتی تورکەوە دەگرت و رادەکێشا (کاتێك دەیوت بەم جۆرە قژی سەری منی دەگرت و رایدەکێشا) منیش ئەوەم زۆر پێ خۆش بوو، چونکە کەسێك لە کەشتییەکەدا نەبوو لە من سووکتر بێت لەبەرچاوی.

**دووەم:** لە مزگەوتێك نەخۆش بووم، بانگوێژەکە هاتە ژوورەوە و پێی وتم: بچۆ دەرەوە.. منیش نەمدەتوانی بچمە دەرەوە، ئەویش لاقێکی گرتم و رایکێشام بۆ دەرەوەی مزگەوتەکە.

**سێیەم جار:** لە شام بووم و فەروێکم لەبەر بوو، سەرنجمدا نەمدەتوانی مووەکانی لە ئەسپێ جیابکەمەوە بە هۆی زۆری ئەسپێوە، ئەوەش دڵخۆشی کردم.

لە بەسەرهاتێکی تر لە ئیبراهیمەوە وتویەتی: هیچ کات بە قەدەر ئەو کاتە دڵخۆش نەبووم، من دانیشتبووم، پیاوێك هات و میزی کرد بە سەرمدا.

**وتراوە:** ئەبو زەڕ و بیلال(خوایان لێ رازی بێت) بوو بە ناخۆشییان، ئەبو زەڕ تانەی لە بیلال دا بەوەی رەشپێستە، ئەویش لای پێغەمبەر(ﷺ) شکاتی لێ کرد، **پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ئەی ئەبو زەڕ تۆ هێشتا شتێك لە لوتبەرزی سەردەمی نەفامیت تێدا ماوە..

**حەسەنی کوڕی عەلی(خوایان لێ رازی بێت)** بەپاڵ کۆمەڵێك منداڵدا تێپەڕی بینی لەتە نانیان بەدەستەوەیە، منداڵەکان داوایان لە حەسەن کرد ببێت بە میوانیان، ئەویش دابەزی و لەگەڵیان نانی خوارد..

پاشان هەڵیگرتن و بردنیەوە بۆ ماڵەوە و خواردنی پێدان و جلوپۆشاکی بۆ کڕین و فەرمووی: چاکەی ئەوان زۆرترە، چونکە تەنها ئەوەیان شك دەبرد دەرخواردنی منیان دا، بەڵام ئێمە زۆرترمان هەیە لەوەی پێماندراون.

**وتراوە:** عومەری کوڕی خەتاب قوماشی غەنیمەتی بەسەر هاوەڵاندا دابەش کرد، قوماشێکی یەمانی نارد بۆ مەعاز، ئەویش فرۆشتی و شەش بەندەی پێکڕی و ئازادی

کردن، ئەو هەواڵە بە عومەر گەیشتەوە و هێشتا هەر قوماشی لەدوای ئەوە دابەش دەکرد، قوماشێکی کەم بایەختر لەوەی بۆ نارد، مەعازیش سەرزەنشتی کرد، عومەریش پێی فەرموو: سەرزەنشتم لەسەر نییە، چونکە ئەوەی یەکەمت فرۆشت.

**مەعاز وتی:** باشە، بەشەکەی خۆمم پێ بدە، سوێندم خواردووە دەیکێشم بە سەرتدا.

عومەر فەرمووی: ئەوە سەرم لەبەر دەستی تۆیە..

## ١٣

# سەرپێچی لە نەفس و (باسی نەنگییەکانی)

**((یەکەم جار دڵت لە سەهو و نەفست لە لەهو و زمانت لە لەغو پاکبکەرەوە پاشان چۆنت دەوێ وا رێگەبگرەبەر))**

**خودا(ﷻ) دەفەرمویت:﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعات: ٤٠ - ٤١**

**لە جابری کوڕی عەبدولڵاوە(خوایان لێ رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((خراپترین شتێك دەترسم تووشی ئومەتەکەم ببێت: شوێنکەوتنی ئارەزوو و هیوا و ئاواتی درێژە، شوێنکەوتنی ئارەزوو رێگە لە حەق دەگرێت و ئاواتی دوور و درێژیش دوارۆژ لەبیردەباتەوە))[٢٦]

پاشان بزانە سەرپێچی لە نەفس سەری عیبادەتە، پرسیار لە گەورەپیاوان کرا دەربارەی ئیسلام وتیان: بریتییە لە سەربرینی نەفس بە شمشێری سەرپێچی لێکردنی.

بزانە هەر کەس تەقەدەرەکانی نەفس لە دڵیدا سەرهەڵبدات رۆشناییەکانی هۆگربوون بە خوداوە لە دڵی ئاوا دەبێت.

**"زو نونی مصری" دەڵێت:** کلیلی عیبادت بریتییە لە بیر، و نیشانە پێکانیش بریتییە لە سەرپێچی نەفس و ئارەزوو، سەرپێچی لەو دوانەش بریتییە لە وازهێنان لە حەزەکانیان.

---

[٢٦] {رواه ابن عدي}.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** لە هەویری نەفسدا بێئەدەبی بوونی هەیە، بەندەش فەرمانی پێکراوە پەیوەست بێت بە ئەدەبەوە، نەفس بە سروشتی خۆی بە مەیدانی سەرپێچیدا گوزەر دەکات، بەندەش بە تێکۆشانی لەو داوا خراپانە دەیگێڕێتەوە، هەر کەس رەشۆ بۆ نەفسی شل بکات لە خراپەکانیدا هاوبەشە.

**جونەید دەڵێت:** نەفس فەرمانکەرە بە خراپە: بانگکەرە بۆ تیاچوون، یارمەتیدەرە بۆ دوژمن(شەیتان) و شوێنکەوتەی ئارەزووە، تۆمەتبارە بە چەندین جۆر لە خراپە.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** هەر کەس بە بەردەوامی نەفسی تۆمەتبار نەکات و بە هەمیشەیی سەرپێچی لێ نەکات و لە هەموو رۆژەکانیدا نەفس رانەکێشێ بۆ ناو زەحمەت و ماندووبوونەکان کەسێکی فریوخواردووە، هەر کەس بە چاوی چاکە سەرنجی نەفسی خۆی بدات بووەتە مایەی تیاچوونی.

چۆن دروستە کەسێکی هۆشمەند لە نەفسی خۆی رازی بێت لە کاتێکدا بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز (یوسفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی خەلیل) (سەلامی خودا لەسەر هەموویان بێت) دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ یوسف: ٥٣

**ئیبن عەتا دەڵێت:** جونەید وتی: شەوێك خەوم لێ نەدەکەوت، هەستام بۆ خوێندنی ویردەکانم[٢٧]، تیایدا هەستم بە شیرینی و چێژی موناجات بۆ پەروەردگارم نەدەکرد، سەرسام بووم، ویستم بخەومەوە، بەڵام خەوم لێ نەکەوت، بۆیە هەستام و دانیشتم.. دیسانیش نەمتوانی دابنیشم، دەرگای ماڵەوەم کردەوە و چوومە دەرەوە، پیاوێکم بینی لە عەبایەکەوە پێچرا بوو لەسەر رێگەکە فڕێ درابوو.. کاتێك هەستی بە من کرد سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەی باوکی قاسم، لەو کاتەوە بە دڵ داوای تۆم کرد تۆ ئەو حاڵەت بەسەرهاتووە، وتم: گەورەم بەبێ هیچ مەوعیدێك؟! وتی: داوام کرد لەو کەسەی دڵان دەبزوێنێت ئەوەی دەمەوێت پێتی بگەیەنێت و دڵت ببزوێنێت.

وتم: خودا ئەوەی کرد، پێم بڵێ پێویستی تۆ چییە؟

[٢٧] {لە نوێژ و یادی خودا}.

وتی: کەی نەخۆشی نەفس دەبێ بە دەرمان و چارەسەری بۆ نەفس؟

وتم: گەر سەرپێچی لە ئارەزووی خۆی بکات نەخۆشییەکەی دەبێت بە دەرمان.

رووی لە نەفسی خۆی کرد و وتی: گوێبگرە، حەوت جار من ئەم وەڵامەم بە تۆ وت، بەڵام تۆ وتت هەر دەبێ لە دەمی جونەیدی ببیستم، ئەوا بیستت، پیاوەکە پشتی هەڵکرد و رۆیشت و لەدوای ئەوە نەمبینییەوە.

**"أبوبكر الطمستاني" دەڵێت:** نیعمەتی هەرە مەزن بریتییە لە دەرچوون لە نەفس، چونکە گەورەترین پەردەی نێوان تۆ و پەروەردگارە(ﷻ)

**سەهلی کوڕی عەبدولا دەفەرموێت:** باشترین بەندایەتییەك بەندایەتی خودای پێ بکرێت بریتییە لە سەرپێچی لە نەفس و ئارەزوو.

**پرسیار لە ئیبن عەتا کرا دەربارەی نزیکترین شت لە تووڕەیی خودا(ﷻ)، وتی:** بینینی نەفس و شانوشکۆی نەفس، خراپتریش لەوە داواکردنی پاداشتە لەسەر کاروکردەوەکانی.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** لە چیای "اللكام"(شوێنێکە لە شام) بووم، هەنارم بینی حەزم لێی کرد.. لێی نزیکبوومەوە و هەنارێکم هێنا، لەتم کرد بینیم ترشە، هەنارەکەم وازلێهێنا و رۆیشتم، پیاوێکم بینی راکشابوو و زەردەواڵە دەورەی لێ دابوو، وتم: سلام عليك، وتی: عليك السلام، ئەی ئیبراهیم، پێم وت: چۆن من دەناسی؟

وتی: هەر کەس خودا بناسێت هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە، وتم: دەبینم خاوەنی حاڵی خۆتی لەگەڵ خودا، بۆ داوای لێ ناکەی بتپارێزێت ئەو ئازار و نەخۆشییەت لێ بکاتەوە؟

وتی: منیش دەبینم تۆ حاڵێکت هەیە لەگەڵ خودا بۆ داوای لێ ناکەی حەزی هەنارت لێ دوور بخاتەوە، چونکە ئازاری گەستنی هەنار لە دوارۆژدایە، بەڵام ئازاری گەستنی زەردەواڵە لە دونیادایە، وازملێهێنا و رۆیشتم بە رێگەی خۆمدا.

**دەگێڕنەوە ئیبراهیمی کوڕی شەیبان وتوویەتی:** چل ساڵە شەوێکم لەژێر سەقفێك یان لەناو چواردیوارێك بەسەر نەبردووە، هەندێ کات حەزم کردووە پڕ بە سکی خۆم نیسکێنەیەك بخۆم، بەڵام بۆم رێنەکەوتووە..

سەردەمێك لە شام بووم، قاپێ نیسكێنەیان بۆ هێنام، شتێكم لێ خوارد و كەوتمە رێ.. كۆمەڵێك كوپەم بینی، وام هەست كرد شلەیان تێدا بێت وامدەزانی سركەیە، هەندێ كەس پێیان وتم: سەرنجی چی دەدەی؟ ئەوە نموونەی شەرابە و ئەوانەش كوپەی شەرابن..

**لە نەفسی خۆمدا وتم:** كەوابوو لەسەرم پێویست بوو.. رۆیشتمە ناو دوكانی شەرابەكە و دەستم بە رشتنی كوپە شەرابەكان كرد، من بەردەوام خەریكی رشتنی كوپە شەرابەكان بووم و خاوەنەكەی وایدەزانی بە فەرمانی سوڵتان دەیانرێژم، كاتێك زانی بە فەرمانی خۆمە، بردمی بۆ لای **"ابن طولون"**.. ئەویش فەرمانی كرد سەد دارم لێ بدەن، هەڵیاندامە زیندانەوە و ماوەیەك تیایدا مامەوە، تا مامۆستام ئەبو عەبدوڵای مەغریبی هات بۆ ئەو شارە و تكای بۆ كردم، كاتێك چاوی پێم كەوت وتی: تۆ چیت كردووە؟ وتم: تێرخواردنێك لە نیسكێنە بەرانبەر سەد دار، وتی: كەوابوو سەربەسەر رزگارت بووە[٢٨].

**جونەید دەڵێت گوێم لە "السري السقطي" بوو دەیوت:** ماوەی سی ساڵە یان چل ساڵە نەفسم حەز لە گێزەر دەكات بە دۆشاوی خورما یان بە هەنگوینەوە بە گوێم نەكردووە(لەوانەیە وەك مرەبای ئەم سەردەمە وابووبێت).

**هەروەها "أبو عبدالرحمن السلمي" دەڵێت:** گوێم لە باپیرم بوو دەیوت: ئافەتی بەندە رازیبوونییەتی لە خۆی بەو نەنگی و ناتەواویانەی تێیدایە.

**"الحسين بن علي القرمسي" دەڵێت:** عیسامی كوڕی یوسفی بەڵخی(كەسێكی دەسەڵاتدار بووە) شتێكی نارد بۆ **"حاتم الأصم"** ئەویش لێی وەرگرت، پێیوترا: بۆ لێت قبووڵ كرد؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: لە وەرگرتنی ئەو شتەدا زەلیلی نەفسی خۆم و عیززەتی ئەوم دەبینی، بەڵام لە رەدكردنەوەیدا عیززەتی نەفسی خۆم و زەلیلی ئەوم دەبینی، بۆیە عیززەتی ئەوم هەڵبژارد بەسەر عیززەتی خۆمدا و زەلیلی خۆمم هەڵبژارد بەسەر زەلیلی ئەودا.

---

[٢٨] {واتە بە هۆی ئەو سزا دونیاییەوە سزای دواڕۆژت-بە هۆی ئەو كارەوە- لەسەر هەڵگیراوە}.

**بە هەندێکیان وترا:** من دەمەوێت لەسەر یەکلابوونەوە بۆ خودا حەج بکەم (واتە چی بکەم باشە؟)

ئەویش پێی وت: یەکەمجار دڵت لە سەهو و نەفست لە لەهو و زمانت لە لەغو پاکبکەرەوە، پاشان چۆنت دەوێ بەو جۆرە رێگەبگرەبەر.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** هەر کەس لە شەوەکەیدا چاکە ئەنجام بدات رۆژەکەی پاداشت دەدرێتەوە، هەر کەسیش لە رۆژەکەیدا چاکە ئەنجام بدات شەوەکەی پاداشت دەدرێتەوە، هەر کەس لە وازهێنان لە حەزێك راست بکات خودا ئەو حەزەی لێ دووردەخاتەوە، خودا(ﷻ) بەخشندەترە لەوەی دڵێك سزا بدات حەزێکی لە پێناوی ئەودا(ﷻ) وازلێهێنا بێت.

**خودا(ﷻ) وەحی نارد بۆ داود(ﷺ) و فەرمووی:** ئەی داود، خۆت بپارێزە و بەئاگابە و هاوەڵانت لە خواردنی حەزلێکراوەکان ئاگاربکەرەوە، چونکە ئەو دڵانەی لە دونیادا بە حەزەکانەوە پەیوەستن هۆشیان لە من بێبەشە.

**پیاوێکیان بینی لە هەوادا دانیشت بوو، پێیان وت:** بە چی بەمە گەیشتووی؟

وتی: وازم لە هەوا(ئارەزوو) هێنا بۆیە خودا هەوا(با)ی بۆ رامهێنام.

**وتراوە:** گەر هەزار حەز بۆ باوەڕدار بخرێنە روو بە ترس لە سزای خودایی لە دڵیان دەردەکات، گەر تەنها یەك حەز بۆ کەسێکی بەدکار بخرێتە روو ئەو حەزە ترسی لە دڵدا ناهێڵێت.

**وتراوە:** رەشۆی خۆت مەدە دەست ئارەزوو، چونکە بەرەو تاریکستان هەنگاوت پێ هەڵدەگرێت.

**یوسفی کوڕی ئەسبات دەڵێت:** تەنها ترسێکی بێزارکەر و شەوقێکی نیگەرانکەر حەزەکان لە دڵدا دەسڕنەوە.

**"الخواص" دەڵێت:** هەر کەس حەزێکی وازلێهێنا و پاداشتەکەی لە دڵدا نەبینییەوە ئەو کەسە لە وازلێهێناندا راستی نەکردووە.

**"جعفر بن نصير" دەڵێت جونەید درهەمێکی پێدام و وتــی:** بـڕۆ هــەنجیر و لـوزی دێمیم بۆ بکڕە، منـیش هەسـتام بـە کڕینەکـە، کاتێـك بـەربانگی کـردەوە دەنکێکـی هەڵگرت و نایە ناو دەمییەوە، پاشان تفی کـردەوە و دەسـتی بـە گریـان کـرد و وتـی: هەڵیبگرە.

لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد، وتی: بانگکەرێك لە دڵمدا بانگی لێکـردم و پێـی وتم: تۆ شەرم ناکەی؟

حەزێك لە پێناوی مندا وازت لێهێناوە دواتر دەگەڕێیەوە سەری!

**وتویانە:**

**نون الهوان من الهوى مسروقة     وصريع كل هوى صريع هوان.**

(پیتی نونی وشەی"هوان-رسوایی" لە (الهوی-ئارەزوو) دزرا، کوژراوەکـانی هـەموو "هوی"یەك بریتییە لـە "هوان"(واتـە کوژراوەکـانی هـەموو ئارەزوویـەك بریتییـە لـە رسوایی)

بزانە نەفس کۆمەڵێك ئەخلاقی ناپەسەندی هەیە، لەوانە: حەسودی.

١٤

# حەسودی

((لە نیشانەکانی حەسودی: کاتێك دەیبینێت خۆی لیَ دەباتە بەرەوە.. کاتێکیش بزر دەبێت غەیبەتی دەکات و کاتێك تووشی موسیبەتێك دەبێت دەست بە ریشیدا دەهێنێت))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢﴾پاشان فەرمووی:﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥ ﴾ **الفلق: ١ - ٥**

سورەتەکە کە بە "پەناگرتن" بەناوبانگە بە باسی حەسوودی کۆتایی پێهێنا.

**لە ئیبن مەسعوودەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: سیَ شت بنچینەی هەموو خراپەیەکن خۆتان بپارێزن و لێیان بەئاگا بن:**

١. ئاگاتان لە لوتبەرزی بێت، چونکە ئیبلیس لوتبەرزی وای لێکرد سوژدە بۆ ئادەم نەبات.

٢. ئاگاتان لە هەڵپە بێت، چونکە هەڵپە وای لە ئادەم کرد لە بەری درەختەکە بخوات.

٣. ئاگاتان لە حەسوودی بێت، چونکە دوو کوڕەکەی ئادەم یەکێکیان ئەویتریانی بەهۆی حەسوودییەوە کوشت))[٢٩]

**هەندێکیان دەڵێن:** کەسی حەسوود نەرێکەری چاکە و نیعمەتە، چونکە بە بڕیاری خودای تاك و تەنها(ﷻ) رازی نییە.

**وتراویشە:** کەسی حەسوود نابێتە کەسێکی سەردار و پێشەوا.

---

[٢٩] {رواه ابن عساكر}.

لەسەر ئایەتی: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾ الأعراف: ٣٣ **وتراوە: "ما بطن"** واتە حەسوودی، لە هەندێ کتێبدا هاتووە: کەسی حەسوود دوژمنی نیعمەتەکانە.

**هەروەها وتراوە:** کاریگەری حەسەد لەسەر خۆت دەردەکەوێ بەر لەوەی لەسەر دوژمنەکەت دەربکەوێت.

**"الأصمعي" دەڵێت:** پیاوێکی ئەعرابیم بینی تەمەنی سەد و بیست ساڵ بوو، وتم: چەندە تەمەنت درێژە!

لە وەڵامدا وتی: حەسوودیم وازلێهێنا و تەمەنم درێژ بوو.

**ئیبن موبارەك دەڵێت:** حەمد بۆ ئەو خودایەی لە دڵی ئەمیرەکەمدا شتێکی دانەناوە کە لە دڵی حەسوودەکەمدا دایناوە.

**لە هەندێ ئاساردا هاتووە:** لە ئاسمانی پێنجەمدا فریشتەیەك هەیە کار و کردەوەی بەندەکانی پیادا تێدەپەڕێت، تیشك و روناکی کردەوەکان وەکو خۆر وایە، فریشتەکە بە کردارەکە دەڵێ: بوەستە من فریشتەی حەسوودیم، ئەو کردەوە بدەنەوە بە رووی خاوەنەکەیدا ئەو کەسێکی حەسوودە.

**موعاویە دەڵێت:** دەتوانم هەموو مرۆڤێك رازی بکەم جگە لە کەسێکی حەسوود ئەو تەنها بە تیاچوونی نیعمەت رازی دەبێت.

**وتراوە:** کەسی حەسوود ستەمکار و سەرکەشە و هەرچی شتە وێرانی دەکات.

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت:** هیچ ستەمکارێکم نەبینیوە لە ستەملێکراو بچێت جگە لە کەسی حەسوود، پەژارەیەکی بەردەوام و نەفسێك بە هەمیشەیی سەرنجی نیعمەتەکانی خەڵکی دەدات.

**هەروەها وتراوە: لە نیشانەکانی کەسی حەسوود ئەوەیە:**

١. کاتێك کەسەکە ئامادە دەبێت خۆی لێ دەباتە بەرەوە.

٢. کاتێك بزر و نادیار دەبێت غەیبەتی دەکات.

٣. و کاتێکیش تووشی موسیبەتێك دەبێت دەست بە ریشیدا دەهێنێت.

**هەروەها موعاویه دەڵێت:** لە سیفەتە ناپەسەندەکاندا هیچ سیفەتێك بە ئەندازەی حەسوودی دادپەروەر نییە بەر لە حەسوودپێبراوەکە کەسە حەسوودەکە دەکوژێت.

**هەروەها** وتراوە: **خودا**(ﷻ) **وەحی بۆ سولەیمانی کوڕی داود (علیهما السلام) نارد و پێی فەرموو: بە حەوت شت وەسێتت بۆ دەکەم:**

١. غەیبەتی بەندە صاڵحەکانم مەکە.

٢. حەسوودی بە هیچ بەندەیەکم مەبە، سولەیمان(ﷺ) فەرمووی: پەروەردگارم، ئەم دوانەم بەسە.

**وتراوە:** موسا(ﷺ) پیاوێکی لەلای عەرشی خودا بینی، خۆزگەی پێخواست، پرسیاری کرد: سیفەتی ئەو پیاوە چییە؟

وترا: حەسوودی بە خەڵکی نەدەبرد بەرانبەر ئەو نیعمەتانەی خودا لە چاکەی خۆی بە بەندەکانی دەبەخشی.

**وتراوە:** کەسی حەسوود کاتێك نیعمەتێك دەبینی سەرسام دەبێت، کاتێك زیان و تێکەوتن دەبینێ دەست بە ریشیدا دەهێنێت.

**هەروەها وتراوە:** گەر ویستت لە دەستی کەسی حەسوود رزگارت ببێت کارەکەی لێ بشێوێنە.

**وتراوە:** کەسی حەسوود پڕ لە کینەیە بەرانبەر کەسانێك گوناهێکیان نەکردووە و بەخیلە بە شتێك ئەو خاوەنی نییە.

**وتراوە:** لە چاکە و خۆشەویستی لەگەڵ کەسی حەسوود خۆت ماندوو مەکە، چونکە ئەو چاکەکانی تۆی قبووڵ نییە.

**وتراوە:** گەر خودا بیەوێت دوژمنێك بەسەر بەندەیەکدا زاڵ بکات و بەزەیی پیایدا نەیەتەوە کەسێکی حەسوودی بۆ رەوانە دەکات.

لەو بارەوە وتراوە:

**كل عداوة قد ترجى إماتتها    إلا عداوة من عاداك من حسد**

(هەموو دوژمنایەتییەك رجای کۆتاپێهێنانی هەیە، جگە لە دوژمنایەتییەك لە حەسەدەوە دەستدرێژی بکاتە سەرت)

**هەروەها وتراوە:**

**قل للحسود إذا تنفس: طعنة يا ظالما وكأنه مظلوم**

(بڵێ بە حەسوود -گەر هەناسەی ئاسوودەیی هەڵکێشا- خودا بتکوژێت، ئەی ستەمکار وەك ئەوەی ستەملێکراو بیت)

**هەروەها وتراوە:**

**وإذا أراد الله نشر فضيلة طويت أتاح لها لسان حسود**

(گەر خودا ویستی چاکەیەکی پێچراوە بلاوە پێ بکات زمانی حەسوودی بۆ دەخاتە دەگەڕ)

هەروەها لە ئەخلاقە ناپەسەندەکانی نەفس: ئالوودەبوونە بە غەیبەتەوە.

۞ ۞ ۞

١٥

# غەیبەت

((هەرکەس پۆشاکی حەیا فڕێ بدات غەیبەتی نییە))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ﴾الحجرات: ١٢**

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) پیاوێك هەستایە سەرپێی-ئەو بەر لە هەستانی لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبوو- هەندێ لەوانەی لەوێ بوون وتیان:** فلان چەندە دەستەوسانە.. **پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** براکەی خۆتان خوارد و غەیبەتتان کرد))[٣٠]

**خودا(ﷻ) وەحی بۆ موسا(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو:** ((هەر کەس تەوبەی لە غەیبەت کردبێت و بمرێت دوایین کەسە دەچێتە بەهەشت، هەر کەس بەردەوام بێت لەسەری و بمرێت یەکەمین کەسە دەچێتە ناو ئاگرەوە))

**عەوف دەڵێت:** چووم بۆ لای ئیبن سیرین غەیبەتی "حەجاج"م کرد، ئیبن سیرین پێی وتم: خودا(سبحانه وتعالى) حەکەمێکی دادپەروەرە، وەك چۆن مافەکان لە "حەجاج" وەردەگرێتەوە هەر بەو جۆرە مافەکانیشی بۆ وەردەگرێتەوە، تۆ کە سبەینێ بە خودا(سبحانه وتعالى) دەگەیت بچووکترین گوناهێك ئەنجامت دابێت لە گەورەترین گوناهی "حەجاج" ئەنجامی دابێت لات دزێوارترە.

**وتراوە:** ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بانگهێشکرا بۆ دەعوەتێك، ئەویش ئامادە بوو، دانیشتوان باسی پیاوێکیان کرد نەهاتبوو بۆ لایان، و وتیان: ئەو پیاوێکی قورس و

---

[٣٠] {رواه أبو يعلى والطبراني}.

تەمبەڵە.. ئیبراهیم وتی: ئەم گوێگرتنە لە غەیبەت نەفسم پێی کردم، چونکە لە شوێنێك ئامادە بووم غەیبەتی خەڵکی تێدا دەکرێت، بۆیە ڕۆیشت و سێ ڕۆژ هیچی نەخوارد.

**هەروەها وتراوە:** نموونەی ئەو کەسەی غەیبەتی خەڵکی دەکات وەك ئەو کەسە وایە مەنجەنیقێکی داناوە و چاکەکانی خۆی بەرەو خۆرهەڵات و خۆرئاوا هەڵدەدات، غەیبەتی کەسێکی خۆراسانی دەکات، پاشان کەسێکی تورکی، بەو جۆرە چاکەکانی خۆی بڵاوە پێ دەکات و هەڵدەستێتە سەرپێ و هیچ چاکەیەکی لەگەڵ نەماوە..

**وتراوە:** لە ڕۆژی دواییدا نووسراوی کردارەکان دەدرێتە دەست بەندەیەك و هیچ چاکەیەکی تێدا نابینێتەوە، دەڵێت: کوا نوێژ و ڕۆژ و چاکەکانم؟

دەوترێت: هەموو کردارەکانت ڕۆیشتن.

**وتراوە:** هەر کەس بە غەیبەتێك غەیبەتکرابێت خودا لە نیوەی گوناهەکانی خۆشدەبێت.

**سوفیانی کوڕی حوسەین دەڵێت:** لەلای ئیناسی کوڕی موعاویە دانیشتبووم باسی کەسێکم کرد.. ئەویش پێی وتم: ئایا ئەم ساڵ غەزای تورك و ڕۆمت کردووە؟

وتم: نەخێر.. وتی: تورك و ڕۆم لە دەستت سەلامەت بوون، بەڵام برا موسڵمانەکەت لە زمانت سەلامەت نەبوو!

**وتراوە:** نووسراوی کردارەکان دەدرێتە دەست کەسێك.. هەندێ چاکەی تێدا دەبینێت ئەنجامی نەداون، پێی دەوترێت: ئەمە بە هۆی ئەوەوە بوو خەڵکی غەیبەتی دەکردی و تۆ هەستت پێ نەدەکرد.

**پرسیار لە سوفیانی سەوری کرا دەربارەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ):** ((خودا ڕقی لە خانەوادەی گۆشتن دەبێتەوە)) وتی: ئەوانە ئەو کەسانەن غەیبەتی خەڵکی دەکەن و گۆشتی خەڵکی دەخۆن..

**لەلای عەبدوڵای کوڕی موبارەك باسی غەیبەت کرا وتی:** گەر غەیبەتی کەسێك بکەم غەیبەتی باوك و دایکم دەکەم، چونکە لەپێشترن بە چاکەکانم..

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت: با بەشی باوەڕدار لە تۆدا سێ خەسڵەت بێت:**

گەر سوودی پێ ناگەیەنیت زیانی پێ مەگەیەنە، گەر ئاسوودە و دڵخۆشی ناکەی خەم و پەژارەی پێ مەدە، گەر ناوی چاکەی ناهێنی غەیبەتی مەکە.

**بە حەسەنی بەصری وترا:** فلان کەس غەیبەتی کردی.. ئەویش پڕ دەورییەك حەڵوای بۆ نارد و وتی: هەواڵم پێدرا هەندێ لە چاکەکانی خۆتت بۆ ڕەوانە کردووم منیش ویستم پاداشتت بدەمەوە.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:** پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەر کەس پۆشاکی حەیا لەڕووی خۆی هەڵماڵێت غەیبەتی بۆ نییە[٣١].

**جونەید دەفەرموێت:** لە مزگەوتی شۆنزێ(مزگەوتێ بووە لە بەغدا، بە ناوەکەیدا وادیارە لە قەراغ زێی دیجلە بووە(شوێن+زێ) دانیشتبووم چاوەڕوانی جەنازەیەکم دەکرد نوێژی لەسەر بکەم، خەڵکی بەغداد بە چین و توێژەکانییەوە چاوەڕوانی جەنازەکە بوون، کەسێکی هەژارم بینی ئاساری زوهد و ماندووبوونی پێوە دیاربوو بە ناو خەڵکەکەدا سواڵی دەکرد، لە نەفسی خۆمدا وتم: گەر ئەو پیاوە کارێکی بۆ خۆی بکردبایە و پارێزگاری لە نەفسی خۆی پێ بکردبایە باشتر بوو بۆی.

کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، شەوان شتێك لە خوێندنی ویردم هەبوو، تەنانەت گریان و نوێژ و کاری تریش هەموو ئەوانە و ویردەکانم لەسەر سەخت و گران بوون.. ئەو شەوە نەخەوتم و دانیشتم.. چاوەکانم خەویان لێ کەوت.. ئەو پیاوە هەژارەم بینی.. لەسەر سفرەیەکی ڕاخراو پیاوەکەیان بۆ من هێنا و پێیان وتم: گۆشتەکەی بخۆ، چونکە غەیبەتت کرد.. منیش لە حاڵەکە تێگەیشتم و وتم: غەیبەتم نەکردووە، بەڵکو تەنها شتێکم لە نەفسی خۆمدا وت، پێم وترا: تۆ لەو کەسانە نیت ئەو شتانەت لێ قبووڵ بکرێت، بڕۆ و گەردنی خۆتی پێ ئازاد بکە.

---

[٣١] {رواه البيهقي}.

ڕۆژم لێ بوویەوە.. بەردەوام بەدوایدا گەڕام تا لە شوێنێك دۆزیمـەوە، بینـیم لـە نـاو ئاوێك شت هەڵدەگرێتەوە، کاتێك ئاوەکە بەرز دەبوویەوە و زیادی دەکرد گەڵای پاقلەی لێ دەردەهێنا، ئەو گەڵانە بە هۆی شۆردنەوەی پاقلەوە لە ئاوەکـەدا لەلایـەن کەسـانی ترەوە بەربووبوونەوە بۆ ناو ئاوەکە و ئەویش دەیگرتنەوە، سەلامم لێ کرد، وتی: ئـەبو قاسم جارێکی تر دەگەڕێیەوە سەر ئەو کارەت؟

وتم: نەخێر، وتی: خودا لە ئێمە و لە ئێوەش خۆشببێت.

**ئـەبو جەعفـەری بـەڵخی دەڵێـت:** گـەنجێکی ئـەهلی شـاری بـەڵخمان لـەلا بـوو، تێکۆشانی دەکرد و خوداپەرستی ئەنجام دەدا، بەڵام بە هەمیشەیی غـەیبـەتی خـەڵکی دەکرد و دەیوت: فلان کەس ئاوایە و فلان کەس ئاوایە.. ڕۆژێك لای ئەو پیاوانە بینیم کە ڕەفتاریان ژنانە بوو و جـل و پۆشـاکیان بـۆ خـەڵکی دەشـۆری، کاتێـك لای ئـەوان ڕۆیشت، پێم وت: فلان کەس چیتە بۆ وات لێهاتووە؟

وتی: ئەو هـەموو غـەیبەتـەی خـەڵکی تووشـی ئەمـەی کـردم، لەگـەڵ یـەکێك لـەو نێرەمووکانەدا گرفتار بووم، دەبینی لە پێنـاوی ئـەودا خزمـەتی دەکـەم، هـەموو ئـەو حاڵانەی هەمبوون ڕۆیشتن و نەمان، داوا لە خودا بکە بەزەیی بە حاڵمدا بێتەوە.

۞ ۞ ۞

# ١٦

# قەناعەت

((هەر کەس چاوەکانی بڕوانێت بە دوای ئەوەی لە دەستی خەڵکیدایە دڵتەنگییەکەی درێژە دەکێشێت..))

**خودا (ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ﴾ النحل: ٩٧

**لە جابری کوڕی عەبدولڵاوە (خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرمووی:** ((قەناعەت گەنجینەیەکە کۆتایی پێ نایەت))[٣٢]

**لە ئەبی هورەیرەوە (خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی:** ((واریع بە دەبیت بە خوداپەرستترین کەس، قانع بە دەبیت بە شاکیرترین کەس، ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت دەبیت بە باوەڕدار، بە چاکە جیرانی ئەو کەسە بکە جیرانیت دەکات دەبیت بە موسڵمان، پێکەنین کەم بکەرەوە، چونکە زۆری پێکەنین دڵ دەمرێنێت))[٣٣]

**وتراوە:** هەزاران مردوون جگە لەو کەسانەی بە عیززەتی قەناعەت زیندووی کردوونەتەوە.

**بیشری حافی دەڵێت:** قەناعەت مەلیکێکە تەنها لە دڵی باوەڕداردا نیشتەجێ دەبێت.

---

[٣٢] {رواه القضاعي}.

[٣٣] {رواه البيهقي}.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** قەناعەت لە رازیبووندا وەك وەرع وایە لە زوهددا، ئەمەیان سەرەتای رازیبوونە و ئەوەشیان سەرەتای زوهدە.

**وتراوە: قەناعەت:** بریتییە لە سوکنایی لە باری نەبوونی دەقپێوەگیراوەکاندا.

**ئەبوبەکری مەراغی دەڵێت:** کەسی هۆشمەند ئەو کەسەیە بە قەناعەت و دواخستن کاری دونیای خۆی بەڕێدەکات و بە هەڵپە و پەلەکردن کاری دوارۆژی خۆی ئەنجام دەدات و بە زانست و تێکۆشانیش کاروباری ئایینی خۆی رێکدەخات.

**ئەبو عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** قەناعەت وازهێنانە لە تامەزرۆبوون بۆ ئەو شتەی نیتە و بێنیازبوونە لەو شتەی بەدەستت هێناوە.

**لەسەر مانای ئایەتی:** ﴿لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾ **الحج: ٥٨** وتراوە: "رزقا حسنا" بریتییە لە قەناعەت.

**"محمد بن علي الترمذي" دەڵێت:** قەناعەت رازیبوونی نەفسە بەوەی بۆی بڕاوەتەوە لە رۆزی.

**وتراوە:** قەناعەت بریتییە لە رازیبوون بەوەی هەیە و نەمانی تەماع لەو شتەی بەدەستی نەهێناوە.

**وەهب دەڵێت:** عیززەت و بێنیازی رۆیشتن بۆ گەڕان و بەدوای هاوەڵێکدا دەگەڕان بە قەناعەت گەیشتن و لەگەڵی جێگیربوون.

**وتراوە:** هەر کەس قەناعەتەکەی زۆر بێت شتی کەمی لا خۆش و شیرین دەبێت، هەر کەس لە هەموو بارەکاندا بگەڕێتەوە بۆ لای خودا خودا قەناعەتی پێ دەبەخشێت.

**وتراوە:** ئەبو حازم بە پاڵ گۆشتفرۆشێکدا گوزەری کرد گۆشتی قەڵەوی لەلا بوو، وتی: ئەبو حازم گۆشت ببەرەوە گۆشتەکەی قەڵەو و جوانە، وتی: پارەم پێ نییە، گۆشتفرۆشەکە وتی: لێت دەوەستم، وتی: نەفسم باشتر مۆڵەتم دەدات و لێم دەخایەنێت هەتا تۆ.

**بە هەندێکیان وترا:** کێ لە هەموو کەس قەناعەتی باشترە؟

وتی: ئەو کەسەی لە هەموو کەس زیاتر کۆمەکی خەڵکی بکات و لە هەموو کەس کەمتر ئەرکی بەسەر خەڵکییەوە بێت.

**لە زەبووردا هاتووە:** کەسی قانیع دەوڵەمەندە با برسیشی بێت.

**وتراوە: خودا پێنج شتی لە پێنج شتدا داناوە:**

١. عیززەت لە گوێڕایەڵیدا.

٢. زەلیلی لە یاخیبووندا.

٣. هەیبەت لە شەونوێژدا.

٤. حیکمەت لە سکی خاڵیدا.

٥. دەوڵەمەندی لە قەناعەتدا.

**ئیبراهیم مارستانی دەڵێت:** بە قەناعەت تۆڵە لە هەڵپە بستێنە، وەك چۆن تۆڵە لە دوژمنەکەت دەکەیەوە.

**"زونونی مصری" دەڵێت:** هەر کەس قەناعەتی هەبێت لە دەست خەڵکی سەردەمی خۆی ئاسوودە دەبێت و بەسەر هاودەمەکانی خۆیدا پێشدەکەوێت.

**وتراوە:** هەر کەس قەناعەتی هەبێت لە سەرقاڵی پشوو دەدات و بەسەر هەمواندا پێش دەکەوێت.

**"الكتاني" دەڵێت:** هەر کەس هەڵپە بە قەناعەت بفرۆشێت عیززەت و پیاوەتی و جوامێری بەدەست دەهێنێت.

**هەروەها** وتراوە: هەر کەس چاوی لەوە بێت لە دەستی خەڵکیدایە دڵتەنگییەکەی درێژە دەکێشێت.

**لەو بارەیەوە وتراوە:**

**وأحسن بالفتى من يوم عار ينال به الغنى كرم و جوع**

(بەخشندەیی و برسێتی بۆ جوامێر لە ڕۆژی ڕسواییدا دەوڵەمەندی بۆ بەدەستدەهێنێت)

**وتراوه:** پیاوێك كەسێكی دانای بینی ئەوەی لە سەوزە دەكەوتە سەر ئـاو دەیخـوارد، پێی وت: گەر خزمەتی دەسەڵاتت بكردبایە ئاتاج نەدەبووی بە خواردنی ئەوە.

داناكە پێی وت: تۆش گەر قەناعەتت بە خواردنی ئەمە هەبوایە ئاتاج نەدەبووی بـە دەرگای سوڵتان.

**وتراوە:** باز(باڵندەی راوكەر) لە فڕینیدا دەگمەنە، روانین و تەماعی راوچی ناگاتیێ، گەر بە تەمای خواردن بوو لە لاكێكی تۆپیو دەبێت بە تۆڕەكەوە، و لە بەرزی و بڵندی خۆی بەردەبێتەوە و دەكەوێتە داوی راوچییەكەوە.

**وتراوە:** كاتێك موسا(عليه السلام) بە باسی تەماع هاتە گۆ وتی بە پیاو چاكەكە: ﴿لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾﴾ **الكهف: ٧٧**

**"خضر"** پێی وت: ﴿قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾ **الكهف: ٧٨**

**وتراوە:** كاتێك موسا(عليه السلام) ئەوەی وت ئاسكێك لەبەردەم موسا و **"خضر"**(علیهمـا السـلام) وەسـتا، ئـەوان ئـەو كاتـە زۆریـان برسـی بـوو، لای ئاسـكەكە كـە رووی لـە موسا(عليه السلام) بوو نەبرژابوو، بەڵام لایەكەی **"خضر"** برژا بوو.

**دەربارەی ئایەتی:** ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿١٣﴾﴾ **الانفطار: ١٣ وتراوە:** ئەو "نعیم"ە بریتییە لە قەناعەت لە دونیادا، دەربارەی ئایەتی: ﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴿١٤﴾﴾ **الانفطار: ١٤** وتراوە: بریتییە لە هەڵپە بۆ دونیا.

**دەربارەی ئایەتی:** ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾﴾ **البلد: ١٣ وتراوە:** واتە لە زەلیلی تەماع نەفست رزگار بكە.

**دەربارەی ئایەتی:** ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ **الأحزاب: ٣٣ وتراوە:** واتە لە چرووكی و لە هەڵپە پاكتان دەكاتەوە، ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ واتە بە سەخاوەتی و بە هەڵبژاردنی پێویستی خەڵك بەسەر پێویستی خۆیاندا.

**دەربارەی ئایەتی:** ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ ﴾ **ص: ٣٥ وتراوە:** واتە "مەقام"ێك لە قەناعەتم پێ ببەخشە کە لە هاوشێوەکانی خۆم پێی جیاببمەوە و رازی بم بە بڕیار و بەشی تۆ.

**دەربارەی ئایەتی:** ﴿ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾ **النمل: ٢١ وتراوە:** سزای توند: واتە قەناعەتی لێ دەگرمەوە، واتە داوا لە خودا دەکەم ئەو کارەی پێ بکات.

**بە ئەبو یەزید وترا: بە چی بەم پلە و پایە بەرزە گەیشتووی؟**

وتی: هۆیەکانی دونیام کۆکردەوە و هەموویانم بە پەتی قەناعەتەوە گرێدا و خستمنە ناو مەنجەنیقی صدقەوە و هەڵمدانە ناو دەریای بێهیوابوون لێیان و لەدوای ئەوە ئاسوودە بووم.

**محەمەدی کوڕی فەرحان(لە سامەرە) دەڵێت:** گوێم لە خاڵم بوو(عبدالوهاب) دەیوت: لە خزمەتی جونەید دانیشتبووم لە ڕۆژەکانی حەجدا، دەستەیەکی زۆر لە عەجەم و منداڵی عەجەم لای دانیشتبوون، کەسێك پێنج سەد دیناری بۆ هێنا و لە بەردەمی دانا و وتی: بەسەر ئەو هەژارانەدا دابەشی بکە.

وتی: هیچ ماڵ و سامانی ترت هەیە؟

وتی: بەڵێ، پارەی زۆرم هەیە، پێی وت: سەروەت و سامانی ترت دەوێت زیاتر لەوەی بەدەستت هێناوە؟

وتی: بەڵێ، جونەید پێی وت: پارەکە بۆ خۆت ببە، چونکە تۆ لە ئێمە پێی ئاتاج تری، بۆیە لێی وەرنەگرت.

١٧

# تەوەکول

((نیشانەی کەسی پشتبەستوو بە خودا سێ شتە:
داوا ناکات.. ڕەد ناکاتەوە... هیچ لای خۆی بەند ناکات..)).

**خودا(ﷻ) دەفەرمویت:**﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾الطلاق: ٣

**هەروەها دەفەرمویت:**﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾﴾ إبراهيم: ١١

**هەروەها دەفەرمویت:**﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾﴾ المائدة: ٢٣

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە(خودا لێی ڕازی بێت) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ((لە خەوندا ئومەتانم لە مەوسمی حەجدا پێ نیشان درا، ئومەتەکەی خۆمم بینی دەشت و شاخی پڕ کرد بوو، زۆریان و شێوەیان بوو بە جێگەی سەرسوڕمانم، پێم وترا: ئایا ڕازی بوویت؟ وتم: بەڵێ، وتی: لەناو ئەوانەدا حەفتا هەزاریان دەچنە بەهەشتەوە بەبێ دادگایی کردن، ئەوانەن داخکردن ئەنجام نادەن و باوەڕیان بە تەیرە نییە و دەست بۆ نوشتەکردن نابەن و پشتیان بە پەروەردگاری خۆیان بەستووە، **"عکاشة بن محصن الأسدي"** هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا داوا لە خودا بکە من لەوانە بم، **پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** خودایە بیگێڕە بە یەکێك لە ئەوان.

پیاوێکی تر هەستا وتی: داوا لە خودا بکە من لەوانە بم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عەکاشە لەو کارەدا پێشتکەوت))[٣٤]

---

[٣٤] {متفق عليه}.

**ئەبو عەلی ڕۆزباری دەڵێت:** وتم بە عەمری کوڕی سینان بەسەرهاتێکم لە سەهلی کوڕی عەبدوڵاوە بۆ باس بکە، وتی: عەبدوڵا دەڵێت: نیشانەی کەسی پشتبەستوو بە خودا سێ شتە: داوا ناکات، ڕەد ناکاتەوە و لای خۆی هیچ هەڵناگرێت.

**ئەبو موسای دیبلی دەڵێت:** بە ئەبو یەزیدم وت: تەوەکول چییە؟

وتی: تۆ چی دەڵێی دەربارەی تەوەکول؟ وتم: هاوەڵانمان دەڵێن: گەر دڕندە و مار لەلای ڕاست و چەپت بن نهێنی و پەنهانت بۆ ئەو دۆخە نالەرزێت.

**ئەبو یەزید وتی:** بەڵێ، ئەو قسەیە نزیکە، بەڵام گەر ئەهلی بەهەشت لە بەهەشتدا خۆشی وەربگرن و ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخدا ئازار بچێژن پاشان جیاکاریت کرد لە نێوان ئەو دوانەدا لە ریزی تەوەکول دەردەچیت.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** یەکەمین مەقامێك لە تەوەکولدا ئەوەیە بەندە لە بەردەم خودادا وەك مردووی لێ بێت لە بەردەم مردووشۆردا، چۆنی بوێت وەریدەگێڕێت و ئەو جووڵە و تەگبیری بۆ نییە.

**حەمدون دەڵێت:** تەوەکول بریتییە لە دەستگرتن بە خوداوە و پەنابردن بۆ لای خودا (سبحانه وتعالى).

**پیاوێك بە "حاتم الأصم"ی وت: تەوەکول لە کوێوەیە؟**

وتی لە ئایەتی: ﴿وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ۝٧﴾ المنافقون: ٧

**بزانە شوێنی تەوەکول** بریتییە لە دڵ، جووڵەی دەرەوە نەرێی تەوەکول ناکات لەناو دڵدا، لەدوای ئەوەی بەندە لەوە گەیشت ئەندازەگیرییەکان بە دەستی خودایە (سبحانه وتعالى)، گەر شتێك گران و دژوار بوو بۆ ئەندازەگیری ئەو دەگەڕێتەوە، گەر شتێکیش ئاسان بوو ئەوا بە ئاسانکاری ئەوەوە بەستراوەتەوە.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی:** ((پیاوێك بە سواری حوشترێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) حوشترەکە بەرەڵا بکەم و پشت بە خودا ببەستم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بیبەستەرەوە و پشت بە خودا ببەستە)).

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** هەر کەس تـەوەکولی لـە نەفسـی خۆیـدا دروسـت بێـت تەوەکولی لە شتەکانی تردا دروست دەبێت.

**بیشری حافی دەڵێت:** یەکێك دەڵێت: پشـتم بـە خـودا بەسـتووە کەچـی درۆ بـە دەم خوداوە دەکات، گەر تەوەکولی بە خـودا هەبوایـە رازی دەبـوو بـەوەی خـودا بەسـەری دەهێنێت.

**پرسیار لە یەحیای کوڕی مەعاز کرا:** کەی پیاوێك دەبێتە خاوەنی تەوەکول؟

وتی: گەر رازی بوو بەوەی خودا وەکیلی بێت.

**ئیبراهیم خەواص دەڵێت:** بە دەشت و سارادا گەشتم دەکرد، گوێم لـە دەنگێـك بـوو بانگی لێکردم، منیش ئاوڕم دایەوە بینیم پیـاوێکی ئەعرابییـە و بەڕێوەیـە، پیاوەکـە پێی وتم: ئەی ئیبراهیم تەوەکول لای ئێمەیە، لەلامان بمێنەرەوە تا تەوەکولەکەت بێتـە راستە، پێتوانییە هیوا و رجات بە بوونی خواردن لە شـارێکدا وات لـێ دەکـات رووی لێ بکەی و تیایدا بمێنییەوە؟ هیوا و رجات ببڕە و پشت بە خودا ببەستە.

**پرسیار لە ئـیبن عــەتا کـرا دەربــارەی حەقیقــەتی تــەوەکول وتــی:** بێزاریـت بـۆ هۆکارەکان تێدا دەرنەکەوێت لەگەڵ زۆری پێویستیت بۆیان، لە راستەقینەی سـوکنایی و ئارامی بۆ لای حەق لانەدەی لەگەڵ وەستان لەسەر ئەو هۆکارانە.

**"أبو نصر السـراج" دەڵێـت:** مـەرجی تـەوەکول ئەوەیـە ئـەبو تـورابی نەخشـەبی وتویەتی: هەڵدانی جەستە بـۆ نـاو بەندایـەتی و پەیوەسـتبوونی دڵ بـە پـەروەردگاریی خوداوە و ئارامی و سوکنایی بەو بەشەی بڕاوەتەوە، گەر پێی درا شوکر بکات و گـەر لێی گیرایەوە ئارام بگرێت.

**وەك "زو نونی مصری" دەڵێت:** تەوەکول بریتییە لە وازهێنان لە تەگبیری نـەفس و خۆدارنین لە هەوڵ و هێز، بەندە لەسـەر تـەوەکول بـەهێز دەبێـت کاتێـك زانـی ئـەوەی لەودایە خودا(سبحانه وتعالى) دەیزانێ و دەیبینێ.

**"أبو جعفر بن أبي الفرج" دەڵێت:** پیاوێکم بـینی بـە "حوشـترەکەی عائشــە" ناسراو بوو، لەگەڵ حەیتەیەك بوو کە بە قەمچـی لێـی دەدا، پـێم وت: چ کاتێـك

ئازاری لێدانەکە لەسەرتان ئاسانترە؟ وتی: گەر ئەو کەسەی لە پێناویدا لێمان دەدرێت بمانبینێت.

**حوسەینی کوڕی مەنصوور بە ئیبراهیمی خەواصی وت:** لەم گەشت و گەڕان و بڕینی سارایە چیت بەدەستهێناوە؟

وتی: لە تەوەکولدا خۆم هێڵایەوە و نەفسی خۆمم لەسەر راست دەکردەوە.

**"حوسەینی کوڕی مەنصوور" وتی:** تەمەنت لە ئاوەدانکردنەوەی ناوەوەت بەسەر برد کوانێ فەنا لە یەکتاپەرستیدا؟

**ئەبو نەصری سەراج دەڵێت:** تەوەکول ئەوەیە ئەبوبەکری دەقاق وتویەتی: گێڕانەوەی یان و گوزەران بۆ تەنها یەك رۆژ و بەردانەوەی خەم و پەژارەی سبەینێ.

دەڵێت: ئەوەش ئەوەیە سەهلی کوڕی عەبدولاّ وتویەتی: تەوەکول رۆیشتنە لەگەڵ خودا بەو جۆرەی ئەو(سبحانه وتعالى) دەیەوێت.

**ئەبو یەعقووبی نەهرجوری دەڵێت:** تەوەکول بە خودا(سبحانه وتعالى) بە کەماڵی حەقیقەتەوە ئەوەیە بۆ ئیبراهیم(عليه السلام) روویداوە لەو کاتەی بە جبریلی(عليه السلام) وت: پێویستیم بۆ لای تۆ نییە، چونکە بە خودا نەفسی خۆی لێ بزر بووبوو و لەگەڵ خودادا(عز وجل) هیچ کەسێکی تری نەدەبینی.

**پیاوێك پرسیاری لە "ذي النون المصري" کرد دەربارەی تەوەکول و وتی:** تەوەکول چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: خۆدارنین لە ئەرباب و بڕینی هۆکارەکان.

پرسیارکەرەکە وتی: زیاترم پێ بڵێ.

وتی: هەڵدانی نەفس بۆ ناو بەندایەتی و دەرکردنی لە پەروەردگاری.

**پرسیار لە "حمدون القصار" کرا دەربارەی تەوەکول، وتی:** گەر دە هەزار درهەمت هەبێت و شەش یەکی درهەمێك قەرزت لەسەر بێت دڵنیا نەبیت لەوەی بمری و ئەو قەرزەت لە گەردن بێت، گەر دە هەزار درهەم قەرزت لەسەر بێت و هیچ شتێکت نەبێت بیگێڕیتەوە لە خودا بێهیوا نەبیت ئەو قەرزەت بۆ بگێڕێتەوە.

**پرسیار لە ئەبو عەبدولاّی قرشی کرا دەربارەی تەوەکول وتــی:** پەیوەســتبوونە بــە خوداوە لە هەموو بارێکدا.

پرسیارکەرەکە وتی: بۆم زیاد بکە، ئەویش وتــی: وازهێنــان لــە هــەموو هۆکارەکــان دەتگەیەنێت بە هۆیەك کە خودا(ﷻ) بۆخۆی سەرۆکاری کارەکانت دەکات.

**سەهلی کوڕی عەبدولاّ دەڵێــت:** تــەوەکول حــاڵی پێغەمبــەر(ﷺ) بــوو و کەســپیش سوننەتی ئەو بوو، هەر کەس لەسەر حاڵی پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە با واز لە سوننتەکەی نەهێنێت.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** تەوەکول بریتییە لە هەژانی بێ سوکنایی و سوکنایی بێ هەژان.

**وتراوە:** تەوەکول ئەوەیە زۆر و کەمت لا یەکسان بێت.

**ئیبن مەسروق دەڵێت:** تەوەکول بریتییە لە خۆڕادەست کردن بۆ گوزەرکردنی بڕیار و حوکمەکان.

**ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت:** تەوەکول رازیبوونە بە بەشێك خودا بڕیویەتــەوە لەگــەڵ متمانە کردن بە خودا.

**حوسەینی کوڕی مەنصوور دەڵێت:** کەسی پشتبەستوو بە خودا لە شارێکدا شــتێك ناخوات کەسێکی تێدا بێت بەو خواردنە لە ئەو لەپێشتر بێت.

**عومەری کوڕی سینان دەڵێت:** "ئیبراهیمی خەواص"مان بــینی پێمــان وت: باســی نامۆترین شتمان بۆ بکە لە گەشت و گەڕانەکانت، وتــی: **"خضــر"**م پێگەیشــت داوای لێکردم هاوەڵیم بکات، ترسام تەوەکولەکەم بشێوێنێت بەهۆی شانداداان لەســەر ئــەو و سوکنایی بە ئەو بۆیە لێی جیابوومەوە.

**لە سەهلی کوڕی عەبدولاّ پرسیاری تەوەکول کرا وتی:** بریتییــە لــە دڵێــك لەگــەڵ خودادا(ﷻ) ژیابێت بەبێ پەیوەندی بە شتەکانی ترەوە.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** بۆ کەسی پشتبەستوو بە خودا سێ پلە هەیە:

تەوەکول، پاشان تەسلیم بوون، پاشان خۆ سپاردن بە خودا.

ئەو کەسەی تەوەکولی هەیە بە بەڵێنەکانی خودا ئارامی و سوکنایی بۆ دێت، خاوەنی تەسلیمبوون زانستی خودا بۆ خۆی بە بەس دەزانێت، ئەو کەسەش خۆی بە خودا سپاردووە بە بڕیارەکانی خودا رازییە.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** تەوەکول سەرەتایە و تەسلیمبوون ناوەڕاست و خۆسپاردنیش کۆتایی.

**پرسیار لە ئەبو عەلی دەقاق کرا دەربارەی تەوەکول وتی:** خواردن بەبێ تەماع.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** پۆشینی خوری دوکاندارییە، قسەکردن لە زوهد پیشەیە، هاوەڵی کاروان پشتهەڵکردنە، هەموو ئەوانە پەیوەندی و کەسابەتن.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** هەر کەس تانە لە جووڵە(کۆشان بۆ رزقی حەڵاڵ) بدات تانەی لە سوننەت داوە، هەر کەسیش تانە لە تەوەکول بدات تانەی لە ئیمان داوە.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** لە رێگەی مەککە بووم، پیاوێکی شێوەدڕندەم بینی.. وتم: جنیت یان مرۆڤ؟ وتی: جنیم، پێم وت: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: بۆ مەککە، وتم: بەبێ خۆراك؟ وتی: لەناو ئێمەش کەسانێك هەن لەسەر تەوەکول دەڕۆن، وتم: تەوەکول چییە؟ وتی: وەرگرتنە لە خوداوە(ﷻ).

**"الفرغاني" دەڵێت:** ئیبراهیمی خەواص لە تەوەکولدا خۆی داڕنی بوو زۆر تیایدا ورد دەبوویەوە، کەچی دەرزی و بەکرە و دەفر و مقەستی لێ جیانەدەبوویەوە، پێیوترا: باوکی ئیسحاق بۆ ئەمانە هەڵدەگری لە کاتێکدا خۆت لە هەموو شت داڕنیوە؟

وتی: نموونەی ئەمانە تەوەکول هەڵناوەشێننەوە، چونکە خودا چەند فەرزێکی لەسەر داناوین، کەسی هەژاریش تەنها یەك پۆشاکی هەیە، لەوانەیە پۆشاکەکەی بدڕێت و کون ببێت، گەر دەرزی و بەکرەی پێ نەبێت عەورەتی دەردەکەوێت و نوێژەکەی لێ تێکدەچێت، گەر دەفرێکی پێ نەبێت خۆپاککردنەوە و دەستنوێژەکەی لێ تێکدەچێت، گەر هەژارێکت بینی بەبێ دەفر و دەرزی و بەکرە ئەوا لەسەر نوێژەکەی تۆمەتباری بکە.

**گوێم له مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لــێ بێـت) بــوو دەیــوت:** تەوەکول سیفەتی باوەڕدارانە و خۆڕادەستکردن(التسلیم) سیفەتی دۆستانی خودایـە و خۆسپاردنیش(**التفویض**) سیفەتی یەکتاپەرستانە.

تــەوەکول ســیفەتی خــەڵکی رەشــۆکییە، و خۆڕادەســتکردن ســیفەتی تایبەتانــە و خۆسپاردن بە خودا سیفەتی تایبەتی تایبەتەکانە.

هــەروەها گــوێم لــێ بــوو دەیــوت: تــەوەکول ســیفەتی پێغەمبەرانــە(**&**)، خۆڕادەســتکردن ســیفەتی ئیــبراهیم بــوو، خۆســپاردنیش بــە خــودا ســیفەتی پێغەمبەرمان **محمد**(ﷺ) بوو.

**ئەبو جەعفەری حەداد دەڵێت:** چەندین ساڵ لە تەوەکولدا بـووم و لـە بـازاڕدا کـارم دەکرد، هەموو رۆژێـك کرێـی خـۆمم وەردەگـرت، قومێـك ئـاوم لـێ نـەدەخواردەوە و حەمامێکم پێ نەدەکرد، بەڵکو کرێکەی خۆم دەهێنا بۆ هەژارانی مزگەوتی شـۆنزێ و لەسەر حاڵی خۆم بەردەوام بووم.

**"الحسین"(برای سینان) دەڵێت:** بەپێی پەتی و لەسەر تەوەکول چواردە حەجم کـرد، دڕکێك دەچوو بە پێمدا بیرم دەکردەوە من بڕیاری تەوەکولم لەســەر نەفســی خـۆم داوە، دەمهێنا بە زەویدا و دەڕۆیشتم.

**ئەبو حەمزە دەڵێت:** من شەرم دەکەم لە خودا روو لە دەشت و سارا بکـەم و تێـربم، چونکە بڕیاری تەوەکولم داوە، تـاکو هـەوڵ و رۆیشـتنم لەسـەر تێـری نـەبێت و نەبێتـە توێشوویەك لەو گەڕانەدا سوودی لێ ببینم..

**پرسیار لە حەمدون کـرا دەربـارەی تـەوەکول وتــی:** ئـەوە پلەیەکـە هێشـتا پێـی نەگەیشتووم، چۆن دروستە کەسێك قسە لە تەوەکول بکـات حـاڵی ئیمـانی بـۆ راسـت نەبووبێتەوە ؟!

**وتراوە:** کەسی پشتبەستوو بە خودا وەك منـداڵ وایـە، شـوێنێك نابینێـت رووی لـێ بکات جگە لە مەمکی دایکی، کەسی پشتبەستووش هەر بەو جۆرەیە تـەنها بـۆ لای پەروەردگاری(سبحانه وتعالى) دەگەڕێتەوە.

**یەکێك لەوان دەڵێت:** لە دەشت و سارادا بووم، کاروانییەك هات و کەسێکم لە بەردەمی خۆم بینییەوە، پەلەم کرد تا پێی بگەم، بینیم ئافرەتێکە گۆچانێکی بەدەستەوەیە، بە هێواشی دەڕوات، وام گومان برد ببووڕێتەوە، دەستم کرد بە گیرفانمدا و بیست درهەمم دەرهێنا، و پێم وت: بیگرە و لێرە بمێنەرەوە تا کاروانییەکەت پێ دەگات و بەو پارەیە کاری خۆتی پێ ئەنجام بدە.

ئافرەتەکە دەستی بردە ناو هەوا و پڕ دەستی دیناری هێنا، و وتی: تۆ درهەم لە گیرفان دەردەهێنێت من دینار لە پەنهان وەردەگرم.

**ئەبو سولەیمانی دارانی** پیاوێکی لە مەککە بینی تەنها چەند قومێك ئاوی زەمزەمی دەخواردەوە و هیچی تری نەدەخوارد، چەندین ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی، ڕۆژێك ئەبو سولەیمان پێی وت: باشە گەر ئاوی زەمزەم نوقم ببێت تۆ چی دەخۆیەوە؟

پیاوەکە هەستا و سەری ئەبو سولەیمانی ماچ کرد و وتی: خودا پاداشتت بداتەوە ڕێنموونیت کردم، چونکە چەند ڕۆژە ئاوی زەمزەم دەپەرستم، بۆیە هەستا و ڕۆیشت.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** لە ڕێگەی شام گەنجێکی تازەپێگەیشتووم بینی، ڕەچاوکردنەکانی چاك و باش بوون، پێی وتم: دەتوانم هاوەڵیت بکەم؟ وتم: من برسیم دەبێت، وتی: گەر برسیت بوو لەگەڵت برسی دەبم.

چوار ڕۆژ بەبێ خۆراك ماینەوە، پاشان شتێك خواردنمان بە رووادا کرایەوە، پێم وت: بڕۆ و دەست بە خواردنی بکە، ئەویش وتی: خۆم یەکلاکردووەتەوە لە ڕێگەی "هۆ"وە هیچ وەرنەگرم، منیش وتم: ئەی گەنج لە تەوەکولدا ورد و باڵایت، وتی: ئەی ئیبراهیم، مەدح مەکە، چونکە خودا بە هەڵەکان بینایە، تۆ چیت داوە لە تەوەکول؟ پاشان وتی: کەمترین تەوەکول ئەوەیە پێویستی زۆر رووت لێ بکات و نەفست تەنها بۆ لای ئەو کەسە باڵا بکەی هەموو پێویستییەکانی بەدەستە.

**وتراوە:** تەوەکول بریتییە لە نەرێکردنی شك و گومان و سپاردنی کارەکان بە پادشای پادشایان.

**هەروەها وتراوە:** دەستەیەك چوونە لای جونەید(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) وتیان: لە کوێ داوای ڕۆزی بکەین؟

وتی: گەر زانیتان ئەو لە کام جێگەیە لەوێ داوا لە ئەو بکەن، وتیان: کەوابوو داوا لە خودا دەکەین، وتی: گەر زانیتان ئەو ئێوەی لەبیر دەچێت یادی بکەن، وتیان: دەچینە ماڵەوە و پشت بە خودا دەبەستین؟ وتی: تاقیکردنەوەی خودا شك و گومانە.

وتیان: تەگبیر چییە؟ وتی: وازهێنان لە تەگبیر.

**ئەبو سولەیمانی دارانی وتی بە ئەحمەدی حەواری:** ئەی ئەحمەد، ڕێگەکانی دوارۆژ زۆرن، شێخەکەی تۆ(مەبەستی خۆیەتی) ئاشنایە بە زۆربەیان، جگە لەم تەوەکولە بەفەڕە کە تاکو ئێستا بۆنیم نەکردووە.

**وتراوە:** تەوەکول متمانەیە بەوەی لە دەستی خودادایە(ﷻ) و بێهیوابوونە لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە.

**هەروەها وتراوە:** تەوەکول خاڵیبوونەوەی پەنهانە لە بیرکردنەوە لە بڕینی داوای ڕۆزی.

**دەربارەی تەوەکول پرسیار لە حاریسی موحاسیبی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) کرا: ئایا تەماعی لەگەڵدایە؟**

**وتی:** لە ڕێگەی سروشتی مرۆڤەوە هەندێ خایلە و ختوورەی لەگەڵ دەبێت، بەڵام زیانی پێ ناگەیەنێت، ئەوەی تەماعی ناهێڵێت بێهیوابوونە لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە.

**وتراوە:** برسێتی لە دەشت و سارادا ڕووی لە **"النوري"** کرد، بانگکەرێك بانگی لێ کرد: کامیان لات خۆشەویستترە: هۆ(واتە هۆیەك ڕۆزی پێ بەدەست بهێنیت) یان هێزێك بێنیازت بکات لە خواردن و خواردنەوە؟.

وتی: هێزێك کۆتایی پێ نەیەت، بۆیە حەڤدە ڕۆژ بەبێ خۆراك مایەوە.

**ئەبو عەلی ڕۆزباری دەڵێت:** گەر هەژارێك دوای پێنج ڕۆژ هیچ نەخواردن وتی: برسیمە، بیگێڕنەوە بۆ ناو بازاڕ و فەرمانی پێ بکەن کار و کاسپی بکات.

هەروەها وتراوە: ئەبو تورابی نەخشەبی سەرنجی سۆفییەکی دا دەستی درێژکرد بۆ توێکڵی کاڵەك بۆ ئەوەی لە دوای سێ ڕۆژ برسێتی بیخوات، پێی وت: تەصەوف بۆ تۆ گونجاو نییە بڕۆ خەریکی بازاڕ بە.

**"أبو يعقوب البصري" دەڵێت:** جارێك لە حەرەم دە ڕۆژ برسی بووم، هەستم بە لاوازی کرد، نەفس لەگەڵم کەوتە گفتوگۆ.. چوومە دەرەوە بۆ شیو و دۆڵەکان، تاکو شتێك ببینمەوە لاوازییەکەم دابمرکێنێتەوە، تۆپێك کەلەرمم بینییەوە کەوتبوو، دەستم بۆ برد و هەڵمگرت.. لە دڵەوە بێزاریم لێی هەبوو، وەك ئەوەی یەکێك پێم بڵێ: دە ڕۆژ برسی بووی و کۆتاییەکەی کەلەرمێکی گۆڕاو(بۆگەن) بێت، بۆیە فڕێمدا، و چوومەوە ناو کەعبە و دانیشتم، لەناکاو پیاوێکی عەجەمیم بینی سندووقێکی لەبەر دەست دانام و وتی: ئەمە هی تۆیە.

وتم: بۆ منت بەمە تایبەت کردووە؟ وتی: دە ڕۆژ لەمەوبەر ئێمە لەسەر دەریا بووین و کەشتییەکە لە نوقمبووندا بوو، هەر یەکێك لە ئێمە نەزری کرد گەر خودا ڕزگارمان بکات شتێك بکەین بە خێر، من نەزرم کرد گەر خودا ڕزگارم بکات ئەمە بکەم بە خێر و بیدەم بەو کەسەی جیرانی ماڵی خودا دەکات و یەکەمجار چاوم دەکەوێتە سەری، تۆ یەکەم کەس بووی چاوم کەوتە سەری.

وتم: بیکەرەوە، ئەویش کردییەوە، بینیم: کێکی ئاردی سپی میسرییە بە میوە و شەکرەوە، هەندێکم لە کێکەکە خوارد و وتم: ئەویتری ببەرەوە بۆ منداڵەکانت، ئەوە هەدیەی منە بۆ ئەوان و منیش هەدیەکەی تۆم قبووڵ کرد.

پاشان لە نەفسی خۆمدا وتم: ڕۆزییەکەت لە دووری دە ڕۆژەوە ڕووت لێ دەکات و تۆ دەچی شیو و دۆڵی بۆ دەگەڕێی!!

ئەبوبەکری ڕازی دەڵێت: لای مەمشادی دەینووری بووم، قسە دەربارەی قەرز کرا، ئەویش وتی: کاتی خۆی قەرزێکم لەسەر بوو، دڵم پێیەوە خەریك بوو.. لە خەونـدا بینیم وەك ئەوەی کەسێك پێم دەڵێ: ئەی چرووکی دەستنوقاو، ئەو بڕەت لە ئێمە وەرگرت، بیگرە، پێویستە بیگری، لەسەر ئێمەش بەخشین پێویستە، لەدوای ئەوە قەرزی بەقاڵ و گۆشتفرۆش و خاوەن پیشەکانم لەسەر نەمابوو.

**لە بەنانی حەماڵەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لەسەر ڕێگەی مەککەی شکۆمەند بووم، لە میسرەوە دەهاتم و توێشوو و خۆراکم پێ بوو، ژنێك هاتە لام و پێی وتم: ئەی بەنان، تۆ حەماڵی و توێشوو و خواردن لەسەر پشتت هەڵدەگریت، وا گومان دەبەی

خودا ڕۆزیت نادات، بەنان دەڵێت: خواردنەکەم فڕێ دا، پاشان سێ ڕۆژم هات بەسەردا و هیچم نەخوارد، لە ڕێگە خرخاڵێکم دۆزییەوە.. لە نەفسی خۆمدا وتم: هەڵیدەگرم تا خاوەنەکەی دێت و هەواڵی دەپرسێت، لەوانەیە شتێکم پێ بدات کاتێك بۆی دەگێڕمەوە، لە ناکاو ئافرەتەکەم لێ پەیدا بوویەوە و پێی وتم: تۆ بازرگانی، دەڵێی تا خاوەنەکەی دێت و شتێکی لێ وەردەگرم؟ پاشان چەند درهەمێکی بۆ هەڵدام و وتی: بۆ خۆت خەرجی بکە، بەو چەند درهەمە گەیشتمە نزیك مەککە.

**لە "بەنان"ەوە دەگێڕنەوە** ئاتاج بە جارییەك بوو خزمەتی بکات، باسەکەی بۆ براکانی والاّ کرد، ئەوانیش نرخەکەیان بۆ کۆکردەوە، وتیان: ئەوە پارەکەی، چەند کەسێك لەگەڵت دێن و ئەوەی بۆت گونجاوە بیکڕە.

کاتێك ئەو چەند کەسە هاتن هەموویان لەسەر جاریەیەك هاوڕابوون و وتیان: ئەمە بۆ تۆ شیاوە.

وتیان بە خاوەنەکەی بە چەند پێمان دەدەی؟ وتی: ئەوەیان بۆ فرۆشتن نییە، ئەوانیش پێداگریان کرد لەسەری، خاوەنەکەی وتی: ئەوە هی "بەنان"ی حەماڵە، ئافرەتێك لە سەمەرقەندەوە هەدیەی کردووە، منیش لەگەڵ خۆم هێناومە بۆی، ئەوانیش باسەکەیان بۆ گێڕایەوە.

**"الحسن الخیاط" دەڵێت:** لەلای بیشری حافی بووم، چەند کەسێك هاتن و سەلامیان لێ کرد و ئەویش لێی پرسی ئێوە لە کوێوە هاتوون؟

وتیان: ئێمە خەڵکی شامین، هاتووین بۆ ئەوەی سەلامت لێ بکەین و دەمانەوێت حەج بکەین.

وتی: خودا خێر و چاکەتان بۆ زیاد بکات، پێیان وت: لەگەڵمان دێی؟ وتی: بە سێ مەرج: هیچ لەگەڵ خۆمان هەڵناگرین و هیچ شتێك لە کەس داوا ناکەین، گەر یەکێك شتێکی پێداین قبووڵی ناکەین؟ وتیان: ئەوەی هیچ لەگەڵ خۆمان نەبەین باشە، ئەوەش داوا لە هیچ کەس نەکەین هەر باشە، بەڵام هیچ شتێك لە کەس وەرنەگرین ئەمەیان ناتوانین.

ئەویش پێی وتن: هاتوون بۆ حەج بەڵام تەوەکولتان بە توێشوو و خۆراکی حاجییەکان بەستووە، پاشان وتی: ئەی حەسەن، هەژارەکان سێ جۆرن: هەژارێك داوا ناکات، و گەر پێی بدرێت وەرینا گرێت، ئەوە لە ریزی رۆحانییەکانە.

هەژارێك داوا ناکات بەڵام گەر پێی بدرێت قبوولی دەکات، ئەمە ئەو کەسەیە سفرەی لە دیوەخانی قودس و پاکیدا بۆ راخراوە، لەگەڵ هەژارێك کە داوا دەکات، گەر پێی درا بە ئەندازەی پێویست وەردەگرێت، ئەوە کەفارەتەکەی بریتییە لە خێر و صەدەقە.

**وترا بە حەبیبی عەجمی:** بۆ وازت لە بازرگانی هێنا؟ وتی: کەفیلێکی خاوەن متمانەم بینییەوە.

**وتراوە:** لە سەردەمانی پێشوودا پیاوێك لە سەفەردا بوو و لەتە نانێکی پێ بوو، وتی: گەر بیخۆم دەمرم، خودا فریشتەیەکی پێ راسپارد و فەرمووی: گەر خواردی رۆزی تری پێ بدە، گەر نەیخوارد هیچی تری پێ مەدە جگە لەوەی هەیەتی، بەردەوام لەتە نانەکەی لەگەڵ بوو هەتا مرد، نەیخوارد و لەتە نانەکەی لەلا مایەوە.

**وتراوە:** هەر کەس کەوتە مەیدانی راسپاردنی کارەکانی بە خودا مەبەستەکانی بۆ دێنە پێشەوە وەك چۆن بووك رەوانەی زاوا دەکرێت، جیاوازی نێوان تیابردن و سپاردن ئەوەیە: تیابردن لە مافی خودادایە(ﷻ) و کارێکی ناپەسەندە، بەڵام سپاردن لە مافی خۆتدایە و پەسەندە.

**عەبدوڵای کوڕی موبارەك دەڵێت:** هەر کەس فلسێکی حەرامی لەلا بێت کەسێك نییە پشتی بە خودا بەستبێت.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** جارێکیان بەبێ خۆراك و توێشوو کەوتمە دەشت و سارا، برسێتییەکی زۆر رووی لێ کردم، لە دوورەوە ئاوەدانییەکم لێ دەرکەوت زۆر پێی دڵخۆش بووم و پێموابوو گەیشتوومەتە بەرەوە.. پاشان لە نەفسی خۆمدا بیرم کردەوە: من سوکنایی و تەوەکولم لەسەر خەڵکی و ئاوەدانییە، بۆیە سوێندم خوارد نەچمە ئاوەدانییەکە مەگەر بە زۆر بمبەن.. لە رمڵ و خاکدا چاڵێکم بۆ خۆم هەڵکەند، جەستەم

هەتا سینەم تێدا شاردەوە، خەڵکی ئاوەدانییەکە لە نیوەشەودا دەنگێکی بەرزیان بیستبوو وتبووی: ئەی خەڵکی ئاوەدانی، خودا دۆستێکی هەیە لەو لمەدا خۆی بەند کردووە بڕۆن فریای بکەون، دەستەیەك هاتن و دەریان هێنام و بردمیان بۆ گوندەکە.

**ئەبو حەمزەی خوراسانی دەڵێت:** ساڵێك چووم بۆ حەج، لە کاتێکدا لە رۆیشتن بەردەوام بووم لەناکاو کەوتمە بیرێکەوە، نەفسم هانی دەدام هاوار بکەم و یەکێك بێت بە دەنگمەوە، وتم: نە بە خودا هاوار ناکەم و پەنا بۆ کەس نابەم.. ئەو خوتوورەیە هێشتا لە ناخمدا تەواو نەبووبوو لە ناکاو دوو پیاو لەسەر بیرەکە پەیدا بوون، یەکێکیان وتی: بەویتریان: وەرە با سەری ئەم بیرە بگرین نەبادا کەسێکی تێبکەوێت، قامیش و حەسیری زبریان هێنا و سەری بیرەکەیان گرت و بە خۆڵ دایانپۆشی، ویستم هاوار بکەم، بەڵام بە خۆمم وت: هاوار دەبەم بۆ لای ئەو کەسەی لەو دوو پیاوە لە من نزیکترە، بۆیە بێدەنگبووم، پاش ماوەیەك گیاندارێك هات و سەری بیرەکەی لابرد و قاچی شۆڕکردەوە و دەنگە دەنگێکی لێوە دەهات وەك پێم بڵێ دەستی پێوە بگرە، منیش لێی تێگەیشتم و دەستم پێوە گرت و دەریهێنامە دەرەوە، بینیم درندەیەکە و رۆیشت، بانگکەرێك بانگی لێکردم و وتی: ئەی ئەبو حەمزە ئایا ئەوە باش نییە بە شتێك کە هۆی تیابردنە رزگارمان کردی لە تیاچوون(واتە بە درندە تۆمان لە مردن رزگار رکرد).

**پرسیار لە حوزەیفەی مەرعەشی**-کە بۆ ماوەیەك هاوەڵی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی کردووە و لە خزمەتیدا بووە- کرا: سەرسوڕهێنترین شت چی بوو لە ئیبراهیمت بینیبێت؟ وتی: چەند رۆژێك لە رێگەی مەککە ماینەوە خواردنمان بەردەست نەکەوت، پاشان چووینە کوفە، روومان لە مزگەوتێکی وێرانە کرد، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم سەیرێکی منی کرد و وتی: ئەی حوزەیفە ئاساری برسێتیت تێدا دەبینرێت!

وتم: ئەوە بەو جۆرەیە شێخ دەیبینێت، وتی: پەڕە و قەڵەمم بۆ بهێنە، منیش بۆم هێنا، ئەویش نووسی: "بسم الله الرحمن الرحيم، تۆ لە هەموو بارێکدا بەمەبەستگیراوی و لە هەموو مانایەکدا ئاماژە بۆکراوی:

**أنا حامد، أنا شاكر، أنا ذاكر أنا جائع، أنا نائع، أنا عاري**
**هي ستة وأنا ضمين لنصفها فكن الضمين لنصفها يا باري**
**مدحي لغيرك لهب نار خضتها فأجر عبيدك من دخول النار**
**والنار عندي كالسؤال فهل ترى أن لا تكلفني دخول النار**

(من حەمدكەر و شوكركەر و یادكەری تۆم، مـن برسـی و مـن تینـوو و مـن رووتم، ئەوانە شەشن من دەستەبەری نیوەیانم، ئەی باری تۆش ببە بـە دەسـتەبەری نیوەكـەی تری، مەدحم بۆ كەسانێك جگە لە تۆ بڵێسەی ئاگرە و دەچمە ناوی، بۆیـە بەنـدەكانت لە چوونە ناو ئاگر بپارێزە، ئاگر لەلای من وەك داواكردن وایـە، خـۆ داوام لـێ ناكـەی بچمە ناو ئاگرەوە؟)

پاشان پەڕەكەی پێـدام و وتـی: بـڕۆ و دڵـت بـە هـیچ كەسـێك جگـە لـە خـودا(ﷻ) پەیوەست نەبێت، پەڕەكە بدە بە یەكەمین كەسێك دەیبینی.

دەڵێ: ڕۆیشتم.. یەكەمین كەسێك پێمگەیشت پیاوێك بوو سواری ئێسترێك بووبـوو، كاغـەزەكەم دایە دەستی، ئەویش وەریگرت و دەستی بە گریان كرد و وتی: خاوەنی ئەم كاغـەزە لە كوێیە؟

وتم: لە فلان مزگەوتە.

كیسەیە پارەی پێدام شەشسەد دیناری تێدا بوو، گەیشتم بە پیاوێكی تـر و پرسـیم: ئەو پیاوە كێ بوو سواری ئەو ئێسترە بووبوو؟

وتی: پیاوێكی نەصرانییە، هاتمەوە بۆ لای ئیبراهیم چیرۆكەكەم بۆ گێڕایەوە، ئـەویش وتی: دەستی لێ مەدە پاش كەمێكی تر دێـت، پـاش ماوەیـەك پیاوەكـە پەیـدا بـوو، كەسێكی نەصرانی بوو، خۆیدا بەسەر سەری ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەمـدا و موسـڵمان بوو.

## ١٨

# شــوكــــر

((گەر دەستت کورت بوو لە چاکە کردن ئەوا زمانت بە شوکر رابهێنە..)).

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ إبراهيم: ٧

**لـە "عطـاء"ەوە دەڵێـت:** لەگـەڵ عوبەیـدی کـوڕی عومـەیر رۆیشـتم بـۆ خزمـەتی عائشە(خودا لێی رازی بێت)، وتمان هەواڵمان پێ بدە بـە سەرسـوڕهێنترین شـتێك لـە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ).

دەستی بە گریان کرد و فەرمووی:

**چ شتێکی پێغەمبەر(ﷺ) سەرسوڕهێن نەبوو؟!** شەوێك هـات بـۆ لام.. هاتـە نـاو جێگەکەم تا بەر پێستم کەوت، پاشان وتی: ئەی کچـەکەی ئەبوبـەکر رێگـەم پـێ بـدە بەندایەتی پەروەردگارم بکەم.

دەڵێـت: وتم: مـن تـەنها نزیکـی تـۆم پێخۆشـە، بۆیـە مۆڵـەتم دا، هەسـتا بـۆ لای جەوەندەیەك لە ئاو، دەستنوێژی گرت و ئاوی زۆری بەکارهێنا، پاشان هەستا و دەستی بە نوێژ کرد، دەستی بە گریان کرد تا فرمێسکەکانی بەسەر سینەیدا هاتنە خوارەوە.. پاشان روکوعی برد و گریا، پاشان سوژدەی برد و گریا.. ئەو بەردەوام بوو لـە نوێـژ و گریان تا بیلال هات و مۆڵەتی بانگ و نوێژی لێخواست.

وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، چی دەتگریەنێت، تۆ خودا لە گوناهی یەکەمجار و دوایین جارت خۆشبووە؟!

فەرمووی: ئەی نابێت بەندەیەکی شوکرکار بم؟ چۆن ئەوە ئەنجام نادەم خودا(ﷻ) ئەم ئایەتەی بۆ سەرم دابەزاندووە:﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٠هەتا ئایەتی(١٩٤). ٣٥

**مامۆستا قوشەیری دەفەرموێت:** راستەقینەی شوکر لەلای ئەهلی خۆی بریتییە لە داننان بە نیعمەتی خاوەن نیعمەتدا لە رووی ملکەچبوونەوە، لەسەر ئەم قسەیە خودا(ﷻ) بە "شکور" وەسف کراوە بەهۆی بەرینکردن و زیادکردنەوە، ماناکەی: ئەو پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە لەسەر شوکر، بۆیە پاداشتی شوکر بە شوکر ناوبراوە، وەك خودا(ﷻ) دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴾الشورى: ٤٠

**وتراوە:** شوکری خودای موتەعال بۆ بەندەکانی بریتییە لە پێدانی زۆرێك لە پاداشت لەسەر کارێکی کەم، لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت: **"دابة شكور"** گەر زیاد لەو ئالفەی پێی دەدرێت قەڵەوی رووی لێکرد.

**دەگوتجێ راستەقینەی شوکر** بریتی بێت لە مەدح و سەناکردنی چاکەکار بە باسکردنی چاکەکانی، شوکری بەندەش بۆ خودا(ﷻ) بریتییە لە مەدح و سەناکردنی بە یادکردن و باسکردنی نیعمەتەکانی، شوکری خوداش(ﷻ) بۆ بەندەکەی: مەدح و سەنا کردنییەتی بە باسکردنی چاکەکانی، پاشان چاکەی بەندە لە شوکرەکەیدا بریتییە لە گوێڕایەڵ بوون بۆ خودا(ﷻ)، چاکەی خوداش(ﷻ) پێدانی نیعمەتی کۆمەکی و سەرخستنە بەهۆی شوکرەکەیەوە، شوکری بەندە لەسەر حەقیقەت بریتییە لە گوزارەی زمان و دانپیادانانی دڵ بە نیعمەتی پەروەردگاردا، شوکر دابەش دەبێت بۆ ئەم بەشانە:

**شوکر بە زمان:** ئەوەش بریتییە لە داننان بە نیعمەتدا بە سیفەتی ملکەچبوون.

**شوکر بە جەستە و ئەندامەکان:** بریتییە لە خۆڕازاندنەوە بە وەفا و خزمەت.

**شوکر بە دڵ:** بریتییە لە بەردەوامی بینینی منەتی خودا بە بەردەوامی پارێزگاری لە حورمەت.

**دەوترێت:** شوکر شوکری هەموانە لە قسە و گوفتاردا.

---

٣٥ {رواه ابن مردويه وعبد بن حميد وابن أبي حاتم وابن حبان وابن أبي الدنيا}.

**شوكر:** سیفەتی عابیدانە لە كار و كرداردا.

**شوكر:** شوكری عاریفانە بە دروست راوەستان لە هەموو حاڵ و بارێكیاندا.

**ئەبوبەكری وەراق دەڵێت:** شوكری نیعمەت بریتییە لە بینینی منەتی خودا و پارێزگاری لە حورمەت.

**"حمدون القصار" دەڵێت:** شوكری نیعمەت ئەوەیە نەفسی خۆت لەناو نیعمەتدا وەك مشەخۆر تەماشا بكەی.

**جونەید دەفەرموێت:** شوكر هۆی تێدایە، چونكە زیاتر بۆ نەفسی خۆی داوا دەكات، ئەو لەسەر بەشی نەفسی خۆی لەگەڵ خودادا راوەستاوە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** شوكر بریتییە لە ناسینی دەستەوسانی لە شوكردا.

**وتراوە:** شوكر لەسەر شوكر تەواوترە لە شوكر، ئەوەش بەوەی شوكرەكەت لە خودا و لە كۆمەكی خوداوە تەماشا بكەیت، ئەو كۆمەكییە لە بەرزترین و مەزنترین نیعمەتەكانی خودایە لەسەر تۆ، بۆیە لەسەر شوكر شوكری خودا دەكەی.. پاشان لەسەر شوكری شوكر شوكری دەكەی، تا ناكۆتا لە شوكر.

**وتراوە:** شوكر بریتییە لە دانەپاڵی نیعمەت بۆ لای خاوەنەكەی بە سیفەتی ملكەچی و گەردنكەچبوون.

**جونەید دەفەرموێت:** شوكر ئەوەیە نەفست بە شایستەی نیعمەتەكە نەزانیت.

**رووەیم دەڵێت:** شوكر بریتییە لە خەرجكردنی هەموو تواناكان لە شوكردا.

**وتراوە:**

**شوكركار(شاكر):** ئەو كەسەیە لەسەر ئەوەی هەیە شوكر دەكات، زۆر شوكركاریش(شكور): ئەو كەسەیە لەسەر نەبوون شوكر دەكات.

**دەوترێت:**

**شاكر:** ئەو كەسەیە لەسەر پێ بەخشین شوكر دەكات، و شەكوریش: ئەو كەسەیە لەسەر پێنەدان شوكر دەكات.

**دەوترێت:**

**شاکر:** ئەو کەسەیە لەسەر سوود و قازانج شوکر دەکات و شـەکوریش ئـەو کەسـەیە لەسەر لێگرتنەوە شوکر دەکات.

**دەوترێت:**

**شاکر:** ئەو کەسەیە لەسەر پێدانی نیعمەت شوکر دەکات، شـەکوریش ئـەو کەسـەیە لەسەر بەلاّ شوکر دەکات.

**هەروەها وتراوە:**

**شاکر:** ئەو کەسەیە لەسەر بەخشین شوکر دەکات، شەکوریش ئەو کەسەیە لـە بـاری دواکەوتنی نیعمەتدا شوکر دەکات.

**جونەید دەفەرموێت:** منداڵێك بووم لە بەردەسـتی **"السري"**دا یـاریم دەکـرد، مـن تەمەنم حەوت ساڵان بـوو، دەسـتەیەك لـە خزمـەتیـدا بـوون قسـەیان دەربـارەی شـوکر دەکرد، پێی وتم: ئەی منداڵ، شوکر چییە؟

منیش وتم: ئەوەیە بە نیعمەتی خوداوە لە خودا یاخی نەبیت.

وتی: خەریکە بەشت لەلای خودا دەبێت بە زمانت.

**هەروەها جونەید (رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** بـەردەوام لەسـەر ئـەو قسـەی **"السري"** پێمی وت دەگریم.

**شیبلی دەڵێت:** بینینی خاوەن نیعمەت نەك بینینی نیعمەت.

**وتراویشە:** شوکر بریتییە لە پارێزگاری لەوەی هەیە و بەدەستهێنانی ئەوەی بزرە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** شوکری خەڵکی بە گشتی لەسەر خواردن و پۆشـاکە، شـوکری تایبەتانیش لەسەر ئەو مانانەیە روو لە دڵیان دەکەن.

**وتراوە:** داود(عليه السلام) فەرمووی: خودایە چۆن شـوکرت بکـەم، لـە کاتێکـدا شـوکردنم نیعمەتێکە لە تۆوە؟

خودا وەحی بۆ نارد و فەرمووی: ئێستا شوکرت کردووم.

**وتراوە:** موسا(عليه السلام) لە موناجاتەکانیدا فەرمووی: خودایە، ئادەمت بە دەستی خۆت دروست کرد، ئەوەت کرد... و ئەوەت کرد.. و چۆن شوکرت بکەم؟

**خودا**(جل جلاله) **فەرمووی:** هەر کەس بزانێت ئەوانە لە منەوەیە و مەعریفەتی بەوانە هەبێت شوکری کردووم.

**وتراوە:** یەکێك لە پیاوان هاوەڵێکی پیاوچاکی هەبوو دەسەڵاتداری وڵات بەندی کردبوو، لە بەندیخانەوە نامەیەکی بۆ هاوەڵەکەی نووسی و پێی وت: لەسەر ئەم بەندکردنە شوکری خودا دەکەم، لەدوای ئەوە لە بەندیخانە لێدانێکی خوارد، دیسان نامەی نووسییەوە و وتی: شوکری خودا دەکەم لەسەر لێدانەکە، لە دوای ئەوە کابرایەکی مەجووسی قەڵەویان هێنا و زنجیری بەندکردنەکەی پیاوەکەیان پێوە بەست، بابای مەجووسی لە شەوێکدا چەند جار هەڵدەستا و دەبوا ئەویش لەگەڵی هەڵبستێت و بە دیارییەوە بوەستێ تا خۆی خاڵی دەکاتەوە، دیسان نامەی نووسییەوە و وتی: شوکری خودا دەکەم لەسەری، هاوڕێکەی نامەی بۆ نووسییەوە و پێی وت: تا کەی دەڵێیت شوکری خودا دەکەم، چ بەڵایەك لەو بەڵایە گەورەترە؟

هاوڕێکەی پێی وت: گەر ئەو پشتێنەی لە ناوقەدی ئەو بەسترایە ببەسترایە لە ناوقەدی تۆ، و ئەو زنجیرەی کراوەتە قاچی ئەو بکرابایەتە قاچی تۆ چیت دەکرد؟

**وتراوە:** پیاوێك رۆیشتە لای سەهلی کوڕی عەبدوڵا و پێی وت: دز هاتووەتە ماڵەکەمەوە و شتومەکەکانی بردووم، فەرمووی: شوکری خودا بکە لەسەری، گەر دز(شەیتان) بڕۆیشتبایەتە ناو دڵت و یەکتاپەرستی لێ تێکبدابای چیت دەکرد؟

**وتراوە:** شوکری دوو چاو: ئەوەیە نەنگی هاوەڵەکەتی پێ بپۆشی، و شوکری دوو گوێ: ئەوەیە ئەو نەنگییانەی پێ بپۆشیت کە بیستووتە.

**هەروەها وتراوە:** شوکر: بریتییە لە چێژ وەرگرتن لە سەنای خودا لەسەر ئەو بەخشینانەی خۆی بۆیان بە شایستە نازانێت.

**جونەید دەڵێت: "السري"** کاتێك بیویستبایە سوودم پێ بگەیەنێت پرسیاری لێ دەکردم، بۆیە ڕۆژێك پێی وتم: ئەی باوکی قاسم شوکر چییە، پێم وت: شوکر ئەوەیە شتێك لە نیعمەتی خودا(ﷻ) بەکارنەهێنێت بۆ یاخیبوون لە خودا.

وتی: ئەمە لە کێوە فێربووی؟

وتم: لە دانیشتنەکانی تۆوە.

**وتراوە: "الحسن بن علي"**(خوایان لێ ڕازی بێت) بە ڕوکنەوە لکا و وتی: خودایە، نیعمەتت پێدام و شاکر نەبووم، بە بەڵا تاقیتکردمەوە و ئارامگر نەبووم، بە وازهێنانم لە شوکر نیعمەتەکەت لێ نەگرتمەوە، بە وازهێنانم لە ئارامگرتن بەلا و ناڕەحەتییەکەت بەردەوام نەکرد، خودایە لە کەسی بەخشندەوە تەنها چاوەڕوانی بەخشندەیی دەکرێت.

**وتراوە:** گەر دەستت کورتە بۆ خێر و چاکە بە زمانت درێژ بێت بۆ شوکری خودا.

**وتراوە:** چوار کەس کارەکانیان بێ بەرن: چپە بۆ کەڕ و دانەری نیعمەت لەلای کەسێك شوکر ناکات و بەخشینی خوێ لە کانە خوێدا و چراپێکەر لە خۆرەتاودا.

**وتراوە:** کاتێك مژدەی لێخۆشبوون بە ئیدریس درا، داوای تەمەنی درێژی کرد، وترا: تەمەنی درێژت بۆ چییە؟

وتی: بۆ ئەوەی شوکری بکەم، چونکە من پێشتر بۆ لێخۆشبوون کارم کردووە، فریشتەکە باڵەکانی ڕاخست و هەڵیگرت و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.

**وتراوە:** پێغەمبەرێك بە پاڵ بەردێکی بچووکدا گوزەری کرد کە ئاوێکی زۆری لێ دەهاتە دەرەوە، سەریسوڕما، خودا بەردەکەی هێنایە قسە لەگەڵی، و وتی: لەو کاتەوەی ئەو ئایەتەم بیستووە:﴿ **نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ** ﴾ **التحريم: ٦** من لە ترسان دەگریم، دەڵێت: پێغەمبەرەکە داوای لە خودا کرد ئەو بەردە بپارێزێت، خودا وەحی بۆ ڕەوانە کرد من ئەو بەردە لە ئاگر پەنا دەدەم، پێغەمبەرەکە ڕۆیشت و کاتێك گەڕایەوە بۆ لای بەردەکە بینی ئاوەکە وەك یەکەمجار لێی هەڵدەقوڵێت دیسان سەریسوڕما، خودا بەردەکەی لەگەڵ هێنایەوە قسە، پێی وت: بۆ دەگری، خودا لێت خۆشبووە؟

بەردەکە وتی: ئەوەی یەکەمیان گریانی ترس و دڵتەنگی بوو، بەڵام ئەم گریانەیان گریانی شوکر و دڵخۆشییە.

**وتراوە:** کەسی شوکرکار هەمیشە بۆی زیاد دەکرێت، چونکە لە بینینی نیعمەتدایە، خودا (سبحانه وتعالى) دەفەرمووێت: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ إبراهيم: ٧، کەسی ئارامگریش لەگەڵ خودادایە، چونکە چاوی لە بینینی ئەو کەسەیە ئەوی تاقیکردووەتەوە، خودا (سبحانه وتعالى) دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٣﴾﴾ البقرة: ١٥٣

**وتراوە:** وەفدێك هات بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(خودا لێی رازی بێت)، گەنجێکیان تێدا بوو..

دەستی کرد بە وتاردان، عومەر فەرمووی: با کەسێکی بەتەمەن وتار بدات.

گەنجەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، گەر کارەکە بە ساڵ و تەمەن بوایە لەناو موسڵمانان‌دا کەسانێك هەن لە تۆ بەتەمەنترن، وتی: قسە بکە..

گەنجەکە وتی: ئێمە وەفدێك نین حەز و ترس بۆ لای تۆ هەڵیگرتبین، ئەوەی حەزمانە لە رێگەی چاکەی تۆوە بە ئێمە گەیشتووە، ترسمان لە رێگەی دادپەروەری تۆوە نەماوە، عومەر پێی وت: ئێوە کێن؟

وتی: وەفدی شوکرین، هاتووین شوکرت بکەین و بڕۆین.

**وتراوە:** خودا وەحی بۆ موسا(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: بەزەییت بە بەندەکانی مندا بێتەوە، ئەوانەی تووشی بەڵا و ناخۆشیم کردوون و ئەوانەش نیعمەت و خۆشیم پێداون، موسا(عليه السلام) فەرمووی: خودایە، ئەوانەی نیعمەت و خۆشیت پێداون، بۆ؟

فەرمووی: بەهۆی کەمی شوکریانەوە لەسەر ئەو نیعمەت و خۆشییەی پێمداون.

**وتراوە:** "الحمد لله" لەسەر هەناسەدانە، شوکریش لەسەر نیعمەتی هەستەکانە، **وتراویشە:** "الحمد لله" لە ئەوەوە بۆ تۆیە و شوکر فیداکارییە لە تۆوە، لە ریوایەتێکی دروستدا هاتووە: ((یەکەمین کەسانێك بانگ دەکرێن بۆ بەهەشت حەمدکەرانی خودان لە هەموو بارێکدا)).

**وتراوه:** حەمد لەسەر ئـەوەی لـە سـەر تـۆی لاداوە و شـوکریش لەسـەر ئـەوەی بـۆی رەوانەکردووی.

**یەکێك لە پیـاوان دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت:** لـە یـەکێك لـە گەشـتەکانمدا پیـاوێکی بەتەمەنم بینی کە لە تەمەندا ئەفتادە بووبـوو، پرسـیاری حـاڵیم کـرد، وتـی: مـن لـە سەرەتای تەمەنمەوە حەزم لە کچی مامێکم بوو، ئەویش هەر بەو جۆرە حەزی لـە مـن بوو، خودا رێکی خست و هاوسەرگیریمان کرد، لە شەوی بوك و زاواییدا وتمان: بـا ئـەم شەوە بە شوکرکردنی خودا زیندوو بکەینەوە لەسەر ئەوەی ئێمەی بەیەکتر گەیاند، ئەو شەوە نوێژمان کرد، هیچ کاممان دەستمان بۆ ئەویترمان نەبرد، کاتێ شەوی دووەم هات هەمان شتمان وت، ئەوە نزیکەی حەفتا یان هەشتا ساڵ دەبێت هەموو شـەوێك یئمـە لەسەر ئەو سیفەتەین، (رووی لـە ژنەکـەی کـرد) ئایـا ئـەوە بـەو جـۆرە نییـە ژنەکـە؟ پیرەژنەکە وتی: هەر بەو جۆرەیە کە ئەو دەیڵێت.

## ١٩

# یەقین

((گەر یەقین گەیشتە دڵ ئەوا دڵ پڕ دەبێت لە نوور))

خودا (ﷻ) دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤ ﴾ البقرة: ٤

**لە عەبدولڵای کوڕی مەسعوودەوە (خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرمووی:** ((هیچ کەس بە تووڕەکردنی خودا رازی مەکە، حەمدی کەسێك مەکە لەسەر فەزڵ و چاکەی خودا، بە خراپە ناوی هیچ کەس مەهێنە لەسەر ئەوەی خودا بە تۆی نەداوە، رۆزی خودا بە هەڵپەی هەڵپەکەران ناگاتە تۆ و بە ناحەزی ناحەزان تۆی لێ بێبەش نابێت، خودا -بە دادپەروەری خۆی- ئاسوودەیی و دڵخۆشی لە رازیبوون و یەقیندا داناوە، خەم و دڵتەنگیشی لە شك و ناڕازیدا داناوە))[٣٦]

**"أبو عبدالله الأنطاكي" دەڵێت:** کەمترین یەقین گەر بگاتە دڵ، دڵ پڕ دەکات لە نوور و هەموو شك و گومانێکی تێدا دەڕەوێنێتەوە، و دڵ پڕ دەبێت لە شوکر و ترسان لە خودا (سبحانه وتعالى).

**ئەبو جەعفەری حەداد دەڵێت** لە دەشت و سارابووم، ئەبو تورابی نەخشەبەندی منی لەسەر گۆمە ئاوێك بینی، بۆ ماوەی شازدە رۆژ دەبوو نە هیچم خوارد بوو نە هیچم خواردبووەوە، پێی وتم: بۆچی دانیشتووی؟ وتم: لە نێوان زانست و یەقیندام چاوەڕوانی ئەوەیانم زاڵ دەبێت تاکو لەگەڵیدا بم(واتە گەر زانست زاڵ بوو دەخۆمەوە، گەر یەقین زاڵ بوو ناخۆمەوە و دەڕۆم) پێی وتم: تۆ دەبیتە کەسێکی خاوەن شانوشکۆ.

---

[٣٦] {القضائي}.

**ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت:** یەقین بریتییە لە کەمی گرنگیدان بە سبەینێ.

**سەهلی کوڕی عەبدولاّ دەڵێت:** یەقین لە زیادەی باوەڕەوەیە و هاتنەدی و ڕاستەقینەی باوەڕە.

**هەندێکی تریان دەڵێن:** یەقین زانستێکە لە دڵدا دادەنرێت، خاوەنی ئەم قسە ئاماژە بەوە دەکات یەقین زانستێکی کەسبی نییە، بەڵکو بەهرە و بەخششە.

**سەهل دەڵێت:** سەرەتای یەقین بریتییە لە موکاشەفە(پەردە لادان)، بۆیە هەندێ لە **پێشین وتویانە:** گەر پەردە لابدرێت من یەقینم زیاد ناکات، پاشان بینین و ئامادەبوونە لەناویدا.

**عەبدولاّی کوڕی خەفیف دەڵێت:** یەقین هاتنەدی و بەدەستهێنانی نهێنییەکانە بە حوکمەکانی پەنهان.

**"أبوبكر بن طاهر" دەڵێت: : زانست:** بە بەرهەڵستکردنی شك و گومانەکان دەبێت، یەقینیش: گومانی تێدا نامێنێت. ئاماژەی بە زانستی کەسبی(بەدەستهێنراو) و ئەوەی وەك بەڵگەنەویست(بەهرەمەندبوون) مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، هەر بەو جۆرە زانستی ئەم دەستەیە لە سەرەتاوە کەسبییە و لە کۆتاییدا بەڵگەنەویستە(بەهرەمەندبوونە).

**"محمد بن الحسين" دەڵێت:** هەندێ لە پیاوان دەڵێن: یەکەمین مەقام لە مەقامەکان مەعریفەیە، پاشان یەقینە، ئەوجا تەصدیقە، پاشان ئیخلاصە، دواتر شەهادەتە ئەوجا گوێڕایەڵییە، ئیمانیش ناوێکە هەموو ئەمانە کۆدەکاتەوە.

بێژەری ئەم قسەیە ئاماژە بەوە دەکات یەکەمین ئەرك لە ئەرکەکان بریتییە لە مەعریفە بە خودا(ﷻ)، مەعریفەش بە پێشخستنی مەرجەکانی بەدەست دەهێنرێت، ئەوەش بریتییە لە سەرنجدانی ورد و دروست، پاشان گەر بەڵگەکان بەدوای یەکتردا هاتن و ڕۆشنکردنەوە بەدەست هات نوور بەدوای یەکتردا دێت و چاورۆشنی(ڕۆشنبینی) لێوە بەرهەم دێت، وەك بێنیازبوونێك لە تێڕامان لە بەڵگە و بورهان کە ئەوەش حاڵ و باری یەقینە، پاشان تەصدیق کردنی حەق(ﷻ)، لەوەی وەڵامی بانگکەر دەداتەوە وەك هەواڵدان لە کردارەکانی(ﷻ) لە داهاتوودا، چونکە

تەصـدیق لـە هەوالّدایـە، پاشـان ئـیخلاص لـە شـوێنکەوتنی فەرمانەکانـدا، ئـەوجا دەرخستنی وەلاّمدانەوە بە جوانی شەهادەت، پاشان گوێڕایەڵییەکان بە یەکتاپەرستی لەوەی فەرمانی پێکردووە و خۆدارنین لەوەی هەڕەشەی لێکردووە.

بۆ ئەم مانایە"**الإمام أبوبكر محمد بن فورك**" ئامـاژەی کـردووە، لـەوەی بیسـتوومە وتوویەتی: یادی زمان چاکەیەکە دڵ بەسەریدا دەیڕێژێت.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** لەسەر دڵێك حەرامە بۆنی یەقین بکات گەر ئارامی بۆ لای شتێك هەبێت جگە لە خودا(ﷻ).

"**زو نونی مصری" دەڵێت:** یەقین بانگ دەکات بۆ کـورتی هیـوا و ئـاوات، کـورتی هیـوا و ئـاواتیش بـانگ دەکـات بـۆ زوهـد، زوهـدیش حیکمـەت بەرهـەم دەهێنێـت، حیکمەتیش سەرنجدان لە سەرئەنجام پەیدا دەکات.

## هەروەها "ذو النون" دەڵێت: سێ شت لە نیشانەکانی یەقینن:

١. کەمی تێکەڵاوی خەڵکی.

٢. وازهێنان لە مەدح و سەنای لە پێبەخشیندا.

٣. خۆپاکڕاگرتن لە زەمکردنیان لە باری گرتنەوەیان.

## سێ شتیش لە نیشانەکانی یەقینی یەقینن:

١. سەیر کردنی خودا لە هەموو شتێکدا.

٢. گەڕانەوە بۆ لای لە هەموو بارێکدا.

٣. داوای کۆمەکی لێکردنی لە هەموو حاڵێکدا.

**جونەید(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** یەقین بریتییە لـە جێگیربـوون و دامـەزرانی ئەو زانستەی وەرناگەڕێ و ئاڵوگۆڕ نابێت و گۆڕانی بەسەردا نایەت لە دڵدا.

**ئـیبن عـەتا دەڵێـت:** بـەپێی نزیکیـان لـە تـەقواوە گەیشـتن بـەوەی پێـی گەیشتن لە یەقین.

**ریشـــــەی تـــــەقوا:** جیابوونەوەیـــە لـــە نـــەهیلیێکراوەکان، جیابوونـــەوە لـــە نـــەهیلیێکراوەکان جیابوونەوەیـە لـە نـەفس، بـە ئەنـدازەی جیابوونـەوەیان لـە نـەفس هەنگاو بۆ ناو یەقین هەڵدەگرن.

**هەندێکیان دەڵێن:** یەقین بریتییە لە موکاشەفە(پەردە لادان)، **پەردە لادانیش سـێ رووی هەیە:**

پەردە لادان بە هەواڵ، و پەردە لادان بە دەرخستنی توانا و دەسەڵات و پـەردە لادان بە حەقیقەتی باوەڕ.

**بزانە "موکاشەفە" لەناو قسەی پیاوانی ئەم دەستەیەدا بریتییە لە:** دەرکـەوتنی شتێك بۆ دڵ بە زاڵبوونی یادی خـودا بـەبێ مانـەوەی هـیچ جـۆرە شـك و گومانێـك، لەوانەیە مەبەستیان بە "موکاشەفە" ئەوە بێت کە خەونبین لە نێوان خـەو و ئاگاییـدا دەیبینێت، زۆر جار بە "جێگیربوون" گوزارشت لەم حاڵە دەکەن.

**"الإمام أبوبكر بن فورك" دەڵێت:** پرسیارم لە ئەبو عوسمانی مەغریبی کـرد و وتم: ئەمە چییە تۆ دەیڵێیت؟

وتی: کەسانێك دەیانبینم ئا بەو جۆرە و ئا بەو جۆرە، وتم: بە چاو دەیانبینی یان بـە موکاشەفە؟

وتی: بە موکاشەفە.

**عامیری کوڕی عەبد قەیس دەڵێت:** گەر پەردە لابدرێت یەقینم زیاد ناکات.

**وتراوە:** یەقین بریتییە لە بینینی ئاشکرا بە هێزی ئیمان.

**وتراویشە:** یەقین بریتییە لە نەمانی بەرهەڵستی.

**جونەید(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێـت:** یـەقین بریتییـە لـە هـەڵگرتنی شـك و گومان لە دیمەنی پەنهان.

**گوێم لە ماۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەربارەی ئـەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی عیسا کە دەفـەرموێت:** ((گـەر یـەقینی زیـاد

بکردبایە بە هەوادا دەڕۆیشت وەك پیایدا ڕۆیشتم)) دەیوت: ئەو(ﷺ) ئاماژەی بە حاڵی ناخی خۆی کردووە لە شەوی میعراجدا، چونکە لە ئایەتەکانی میعراج ئەوە بوو کە **پێغەمبەر**(ﷺ) **دەیفەرموو:** ((بوراقم بینی وەستا بوو، منیش دەڕۆیشتم)).

**پرسیار لە "السري" کرا دەربارەی یەقین وتی:** یەقین ئارامی تۆیە لە باری گەردەشی هاتووەکان لە سینەدا، بەهۆی تێگەیشتن لەوەی جووڵەت لەو شتانەدا سوودت پێ ناگەیەنن و لە تۆوە دەرناچن و بڕاونەتەوە.

**عەلی کوڕی سەهل دەڵێت:** ئامادەبوون باشترە لە یەقین، چونکە ئامادەبوون دامەزرانە و یەقین خوتوورەی دڵە.

وەك ئەوەی یەقینی کردبێت بە سەرەتای ئامادەبوون، ئامادەبوونیش بەردەوامی یەقین بێت، وەك ئەوەی بڵێت یەقین بەبێ ئامادەبوونیش بوونی هەیە، بەڵام ئامادەبوون بەبێ یەقین **محاڵە**، بۆ ئەو مەبەستە **"النوري" دەڵێت:** یەقین بریتییە لە موشاهەدە، واتە: موشاهەدا یەقینێکە گومانی تێدا نییە، چونکە نایبینێت، پاکێتی بۆ ئەو خودا لەو کەسانەی متمانە ناکەن بەوەی لە ئەوەوەیە.

**ئەبوبەکری وەراق دەڵێت:** یەقین داگیرکاری دڵە و کەماڵی باوەڕ بە یەقینەوەیە، بە یەقین خودا دەناسرێت و بە ئەقڵ لە خودا(ﷻ) تێدەگەین.

**جونەید دەڵێت:** هەندێ لە پیاوان بە یەقین بەسەر ئاودا ڕۆیشتن، باشترین کەسیان لە یەقیندا لە تینوێتیدا مرد.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** لە سارادا بە گەنجێك گەیشتم، وەك قاڵبی زیو وابوو، پێم وت: بۆ کوێ دەچی ئەی گەنج؟

وتی: بۆ مەککە، وتم: بەبێ توێشوو و خۆراك و وڵاخ و خەرجی دەڕۆی؟

وتی: ئەی یەقین لاواز، ئەو کەسەی دەتوانێ ئاسمانەکان و زەوی پارێزگاری لێ بکات ناتوانێ بەبێ توێشوو من بگەیەنێتە مەککە، دەڵێ: کاتێ گەیشتمە مەککە لە تەواف گەنجەکەم بینی لەوێ بوو.

کاتێك بینیمی پێی وتم: ئەی شێخ، هێشتا لە لاوازی یەقینداى؟

**نەهرجوری دەڵێت:** گەر بەندە راستەقینەکانی یەقین تەواو بکات بەڵا لای دەبێت بە نیعمەت و خۆشی بە موسیبەت.

**ئەبوبەکری وەراق دەڵێت: یەقین سێ رووی هەیە:**

یەقینی هەواڵ و یەقینی بەڵگە و بورهان و یەقینی موشاهەدە.

**ئەبو تورابی نەخشەبی دەڵێت:** گەنجێکم لە دەشت و سارا بینی بەبێ توێشوو دەڕۆیشت، وتم: گەر یەقینی لەگەڵ نەبێت تیادەچێت، بۆیە پێم وت: ئەی گەنج لەم جۆرە شوێنانەدا بەبێ خۆراك و توێشوو؟!

وتی: ئەی شێخ، سەرت بەرز بکەرەوە ئایا جگە لە خودا شتێکی تر دەبینی؟

وتم: ئێستا بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** زانست ئەوەیە پێشەوایەتی و رێنموونیت دەکات، یەقینیش ئەوەیە هەڵتدەنێ بۆ کۆشان و گوێڕایەڵی خودا.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** هەوڵی ژیان و زیندەگیم دەدا بە خواردنی شتی حەڵاڵ، بۆیە بڕیاری ماسی گرتنم دا، رۆژێك ماسییەك بوو بە تۆڕەکەوە، ماسییەکەم دەرهێنا و تۆڕەکەم هەڵدایەوە بۆ ناو ئاوەکە و ماسییەکی تری پێوە بوو، جارێکی تر تۆڕەکەم هەڵدایەوە و گەڕامەوە، گوێم لە بانگکەرێك بوو بانگی لێکردم دەیوت: رۆزیت نەدۆزییەوە لە کوشتنی ئەوانەدا نەبێت یادی ئێمە دەکەن..!

دەڵێت: بەلەم و تۆڕەکەم تێکشکاند و وازم لە ماسیگرتن هێنا..

٢٠

# ئارامگرتن

((وتراوه: ئارامگرتن لەسەر داوا ناونیشانی بەدەستهێنانە، و ئارامگرتن لە ناخۆشیدا نیشانەی دەرووە..))

﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾النحل: ١٢٧

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت)-کە بەرزی کردووەتەوە بۆ لای عائشە(خودا لێی رازی بێت)- پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((ئارامگرتن لە لێدان و هەژانی یەکەمجاردایە))[٣٧]

**هەروەها لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((ئارامگرتن لەگەڵ لێدان و هەژانی یەکەمجاردایە))

## پاشان ئارامگرتن چەند بەشێکە:

١. ئارامگرتن لەسەر ئەوەی بەری دەستی بەندەکە خۆیەتی.

٢. ئارامگرتن لەسەر ئەوەی بەری دەستی بەندە نییە.

## ئارامگرتن لەسەر ئەوەی بەری دەستی بەندەیە دوو بەشە:

١. ئارامگرتن لەسەر ئەوەی خودا فەرمانی پێکردووە.

٢. ئارامگرتن لەسەر ئەوەی خودا نەهیلێکردووە.

[٣٧] {متفق علیه}.

## ئارامگرتن لەسەر ئەوەی بەری دەستی بەندە نییە بریتییە:

لە ئارامگرتن لەسەر ئەو بڕیار و قەدەرە خوداییانەی مرۆڤ بەهۆیەوە ڕووبەڕووی ناڕەحەتی و تەنگەلانی دەبێتەوە.

**جونەید دەڵێت:** ڕۆیشتن لە دونیاوە بۆ دوارِۆژ لەسەر کەسی باوەڕدار ئاسان و سانایە، بەڵام کۆچکردن لە خەڵکی لە پێناوی خودادا گرانە، هەروەها ڕۆیشتن لە نەفسەوە بۆ لای خودا گرانتر و دژوارترە، بەڵام ئارامگرتن لەگەڵ خودا سەختترین و گرانترینیانە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی ئارامگرتن، وتی:** بریتییە لە نۆشکردنی تاڵاو بەبێ ئەوەی ڕووت گرژ بکەی.

**عەلی کوڕی ئەبی تالب(خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت:** ئارامگرتن لەپای ئیمان وەك سەر وایە بۆ جەستە.

**"أبو القاسم الحكيم" لەسەر ئەو ئایەتە دەڵێت:** "واصبر" فەرمان کردنە بە عیبادەت، ئەو بەشەی ئایەتەکەش: "وما صبرك إلا بالله" بەندایەتییە(**عبودیة**)، هەر کەس لە پلەی "لك"ەوە بەرزبوویەوە بۆ پلەی"بك" ئەوا لە پلەی عیبادەتەوە بەرزبووەتەوە بۆ پلەی عبودییەت. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((بك أحيا وبك أموت-بە تۆوە دەژیم و بە تۆوە دەمرم))

**ئەحمەد دەڵێت:** پرسیارم لە ئەبو سولەیمانی دارانی کرد دەربارەی "ئارامگرتن"، وتی: سوێند بە خودا ئێمە ئارام ناگرین لەسەر ئەوەی خۆشماندەوێت، ئیتر چۆن ئارام دەگرین لەسەر ئەوەی لێی بێزارین؟!

**"ذو النون" دەڵێت:** ئارامگرتن بریتییە لە خۆبەدوورگرتن لە سەرپێچییەکان، و ئارامی لە کاتی نۆشکردنی تاڵاوی بەڵا و نیشاندانی دەوڵەمەندی لەگەڵ دابارینی هەژاری بەسەر ژیان و گوزەراندا.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** ئارامگرتن بریتییە لە وەستان لەگەڵ بەڵا بە جوانی ئەدەبەوە.

**وتراوە:** ئارامگرتن بریتییە لە فەنابوون لە بەڵادا بەبێ نیشاندانی سکاڵا.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** "الصبار" کەسێکە نەفسی خۆی راهێناوە بۆ هێرشکردنە سەر ناخۆشییەکان.

**وتراویشە:** ئارامگرتن مانەوەیە لەگەڵ بەڵا بە جوانی هاوەڵێکردن وەك چۆن لەگەڵ خۆشییەکاندا هاوەڵی دەکەی.

**هەروەها ئەبو عوسمان دەڵێت:** پاداشتی باش لەسەر عیبادەت: پاداشتە لەسەر ئارامگرتن و هیچ پاداشتێك لەسەرو ئەوەوە بوونی نییە، خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ النحل: ٩٦

**عەمری کوڕی عوسمان دەڵێت:** ئارامگرتن بریتییە لە جێگیربوون و دامەزران لەگەڵ خودا(سبحانه وتعالى) و وەرگرتنی بەڵا و تاقیکردنەوەکانی بە سینەی فراوانەوە.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** بریتییە لە دامەزران و جێگیربوون لەسەر حوکمەکانی کیتاب و سوننەت.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** ئارامگرتنی خۆشەویستان توندترە لە ئارامگرتنی زاهیدان، چ سەرسوڕمانێکە، ئەوانە چۆن ئارام دەگرن(واتە خۆشەویستان)، بۆیە لە دێڕە هۆنراوەیەکدا وتراوە:

**الصبر يحمد في المواطن كلها   إلا عليك فإنه لا يحمد**

(ئارامگرتن لە هەموو شوێنەکاندا پەسەند و جوانە جگە لە ئارامگرتن لە تۆ لەو جێگەدا پەسەند و شیاو نییە)

**روەیم دەڵێت:** ئارامگرتن بریتییە لە وازهێنان لە سکاڵا.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئارامگرتن(الصبر) وەك ناوەکەی وایە(واتە وەك چۆن وشەی"الصبر" لەسەر زمان قورس و گرانە هەر بەو جۆرە ماناکەشی سەخت و دژوارە)

**ئیبن عەتا دەڵێ:**

**سأصبر كي ترضى، وأتلف حسرة وحسيي   أن ترضى ويتلفني صبري**

(ئارام دەگرم بۆ ئەوەی رازی بیت، و لە حەسرەتدا تیادەچم، ئەوەندەم بەسە تـۆ رازی بیت و ئارامگرتنەکەم من تیا ببات)

**ئەبو عەبدولاّی خەفیف دەڵێ: ئارامگرتن سێ بەشە:**

١. "متصبر-خوازیاری ئارامی"

٢. "صابر-ئارامگر"

٣. "صبار-زۆر ئارامگر"

**عەلی کوڕی ئەبی تالب(خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێت:** ئارامگرتن ولاّخێکـە هەرگیز بە چۆکدا نایەت.

**پیاوێك چووە لای شیبلی و وتی:** کام ئارامگرتن لەسەر ئارامگران سەخت و دژوارە؟

وتی: ئارامگرتن لە پێناوی خودادا(ﷻ).

وتی: نەخێر.

وتی: ئارامگرتن بۆ خودا.

وتی: نەخێر.

وتی: ئارامگرتن لەگەڵ خوداز

وتی: نەخێر، وتی: ئەی کام ئارامگرتن؟

وتی: ئارامگرتن لە خودا.

دەڵێ: شیبلی هاوارێکی لێ بەرز بوویەوە نزیك بوو رۆحی دەربچێت.

**ئەبو محەمەدی جەریری دەڵێت:** ئارامگرتن ئەوەیە جیاوازی نەکەی لـە نێـوان بـاری نیعمەت و میحنەتدا، لەگەڵ ئارامی ناخ لە هەردوو بارەکەدا، "التصبر" بریتییـە لـە ئارامی لەگەڵ بەلاّدا بە بوونی قورسی و سەختی میحنەتەکە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئارامگران سەربەرزی هەردوو خانەیان بەدەستهێناوە، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾﴾ الأنفال: ٤٦

لەسەر مانای ئایەتی: ﴿ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ﴾ **آل عمران: ٢٠٠** وتراوە: **"الصبر"** لەخوار **"المصابرة"**وەیە و ئەمەش لە خوار **"المرابطة"**وەیە.

**هەروەها لەسەری وتراوە:** لە ناخی خۆتاندا ئارامبگرن و بە خوداوە ئارامبگرن و لەگەڵ خودادا پەیوەست بن.

**وتراوە:** خودا(ﷻ) وەحی بۆ داود(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: بە ئەخلاقی من خۆت برازێنەوە، لە ئەخلاقەکانی من "صبور-زۆر ئارامگرییە".

**وتراوە:** نۆشکردنی تاڵاوی ئارامگرتن گەر بتکوژێت شەهیدی، گەر نەشمری بە سەربەرزی ژیان بەسەر دەبەی.

**هەروەها** وتراوە: ئارامگرتن بۆ خودا کۆڵێکی قورسە، ئارامگرتنیش لەگەڵ خودا مانەوەیە، ئارامگرتنیش لە پێناوی خودادا بەڵایە، و ئارامگرتن لەگەڵ خودا وەفایە، و ئارامگرتن لە خوداش جەفایە.

**لە هۆنراوەیەکدا وتراوە:**

**والصبر عنك فمذموم عواقبه    والصبر في سائر الأشياء محمود**

(ئارامگرتن لە تۆ سەرئەنجامێکی ناپەسەندی هەیە، ئارامگرتن لە هەموو شتەکانی تردا جوان و پەسەندە)

**هەروەها وتراوە:**

**وكيف الصبر عمن حل مني    بمنزلة اليمين من الشمال**

**إذا لعب الرجال بكل شيء    رأيت الحب يلعب بالرجال**

(چۆن ئارامدەگیرێت لە کەسێك بۆ من وەك لای راست وایە بۆ لای چەپ، گەر پیاوان بە هەموو شتێك یاری بکەن، من دەبینیم خۆشەویستی بە پیاوان یاری دەکات)

**وتراوە:** ئارامگرتن لەسەر داواکان ناونیشانی بەدەستهێنانە، و ئارامگرتن لە میحنەتدا نیشانەی دەرووە.

**گوێم له مەنصوری كوڕی خەلەفی مـەغرییی بوو(رەحمـەتی خـودای لـێ بێـت) دەیوت:** یـەكێكیان رووتكـردەوە بـۆ قەمچـی لێـدان، كاتێـك گەڕایـەوە بـۆ بەندیخانـە هاوەڵێكی خۆی بانگ كرد هەندێ وردە زیوی لە دەمی دەرهێنا و كردییە دەستی، لەو بارەیەوە پرسیاری لێكرد، ئەویش وتی: دوو درهەمی زیوم لەناو دەمم دانابوو، یەكێك لەوانەی دانیشتبوون چاودێری منی دەكرد، بۆیە منیش نەمویست هاوار بكـەم و ئـەو پێی خۆش بێت، بۆیە دانم دەنا بە دوو درهەمەكەدا و لەناو دەممدا ورد بوون.

**وتراوە:** ئەو حاڵەی تۆی تێدای "رباط-سەنگەرگری"ی تۆیە، هەرچی شتە لـە خـوار خوداوە دوژمنی تۆیە، بۆیە زۆر بە باشی سەنگەرگری حاڵی خۆت بكـە تـاكو دوژمـن بەسەر تۆدا سەرنەكەوێت.

**دەربارەی "المصابرة" وتراوە:** بریتییە لە ئارامگرتن لەسەر ئـارامگرتن، تـا هـەموو ئارامگرتن لە ئارامگرتندا بەخت دەكرێـت و ئـارامگرتن لـە ئـارامگرتن دەستەوسـان دەبێت، وەك لە هۆنراوەیەكدا وتراوە:

**صابر الصبر فاستغاث به الصبر　فصاح المحب بالصبر صبرا**

(ئارامگرتن ئارامی گرت ئارامگرتنیش هانای بۆ برد، بۆیە خۆشەویستەكە هـاواری كرد لە ئارامگرتن و وتی: ئارامبگرە)

**وتـــراوە:** ماوەیـــەك شـــیبلی لـــە خەســـتەخانە بەنـــدكرا، كۆمـــەڵێك چـــوونە لای، پرسی: ئێوە كێن؟

وتیان: خۆشەویستانی تۆین بە سەردان هاتووین بۆ لات.

**شبلی بەردبارانی كردن و ئەوانیش هەڵهاتن، شیبلی پێـی وتـن:** درۆزنانـە، گـەر خۆشەویستی من بوونایە ئارامتان دەگرت لەسەر بەڵاكەی من.

**لە هەندێ ریوایەتدا هاتووە:** ئەوانەی لـە پێنـاوی منـدا شـان دەدەنـە ژێـر بـەڵا و ناخۆشی لەژێر چاودێری مندان.

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:**﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾الطور: ٤٨

**یەکێك لە پیاوان دەڵێت:** لە مەککە بووم.. هەژارێکم بینی تەوافی ماڵی خودای کرد، لە گیرفانی نوسراوێکی دەرهێنا و تەماشایەکی کرد، و تێپەڕی، بۆ سبەینێ لە تەوافدا هەمان شتی دووبارە کردەوە، چەندین ڕۆژ چاودێریم کرد ئەو هەموو ڕۆژێك هەمان شتی دووبارە دەکردەوە و یەکێك لە ڕۆژەکان کاتێك لە نووسراوەکە ورد دەبوویەوە هەندێك دوورکەوتەوە و کەوت بە زەویدا و گیانی سپارد، نووسراوەکەم لە گیرفانی دەرهێنا، بینیم تیایدا نووسرابوو: ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾ الطور: ٤٨

**وتراوە:** گەنجێك بینرا بە نەعلەکانی دەیدا بە روخساری پیرێکدا، پێی وترا: تۆ شەرم ناکەی.. بە نەعل دەکێشی بە روخساری ئەو پیرەدا ؟!

لە وەڵامدا وتی: تاوانێکی گەورەی کردووە، پێیان وت: تاوانەکەی چییە؟

وتی: ئەم پیرە بانگەشەی ئەوە دەکات ئارەزووی لە منە کەچی سێ ڕۆژە نەهاتووە بۆ بینینم.

**یەکێك لە پیاوان دەڵێت:** چوومە وڵاتی هند، پیاوێکم بینی یەك چاوی هەبوو، پێیان دەوت "فلانی ئارامگر"، پرسیاری حاڵی ئەو کەسەم کرد، وتیان: ئەمە لە سەردەمی لاوێتی خۆیدا هاوڕێیەکی سەفەری کرد، ئەویش بۆ خواحافیزی لێی ڕۆیشتە دەرەوە، یەکێك لە چاوەکانی فرمێسکی بۆ هاوڕێکەی باراند، بەڵام ئەویتریان نەگریا، وتی بەو چاوەیان کە فرمێسکی نەڕشت: بۆچی بۆ جیابوونەوە لە دۆستەکەم فرمێسکت نەباراند؟

دەبێ بێبەشت بکەم لە سەرنجدان و ڕوانین لە دونیا، بۆیە ئەو چاوەی داخست و بۆ ماوەی شەست ساڵە بەو چاوەی تەماشای دونیای نەکردووە.

**لەسەر ئایەتی:** ﴿ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ٥ ﴾ **المعارج: ٥ وتراوە:** "الصبر الجميل" ئەوەیە خاوەنی بەڵا و ناخۆشییەکە لەناو خەڵکیدا نەناسرێتەوە.

**عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:** گەر ئارامگرتن و شوکرکردن دوو حوشتر بن نازانم سواری کامیان ببم.

**ئیبن شەبرمە (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) کاتیٚك بەلاٚ بە سەریدا دادەباری دەیوت:** هەوریٚکە و پاشان دەڕەویٚتەوە.

**لە ریوایەتیٚکدا: پرسیار لە پیٚغەمبەر(ﷺ) کرا دەربارەی ئیمان، فەرمووی:** ((ئارامگرتن و لیٚبوردەیی))[38]

**عومەیر لە باوکییەوە ئەویش لە باپیرییەوە دەلیٚت: پرسیار لە پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی ئیمان، فەرمووی:** ((ئارامگرتن و لیٚبووردەیی))[39]

**پرسیار لە "السري" کرا** دەربارەی ئارامگرتن، ئەویش دەستی بە قسەکردن کرد دەربارەی ئارامگرتن، دووپشکیٚك بەسەر لاقەکانیدا هەلگەڕا کە چەندین جار پیٚوەی دا، بەلاٚم ئەو ئارام و بیٚدەنگ بوو، پیٚی وترا: بۆ لە خۆتی دوور ناخەیەوە؟

وتی: شەرم دەکەم لە خودا قسە لەسەر ئارامگرتن بکەم و ئارام نەگرم.

**لە هەندیٚ ریوایەتدا هاتووە:** هەژارانی ئارامگر ئەهلی مەجلیسی خودان لە رۆژی دواییدا.

**خودا وەحی بۆ هەندیٚ لە پیٚغەمبەرانی(علیهم الصلاة والسلام) کرد و پیٚی فەرموون:** "بەلاٚ"م بۆ سەر بەندەکەم دابەزاند، ئەویش دوعا و داوای لیٚکردم، منیش ماوەیەك وەلاٚمدانەوەم بۆی دواخست، ئەویش دەستی بە سکالاٚ کرد، منیش پیٚم وت: ئەی بەندەکەم چۆن رەحمت پیٚ بکەم لە شتیٚکدا کە بەوە رەحمت پیٚ دەکەم؟! (واتە بەلاٚی خودا بۆ بەندەکەی بۆی دەبیٚتە رەحمەت)

**"ابن عيينة" لەسەر مانای﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ السجدة: ٢٤ دەلیٚت:** کاتیٚك سەری هەموو کارەکەیان گرتە دەست ئەوانمان کرد بە سەرکردە و پیٚشەوە.

**گویٚم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) دەیوت:** رادەی ئارامگرتن ئەوەیە بەرهەلستی قەدەر نەکەی، دەرخستنی بەلاٚ بەبیٚ سکالاٚ

---

[38] {رواه أبو يعلى والطبراني}.

[39] {رواه أبو يعلى والطبراني}.

نەرێکاری ئارامگرتن نییە، خودا لە بەسەرهاتی ئەیوب(عليه السلام) دەفەرمویت:﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾﴾ ص: ٤٤ لەگەڵ ئەوەی خودا هەواڵمان پێ دەدا دەربارەی ئەیوب(عليه السلام) کە فەرموویەتی: ﴿أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ﴾ الأنبياء: ٨٣

**هەروەها گوێم لێبوو دەیوت:** خودا ئەو قسەیەی(واتە: **أني مسني الضر**) لە ئەیوب دەرهێنا بۆ ئەوەی ببێت بە هەناسەدانێك بۆ لاوازەکانی ئەم ئومەتە.

**هەندێکیان دەڵێن:** قورئان دەربارەی ئەیوب(عليه السلام) دەفەرمویت:﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا﴾ ص: ٤٤، نەیفەرموو: (صبورا) چونکە هەموو حاڵی بریتی نەبوو لە "صبر" بەڵکو لە هەندێ حاڵیدا چێژی لە بەلاکە وەردەگرت و لە هەندێکیدا ئازار، لە حاڵی چێژوەرگرتنەکەیدا ئارامگری نەویستووە، بۆیە خودا نافەرمویت(صبورا)

**هەروەها گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** راستەقینەی ئارامگرتن بریتییە لە دەرچوون لە بەلا بەپێی چوونە ناوی، وەك ئەیوب(عليه السلام) لە کۆتایی بەلاکەیدا دەفەرمویت﴿أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾﴾ الأنبياء: ٨٣، ئەدەبی گفتوگۆی پارێزگاری لێکرد کاتێك دەڵێت: (وأنت أرحم الراحمين) بە ئاشکرا نەیفەرموو: (ارحمني-رەحم پێ بکە)

**بزانە ئارامگرتن دوو جۆرە:**

١. ئارامگرتنی عابیدان.

٢. ئارامگرتنی خۆشەویستان.

**باشترین و جوانترینی ئارامگرتنی عابیدان** ئەوەیە هەمیشەیی و بەردەوام بێت.

**باشترین و جوانترینی ئارامگرتنی خۆشەویستان** ئەوەیە خۆشەویستییەکەی رەد دەکرێتەوە و ئەویش ئارام دەگرێت.

**لەو بارەیەوە لە هۆنراوەیەکدا وتراوە:**

**تبين يوم البين أن اعتزامه    على الصبر إحدى الظنون الكواذب**

(رۆژی له یه‌كدابڕان ئه‌وه رۆشن بوویه‌وه سووربوونی له‌سه‌ر ئارامگرتن یـه‌كێك بـووه له گومان و درۆ گه‌وره‌كان) چونكه خۆشه‌ویستان به دابڕانیش هه‌ر یه‌كیان خۆشده‌وێت.

**له‌سه‌ر ئه‌م مانایه گوێم له مامۆستا ئه‌بو عه‌لی ده‌قاق بوو(ره‌حمه‌تی خودای لیٚ بێت) ده‌یوت:** به‌یانییه‌كه‌ی یه‌عقوب(عليه السلام) فه‌رمووی:﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ یوسف: ٨٣ به‌ڵێنی ئارامگرتنی له‌سه‌ر نه‌فسی خۆیدا، واته حاڵ و باری ئارامگرتنێكی جوان ده‌بێت، پاشان ئێواره‌كه‌ی فه‌رمووی: (﴿يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ﴾ یوسف: ٨٤).

٢١

# چاودێری

((هەر کەس لە ختوورەکانیدا چاودێری خودایی هەبێت خودا لە ئەندامەکانیدا دەیپارێزێت..))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا ۝٥٢﴾ الأحزاب: ٥٢**

**لە "جرير بن عبدالله البجلي"ەوە:((جبريل(عليه السلام) لە شێوەی پیاوێکدا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، و پێی فەرموو: ئەی محەمەد، ئیمان چییە؟**

فەرمووی: ئیمان ئەوەیە باوەڕ بە خودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و قەدەر بە خێر و شەڕ و شیرین و تاڵییەوە بهێنیت، فەرمووی: ڕاست دەکەیت، دەڵێ: سەرمان سوڕما لەوەی پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکات و پێشی دەڵێت: ڕاست دەکەی.

فەرمووی: هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیسلام؟

وتی: ئیسلام[٤٠] ئەوەیە نوێژ بکەی و زەکات بدەی و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خودا بکەی، فەرمووی: ڕاست دەکەی.

فەرمووی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیحسان؟

فەرمووی: ئیحسان ئەوەیە خودا بپەرستی وەك ئەوەی ببینیت، گەر نەتوانی بەو جۆرە بیت ئەوا ئەو دەتبینێت، فەرمووی: ڕاست دەکەی...))[٤١]

---

٤٠ {ئەم فەرموودەیە ئیمامی قوشەیری وەکو (محدیپ)ێك ریواتی کردووە، بەڵام ئێمە پیاوانی سەندەکەمان لابردووە بۆیە لە فەرموودە مشهورەکەدا ووشەی شهادەی تیایە بەڵام لەم فەرموودەیەدا نیە}.

٤١ {رواه الشيخان وغيرهما}.

**ئیمامی قوشەیری دەڵێت:** ئەو بەشەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ):((گەر نەتوانی بەو جۆرە بیت ئەوا ئەو دەتبینێت)) ئاماژەیە بە حاڵی چاودێری، چونکە چاودێری بریتییە لە زانست و ئاگاهی بەندە بە تەماشاکردنی خودا(ﷻ) بۆ ئەو، بەردەوامبوونی لەو زانست و ئاگاهییەدا چاودێری کردنی پەروەردگارییەتی، ئەمەش بۆی دەبێتە بنچینە و بنەڕەتی هەموو خێرێك، ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە تا پلەی خۆدادگاییکردنی بەدەست نەهێنابێت، گەر دادگایی نەفسی خۆی کرد لەسەر ئەو کارانەی لێی وەشاوەتەوە و حاڵی خۆی لە ئێستادا چاك کرد و پابەندبوونی بە گرتنەبەری ڕێگا ڕاگەیاند و نێوانی خۆی و خودای بە سازدانی دڵ چاککرد و هەناسەکانی لەگەڵ خودا پارێزگاری لێ کرد و لە هەموو حاڵەکانیدا چاودێری خودایی کرد و زانی خودا(ﷻ) لەسەر ئەو چاودێرە و لە دڵییەوە نزیکە و حاڵ و باری ئەو دەزانێت و کردارەکانی دەبینێت و قسەکانی دەبیستێ، هەر کەس لە کۆی ئەمانە بێئاگا بوو ئەو کەسە لە سەرەتای گەیشتن بێبەش بووە، ئیتر چۆن دەتوانێت حەقیقەتی نزیکی لە خوداوە بەدەست بهێنێت؟

**"الجريري" دەڵێت:** هەر کەس لە نێوان خۆی و خودادا تەقوا و چاودێری نەکات بە دادوەر ناگاتە پەردە لەسەر لادان و بینین.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئەمیرێك وەزیرێکی هەبوو، ڕۆژێك لە بەردەستی دانیشتبوو، لای بە لای ئەو گەنجانەدا کردەوە لە خزمەت ئەمیردا ڕاوەستابوون، نەك گومانی لێیان بێت، بەڵکو بەهۆی جووڵە و دەنگێکەوە هەستی کرد لەو گەنجانەوە پەیدا بوو، وا ڕێکەوت ئەمیرەکە لەو کاتەدا تەماشای وەزیرەکەی دەکرد، وەزیرەکە ترسا ئەمیر وا بیربکاتەوە وەزیرەکەی تەماشای ئەو گەنجانەی کردووە، بۆیە ئەویش تەماشای ئەمیری کردەوە، ڕۆژێك دوای ئەوە وەزیرەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای ئەمیر، وەزیرەکە بە بەردەوامی تەماشای لایەکی دەکرد، تا ئەمیرەکە وا گومانی برد وەزیرەکەی خێلە و بەو جۆرەیە، ئەمە بریتییە لە چاودێری بەندەیەك بۆ بەندەیەکی هاوشێوەی خۆی، ئەی دەبێ چاودێری بەندە بۆ خودای موتەعال چۆن بێت؟!

**لە هەژارێکم بیست دەیوت:** ئەمیرێك خزمەتکارێکی لاوی هەبوو لە هەموان زیاتر رووی پێ دەدا، لە کاتێکدا ئەو خزمەتکارە بەهای لەوان زۆرتر و شێوەی لەوان جوانتر نەبوو، لەو بارەیەوە پرسیاریان لە ئەمیر کرد، ئەمیرەکە ویستی چاکە و باشەی خزمەتکارەکە بەسەر ئەوانی تردا رۆشن بکاتەوە، رۆژێك ئەمیر سواری ئەسپێك بوو، خەڵکێکی زۆر لەگەڵی بوون، لە دوورەوە چیایەك دیاربوو بەفری بە لوتکەوە بوو، ئەمیرەکە تەماشایەکی بەفرەکەی کرد و پاشان سەری داخست، خزمەتکارەکە ئاوزەنگی دا لە ئەسپەکەی و رۆیشت، خەڵکی نەیانزانی بۆ کوێ دەچێت، زۆری نەبرد گەڕایەوە و بەفری لەگەڵ خۆی هێنا بوو، ئەمیر پێی وت: چۆنت زانی من حەزم لە بەفر بوو؟

خزمەتکارەکە وتی: چونکە تەماشای بەفرەکەت کرد، سەرنجی سوڵتان بۆ شتێك بێ مەرام و مەبەستی دروست نییە، ئەمیرەکە وتی: کاتێك من ئەم خزمەتکارە بە رێز و رووتێکردن تایبەت دەکەمەوە، چونکە هەر کەسێك سەرقاڵییەکی هەیە، سەرقاڵی ئەم گەنجە سەرنجەکانی من و تێڕوانینە لە حاڵ و باری من.

**هەندێکیان دەڵێن:** هەر کەس خودا لەسەر خوتوورەکانی ناخی بکات بە چاودێر ئەوا خودا ئەندامەکانی لە گوناه دەپارێزێت.

**پرسیار لە ئەبو حوسەینی کوڕی هند کرا:** کەی شوان رانەمەڕەکەی بە گۆچانی چاودێری لە لەوەڕگای تیاچوون دەردەکات؟

وتی: گەر زانی چاودێرێکی لەسەرە.

وتراوە: ئیبن عومەر(خودا لێیان رازی بێت) لە سەفەرێکدا مێردمنداڵێکی بینی مەڕی دەلەوەڕاند، پێی وت: یەکێك لەم مەڕانەم پێ دەفرۆشی؟

وتی: من خاوەنیان نیم، وتی: بە خاوەنەکەی بڵێ گورگ یەکێکیانی خوارد، مێردمنداڵەکە وتی: ئەی خودا لە کوێیە؟

ئیبن عومەر ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە بەردەوام ئەوەی دەوتەوە کە مێردمنداڵەکە وتی: ئەی خودا لە کوێیە؟

**جونەید دەڵێت:** هەر کەس چاودێری بەدەست بهێنێت لە تیاچوونی بەشی خۆی لە خودا دەترسێت نەك لە شتێکی تر.

**مامۆستایەك کۆمەڵێك قوتابی هەبوو**، یەکێك لە قوتابییەکانی بە رووپێدان و گرنگیپێدان لەوانی تر جیاکردبووەوە، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، ئەویش باڵندەیەکی دا بە هەریەکەیان، و پێی وتن: هەریەك لە ئێوە باڵندەکەی خۆی لە شوێنێك سەربڕبرێت کەس چاوی لێ نەبێت، هەریەکەیان باڵندەکەی خۆی لە شوێنێکی چۆڵدا سەربڕی... بەڵام ئەو قوتابییەیان باڵندەکەی بۆ مامۆستا گێڕایەوە و سەرینەبڕی، مامۆستاکەی پرسیاری لێکرد، ئەویش وتی: تۆ فەرمانت پێکردم لە شوێنێك سەریببڕم کەس نەیبینێت، شوێنێك بوونی نەبوو خودا(ﷻ) نەیبینێت، مامۆستاکە وتی: بۆ ئەو مەبەستەیە لە ئێوە زیاتر گرنگی پێ دەدەم و پێشی دەخەم.

**"زو نونی مصری" دەڵێ:** نیشانەی چاودێری: هەڵبژاردنی ئەوەیە خودا(ﷻ) بۆتی هەڵدەبژێرێت و بەمەزنڕاگرتنی ئەوەی خودای موتەعال بە مەزنی ڕاگرتووە و بچووك تەماشاکردنی ئەوەی خودا بچووك تەماشای کردووە.

**نەصرابادی دەڵێت:** رجا بەرەو کاری چاکە و گوێڕایەڵی هەڵتدەنێت، ترسیش لە یاخیبوون دوورت دەخاتەوە، چاودێریش سەرت لە پلەکانی حەقیقەتەوە دەردەکات.

**ئەبو عەباسی بەغدادی دەڵێت:** پرسیارم لە "أبو جعفر بن نصیر" کرد دەربارەی چاودێری وتی: چاودێری کردنی نهێنی و پەنهانە بۆ تەماشاکردنی خودا(ﷻ) لە هەموو خوتوورەیەکدا.

**"الجریري" دەڵێت: ئەم کارەی ئێمە لەسەر دوو پایە بیناکراوە:**

**یەکەمیان** نەفسی خۆت پابەند بکەی بە چاودێری خوداوە(ﷻ) و **زانست** لەسەر ڕواڵەت و دەرەوەت ڕاست بوویێتەوە(واتە پابەند بیت بە ئەمر و نەهی شەریعەتەوە).

**مورتەعیش دەڵێت:** چاودێری بریتییە لە چاودێری کردنی نهێنیت بە تەماشاکردنی پەنهان لە هەموو چرکە و وشەیەکدا.

**پرسیار لە ئیبن عەتا کرا:** باشترین چاکە و گوێڕایەڵی کامەیە؟ وتی: چاودێری کردنی حەق(سبحانه وتعالى) بە بەردەوامی.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** ڕەچاوکردن چاودێری دروست دەکات، چاودێریش پاڵفتەبوونی نهێنی و ئاشکرای کەسەکە بۆ خودا(سبحانه وتعالى) بەرهەم دەهێنێت.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** باشترین شتێك بەندە نەفسی خۆی لەسەر ئەم ڕێگەیە پێوە پابەند بکات: خۆدادگایی کردن و چاودێری و رامهێنانی کارەکانییەتی بەپێی زانست(شەریعەت).

**هەروەها ئەبو عوسمان دەڵێت:** ئەبو حەفص پێی وتم: گەر دانیشتی بۆ ئامۆژگاری کردنی خەڵکی ئەوا ببە بە ئامۆژگاریکەری دڵ و دەروونت، کۆبوونەوەی خەڵکی لێت فریوت نەدات، چونکە ئەوان تەنها دەرەوە و روواڵەتی تۆ دەبینن و خودا چاودێری ناوەوەت دەکات.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** یەکێك لە مامۆستاکانم پێی وتم: ڕەچاوی نهێنیت بکە و ئاگات لە چاودێری بێت.. دەڵێت: ڕۆژێك بە دەشت و سارادا دەگەڕام گوێم لە خشەخشێك بوو لە دوامەوە، و ڕاچڵەکانێکی بۆ دروست کردم.. ویستم لا بکەمەوە، بەڵام لام نەکردەوە.. شتێکم بینی خۆی هەڵدایە سەر شانەکانم.. من هەر بەردەوام چاودێری ناوەوەی خۆمم دەکرد، شتەکە لێم دوورکەوتەوە و ڕۆیشت، کە ئاوڕمدایەوە بینیم دڕندەیەکی گەورەیە.

**"الواسطي" دەڵێت:** باشترین چاکە پارێزگارییە لە کاتەکان، ئەوەش: ئەوەیە بەندە سنووری خۆی تێنەپەڕێنێت و تەنها چاودێری پەروەردگاری بکات و تەنها لەناو کاتی خۆی(ئێستا)دا بژی.

❁ ❁ ❁

## ٢٢

# رازیبوون

**((رازیبوون: دەرکردنی بێزارییە لە دڵ، بۆ ئەوەی تەنها دڵخۆشی و سرووری تێدا بێت))**

**خودا(ﷻ) دەفەرمویێت:﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾البينة: ٨**

**لە جابرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((لە کاتێکدا ئەهلی بەهەشت لە دانیشتنێکدان، نوورێك لە دەرگای بەهەشتەوە دەردەکەوێت، ئەوانیش سەر بەرز دەکەنەوە، دەبینن پەروەردگار دەرکەوتووە و تەماشایان دەکات، پێیان دەفەرمویێ: ئەی ئەهلی بەهەشت، داوام لێ بکەن، دەڵێن: داوای رازیبوونی تۆ دەکەین، خودا(ﷻ) دەفەرمویێت: داوای زیادەمان لێدەکەن، دەفەرمویێ: یاقووتی سووری بەنرخیان بۆ دەهێنن کە بە زومرودی سەوزەوە کراون، ئەهلی بەهەشت دێن بۆ سەری، هەتا چاو هانا بکات بۆیان دادەنرێت، خودا(ﷻ) فەرمان دەکات بە هێنانی درەخت کە بەریان پێوەیە و هێنانی جاریە لە حۆرلعەین، حۆرلعەینەکان دەڵێن: ئێمە نازدارانین و هەرگیز پیر نابین، نەمرین و مەرگ roومان تێناکات، هاوسەری دەستەیەکی باوەڕداری بەڕێزین، خودا(ﷻ) فەرمان دەکات بە کۆمای گەورە لە میسکی سپی بۆنخۆش، بایەکی بۆنخۆشی لێوە سەرهەڵدەدات پێی دەوترێت "المثيرة" تا دەگاتە بەهەشتی عەدن، ئەو شوێنەش ناوەڕاستی بەهەشتە، فریشتەکان دەڵێن: پەروەردگار ئەو دەستەیە هاتن، خودا دەفەرمویێت: مەرحەبا لە صادیقان.. مەرحەبا لە ملکەچان، دەفەرمویێ: خودا پەردەیان بۆ لادەبات و تەماشای خودا(ﷻ) دەکەن، بە نووری

ڕەحمان خۆشی وەردەگرن، تا وایان لیٚ دێت یەکتری نابینن، پاشان دەفەرمویٚ: بە شتی گرانبەها و نەختینەوە بیانگێڕنەوە بۆ کۆشکەکانیان، دەفەرمویٚ: دەگەڕێنەوە، ئەوجا یەکتری دەبینن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەش مانای ئایەتی:﴿ نُزُلًا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴿٣٢﴾ ﴾ فصلت: ٣٢))

عێراقییەکان و خۆراسانییەکان لە رازیبووندا جیاوازیان لە نێواندا هەیە: ئایا لە حاڵەکانە یان لە مەقامەکانە؟

**ئەهلی خوراسان دەڵێن:** رازیبوون یەکێکە لە مەقامەکان و کۆتایی تەوەکولە و ماناکەی: ئەوەیە رازیبوون بە هەوڵ و کۆشانی بەندە بەدەست دێت.

**بەلاّم عێراقییەکان دەڵێن:** رازیبوون یەکێکە لە حاڵەکان و بەری دەستی بەندە نییە، بەڵکو میوانێکە وەکو هەر هاتوویەکی تر روو لە دڵ دەکات.

دەتوانین ئەم دوو بۆچوونە کۆبکەینەوە، دەوترێت سەرەتای رازیبوون بە هەوڵ و کۆششی بەندەیە و لە ریزی مەقامەکانە، بەلاّم کۆتایی رازیبوون لە حاڵەکانە و بە هەوڵ و کۆشیی بەندەوە نەبەستراوە.

خەڵکی قسەیان لە رازیبوون کردووە، هەر کەس گوزارشتی لە حاڵ و مەشرەبی خۆی کردووە، ئەوان لە گوزارشتەکانیاندا جیاوازن، وەك چۆن لە هەڵگۆزین و بەشیاندا جیاوازیان لە نێواندا هەیە.

مەرجی زانست-کە هەر دەبیٚ ببێت-: کەسی رازی بە خودا(ﷻ) ئەو کەسەیە بەرهەڵستی بڕیارەکانی خودا ناکات.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لیٚ بێت) دەیوت:** رازیبوون ئەوە نییە هەست بە بەلاّ نەکەیت، بەڵکو رازیبوون ئەوەیە بەرهەڵستی بڕیار و قەزا نەکەی.

**بزانە پێویست لەسەر بەندە ئەوەیە:** رازی بێت بەو قەزایەی کە فەرمان کراوە پێیرازی بێت، چونکە مەرج نییە هەموو قەزایەك بۆ بەندە شیاو بێت و پێی رازی بێت، وەك گوناه و یاخیبوونەکان و جۆراوجۆری بەلاّ و ناخۆشییەکانی موسڵمانان.

**گەورەپیاوان دەڵێن:** رازیبوون مەزنترین دەرگای خودایە، مەبەستیان ئەوەیە: هەر کەس بە رازیبوون رێزی لێگیرا باشترین و مەزنترین پێشوازی لێ دەکرێت و بالآترین نزیکبوونەوە لە خوداوە بەدەست دەهێنێت.

**عەبدولواحیدی کوڕی زەید دەڵێت:** رازیبوون دەرگای مەزنی خودایە و بەهەشتی دونیایە.

بزانە بەندە ناگاتە رازیبوون لە خودا(ﷻ) تاکو خودا لە بەندە رازی نەبێت، چونکە خودا(ﷻ) دەفەرمویت:﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾البينة: ٨

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** قوتابییەك بە مامۆستاکەی وت: ئایا بەندە دەزانێت خودا(ﷻ) لە ئەو رازییە؟ وتی: نەخێر، چۆن ئەوە دەزانێت لە کاتێکدا رازیبوونی خودا پەنهان و نادیارە؟ قوتابییەکە وتی: بەڵکو ئەوە دەزانێت، وتی: چۆن؟ وتی: گەر بینیم دڵم رازییە لە خودا(ﷻ) ئەوا دەزانم خودا لە من رازییە، مامۆستاکە وتی: باشت وت ئەی گەنج.

**وتراوە:** موسا(ﷺ) فەرموویەتی: خودایە، کارێکم پێ بڵێ گەر ئەنجامم دا تۆم لێ رازی بیت، فەرمووی: تۆ ناتوانی بچییە ژێر ئەو کارە، موسا(ﷺ) رۆیشت بە سوژدەدا و دەستی بە نزا و پاڕانەوە کرد، خودا(ﷻ) وەحی بۆ نارد و فەرمووی: ئەی موسای کوڕی عیمران رازیبوونی من لە رازیبوونی تۆدا بە بڕیاری بڕاوەی منە.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** گەر بەندە لە حەز و ئارەزووەکان ئاسوودە بوو ئەو کەسە رازییە.

**نەصرابادی دەڵێت:** هەر کەس دەیەوێت بگاتە جێگەی رازیبوون با پابەند بێت بەو شتانەوە خودا رازیبوونی خۆی تێدا داناوە.

**محەمەدی کوڕی خەفیف دەڵێت: رازیبوون دوو بەشە:** رازیبوون پێی و رازیبوون لێی، **رازیبوون پێی ئەوەیە:** رازی بیت بەوەی کە خودا(ﷻ) کارهەڵسوڕێنەر و تەگبیرکەرە بۆت، **رازیبوونیش لێی ئەوەیە:** رازی بیت بەوەی بڕیاری لێ دەدات بۆت.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** رێگەی سالیکان درێژترە، چونکە رێگەی خۆڕامهێنانە، رێگەی تایبەتان نزیکترە، بەڵام سەخت و دژوارترە، ئەوەش ئەوەیە کارەکانت بە رازیبوون بێت و رازی بیت بە قەزای خودایی.

**ڕوەیم دەڵێت:** ڕازیبوون ئەوەیە گەر خودا دۆزەخ لەلای ڕاستی ئەوەوە(لای ڕاستی بەندەکەوە) دابنێت داوا ناکات بیگۆڕێت بۆ لای چەپی(مەبەستی وەرگرتنی شەهادەیە بە لای ڕاست یان بە لای چەپ).

**ئەبوبەکری کوڕی تاهیر دەڵێت:** ڕازیبوون دەرکردنی بێزاری و ناڕازیبوونە لە دڵ تا وای لێدێت تەنها خۆشی و سرووری تێدا دەمێنێتەوە.

**"الواسطي" دەڵێت:** کۆشانت لە ڕازیبووندا بەکاربهێنە، ڕێگە مەدە ڕازیبوون بەکارت بهێنێت، چونکە ئەو کات بە چێژی ڕازیبوون بێبەش دەبیت لە ڕاستەقینەی ئەوەی کاری بۆ دەکەی.

بزانە ئەم قسەیەی **"الواسطي"** دەیکات شتێکی زۆر مەزنە، ئاگادارییەکی تێدایە بۆ ئەو شتەی کەسانی سەر ئەم ڕێگەیە لە ڕۆیشتن دادەبڕێت، ئاسوودەیی و ئارامی بۆ لای حاڵەکانیان پەردەیەکە دەکەوێتە نێوان ئەوان و ئەو کەسەی حاڵەکانیان بۆ ڕەوانە دەکات(واتە خودا)، کاتێك چێژی لە ڕازیبوون بینی لە دڵیدا ئاسوودەیی ڕازیبوون دەبینێتەوە، لێرەوە بە هۆی حاڵەکەیەوە لە بینینی حەق بێبەش دەبێت.

**هەروەها "الواسطي" دەڵێت:** ئاگاتان لە شیرینییەکانی کاری چاکە بێت، چونکە ژەهرێکی کوشندەن.

**ئیبن خەفیف دەڵێت:** ڕازیبوون سوکنایی و ئارامی دڵە بۆ بڕیارەکانی خودا(ﷻ) و تەبایی دڵ بەوەی خودا پێی ڕازی بووە و هەڵیبژاردووە بۆ ئەو.

**پرسیار لە ڕابیعەی عەدەوی کرا:** کەی بەندە ڕازی دەبێت؟

وتی: گەر ناخۆشییەکان دڵخۆشی بکات وەك چۆن خۆشییەکان دڵخۆشی دەکات.

**وتراوە:** شیبلی لەبەردەم جونەیدا وتی: **"لا حول ولا قوة إلا بالله"**، جونەید پێی وت: ئەو قسەت سینە دێنێتەوە یەك، سینە هاتنەوەیەکیش بە هۆی وازهێنانەوەیە لە ڕازیبوون بە بڕیارە بڕاوەکان، شیبلی بێدەنگ بوو.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** ڕازیبوون ئەوەیە داوای بەهەشت لە خودا بکەی و لە دۆزەخ پەنا نەگریت.

**"زو نونی مصری"(ڕەحمەتی خودای لیٚ بیێت) دەڵیٚت: سیٚ شت لە نیشانەکانی ڕازیبوونن:**

<u>وازهێنان لە هەڵبژاردن لە بڕیارە بڕاوەکاندا</u>، و <u>نەمانی تاڵاو لەدوای بڕیارە بڕاوەکان</u> و <u>هەڵچوونی خۆشەویستی لە ناواخنی بەڵادا</u>.

**بە حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب(خوایان لیٚ ڕازی بیێت) وترا:** ئەبو زەڕ(خودا لیٚی ڕازی بیێت) دەڵیٚت: هەژاریم لا خۆشترە لە دەوڵەمەندی، و نەخۆشیم لە لەشساغی پیٚ خۆشترە، حوسەین فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە ئەبو زەڕ، بەڵام من دەڵیٚم: هەر کەس لەسەر هەڵبژاردنی خودا بۆ ئەو شانی دادا بیێت تەنها ئەوە بە باش دەبینیٚت خودا(سبحانه وتعالى) بۆی هەڵدەبژێریٚت.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز وتی بە بیشری حافی:** ڕازیبوون باشترە لە زوهد لە دونیا، چونکە کەسی ڕازی ئاوات بۆ مەنزیلەیەکی بانتر ناخوازیٚت.

**پرسیار کرا لە ئەبو عوسمان دەربارەی ئەو فەرموودەی پیٚغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرمویٚت:** ((أسألك الرضا بعد القضاء-داوای ڕازیبوونت لیٚ دەکەم لە دوای بڕیاری بڕاوەت)) وتی: ڕازیبوون پیٚش قەزا سووربوون و لیٚبڕانە لەسەر ڕازیبوون، بەڵام ڕازیبوون لە دوای قەزا بریتییە لە خودی ڕازیبوون(ئەمەی دووەمیان کە پیٚغەمبەر(ﷺ) داوای دەکات کامڵترە).

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵیٚت:** ڕجام وایە شتیٚك لە ڕازیبوونم زانیبیٚت، گەر بمخاتە ناو ئاگرەوە بە بڕیارەکەی ڕازی دەبم.

**"أبو عمر الدمشقي" دەڵیٚت:** ڕازیبوون بریتییە لە هەڵگرتنی نیگەرانی لە هەر بڕیاریٚك خودا بۆ ئەوی دەردەکات.

**جونەید دەڵیٚت:** ڕازیبوون بریتییە لە هەڵگرتنی هەڵبژاردن.

**ئیبن عەتا دەڵیٚت:** ڕازیبوون بریتییە لە سەرنجی دڵ بۆ هاودەمی هەڵبژاردەی خودایی بۆ بەندەکەی.

**ڕوەیم دەڵیٚت:** ڕازیبوون بریتییە لە پیٚشوازی لە بڕیارەکان بە دڵخۆشییەوە.

**"المحاسبي" دەڵێت:** رازیبوون بریتییە لە سوکنایی و ئارامی دڵ لەژێر گوزەر کردنی بڕیارەکاندا.

**"النوري" دەڵێت:** رازیبوون بریتییە لە سرووری دڵ بە تاڵاوی بڕیارە بڕاوەکان.

**ئەبو حوسەینی فارسی دەڵێت:** گوێم لە **"الحريري"** بوو دەیوت: هەر کەس بە خوار قەدەرەکانی رازی بێت خودا بەرزی دەکاتەوە بۆ سەرەو ئامانجەکەی.

**ئەبو تورابی نەخشەبی دەڵێت:** ناگاتە رازیبوون ئەو کەسەی شتێك لە دونیا لەناو دڵێدایە.

**لە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ((ئەو کەسەی رازی بێت بەوەی خودا پەروەردگاری بێت چێژی ئیمانی کردووە))

**وتراوە:** عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێی رازی بێت) بۆ ئەبو موسای ئەشعەری(خودا لێی رازی بێت) نووسی: ((پاشان، هەموو خێرێك لە رازیبووندایە، گەر توانیت رازی بە، ئەگەر نە ئارام بگرە)).

**وتراوە:** عوتبەی غولام شەوێك تا بەیانی دەیوت:((گەر سزام بدەی من هەر تۆم خۆشدەوێت، گەر رەحمم پێ بکەی من هەر تۆم خۆشدەوێت))

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** مرۆڤ فەخفورییە، بۆ فەخفووری هیچ ترسێك نییە بەرانبەر رووبەڕووبوونەوە بە بڕیاری حەق(سبحانه وتعالى).

**ئەبو عوسمانی حەریری دەڵێت:** ماوەی چل ساڵە خودا(سبحانه وتعالى) لە بارێکدا داینەناوم پێم ناخۆش بووبێت و نەیگواستوومەتەوە بۆ حاڵێك لێی بێزار بووبم.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** پیاوێك لە بەندەیەکی خۆی تووڕە بوو، بەندەکە کەسێکی بۆ لای گەورەکەی خۆی کرد بە تکاکار، ئەویش لێیبوورا، بەندەکە دەستی بە گریان کرد، کەسە تکاکارەکە پێی وت: بۆ دەگریت گەورەکەت لە تۆ بووراوە؟

گەورەکە وتی: ئەو داوای رازیبوونم لێ دەکات(لە پاش لێخۆشبوون) بەڵام رێگەیەك نییە لە بەردەمیدا بۆ گەیشتن بەوە، لە پێناوی ئەوەدا دەگری.

**٢٣**

# بەندایەتی

**((بەندایەتی: جوانی و رازاوەیی بەندەیە، هەر کەس وازی لیَ بهێنێت لە جوانی و رازاوەیی دوور دەکەوێتەوە))**

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر: ٩٩

**لە ئەبی سەعیدی خودری و ئەبی هورەیرەوە(خوایان لیَ رازی بێت) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ((حەوت (جۆر کەس) خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لە رۆژێکدا هیچ سێبەرێك بوونی نییە جگە لە سێبەری عەرشی ئەو: ئیمامێکی دادپەروەر، و گەنجێك لە عیبادەتی خودادا گەورە بووبێت، و پیاوێك دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە کاتێك دەردەچێت لە مزگەوت تا بۆی دەگەڕێتەوە، دوو پیاو لەبەر خودا یەکتریان خۆشبوێت و لەبەر خودا کۆببنەوە و لەبەر خودا لەیەکتر جیاببنەوە، و پیاوێك بەتەنها یادی خودا بکات و چاوەکانی فرمێسکی لیَ داباریێت، و پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن جوانی بانگی بکات و ئەویش بڵێ: من لە خودا پەروەردگاری هەموو جیهانان دەترسم، و پیاوێك خێرێك بکات و بیشارێتەوە هەتا دەستی چەپی نەزانێت دەستی راستی چی بەخشیوە)).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لیَ بێت) دەیوت:** بەندایەتی(**العبودية**) لە پەرسش(**العبادة**) تەواوترە، یەکەمجار پەرسش پاشان بەندایەتی و ئەوجا کۆیلەبوون(**عبودة**).

پەرسش بۆ هەموو باوەڕدارانە بە گشتی و بەندایەتی بۆ تایبەتانە و کۆیلەبوونیش بۆ تایبەتی تایبەتان.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:**

- پەرسش بۆ کەسێکە زانستی یەقینی هەبێت.
- بەندایەتی بۆ کەسێکە چاوی یەقینی هەبێت.
- کۆیلەبوونیش بۆ کەسێکە حەقی یەقینی هەبێت.

**دیسان گوێم لێ بوو دەیوت:**

- پەرسش بۆ بۆ خاوەن تێکۆشانەکانە.
- و بەندایەتی بۆ ئەوانەیە ئازار و ماندووبوون دەچێژن.
- و کۆیلەبوونیش سیفەتی ئەوانەیە گەیشتوونەتە موشاهەدە.

**هەر کەس لە نەفسی ببورێت** خاوەنی پەرسشە، **هەر کەسیش دڵی ببەخشێت** خاوەنی بەندایەتییە، **هەر کەسیش ڕۆحی فیدا بکات** خۆی بە کۆیلەی کردووە.

**هەروەها دەوترێت: بەندایەتی:** بریتییە لە هەستان بە مافی گوێڕایەڵی و چاکە بە مەرجی تێر و تەواوی و تەماشاکردنی ئەوەی لە تۆوەیە بە چاوی کەموکورتی و کەمتەرخەمی و بینینی ئەوەی لە خوداوەیە بە چاوی ڕێز و گەورەیی.

**هەروەها وتراوە:** بەندایەتی بریتییە لە وازهێنان لە هەڵبژاردن لەوەی دەردەکەوێت لە قەدەرەکان.

**هەروەها وتراوە:** بەندایەتی خۆدارنینە لە هەوڵ و هێزی خۆ و داننانە بەوەی پێت دەوترێت و چاودێری دەکرێیت لە دەسەڵات و منەت.

**هەروەها وتراوە:** بەندایەتی: دەستلەملانبوونی ئەوەیە فەرمانت پێکراوە و جیابوونەوەیە لەوەی هەڕەشەت لێکراوە.

## پرسیار لە محەمەدی کوڕی خەفیف کرا: کەی بەندایەتی دروست دەبێت؟

وتی: گەر هەمووی بخاتە بەردەم مەولای خۆی و لەسەر بەڵاکانی ئارام بگرێت.

**سەهلی کوڕی عەبدولڵا دەڵێت: بەندایەتی کەسێك دروست نابێت تا لـە چوار شت ترسی نەمێنێت:**

١. برسێتی.

٢. رووتی.

٣. هەژاری.

٤. زەلیلی.

**وتراوە:** بەندایەتی ئەوەیـە هـەموو بـوونی خـۆتی رادەسـت بکـەی و هـەموو کـۆڵ و بارەکانت سپاردەی ئەو بکەیت.

**وتراوە:** لە نیشانەکانی بەندایەتی: وازهێنانە لە تەگبیر و بینینی قەدەرەکان.

**"زو نونی مصری" دەڵێت: بەندایەتی:** ئەوەیە تۆ لە هەموو بارێکـدا بەنـدەی ئـەو بیت وەك چۆن ئەو لە هەموو حاڵێکدا پەروەردگاری تۆیە.

**"الجريري" دەڵێت:** بەندەی نیعمەتەکان زۆرن، بەڵام بەندەی خاوەن نیعمەت کـەم و دەگمەنە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** تۆ بەندەی کەسێکی کە بەنـد و یەخسیری ئەویت، گەر یەخسیری دەستی نەفسی خۆت بیت تۆ بەندەی نەفسی خـۆتی، گەر یەخسیری دەستی دونیای تۆ بەندەی دونیایت.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((رسوا بێت بەندەی درهەم، رسوا بێت بەندەی دینار، رسوا بێت بەندەی پۆشاك))

**ئەبو رەزین پیاوێکی بینی پێی وت: پیشەت چییە؟**

**وتی:** خزمەتکاری کەر.

وتی: خودا کەرەکەت بکوژێت بۆ ئەوەی ببیت بە بەندەی خودا نەك بەندەی کەر.

**عەبدوڵای کوڕی مەنازل دەڵێت:** بەندە بەندەیە گەر داوای خزمەتکارێك بۆ نەفسی خۆی نەکات، گەر خزمەتکارێکی بۆ خۆی داوا کرد ئەوا لە سنوور و رادەی بەندایەتی دەرچووە و ئادابی بەندایەتی وازلێهێناوە.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** بەندایەتی بۆ بەندەیەك نایەتە راستە تا نەگاتە ئەوەی لە هەژاری و نەبوونیدا کاریگەری گەدایی پێوە دیار نەبێت و لە دەوڵەمەندی و هەبوونیشدا کاریگەری دەسەڵاتی پێوە دیار نەبێت.

**وتراوە:** بەندایەتی بریتییە لە بینینی پەروەردگاریی خودا(ﷻ).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** گوێم لە نەصرابادی بوو دەیوت: بەهای بەندە بە پەرستراوەکەیەوە بەستراوە، وەك چۆن بەرزی و مەزنی عاریف بە مەعریفەکەوە بەستراوە.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** بەندایەتی جوانی بەندەیە، هەر کەس وازی لێبێنێت وازی لە جوانی هێناوە.

### "الناجی" دەڵێت: بنەڕەت و بنچینەی عیبادەت لە سێ شتدایە:

١. هیچ شتێك لە حوکمەکانی رەد نەکەیەوە.

٢. هیچ شتێکت نەبێت بۆ ئەو(ﷻ) بەختی نەکەی.

٣. لێت نەبیستێ داوای پێویستییەك لە کەسێك بکەیت جگە لە ئەو(ﷻ).

### ئیبن عەتا دەڵێ: بەندایەتی لە چوار خەسڵەتدایە:

١. وەفاکردن بە پەیمان.

٢. پارێزگاری لە سنوورەکان.

٣. رازی بوون بەوەی هەیە.

٤. ئارامگرتن لەسەر ئەوەی لەدەستی دەدەی.

**"عمرو بن عثمان المكي" دەڵێت:** لەوانەی بینیومن لە عابیدان لە مەککە و شوێنەکانی تر، یان ئەوانەی لە مەوسیمەکاندا روویان لێ دەکردین کەسێکم نەبینیوە لە **"المزني"**(رەحمەتی خودای لێ بێت) تێکۆشان و عیبادەتی زۆرتر بێت، هەر بەو جۆرە کەسێکم نەبینیوە بە ئەندازەی ئەو فەرمانەکانی خودا پارێزگاری لێ بکات، بە هەمان شێوە کەسێکم نەبینیوە وەکو ئەو لە نەفسی بەرتەسك بکاتەوە و لەسەر خەڵکی بەرین و ئاسان بکات(چونکە **"المزني"** فەقیهێکی گەورە و خواناسێکی باڵا بوو).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** هیچ شتێك لە بەندایەتی مەزنتر نییە، و هیچ ناوێك بۆ باوەڕدار لە "بەندە" تەواوتر نییە، بۆ ئەو مەبەستە خودا(سبحانه وتعالى) لە وەسفی پێغەمبەردا(ﷺ) لە شەوی میعراجدا دەفەرموێت: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ الإسراء: ١، هەروەها دەفەرموێ:﴿ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ١٠ ﴾ النجم: ١٠، گەر ناوێك لە بەندایەتی مەزنتر بوایە ناوی پێغەمبەرەکەی پێ دەهێنا.

**هەندێکیان دەڵێن: دوو شت هەیە:** سوکنایی و ئارامیت بۆ لای چێژ و شان دادانت لەسەر هەوڵ و جووڵەی خۆت، گەر ئەم دوو شتە لە خۆت بکەیەوە مافی بەندایەتیت داوە.

**"الواسطي" دەڵێت:** ئاگاتان لە چێژی پێبەخشین بێت، چونکە دەبێتە داپۆشەر بۆ ئەهلی سەفا و پاکێتی.

**"أبو علي الجوزجاني" دەڵێت:** رازیبوون خانەی بەندایەتییە و ئارامگرتن دەرگاکەیەتی و سپاردەکردن بە خودا ژوورەکانییەتی، دەنگ لە دەرگایە و بۆشایی لە خانوو و ئاسوودەیی لە ماڵدا.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** وەك پەروەردگاریی سیفەتی خودایە(سبحانه وتعالى) و لێی جیانابێتەوە، بەندایەتیش سیفەتی بەندەیە و هەتا بوونی هەبێت لێ جیانابێتەوە.

**نەصـــرابادی دەڵێـــت:** پەرسشـــەکان بـــۆ داوای لێخۆشـــبوون و لێبـــووردن لـــە کەموکوڕییـــەکانی پەرســش لەپێشــترە تــا لــە داوای بــریتی و پاداشــت لــەپای ئــەو پەرسشانە.

**هـــەروەها دەڵێـــت:** بەندایـــەتی بەردانـــەوەی بینـــینی پەرســـتنە لـــە موشـــاهەدەی پەرستراودا.

**جونەید دەڵێت:** بەندایەتی بریتییە لە وازهێنان لـە سـەرقاڵی و سـەرقاڵبوون بـەوەی بنچینە و بنەڕەتی پێدانی تەمەنە.

۞ ۞ ۞

## ٢٤

# ویست ( إرادة )

((کلّپەیەکە لە دەرووندا و گەستنێکە لە دلّدا و خۆشەویستییەکە لە ناخدا و بێزارییەکە لە ناوەوە و ئاگرێکە بەربووەتە دلاّن))

**خودا (ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾ **الأنعام: ٥٢**

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت) پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((گەر خودا خێری بۆ بەندەیەك بوێت بەکاری دەهێنێت، وتیان: چۆن بەکاری دەهێنێت، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: سەرکەوتووی دەکات بۆ کاری چاکە بەر لە مردنی))[٤٢].

**ویست:** سەرەتای رێگەی سالیکانە و ناوێکە بۆ یەکەمین مەنزیلەی ئەوانەی خودا(ﷻ) دەکەن بە مەبەست و رووی لێ دەکەن.

ئەم سیفەتە بە **"ویست"** ناوبراوە چونکە ویست پێشەکی هەموو کارێکە، ، هەر شتێك بەندە نەیەوێت ئەنجامی نادات، لەبەر ئەوەی ویست یەکەمین هەنگاوی ئەوانەیە رێگەی بەرەو خودا(ﷻ) دەگرنە بەر بە **"ویست"** ناوبراوە، وەك شوبهاندنێك بە مەبەست لەو کارانەدا کە دەبنە پێشەکی بۆی.

**مورید (بەپێی داتاشینەکە لە وشەی "الإرادة"وە):** ئەو کەسەیە خاوەنی ویستە، وەك چۆن زانا ئەو کەسەیە خاوەنی زانستە، چونکە لە ناوە داتاشراوەکانە.

---

[٤٢] {حديث صحيح رواه أحمد في مسنده والترمذي وابن حبان والحاكم عن أنس}.

**بەڵام مورید لە زاراوەی ئەم دەستەیەدا:** کەسێکە ویستی بۆ نەماوەتەوە، هەر کەس لە ویستەکەیدا خۆی یەکلانەکاتەوە پێی ناوترێت مورید، وەك چۆن ئەو کەسەی "ویست"ی نییە بەپێی پێویستی داتاشین نابێت بە مورد.

خەڵکی لە مانای "ویست" قسەی زۆریان کردووە، هەر یەکەیان بەپێی ئەوەی بۆ دڵی دەرکەوتووە، **زۆربەی گەورەپیاوان دەڵێن:**

**ویست:** بریتییە لە وازهێنان لەوەی لەسەریەتی لە عادەت، عادەتی خەڵکی بریتییە لە مانەوە لە شوێنی بێئاگاییدا و مەیل بە لای حەزەکاندا و پاڵدانەوە بەلای هیوا و ئاواتەکان.

**کەسی مورید** لە کۆی ئەوانە خۆی داڕنیوە و دەرچوونیشی لەوانە بووە بە بەڵگە و نیشانەی دروستی ویست، و ئەو حاڵەتە بە ویست ناوبراوە، کە دەرچوونە لە عادەت، چونکە وازهێنان لە عادەت نیشانەی بوونی ویستە.

**حەقیقەتی ویستیش:** بریتییە لە راستبوونەوەی دڵ بۆ داوای حەق(ﷻ)، بۆیە دەوترێت: ویست کلپەیەکە هەمووترسێکت لەلا ئاسان دەکات.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** مەمشادی دەینووری دەڵێت: لەو کاتەوەی زانیم حاڵی هەژاران هەمووی سووربوون و لێبڕانە شۆخیم لەگەڵ هەژارێکدا نەکردووە، ئەوەش لەبەر ئەوەی هەژارێك هات بۆ لام و وتی: ئەی شێخ، دەمەوێ هەندێ حەڵوا بخۆم، حەزی حەڵوا شەرمەزاری کردووم، منیش هات بەسەر زمانمدا و وتم: ویست و حەڵوا؟! هەژارەکە دواکەوت و لێم دوورکەوتەوە و رۆیشت، فەرمانم کرد حەڵوای بۆ ئامادە بکەن، رۆیشتم بەدوایدا گەڕام نەمبینییەوە، دواتر هەواڵم زانی و پێم وترا: رۆیشتووە و بەدەم خۆیەوە بەردەوام وتویەتی: ویست و حەڵوا؟! ویست و حەڵوا؟! سەری خۆی هەڵگرتووە و رووی لە دەشت و سارا کردووە، بەردەوام ئەو قسەیەی دووبارە کردبووەوە تا گیانی سپارد بوو.

**لە هەندێ لە گەورەپیاوانەوە دەڵێت:** لە دەشت و سارا بەتەنها بووم، سینگم هاتەوە یەك، وتم: ئەی مرۆیان قسەم لەگەڵ بکەن، ئەی جین قسەم لەگەڵ بکەن، گوێم دەنگێك بوو هاواری لێ کردم و وتی: چیت دەوێت؟ وتم: خودام(ﷻ) دەوێت، وتی: کەی

خودات دەویٚ؟ واتە ئەو کەسەی دەڵێت بە مرۆڤ و بە جین قسەم لەگەڵ بکەن کەی خودای دەوێت؟ مورید شەو و رۆژ سارد نابێتەوە و لە رووالەتدا بە وەسفی تێکۆشانەوە راوەستاوە و لە ناوەوەش بە وەسفی ئازار و نۆشکردنی ماندبوون راوەستاوە.. لە جێگەی نووستنەکەی جیابووەتەوە و خۆی گرمۆڵە کردووە و و شانی داوەتە ژێر سەختی و دژوارییەکان و سواری شەپۆلی ماندبوونەکان بووە و چارەسەری نەنگی ئەخلاقی خۆی کردووە و سەختی و دژوارییەکانی گرتووەتە بەر و دەستەملانی هەڕەشە و ترسەکان بووە و لە هاوشێوەکانی خۆی جیابووەتەوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** ویست کڵپەیەکە لە ناخدا و گەستنێکە لە دڵدا و خۆشەویستییەکە لە ویژداندا و بێزارییەکە لە ناوەوە و گڕێکی کڵپەسەندووە لە دڵاندا..

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** گرێبەستێك(پەیمانێك) لە نێوان ئەبو سولەیمانی دارانی و ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواریدا هەبوو: هەر شتێك ئەبو سولەیمان فەرمانی پێکرد ئەحمەد سەرپێچی لیٚ نەکات، رۆژێك ئەحمەد هات بۆ دانیشتنێکی ئەبو سولەیمان بینی قسە دەکات، ئەبو سولەیمان وتی: تەنوورەکە گەرم بووە، کەس دەتوانیٚ دەستی لیٚ بدات؟ ئەحمەد وەڵامی نەدایەوە، ئەویش دوو سیٚ جار دووبارەی کردەوە، ئەبو سولەیمان وتی بە ئەحمەد: بڕۆ لە تەنوورەکەدا دابنیشە.. وەك ئەوەی دڵی رەوانەی ئەو شوێنەی بکات، ماوەیەك ئەبو سولەیمان لێی بێئاگا بوو، پاشان بیری کەوتەوە چی وتووە، وتی: فریای ئەحمەد بکەون ئەو ئێستا لە تەنوورەکەدایە، چونکە پەیمانی لەسەر خۆی بەستووە سەرپێچی لە فەرمانم نەکات، ئەوانیش رۆیشتن و بینیان لەناو تەنوورەکەدایە و تەنها موویەکیشی نەسووتاوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لیٚ بێت) دەیوت:** لە سەرەتای منداڵیمەوە لە ویستدا سووتابووم، بە خۆمم دەوت: خۆزگە دەمزانی مانای ویست چییە.

**وتراوە:** لە سیفەتەکانی موریدان خۆ خۆشەویست کردنە لەلای خودا بە سوننەتەکان و دڵسۆزی لە ئامۆژگاری کردنی ئومەتدا و هۆگری بە خەڵوەتەوە و ئارامگرتن لەسەر تاڵاوی

حوکمەکان و هەڵبژاردنی فەرمانەکانی و حەیا و شەرم لە سەرنجی خودا بۆی و بەخشینی کۆشان بۆ خۆشەویستەکەی و دەستبردن بۆ هەر هۆیەك بە ئەوت دەگەیەنێت و قەناعەت بە بێ ناوی و خامۆشی و پشوو و ئارامی نەدان بە دڵ تا دەگەی بە پەروەردگار.

**ئەبوبەکری وەراق دەڵێت:** سێ شت ئافەتی موریدن: هاوسەرگیری، و خۆیەکلاکردنەوە بۆ نووسینی فەرموودە و سەفەرکردنی بەردەوام.

**وترا:** بۆ نووسینی فەرموودەت وازلێهێنا؟ وتی: ویست ڕێگری لێکردم.

**"حاتم الأصم" دەڵێت:** گەر موریدت بینی جگە لە مەرامی خۆی شتێکی تری دەوێت بزانە ئەو کەسە کەم نرخی خۆی دەرخستووە.

**"الكتاني" دەڵێت:** لە حوکمەکانی مورید ئەوەیە سێ شتی تێدا بێت: خەوتنی زاڵبوونی خەوە بەسەر چاوانیدا، خواردنی لە برسێتییەکی زۆردایە، و قسەی بە پێویستییە.

**جونەید دەڵێ:** گەر خودا خێری بۆ مورید ویست دەیخاتە ناو دەستەی سۆفیەکانەوە و لە هاوەڵی خوێنەران ڕێگری لێ دەکات(خوێنەران: ئەوانەی لەو سەردەمەدا قورئانیان دەخوێند، و هەندێ جاریش کردبوویان بە سەرچاوەی بژێوی خۆیان)

**ئەبوبەکری دەقاق دەڵێت:** کۆتایی ویست ئەوەیە ئاماژە بۆ خودا(ﷻ) بکەی و لەگەڵ ئاماژەدا بیبینییەوە، وتم: چ شتێك ویست لەخۆ دەگرێت؟ وتی: خودا بەبێ ئاماژە ببینییەوە.

**عەباسی کوڕی ئەبی سەحو دەڵێت:** گوێم لە ئەبوبەکری دەقاق بوو دەیوت: مورید نابێت بە مورید تا فریشتەی لای چەپ بیست ساڵ شتێکی لەسەر نەنووسێت.

**ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت:** هەر کەس ویستی لە سەرەتاوە نەیەتە ڕاستە تێپەڕبوونی ڕۆژگار تەنها پشتهەڵکردنی لە خودا بۆ زیاد دەکات.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** مورید کاتێك شتێك لە زانستی ئەم دەستەیە دەبیستێ و کاری پێ دەکات دەبێت بە حیکمەت لە دڵیدا هەتا دوارۆژەکانی تەمەنی لەلای دەمێنێتەوە و سوودی لێ دەبینێت، گەر بیکات بە قسە ئەوانەی دەیبیستن سوودی لێ دەبینن، هەرکەسیش شتێك لە زانستی ئەم دەستەیە وەربگرێت و کاری پێ نەکات بەسەرهاتگەلێکن چەند ڕۆژێك لەبەریان دەکات و پاشان لەبیری دەچنەوە.

**"الواسطي" دەڵێت:** یەکەمین مەقامی مورید بریتییە لە ویستی حەق(ﷻ) بە بەردانەوەی ویستی خۆی.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** سەختترین شت لەسەر موریدان تێکەڵاوی دژەکانە(نەیارەکانی سەر ڕێگەی هەنگاوهەڵگرتن بەرەو خودا).

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** گەر موریدت بینی خۆی بە روخسەت و کەسابەتەوە سەرقاڵ دەکات ئەوە هیچ شتێکی لێوە بەرهەم نایەت.

**پرسیار لە جونەید کرا:** چی بۆ مورید دەمێنێتەوە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان (بەسەرهاتی پیاوانی ئەم ڕێگەیە)؟ وتی: بەسەرهاتەکان سەربازی خودان و دڵی موریدانی پێ بەهێز دەبێت، وترا: ئایا شایەتێکت لەسەر ئەوە هەیە؟ وتی: بەڵێ، ئایەتی:﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾هود: ١٢٠

**هەروەها جونەید دەڵێ:** موریدی راستگۆ بە زانستی زانایان دەوڵەمەندە.

**جیاوازی چییە لە نێوان "مورید و موراد"دا، هەموو موریدێك** لە راستەقینەدا مورادە، چونکە گەر مورادی خودا(ﷻ) نەبوایە بەوەی خودا ئەوی بوێت نەدەبوو بە مورید، چونکە هیچ شتێك بەبێ ویستی خودا(ﷻ) نابێت، هەموو مورادێکیش موریدە، چونکە گەر خودا(ﷻ) تایبەتکردنەوەیەکی بۆ ئەو بوێت بۆ "ویست"(واتە لێبڕان بۆ کار و کردەوەی چاکە) سەرکەوتووی دەکات، بەڵام ئەم دەستەیە جیاکارییان کردووە لە نێوان: "مورید و موراد"دا:

**مورید** لەلایان کەسێکە لە سەرەتای ڕێگەدایە و مورادیش لە کۆتاییدایە، مورید: ئەو کەسەیە سەرقاڵی کۆشان و خۆماندووکردن و نۆشکردنی تاڵاوی تێکۆشانە، **مورادیش:** ئەو کەسەیە ئەرك و کارەکان بەبێ ماندووبوون جێبەجێ دەکات، مورید وردەکاری لە کار و کردەوەکانیدا بەکاردەهێنێت و مورادیش بۆ کارە گەورە و دروستەکان لەلای خوداوە کۆمەك کراوە.

سوننەتی خودا لەگەڵ مەبەستداران(القاصدين) جۆراوجۆرە، ئەوان بۆ گەیشتن بە سەرچاوەی مانا دوای نۆشکردنی تاڵاو سەرکەوتوودەبن لە تێکۆشانەکاندا و پاشان بە

مەبەست دەگەن، زۆرینەیان لە سەرەتاوە مانای بەرز و بڵندیان بۆ دەردەکەوێت و ئەوەی خاوەن راهێنانەکان(وەرزشی دەروونی سەخت) بەدەستیان نەهێناوە ئەوان بەدەستی دەهێنن، بەڵام بەشێکیان روو لە تێکۆشان دەکەن-لە دوای ئەم بەرزبوونەوەیە- بۆ ئەوەی حوکمەکانی خۆرامهێنان تێر و تەواو بکەن.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** مورید کۆڵهەڵگرە، مورادیش: کۆڵبۆهەڵگیراوە.

هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت: موسا(عليه السلام) مورید بوو کاتێك فەرمووی:﴿ **قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥** ﴾ طه: ٢٥ ، بەڵام پێغەمبەری ئێمە(ﷺ) موراد بوو کاتێك خودا پێیی دەفەرموێت:﴿ **أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ١ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ٢ ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ ٣** ﴾ الشرح: ١ – ٣، هەر بەو جۆرە موسا(عليه السلام) فەرمووی:﴿ **رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي** ﴾ الأعراف: ١٤٣، بەڵام بە پێغەمبەری ئێمەی فەرموو:﴿ **أَلَمۡ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيۡفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ** ﴾ الفرقان: ٤٥

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق دەیوت:** مەبەست ئەم بەشەی ئایەتەکەیە(**ألم تری إلى ربك**)، ئەو بەشەی ئایەتەکە: (**کیف مد الظل**) نهێنییەکە بۆ باسێك و پارێزگاری کردنە لە حاڵەتێك.

**پرسیار لە جونەید کرا(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەربارەی مورید و موراد، وتی:**

**مورید:** رامهێنانی زانست(شەریعەت) سەرپەرشتی دەکات، **مورادیش:** چاودێری حەق(سبحانه وتعالى) سەرپەرشتی دەکات، چونکە مورید بەپێ دەڕوات و موراد دەفڕێت، لە کوێ کەسی بەپێ رۆیشتوو بە کەسی فڕیو دەگات؟

**وتراوە: "ذون النون" پیاوێکی نارد بۆ لای ئەبو یەزید، و پێی وت:** بە ئەبو یەزید بڵێ: تا کەی خەو و ئیسراحەت، ئەوا کاروانەکە دوورکەوتەوە؟

**ئەبو یەزید وتی: بڵێ بە برام "ذي النون":** پیاو ئەو کەسەیە هەموو شەوەکە بخەوێت و پاشان بەیانی بەئاگا بێت لە قۆناغێکدا بێت پێش کاروانەکە کەوتبێت.

**"ذو النون"** وتی: پیرۆزی بێت، ئەمە قسەیەکە حاڵی ئێمەی ناگاتێ.

## ٢٥

# راست وەستان(الإستقامة)

((تەنها مەزنەکان دەتوانن شان بدەنە ژێری، چونکە دەرچوونە لە دەقپێوەگیراوەکان و جیابوونەوە لە بەندوباو و نەریتەکان و راستبوونەوە لەبەر دەستی خودادا لەسەر راستەقینەی صدق))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:**﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟﴾ فصلت: ٣٠

**لە "ثوبان"ەوە مەولای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** راستڕاوەستن، بەڵام ئێوە ناتوانن بەتەواوی راستڕاوەستن، بزانن باشترین ئایینی ئێوە نوێژە، تەنها باوەڕدار دەتوانێ پارێزگاری لە دەستنوێژ بکات))[٤٣]

**راستوەستان:** پلەیەکە کەماڵ و تەواوی کاروبارەکانی ئایینی پێوەیە، بە بوونی راستوەستان شارەزایی و ئاگاهای بەدەست دێت، هەرکەس لە حاڵیدا راستنەوەستابێت هەوڵ و کۆشانی بەفیڕۆ دەڕوات، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا ﴾ النحل: ٩٢

هەر کەس لە سیفەتەکانیدا راستوەستاو نەبێت لە مەقامێکەوە ناتوانێت بگوێزێتەوە بۆ مەقامێکی تر، و سلوکی لەسەر بناغەیەکی دروست دانامەزرێنێت، لە مەرجەکانی ئەو کەسەی لە سەرەتاوە دەست پێدەکات ئەوەیە: لە حوکمەکانی سەرەتادا راستوەستانی هەبێت، وەك چۆن لەسەر عاریف پێویستە راستوەستانی هەبێت لە ئادابی کۆتاییدا.

---

[٤٣] {أخرجه أحمد وابن ماجة والحاكم}.

**لــه نيشــانەكانى راستوەســتانى ئــەهلى ســەرەتا ئەوەيــە:** مامەڵــەكانيان بــە ساردبوونەوە تێكەڵ نەبێت.

**لە نيشــانەكانى راستوەســتانى ئــەهلى ناوەنــد ئەوەيــە:** وەستان روو نــەكات لــە بەرزبوونەوەيان بە مەنزيلەكاندا.

**لە نيشــانەكانى راستوەســتانى ئــەهلى كۆتــايى ئەوەيــە:** پــەردە نەكەوێتــە نــاو گەيشتنەكەيان(واتە رێگە نەدەن پەردە لە نێوان ئەوان و خودادا سەرهەڵبداتەوە).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلى دەقاق بوو(رەحمەتى خــوداى لــێ بێــت) دەيــوت:** راستوەستان سێ پلەى هەيە:

**يەكەميان:** راستبوونەوە، **پاشــان** وەستان، و **ئــەوجا** راستوەستان، راستبوونەوە: ئەدەبدادانى نەفسە، وەستان: پاڵفتەكردنى دڵە، و راستوەستانيش: نزيكردنەوەى نهێنى و پەنهانە لە خودا.

**ئەبوبەكر(خودا لێى رازى بێت) لەسەر ماناى ئايەتى:﴿ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ ﴾ فصلت: ٣٠ دەفەرموێت:** واتە هاوەڵيان بۆ خودا دانەنا.

**عومەر(خوا لێى رازى بێت) لەسەر مانەكەى دەفەرموێت:** پێچيان لێ نــەدا وەك پێچلێدانى رێوى.

**قسەكەى ئەبوبەكرى صديق**(خودا لێى رازى بێت) هەڵدەدرێتــە ســەر رەچاوكردنى بنچينەكانى يەكتاپەرستى.

**قســەكەى عومــەريش**(خــودا لێــى رازى بێــت) هەڵدەدرێتــە ســەر داواى تــەئويل و هەستان بە مەرجى پەيمان.

**ئيبن عەتا لەسەر ماناى ئەو ئايەتە دەڵێــت:** لەســەر تەنهاكردنــەوەى دڵ بــۆ خــودا راستوەستان.

**ئــەبو عــەلى جوزجــانى دەڵێــت:** ببــە بــە خــاوەنى راستوەســتان نــەك داواكــەرى كــەرامات، نەفســت دەبــزوێ بــۆ داواى كــەرامات، بــەڵام پــەروەردگارى تــۆ(ﷻ) داواى راستوەستانت لێ دەكات.

**ئەبو عەلی شەبوور دەڵێت:** پێغەمبەرم(ﷺ) لە خەوندا بینی، پێم وت: لە تۆوە ریواتکراوە فەرمووتە: ((سورەتی هود پیری کردم))[٤٤] چ شتێك لەو سورەتە تۆی پیر کرد: ئایا چیرۆکی پێغەمبەران و تیاچوونی ئومەتەکانیان بوو؟ فەرمووی: نەخێر، ئایەتی:﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ ﴾ هود: ١١٢

**وتــراوە:** تــەنها مەزنــەکان دەتــوانن شــان بدەنــە ژێــری، چــونکە دەرچــوونە لــە دەقپێوەگیراوەکان و جیابوونەوە لە بەندوباو و نەریتەکان و راستبوونەوە لەبەر دەستی خــودادا لەســـەر راســـتەقینەی صـــدق، بـــۆ ئـــەو مەبەســـتە پێغەمبـــەر(ﷺ) فەرموویەتی:((راستڕاوەستن، بەڵام ئێوە ناتوانن بەتەواوی راستڕابوەستن))

**"الواسطي" دەڵێت:**((ئەو خەسڵەتەی چاکەکانی پـێ تـەواو دەبێـت و بـە نـەبوونی هەموو چاکەکان ناشیرین دەبن بریتییە لە راستوەستان)).

**لە شیبلییەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەگێڕنەوە وتویەتی:** راستوەستان ئەوەیـە لە ئێستادا قیامەت ببینیت.

**هەروەها وتراوە:** راستوەستان لە گوفتاردا بە: وازهێنان لە غەیبەت، لە رەفتاردا بە: نەرێکردنی بیدعەت، لە کرداردا بە: نەمانی ساردبوونەوە، لە حاڵدا بە: نەبوونی پەردە.

**گوێم لە مامۆستا "محمد بن الحسين بن فورك" بوو دەیوت:** پیتی (سین) لە وشەی **"الإستقامة"**دا سینی داوایە(**سين الطلب**)ە، واتە داوایان لە حەق(سبحانه وتعالى) کـردووە لەسـەر یەکتاپەرسـتی راوەسـتاویان بکـات و لەسـەر پەیمانـەکان بـەردەوامیان پـێ بـدات و سنوورەکانیان بپارێزن.

**مامۆستا(قوشەیری) دەڵێت:** بزانە راستوەستان بەردەوامی کەرامات پێویست دەکات، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:﴿ وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا ١٦ ﴾ **الجن: ١٦**، نەیفەرموو (سقيناهم) بەڵکو فەرمووی (أسقيناهم)، دەوترێت: **"أسقيته"** گەر خواردنەوەت بۆ دابین کرد، بۆیە وشەکە ئاماژە بە بەردەوامی دەکات.

[٤٤] {أخرجه الطبراني في المعجم الكبير}

**جونەید دەفەرموێت:** لە دەشت و سارادا بە گەنجێك لە موریدان گەیشتم، لەژێر دارێك لە دارەکانی(أم غیلان)دا بوو، پێم وت: بۆچی لێرە دانیشتووی؟

وتی: شتێکم بزر کردووە بۆی دەگەڕێم، منیش ڕۆیشتم و بەجێمهێلا، کاتێك لە حەج تەواو بووم گەنجەکەم بینی لە شوێنێکی نزیك بە دارەکە بوو، پرسیم: بۆ لێرە دانیشتووی؟

وتی: ئەوەی بۆی دەگەڕام لەم شوێنە بینیمەوە بۆیە پەیوەستم بەم جێگەوە.

**جونەید دەڵێت:** نازانم کامیان بالاترە، پەیوەستبوونی بە بزربوونی حاڵەکەی، یان پەیوەستبوونی بۆ جێگەکە کە تیایدا بە مەرامی خۆی گەیشت.

۞ ۞ ۞

٢٦

# ئیخلاص

((وازهێنان له کار له پێناوی خەڵکیدا ریایە، کارکردنیش له پێناوی خەڵکیدا هاوەڵدانانه، ئیخلاصیش بریتییه لەوەی خودا لەو دوانە بتپارێزێت))

**خودا (ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ﴾ الزمر: ٣

**له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی:** ((سێ شت دڵی موسڵمان ناپاکی لێ ناکات: ئیخلاصی کار بۆ خودا، و گوێڕایەڵی و ئامۆژگاری بۆ خاوەن کاروبارەکان(دەسەڵات)، و پابەندبوون بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە))

**مامۆستا (قوشەیری) دەڵێت:** ئیخلاص بریتییه له تەنهاکردنەوەی حەق(ﷻ) بە بوونی مەبەست لە گوێڕایەڵیدا، ئەوەش ئەوەیە لە گوێڕایەڵییەکانیدا مەبەستی نزیکبوونەوە بێت لە خودا(ﷻ) نەك شتێکی تر، هەر کەس کار بۆ دروستکراوێك ئەنجام بدات یان لە پێناوی پیاهەڵداندا بێت لەلای خەڵکی، یان مەدحی خەڵکی پێخۆش بێت، یان هەر مانایەکی تر جگە لە نزیکبوونەوە لە خودا ئەوە ئیخلاصی وازلێهێناوە.

**دروستە بوترێت ئیخلاص:** بریتییه لە پاككردنەوەی كردار لە سەرنجدانی دروستكراوەكان.

**هەروەها دروستە بوترێت ئیخلاص:** بریتییه لە خۆپارێزی لە تێبینی كردنی كەسەكان.

**لە ریوایەتێکی مەسنەددا: پێغەمبەر(ﷺ) لە جبریلەوە(عليه السلام) هەواڵەکە دەگەیەنێت، ئەویش لە خوداوە(ﷻ) دەفەرموێت:** ((ئیخلاص نهێنییەکە لە نهێنییەکانی من، لەلای هەر بەندەیەك لە بەندەکانم دایدەنێم کە خۆشمبوێت))

**پرسیم لە "أبو عبدالرحمن السلمي" ئیخلاص چییە؟**

وتی: منیش پرسیم لە عەلی کوڕی سەعید و محەمەدی کوڕی زەکەریا: ئیخلاص چییە؟

**هەردوو وتیان: پرسیارمان لە ئیبراهیمی شەقیقی کرد: ئیخلاص چییە؟**

ئیبراهیم وتی: پرسیارم لە محەمەدی کوڕی جەعفەری خەصاف کرد: ئیخلاص چییە؟

محەمەدی کوڕی جەعفەر وتی: پرسیارم لە ئەحمەدی کوڕی بەشار کرد: ئیخلاص چییە؟

ئەحمەد وتی: پرسیارم لە"**أبا يعقوب الشريطي**" کرد ئیخلاص چییە؟

ئەبو یەعقوب وتی: پرسیارم لە ئەحمەدی کوڕی غەسان کرد: ئیخلاص چییە؟

ئەحمەد وتی: پرسیارم لە "عبدالواحد بن زيد" کرد ئیخلاص چییە؟

**عبدالواحد وتی: پرسیارم لە "الحسن" کرد ئیخلاص چییە؟**

"**الحسن**" وتی: پرسیارم لە "**حذيفة**"(خودا لێی ڕازی بێت) کرد: ئیخلاص چییە؟

"**حذيفة**"**(خودا لێی ڕازی بێت) وتی:** پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد: ئیخلاص چییە؟

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** پرسیارم لە جبریل(عليه السلام) کرد: ئیخلاص چییە؟

**جبریل(عليه السلام) فەرمووی:** پرسیارم لە خودا(عز وجل) کرد ئیخلاص چییە؟

**خودا فەرمووی:** ((ئیخلاص نهێنییەکە لە نهێنییەکانی من، لەلای هەر بەندەیەك لە بەندەکانم دایدەنێم کە خۆشمبوێت))

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** ئیخلاص خۆپارێزییە لە سەرنج و تێبینی خەڵکی، صدقیش: پاکبوونەوەیە لە سەرنجەکانی نەفس، بۆیە کەسی موخلیص ریای نییە، کەسی صادقیش خۆپەسەندی(**الإعجاب**) نییە.

"**زو نونی مصری" دەڵێت:** ئیخلاص بە بوونی صدق تیایدا و ئارامگرتن لەسەری تەواو دەبێت، صدقیش بە بوونی ئیخلاص تیایدا و بەردەوام بوون لەسەری تێر و تەواو دەبێت.

**ئەبو یەعقوبی سوسی دەڵێت:** هەر کات رزگاربوونیان لە ئیخلاصی خۆیاندا بینی ئەوا ئیخلاصەکەیان پێویستی بە ئیخلاصە.

**"ذو النون" دەڵێت: سێ شت لە نیشانەکانی ئیخلاصن:**

١. یەکسانبوونی مەدح و زەمی خەڵکی بەگشتی لەلا.

٢. لەبیرچوونەوەی بینینی کارەکان لەناو کارەکاندا.

٣. لەبیرچوونەوەی پێویستبوونی پاداشت بۆی لە دوارۆژدا.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** ئیخلاصێك بەشی نەفسی لە حاڵ تێدایە، ئەمە ئیخلاصی خەڵکییە بەگشتی، ئیخلاصی تایبەتان: کار و کردەوەکان بەسەریاندا گوزەر دەکات نەك بە هۆی ئەوانەوە، وا دەردەکەوێت کارە چاکەکان لە ئەوانەوە بێت، بەڵام ئەوان خۆیانی لێ بەدوور دەگرن و بینینی ئەوانی ناکەوێتە سەر و لای بەلادا ناکەنەوە، ئەمە بریتییە لە ئیخلاصی تایبەتان.

**ئەبوبەکری دەقاق دەڵێت:** ناتەواوی هەر موخلیصێك لە ئیخلاصەکەیدا بریتییە لە بینینی ئیخلاصەکەی، کاتێك خودا بیەوێت ئیخلاص بخاتە ناو ئیخلاصەکەیەوە بینینی ئیخلاصەکە لە ئەو دوور دەخاتەوە، ئەو کاتە دەبێت بە **"مخلص-بفتح اللام"** نەك **"مخلص-بکسر اللام"**.

**سەهل دەڵێت:** تەنها کەسی موخلیص ریا دەناسێتەوە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** ریای عاریفان لە ئیخلاصی موریدان باشترە.

**"ذو النون" دەڵێت:** ئیخلاص ئەوەیە لە دوژمن پاراستووتە بۆ ئەوەی تێکینەدات.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** ئیخلاص لەبیرچوونەوەی سەرنجدانە لە خەڵکی بە بەردەوامبوونی سەرنجدان لە چاکەی خودا(سبحانه وتعالى).

**"حذيفة المرعشي" دەڵێت:** ئیخلاص ئەوەیە رەفتارەکانی بەندە لە ناوەوە و دەرەوە یەکسان بن.

**وتراوە:** ئیخلاص ئەوەیە تیایدا حەق(سبحانه وتعالى) بە مەرامگیرابێت و مەبەست پێی صدق بێت.

**هەروەها وتراوە:** ئیخلاص چاوداخستنە لە بینینی کار و کردەوە چاکەکان.

**"السري" دەڵێت:** هەر کەس خۆی بۆ خەڵکی جوان بکات بە شتێك کە تیایدا نییە لەبەر چاوی خودا بەردەبێتەوە.

**فوزەیل دەڵێت:** ((وازهێنان لە کار لە پێناوی خەڵکیدا ریایە، کارکردنیش لە پێناوی خەڵکیدا هاوەڵدانانە، ئیخلاصیش بریتییە لەوەی خودا لەو دوانە بتپارێزێت))

**جونەید دەڵێت:** ئیخلاص نهێنییەکە لە نێوان خودا(ﷻ) و بەندەکەی، فریشتە پێی نازانێت بینووسێت و شەیتان پێی نازانێت لێی تێکبدات و ئارەزوو پێی نازانێت تووشی لادانی بکات.

**روەیم دەڵێت:** ئیخلاص لە کاردا ئەوەیە خاوەنەکەی لە خانەی دونیا و خانەی دوارۆژدا پاداشتی ناوێت و داوای بەشێك ناکات لەو دوو موڵکەدا.

**بە سەهلی کوڕی عەبدوڵلا وترا:** چ شتێك لەسەر خەڵکی زۆر گرانە؟ وتی: ئیخلاص، چونکە بەشی نەفسی تێدا نییە.

**پرسیار لە هەندێکیان کرا دەربارەی ئیخلاص وتی:** جگە لە خودا(ﷻ) هیچ کەسێکی تر لەسەر کارەکانت نەکەی بە شایەت.

**یەکێکیان دەڵێت:** بەر لە نوێژی هەینی رۆیشتم بۆ لای سەهلی کوڕی عەبدوڵلا لە ماڵەوە.. لە ماڵەکەیدا مارێکم بینی، پێیەکم پێش دەخست و ئەویترم دەگێڕایەوە، وتی: وەرە ژوورەوە هیچ کەس ناگاتە حەقیقەتی ئیمان ترسی لە شتێکی سەر زەوی هەبێت، پاشان وتی: پێتخۆشە بچین بۆ نوێژی جومعە (لە فلان جێگە)؟ وتم: نێوان ئێمە و ئەو مزگەوتە شەو و رۆژێك رێگەیە، دەستی گرتم و پاش کەمێکی زۆر کەم مزگەوتەکەم بینی و چووینە ژوورەوە، و نوێژی جومعەمان کرد و پاشان هاتینە دەرەوە، بەپێوە وەستا بوو تەماشای خەڵکی دەکرد دەهاتنە دەرەوە و ئەویش دەیوت: ئەهلی **"لا إله إلا الله"** زۆرن، بەڵام موخلیصان لەناویاندا کەمن.

**مەکحول دەڵێت:** هەر بەندەیەك چل رۆژ ئیخلاصی هەبێت کانیاوی حیکمەت لەسەر زمانی دەتەقێت.

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** دەگمەنترین و بەنرخترین شت لە دونیادا بریتییە لە ئیخلاص، زۆر هەوڵمدا ریا لە دڵی خۆم دەربکەم، بەڵام وەك ئەوەی هەر جارە و بە رەنگێکی تر لە زەمینەی دڵدا سەوز دەبێتەوە.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** گەر بەندە ئیخلاصی هەبوو لە وەسوەسەی زۆر و ریا دووردەکەوێتەوە.

٢٧

# صدق

(("زو نونی مصری" دەڵێت: صدق شمشێری خودایە، لەسەر هەر شتێك دابنرێت دەیبڕێت))

خودا (ﷻ) دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩﴾ التوبة: ١١٩

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە (خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرمووی:** ((بەردەوام بەندە راست دەکات و بەدوای راستیدا دەگەڕێت تا لەلای خودا بە صدیق دەنوسرێت، هەروەها بەردەوام بەندە درۆ دەکات و بەدوی درۆدا دەگەڕێ تا لە لای خودا بە درۆزن دەنوسرێت))[٤٥]

**مامۆستا (قوشەیری) دەڵێت:** صدق کۆڵەکەی ئایینداربیە و تەواوی ئایین بە صدقەوەیە، رشتەی ئایینی لەسەر دامەزراوە، دووەم پلەیە و لەدوای پێغەمبەرایەتی دێت، خودا (ﷻ) دەفەرموێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ﴾ النساء: ٦٩

"صادق" ناوێکی پێویستە لە "صدق" وەرگیراوە، "صدیق"یش بۆ زیادبوونی ئەو سیفەتەیە لە کەسەکەدا، واتە کەسێکە "صدق"ی زۆرە و صدق زۆرینەی گوفتار و رەفتار و ناوەوەی ئەوی داگیرکردووە، هەروەك وشەی "السکیر" و "الخمیر" بۆ کەسێك سەرخۆشی و مەستی زۆربەی کاتەکانی تەمەنی داگیر کردبێت..

[٤٥] {رواه البخاري ومسلم بنحوه}.

**کەمترین صدق بریتییە** لە یەکسانبوونی پەنهان و ئاشکرای کەسەکە، "صادق" ئەو کەسەیە لە گوفتاریدا صدقی هەیە، بەڵام "صدیق" کەسێکە لە گوفتار و لە کردار و حاڵەکانیدا صدقی هەیە.

**"أحمد بن خضرويه" دەڵێت:** هەر کەس دەیەوێت خودا لەگەڵی بێت با پابەندبێت بە صدقەوە، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٣﴾ **البقرة: ١٥٣**، (بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە بۆ ئەم شوێنە گونجاو نییە، چونکە باسی صدق ناکات بەڵکو باسی "صبر" دەکات پێدەچێت لەگەڵ ئایەتی:﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩﴾ **التوبة: ١١٩** تێکەڵی لا دروست بووبێت، یان پێدەچێت بۆ قسەکردن لەسەر "صبر" بەڵگەی هێنابێتەوە و بە هەڵە لەم دەروازەیەدا دانراوە)

**جونەید دەڵێت:** صادق لە رۆژێکدا چل جار وەردەگەرێت، ریاباز چل ساڵ لەسەر حاڵێك دەمێنێتەوە.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** گەر صادق بیەوێت ئەوەی لەناو دڵیدا وەسفی بکات زمانی ناتوانێت گوزارشتی لێ بکات.

**وتراوە:** صدق قسەی حەقە لە جێگەیەك مایەی تیاچوون بێت.

**هەروەها وتراوە:** صدق بریتییە لە تەبایی نێوان نهێنی و گوفتار.

**"الفناد" دەڵێت:** صدق بریتییە لە رێگری لە حەرامی قسەزۆری.

**سەهلی کوڕی عەبدولا دەڵێت:** بەندەیەك بۆنی صدق ناکات چاوپۆشی لە نەفسی خۆی و خەڵکی بکات.

**ئەبو سەعیدی قورشی دەڵێت:** صادق: کەسێکە خۆی ئامادە کردووە بۆ مردن و لە نهێنی و پەنهانی شەرم ناکاتەوە گەر پەردەی لەسەر لابدرێت، **خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:** ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٩٤﴾ البقرة: ٩٤

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** رۆژێك ئەبو عەلی سەقەفی قسەی دەکرد، "عبدالله بن منازل" پێی وت: ئەی ئەبو عەلی، خۆت بۆ مردن ئامادە

بکە، چونکە مردن هەر دێت، ئەبو عەلی وتی: تۆش ئەی عەبدولاَ خۆت بۆ مردن ئامادە بکە، چونکە هەر دێت، عەبدولاَ راکشا و لاقەکانی درێژ کرد و شتێکی نایە ژێر سەری و وتی: ئەوا مردم، ئەبو عەلی قسەکانی خۆی بڕی، چونکە نەیتوانی بەوەی کردی رووبەڕووی ببێتەوە، چونکە ئەبو عەلی کۆمەڵێك پەیوەندی هەبوو، بەلاَم عەبدولاَ کەسێکی دابڕاو بوو لە دونیا و لە پەیوەندییەکاندا هیچ سەرقاڵییەکی نەبوو.

**گوێم لە "أبو عبدالرحمن السلمي" بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئەبو عەباسی دەینووری قسەی دەکرد، پیرەژنێك لە دانیشتنەکەدا هاواری لێ بەرز بوویەوە، ئەبو عەباس وتی: بمرە، پیرەژنەکە هەستایە سەرپێی و چەند هەنگاوێکی هەڵگرت و پاشان لای کردەوە بە لای ئەبو عەباسدا و وتی: مردم.. یەکسەر بە زەویدا کەوت و مرد.

**"الواسطي" دەڵێت: صدق:** بریتییە لە دروستی یەکتاپەرستی لەگەڵ مەبەست.

**وتراوە:** "عبدالواحد بن زید" رۆژێك سەرنجی گەنجێکی هاوەڵی خۆی دا جەستەی لەڕ و لاواز بووبوو، پێی وت: ئەی گەنج بەردەوام رۆژوو دەگری؟

وتی: بەردەوام رۆژوو ناشکێنم(واتە زۆرجار بەڕۆژوو دەبم)، وتی: ئایا بەردەوام شەونوێژ دەکەی؟

وتی: بەردەوام ناخەوم(واتە زۆر کات بە ئاگام)، وتی: ئەی چی ئاوا لاوازی کردووی؟

وتی: ئارەزوویەکی هەمیشەیی و شاردنەوەی بەردەوامی ئەو ئارەزووە، عبدالواحد پێی وت: بێدەنگ بە، چەند بوێری بە خۆت دەدەی، گەنجەکە لەلای هەستا و دوو هەنگاوی هەڵگرت و وتی: خودایە گەر کەسێکی صادقم ببەرەوە بۆ لای خۆت، یەکسەر کەوت و مرد.

**"أبو عمرو الزجاجي" دەڵێت:** دایکم مرد، خانوویەکم لێوە بە میرات گرت، فرۆشتم بە پەنجا دینار و رۆیشتم بۆ حەج، کاتێك گەیشتمە بابل، یەکێك لە رێنیشاندەرەکان پێشوازی لێ کردم و وتی: چیت پێیە؟

لە ناخی خۆمدا وتم: راستگۆیی لە هەموو شت باشترە، بۆیە وتم: پەنجا دینارم پێیە، وتی: بیدە دەستی من، منیش کیسە پارەکەم دایە دەستی، ژماردی پەنجا دینار بوو،

وتی: بیگره راستگۆییەکەت داگیری کردم، پاشان لە وڵاخەکەی دابەزی و وتی: سواری بە، وتم: نامەوێت، وتی: هەر دەبێت بتەوێ و زۆری لێکردم، منیش سواری بووم، وتی: من دەبێ تۆ بەجێبهێڵم، بۆ ساڵی ئایینده پێمگەیشت و لەگەڵم مایەوە هەتا مرد.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** کەسی صادق یان لە جێبەجێ کردنی فەرزێکدایە یان سوننەتێك کاری پێ بکات.

**جونەید دەڵێت:** راستەقینەی صدق ئەوەیە لە جێگەیەکدا صدق هەڵبژێریت کە تەنها درۆ قوتارت بکات.

**وتراوە: سێ شت لە صادق جیانابێتەوە:**

**١. شیرینی.**

**٢. هەیبەت.**

**٣. روخساری جوان.**

**وتراوە:** خودا(ﷻ) وەحی بۆ داود(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: هەر کەس لە ناخ و پەنهانیدا راستم لەگەڵ بکات لە ئاشکرایدا لەلای دروستکراوەکان بە راستگۆ دەیناسێنم.

**وتراوە:** "**إبراهيم بن دوحة**" لەگەڵ "**إبراهيم بن ستنة**" روویان لە دەشت و سارا کرد، ئیبراهیمی کوڕی سوتنە وتی: هەرچیت پێیە فڕێی بدە، دەڵێ هەرچی شتێك پێم بوو فڕێم دا جگە لە دینارێك، ئیبراهیم کوڕی سوتنە وتی: هەرچیت پێیە فڕێی بدە و ناخم سەرقاڵ و خەریك مەکە، دەڵێ: دینارەکەشم فڕێ دا، پاشان وتی: ئەی ئیبراهیم هەرچیت پێیە فڕێی بدە، بیرمکەوتەوە قەیتانی نەعلم هەڵگرتووە، ئەوەشم فڕێ دا، لە رێگە و لە هەر شوێنێك پێویستم بە قەیتان بوایە بۆ نەعلەکانم لەبەردەستم ئامادە دەبوو، ئیبراهیمی کوڕی سوتنە وتی: دەبێ بەم جۆرە مامەڵە بکرێت لەگەڵ خودا بە صدق.

**"زو نونی مصری"(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** صدق شمشێری خودایە، لەسەر گەردنی هەر شتێك دابنرێت دەیبڕێت.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** یەکەمین ناپاکی صدیقان گفتوگۆیانە لەگەڵ نەفسی خۆیان.

**پرسیار کرا لە "فتح الموصلي" دەربارەی صدق:** دەستی خستە ناو کورەی ئاسنگەرییەوە و پارچە ئاسنێکی سووربووەوەی دەرهێنا و خستییە ناو لەپی دەستییەوە و وتی: صدق بریتییە لەمە.

**یوسفی کوڕی ئەسبات دەڵێت:** گەر شەوێك بمێنمەوە و بە صدق مامەڵە لەگەڵ خودا بکەم لەلام خۆشەویستترە تا بە شمشێر لە پێناوی خودادا(ﷻ) بجەنگم.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** صدق ئەوەیە لەگەڵ خەڵك بیت بەو جۆرەی کە لەگەڵ خودی خۆتی، خۆیشت چۆنی بەو جۆرە سەرنجی خۆت بدەی.

**لە "الحارث المحاسبي" پرسیار کرا: نیشانەی صدق چییە؟**

وتی: ئەو کەسەیە گوێ نادات هیچ ڕێز و حورمەتێکی لەلای خەڵکی نەمێنێت لە پێناوی چاککردنی دڵی خۆیدا، پێی خۆشنییە خەڵکی بە گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەو بزانن، گوێ نادات خەڵکی بە کردەوە خراپەکانی بزانن، پێناخۆشبوونی ئەوە بەڵگە لەسەر ئەوەی دەیەوێت ڕێز و پایە لەلایان بەدەستبهێنێت، ئەوەش ئەخلاقی صدیقان نییە.

**هەندێکیان دەڵێن:** هەر کەس فەرزی هەمیشەیی جێبەجێ نەکات فەرزی کاتی لێ قبووڵ ناکرێت.

**وترا:** فەرزی هەمیشەیی چییە؟

وتی: صدق.

**وتراوە:** گەر ڕاستگۆیانە داوا لە خودا بکەی خودا(ﷻ) ئاوێنەیەکت پێ دەدات هەرچی سەیروسەمەرەکانی دونیا و دوارۆژە تیایدا دەبینیت.

**وتراوە:** صدق بپارێزە لەو شوێنەی دەترسی صدق زیانت پێ بگەیەنێت، چونکە سوودت پێ دەگەیەنێت، واز لە درۆ بهێنە لەو شوێنەی پێتوایە سوودت پێ دەگەیەنێت، چونکە زیانت پێ دەگەیەنێت.

**وتراوە:** هەموو شتێك شتە، بەڵام بەڕاستزانینی درۆزن هیچ شتێك نییە.

**هەروەها وتراوە:** نیشانەی درۆزن سوێندخواردنییەتی بەبێ ئەوەی داوای سوێندی لێ کرابێت.

**ئیبن سیرین دەڵێت:** زمان و قسە بەرینترە لەوەی شۆخیکەر درۆی تێدا بکات.

**هەروەها وتراوە:** چەند هەژارە بازرگانێکی راستگۆ!

# ٢٨

# شەرم و حەیا

((هەر کەس بەگوێڕایەڵی حەیا لە خودا بکات، خودا بە گوناهەکانییەوە حەیای لێ دەکات))

**خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:**﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ العلق: ١٤

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا**(ﷺ) **فەرمووی:** ((حەیا لە ئیمانەوەیە))

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خودا لێی رازی بێت) پێغەمبەر**(ﷺ) **جارێك بە هاوەڵانی فەرمووی:** ((بە حەق لە خودا حەیا بکەن، وتیان: ئێمە حەیا لە خودا دەکەین ئەی پێغەمبەری خودا، الحمد لله، فەرمووی: حەیا ئەوە نییە، بەڵام هەر کەس بە حەق حەیا لە خودا بکات با سەرو ئەوەی لەناو سەردایە بپارێزێت، با سك و ئەوەی بە دەوری سکدایە بپارێزێت، با بیر لە مردن و رزینی جەستە بکاتەوە، هەر کەس دوارۆژی بوێت رازاوەیی و جوانی ژیانی دونیا واز لێ دەهێنێت، هەر کەسێکیش ئەو کارانە بکات بە حەق حەیای لە خودا کردووە))[٤٦]

**هەندێ لە حەکیمان دەڵێن:** حەیای خۆتان زیندوو بکەنەوە بە دانیشتن لەگەڵ ئەوانەی حەیا لە خودا دەکەن.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** مەزنترین زانست بریتییە لە هەیبەت و حەیا، گەر هەیبەت و حەیا لە کەسێك کۆچی کرد ئەو کەسە خێری تێدا نامێنێت.

---

[٤٦] {حديث صحيح أخرجه أحمد في مسنده والترمذي في سننه}.

**"ذو النون" دەڵێت:** حەیا بوونێکە لەناو دڵدا، لەگەڵ بوونی نامۆیی لەوەی پێشتر لەگەڵ خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) ئەنجامت داوە.

**هەروەها "ذو النون" دەڵێت:** خۆشەویستی دێتە قسە، حەیا دەچۆڕێت و ترسیش نیگەرانی و پەرێشانی دروست دەکات.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** هەر کەس قسە لە حەیا بکات و خۆی لە خودا(عَزَّ وَجَلَّ) حەیا نەکات لەوەی قسەی تێدا دەکات ئەو کەسێکی فریوخواردووە و هەڵنراوە.

**حەسەنی کوڕی حەداد ڕۆیشت بۆ لای "عبدالله بن منازل" پێی وت:** لە کوێوە هاتووی؟

وتی لە دانیشتنێکی **"أبي القاسم المذكر"**ەوە، عەبدوڵا وتی: قسەی دەربارەی چی دەکرد؟ وتی: دەربارەی حەیا، عەبدوڵا وتی: هاوار چ سەرسوڕمانێکە، هەر کەس حەیا لە خودا نەکات چۆن دەبێت قسە لە حەیا بکات؟!

**"السري" دەڵێت:** حەیا و هۆگربوون تەقە لە دڵ دەدەن، گەر بەشێك لە زوهد و وەرعی تێدا بوو دێنە ژوورەوە، ئەگەر نە، دەڕۆن و کۆچی لێ دەکەن.

**"الجريري" دەڵێت:** سەدەی یەکەم خەڵکی بە ئایین مامەڵەیان کرد تا ئایین کاڵبوویەوە، پاشان سەدەی دووەم بە وەفا مامەڵەیان کرد تا وەفا کۆچ و باری کرد، پاشان سەدەی سێ بە جوامێری و پیاوەتی مامەڵەیان کرد تا جوامێری و پیاوەتی باری کرد، ئەوجا سەدەی چوار بە حەیا مامەڵەیان کرد تا حەیا کۆچی کرد، پاش ئەوە خەڵکی بە حەز و ترس مامەڵەیان کرد.

**لەسەر ئەم ئایەتە:** ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾یوسف: ٢٤

**وتراوە:** "البرهان" ئەوە بوو ژنەکە پەڕۆیەکی هەڵدایە سەر روخساری بتەکەی کە لە سوچێکی ژوورەکەدا دانرابوو بۆ ئەوەی چاوی لە کارە خراپەکەیەوە نەبێت، یوسف(عَلَيْهِ السَّلَامُ) پێی وت: خەریکی چیت؟

ژنەکە وتی: شەرم لە بتەکە دەکەم، یوسف(عَلَيْهِ السَّلَامُ) وتی: من لە تۆ لەپێشترم لە خودای خۆم(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) شەرم بکەم.

**لەسەر ئەم ئایەتە:** ﴿ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ ﴾ القصص: ٢٥

**وتراوە:** حەیای لە موسا کرد، چونکە بانگهێشی دەکرد بۆ میواندارییەك، شەرمی کرد لەوەی موسا(عليه السلام) وەڵامی بانگهێش کردنەکە نەداتەوە، سیفەتی خانەخوێ شەرمکردنە، ئەوەش شەرمکردنی بەخشندەییە.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت: خودا(ﷻ) دەفەرموێت:**

((ئەی بەندەکەم، هەتا شەرمم لێ بکەی، عەیبەکانت لەبیری خەڵکی دەبەمەوە و گوناهەکانت لەبیری شوێنەکانی سەر زەوی دەبەمەوە و هەڵە و خراپەکانت لە "أم الکتاب"دا دەسڕمەوە، لە ڕۆژی دواییدا دادگاییت ناکەم)).

**وتراوە:** پیاوێکیان بینی لە دەرەوەی مزگەوت نوێژی دەکرد، پێی وترا: بۆ ناچییە ناو مزگەوتەکە نوێژەکەت بکەی؟

وتی: شەرم دەکەم لە خودا بچمە ماڵەکەی لە کاتێکدا من لێی یاخی بووم.

**وتراوە:** لە نیشانەکانی کەسی حەیاکەر ئەوەیە لە شوێنێکدا نەبینرێت جێگەی شەرمەزاری بێت.

**یەکێکیان دەڵێت:** شەوێك چووینە دەرەوە بە پاڵ درەختێکدا تێپەڕین پیاوێکمان بینی خەوتبوو، ئەسپێکیش لە نزیك سەریەوە دەلەوەڕی، ئێمەش بە ئاگامان هێنا و پێمان وت: ناترسی لە دڕندەیەك لەم شوێنەدا دەخەوی؟

ئەویش سەری بەرز کردەوە و وتی: من شەرم لە خودا دەکەم لە شتێك بترسم جگە لە خودا، سەری نایەوە و خەوتەوە.

**خودا(ﷻ) وەحی بۆ عیسا(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو:**

ئامۆژگاری نەفسی خۆت بکە، گەر ئامۆژگاریت وەرگرت ئەوا ئامۆژگاری خەڵکی بکە، ئەگەر نە، لە خودا شەرم بکە لەوەی ئامۆژگاری خەڵکی بکەی.

**وتراوە: حەیا چەندین رووی هەیە:**

١. حەیای گوناه، وەك ئادەم(علیه السلام)، کاتێـك پێـی وتـرا: ئایـا لـە دەسـتم هەڵدێیت؟

وتی: نەخێر، شەرمت لێ دەکەم.

٢. **حەیای کەموکورتی:** وەك فریشتەکان کە دەڵێن: سبحانك.. ئێمـە بـە حـەق نەمانتوانی بەندایەتی تۆ بکەین.

٣. **حەیای بەمـەزنڕاگرتن:** وەك ئیسـرافیل(عليه السلام) باڵـەکانی دەلـەرزێنێت لەبـەر حەیا لە خودا(عز وجل).

٤. **حەیای بەخشندەیی:** وەك حەیای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەو لە ئومەتەکەی حەیای دەکرد پێیان بڵێت: بچنە دەرەوە، بۆیە خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند و فەرمووی: ﴿وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ﴾ الأحزاب: ٥٣

**حەیای حیشمەت:** وەك عەلی(خودا لێی رازی بێت) کاتێك داوای لە میقدادی کوڕی ئەسوەد کرد پرسیار لـە پێغەمبـەری خـودا(صلى الله عليه وسلم) بکـات دەربـارەی حـوکمی دەرچـوونی "مـەزی" لە ئەندامی نێرینەی پیاو، ئەوەش بە هـۆی ئـەوەی فاتیمـە(خودا لێـی رازی بێت) هاوسەری بوو.

**حەیای بەکەم تەماشا کردن:** وەك حەیای موسـا(عليه السلام) کاتێـك دەفـەرموێت: ئـەی پەروەردگار، مـن پێویستییەکی دونیاییم بۆ دێتە پێش، شەرم دەکەم داوات لێ بکـەم، **خودا(عز وجل) فەرمووی:** داوام لـێ بکـە تەنانـەت بـۆ خـوێی نـاو هەویرەکـەت و ئـاڵفی کاوڕەکەت.

**حەیای نیعمەتپێدان:** بریتییە لە حەیای خودا(عز وجل)، لە دوای ئـەوەی بەندەکـەی لـە پردی سیرات دەپەڕێتەوە نووسراوێکی مۆرکراوی پێ دەدات، دەبینێت تیایـدا هـاتووە: ئەوە و ئەوەت ئەنجامداوە، بەڵام شەرمم کرد لە دادگا نیشانی تۆی بدەم، بـڕۆ مـن لـە تۆ خۆشبووم.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** یەحیای کوڕی مەعاز وتویەتی: پاکێتی بۆ ئەو خودایەی بەندەکەی گوناه دەکات و ئەو(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) شەرمی لێ دەکات.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: پێنج شت لە نیشانەکانی بەدبەختین:**

١. دڵڕەقی.

٢. چاو وشکی.

٣. کەمی حەیا.

٤. حەزی دونیا .

٥. هیوا و ئاواتی دوورودرێژ.

**لە هەندێ کتێبدا هاتووە:** بەندەکەم لەگەڵم بە ویژدان نەبوو، داوام لێ دەکات و شەرم دەکەم رەدی بکەمەوە و یاخی دەبێت و شەرم لە من ناکات.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** هەر کەس بە گوێڕایەڵی حەیا لە خودا بکات خودا حەیای لێ دەکات لە باری گوناهباریدا.

بزانە حەیا توانەوە بە دوای خۆیدا دەهێنێت، دەوترێت: حەیا توانەوەی پەردەی دڵە بە هۆی تەماشاکردنی مەولاوە(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ).

**هەروەها دەوترێت:** حەیا گرژبوونی دڵە بۆ مەزنی پەروەردگار.

**وتراوە:** کاتێك کەسێك دادەنیشێت ئامۆژگاری خەڵکی بکات دوو فریشتە بانگی لێ دەکەن: ئامۆژگاری نەفسی خۆت بکە بەوەی ئامۆژگاری براکەتی پێ دەکەی، ئەگینا لە گەورەکەی خۆت شەرم بکە، چونکە ئەو تەماشات دەکات.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی حەیا:** وتی: بینینی زۆری نیعمەتەکانی خودا و بینینی کەموکورتییەکانی خۆتە، لە نێوان ئەم دووانەدا حاڵێك لەدایك دەبێت پێی دەوترێت حەیا.

**"الواسطي" دەڵێت:** هەر کەس سنوورێك ببەزێنێت و پەیمانێك بشکێنێت گەستنەکانی حەیا ناچێژێت.

**هەروەها "الواسطي" دەڵێت:** کەسی شەرمکەر ئارەقی لێ دەچۆڕێت، ئەوەش ئەو چاکەیە کە تێیدایە، هەتا لە نەفسدا شتێك بوونی هەبێت لە حەیا دوورەپەرێزە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** حەیا وازهێنانە لە بانگەشە لەبەردەم خودادا (ﷻ).

**ئەبوبەکری وەراق دەڵێت:** لەوانەیە دوو رکات نوێژ بکەم و پشتیان لێ بکەم، وەك پشتهەڵکردنی ئەو کەسەی لە حەیادا پشت لە دزی دەکات.

۞ ۞ ۞

٢٩

# ئازادی

((تۆ ناگەیتە ئازادی تەواو لە حەقیقەتی بەندایەتی شتێکت لەسەر مابێت))

**خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:**﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾الحشر: ٩ ،

**ئیمامی قوشەیری دەڵێت:** کەسانی تریان بەسەر خۆیاندا پێش خست بەهۆی خۆدارنیانیان لەوەی لێی هاتبوونە دەرەوە و ئەوانیان پێ پێشخست بوو.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا**(ﷺ) **فەرمووی:** ((ئەوەندە بەسە بۆ یەکێك لە ئێوە نەفسی قنیاتی پێ دەکات، ئەو دەچێت بۆ چوار باڵ و بستێك لە خاك(گۆر) و هەموو شتێك بەرەو کۆتایی دەچێت))[٤٧]

**ئیمامی قوشەیری دەڵێت:** ئازادی: ئەوەیە بەندە نەکەوێتە ژێر نیری بەندایەتییەوە، و دەسەڵاتی شتەکان بەسەریدا گوزەر نەکات، نیشانەی دروستی ئەمەش: ئەوەیە لە دڵیدا جیاکاری لە نێوان شتەکاندا نەمێنێت، بۆیە ترس و هەڕەشە پێشهاتەکانی لا یەکسان بووە.

**"حارثة"(خودا لێی رازی بێت) وتی بە پێغەمبەری خودا**(ﷺ): نەفسی خۆم لە دونیا کەنارگیر کردووە، بەرد و ئاڵتوونی دونیام لا یەکسان بووە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** هەر کەس بچێتە ناو دونیاوە و لە دونیا ئازاد بێت ئەوا ئازادانە کۆچ دەکات بۆ دوارۆژ.

---

[٤٧] {و روى نحوه ما أخرجه الطبراني والبيهقي}.

**هەروەها دەقاق دەڵێت:** هەر کەس لە دونیادا ئازاد بێت لە دونیا ئەوا لە دوارۆژدا لێی ئازاد دەبێت.

بزانە راستەقینەی ئازادی لە کەماڵی بەندایەتیدایە، هەر کەس راست بکات لە بەندایەتییەکەی بۆ خودا ئەوا ئازادییەکەی لە کۆتوبەندی نەیار قوتاری دەبێت.

بەڵام ئەوانەی وا ئەندێشە دەکەن لەم خانەی داوادا(دونیا) کاتێك دێتە بەرەوە بەندە لە کۆتوبەندی بەندایەتی قوتاری ببێت و لە سنوورەکانی ئەمر و نەهی رزگاری ببێت ئەوا ئەو کەسە خۆی لە ئایین دارنیوە.

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر: ٩٩، یەقین:** واتە کاتی مردن و لەسەر ئەم لێکدانەوەیە هەموو ئەهلی تەفسیر کۆدەنگیان هەیە.

**ئەوەی ئەم دەستە دەربارەی ئازادی ئاماژەی پێ دەکەن:** ئەوەیە بەندە نەکەوێتە ژێر نیر و کۆتوبەندی شتێك لە دروستکراوەکان نە بۆ شتێکی کەمی دونیایی نە بۆ شتێك کە پەیوەندی بە دوارۆژەوەیە، بۆ خودا تەنها ببێتەوە و دونیای کەموکورت نەیکات بە کۆیلە و نەچێتە ژێر دەسەڵاتی ئارەزووەوە و هیوا و ئاواتەکان فریوی نەدەن و داوا و مەبەست و پێویستی و بەشی دونیای تووشی لادان و هەڵپەی نەکەن.

**وترا بە شیبلی: ئایا نازانی کە خودای موتەعال "رحمن"ە؟**

**وتی:** با، بەڵام لەو کاتەی رەحمەتی ئەوم ناسیوە داوام لێ نەکردووە رەحم پێ بکات.

مەقامی ئازادی مەقامێکی دەگمەن و بەنرخە.

**ئەبو عەباسی یەساری دەڵێت:** گەر نوێژ بەبێ قورئان دروست بوایە ئەوا دەبوا بەم **دێرە هۆنراوەیە دروستبوایە:**

**أتمنى على الزمان محالا    أن ترى مقلتاي طلعة حر**

(محاڵ داوا دەکەم لە رۆژگار، کاتێك چاوەکانم چاوەڕوانی هەڵهاتنی رۆشنایی کەسێکی ئازادن)

**قسەی گەورە پیاوان لەسەر ئازادی:**

**"الحسين بن منصور" دەڵێت:** هەر کەس ئازادی دەوێت با بەندایەتی بەردەوام بێت.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی کەسێك کە بە ئەندازەی تامکردنی ناوکە خورمایەك بەشی بە دونیاوە ماوە، وتی:** بەندەی نووسراو بۆ کراو ئەو بەندەیەیە تەنها درهەمێکی قەرزی گەورەکەی لەسەر نەمابێت.

**بیشری حافی دەڵێت:** هەر کەس دەیەوێ تامی ئازادی بکات و لە بەندایەتییدا ئاسوودە بێت با نهێنی و پەنهانی خۆی لەگەڵ خودا(ﷻ) پاك بکاتەوە.

**"الحسين بن منصور" دیسان دەڵێت:** کاتێك بەندە هەموو مەقامەکانی بەندایەتی تێر و تەواو دەکات ئەوا لە ماندبوونی بەندایەتی ئازاد دەبێت، ئەو کات بەبێ ئەرك و ماندووبوون و زۆرلەخۆکردن بەندایەتی ئەنجام دەدات، ئەوەش مەقامی پێغەمبەران و صدیقانە، واتە ئەو دەبێت بە کەسێکی هەڵگیراو و شەکەتی و ماندووبوون روو لە دڵی ناکات هەرچەند ئەو لەڕووی شەرعەوە بە عیبادەتەکان هەڵدەستێت.

**"منصور الفقيه" لە دوو دێڕ هۆنراوەدا دەڵێت:**

**ما بقي في الإنس حر لا، ولا في الجن حر**

**قد مضى حر الفريقين فحلو العيش مر**

(لە ناو مرۆڤەکاندا ئازانێك نەماوە، نەخێر، لەناو جنیشدا ئازاد نەماوە، لەناو هەردوو دەستەکە ئازادان رۆیشتن و نەمان، بۆیە ئێستا شیرینی ژیانە تاڵاوە)

بزانە زۆربەی ئازادی لە خزمەتی هەژاراندایە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** خودا وەحی بۆ داود نارد و پێی فەرموو: گەر کەسێکت بینی داوای منی دەکرد بۆی ببە بە خزمەتکار.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** رۆڵەکانی دونیا کەنیزەك و خزمەتکارەکان خزمەتیان دەکەن، بەڵام رۆڵەکانی دوارۆژ ئازادان و چاکان خزمەتیان دەکەن.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێت:** ئازادی بەخشندە لە دونیا دێتە دەرەوە بەر لەوەی دونیا ئەو بەجێبهێڵێت.

**هەروەها ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێت:** تەنها هاوەڵی کەسی ئازادی بەخشندە بکە، کەسێك گوێدەگرێت(دەبیستێ) و قسە ناکات.

## ٣٠

# یاد( الذکر )

**((پرسیار لە "الواسطي" کرا دەربارەی یاد ، وتی: دەرچوونە لە مەیدانی بێئاگایی بەرەو ئاسۆی موشاهەدە لەسەر زاڵبوونی ترس و توندی خۆشەویستی بۆ خودا))**

**خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:**﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴿٤١﴾﴾ **الأحزاب: ٤١**

**لە "أبي الدرداء"(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا**(ﷺ) **فەرمووی:** ((دەتانەوێ هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی باشترین کار و کردەوەتان و پاکترینیان لەلای مەلیکەکەتان و باڵاترینیان لە پلە و پایەی ئێوە و لە پێدانی زێڕ و پارە بەنرختر بێت و خێرتر بێت لەوەی بە دوژمنتان بگەن و لە گەردنیان بدەن و لە گەردنتان بدەن؟ وتیان: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی یادی خودا(ﷻ)))

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر**(ﷺ) **فەرمووی:** ((رۆژی دوایی بەسەر کەسێکدا نایەت بڵێت: الله.. الله))

**هەروەها لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا**(ﷺ) **فەرمووی:** ((رۆژی دوایی نایەت تا لەسەر زەوی کەسێك نامێنێت بڵێ: الله.. الله))

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** یاد کۆڵەکەیەکی بەهێزە لە رێگەی بەرەو خوداچوون، بەڵکو پایەیەکی دامەزراوە لەسەر ئەم رێگەیە، تەنها بە بەردەوامی یادی خودا کەسێك بە خودا دەگات.

**یادی خودا دوو جۆرە:**

**یادی زمان و یادی دڵ.**

**یادی زمان:** بەندە بە هۆیەوە دەگاتە بەردەوامی یادی دڵ و کاریگەری بۆ سەر یادی دڵ، کاتێك بەندە بە زمان و بە دڵ یادی خودای کرد ئەوا ئەو کەسە لە حاڵی بەرەو خوداچوونی تێر و تەواوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** دەسەڵاتی زیکر بەربڵاوە، هەر کەس لە زیکردا سەرکەوتوو بوو ئەو دەسەڵاتەی پێ دەدرێت، هەر کەسیش لە زیکر بێبەش بێت لەو دەسەڵاتە کەنارگیر دەکرێت.

**وتراوە:** شیبلی لە سەرەتای بەرەو خوداچوونیەوە رێگەیەکی دەگرتەبەر و گورزەیەك لە داری لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت، هەر کات بێئاگاییەك رووی بکردبایەتە دڵی بەو دارانە لە خۆی دەدا تا دەشکان، هەندێ جار گورزە دارەکە هەموویان دەشکان بەر لەوەی ئێوارە دابێت، هەندێ جاریش دەست و قاچی خۆی بە دیواردا دەکێشا.

**وتراوە:** زیکری خودا بەدڵ شمشێری مورشیدانە، بەو شمشێرە لەگەڵ دوژمنەکانیان دەجەنگن، و بەو شمشێرە ئەو ئافەتانەی روویان تێدەکەن و ئەو بەڵانەی دەبن بە سێبەر بە سەریانەوە لادەدەن، کاتێك دڵی بە ترسەوە بۆ لای خودا(ﷻ) هەڵدێت هەموو ئەو شتانەی لەو دەمەدا لێی بێزارە دووردەکەونەوە.

**پرسیار لە "الواسطي" کرا دەربارەی زیکر وتی:** دەرچوونە لە مەیدانی بێئاگایی بۆ ئاسۆی بەرینی موشاهەدە لەسەر زاڵبوونی ترس و توندی خۆشەویستی بۆ خودا.

**"ذو النون" دەڵێت:** هەر کەس بە یادێك یادی خودا بکات لەسەر حەقیقەت بێت لە پاڵ یادەکەیدا هەرچی شتە لەبیردەباتەوە و خودا هەموو شتێکی لەسەر دەپارێزێ و دەبێت بە پاداشت بۆی لە جێگەی هەموو شت.

**پرسیار لە ئەبو عوسمان کرا و پێی وترا:** ئێمە یادی خودا دەکەین و شیرینییەکەی لە دڵدا نابینینەوە؟ ئەویش وتی: حەمدی خودا بکەن کە ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئێوەی بە گوێڕایەڵی خۆی جوان کردووە.(ئەبو عوسمان(رەحمەتی خودای لێ بێت)

ویستوویەتی پێیان بڵێ: شوکری خودا بکەن لەسەر یادی زمـان بـا خـودا بۆتـان زیـاد بکات و دڵیشتان بکەوێتە ناو یادەوە و لەوێوە شیرینی یادی خودا بکەن)

**لە ریوایەتێکی بەناوبانگدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی:** ((گـەر بـە پاڵ باخچەکانی بەهەشتدا گوزەرتان کرد سەرێك بکێشنە ناویانەوە، وتیان: باخچەکانی بەهەشت چین، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ئەڵقەی یادی خودا))[٤٨]

**لــە جــابری کــوڕی عەبــدوڵاوە(خوایان لــێ رازی بێــت) فــەرمووی: ڕۆژێــك پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و فــەرمووی:** ((ئـەی خەڵکینـە لابدەنـە باخچـەکانی بەهەشــت، وتمــان ئــەی پێغەمبــەری خــودا باخچــەکانی بەهەشــت چــین؟ فــەرمووی: مەجلیسی یادی خودا، بەیانیان و ئێواران یادی خودا بکەن، هەر کەس پێی خۆشە پلە و پایەی خۆی لەلای خودا بزانێت با بزانێت پلە و پایەی خودا لەلای ئەو چۆنە؟ خـودا بەندەکەی لە شوێنێك دادەنێت کە بەندەکە لەلای خۆی خودای تێدا دادەنێت))[٤٩]

**لە تایبەتمەندییەکانی زیکر:** ئەوەیە کە کـاتی نییـە، بـەڵکو لـە هـەموو کاتێکـدا بەندە داوای لێکراوە یادی خودا بکات: جا یان وەك فەرز یان سوننەت، نوێژ هەرچـەند بەرزترین و مەزنترین عیبادەتە لە هەندێ کاتدا دروست نییە، بەڵام یادی خـودا بـەدڵ لە هەموو بارێکدا بەردەوامە.

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:**﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ﴾ آل عمران: ١٩١

**"الإمام أبوبكر بن فورك"(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** "قیاما-بـە پێـوە": واتە بە حەقی یادی خودا، و "قعودا-بە دانیشتنەوە" لە بانگەشە تیایدا.

**گوێم لە "أبو عبدالرحمن" بوو پرسیاری لە ئەبو عەلی دەقاق دەکـرد و دەیـوت:** ئایا یادی خودا تەواوترە یان بیرکردنەوە؟ مامۆسـتا ئـەبو عـەلی فـەرمووی: شـێخمان بۆخۆی چی لەو بارەوە دەڵێ؟

---

[٤٨] {أخرجه أحمد في المسند}.

[٤٩] {رواه أبو الدنيا و أبو يعلى، والبزار، والطبراني، والحاكم، والبيهقي}.

**"أبو عبدالرحمن" وتی:** لەلای من یادی خودا لە بیرکردنەوە تەواوترە، چونکە حەق(ﷻ) بە زیکر وەسف دەکرێت، بەڵام بە بیرکردنەوە وەسف ناکرێت، ئەوەی خودای(ﷻ) پێ وەسف دەکرێت تەواوترە لەوەی تایبەتە بە دروستکراوەکانەوە، مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت) قسەکەی زۆر لا باش و جوان بوو.

**"الكتاني" دەڵێت:** گەر یادی خودا لەسەرم فەرز نەبوایە یادی خودام نەدەکرد لەبەر مەزنی و شکۆمەندی خودا، کەسێکی وەك من چییە یادی خودا بکات؟! دەمی بە هەزار تەوبەی قبووڵکراو لە یادەکەی پاکنابێتەوە))

هەروەها لە تایبەتمەندییەکانی یادی خودا یادی خۆی بۆ بەندەکەی خستۆتە بەرانبەر یادی بەندەکەی بۆ ئەو و دەفەرموێت:﴿ **فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ** ﴾ **البقرة: ١٥٢**

**لە ریوایەتێکدا: ((جبريل(عليه السلام) بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) فەرموو:** خودا(ﷻ) دەفەرموێت: شتێکم بە ئومەتەکەی تۆ داوە بە هیچ ئومەتێکی ترم نەداوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی چییە ئەی جبریل؟ فەرمووی ئایەتی: ﴿ **فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ** ﴾ خودا بە هیچ ئومەتێك جگە لەم ئومەتە ئەمەی نەفەرمووە))

**وتراوە:** فریشتەی مردن داوای مۆڵەت لە کەسی یادکەر دەکات بۆ کێشانی گیانی.

**لە هەندێ کتێبدا هاتووە:** موسا(عليه السلام) فەرمووی: پەروەردگار: تۆ لە کوێ نیشتەجێ بوویت؟ خودا وەحی رەوانە کردە سەر دڵی و پێی فەرموو: لە دڵی بەندەی باوەڕداردا، ماناکەی: سوکنایی و نیشتەجێبوونی یادی خودا لە دڵدایە، چونکە خودا(ﷻ) پاك و بێگەردە لە نیشتەجێبوون و تێکەڵبوون، بەڵکو ئەوە جێگیرکردنی یادی خودا و بەرهەم هاتنییەتی.

**پرسیار لە "ذو النون" کرا دەربارەی زیکر، فەرمووی:** بریتییە لە بزربوونی یادکەر لە یادەکەی، پاشان دێڕێك هۆنراوەی وت:

**لا لأني أنساك أكثر ذكرا ك، ولكن بذاك يجري لساني**

(لەر ئەوە نییە لەبیرت بکەم بۆیە زۆر یادت دەکەم، بەڵکو ئەوە زمانمە ئەوەی بەسەردا گوزەر دەکات)

**سەهلی کوڕی عەبدولاّ دەڵێت:** ((هەموو ڕۆژێك جەلیل(ﷻ) بانگ دەکات: ئەی بەندەکەم لەگەڵم بە ویژدان نەبووی، یادت دەکەم و تۆ من لەبیر دەکەی، بانگت دەکەم بۆ لای خۆم و دەچی بۆ لای کەسانی تر، بەلاّ و ناخۆشییەکانت لیّ لا دەبەم و تۆ بەردەوامی لە هەڵە و گوناه، ئەی ڕۆڵەی ئادەم سبەینیّ کە دێیەوە بۆ لام تۆ چی دەڵێیت؟))

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** لە بەهەشت شوێنی تەخت و دەشتایی هەیە، کاتێك کەسی یادکەر دەچێتە ناو یادەکەیەوە فریشتەکان لەو دەشتانەدا دەست بە چاندنی درەخت دەکەن بۆی، هەندیّ فریشتە لە کارکردن دەوەستن، پێی دەوترێت: بۆ وەستاوی؟ ئەویش دەڵیّ: هاوەڵەکەمان لە یادی خودا سارد بووەتەوە.

**حەسەنی بەصری دەڵێت: لە سیّ شتدا بە دوای شیرینیدا بگەڕێن:** نوێژ و یادی خودا و خوێندنی قورئان، گەر بینیتانەوە باشە، ئەگەر نە بزانە دەرگات بەڕوودا داخراوە.

**"حامد الأسود" دەڵێت:** لە سەفەرێکدا لەگەڵ ئیبراهیمی خەواص بووم، هاتین بۆ شوێنێك ماری زۆری تێدا بوو، دەفرەکەی(ئەوەی ئاوی پیّ دەخواردەوە) دانا و دانیشت و منیش دانیشتم، کاتێك شەو بەرەو سەرما ڕۆیشت و هەوا سارد بوو مارەکان هاتنە دەرەوە، هاوارم کرد لە هاوەڵەکەم و ئەویش وتی: یادی خودا بکە.. منیش یادی خودام کرد و مارەکان چوونە دواوە، پاشان گەڕانەوە و دیسان هاوارم کردەوە و هاوڕێکەم وتی: یادی خودا بکە، ئەو شەوە تا بەیانی لەو حاڵەتەدا بووم.. کاتێك ڕۆژبوویەوە هەستا و دەستی بە ڕۆیشتن کرد و منیش لەگەڵی ڕۆیشتم، لەناکاو مارێکی گەورە کە خۆی ئەڵقەدابوو لە ئیبراهیم کەوتە خوارەوە، پێم وت: هەستت بەو مارە نەکرد بوو؟

وتی: نەخێر، لە زووەوە شەوێکم بە ئەندازەی ئەم شەوە خۆش و ئاسوودە بەسەر نەبردووە.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** هەر کەس نامۆبوونی بێئاگایی نەچێژێت تام و شیرینی یادی خودا ناکات.

**جونەید دەفەرموێت:** گوێم لە **"السري"** بوو دەیوت: لە هەندیّ کتێب کە خودا دایبەزاندوون نووسراوە: گەر یادی من بەسەر بەندەکەمدا زاڵ ببێت، عاشقم دەبێت و عاشقی دەبم.

**هەروەها دەڵێت:** خودا وەحی نارد بۆ داود(عليه السلام) و فەرمووی: ((بە من دڵخۆش بن، و بە یادی من بەهرە و خۆشی وەربگرن))

**"الثوري" دەڵێت:** هەموو شتێك سزایەکی هەیە، سزای کەسی عاریف بە خودا دابڕانییەتی لە یادی خودا.

**لە ئینجیلدا هاتووە:** کاتێك تووڕە دەبیت یادی من بکە، کاتێك تووڕە دەبم یادت دەکەم، رازی بە سەرخستنی من بۆ تۆ، سەرخستنی من بۆ تۆ باشترە لە سەرخستنی تۆ بۆ خۆت.

**وترا بە راهیبێك:** تۆ بەڕۆژووی؟ وتی: بەڕۆژووم بە یادی خودا، گەر باسی کەسێکی تر بکەم جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) رۆژووەکەم شکاوە.

**وتراوە:** کاتێك یادی خودا لە دڵ دادەمەزرێت گەر شەیتان لێی نزیك ببێتەوە تووشی فێ دەبێت، وەك چۆن مرۆڤ فێی لێ دێت کاتێك شەیتان لێی نزیك ببێتەوە، ئەو کات کۆمەڵێك شەیتانی لێ کۆدەبنەوە و دەڵێن: ئەم شەیتانە چییەتی؟

دەڵێن: مرۆڤ تووشی کردووە.

**سەهل دەڵێت:** هیچ یاخیبوونێك ناشیرینتر نییە لە لەبیرچوونەوەی پەروەردگار(سبحانه وتعالى).

**وتراوە:** یادی شاراوە و نادیار فریشتە بەرزی ناکاتەوە، چونکە ئاگای پێی نییە، ئەوە نهێنییەکە لە نێوان بەندە و پەروەردگار(عز وجل).

**یەکێکیان دەڵێت:** باسی کەسێکی زاکیریان بۆ کردم لە جەنگەڵێك، منیش هاتم بۆ لای، کاتێك دانیشتبوو دڕندەیەکی زەبەلاح هێرشی کردە سەری و لێیدا و پارچەیە گۆشتی لێ کردەوە، بۆیە بوورایە و منیش بوورامەوە، کاتێك بەئاگاهاتەوە وتم: ئەوە چی بوو؟ وتی: خودا ئەم دڕندەیەی بەسەر منەوە داناوە هەر کات لاوازی و ساردبوونەوە روو لە یادەکەم دەکات ئەو دڕندەیە گازێکم لێ دەگرێت وەك بینیت.

**"الجريري" دەڵێت:** لەناو یەکێك لە هاوەڵانماندا پیاوێکی تێدا بوو زۆر دەیوت: الله، الله.. رۆژێك دارێك بەسەریدا بەربوویەوە و سەری شکاند و خوێنی لێ رژا، خوێنەکەم بینی لە زەوی دەینووسی: الله... الله..

٣١

# جوامێری

((جونەید دەڵێت: جوامێری گرتنەوەی ئازارە لە خەڵکی و بەخشینەوەی چاکەیە، وتراوە: جوامێری چاکەیەکە رووی لێ دەکەی و نەفسی خۆتی تێدا ناخوێنیتەوە))

﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾﴾ الكهف: ١٣

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت،** بنچینەی جوامێری ئەوەیە بەندە بەهەمیشەیی بۆ کاروباری کەسانی تر بکۆشێت و هەوڵبدات.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((بەردەوام خودا(سبحانه وتعالى) لە پێویستی بەندەیەکدا دەبێت هەتا بەندەکە لە پێویستی برا موسڵمانەکەیدا بێت))

**بە سەنەدێکی تر لە زەیدی کوڕی سابیتەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:**((بەردەوام خودا(سبحانه وتعالى) لە پێویستی بەندەیەکدا دەبێت هەتا بەندەکە لە پێویستی برا موسڵمانەکەیدا بێت))

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** کەماڵی ئەم ئەخلاقە تەنها بۆ پێغەمبەری خودایە(ﷺ) لە رۆژی دواییدا هەموو بەندەیەك دەڵێت: خۆم.. خۆم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ئومەتەکەم.. ئومەتەکەم.

**جونەید دەڵێت:** جوامێری لە شامە و زمان لە عێراق و صدق لە خۆراسان.

**فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** جوامێری چاوپۆشییە لە هەڵە و تێکەوتنی برایان.

**وتراوە:** جوامێری ئەوەیە نەفسی خۆت لە هیچ کەس بە چاکتر نەزانی.

**ئەبوبەکری وەراق دەڵێت:** جوامێر ئەو کەسەیە نەیاری نییە.

**"محمد بن الترمذي" دەڵێت:** جوامێری ئەوەیە لەبەر خودا ببیت بە نەیاری نەفسی خۆت.

**وتراوە:** جوامێر ئەو کەسەیە نەیار نییە بە هیچ کەس.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** گوێم لە نەصرابادی بوو دەیوت: بۆیە هاوەڵانی ئەشکەوت بە جوامێر(**فتية**) ناوبران، چونکە بەبێ ناوەند(**واسطة**) باوەڕیان بە پەروەردگاریان هێنا.

**وتراوە:** جوامێر ئەو کەسەیە بتی شکاندووە، **خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:** ﴿قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾﴾ **الأنبياء:** ٦٠، **هەروەها خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:** ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا﴾ **الأنبياء:** ٥٨ واتە: پارچە پارچەی کردن. بتی هەموو مرۆڤێك بریتییە لە نەفسی، هەر کەس سەرپێچی لە نەفسی خۆی بکات ئەو کەسە لە راستەقینەدا جوامێرە.

**حاریسی موحاسیبی دەڵێت:** جوامێری ئەوەیە بە ویژدان بیت نەك داوای ویژدان لە بەرانبەر بکەی.

**عومەری کوڕی عوسمانی مەکی دەڵێت:** جوامێری ئەخلاقی جوانە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی جوامێری وتی:** ئەوەیە هەژار نەتۆرێنی و بەرهەڵستی دەوڵەمەندیش نەکەی.

**نەصرابادی دەڵێت:** پیاوەتی بەشێکە لە جوامێری، ئەوەش بریتییە لە پشتهەڵکردن لە دوو دونیاکە(دونیای نەفس و دونیای دەرەوە) و خۆباڵاکردن لە هەردووکیان.

**"محمد بن الترمذي" دەڵێت:** جوامێری ئەوەیە بەردەوام و کاتیت لا یەکسان ببێت.

**پرسیار لە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرا دەربارەی جوامێری، فەرمووی:** وازهێنانە لەوەی ئارەزووی دەکەی بۆ ئەوەی لێی دەترسی.

**بە یەکێکیان وترا: جوامێری چییە؟**

وتی: ئەوەیە جیاکاری نەکات لە نێوان ئەوەی دۆستی خودا نانی لەلا بخوات یان بێباوەڕ.

**گوێم لە زانایەك بوو دەیوت:** کەسێکی مەجووسی داوای لە ئیبراهیم خەلیل کرد میوانداری بکات، ئیبراهیم فەرمووی: گەر موسڵمان ببیت میوانداریت لێ دەکەم، بابای مەجووسی وتی: گەر موسڵمان ببم چ منەتێکت لەسەرم دەمێنێت؟

بۆیە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، خودا وەحی بۆ ئیبراهیم(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: تەنها بە گۆڕینی دینەکەی خواردنی پێ دەبەخشی؟

ئێمە حەفتا ساڵە بەبێ باوەڕییەوە خواردنی پێ دەدەین، گەر تەنها شەوێك میوانداریت لێ بکردبایە چی دەبوو؟

ئیبراهیم بە دوای مەجووسییەکەدا گەڕا و دۆزییەوە و میوانداری لێ کرد، مەجووسییەکە پێی وت: هۆی چی بوو رای خۆت گۆڕی؟

ئەویش بۆی باس کرد، مەجووسییەکە وتی: ئاوا مامەڵەم لەگەڵ دەکات؟

پاشان وتی: باسی ئیسلامم بۆ بکە و موسڵمان بوو.

**جونەید دەڵێت:** جوامێری گرتنەوەی ئازارە لە خەڵکی و بەخشینی خۆشی و ئاسوودەییە بە کەسی بەرانبەر.

**سەهلی کوڕی عەبدولا دەڵێت:** جوامێری بریتییە لە شوێنکەوتنی سوننەت.

**وتراوە:** جوامێری بریتییە لە وەفا و داپۆشین.

**وتراوە:** جوامێری چاکەیەکە ئەنجامی دەدەی و نەفسی خۆتی تێدا ناخوێنییەوە.

**وتراوە:** جوامێری ئەوەیە کاتێك داواکەر رووی لێ کردی هەڵنەیەیت.

**وتراوە:** جوامێری ئەوەیە خۆت بزر نەکەی لەوانەی رووت لێ دەکەن.

**وتراوە:** ئەوەیە هیچ پاشکەوت نەکەی و پاساو و بیانوو نەهێنیتەوە.

**وتراوە:** بریتییە لە دەرخستنی نیعمەت و شاردنەوەی میحنەت.

**وتراوە:** ئەوەیە دە کەس بانگێش بکەی، بەڵام گەر نۆ یان یازدە هاتن هیچ نەگۆڕێیت.

**گـوێم لـە "أبـو عبـدالرحمن السـلمي" بوو(ڕەحمـەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** ئەحمـەدی کـوڕی خـەزرەوەی بـە ژنەکـەی خـۆی(**أم علـي**) وت: دەمـەوێ دەعوەتێـك سـاز بکـەم و تیایـدا بانگهێشـی زەڕەنگـەرێکی زۆر زیـرەك بکـەم کـە لـە ولاتـی خۆماندا نموونەی کەسێکی جوامێر بووە.

ژنەکەی وتی: دەعوەتی تۆ ناگات بە دەعوەتی ئەو کەسە جوامێرانە.

**ئەحمەد** وتی: هەر دەبێ ئەنجامی بدەم.

ژنەکەی وتی: گەر ئەو کارە دەکەی لە دەرگای ماڵی ئەو پیاوەوە تـا دەرگـای مـاڵی خۆت مەڕ و وڵاخ و گوێدرێژ سەربڕە.

**ئەحمەد** وتی: مەڕ و وڵاخم زانیوە، بەڵام گوێدرێژ بۆ؟

وتی: تۆ کەسێکی جوامێر بانگ دەکەی بـۆ ماڵەکـەت، کەمەکـەی ئەوەیـە سـەگی گەڕەکەکەشمان خێر لەو دەعوەتە ببینن بە خواردنی گۆشتی گوێدرێژەکان.

**وتراوە:** کەسێك لە پیاوان دەعوەتێکی ساز کرد و شێخی شیرازی تێدا بـوو، کاتێـك نانیان خوارد لە باری گوێگرتن لە هەندێ ئاواز خەویان لێکەوت.

**شێخی شیرازی وتی** بە خاوەن دەعوەتەکە: هۆی ئەم خەو لێکەوتنەمان چی بوو؟

وتی: نازانم.

لە هەموو ئەوەی دەرخواردم دان وردبوومەوە و پرسیارم کرد، جگە لـە باینجانەکـە، پرسیاری ئەوەم نەکرد..

کاتێك بەیانیان لێهات پرسیاریان لە فرۆشیاری باینجانەکە کرد، ئەویش وتی: هیچم لە ماڵدا نەبوو، باینجانەکەم لە فلان شوێن دزی و فرۆشتم، ئەوانیش پیاوەکەیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ لای خاوەن کێڵگەکە تاکو گـەردنی خـۆی بـە جوتیارەکـە ئـازاد بکـات، پیاوەکە وتی: داوای هەزار باینجانم لێ دەکەن؟

ئەوا ئەم زەویە و دوو گا و گوێدرێـژێك و ئـامێری جووتکردنەکـەم پـێ بەخشـی بـە مەرجێك نەگەڕێتەوە سەر ئەو کارەی.

**وتراوه:** پیاوێك هاوسەری لەگەڵ ئافرەتێك کرد، بەر لەوەی ژنەکە بگوێزێتەوە ژنەکە تووشی ئاوڵە بوو، پیاوەکە وتی: چاوم ئێش دەکات، پاشان وتی: چاوم کوێر بووە، بۆیە ژنەکە شووی پێ کرد..

پاش بیست ساڵ ژنەکەی مرد، دوای مردنی ژنەکە پیاوەکە چاوی کردەوە، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا وتی: کوێر نەبووبووم، بەڵام خۆم کرد بە کوێر نەوەك ژنەکەم(لەبەر ناشیرینی روخساری بەهۆی ئاوڵەوە) دڵی تەنگ ببێت، پێی وترا: پێش هەموو جوامێرەکان کەوتی.

**"ذو النون" دەڵێت:** هەر کەس نموونەی جوامێری گەرەکە با بڕوات بۆ لای ئاوبەخشەکانی بەغداد.

پێی وترا: ئەوە چۆنە؟ وتی: کاتێك لە میسرەوە بردمیان بۆ لای خەلیفە لەسەر ئەو تۆمەتی زەندەقەی درابووە پاڵم، کەسێکی ئاوگێڕم بینی عەمامەیەك و دەسڕێکی میسری لەسەر دانابوو، دوو گۆزەی گڵینەی بە دەستەوە بوو، وتم: ئەمە ئاوگێڕی پادشایە، وتیان: نەخێر، ئەمە ئاوگێڕی خەڵکییە بەگشتی، جامە ئاوەکەم لێ وەرگرت و لێم خواردەوە، و وتم بەوانەی لەگەڵم بوون: دینارێکی پێ بدەن، پیاوەکە وەرینەگرت و وتی: تۆ دیلی، جوامێری نییە پارە لە کەسێکی وەك تۆ وەربگرم.

**یەکێك لە هاوەڵانمان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئەوە جوامێری نییە قازانج لە دۆستەکەت بکەی.

ئەو کەسە جوامێرە ناوی ئەحمەدی کوڕی سەهل بوو، کەسێکی بازرگان بوو، خەرقەیەکی سپیم لا کڕی، ئەویش بە نرخی خۆی پێی فرۆشتمەوە و خێری لێ نەسەندم، وتم: بۆ خێرم لێ وەرناگری؟

وتی: نرخەکەی خۆی وەردەگرم و منەتت بەسەردا ناکەم، چونکە ترسێکی نییە گەر نرخەکەی خۆی وەربگرمەوە، بەڵام خێر وەرناگرم، چونکە جوامێری نییە قازانج لە دۆستەکەت بکەی.

**وتراوه:** کەسێك پەیدا بوو بانگەشەی جوامێری دەکرد، لە نیسابوورەوە ڕۆیشت بۆ "نسا"، لەوێ پیاوێك میوانداری کرد، کەسەکە تاقمێك گەنجی لەگەڵ بوو، کاتێك لە خواردن بوونەوە کەنیزەکێك هات بۆ ئەوەی ئاو بکات بە دەستیاندا، کەسە نیسابوورییەکە بۆ شۆردنی دەستی گرژی رووی لێ کرد، و وتی: جوامێری نییە ژنان ئاو بکەن بە دەست پیاواندا.

**یەکێك لەوان وتی:** من چەندین ساڵە روو لەم ماڵە دەکەم نەمزانیوە ژن ئاو دەکات بە دەستماندا یان پیاو(چونکە سەرنجی ئەندامانی خێزانەکەی نەداوە و چاوی خۆی لە حورمەتی خاوەن ماڵ داخستووە).

**گوێم لە "منصور المغربی" بوو دەیوت:** یەکێك ویستی نوحی نیسابووری تاقیبکاتەوە، کەنیزەکێکی پێ فرۆشت پۆشاکی کوڕی پۆشی بوو، بە مەرجی گرت کوڕ بێت، کەسێکی روخسار رۆشن بوو، نوح لێی کڕی بەو مەرجەی کوڕ بێت، چەندین مانگ لای مایەوە، وترا بە کەنیزەکەکە: ئایا پێتی زانیوە تۆ کەنیزەکی؟ وتی: نەخێر، چونکە دەستی بۆ نەبردووم و وا دەزانێ من کوڕم.

**دەڵێن** پیاوێکی خاوەن پیشە گەنجێکی لەلا بوو، داوایان لێکرد بینێرێت بۆ سوڵتان، ئەویش رازی نەبوو، بۆیە هەزار قەمچیان لێدا، ئەو هەر سووربوو رەوانەی لای سوڵتانی نەکرد، وا رێکەوت خاوەن پیشەکە ئەو شەوە ئیحتیلام بووبوو، ئەو شەوەش سەرمایەکی کەم وێنە بوو، کە بەیانی لێ بوویەوە بە ئاوی سارد خۆی شۆری، پێی وترا: بۆچی رۆحی خۆتت خستە بەر مەترسی، لە وەڵامدا وتی: شەرمم کرد لە خودا لەسەر لێدانی هەزار قەمچی بۆ دروستکراوێك(مەبەستی گەنجەکەیە) ئارام بگرم، بەڵام بۆ خودا لەسەر ئازاری ئاوی سارد ئارام نەگرم.

دەستەیەك لە خەڵکی جوامێر چوون بۆ سەردانی پیاوێك بانگەشەی جوامێری دەکرد، پیاوەکان داوایان لە خزمەتکاری پیاوەکە کرد و پێیان وت: سفرەی نانخواردن رابخە، بەڵام خزمەتکارەکە پێشکەشی نەکرد، خاوەن ماڵەکە بۆ جاری دووەم و سێیەم داوای لێکردەوە..

پیاوەکـان تەماشـای یـەکتریان کـرد و وتیـان: ئەمـە جـوامێری نییـە کەسـێك خزمەتکارێك بۆ خزمەتی میوانەکانی بەکاربهێنێت کە لێی یـاخی دەبێـت و ئەوەنـدە سـفرەکە دوادەخـات.. پیاوەکـە بـە خزمەتکارەکـەی وت: بـۆ سـفرەکەت دواخسـت؟ خزمەتکارەکـە وتـی: مێرووڵـەی لەسـەر بـوو، ئـەدەبێکی جـوان نـەبوو سـفرەکە بـە مێرووڵەوە پێشکەش بە میوانەکان بکرێت، جوامێریش نەبوو مێرووڵەکان لە سـفرەکە دەربکەی، بۆیە چاوەڕێ بووم تا مێرووڵەکان دەڕۆن، بۆیە ماوەیەك خـۆم دواخسـت تـا مێرووڵەکان ڕۆیشتن، ئەوانیش پێیان وت: زۆر وردی ئەی گەنج، دەبێ نموونەی وەك تـۆ خزمەتی پیاوی جوامێر بکات.

**وتراوە:** پیاوێك لە حەجدا لە مەدینە خەوی لێکەوت و کە بەئاگا هـات وا گومـانی برد کیسی پارەکەیان بردووە، بۆیە ڕۆیشتە دەرەوە، لەوێ جەعفـەری صـادقی بـینی و خۆی پێدا هەڵواسی و پێی وت: کیسەی پارەکەیان بردووم؟ ئەویش پێی وت: چی تێدا بوو؟ وتی: هەزار دینار.

**جەعفەری صادق(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)** پیاوەکەی بردەوە بۆ ماڵـەوە و هـەزار دیناری پێدا، پیاوەکە گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و ڕۆیشتە ژوورەوە و بینی کیسەی پارەکەی لەوێیە و لێی تێکچووبوو و پێیوابوو دزراوە، بۆیە گەڕایەوە بـۆ لای ئیمـامی جەعفەر بە داوای لێبووردنەوە و پارەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش نەیویست وەریبگرێتەوە و فەرمووی: شتێك بوو لە دەستم دەرکردووە و وەریناگرمەوە.

پیاوەکە پرسی: ئەم پیاوە کێیە؟ وتیان: جەعفەری صادقە.

**وتـراوە:** شـەقیقی بـەڵخی پرسـیاری کـرد لـە جەعفـەری کـوڕی محەمـەد دەربـارەی جوامێری، ئەویش فەرمووی: تۆ چـی دەڵـێی؟ شـەقیق وتـی: گـەر پێمـان بـدەن شـوکر دەکەین و گەر لێمان بگرنەوە ئارام دەگرین.

**جەعفەر فەرمووی:** ئێمە گەر پێمان بدرێت دەیبەخشین و گەر لێمان بگرنەوە شوکر دەکەین.

**"الجريري" دەڵێت:** شێخ ئەبو عەباسی کوڕی مەسروق شەوێك دەعوەتی کردین بـۆ ماڵی خۆی، لە ڕێگە گەیشتین بە دۆستێکی خۆمان و پێمـان وت: لەگـەڵمان بگـەڕێوە ئێمە لە میوانداری شێخداین، ئەویش وتی: ئاخر شێخ منی بانگهێش نەکردووە.

وتمان ئێمە داوای مۆڵەتی لێ دەکەین، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی بۆ عائشە(خودا لێی رازی بێت) کرد.

لەگەڵ خۆمان گێڕامانەوە، کاتێك گەیشتینە دەرگای ماڵی شێخ هەواڵمان پێدا و مۆڵەتمان لێ داوا کرد، ئەویش وتی: مەبەستی خۆمم خستە دڵت تاکو بەبێ بانگهێش کردن بێی بۆ ئەم دەعوەتە منیش پێت بخەمە سەر چاوەکانم و لەسەر روخسارم تا ئەو جێگە بڕۆم تۆی لێ دادەنیشی، بۆیە زۆری لە میوانەکە کرد پێ بخاتە سەر چاوانی، ئەویش بە ناچاری و بە ئەسپایی پێیەکی لەسەر دانا، پاشان شێخ لەسەر روخساری خۆی تا ئەو شوێنە رۆیشت دۆستەکەی ئێمەی لێ دانیشت بوو.

بزانە بەشێك لە جوامێری ئەوەیە نەنگی دۆستانی خۆت داپۆشی، بەتایبەت گەر ئاشکراکردنی ئەو نەنگییە دڵخۆشی دوژمنانی تێدا بێت:

**گوێم لە شێخ "عبدالرحمن السلمي" بوو دەیوت بە نەصرابادی:** عەلی قەوال بە شەو دەخواتەوە و بە رۆژ لە دانیشتنەکانی تۆدا ئامادە دەبێت، بەڵام نەصرابادی گوێی بەو قسانە نەدەدا دەربارەی ئەو کەسە دەوترا، وا رێکەوت رۆژێك بە رێگەدا دەڕۆیشت یەکێکی لەگەڵ بوو ئەو قسانەی دەربارەی عەلی قەوال بە ئەو دەوت، نەصرابادی عەلی بینییەوە لە شوێنێك راکشابوو، کاریگەری سەرخۆشی پێوە دیار بوو، پیاوەکە وتی بە نەصرابادی: تا کەی ئێمە بە شێخ بڵێین عەلی بەم جۆرەیە و تۆ گوێمان بۆ ناگری؟

ئەوە عەلی بەو جۆرەی ئێمە بۆمان باس کردی بە چاوی خۆت بینیت، نەصرابادی تەماشایەکی کرد و وتی: بیکە کۆڵ و بیبەرەوە بۆ ماڵەوە، ئەویش هیچ رێگە چارەیەکی تری نەبوو جگە لەوەی بیکاتە کۆڵ و بیباتەوە بۆ ماڵەوە.

**"المرتعش" دەڵێت:** لەگەڵ ئەبو حەفص رۆیشتین بۆ سەردانی نەخۆشێك و دەستەیەکمان لەگەڵ بوو، ئەبو حەفص وتی بە نەخۆشەکە: حەز دەکەی چاك ببییەوە؟

وتی: بەڵێ، ئەویش وتی بە هاوەڵانی: بچنە ژێر نەخۆشییەکەی، نەخۆشەکە راستبوویەوە و لەگەڵمان هاتە دەرەوە و هەموو ئەوانەی لەگەڵ ئەبو حەفص بووین نەخۆشکەوتین و لەناو جێگەدا کەوتین.

## ٣٢

# فیراسەت

> **((هەر کەس چاوی لە حەرام بپارێزێت و نەفسی لە حەزەکان بگرێتەوە و ناوەوەی بە بەردەوامی چاوێری ئاوەدان بکاتەوە و دەرەوەی بە شوێنکەوتنی سوننەت برازێنێتەوە و خۆی لەسەر خواردنی حەلاڵ رابهێنێت فیراسەتی هەڵە**

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الحجر: ٧٥**، لەسەر مانای **"للمتوسمين وتراوە "**للمتفرسين-بۆ ئەوانەی فیراسەتیان هەیە"

**لە "أبي سعيد الخدري"وە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:** پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((خۆتان بپارێزن لە فیراسەتی باوەڕدار چونکە ئەو بە نووری خودا(ﷻ) تەماشا دەکات))[٥٠]

**فیراسەت:** ختوورەیەکە لە دڵەوە نەرێی دژەکەی دەکات، دەسەڵاتی بەسەر دڵدا هەیە، داتاشینی وشەکە لە زمانەوانیدا لە: **"فريسة السبع**-نێچیری دڕندە" وەرگیراوە، لە بەرانبەر فیراسەتدا ئەگەرەکانی نەفس بوونیان نییە.

**فیراسەت بەپێی هێزی باوەڕ:** هەر کەس باوەڕەکەی بەهێزتر بێت فیراسەتەکەی تیژتر دەبێت.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەفەرموێت:** هەر کەس بە نووری فیراسەت تەماشا بکات بە نووری حەق تەماشای کردووە، ئەو کات کەرەستەی زانستەکەی لە حەقەوەیە بەبێ هەڵە و بێئاگایی، بەڵکو حوکمێکی راستەقینەیە تا لەسەر زمانی بەندە گوزەر دەبێت.

---

[٥٠] {أخرجه البخاري في التأريخ والترمذي والطبراني في المعجم الكبير وابن عدي وابن جرير}.

**ئەو قسەی کە دەڵێت:** "بە نووری حەق تەماشای کردووە" واتە بە نوورێك کە خودا تایبەتی کردووە بە ئەو.

**"الواسطي" دەڵێت:** فیراسەت درەوشانەوەی نوورە و لە دڵدا پەخش دەبێتەوە، دامەزرانی مەعریفەیەکە نهێنییەکانی پەنهان هەڵدەگرێت لە پەنهانێکەوە بۆ پەنهانێکی تر، تا شتەکان بەو جۆرە دەبێنێ کە حەق(ﷻ) نیشانی دەدات، بۆیە قسە لە ناخی کەسەکان دەکات.

**لە ئەبی حەسەنی دەیلەمییەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** چووم بۆ ئەنتاکییە لە پێناوی بینینی "أسود"دا، پێم وترا: ئەو پیاوە قسە دەربارەی نهێنی ناخی کەسەکان دەکات، تیایدا مامەوە تا لە چیای"لکام" گەڕایەوە و شتێکی موباحی لەگەڵ خۆی هێنا بوو دەیفرۆشت، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بوو برسیم بوو، هیچم نەخوارد بوو، پێم وت: ئەمە بە چەند؟

وام نیشاندا ئەوەی پێیەتی لێی دەکڕم، وتی: دانیشە و پاشان دەیفرۆشین و شتێکت پێ دەدەم خواردنی پێ بکڕە و بیخۆ، وازم لەو هێنا و ڕۆیشتم بۆ لای کەسێکی تر، وام نیشان دا نرخ تاقیدەکەمەوە، پاشان گەڕامەوە بۆ لای و وتم: گەر دەیفرۆشی بە چەند؟ وتی: ئەوە دوو ڕۆژە برسیمە، دانیشە و پاشان کە فرۆشتمان شتێکت پێدەدەم خواردنی پێ بکڕە، منیش دانیشتم، کاتێك فرۆشتی شتێکی پێدام و ڕۆیشت، منیش شوێنی کەوتم، لای بە لامدا کردەوە و وتی: گەر پێویستییەکت هاتە پێش بیدە دەستی خودا، مەگەر بەشێکی نەفسی خۆتی تێدا بێت، لەو بارەدا پێویستییەکەت وەڵام نادرێتەوە.

**"الكتاني" دەڵێت:** فیراسەت بریتییە لە دەرکەوتنی یەقین و بینینی پەنهان، و یەکێکە لە مەقامەکانی باوەڕ.

**وتراوە:** ئیمامی شافیعی و **محەمەدی** کوڕی حەسەن لە حەرەم دانیشتبوون پیاوێك هاتە ژوورەوە، **محەمەدی** کوڕی حەسەن وتی: فیراسەتم پێیوایە ئەم پیاوە دارتاش بێت، ئیمامی شافیعی فەرمووی: فیراسەتم پێیوایە ئاسنگەر بێت، هەردوو پرسیاریان لێ کرد، وتی: پێشتر ئاسنگەر بووم، ئێستا دارتاشم.

**ئەبو سەعیدی خەراز لەسەر ئەم ئایەتە:** ﴿لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ﴾ **النساء: ٨٣ دەڵێت: "المستنبط"** کەسێکە سەرنجی پەنهان دەدات و لێی بزر نابێت و شتێکی لێ شاراوە نییە.

"المتوسم"یش ئەو کەسەیە "وسم-نیشانە" دەناسێتەوە، ئەوەش ئەو کەسەیە زانایە بە قوڵاییەکانی دڵان، **خودا**(ﷻ) **دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ٧٥﴾ **الحجر: ٧٥**، واتە "بۆ زانایان بە ئەو نیشانانەی کە خودا لەسەر دوو دەستەکە لە دۆستان و دوژمنانی دەریدەخات.

"المتفرس-نیشانەگر" بە نووری خودا تەماشا دەکات، ئەوەش درەوشانەوەی نوورێکە لە دڵیدا پەخش دەبێتەوە و بە هۆیەوە پەی بە ماناکان دەبات، ئەو نوورە تایبەتمەندی باوەڕە، ئەوانەی لە ئەهلی فیراسەت بەشیان زۆرترە بریتیین لە "ڕەبانییەکان"، خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ﴾ **آل عمران: ٧٩**، واتە: زانا و دانا و لەڕووی روانین و ڕەوشتەوە خۆتان بە ئەخلاقی حەق(ﷻ) ڕازاندبێتەوە، ئەوان خاڵیبوونەتەوە لەوەی هەواڵ دەربارەی خەڵکی بدەن و لێیان ورد ببنەوە و پێیانەوە خەریکبن.

**وتراوە: "أبو القاسم المنادي"** نەخۆش بوو، ئەو کەسێکی خاوەن شانوشکۆ بوو، یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی نیسابوور، **"أبو الحسن البوشنجی و الحسن الحداد"** سەردانیان کرد، لە ڕێگە سێوێکیان کڕی و بردیان بۆی، کاتێك دانیشتن **"أبو القاسم"** وتی: ئەم تاریکییە چییە؟

هەردوو چوونە دەرەوە و وتیان: چیمان بە خۆمان کرد؟

هەردوو بیریان کردەوە و وتیان: لەوانەیە نرخی سێوەکەمان نەدابێت، بۆیە ڕۆیشتن نرخی تەواوی سێوەیەکەیان دا و گەڕانەوە، کاتێك ئەبو قاسم ئەوانی بینی وتی: ئەمە جێگەی سەرسوڕمانە، ئایا مرۆڤ دەتوانێ بەم خێراییە لە تاریکی بێتە دەرەوە؟!

پێم بڵێن چیتان کردووە؟

ئەوانیش چیرۆکەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: بەڵێ، هەر یەکێك لەو دوانەتان شانی دادابوو لەسەر هاوەڵەکەی نرخی سێوەکە بدات، پیاوەکەش شەرمی کرد بە تەواوی

نرخەکەی لە ئێوە وەربگرێت، بۆیە وەك کۆڵێك بە گەردنتانەوە دەمایەوە و منیش هۆی ئەو کارە بووم، ئەوەم لە هەردووکتان بینی، ئەم **"أبو القاسم المنادي"**ە هەموو ڕۆژێـك دەچووە بازاڕ و بانگی خەڵکی دەکرد، گەر ئەو ڕۆژە شتێکی دەستبکەوتبایە کە بەشی بکات-کە لە دانقێکەوە تا نیو درهەمی دەویست- ئەوا لە بازاڕ دەردەچوو و دەگەڕایەوە بۆ سەر کاتی خۆی و چاودێری کردنی دڵی.

**حوسەینی کـوڕی مەنصـوور دەڵێـت:** کاتێـك حـەق زاڵ دەبێـت بەسـەر پەنهانـدا نهێنییەکان داگیری دەکات، دەیانبینێت و دەربارەیان هەواڵ دەدات .

**پرسیار کرا لە هەنـدێکیان دەربـارەی فیراسـەت وتـی:** ڕۆحـەکان لـە مەلـەکوت باڵەتەپێ دەکـەن و دەڕواننـە ماناکـانی پـەنهان، بـە موشـاهەدە نـەك بـە "گومـان و پێموایە" گوزارشت لە نهێنی دروستکراوەکان دەکەن.

**وتراوە:** دەڵێن بەر لە تەوبەکردنی لە نێوان زەکەریای شەختەنی و ئافرەتێکدا نێوانێك هەبوو، ڕۆژێك لەسەر ئەبو عوسمانی خەیری ڕاوەستاوەبوو-دوای ئەوەی بوو بە یـەکێك لە شاگردە تایبەتەکانی- بیری لە ئافرەتەکە کردەوە، ئـەبو عوسمـان سـەری هـەڵبڕی و پێی وت: تۆ شەرم ناکەی؟

**مامۆستای ئیمام(قوشەیری) (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** لە سەرەتای ژیانم لە خزمەتی مامۆستا ئەبو عەلی دەقاقدا(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بووم، دانیشتنێکی (ئەڵقەی دانیشتن) بۆ سازدام(بۆ ئـەوەی تیایـدا ئامۆژگـاری خـەڵکی بکـات)، جارێـك مۆڵەتم لێ وەرگرت بۆ چوون بۆ "نسا" ئەویش مۆڵەتیدام، ڕۆژێك لە ڕێگە لە خزمەتیدا دەچووم بۆ دانیشتنەکە، هات بە خەیاڵمدا خۆزگە ئەو ڕۆژانەی ئامـادە نـابم خـۆی لـە جێگەی من دادەنیشت، هەندێك ڕۆیشتم و هات بە خەیاڵمدا ئەو نەخۆشە و گران دەبێت لەسەری لە هەفتەیەکدا دوو ڕۆژ لە جێگەی من دابنیشێت، خۆزگە لە هەفتەیەکدا یەك ڕۆژی بۆ دادەنام، لای بە لامدا کردەوە و وتی: گەر نەتوانم لە هەفتەیەکدا دوو ڕۆژ لـە جێگەت دابنیشم ئەوا دەتوانم لە هەفتەیەکدا یەك ڕۆژ لە جێگەت دابنیشم، هەندێك لە خزمەتیدا ڕۆیشتم و شتی سێیەم هات بە خەیاڵمدا، لای بە لامدا کردەوە و هەواڵەکەی وەکو خۆی بۆ باس کردم.

**ئەبو عەمر بن تەجید دەڵێ:** شاهی کەرەمانی خاوەنی فیراسەتێکی تیژ بوو، هەڵەی نەدەکرد و دەیوت: **هەر** کەس چاوی لە حەرام بپارێزێت و نەفسی لە حەزەکان بگرێتەوە و ناوەوەی بە بەردەوامی چاوێری ئاوەدان بکاتەوە و دەرەوەی بە شوێنکەوتنی سوننەت برازێنێتەوە و خۆی لەسەر خواردنی حەڵاڵ رابهێنێت فیراسەتی هەڵە ناکات.

**پرسیار لە ئەبو حەسەنی نووری کرا: فیراسەتی خاوەن فیراسەتەکان لە کوێوە لەدایك دەبن؟**

وتی: لە ئایەتی:﴿وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ **الحجر: ٢٩** هەر کەس بەشی لەو نوورە گەورەتر و تەواوتر بێت ئەوا موشاهەدەکەی دامەزراوتر دەبێت و بڕیاردانی بە فیراسەت راستگۆترە، نابینی چۆن پێداکردنی فووی رۆح سوژدە بردنی بۆ ئادەم پێویست کرد بە ئایەتی:﴿ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٢٩ ﴾ **الحجر: ٢٩**

ئەم قسەیە لە ئەبی حەسەنی نوورییەوە کەمێك تەمومژ و ناڕوونی تێدایە، باسی فووکردنی رۆح دەکات بۆ راستکردنەوەی ئەوانەی قسە دەکەن لە دێرینی رۆح، ئەوە بەو جۆرە نییە دڵی کەسە لاوازەکان بیری لێدەکەنەوە، چونکە ئەو شتەی قابیلی فووپێداکردن و پەیوەستبوون و جیابوونەوە بێت قابیلی کاریگەری و گۆڕانە، ئەوانەش لە خەسڵەتەکانی رووداون(نەك دێرینبوون)، خودا باوەڕدارانی تایبەت کردووە بە بەصیرەت و نوورێك بە هۆیەوە فیراسەت دەکەن، لە راستیدا ئەوانە مەعریفەن و فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((ئەو(باوەڕدار) بە نووری خودا تەماشا دەکات)) هەڵدەدرێتە سەر ئەمە، واتە بە زانست و بەصیرەتێك کە خودا ئەوی پێ تایبەت دەکات و لە هاوشێوەکانی خۆی جیایدەکاتەوە، ناونانی زانستەکان و رۆشنبینییەکان بە "ئەنوار" شتێکی داهێنراو نییە و وەسفی ئەوە بە فوو(نفخ) بەدوور نازانرێت و مەبەستەکەی ئەبو حەسەن بەو فووە بوونێکە کە دروستکراوە.

**حوسەینی کوڕی مەنصوور دەڵێ:** کەسی فیراسەتدار ئەو کەسەیە لە یەکەمین هەڵدانیدا مەبەستەکە دەپێکێت و لانادات بە لای تەئویل و گومان و پێموایەدا.

**وتراوە:** فیراسەتی باوەڕداران گومانێکە هاتنەدی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەڵام فیراسەتی عاریفان هاتنەدییەکە راستەقینە پێویست دەکات.

**"أحمد بن عاصم الأنطاكي" دەڵێت:** گەر لەگەڵ ئەهلی صدقدا دانیشتن بە صدق لەگەڵیان دانیشن، چونکە ئەوان نهێنگری دڵانن، دەچنە ناو دڵتانەوە و شتی لێ دەردەهێنن بەبێ ئەوەی بە خۆتان بزانن.

**ئەبو جەعفەری حەداد دەڵێت:** فیراسەت یەکەمین خوتوورەیە بەبێ بەرهەڵستکار، گەر بەرهەڵستکارێك لە هاوشێوەی خۆی بەرهەڵستی کرد ئەوە دەبێتە خوتوورە و قسەی دەروون.

**لە ئەبی عەبدولای رازییەوە(میوانەکەی نیسابوور) دەگێڕنەوە وتوویەتی:** ئیبن ئەنباری خورییەکی لەبەر کردم، لەسەر سەری شیبلی مێزەرەیەکی جوانم بینی کە زۆر شایستەی ئەو خورییە بوو، لە ناخەوە ئاواتم خواست هەردووکیان بۆ من بێت، کاتێك شیبلی لە دانیشتنەکەی هەستا لای بە لامدا کردەوە.. منیش شوێنی کەوتم، عادەتی وابوو گەر بویستبایە شوێنی بکەوم لای بە لامدا دەکردەوە، کاتێك رۆیشتە ناو ماڵەکەی منیش لەگەڵی چوومە ژوورەوە، وتی: خورییەکە لەبەرت دابکەنە، منیش خورییەکەم لەبەر کردەوە، لولی کرد و مێزەرەکەی لەسەر دانا و ئاگری داواکرد و هەردووکیانی سوتاند.

**ئەبو حەفصی نیسابووری دەڵێت:** کەس بۆی نییە بانگەشەی فیراسەت بکات، بەڵام با لە فیراسەتی کەسانی تر خۆی بپارێزێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((خۆتان لە فیراسەتی باوەڕدار بپارێزن))، نەیفەرمووە: فیراسەت بکەن، ئیتر چۆن بانگەشەی فیراسەت دروستە لە کاتێکدا ئەو لە فیراسەتی کەسانی تر خۆی دەپارێزێت؟!.

**ئەبو عەباسی کوڕی مەسرووق دەڵێت:** چووین بۆ سەردانی یەکێك لە هاوەڵانمان کە نەخۆش بوو، بینیم حاڵی زۆر جێگەی بەزەییە، لە دڵی خۆمدا وتم: دەبێ رۆزی ئەم شێخە لە کوێوە بێت؟ ئەویش پێی وتم: ئەی ئەبو عەباس ئەو خوتوورە نزم و پەستانە وازلێبهێنە، چونکە خودا کۆمەڵێك لوتفی شاراوەی هەیە.

**لە "زوبیدی"یەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە بەغداد لەگەڵ دەستەیەك لە هەژاران لە مزگەوتێك بووین، چەندین رۆژ بوو دەرگایەکمان لێ نەکرابوویەوە(واتە خواردنمان

نەخوارد بوو) هاتم بۆ لای "خەواص" بۆ ئەوەی شتێکی لێ داوا بکەم، کاتێک چاوی پێمکەوت وتی: ئەو پێویستییەی تۆی هێناوە بۆ لای من خودا دەیزانێت یان نایزانێت؟ وتم: دەیزانێت، وتی: دەی بێدەنگ بە و بۆ هیچ دروستکراوێك باسی مەکە، گەڕامەوە بۆ مزگەوتەکە و زۆری نەبرد خودا زیاد لە پێویستی ئێمە بۆی ڕەوانە کردین.

**وتراوە:** ڕۆژێك سەهلی کوڕی عەبدوڵا لە مزگەوت بوو، کۆترێك کەوتە ناو مزگەوتەکە بەهۆی زۆری گەرما و ماندووبوونەوە، سەهل وتی: شاهی کەرەمانی ئەم لەم ساتەدا مردووە، گەر خودا(ﷻ) بیەوێت، ئەوانیش ڕۆژ و بەروار و کاتەکەیان دیاری کرد، هەر بەو جۆرە بوو لەو کاتەدا کۆچی دوایی کرد بوو.

**وتراوە:** ئەبو عەبدولای ترۆغەندی-کە کەسێکی بەساڵاچوو بوو- ڕۆیشت بۆ شاری "**طوس**"، کاتێك گەیشتە "خر" وتی: بە هاوەڵەکەی نان بکڕە، ئەویش ئەوەندەی پێویستی هەردووکیان بێت نانی کڕی، وتی: زیاتر لەوە بکڕە، هاوەڵەکەی بەئەنقەست بەشی دە کەس نانی کڕی، وەك ئەوەی نەیەوێت قسەی ئەو پیاوە سێبارە و چواربارە ببێتەوە، دەڵێ: کاتێك سەرکەوتین بەسەر چیاکەدا کۆمەڵێکمان بینی دز کۆتوبەندی کردبوون، ماوەیەکی زۆر بوو هیچیان نەخوارد بوو، داوای خواردنیان لێ کردین، ئەبو عەبدولا وتی: خوانێکیان پێشکەش بکە.

**مامۆستای ئیمام(قوشەیری) دەڵێت:** ڕۆژێك لە خزمەتی مامۆستای ئیمام ئەبو عەلی دەقاقدا بووم(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)، قسە دەربارەی شێخ ئەبو عبدالرحمانی سولەمی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) کرا: وترا لەکاتی گوێگرتن لە ئاواز هەڵدەستێ و وەك تەباییەك لەگەڵ هەژاران دەسوڕێتەوە، مامۆستا ئەبو عەلی وتی: کەسی وەك ئەو لە حاڵی خۆیدایە، لەوانەیە سکون(نەبزوان) بۆ ئەو لەپێشتر بێت، پاشان لە هەمان دانیشتندا وتی: بچۆ بۆ لای ئەو ئێستا لە ژووری کتێبەکانیدایە، لەسەر کتێبەکانی کتێبێکی بەرگ سووری چوارگۆشەی بچووکی داناوە کە شیعرەکانی حوسەینی کوڕی مەنصووری تێدایە، ئەو کتێبە لە بەردەمی هەڵبگرە و هیچی پێ مەڵێ و بیهێنە بۆ من، ئەو کاتە نیوەڕۆ بوو.. منیش ڕۆیشتم بۆ لای بینیم لە ژووری کتێبەکانیدایە و کتێبەکە لەو شوێنە بوو کە ئەو باسی کرد، کە دانیشتم "أبو عبدالرحمن" دەستی بە

قسەکردن کرد و وتی: یەکێك لە زانایان جوولّە و بزوانیان(سوڕانەوە) لە کاتی بیستنی ئاوازدا لە سۆفییەکان بەباش نەدەزانی، ڕۆژێك ئەو کەسە لە ماڵێکی چۆڵدا بینرا دەسوڕایەوە وەك لە حاڵەتی وەجددا بێت، پرسیاری لێکرا دەربارەی حاڵەکەی وتی: بابەتێك لەلام ئاڵۆز و تەمومژاوی بوو ئێستا ماناکەیم بۆ ڕۆشن بوویەوە، بۆیە لە خۆشیدا خۆم نەگرت و هەستامە سەرپێی و دەستم بە خولانەوە کرد، پێی وترا: حاڵی ئەوانیش بەم جۆرەیە کە تۆ بەسەرت هاتووە.

کاتێك ئەوەی ئەبو عەلی پێمی وتبوو بە چاوی خۆم بینیم و وەسفەکە بەو جۆرە بوو ئەو وتبووی و ئەو قسانەشم لەسەر زمانی شێخ "عبدالرحمن" بیست سەرسام بووم، وتم: چی بکەم لە نێوان ئەم دوانەدا؟

پاشان لە دڵی خۆمدا بیرم کردەوە و وتم: هیچ چارەیەك نییە جگە لە صدق بۆیە وتم: مامۆستا ئەبو عەلی ئەو کتێبەی بۆ وەسف کردم و پێی وتم لەگەڵ خۆم هەڵیبگرم و بۆی ببەم بەبێ ئەوەی مۆڵەت لە تۆ وەربگرم، بەڵام ئەوەتە من دەترسم لێت و ناشمەوێت سەرپێچی لە ئەبو عەلی بکەم، ئێستا تۆ فەرمانت چییە؟ هۆنراوەیەکی شەش دێڕی کە خۆی کتێبێکی لەسەر دانابوو و ناوی نابوو(**الصهیور في نقض الدهور**) دەرهێنا و وتی: ئەمە ببە بۆی و پێی بڵێ: من خەریکی خوێندنەوەی ئەو کتێبەم و هەندێ دێڕە هۆنراوەی لێ دەردەهێنم بۆ ناو نووسینەکانی خۆم.. منیش گەڕامەوە.

لە حەسەنی حەداوە دەگێڕنەوە: لەلای ئەبو قاسمی مونادی بووم و دەستەیەك لە هەژاران لە خزمەتی دانیشتبوون، پێی وتم: تۆ بڕۆ شتێك بۆ ئەم هەژارانە بهێنە، منیش دڵخۆش بووم بەوەی مۆڵەتی پێدام شتێك بۆ ئەو هەژارانە بهێنم لە کاتێکدا هەژاری من دەزانێت، دەڵێت: زەمبیلەیەکم بە دەستەوە گرت و ڕۆیشتم.. کاتێك هاتم بۆ گەڕەکی "سیار" پیاوێکی جوانخاسی پێکەوتووم بینی و سەلامم لێکرد و وتم: دەستەیە لە هەژاران لە جێگەیەکن ئایا دەتوانی چاکەیەکیان لەگەڵ بکەی و شتێکیان بۆ ڕەوانە بکەی؟ ئەویش فەرمانی کرد بە هێنانی خواردن.. تەنانەت نان و گۆشت و ترێی تێدا بوو، کاتێك گەڕامەوە بۆ بەردەرگا لە پشتی دەرگاکەوە ئەبو قاسم بانگی کرد، بیگێڕەوە بۆ ئەو شوێنەی لێت هێناوە، منیش گێڕامەوە و داوای لێبووردنم لە

پیاوەکە کرد و وتم: نەمبینینەوە و وام نیشاندا بڵاوەیان لێ کردبێت، هەموو شتەکانم بۆ گێڕایەوە و پاشان هاتم بۆ بازاڕ و دەرگایەکم لێکرایەوە و لەگەڵ خۆم هەڵمگرت کە گەیشتمە بەر دەرگاکە وتی: ئێستا وەرە ژوورەوە.

**منیش چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی:** بەڵێ، ئەوە "ئیبن سەیار" بوو ئەو پیاوی سوڵتانە، گەر شتت بۆ هەژاران هێنا نموونەی ئەمەیان بۆ بهێنە نەك نموونەی ئەوە.

**ئەبو حوسەینی قەرافی دەڵێت:** سەردانی "ئەبو خەیری تیناتی"م کرد، کاتێك خواحافیزیم لێکرد تا دەرگای مزگەوتەکە لەگەڵم هات و پێی وتم: ئەی ئەبا حوسەین، من دەزانم تۆ هیچ شتێکت لەگەڵ خۆت هەڵنەگرتووە، بەڵام ئەم دوو سێوە لەگەڵ خۆت هەڵبگرە، منیش لێم وەرگرت و خواردم، پاشان ویستم بەگەڕبکەوم، بینیم هەردووکیان لە گیرفانمدان، بەو جۆرە بەردەوام لێم دەخواردن و دەهاتنەوە تا گەیشتمە دەروازەی موسڵ لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم دوو سێوە حاڵی تەوەکولم دەشێوێنن، چونکە بوون بە کۆمەککارێکی ئاشکرام، بۆیە هەردووکیانم لە گیرفانم دەرکرد، تەماشام کرد هەژارێك خۆی لە عەباکەیەوە پێچاوە و دەڵێت: حەزم لە سێوە..

منیش هەردوو سێوەکەم پێدا، کاتێك پەڕیمەوە(دیارە روباری دیجلە بە ناو شاری موسڵدا دەڕوات) شتێك کەوتە ناو دڵمەوە و بە خۆمم وت: دەبوا ئەو دوو سێوەم بەو پیاوە بفرۆشتبایە کە لەو رێگەیە لەگەڵم بوو، بۆیە گەڕامەوە بۆ لای هەژارەکە بەڵام نەمبینییەوە.

**ئەبو عەمری کوڕی عەلوان دەڵێت:** گەنجێك هاوەڵی جونەیدی دەکرد و قسەی دەکرد لەسەر خوتوورەکانی ناخی خەڵکی، ئەوەی بۆ جونەید باس کرد، جونەید پێی وت: ئەوە چییە دەربارەی تۆ دەیڵێن؟ وتی بە جونەید: شتێك بخە دڵتەوە، ئەویش وتی: ئەوە خستمە دڵمەوە، گەنجەکە وتی: ئەوە و ئەوەت لە دڵدایە؟ جونەید وتی: نەخێر، وتی: بۆ جاری دووەم شتێك بخە دڵتەوە، وتی: ئەوا خستمە دڵمەوە، گەنجەکە وتی: ئەوەت لە دڵدایە، جونەید وتی: نەخێر، وتی: بۆ جاری سێیەم بیخە دڵتەوە، هەر بەو جۆرە جونەید وتی: نەخێر، گەنجەکە وتی: ئەمە جێی سەرسوڕمانە، تۆ کەسێکی زۆر

راستگۆی، منیش دڵی خۆم دەناسم؟! جونەید وتی: لە یەکەم و دووەم و سێیەم راستت کرد، بەڵام ویستم تاقیتبکەمەوە بزانم گۆڕان دێت بەسەر دڵی تۆدا.

**ئەبو عەبدوڵای رازی دەڵێت:** "ابن الرقی" نەخۆشکەوت، دەرمانیان لە کوپێکدا بۆ برد، ئەویش وەریگرت و پاشان وتی: ئەمڕۆ لە مەملەکەتدا رووداوێك روویداوە، ناخۆم و ناخۆمەوە تا نەزانم چی روویداوە، چەند رۆژێك دوای ئەوە هەواڵ هات **"القرمطي"** لەو رۆژەدا چووەتە ناو مەککەوە و ئەو رەشەکوژییە گەورەیەی تێدا ئەنجامداوە.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** "ابن الکاتب" ئەو بەسەرهاتەی گێڕایەوە و وتی: ئەمە جێگەی سەرسوڕمانە.. منیش پێم وت: جێگەی سەرسوڕمان نییە، **"أبو علي بن الکاتب"**(بۆ تاقیکردنەوەی من) پێی وتم: هەواڵی ئەمڕۆی مەککە چییە؟ وتم: ئەوەیە کە تەلحییەکان و بەنو حەسەن دژ بەیەکتر لە جەنگدان، پێشەنگی تەلحییەکان کەسێکی رەشە مێزەرەیەکی سووری بەستووە، ئەمڕۆ لەسەر مەککە هەورێك هەیە بە ئەندازەی حەرەم، ئەبو عەلی کاتب هەموو ئەوانەی نووسی و رەوانەی مەکەی کرد و هەمووی بەو جۆرە بوو کە باسکرا.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) ریوایەت کراوە فەرمووی:** چووم بۆ لای عوسمانی کوڕی عەفان(خودا لێی رازی بێت) لە رێگە ئافرەتێکم بینی و سەرنجی جوانییەکەیم دا، عوسمان(خودا لێی رازی بێت) پێی فەرمووم: هەندێ کەس دێت بۆ لای ئێمە ئاساری زینا لە دوو چاوانیدا دیارە، وتم: ئەمە وەحییە لە دوای پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو بەصیرەت و بورهان و فیراسەتی راستگۆیە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** چوومە ناو "المسجد الحرام"ەوە، هەژارێکم بینی دوو خەرقەی لەبەردا بوو و داوای شتی لە خەڵکی دەکرد، لە نەفسی خۆمدا وتم: نموونەی ئەمانەیە بوون بە مشەخۆر بەسەر خەڵکییەوە، ئەویش تەماشایەکی کردم و وتی: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ﴾البقرة: ٢٣٥

دەڵێت: لە ناخەوە داوای لێخۆشبوونم لە خودا کرد، بانگی لێکردم و وتی:﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ﴾ الشوری: ٢٥

**له ئیبراهیمی خەواصەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** له شاری بەغداد له **"جامع المدینة"** بووم، دەستەیه له هەژاران لەوێ بوون، گەنجێکی جوانخاسی بۆن خۆشی پرچ جوانی روو شیرین رووی لێ کردین، وتم به هاوەڵەکانم: وای دەبینم ئەم گەنجه یەهودی بێت، هەموویان قسەکەیان لا ناخۆش بوو، منیش رۆیشتمه دەرەوە و گەنجەکەش هاته دەرەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ لایان و پرسی: ئەو پیاوە دەربارەی من چی به ئێوە وت؟

ئەوانیش پێیان باش نەبوو بوو بیڵێن، بەڵام زۆری لێکردبوون، بۆیه وتبوویان: ئەو پیاوە وتی تۆ یەهودیت، ئیبراهیم دەڵێ: گەنجەکه هات بۆ لام و خۆی خست بەسەر دەست و سەرمدا و موسڵمان بوو، پێی وترا: هۆیەکەی چی بوو؟

وتی: له کتێبەکانماندا هاتووە کەسی صدیق له فیراسەتیدا هەڵه ناکات، منیش وتم: موسڵمانان تاقیدەکەمەوە، بۆیه بیرم کردەوە و وتم: گەر صدیقیان تێدا بێت لەناو ئەم دەستەیەدایه(واته ئەهلی تەصەوف)، چونکه له خوداوە(ﷻ) قسه دەکەن، بۆیه جلوبەرگی ئێوەم لەبەر کرد، کاتێك ئەو پیاوە تەماشای کردم و فیراسەتی تێدا بەکارهێنام زانیم ئەو صدیقه، لەو کاتەوە گەنجەکه بوو به یەکێك له صۆفییه مەزنەکان.

**محەمەدی کوڕی داود دەڵێت:** لەلای **"الجریري"** بووین، وتی: ئایا لەناو ئێوەدا کەسێك هەیه گەر خودا(ﷻ) بیەوێت له مەملەکەتی خۆیدا شتێك رووبدات بەر له روودانی ئاگاداری بکاتەوە؟ وتمان: نەخێر، فەرمووی: کەوابوو بگرین بەسەر دڵانێکدا هیچیان له خوداوە(ﷻ) وەرنەگرتووە.

**ئەبو موسای دەیلەمی دەڵێت:** پرسیارم له "عبدالرحمن بن یحیی" کرد دەربارەی تەوەکول وتی: گەر دەستت بخەیه ناو دەمی ئەژدهایەك و هەتا ئەنیشکت ببات به دەمدا ئەوا لەگەڵ خودا له هیچ شتێکی تر ناترسی، هەروەها ئەبو موسا دەڵێت: رۆیشتم بۆ لای ئەبو یەزید پرسیاری تەوەکولی لێ بکەم، تەقەم دا له دەرگای ماڵەکەی، ئەویش وتی: ئایا قسەکانی "أبو عبدالرحمن" بۆ تۆ بەس نییه؟ وتم: دەرگاکه بکەرەوە، وتی: بۆ سەردانم نەهاتووی، تۆ له پشتی دەرگاکەوە وەڵامی خۆت وەرگرت، بۆیه دەرگای لێ نەکردمەوە، رۆیشتم و ساڵێکم پێچوو، پاشان گەڕامەوە بۆ لای، ئەمجارە وتی: مەرحەبا، بۆ سەردانم هاتووی، بۆیه مانگێك لەلای بووم، شتێك به

دڵمدا بهاتبایه بۆی باس دەکردم، له کاتی خواحافیزی لێی وتم: سودێکم پێ بگەیەنە، وتی: دایکم بۆی باس کردم، کاتی خۆی بە من سکی پڕ بووه، کاتێك خواردنی حەڵاڵیان پێشکەش دەکرد دەستی بۆ خواردنەکە درێژ دەبوو، کاتێك خواردنەکە شوبهەی تێدا بوایە دەستی گرژ دەبوو و دەکشایەوە.

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** رووم له دەشت و سارا کرد، تەنگەلانییەکی زۆر رووی لێکردم، کاتێك گەیشتمە مەککە، هەندێ له خۆپەسەندی رووی له نەفسم کرد، بۆیە پیرەژنێك بانگی لێکردم و وتی: ئەی ئیبراهیم، من له دەشت و سارا لەگەڵت بووم و قسەم لەگەڵ نەکردی، چونکە نەمویست پەنهانت بە خۆمەوە خەریك بکەم، ئەو وەسوەسەیە له خۆت دەربکە.

**دەگێڕنەوە "فەرەغانی" هەموو ساڵێك دەچوو بۆ حەج و بە نیسابووردا گوزەری دەکرد** و نەدەچووە لای ئەبو عوسمانی حیری، دەڵێت: جارێك چوومە لای و سەلامم لێ کرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە، له نەفسی خۆمدا وتم: موسڵمانێك دەچێت بۆ لای و سەلامی لێ دەکات و وەڵامی ناداتەوە؟!

ئەبو عوسمان وتی: نموونەی ئەمە حەج دەکات و دایکی بەجێدەهێڵێت و گەردنی خۆی پێ ئازاد ناکات! دەڵێت: گەڕامەوە بۆ فەرغانە(شوێنەکەی خۆی) و لە خزمەتی دایکمدا بووم هەتا مرد، پاشان هاتم بۆ لای ئەبو عوسمان، کاتێك چوومە خزمەتی پێشوازی لێ کردم و داینیشاندم، پاشان فەرەغانی پەیوەست بوو بە ئەبو عوسمانەوە و داوای لێکرد خزمەتکردنی وڵاخەکەی بە ئەو بسپێرێت، ئەویش ئەو کارەی پێڕاسپارد تا ئەبو عوسمان کۆچی دوایی کرد.

**"خیر النساج" دەڵێت:** لە ماڵەوە دانیشتبووم، کەوتە دڵمەوە جونەید لەبەردەرگایە، چوومە دەرەوە بینیم جونەید لەوێ بوو، پێی وتم: بۆ لەگەڵ خوتوورەی یەکەم نەهاتییە دەرەوە؟!

**"محمد بن الحسين البسطامي" دەڵێت:** چووم بۆ لای ئەبو عوسمانی مەغریبی و لە دڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە حەزی له شتێك بێت و بە من بڵێت، ئەبو عوسمان وتی:

هەندێ کەس بەوەندە کۆڵ نادەن شتێکیان لێ وەردەگرم، دەگەڕێنەوە و دەیانەوێت خۆم شتیان لێ داوا بکەم!

**یەکێك لە هەژاران دەڵێن:** لە بەغداد بووم، کەوتە دڵمەوە **"المرتعش"** پازدە درهەمم بۆ دەهێنێت، بۆ ئەوەی سەتڵێك و حەبلێك و جووتێك نەعلی پێ بکڕم و روو لە دەشت و سارا بکەم، دەڵێت: تەقە لە دەرگا درا، منیش دەرگام کردەوە، بینیم "مورتەعیش"ە، کیسەیەکی دایە دەستم و وتی: بیگرە، وتم: گەورەم نامەوێت، وتی: ئەی بۆ ئازارمان دەدەی؟

تۆ چەندت ویست؟

وتم: پازدە درهەم؟

وتی: ئەوە پازدە درهەمە.

**لەسەر ئەم ئایەتە:**﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ﴾ **الأنعام: ١٢٢ وتراوە:** "میتا" واتە زەینی مردبێت و خودا(ﷻ) بە نووری فیراسەت زیندووی کردبێتەوە و نووری جیلوەکردن و موشاهەدەی پێبەخشی بێت، وەك ئەو کەسە نییە بەناو ئەهلی بێئاگاییدا دەڕوات.

**وتراوە:** گەر فیراسەت دروست بوو خاوەنەکەی بەرەو موشاهەدە بەرز دەبێتەوە.

**ئەبو عەباسی کوڕی مەسرووق دەڵێت:** پیاوێك هات بۆ لامان، دەربارەی سۆفییەکان و دەربارەی فیراسەت قسەی زۆر جوان و باشی لەلا بوو، مرۆڤێکی زمان شیرین بوو، مانای باش و جوانی لەلا بوو، لە هەندێ لە قسەکانیدا وتی: هەر شتێك لە خوتوورە دەکەوێتە دڵتانەوە بیکەن بە قسە بۆ من، کەوتە دڵمەوە ئەو کەسە یەهودییە، خوتوورەی دڵم لەو بارەیە بەهێز دەبوو و نەدەسڕایەوە، ئەوەم بۆ **"الجريري"** باس کرد، ئەو قسەیەی لەلا گەورە بوو، وتم: هەر دەبێ ئەو هەواڵە بدەم بەو پیاوە، پێم وت: تۆ بە ئێمەت وت هەر شتێك کەوتە دڵتانەوە بە من بڵێن، من دڵم دەڵێت: تۆ یەهودیت.. بۆ ساتێك سەری داخست و پاشان سەری هەڵبڕی و وتی: تۆ راست دەکەی، **"أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا رسول الله"** پاشان وتی: هەموو مەزهەبەکانم

تاقیکردەوە و بە خۆمم دەوت: گەر لەگەڵ موسڵماناندا راستییەك بوونی هەبێت دەبێت لەلای ئەم دەستەیە بێت، بۆیە هاتمە ناوتان تاکو تاقیتان بکەمەوە، ئێوە لەسەر حەقن، لەدوای ئەوە بوو خاوەنی ئیسلامێکی باش و جوان.

**دەگێڕنەوە "السري" داوای لە جونەید کرد قسە بۆ خەڵکی بکات، جونەید دەڵێ:** لە دڵمدا ترس و شەرمێك هەبوو لە قسەکردن بۆ خەڵکی، چونکە نەفسی خۆم پێویستی بە ئامۆژگاری کردن بوو، بۆیە خۆم بە شایستە نەدەبینی، شەوی جومعە پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە خەوندا بینی و پێی فەرمووم: قسە بۆ خەڵکی بکە، بەئاگا هاتم.. چووم بۆ بەر دەرگای ماڵی **"السري"** بەر لە نوێژی بەیانی، تەقەم دا لە دەرگا، وتی: باوەڕت بە ئێمە نەکرد تا پێت وترا ؟!

بۆ سبەینێ لە مزگەوت دانیشتم بۆ ئامۆژگاری کردنی خەڵکی، هەواڵەکە لەناو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە جونەید دانیشتووە و دەیەوێت قسە بۆ خەڵکی بکات، گەنجێکی نەصرانی جلوبەرگی موسڵمانی لەبەر کرد بوو لە دانیشتنەکەی جونەید هەستایە سەر پێ و وتی: ئەی شێخ، مانای ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) چییە کە دەفەرموێت: ((خۆت لە فیراسەتی باوەڕدار بپارێزە، چونکە ئەو بە نووری خودا تەماشا دەکات))؟

جونەید ماوەیەك سەریداخست و پاشان سەری هەڵبڕی و وتی: موسڵمان ببە، ئێستا کاتی موسڵمانبوونی تۆ هاتووە، بۆیە گەنجەکە موسڵمان بوو.

## ٣٣

# ئەخلاق

**((پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ئێوە بە ماڵ و سامانتان گوشادی ناخەنە دڵی خەڵکییەوە، بەڵکو بە رووی خۆش و ئەخلاقی جوانتان گوشادی دەخەنە دڵیانەوە))**

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ٤**

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: ((وترا: ئەی پێغەمبەری خودا:** کام باوەڕدار ئیمانەکەی باشترینە؟ فەرمووی: ئەوەیان ئەخلاقی باشترینە))[٥١].

ڕەوشتی جوان باشترین سەروەری و سەرمایەی بەندەیە، جەوهەری پیاوان بە ئەخلاقدا دەردەکەوێت، مرۆڤ جەستەی داپۆشراوە و ئەخلاقی بینراوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** خودا(ﷻ) پێغەمبەرەکەی تایبەت کردووە بەوەی پێی تایبەت کردووە، پاشان بە ئەندازەی ئەخلاق سەنای هیچ کام لەو خەسڵەتانەی نەکردووە، **خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ٤**

**"الواسطي" دەڵێت:** خودا(ﷻ) پێغەمبەری بە ئەخلاقی مەزن وەسف کردووە، چونکە لە دونیا و دوارۆژدا مەزنترین کرداره،، بۆیە خودا(ﷻ) تەنها ئاماژەی بەوە داوە.

---

[٥١] {أخرجه البخاري في صحيحه}.

**هەروەها"الواسطي" دەڵێت:** ئەخلاقی مەزن ئەوەیە نە نەیاری کەس بکەیت نە نەیاری بکرێیت، ئەوەش لە توندی و زۆری مەعریفەی ئەوەوە بە خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ).

**حوسەینی کوڕی مەنصوور دەڵێت:** مانای ئەو ئایەتە ئەوەیە: ئەی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆ جەفای مەردوومان-لە دوای روانینت بە رووی حەقدا- کاری تێنەکردی..

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** ماناکەی: هیچ خەم و پەژارەیەکت نییە جگە لە خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ).

**"الكتاني" دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە ئەخلاق، هەر کەس ئەخلاقی لە تۆ زیاتر بوو تەصەوفی لە تۆ زیاترە.

**لە ئیبن عومەرەوە(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) دەگێڕنەوە وتویەتی:** گەر لە منت بیست بە بەندەیەك بڵێم: خودا شەرمەزارت بکات ئەوا ئێوە بە شایەت بن ئەو بەندەیە لەلای منەوە ئازاد کراوە.

**فوزەیل دەڵێت:** گەر بەندەیەك هەموو چاکەی تەواو کرد و ئەنجامی دا، بەڵام مریشکێکی هەبوو مامەڵەی لەگەڵی خراپ بوو ئەوا ئەو کەسە ناچێتە ریزی چاکەکارانەوە.

**وتراوە:** ئیبن عومەر کاتێك بەندەیەکی خۆی ببینیبایە جوان نوێژەکانی ئەنجام دەدا ئازادی دەکرد، ئەو رەوشتە لە ئیبن عومەر ئاشکرا بوو، بۆیە هەندێ بەندە بۆ خۆ ئازاد کردن ریای بۆ ئیبن عومەر دەکرد لە نوێژەکەیدا و خۆی رزگار دەکرد، لەو بارەیەوە راستییەکە بە ئیبن عومەر وترا، ئەویش فەرمووی: هەر کەس لە پێناوی خودادا دەمانخەڵەتێنێت خۆمانی بۆ دەخەڵەتێنین.

**حارسی موحاسیبی دەڵێت: سێ شتمان بزر کرد:** روخساری کراوە لەگەڵ خۆپارێزی، و قسەی جوان و باش لەگەڵ ئەمانەت، و برایەتی باش لەگەڵ وەفا.

**عەبدوڵای کوڕی محەمەدی رازی دەڵێت:** ئەخلاق بە کەم تەماشاکردنی ئەوەیە لە تۆوە بۆ ئەو(ئەوەی تۆ بە ئەوی دەبەخشی بە کەم تەماشای بکەی) و بە مەزن تەماشاکردنی ئەوەیە لە ئەوەوە بۆ تۆ(ئەوەی ئەو بە تۆی دەبەخشێ بەمەزن تەماشای بکەی).

**به ئەحنەف وترا:** ئەخلاق لە کێوە فێر بوویت؟

وتی: لە قەیسی کوڕی عاصمی مونقەریەوە، وترا: ئەخلاقی تا کوێ گەیشتبوو؟ وتی: جارێکیان لە ماڵەوە دانیشتبوو کەنیزەکەکەی لەسەر ئاسنی سوورەوە بوو گۆشتی برژاوی بۆ هێنا، ئاسنەکە لە دەستی بەربوویەوە و کەوت بەسەر یەکێك لە کوڕەکانیدا و مرد، کەنیزەکەکە تووشی ترس و شڵەژان بوو، ئەویش پێی وت: هیچ مەترسە تۆ لە پێناوی خودادا(سبحانه وتعالى) ئازادکراوی.

**شاهی کەرەمانی دەڵێت:** نیشانەی ئەخلاقی جوان گرتنەوەی ئازارە لە خەڵکی و شاندانە ژێر کۆڵی مەینەتییەکانیانە.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ئێوە بە ماڵ و سامانتان گوشادی ناخەنە دڵی خەڵکییەوە، بەڵکو بە رووی خۆش و ئەخلاقی جوانتان گوشادی دەخەنە دڵیانەوە))

**به "ذو النون" وترا:** کێ لە هەموو کەس خەم و پەژارەی زۆرترە؟ وتی: ئەوەیان رەوشتی لە هەموویان خراپترە.

**وەهب دەڵێ:** هەر کەس چل رۆژ خۆی بە ئەخلاقێك برازێنێتەوە ئەو ئەخلاقە دەبێت بە سروشتی.

**حەسەنی بەصری دەربارەی ئایەتی:**﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾﴾ **المدثر: ٤ دەڵێت:** واتە ئەخلاقت چاك و باش بکە.

**هەروەها وتراوە:** یەکێك لە ناسیکان کاوڕێکی هەبوو لەسەر سێ قاچ دەڕۆیشت، پرسی: کێ وای کردووە لەم گیاندارە؟ خزمەتکارێکی بەندە وتی: من، پرسی: بۆچی؟ وتی: بۆ ئەوەی بەو کارە خەم و پەژارەت بۆ دروست بکەم، ئەویش وتی: نەخێر، بەو کارە خەمی تۆ لا دەدەم، بڕۆ تۆ ئازادی.

**بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وترا:** هەرگیز لە دونیادا دڵخۆش بوویت؟ وتی: بەڵێ، دوو جار، یەکەمیان: رۆژێك دانیشتبووم لە ناکاو پیاوێك میزی کرد بە سەرمدا، دووەمیان دانیشتبووم پیاوێك هات و زلەیەکی لێدام.

**وتراوە:** گەر منداڵان ئوەیسی قەرەنییان ببینیبایە بەردبارانیان دەکرد، ئەویش دەیوت: ئەگەر بڕیارە بەردبارانم بکەن بەردی بچووکم تێبگرن بۆ ئەوەی لاقەکانم نەشکێ و نەتوانم نوێژەکانم بکەم.

**پیاوێك** جنێوی بە ئەحنەفی کوڕی قەیس دا و شوێنی کەوت و لێی نەدەبوویەوە.. کاتێك لە گەڕەکەکەی خۆی نزیکبوویەوە ئەحنەف وەستا و وتی: ئەی لاو گەر جنێوی ترت ماوە لێرە پێمی بڵێ بۆ ئەوەی هەندێ نەزانی گەڕەکەکە نەیبیستن و وەڵامت بدەنەوە.

**لە "حاتم الأصم" پرسیارکرا:** ئایا مرۆڤ لە هەموو کەس قبوولّ دەکات؟ وتی: بەڵێ، تەنها لە نەفسی خۆی قبووڵی ناکات.

**دەگێڕنەوە ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالب**(خودا لێی رازی بێت) خزمەتکارێکی بانگ کرد وەڵامی نەدایەوە، دووەم جار و سێیەم جار بانگی کرد دیسان وەڵامی نەدایەوە، هەستا و چوو بۆ لای، بینی راکشاوە، پێی وت: گوێت لێ نەبوو بانگم کردی؟

وتی: با، پرسی: ئەی بۆ وەڵامت نەدامەوە؟ وتی: دڵنیابووم سزام نادەی بۆیە تەمبەڵیم نواند، ئەویش پێی فەرموو: بڕۆ تۆ لە پێناوی خودادا(سبحانه وتعالى) ئازادی.

**وتراوە:** شێخ مەعرووفی کەرخی دابەزی بۆ ناو ئاوی دیجلە تاکو دەستنوێژ هەڵبگرێت، بۆیە قورئانەکەی و دەسماڵەکەی لە قەراغ رووبارەکەدا دانا، ژنێك هات و هەردووکیانی برد، شێخ مەعرووف شوێنی کەوت و پێی وت: خوشکی من، من مەعرووفم هیچت لەسەر نییە، ئایا کوڕێکت هەیە قورئان بخوێنێتەوە؟ وتی: نەخێر، ئەی مێردەکەت؟

وتی: نەخێر، وتی: کەوابوو قورئانەکەم بۆ بگێڕەوە و پۆشاکەکە ببە.

**جارێك** دز لە گەڕەکی "المكابرة" دای بەسەر ماڵی "أبو عبدالرحمن السلمي"دا و هەرچی تێدا بوو بردیان، گوێم لە هەندێ لە هاوەڵانمان بوو دەیانوت: گوێمان لە شێخ "عبدالرحمن" بوو دەیوت: بە بازاڕدا تێپەڕیم، جبەکەی خۆمم بینی خرابوویە مەزاتەوە، بەڵام پشتمهەڵکرد و لام نەکردەوە بە لایاندا.

**"الجريري" دەڵێت:** لە مەککە گەڕامەوە و سەردانەکانم لە جونەیدەوە دەست پێکرد تاکو ئەو ماندوو نەبێت و بێت بۆ لای من، سەلامم لێکرد و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك لە مزگەوت نوێژی بەیانیم کرد بینیم لە ریزی نوێژەکەمدا لەدواوە وەستاوە، پێم وت: بۆیە دوێنێ من هاتم بۆ لات تۆ زەحمەت نەکێشی، ئەویش وتی: ئەوە فەزڵ و چاکەی تۆ بوو، ئەمەش مافی خۆتە.

**پرسیار لە ئەبو حەفص کرا دەربارەی ئەخلاق: فەرمووی:** بریتییە لەوەی خودا(سُبحانه وتعالى) بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هەڵبژاردووە لە ئایەتی: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ۝١٩٩ ﴾ الأعراف: ١٩٩

**وتراوە:** ئەخلاق ئەوەیە لە خەڵکەوە نزیك بیت و لەناویاندا غەریب بیت.

**هەروەها وتراوە:** ئەخلاق قبوولکردنی ئەو جەفایە لە خەڵکەوە بە رووی تۆدا دەدرێت و جێبەجێ کردنی حەق بەبێ بێزاری و سکاڵا و نیگەرانی.

**هەروەها وتراوە:** ئەبو زەڕ لەسەر حەوزێ ئاو بوو حوشترێکی خۆی ئاو دەدا، چەند کەسێك بەپەلە هاتن بۆ لای، حەوزەکە شکا، ئەویش دانیشت و پاشان لەسەر شان پاڵکەوت، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، فەرمووی: پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) فەرمانی پێکردووین گەر کەسێك تووڕە بوو با دابنیشێت، گەر تووڕەییەکەی نەڕۆیشت با پاڵبکەوێت.

**وتراوە:** لە ئینجیلدا نووسراوە: بەندەکەم، ئەو کاتەی تووڕە دەبیت یادم بکە، ئەو کاتەی تووڕە دەبم یادت دەکەم.

**ژنێك بە مالیکی کوڕی دیناری وت:** ئەی ریاباز.. ئەویش لە وەڵامیدا وتی: خاتوون ناوی راستەقینەی خۆم لە دەمی تۆ دۆزییەوە، ئەو ناوەی ئەهلی بەصرە نایزانن و لێیان بزر بووە.

**لوقمان بە کوڕەکەی وت: سێ شت لە پەنای سێ شتدا دەناسرێن:** کەسی حەلیم لەباری تووڕەبووندا، کەسی ئازا لە کاتی جەنگدا، و برایەك لە کاتی پێویستیت پێی.

**موسا**(عليه السلام) **دەفەرموێت:** خودایە، داوات لێدەکەم شتێك نەوترێت کە لە مندا نییە، خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ نارد و پێی فەرموو: من ئەوەم بۆ خۆم نەکردووە ئیتر چۆن بۆ تۆی دەکەم؟!

**یەحیای کوڕی زیاد** خزمەتکارێکی خراپی هەبوو، بە یەحیا وترا: بۆ ئەم خزمەتکارە رادەگری؟ وتی: بۆ ئەوەی حیلمی لێوە فێربم.

**دەربارەی ئایەتی:**﴿وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗ﴾ **لقمان: ٢٠ وتراوە: "الظاهرة"** بریتییە لە راستوەستانی ئەخلاق و **"الباطنة"**ش بریتییە لە پاڵفتەبوونی ئەخلاق.

**فوزەیل دەڵێت:** گەر کەسێکی فاجیری مامەڵە جوان و باش هاوەڵیم بکات لام خۆشترە لە هاوەڵی کردنی عابیدێکی مامەڵە خراپ.

**وتراوە:** رەوشتی باش بریتییە لە شاندانە ژێر ناخۆشییەکان بە هەڵکردنێکی باش.

**دەگێڕنەوە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم** رووی لە هەندێك دەشت و سارا کرد، لەوێ سەربازێك بەرەو رووی هات و پرسی: ئاوەدانی لە کوێیە؟

ئیبراهیم ئاماژەی بۆ قەبرستانێك کرد، سەربازەکەش دەستی بە لێدانی ئیبراهیم کرد و سەری شکاند، بە سەربازەکە وترا: ئەوە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمە، یەکێکە لە زاهیدان و خەڵکی خۆراسانە، بۆیە سەربازەکە هات بۆ لای و داوای لێبوردنی لێکرد، ئیبراهیم وتی: تۆ کاتێك لە منت دەدا من داوای بەهەشتم لە خودا(سبحانه وتعالى) بۆ دەکردی، سەربازەکە پرسی: بۆ؟

وتی: زانیم لەسەر ئەو لێدانە پاداشت دەدرێمەوە، بۆیە نەمویست بەشی من لە تۆدا خێر بێت و بەشی تۆ لە مندا شەڕ بێت.

**دەگێڕنەوە کەسێك ئەبو عوسمانی حیری بانگ کرد** بۆ میوانداریيەك، کاتێك گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی وتی: مامۆستا ئێستا کاتی چوونە ژوورەوەت نییە، من پەشیمان بوومەوە، بۆیە لێرە مەوەستە و بڕۆ، ئەبو عوسمان گەڕایەوە، کاتێك گەیشتە ماڵەوە پیاوەکە هاتەوە بۆ لای و وتی: مامۆستا پەشیمان بوومەوە.. هەندێ پاساو و بیانووی بۆ هێنایەوە و داوای لێبوردنی لێکرد، پێی وت: ئێستا بفەرموو با بڕۆین،

ئەبو عوسمان هەستا و لەگەڵی ڕۆیشت، کاتێك گەیشتنە بەر دەرگای ماڵەکەی هەروەك یەکەم جار هەمان شتی پێ وتەوە، هەر بەو جۆرە بۆ جاری سێیەم و چوارەم ئەبو عوسمان دەڕۆیشت و دەهاتەوە، دوای ئەو چەند جارە پیاوەکە وتی: مامۆستا من تەنها ویستم تۆ تاقیبکەمەوە، بۆیە پیاوەکە دەستی بە مەدح و سەنای ئەبو عوسمان کرد، ئەبو عوسمانیش پێی وت: لەسەر ڕەوشتێك مەدحم مەکە هەمان ڕەوشت لە سەگدا هەیە، سەگ کاتێك بانگی دەکەی ئامادە دەبێت کاتێکیش چغەی لێ دەکەی و دەمکوتی دەکەی دەمکوت دەبێت.

**وتراوە:** لە کاتی گەرمای نیوەڕۆدا ئەبو عوسمان بە گەڕەکێکدا تێپەڕی، لە سەربانێکەوە تەشتێ خۆڵەمێش(ژیلەمۆ)یان کرد بە سەریدا، هاوەڵانی ئەبو عوسمان بێزاربوون و دەستیان کرد بە قسە پێوتنی کەسەکە، بەڵام ئەبو عوسمان وتی: هیچ مەڵێن، کەسێك شایستە بێت ئاگر بکرێت بە سەریدا و بە خۆڵەمێش سوڵحی لەگەڵ کرابێت دروست نییە تووڕە ببێت.

**هەروەها وتراوە:** یەکێك لە هەژاران بوو بە میوانی **"جعفر بن حنظلة"**، جەعفەر زۆر بە جوانی خزمەتی دەکرد، هەژارەکەش دەیوت: تۆ پیاوێکی زۆر باشی گەر یەهودی نەبوویتایە.. جەعفەر وتی: بە هۆی ئەوەی لە خزمەت کردنت باش نیم تانە لە بیروباوەڕم مەدە، داوای شیفا بۆ خۆت و هیدایەت بۆ من بکە.

**هەروەها وتراوە: "عبدالله الخیاط"** ناحەزێکی مەجووسی هەبوو، عەبدوڵا جل و پۆشاکی بۆ دەدووری و ئەویش درهەمی ساختەکراوی پێ دەدا، عەبدوڵاش لێی وەردەگرت.. ڕۆژێك وا ڕێکەوت عەبدوڵا لە دوکانەکەی دەرچوو بوو، پیاوەکە هات و درهەمە ساختەکانی دا بە شاگردەکەی عەبدوڵا، بەڵام ئەو لێی وەرنەگرت، بۆیە درهەمی ڕاستەقینەی پێدا، کاتێك عەبدوڵا گەڕایەوە وتی بە شاگردەکەی: کراسی مەجووسییەکە لە کوێیە؟

ئەویش چیرۆکەکەی بۆ باس کرد، عەبدوڵا بە شاگردەکەی وت: کارێکی خراپت کرد، ئەوە ماوەیەکە بەو جۆرە مامەڵەی من دەکات و منیش ئارام دەگرم لەسەری و درهەمەکان هەڵدەدەمە بیری ئاوەوە تاکو کەسێکی تری پێ فریو نەدرێت.

**وتراوە:** ڕەوشتی خراپ دڵی خاوەنەکەی تەسك دەکاتەوە، چونکە تەنها مەرامی خۆی تیا جێدەبێتەوە، هەروەك چۆن شوێنێکی بەرتەسك تەنها یەك کەسی تێدا جێدەبێتەوە.

**وتراوە:** ڕەوشتی باش ئەوەیە بەرانبەر ئەو کەسەی لە ریزی نوێژدا لە تەنیشتتەوە دەوەستێت گۆڕانت بەسەردا نەیەت.

**هەروەها وتراوە:** لە ڕەوشت خراپیت ئەوەیە چاوت بکەوێتە سەر ڕەوشتی خراپی کەسانی تر.

**دەربارەی شوومی پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا، فەرمووی:** ((ڕەوشتی خراپ))[٥٢].

**لە ئەبو هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:((وترا ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)** دوعا لە هاوەڵدانەران بکە، ئەویش فەرمووی: من وەك ڕەحمەت ڕەوانەکراوم، بە سزاوە ڕەوانە نەکراوم))[٥٣].

۞ ۞ ۞

[٥٢] {أخرجه أحمد في مسنده والطبراني في المعجم الأوسط، وأبو نعيم في الحلية و الدار القطني}.

[٥٣] {أخرجه البخاري في التأريخ}.

٣٤

# بەخشین و سەخاوەت

**((چوار شت نابێت کەسی مەزن خۆی لێ لابدات با ئەمیریش بێت: هەستانە سەرپێ لەبەر باوکی.. خزمەتکردنی میوانەکانی.. خزمەتکردنی بۆ زانایەك لێیەوە فێربووبێت.. پرسیارکردن دەربارەی شتێك كە نایزانێت))**

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾الحشر: ٩**

**لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((کەسی سەخی لە خوداوە نزیکە، لە خەڵکەوە نزیکە، لە بەهەشتەوە نزیکە، لە دۆزەخەوە دوورە، کەسی بەخیلیش لە خوداوە(سبحانه وتعالى) دوورە، لە خەڵکەوە دوورە، لە بەهەشتەوە دوورە، لە دۆزەخەوە نزیکە، کەسێکی نەزانی سەخی لەلای خودا لە عابیدێکی بەخیل خۆشەویستترە))

**مامۆستا(قوشەیری) دەڵێت:** لە نێوان بەخشین و سەخاوەت لەسەر زمانی ئەم دەستەیە جیاوازییەك بوونی نییە، خودا بە سەخاوەت و سنگفراوانی وەسف ناکرێت، چونکە لە قورئان و فەرموودەدا نەهاتوون.

راستەقینەی بەخشندەیی ئەوەیە بەخشینی لەلا گران نەبێت.

**لای ئەم دەستەیە سەخاوەت:** پلەی یەکەمە و پاشان بەخشندەیی بەدوایدا دێت، و ئەوجا ئیسار(پێشخستنی کەسی بەرانبەر بە پێویستییەکان بەسەر خۆتدا)، هەر کەس هەندێکی بەخشی و هەندێکی هێڵایەوە ئەوە خاوەنی سەخاوەتە، هەر کەس زۆرینەی بەخشی و کەمێکی بۆ خۆی هێڵایەوە ئەوە کەسێکی بەخشندەیە، هەر کەسیش شانی دایە ژێر زیان و کەسانی تری پێشخست بەسەر خۆیدا ئەوە خاوەنی ئیسارە.

**هەر بەو جۆرە گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت: "أسماء بنت خارجة"** دەڵێت: حەز ناکەم داوای هیچ کەسێك رەد بکەمەوە بۆ پێویستییەك کە رووم لێ دەکات، چونکە گەر کەسێکی بەخشندە بێت حورمەت و ناموسی دەپارێزم، گەر کەسێکی بەدکاریش بێت حورمەت و ناموسی خۆمی لێ دەپارێزم.

**وتراوە: "مورق العجلي"** کەسێکی بە لوتف و بەخشندە بوو، بۆ ئەوەی خۆشی بخاتە دڵی براکانییەوە، هەزار درهەمی لەلایان دادەنا، دەیوت لەلای خۆتان هەڵیبگرن تا دەگەڕێمەوە بۆ لاتان، پاشان هەواڵی بۆ دەناردن گەردنتان لەو پارەیە ئازاد بێت خەرجی بکەن بۆ خۆتان.

**وتراوە:** پیاوێکی خەڵکی **"منبج"** گەیشت بە پیاوێکی خەڵکی مەدینە، پێی وت: تۆ خەڵکی کوێیت؟

وتی: خەڵکی مەدینەم، وتی: پیاوێك لە ئێوە ناوی **"الحكم بن عبدالمطلب"** بوو هات بۆ لای ئێمە و هەموومانی دەوڵەمەند کرد، پیاوە مەدینەییەکە وتی: چۆن؟

ئەو تەنها جوبەیەکی خوری لەبەردا بوو، پیاوەکە وتی: بەماڵ دەوڵەمەندی نەکردین، بەڵکو بە بەخشندەیی دەوڵەمەندی کردین، هەندێکمان بە هەندێکمان بەخشی تا هەمووومان بێنیاز بووین.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** کاتێك غولام خەلیل لەلای خەلیفە ویستی بۆ سۆفییەکان تێچێنێت، خەلیفە بڕیاریدا لە گەردنی سۆفییەکان بدرێت، جونەید لە فیقهدا وەك باڵندەی باز وابوو، لەسەر مەزهەبی **"أبي ثور"** فتوای دەدا بۆیە دەستیان بۆ نەبرد، بەڵام **"الشحام و الرقام و النوري"** و دەستەیەك لەگەڵ ئەواندا گیران، بۆ گەردن پەڕاندنیان ئامادەکاری کرا، **"النوري"** بەر لە هەموویان رۆیشتە بەرەوە، جەلادەکە پێی وت: دەزانی بۆ چ شتێك پێشکەوتووی؟

وتی: بەڵێ، پرسی: بۆچی پەلەی مردنتە؟ وتی: پێمخۆش بوو ساتێك لە تەمەن بە هاوەڵەکانم ببەخشم.

جەلادەکە سەریسورِما، هەواڵەکەیان بۆ لای خەلیفە بەرزکردەوە، ئەویش رەوانەی لای قازی کردنەوە بۆ ئەوەی دووبارە لێیان وردببێتەوە، قازییەکە چەند بابەتێکی فیقهی لە ئەبو حوسەینی نووری پرسی هەمووی وەڵامدایەوە، پاشان وتی: خودا کۆمەڵێك بەندەی هەیە کاتێك راستدەبنەوە بە خوداوە راستدەبنەوە، کاتێك قسە دەکەن لە خوداوە قسە دەکەن، بەو جۆرە کۆمەڵێك قسەی کرد و قازی دەستی بە گریان کرد، بۆیە قازی هەواڵی نارد بۆ خەلیفە و پێی وت: گەر ئەمانە زەندیق بن ئەوا لەسەر زەوی موسڵمانێك بوونی نییە.

**وتراوە:** عەلی کوڕی فوزەیلی کوڕی عەیاز لەلای فرۆشیارەکانی گەڕەك شتی دەکڕی، پێی وترا: گەر بچی بۆ بازاڕ هەرزانتر شت دەکڕی، ئەویش وتی: ئەوانە لە نزیك ئێمەوە کەسابەت دەکەن هیوایان وایە ئێمە سوودێکیان پێ بگەیەنین.

**وتراوە:** پیاوێك کەنیزەکێکی نارد بۆ جەبلەی کوڕی سەحیم، ئەو لەو کاتەدا لەناو هاوەڵانی خۆیدا بوو، بۆیە وتی: ناشیرینە بۆ خۆمی هەڵبگرم و ئێوە ئامادە بن، پێشمخۆش نییە یەکێکتان لەوانیتر جیابکەمەوە، هەمووتان ماف و حورمەتتان هەیە، ئەم کەنیزەکەش دابەش ناکرێت، چونکە ئێوە هەشتا کەسن، بۆیە فەرمانی کرد بۆ هەریەکەیان کەنیزەکێك یان خزمەتکارێك ئامادە بکرێت.

**وتراوە:** رۆژێك **"عبدالله بن أبي بكرة"** لە رێگە تینووی بوو، لە ماڵێك داوای ئاوی لە ئافرەتێك کرد، ئەویش لە پشتی دەرگاوە گۆزەیەك ئاوی بۆ خستە دەرەوە و وتی: لە دەرگاکە خۆت بەدوور بگرە و با منداڵێك وەریبگرێت، من ئافرەتێکی عەرەبم چەند رۆژە خزمەتکارەکەم مردووە، عەبدوڵا ئاوەکەی خواردەوە و وتی: بە خزمەتکارەکەی دە هەزار درهەمی بەدیاری بۆ ببە، ئافرەتەکە وتی: سبحان الله! گاڵتەم پێ دەکەی؟ عەبدوڵا وتی: بیست هەزار درهەمی بۆ ببە؟

ئافرەتەکە وتی: داوای عافییەت لە خودا دەکەم، عەبدوڵا وتی: ئەی گەنج سی هەزار درهەمی بۆ ببە، ژنەکە دەرگاکەی لێ داخستن و وتی: ئۆف لەدەستی تۆ، عەبدوڵا سی هەزار درهەمی بە خزمەتکارەکەیدا بۆ نارد، هەر ئەو ئێوارەیە داواکارێکی زۆر بەسەر ماڵەکەیدا باری.

**وتراوە:** بەخشندەیی وەڵامدانەوەی خوتوورەی یەکەمی ناو دڵە.

گـوێم لـە هـاوەڵێکی ئـەبو حەسـەنی بۆشنچـی بـوو دەیـوت: ئـەبو حەسـەنی بۆشنچی(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر پێشاو بوو، قوتابییەکی خۆی بانگ کرد و وتی: ئەم کراسەی بەرم دابکەنە و بیدە بە فـلان کـەس، پێیـان وت: بـا لـە پێشـاوەکە تەواوبوویتایە ئەوجا کراسەکەت دابکەندبایە؟!

لە وەڵامیاندا وتی: دڵنیانەبووم لە خۆم و ترسام لـە دوای ئـەم کاتـە گـۆڕان بەسـەر خایلەکەمدا بێت.

**وترا بە قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە:** ئایا هـیچ کەسـێکت بینیـوە لـە تـۆ سەخاوەتی زیاتر بێت؟

وتی: بەڵێ، لە دەشت و سارا بووین بە میوانی ئافرەتێك، مێردەکەی ئامادە کـرد و پێی وت: ئەوە دوو میوان هاتوونەتە ماڵەکـەت، ئـەویش حوشـترێکی گـەنجی هێنـا و سـەریبڕی و فـەرمووی چـۆنتان پێخۆشـە بفـەرموون، کاتێـك بـەیانیمان لـێ بوویـەوە دانەیەکی تری هێنـا و سـەریبڕی و وتـی: چـۆنتان پێخۆشـە بفـەرموون، وتمـان: تـەنها کەمێکمان لەوەی دوێنێ خواردووە بۆ ئەمەت سەربڕی؟

ئەویش وتی: مـن گۆشتی دوێنێ دەرخواردی میوانەکانم نادەم، دوو تـا سـێ ڕۆژ لەلای ماینەوە-چونکە باران دەباری- ئەو هەموو ڕۆژێك حوشـترێکی سـەردەبڕی، کاتێك ڕۆیشتین سەد دینارمان لـە ماڵەکەیـدا بـۆ دانـا، وتمـان بـە ژنەکـەی داوای لێبووردنی لێ بکە لە ئێمەوە.. ڕۆیشتین، کاتی چێشتەنگاو گوێمان لە پیاوێك بوو لە دواوە بانگی لـێ دەکـردین و دەیـوت: بوەسـتن ئـەی قافڵـەی بـەدکاران، نرخـی میواندارییەکەم پێدەدەن.. پاشان پێمانگەیشت و وتی: ئەو پارەیە بگرن ئەگینا بەم ڕمەم هەردووکتان بریندار دەکەم، ئێمەش لێمان وەرگرت و پیاوەکە گەڕایەوە و ئەم دێڕە **هۆنراوەی وت:**

**وإذا أخذت ثواب ما أعطيته فكفى بذاك لنائل تكديرا**

(گەر لەسەر ئەوەی دەیبەخشم پاداشت وەربگرم ئەوە بەسە بۆ لێڵی ڕەوشتی کەسی جوامێر)

**گوێم لە شێخ"أبو عبدالرحمن السلمي" بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئەبو عەبدوڵای ڕۆزباری ڕۆیشتە ماڵی یەکێك لە هاوەڵانی، بینی لە ماڵەوە نییە و دەرگای ماڵەکەش قوفڵدراوە، سۆفییەك پێی وت: دەرگای ماڵەکە قوفڵ دراوە، وتی: قوفڵەکە بشکێنن، ئەوانیش قوفڵەکەیان شکاند، پاشان فەرمانی کرد هەرچی لە ماڵەکەدایە کۆی بکەنەوە و بیبەن لە بازاڕ بیفرۆشن، ئەوانیش هەموویان کۆکردەوە و بردیان بۆ بازاڕ و فرۆشتیان و هەندێ پێویستی خۆیان بە پارەکە کڕی، و لە ماڵەکە لێی دانیشتن، خاوەن ماڵەکە گەڕایەوە و هیچی نەوت، ژنەکەی دوای ئەو هاتە ژوورەوە کە پۆشاکێکی جوانی پۆشی بوو، ڕۆیشت لە شوێنێك لەبەری خۆی کردەوە و دای بە هاوەڵانمان و وتی: ئەمەش هەر لەو شتانەیە دەبێت بفرۆشرێت بۆیە بچن بیفرۆشن، پیاوەکەی پێی وت: بۆ بە ویستی خۆت ئەو کارەت ئەنجامدا؟

ژنەکە وتی: بێدەنگ بە، چۆن دەبێ شتێك لە نموونەی ئەم شێخە-کە ڕوومان پێدەدات و ڕێگەمان نیشان دەدات- لابخەین.

**بیشری حافی دەڵێت:** سەیرکردنی کەسی بەخیل دڵت ڕەق دەکات.

**وتراوە:** قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش کەوت و براکانی(هاوەڵانی) لە سەردانی دواکەوتن، ئەویش پرسی بۆ نەهاتوون، پێی وترا: ئەوان شەرم دەکەن، چونکە زۆربەیان قەرزاری تۆن، قەیس وتی: خودا ماڵێك شەرمەزار بکات ڕێگری دەکات لە براکان سەردانی یەکتر بکەن، پاشان فەرمانی کرد یەکێك جاڕبدات بە ناویاندا هەر کەس قەرزی قەیسی لەسەرە گەردنی ئازاد کردووە، کە گەیشتنە ئێوارە ئەوەندە خەڵك هات بۆ سەردانی دەرگای حەوشەکەی بەربوویەوە.

**بە عەبدوڵای کوڕی جەعفەر وترا:** تۆ گەر داوات لێ بکرێت زۆر دەبەخشی و کاتێك داوا دەکەی زۆر کەم وەردەگری؟ وتی: من ماڵەکەم دەبەخشم و ئەقڵم دەپارێزم.

**وتراوە:** عەبدوڵای کوڕی جەعفەر ڕۆیشت بۆ سەر هەندێ زەوی و زاری، چووە ناو باخێکی خورما کە گەنجێکی ڕەشپێستی تێدا بوو کاری تێدا دەکرد، کاتێك گەنجەکە خواردنی بۆ هات سەگێك لە دیواری باخەکە نزیك بوویەوە ئەویش هەندێ لە

خواردنەکەی خۆی پێدا و سەگەکە خواردی، پاشان بەشێکی تری خواردنەکەی پێدا، ئەوجا بەشی سێیەمی پێدا و سەگەکە خواردی، عەبدوڵای کوڕی جەعفەر وەستابوو تەماشای دەکرد، بە گەنجەکەی وت: ئەی گەنج خۆراکی تۆ لە شەو و ڕۆژێکدا چەندە؟ وتی: ئەوەی بینیت، عەبدوڵا وتی: ئەی بۆ سەگەکەت لە خۆت پێشخست؟

وتی: ئەم ناوە سەگی لێ نییە، ئەو سەگە لە شوێنێکی دوورەوە هاتبوو پێمخۆش نەبوو بە برسێتی بیگێڕمەوە، پرسی: ئەی بۆ ئەمڕۆ تۆ چی دەکەی؟

وتی: ئەمڕۆم دەپێچمەوە، عەبدوڵا وتی: ئایا لەسەر سەخاوەت لۆمەم دەکرێت؟

ئەم گەنجە لە من سەخاوەتی زۆرترە، بۆیە هەستا بە کڕینی باخەکە و گەنجە بەندەکە و هەموو ئەو ئامێرانەی تێیدا بوو، بەخشی بە گەنجەکە.

**وتراوە:** پیاوێك هات بۆ سەردانی هاوڕێیەکی و تەقەی دا لە دەرگاکەیان، کاتێك خاوەن ماڵ هاتە دەرەوە پرسی: بۆ هاتووی بۆ لام؟

وتی: بۆ چوارسەد درهەم قەرز لەسەرم کۆبووەتەوە، فەرمووی لێکرد بۆ ژوورەوە و چوارسەد درهەمی بۆ ژمارد و پێیدا، ئەو ڕۆیشت و خاوەن ماڵ بە گریانەوە هاتە ژوورەوە، ژنەکەی-وای دەزانی بۆ پارەکە دەگری بۆیە- پێی وت: با بیانوویەکت دروستبکردبایە و پارەکەت پێ نەدابایە، ئەویش وتی: بۆ ئەوە دەگریم پێشتر حاڵی ئەم برای خۆم نەزانی تا ناچاربوو خۆی بێت و ئاتاجییەکەی باس بکات.

**"مطرف بن شخیر" دەڵێت:** هەر کەس لە ئێوە پێویستییەکی هەیە با لە کاغەزێکدا بۆم بنووسێت، چونکە پێم ناخۆشە زەلیلی پێویستی لەڕووی براکەمدا ببینم.

**وتراوە:** پیاوێك ویستی زیان بە عەبدوڵای کوڕی عەباس(خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت) بگەیەنێت، هات بۆ لای گەورە پیاوانی شار و پێی وتن: عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێت: ئەم نیوەڕۆیە دەعوەتی منن و لەلای ئێمە ژەمی نیوەڕۆ دەخۆن، ئەوانیش هەموو هاتن بۆ ماڵی عەبدوڵا، ماڵەکە پڕ بوو، پرسی: چی ڕوویداوە؟ ئەوانیش

هەواڵەکەیان پێدا، هەر لەو کاتەدا فەرمانی کرد میوە و خواردن ئامادە بکەن، دەعوەتێکی باشی بۆ ئامادە کردن، کاتێك لە خواردن تەواو بوون، وتی بە بریکارەکانی(خزمەتکارەکان) ئایا دەتوانرێت ئەمە هەموو رۆژێك ئامادە بکرێت؟ وتیان: بەڵێ، وتی: با لەمەودوا هەموو رۆژێك ئەمانە لەلای ئێمە ژەمی نیوەڕۆ بخۆن.

**گوێم لە مامۆستا "عبدالرحمن السلمي" بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** مامۆستا **"أبو سهل الصعلوكي"** رۆژێك لە حەوشەی ماڵەکەیدا دەستنوێژی دەگرت، کەسێك هاتە ژورەوە و داوای شتێکی دونیایی لێکرد، هیچی نەبوو پێی بدات، وتی: بوەستە تا دەستنوێژەکەم تەواو دەکەم، کە تەواو بوو وتی: ئەو مەسینە حەوجۆشە ببە و بڕۆ، ئەویش هەڵیگرت و رۆیشت، پاشان ئەبو سەهل راوەستا تا زانی کەسەکە دوورکەوتووەتەوە، هاواری کرد: کەسێك هاتە ژوورەوە و مەسینە حەوجۆشەکەی برد، ئەوانیش بە دوایدا رۆیشتن، بەڵام نەیانبینییەوە. بۆیە ئەوەی کرد چونکە خانەوادەکەی لەسەر زۆری بەخشین لۆمەیان دەکرد.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** مامۆستا ئەبو سەهل لە زستاندا جبەکەی بەری بەخشی بە کەسێك، بۆیە جبەی ژنانەی لەبەر دەکرد کاتێك دەچووە دەرەوە بۆ وانە وتنەوە، چونکە هەر ئەو جبەی هەبوو کە بەخشی، وەفدێکی ناسراو لە فارس هاتن بۆ لای کە هەموو جۆرێك لە خەڵکی تێدا بوو: ئیمام لە فەقیهان و ئەهلی کەلام و نەحوزان و هتد.. سەرۆکی سوپا(ئەبو حەسەن) ناردی بەدوای ئەبو سەهلدا و فەرمانی پێکرد سواری ئەسپێك ببێت بۆ پێشوازی کردنیان، ئەویش دورعێکی لەسەر جبە ژنانەکەوە لەبەرکرد و سواری ئەسپێك بوو، سەرۆکی سوپا وتی: ئەم کابرایە لەبەردەم ئەم گشتە خەڵکەدا بەم جبە ژنانەوە من رسوا دەکات.. بەڵام دواتر مونازەرەی لەگەڵ هەموویان کرد و قسەکانی ئەو لە هەموو ئەو زانستانەدا بەسەر قسەی هەمواندا سەرکەوت.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** مامۆستا ئەبو سەهل بە دەستی خۆی شتی نەدەبەخشی بە هیچ کەسێك، لە زەوی دایدەنا بۆ ئەوەی کەسەکە خۆی لە زەوی هەڵیبگرێت، بۆیە دەیوت: دونیا بچووکترە لەوەی لە پێناویدا دەستم لەسەرو دەستی کەسێکەوە دابنێم.

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:** ((دەستی باڵا خێرترە لە دەستی نزم))[٥٤]

**وتراوە**"أبو مرتد"(رەحمەتی خودای لێ بێت) مرۆڤێکی بەڕێزی بەخشندە بوو، یەکێك لە شاعیران مەدحیان کرد، ئەویش وتی: هیچم لا نییە پێتی ببەخشم، بەڵام ببە بۆ لای قازی و سکاڵای دە هەزار درهەمم لەسەر تۆمار بکە، منیش دانی پیادا دەنێم، پاشان بەندم بکە، کەسوکار و خانەوادەکەم لێم ناگەڕێن لە بەندیخانەدا بم و پارەکە دەدەن، ئەویش ئەو کارەی کرد، نەگەیشتە ئێوارە دە هەزار درهەمەکەیان بۆ هێنا و لە بەندیخانە هێنایانە دەرەوە.

**وتراوە:** پیاوێك داوای شتێکی لە حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب کرد(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت)، ئەویش پەنجا هەزار درهەم و پێنج سەد دیناری پێدا، وتی: حەماڵێك بهێنە با بۆت هەڵبگرێت، ئەویش حەماڵێکی هێنا، حەسەن پارچە قوماشێکی سەرشانی دا بە حەماڵەکە و وتی: ئەمەش کرێی هەڵگرتنی کۆڵەکە لەلایەن منەوە.

**ژنێك داوای کوپێك هەنگوینی لە لەیسی کوڕی سەعد کرد**، ئەویش سەتڵێك هەنگوینی پێدا، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: ئەو بەپێی پێویستی خۆی داوای کرد، ئێمە بەپێی نیعمەتەکە دەبەخشین.

**پیاوێك دەڵێت:** نوێژی بەیانیم لە مزگەوتی ئەشعەس لە شاری کوفە کرد، بەدوای قەرزارێکی خۆمدا دەگەڕام، کاتێك سەلامم دایەوە لەبەردەم هەر کەسێکدا بە منیشەوە پۆشاکێك و جووتێ نەعلیان دانا، پرسیم: ئەمە چییە؟

وتیان: ئەشعەس لە مەکەوە هاتووە و فەرمانی کردووە ئەمە بە ئەهلی جەماعەتی مزگەوت بدرێت.

منیش وتم: من لە ئەهلی جەماعەتی ئەم مزگەوتە نیم، بەڵکو هاتووم بە دوای کەسێکی قەرزاری خۆمدا دەگەڕێم.

وتیان: بۆ هەر کەسێکە لێرە ئامادە بووبێت.

---

[٥٤] {أخرجه أحمد والطبراني}.

**وتراوه:** کاتێك مردنی شافیعی(خوا لێی رازی بێت) نزیك بوویەوە، فەرمووی: فەرمان بە فلان کەس بکەن بمشۆرێت، ئەو کاتە پیاوەکە لەوێ نەبوو، کاتێك هات هەواڵەکەیان پێدا، داوای دەفتەری یاداشتی ئیمامی شافیعی کرد بینی حەفتا هەزار درهەم قەرزارە، هەمووی گێڕایەوە بۆ خاوەن قەرزەکان و وتی: ئەمە شۆرینی منە بۆ ئەو.

**وتراوە:** کاتێك شافیعی لە سەنعاوە هات بۆ مەککە دە هەزار دیناری پێ بوو، پێی وترا: شتێکی پێ بکڕە بیخۆیت، خێمەیەکی لە دەرەوەی مەککە هەڵدا و دینارەکانی هەڵڕشت، هەر کەس دەهاتە ژوورەوە مشتێکی پێ دەدا، کاتێك نوێژی نیوەڕۆ هاتە بەرەوە ئەو قوماشەی پارەکەی لەسەر هەڵڕشت بوو هەڵیتەکاند و هەمووی بەخشی بوو.

**وتراوە رۆژی جەژن "السري"** هاتە دەرەوە و پیاوێکی خاوەن شانوشکۆ پێشوازی لێکرد، **"السري"** بە ناتەواوی سەلامی لێکرد، دواتر لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: بەدڵنیاییەوە من ئەوم ناسیوە، بەڵام لە مەسنەددا ریوایەت کراوە: ((گەر دوو موسڵمان بە یەکتر بگەن سەد رەحمەت لە نێوانیان بەش دەکەم، نەوەدیان بۆ ئەو کەسەی رووخۆشترە و جوانتر مامەڵە دەکات)) بۆیە منیش ویستم ئەو نەوەد رەحمەتە بۆ ئەو بێت.

**وتراوە:** رۆژێك ئەمیری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تالب(خودا لێی رازی بێت) دەگریا، پێیوترا: چی دەتگریەنێت؟ وتی: حەوت رۆژە میوان رووی لێ نەکردووم، ئەترسم خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) شەرمەزاری کردبم.

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت) دەگێڕنەوە وتوویەتی:** زەکاتی ماڵ و خانوو ئەوەیە ژوورێکی هەبێت بۆ میوان.

**لەسەر ئایەتی:**﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٤﴾﴾ **الذاريات: ٢٤ وتراوە:** خزمەت کردنیان لەلایەن خۆیەوە، چونکە کۆمەڵێك میوانی بەڕێزی کەسێکی بەڕێز بوون.

**ئیبراهیمی کوڕی جونەید دەڵێت: وتراوە چوار شت نابێت کەسی مەزن خۆی لێ لابدات با ئەمیریش بێت:** هەستان لەبەر باوکی لە مەجلیسدا، و خزمەتی میوانی و خزمەتی ئەو زانایەی لێیەوە فێربووە و پرسیار کردن لەبارەی ئەوەی نایزانێت.

**ئیبن عەباس(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) لەسەر ئایەتی:**﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗا﴾النور: ٦١ **دەفەرموێت:** هاوەڵان پێیان خۆش نەبوو بەتەنها نان بخۆن بۆیە خودا لەوەدا ئەو روخسەتەی دان.

**هەروەها وتراوە:** عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیز میوانداری لە پیاوێك کرد و زۆر بە جوانی خزمەتی کرد، کاتێك پیاوەکە ویستی خواحافیزی بکات خزمەتکارەکان یارمەتیان نەدا، کاتێك لەو بارەیەوە پرسیار لە عەبدوڵا کرا وتی: ئەوان بە هۆی دڵگرانیانەوە لە رۆیشتنی میوانەکە یارمەتی میوانەکەیان نەداوە.

**عەبدوڵای کوڕی موبارەك دەڵێت:** سەخاوەتی نەفس لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە(واتە چاو نەبڕێتە ئەوەی لە دەستی خەڵکیدایە) باشتر و چاکترە لە سەخاوەتی نەفس بە پێدان و بەخشین.

**پیاوێك دەڵێت:** رۆژێکی زۆر سارد چووم بۆ لای بیشری کوڕی حاریس، پۆشاکی لەبەردا نەبوو و هەڵدەلەرزی، وتم: ئەی باوکی نەصر خەڵکی بۆ ئەم رۆژە ساردانە پۆشاکێ زیادەی لەماڵەوە هەیە، بەڵام تۆ پۆشاکەکەی بەری خۆتت نەپۆشیوە؟!

لە وەڵامدا وتی: هەژارەکان و ئەوەی ئەوانی تێدایە هات بە بیرمدا، هیچ شتێکم نەبوو دڵنەوایی ئەوانی پێ بکەم، بۆیە ویستم لە ئازاری سەرمادا بەشداریان بم.

**ئەبو عەلی دەقاق دەڵێت:** سەخاوەت ئەوە نییە ئەو کەسەی هەیەتی ببەخشێت بەوەی نییەتی، بەڵکو سەخاوەت ئەوەیە ئەو کەسەی نییەتی ببەخشێت بەو کەسەی هەیەتی.

٣٥

# غیرەت

((شیبلی دەڵێت: غیرەت دوو غیرەتە: غیرەتی مرۆیی لەسەر دەروونەکان و غیرەتی خودایی لەسەر دڵان))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾ الأعراف: ٣٣**

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((هیچ کەس لە خودا(ﷻ) بەغیرەتتر نییە، لە غیرەتی خودا ئەوەیە خراپەی دەرەوە و ناوەوەی حەرام کردووە))[٥٥]

**لە ئەبو هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((خودا غیرەت دەکات و ئیمانداریش غیرەت دەکات، غیرەت کردنی خودا لەو جێگەدایە بەندەیەکی باوەڕدار روو لە کارێك بکات خودا حەرامی کردووە))[٥٦]

**غیرەت:** بریتییە لە ناحەزی کردنی بەشداری کەسانی تر جگە لە خۆی، کاتێك خودا(ﷻ) بە غیرەت وەسف دەکرێت ماناکەی ئەوەیە: خودا رازی نابێت لەگەڵ ئەو کەسانێکی تر بەشدار بن لەوەی مافی خۆیەتی لە گوێڕایەڵی بەندەکەی بۆ ئەو(ﷻ).

**دەگێڕنەوە لە بەردەم "السري"دا ئەم ئایەتە:﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ ﴾ الإسراء: ٤٥ خوێنرایەوە، "السري"** وتی بە هاوەڵانی: دەزانن ئەو پەردەیە(حجاب) چییە؟ ئەوە بریتییە لە پەردەی غیرەت، هیچ کەس لە خودا(ﷻ) بەغیرەتتر نییە.

---

[٥٥] {روى بنحوه عن عائشة فيما أخرجه البخاري}.

[٥٦] {أخرجه أحمد والبخاري و مسلم في صحيحهما والترمذي قال حديث صحيح}.

**مانای قسەکەی "السري":** ((ئەوە بریتییە لە پەردەی غیرەت)) واتە: خودا بێباوەڕانی شایستە نەکردووە بە زانینی صدقی ئایین.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** کەسانی تەمبەڵ لە عیبادەت کردنی ئەوانەن خودا(ﷻ) شتێکی قورسی رسواکەری بەستووە بە لاقەکانیانەوە، بۆیە دووری بەوان لە خۆی بەخشیوە، و لە شوێنی نزیکبوونەوە لە خۆی دوایخستوون، بۆیە بەو جۆرە دواکەوتن.

**هەروەها گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** گوێم لە "عەباس زۆزنی" بوو دەیوت: سەرەتایەکی زۆر باشم هەبوو.. دەمزانی چەندم ماوە بگەم بە مەبەستی خۆم و مەرامەکەی خۆم بەدەست بهێنم، شەوێك لە خەوندا بینیم دەمویست بۆ سەر لوتکەی چیایەك سەربکەوم، بەڵام وەك ئەوەی بە تەپاوتل لە چیاکە بەرببمەوە، دەڵێ: زۆر دڵتەنگ و نیگەران بووم، جارێکی تر خەوم لێکەوتەوە یەکێکم بینی دەیوت: عەباس، حەق(ﷻ) نایەوێت تۆ بگەی بەوەی داوای دەکەی، بەڵام حیکمەتی لەسەر زمانت داناوە، دەڵێ: بەیانیم لێ بوویەوە وشەکانی حیکمەتم ئیلهام کرابوو.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** یەکێك لە گەورە پیاوان حاڵ و کاتێکی لەگەڵ خودادا هەبوو، بۆیە ماوەیەك دیار نەما و لەناو هەژاراندا نەبینرا، دواتر دەرکەوتەوە نەك بە شێوەی کاتەکانی پێشووی، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: ئاخ، دیسان پەردەکە دروستبوویەوە(دادرایەوە).

**هەروەها گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** گەر شتێك لە دانیشتنی مزگەوتدا روویدا و دڵی ئامادەبوانی خەریك کرد ئەوە لە غیرەتی خودایە(ﷻ) دەیەوێت لە صەفای ئەو کاتە بەسەر ئەواندا گوزەر نەکات.

**بە یەکێکیان وترا:** دەتەوێ بیبینی؟ وتی: نەخێر، پرسی: بۆ؟ وتی: ئەو جوانی شکۆمەندە لە سەیرکردنی هاوشێوەی من بە پاکی رادەگرم.

**پرسیار لە شیبلی کرا:** کەی ئاسوودە دەبیت؟ وتی: کاتێك کەسێکم نەبینی یادی بکات.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر ئەو فەرموودەی:** ((ئەعرابییەکە لێی پرسی: تۆ کێیت؟ ئەویش فەرمووی: پیاوێکی قورەیشیم، یەکێك لە هاوەڵان فەرمووی: جەفا بەسە بۆ تۆ پێغەمبەرەکەی خۆت ناناسی)) دەیوت: وەك غیرەت کردن فەرمووی: پیاوێکم لە قورەیش، ئەگینا پێویستە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بە هەموو کەس بناسێنێت کە ئەو پێغەمبەری خودایە، پاشان خودا(ﷻ) لەسەر زمانی ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەری بە ئەعرابییەکە ناساند.

**هەندێك کەس دەڵێن:** غیرەت لە ئاکارەکانی ئەو کەسانەیە لە سەرەتادان، کەسی گەیشتووی یەکتاپەرست غیرەت نابینێت و بە بوونی هەڵبژاردن وەسف ناکرێت، لەوەی لە مەملەکەتی خودادا گوزەر دەکات هیچ بەرهەڵستییەکی نییە، بەڵکو خودا(ﷻ) لەپێشترە بە شتەکان چۆن بڕیاریان لەسەر دەدات.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** غیرەت کاری موریدانە، بەڵام بۆ کەسانێك بە حەقیقەتەکان گەیشتوون نەخێر.

**شیبلی دەڵێت:** غیرەت دوو غیرەتە: غیرەتی مرۆیی لەسەر دەروونەکان و غیرەتی خودایی لەسەر دڵان.

**غیرەتی خودا(ﷻ) لەسەر بەندەکەی:** ئەوەیە خودا بەشی خەڵکی لە بەندەکەیدا دانەنێت، بۆیە ئەو بۆ خۆی(ﷻ) ساغ دەکاتەوە، غیرەتی بەندەش لەسەر خودا: ئەوەیە شتێك لە حاڵ و هەناسەی بۆ هیچ کەسێك نەبێت جگە لە خودا(ﷻ)، ناوترێت من غیرەت دەکەم لەسەر خودا، بەڵکو دەوترێت من غیرەت دەکەم بۆ خودا، کەوابوو غیرەت لەسەر خودا(ﷻ) نەزانییە، لەوانەیە سەربکێشێت بۆ وازهێنان لە ئایین، غیرەتیش بۆ خودا بەمەزنڕاگرتنی مافەکانی خودا و پاڵفتەکردنی کردارەکان بۆی پێویست دەکات.

بزانن لە سونەتەکانی خودا(ﷻ) لەگەڵ دۆستانی: هەر کات لەلای جگە لە ئەو سوکناییان بۆ هات و چاویان لەسەر شتێك بوو یان دڵیان بوو بە هامنشینی شتێك

خودا ئەو شتەیان لێ تێکدەدا، غیرەت دەکات لەسەر دڵیان تا بە پاکی و پاڵفتەیی بۆ لای خۆی بیگێڕێتەوە و خاڵی بکاتەوە لەوەی تیایدا نیشتەجێ بووە و چاوی لەسەریەتی و بووە بە هامنشینی، وەك ئادەم(عليه السلام) کاتێك نەفسی لەسەر نەمری(خلود) جێگیر کرد خودا(سبحانه وتعالى) لە بەهەشت دەریکرد.

**هەروەها ئیبراهیم(عليه السلام) کاتێك سەرنجی بەلای ئیسماعیلدا(عليه السلام) دەڕوات،** خودا فەرمانی پێکرد بە سەربڕینی تا لە دڵی دەریکرد وەك قورئان دەفەرموێت:﴿ **فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ١٠٣** ﴾ **الصافات: ١٠٣** و نهێنی و پەنهانی بۆ خودا(سبحانه وتعالى) پاڵفتە بوو فەرمانی کرد بە فیدیە بۆی.

**محەمەدی کوڕی حەسان دەڵێت:** ئەو کاتەی لە چیای لوبنان دەسوڕامەوە، گەنجێکم بینی بای گەرم روخساری سوتاندبوو، کاتێك تەماشای منی کرد پشتی هەڵکرد و هەڵهات، منیش شوێنی کەوتم و پێم وت: بە تەنها وشەیەك ئامۆژگاریم بکە؟

پێی وتم: ئاگاداری خۆت بە ئەو(سبحانه وتعالى) زۆر بە غیرەتە، پێیخۆش نییە جگە لە خۆی کەسێکی تر لە دڵی بەندەکەیدا ببینێت.

**نەصرابادی دەڵێت:** خودا(سبحانه وتعالى) خاوەنی غیرەتە، لە غیرەتی خودا ئەوەیە هیچ رێگەیەکی بۆ لای خۆی جگە لە خۆی دانەناوە.

**وتراوە:** خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ یەکێك لە پێغەمبەرانی نارد: فلان کەس پێویستییەکی هەیە لە لای من، گەر پێویستییەکەم جێبەجێ بکات پێویستییەکەی جێبەجێ دەکەم، پێغەمبەرەکە(عليه السلام) لە موناجاتەکانیدا فەرمووی: خودایە، تۆ چۆن دەبێت پێویستیت هەبێت؟ خودا(عز وجل) پێی فەرموو: ئەو کەسێکی تر لە دڵیدا نیشتەجێ بووە با دڵی خۆی لێ بەتاڵ بکاتەوە پێویستییەکەی بۆ جێبەجێ دەکەم.

**وتراوە:** ئەبو یەزیدی بوستامی لە خەونیدا دەستەیەك لە حورلعەینی بینی.. تەماشای کردن، بەو کارەی لە خەوندا چەندین رۆژ حاڵ و کاتی لێ وەرگیراوە، پاشان دەستەیەکی تری لە حورلعەین لە خەوندا بینییەوە لای نەکردەوە بە لایاندا و پێی وتن: ئێوە سەرقاڵکەر و خەریککەرن.

**وتراوە:** رابیعەی عەدەوی نەخۆشکەوت، پێی وترا: هۆی نەخۆشییەکەت چییە؟

لە وەڵامدا وتی: بە دڵ تەماشای بەهەشتم کرد خودا ئەدەبی دادام، لێرە بەدواوە دەرگانەی بەرنادەم و ناگەڕێمەوە سەر ئەو کارە.

**لە "السري"ەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** ماوەیەك بە دوای پیاوێکی هاوەڵی خۆمدا دەگەڕام، بە هەندێ چیادا گوزەرم کرد، کۆمەڵێك پیر و نەخۆش و کوێرم بینی، پرسیاری حاڵی ئەوانم کرد، وتیان پیاوێك لەو شوێنەیە ساڵێك یەك جار دێتە دەرەوە و دوعایان بۆ دەکات و خودا شیفایان بۆ دەنێرێت، ئارامم گرت تا هاتە دەرەوە، دوعای بۆ کردن و شیفایان بۆ هات، شوێنپێم هەڵگرت و بەدوایدا رۆیشتم و پێم وت: نەخۆشییەکی ناوەکیم پێوەیە دەواکەی چییە؟

لە وەڵامدا وتی: ئەی **"السري"** لێمگەڕێ، خودا(ﷻ) خاوەنی غیرەتە هەر کات تۆ ببینێت سوکنایت بۆ لای کەسێکی ترە لەبەرچاوی دەکەویت.

**مامۆستا (قوشەیری) دەڵێت:** لە غیرەتی هەندێکیان کاتێك خەڵکی دەبینن بە بێئاگایی ناوی خودا دەهێنن ناتوانێ ئەوە ببینێت و زۆر لای گران دەبێت.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو (رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** کاتێك ئەعرابییەکە چووە ناو مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) و میزی تیاکرد هاوەڵان بۆی چوون تاکو بیکەنە دەرەوە، ئەبو عەلی دەیوت: ئەعرابییەکە ئەدەبی ناباش بوو، بەڵام شەرمەزاری رووی لە هاوەڵان کرد، هەموویان رووبەڕووی گرانی و نارەحەتی بوونەوە کاتێك حاڵ و باری حەیای پێغەمبەری خودایان(ﷺ) بینی، بەندەش هەر بەو جۆرەیە گەر مەزنی و شکۆمەندی خودای ناسی بێت کاتێك خەڵکی بەبێئاگاییەوە ناوی دەهێنێت و وەکو پێویست گوێڕایەڵی لێ ناکەن لای گران و دژوارە.

**دەگێڕنەوە ئەبوبەکری شبلی** کوڕێکی مرد ناوی **"أبو الحسن"** بوو، دایکی زۆر بۆی دڵگران بوو و پرچی سەری خۆی بڕی، شیبلی رۆیشت بۆ حەمام و ریشی خۆی بۆیاخ کرد، هەر کەس دەهات بۆ لای پێیان دەوت: ئەمە چییە ئەی ئەبوبەکر؟

دەیوت: ئەوە وەك تەبایی لەگەڵ خانەوادەکەم.

**هەندێکیشیان پێیان وت: پێمان بڵێ ئەی ئەبوبەکر بۆ ئەمەت کرد؟**

وتـی: زانـیم ئێـوە بـەبێئاگایی تەعزیـەم لـێ دەکـەن و دەڵـێن: خـودا پاداشـتت بـۆ بنووسێت، بۆیە ریشەکەم کرد بە فیدیەی یادکردنی ئێوە بۆ خودا بەبێئاگاییەوە.

**"النوري"** گوێی لە پیاوێك بوو بانگی دەدا پێی وت: تیرباران بکرێیت و ژەهری مردن بخۆیەوە، کەچی گوێی لە دەنگی سەگێك بوو دەوەڕی پێی وت: **"لبيك وسعديك"** بۆیە وتیان: ئەم پیاوە لە دین دەرچووە، بە باوەڕدار لە شایەتماندا دەڵێت: تیرباران بکرێیت و ژەهر بخۆیەوە، بەڵام بە سەگ دەڵێت: **"لبيك وسعديك"**؟!

لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا وتی: ئەو بانگوێژە زیکرەکەی لەسەر بێئاگایی بوو، بەڵام دەربارەی سەگەکە خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمووێت:﴿ **وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ** ﴾ **الإسراء: ٤٤**

**پیاوێك گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: "جل الله"** ئەویش پێی وت: پێمخۆشە خودا لەو جۆرە زیکرە مەزنڕابگریت.

**ئەبو حەسەنی خەزەفانی دەڵێت: "لا إله إلا الله"** لەناو دڵدایـە، **"محمد رسول الله"** گوێڕایەڵییە، هەر کەس تەماشای رووالەتی ئەم قسەیە بکات وا گومان دەبات شەرعی بە بچووك تەماشا کردبێت، بـەڵام بـەو جـۆرە نییـە ئـەو ئەندێشـەی دەکـات، چـونکە هەرچی شتە لەبەردەم مەزنی و گەورەیی خودادا بچـووکە، ئەوانـەش کـە هەڵبـژاردەی خودان خودا دەستی رێز و گەورەیی لەسەر داناون.

# ٣٦

# ویلایەت

((ئەبو تورابی نەخشەبەندی دەڵێت: هەر کات دڵ هۆگری پشتهەڵکردن بوو لە خودا بەدوایدا دەم دەخاتە ناو حورمەتی دۆستانی خودا))

**خودا(ﷻ) دەفەرمویت:**﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ **یونس: ٦٢**

**لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:**((خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمویت: هەر کەس دۆستێکم ئازار بدات جەنگی لە دژ رادەگەیەنم، بەندەکەم بە شتێك لێم نزیك نابێتەوە باشتر بێت لەوەی لەسەری فەرزم کردووە، بەردەوام بەندەکەم بە سوننەتەکان لێم نزیك دەبێتەوە هەتا خۆشم دەوێت، لە هیچ شتێك دڵەڕاوکێم نەبووە وەك گیانکێشانی بەندە باوەڕدارەکەم، چونکە ئەو حەزی لە مردن نییە و منیش نامەوێت بێزاری بکەم کە ئەوەش هەر دەبێت ببێت))[٥٧]

**"ولي" دوو مانای هەیە: یەکەمیان** لەسەر کێشی "فعیل"ە، ئەوەش ئەو کەسەیە خودا کارەکانی دەگرێتە دەست، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمویت:﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾﴾ **الأعراف: ١٩٦**، بۆیە بۆ تەنها ساتێکیش نایداتە دەست نەفسی خۆی، بەڵکو خودا(سبحانه وتعالى) دەیخاتە ژێر سەرپەرشتیاری خۆیەوە.

**دووەمیان** لەسەر کێشی "فعیل"ە بۆ موبالەغە لە "فاعل"ە، ئەوەش ئەو کەسەیە بە بەردەوامی لە عیبادەت و گوێڕایەڵی خودادایە، واتە عیبادەتەکانی بەدوای یەکتردا دێن، بەبێ ئاوەی گوناه و یاخیبوون بکەوێتە نێوانیانەوە.

---

[٥٧] {هاوشێوەی ئەمە لە "ریاض الصالحین"دا هاتووە}.

هەردوو وەسفەکە پێویستن تا وەلی ببێت بە وەلی، پێویستە بە وردی و بەردەوامی هەستێت بە جێبەجێ کردنی حەقەکانی خودا(ﷻ) لەسەر خۆی، لەوێشەوە خودا بە بەردەوامی پارێزگاری لێ دەکات و کارەکانی لە زەمینەی خۆشی و ناخۆشیدا دەگرێتە دەست.

**لە مەرجەکانی وەلی ئەوەیە:** کەسێکی پارێزراو بێت، وەك چۆن لە مەرجەکانی پێغەمبەرایەتی ئەوەیە مەعسووم بێت، هەر کەسێك بەرهەڵستی شەریعەتی خودا بکات کەسێکی فریوخواردووی خەڵەتاوە.

**گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئەبو یەزیدی بوستامی رۆیشت بۆ لای کەسێك بە ویلایەت وەسف دەکرا، کاتێك گەیشتە مزگەوتەکەی دانیشت تەماشای چوونە دەرەوەی بکات، پیاوەکە هاتە دەرەوە و بەڵغەمی ناو دەمی لە مزگەوتەکەدا رۆکرد، ئەبو یەزید پشتیهەڵکرد و سەلامی لێ نەکرد، و وتی: ئەمە پیاوێکە نەیتوانی ئادابێك لە ئادابەکانی شەریعەت پارێزگاری لێ بکات ئیتر چۆن دەبێت بە کەسێك نهێنییەکانی حەق(ﷻ) بگرێتە دەست؟!

**لەوەدا جیاوازیان هەیە ئایا دروستە وەلی بزانێت وەلییە یان نە؟**

**هەندێکیان دەڵێن:** ئەوە دروست نییە، بۆیە دەڵێن: وەلی بە چاوی کەم تەماشای نەفسی خۆی دەکات و گەر شتێکی کەم لە کەراماتی لێ دەرکەوت دەترسێت فێڵ و هەڵنان بێت، ئەو بە هەمیشەیی هەست بە ترس دەکات، دەترسێت بەربێتەوە لەوەی تێیدایە، و سەرئەنجامەکەی پێچەوانەی حاڵەکەی بێت، ئەوانە سەرئەنجامی باش بە مەرجی ویلایەت دەزانن.

لەم دەروازەیەوە بەسەرهاتی زۆر لە گەورەپیاوانی ئەم دەستەیەوە باسکراون کە نایەنە هەژمارکردن، گەر خۆمان خەریك بکەین بە باسکردنی ئەوەی وتوویانە ئەوا لە رادەی پوختەی بابەتەکە دەردەچین، لەو گەورە پیاوانەی ئێمە بە خزمەتیان گەیشتووین و لەسەر ئەم رایەن: **"ألإمام أبوبكر بن فورك"**ە(رەحمەتی خودای لێ بێت)

**هەشیانە دەڵێت:** دروستە وەلی بزانێت وەلییە، سەرئەنجامی باش لە مەرجەکانی هاتنەدی ویلایەت نییە لە ئێستایدا.

پاشان گەر سەرئەنجامی باش لە مەرجی ویلایەت بێت دروستە ئەو وەلییــە تایبــەت کرابێت بە کەرامەتێك کە تیایدا خودا(ﷻ) ئاگاداری کردبێت بـەوەی سـەرئەنجامێکی باشی دەبێت، چونکە داننان بە کەراماتی دۆستانی خودا پێویستە، هەرچـەند تێکەڵـە بـە تـرس لـە سـەرئەنجام، بـەڵام ئـەوەی ئـەو لەسـەریەتی لـە هەیبـەت و مـەزنی و شکۆمەندی لە ئێستادا تەواوتر و توندترە، کـەمێك لـە "بەمـەزنڕاگرتن و هەیبـەت" کاریگەری زۆرترە لەسەر دڵ لە زۆرێك لە ترس.

**هــەروەها لەبــەر ئــەوەی پێغەمبــەر(ﷺ) فەرمووویــەتی:** ((دە لـە هـاوەڵانم لـە بەهەشــتدان)) ئــەو دەیــە-بــەبێ چەندوچــوون- پێغەمبــەریان(ﷺ) بەڕاســتزانیوە و سەلامەتی سەرئەنجامی خۆیان زانیوە، پاشان ئەوە نەبووەتە مایەی نەنگی بۆ حاڵیان.

**هەروەها لەبەر ئەوەی لە مەرجی دروستی زانینی پێغەمبەرایـەتی:** وەسـتانە لـە رادەی موعجیزەدا، زانست بە کـەراماتیش دەچـێتە نـاو ئەمـەوە، کاتێـك کـەراماتی بینی لە ئەو دەوەشایەوە نابێت جیاکاری بکات لە نێوان خـۆی و کەسـانی تـردا، گـەر شتێکی لەو جۆرەی لە خـۆی بـینی لـەوە تێـدەگات لـە ئێسـتادا ئـەو لەسـەر حەقـە، پاشـان دەگـونجێ لـە داهـاتوودا لەسـەر ئـەو حاڵەتـە بمێنێتـەوە، ئـەم زانینـە بـۆ ئـەو کەرامەتێکە، وتنی کەرامات بۆ دۆستانی خوداش دروستە.

زۆرێك لە باس و بەسەرهاتەکانی پیاوانی ئەم دەستەیە ئاماژە بەم راستییە دەکـەن (وەك چۆن لە دەروازەی کەراماتی ئەولیا بە پشتیوانی خودا هەندێکی لێ باس دەکەین).

لەو پیاوانەی ئێمە بە خزمـەتیان گەیشـتووین و لەسـەر ئـەم رایـەن مامۆسـتا ئـەبو عەلی دەقاقە(رەحمەتی خودای لێ بێت).

**وتراوە:** ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بە پیاوێکی وت: پێتخۆشە ببیت بـە وەلـی خـودا؟ وتی: بەڵێ، پێیوت: حەزت لە هیچ شتێکی دونیا و دوارۆژ نەبێت، نەفسـی خـۆت بـۆ خودا(ﷻ) یەکلابکەرەوە، بە رووی خۆتەوە روو لە خودا بکـە بـا خـودا(ﷻ) رووت لـێ بکات و سەرپەرشتیت بکات.

**یەحیای کوڕی مەعاز لە سیفەتی دۆستانی خودادا دەڵێت:** ئەوانە کەسانێکن لەدوای ئازار و تاڵاوی کۆشان بەرگی هۆگربوونیان بە خوداوە(ﷻ) پۆشیوە، ڕۆحیان ئازاد کردووە لەدوای هەوڵ و تێکۆشان بە گەیشتنیان بە مەقامی ویلایەت.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** دۆستانی خودا بووکی رازاوەی خودان، تەنها بێبەشان بووك دەبینن، ئەوان لە خێمەی هۆگریدا رووی خۆیان شاردووەتەوە، نە لە دونیا و نە لە دوارۆژدا هیچ کەس ئەوان نابینێت.

**گوێم لە ئەبوبەکری صەیدەلانی بوو-کە پیاوێکی صالح بوو- دەیوت:** زۆر جار لە گۆڕستانی **"الحيرة"** خەریکی چاککردنی لەوح دەبووم بۆ گۆڕی**"أبوبكر الطمستاني"**، ناوی ئەوم لێ دەنووسی و دواتر لەوحەکەیان لێ دەکردەوە و دەدزرا، ئەو کارە تەنها بۆ گۆڕی ئەو پیاوە روویدەدا و لەسەر گۆڕەکانی تر روویندەدا، منیش زۆر سەرم سوڕدەما، لەو بارەیەوە رۆژێك پرسیارم لە ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) کرد وتی: ئەو پیاوە لە دونیادا بێناوی و خۆشارینەوەی هەڵبژارد، تۆ دەتەوێ بەو لەوحەی ناوی ئەوی لێ دەنووسی بەناوبانگی بکەی، خودا(ﷻ) دەیەوێت گۆڕەکەی شاراوە بێت، وەك چۆن ئەو پێیخۆش بوو خۆی داپۆشێت.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** هەندێ جار وەلی بەناوبانگ دەبێت، بەڵام تووشی فیتنە نابێت.

**نەصرابادی دەڵێت:** دۆستانی خودا داوایان لە خودا نییە، تەنها کزبوون و ژاکاوی و خامۆشبوونیان هەیە.

**هەروەها نەصرابادی دەڵێت:** کۆتاییەکانی ئەولیا سەرەتاکانی پێغەمبەرایەتییە.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** وەلی ئەو کەسەیە کردارەکانی لەسەر تەبایی شەرع بەدوای یەکتردا دێن.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** وەلی ریا ناکات و دووڕوویی تێدا نییە، هەر کەس ئەوە ئەخلاقی بێت لە صدیق کەمتر نییە.

**ئەبو عەلی جوزجانی دەڵێت:** وەلی لە حاڵی خۆی فەنای کردووە، و لە موشاهەدەی حەق(ﷻ) ماوەتەوە، خودا رامهێنانی ئەوی گرتووەتە دەست، بۆیە نووری سەرپەرشتی

کردنی بەسەردا داباراندووە، هەواڵێکی لە نەفسی خۆی نییە و لەگەڵ کەسانی تریش ئارامی و سوکنایی بۆ نایەت.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** بەشی ئەولیاکان لەگەڵ جیاوازیان لە چوار ناوی خوداوەیە(ﷻ)، هەر دەستەیەك لەوانە بە ناوێکەوە راستبووەتەوە، ئەو ناوانەش: **"الأول و الآخر و الظاهر و الباطن"** هەرکات لەو بەشەی فانی بوو-لەدوای ئەوەی تیایدا ژیا- ئەوا دەبێتە کەسێکی کامڵی تەواو، هەر کەس بەشی لە ناوی **"الظاهر"** هەبێت شتە سەیر و سەمەرەکانی دەسەڵاتی خودا دەبینێت، هەر کەس بەشی لە ناوی **"الباطن"** هەبێت ئەو نوورانەی بە پەنهانیدا گوزەر دەکەن هەست پێ دەکات، هەر کەس بەشی لە ناوی **"الأول"** هەبێت خەریکبوونی بەوەوەیە لە ئەزەلدا گوزەری کردووە، هەر کەس بەشی لە ناوی **"الآخر"** هەبێت پەیوەست دەبێت بەوەی لە داهاتوودا رووبەڕووی دەبێتەوە، هەر کەس بەپێی توانای خۆی بۆی دەردەکەوێت، جگە لەو کەسەی حەق(ﷻ) بە چاکەی خۆی سەرپەرشتی دەکات و لە جێگەی ئەو کارەکانی دەکات.

**ئەوەی ئەبو یەزید دەیڵێت:** ئاماژە بەوە دەکات تایبەتانێك لە بەندەکانی خودا لەو بەشانە بەرزبوونەتەوە، یادی سەرئەنجامێك ناکەن و بیر لە بڕیاری ئەزەل بۆ خۆیان ناکەنەوەو بەهیچ شتێکەوە کۆتوبەند نەکراون، هەر بەو جۆرە ئەوانەی لەسەر حەقیقەتن تەنها رواڵەتیان بە سیفەتی خەلقەوەیە، وەك قورئان دەفەرموێت:﴿ **وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ** ﴾الكهف: ١٨

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** وەلی لەسەر زەوی رێحانەی خودایە(ﷻ)، صدیقان بۆنی دەکەن و بۆنەکەی دەگاتە دڵیان و لەوێوە تامەزرۆ دەبن بۆ گەیشتن بە مەولایان(ﷻ) و عیبادەتیان بەپێی ئەخلاقیان زیاد دەکەن.

**پرسیار لە "الواسطي" کرا:** وەلی چۆن لە ویلایەتەکەیدا پەروەردە دەبێت؟ وتی: لە سەرەتایەوە بە عیبادەت کردنی خودا و لە پیریدا داپۆشینی بە لوتفی خودایی، پاشان رایدەکێشێت بۆ ئەوەی لە ئەزەلدا بۆی نووسراوە لە سیفەتی جۆراوجۆر، پاشان تاموچێژی راستبوونەوەی لە هەموو کاتەکاندا دەرخوارد دەدات.

**وتراوه: نیشانەی وەلی سێ شته:**

١.خەریکبوونی بە خوداوە.

٢.هەڵهاتنی بۆ لای خودا.

٣.خەم و پەژارەی بۆ خودا.

**"الخراز" دەڵێت:** گەر خودا(ﷻ) ویستی ویلایەت بە بەندەیەك بدات دەرگای زیکری خۆی لێدەکاتەوە، گەر تام و چێژی زیکری کرد دەرگای نزیکی لێدەکاتەوە، پاشان بەرزیدەکاتەوە بۆ مەجلیسی هۆگربوون بە خوداوە، پاشان لەسەر کورسی یەکتاپەرستی دایدەنێت، پاشان پەردەی لەڕوو هەڵدەگرێ و دەیباتە ناو خانەی تاکوتەنهاییەوە و گەورەیی و مەزنی و جوانی و شانوشکۆی خۆی پێ نیشان دەدات، گەر چاوی کەوت بەسەر جوانی و مەزنی و شکۆمەندیدا بە"بێ ئەو" دەمێنێتەوە، ئەو کات بەندە دەبێتە سەردەمێکی بەسەرچوو و دەکەوێتە ناو پارێزگاری خوداوە(ﷻ) و لە بانگەشەی نەفسی خۆی دێتە دەرەوە و پاکدەبێتەوە.

**ئەبو تورابی نەخشەبی دەڵێت:** گەر دڵ هۆگربوو بە پشتکردن لە خودا بەدوای زمانی لە دۆستانی خودادا بە خراپ بەکاردەهێنێت.

**وتراوە:** لە سیفەتی وەلی ئەوەیە ترسی نەبێت، چونکە ترس چاوەڕوانی ناخۆشییەکە لە داهاتوودا رووی لێ بکات یان چاوەڕوانی تیاچوونی خۆشویستراوێکە لە داهاتوودا لەدەستی بدات، وەلی رۆڵەی کاتی خۆیەتی(واتە ئەو ساتەی تیایدا دەژی(دەمی ئێستا) بەبێ بیرکردنەوە لە رابردوو و داهاتوو) داهاتوویەکی نییە لە شتێك بترسێت.

وەك چۆن ترسی نییە رجاشی نییە، چونکە رجا چاوەڕوانی خۆشویستراوێکە بەدەستبێت یان خۆشنەویستراوێکە بڕەوێتەوە، ئەمانەش لە دەمی داهاتوودان کە وەلی رووی تێناکات.

هەر بەو جۆرە وەلی دڵتەنگی بۆ نییە، چونکە دڵتەنگی لە دژواری و سەختی دڵەوەیە، هەر کەس لەبەر رۆشنایی رازیبوون و فێنکی تەبابووندا بێت ئیتر چۆن دڵتەنگی رووی لێ دەکات؟! خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢﴾ یونس: ٦٢

## ٣٧

# دوعـــا

((دوعا كلیلی پێویستییە و ددانەكانی ئەو كلیلە خواردنی حەڵاڵە))

**خودا** (ﷻ) **دەفەرمویت:** ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةً ﴾ **الأعراف: ٥٥**

**هەروەها دەفەرمویت:** ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾ **غافر: ٦٠** لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە(خودا لێی رازی بێت) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((دوعا مۆخی عیبادەتە))[٥٨]

**دوعا:** كلیلی پێوویستییە و ئاسوودەكەری خاوەن پێویستییەكان و پەنای ناچاران و بەختەوەركەری بیمارانە، خودا زەمی دەستەیەك دەكات دوعایان وازلێهێناوە و **دەفەرمویت:** ﴿ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡ ﴾ **التوبة: ٦٧**، **وتراوە:** واتە دەستیان بە دوعاكردن بۆ لای ئێمە بەرز ناكەنەوە.

**سەهلی كوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** خودا دروستكراوەكانی دروست كرد و فەرمووی هانام بۆ بهێنن، گەر ئەوە ئەنجام نادەن تەماشام بكەن، گەر ئەوە ئەنجام نادەن لە منەوە ببیستن، گەر ئەوە ئەنجام نادەن وەرن بۆ دەرگانەم، گەر ئەوە ئەنجام نادەن پێویستییەكانتان رادەستی من بكەن.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** سەهلی كوڕی عەبدوڵا دەڵێت: نزیكترین دوعا لە وەڵامدانەوە دوعای حاڵە.

---

٥٨ {أخرجه الترمذي}.

**دوعای حاڵ:** ئەوەیە خاوەنەکەی لە ئەوپەڕی و ناچاری و تەنگانەدا بێت و پێویست بێت لەو پێناوەدا دوعا بکات.

**عەبدوڵای مەکانیسی دەڵێت:** لەلای جونەید بووم، ژنێك هات بۆ لای و وتی: داوا لە خودا بکە کوڕەکەم بۆ بگێڕێتەوە، چونکە کوڕەکەم بزر بووە، ئەویش پێی وت: بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە و ئارام بگرە، ئافرەتەکە ڕۆیشت، پاشان گەڕایەوە و هەمان شتی پێ وتەوە، جونەید پێی وت: بڕۆ و ئارامبگرە، ئافرەتەکە ڕۆیشت، پاشان گەڕایەوە و هەمان شتی بە جونەید وتەوە و جونەیدیش پێی وت: ئارام بگرە، ئافرەتەکە وتی: ئارامم لێ بڕاوە، توانام لەسەری نەماوە، دوعام بۆ بکە، جونەید وتی: گەر کارەکە بەو جۆرەیە کەوابوو بڕۆ، کوڕەکەت گەڕاوەتەوە، ئافرەتەکە ڕۆیشت و کوڕەکەی خۆی بینییەوە، پاشان گەڕایەوە شوکری دوعاکردنەکەی جونەیدی کرد، لەو بارەیەوە بە جونەید وترا: چۆن ئەوەت زانی؟

وتی: خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) دەفەرموێت: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾ **النمل: ٦٢**

**خەڵکی جیاوازیان هەیە لەوەدا ئایا باشتر دوعاکردنە یان بێدەنگبوون و رازیبوون؟**

**هەندێکیان دەڵێن:** دوعا لە خودی خۆیدا عیبادەتە، پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: ((دوعا مۆخی عیبادەتە)) بۆیە هەستان بە عیبادەت لەپێشترە لە وازلێهێنانی، پاشان دوعا مافی خودایە(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) لەسەر بەندەکەی گەر وەڵامی بەندەکەش نەداتەوە و بەندەکە نەگات بەوەی بەشی نەفسی خۆیەتی ئەوا هەستاوە بە مافی پەروەردگاری لەسەر خۆی، چونکە دوعا دەرخستنی هەژاریی و ملکەچی بەندایەتییە، ئەبو حازمی ئەعرەج دەڵێت: بێبەشبوونم لە دوعا لەسەر توند و ناخۆشترە لە بێبەشبوونم لە وەڵامدانەوە.

**دەستەیەکی تر دەڵێن:** بێدەنگبوون و خامۆشبوون لەژێر جاریبوونی بڕیارەکانی خودا تەواوترە، رازیبوون بە هەڵبژاردەی حەق(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) لەپێشترە، بۆ ئەو مەبەستە **"الواسطي"** دەڵێت: هەڵبژاردنی ئەوەی لە ئەزەلەوە بەسەر تۆدا گوزەری کردووە باشترە لە بەرهەڵستکردنی کات(واتە دەمی دەرکەوتنی ئەوەی لە ئەزەلدا بڕیاری لێدراوە)، پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە خوداوە(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) هەواڵمان پێ دەدات و دەفەرموێ: ((هەر

کـەس یـادی مـن لـە داوالێکـردنم خـەریکی بکـات باشـترینی ئـەوەی بـە داواکـارانی دەبەخشم بەوی دەبەخشم))[٥٩]

**دەستەیەکیش دەڵێن:** پێویستە بەندە بە زمانی خاوەنی دوعا بێت و بە دڵ خـاوەنی رازیبوون بێت بۆ ئەوەی هەردوو رێگەکە لە خۆیدا کۆبکاتەوە.

**لەپێشترە بوترێت:** کاتەکان جۆراوجۆرن، لـە هەنـدێ بـاردا دوعـا کـردن باشـترە لـە بێدەنگبوون، ئەوەش بریتییە لە ئەدەب، لـە هەنـدێ باریشـدا بێـدەنگبوون باشـترە لـە دوعا و ئەوەش ئەدەبە، ئەوە لە کاتدا دەناسرێتەوە، چونکە زانینی کـات لـەناو کاتـدا بەدەست دێت، گەر لە دڵیدا ئاماژەی دوعای تێدا بوو ئەوا دوعاکردن لەپێشترە، گـەر ئاماژەی بێدەنگی تێدا بوو ئەوا بێدەنگبوون لەپێشترە.

**دروستە بوترێت:** پێویستە بەندە بێئاگا نەبێت لە بینینی پەروەردگاری(ﷻ) لە باری دوعاکردنیدا، پاشان پێویستە چـاودێری حـاڵی خـۆی بکـات، گـەر لـە دوعـادا زیـادە کرانەوەی بینییەوە ئەوا دوعاکردن لەپێشترە، گەر شێوە دەمکوتکردنێك وەك گرژبوون رووی لــە دڵــی کــرد ئــەوا لەپێشــتر وازهێنانــە لــە دوعــا، گــەر زیــادە کرانــەوە و دەمکوتکردنی لە دڵدا نەبینییەوە ئەوا وازهێنان و وازلێنەهێنانی یەکسـانە، گـەر زاڵ بە سەریدا لەو کاتە زانست بوو ئەوا دوعا لەپێشترە، گـەر زاڵ بەسـەریدا لـەو کاتـەدا مەعریفە و حاڵ بوو ئەوا بێدەنگبوون لەپێشترە، دروستە بوترێت: ئەوەی بۆ موسڵمانان بەشێکی تێدایە و مافێکی خـودای تێـدا بەدیـدەکرێت ئـەوا دوعـا لەپێشـترە، ئـەوەی بەشێکی تێدایە بۆ نەفسی خۆت ئەوا بێدەنگبوون لەپێشترە.

**لە ریوایەتێکدا:** ((بەندەیەك داوا لە خودا دەکات و خودا(ﷻ) خۆشـیدەوێت بۆیـە بە جبریل دەفەرموێت: ئەی جبریل پێویستی بەندەکەم جێبـەجێ بکـە، بـەڵام دوایبخـە چونکە من پێمخۆشە گوێم لە دەنگی بێت، بەندەیەکیش داوا لە خودا دەکات و خـودا رقی لێیەتی بە جبریل دەفەرموێت: پێویستی بەندەکەم جێبەجێ بکـە پێمخـۆش نییـە گوێم لە دەنگی بێت))[٦٠]

---

[٥٩] {أخرجه الدارمي في فضائل القرآن}.

[٦٠] {أخرجه ابن ماجة في السنن والبيهقي في الدلائل}.

**دەگێڕنەوە یەحیای کوڕی سەعید**(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە خەوندا بە خزمـەتی خـودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) گەیشـت، وتـی: خودایـە، زۆر داوام لێکـردی و وەڵامـت نەدایـەوە، خـودا پێیفەرموو: ئەی یەحیا من پێمخۆش بوو گوێم لە دەنگت بێت.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، بەندەیەك داوا لە خودا دەکات و خودا لێی تووڕەیە، بۆیـە پشـتی تێـدەکات، پاشـان داوای لـێ دەکات دیسان پشتی تێدەکات پاشان داوای لـێ دەکـات و دیسـان پشـتی تێـدەکات، پاشان داوای لێ دەکات، خودا بە فریشتەکانی دەفەرموێت: بەندەکەم نایەوێت داوا لـە هیچ کەسی تر بکات، ئەوا وەڵامم دایەوە))[٦١]

**لە ئەنەسی کوڕی مـالیکەوە(خودا لێـی ڕازی بێـت) فـەرمووی:** ((پیاوێـك لـە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لە شامەوە بۆ مەدینە و لـە مەدینـەوە بـۆ شـام بازرگـانی دەکرد و هاوەڵی قافڵەکانی نەدەکرد و پشتی بە خودا(عَزَّ وَجَلَّ) دەبەست، وتی: جارێك کـە لە شامەوە دەیویست بێت بۆ مەدینە، دزێك بەسەر ئەسپێکەوە هاتە سەر ڕێگەکەی.. هاواری لە بازرگانەکە کرد: بوەستە، بوەستە.. بازرگانەکە وەستا و پێی وت: تۆ ماڵ و سامانەکەی منت دەوێ، بیبە، بەڵام ڕێگەم بدە با بڕۆم، دزەکە پێی وت: ماڵەکە ماڵی منە، من خۆتم دەوێت، بازرگانەکە پێی وت: چیت لە گیانم دەوێت؟

ئەوە ماڵەکە بیبە و ڕێگەم بـدە بـا بـڕۆم، دەڵێـت: دزەکـە هـەمان قسـەی پێشـووی کردەوە، بازرگانەکە وتی: ڕێگەم بـدە تـا دەسـتنوێژێك دەگـرم و نوێـژێك دەکـەم و لـە پەروەردگارم(عَزَّ وَجَلَّ) دەپاڕێمەوە، دزەکـە وتـی: ئـەوەی دەتـەوێ ئـەنجامی بـدە، دەڵێـت: بازرگانەکە هەستا و دەسـتنوێژی گـرت و چـوار ڕکـات نوێـژی کـرد و پاشـان دەسـتی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، لەناو دوعاکانیدا وتی:

**"یا ودود.. یا ودود.. یا ذا العرش المجید.. یا مبدیء یا معیـد.. یـا فعـال لمـا یریـد، أسألك بنور وجهك الذي ملأ أركان عرشك، وأسألك بقدرتك التي قـدرت بهـا علـى خلقك، وبرحمتك التي وسعت كل شيء، لا إله إلا أنت، یا مغیث أغثني** (سێ جار)"

---

[٦١] {أخرجه ابن ماجة}.

کاتێك لە دوعاکەی تەواو بوو سوارێکی بینی لەسەر ئەسپێکی بازوو، پۆشاکی سەوزی پۆشی بوو، نێزەیەکی لە نوور بە دەستەوە بوو، کاتێك دزەکە تەماشای سوارەکەی کرد بازرگانەکەی وازلێهێنا و بەرەو سوارەکە ڕۆیشت، کاتێك لێی نزیك بوویەوە سوارەکە لە دزەکە هاتە پێشەوە لێدانێکی لێدا لە ئەسپەکەی خستییە خوارەوە، پاشان هات بۆ لای بازرگانەکە و پێی وت: هەستە و بیکوژە، بازرگانەکە پێی وت: تۆ کێی؟

من هەرگیز کەسم نەکوشتووە و پێمخۆش نییە کەس بکوژم، دەڵێت: سوارەکە ڕۆیشت بۆ لای دزەکە و کوشتی، پاشان گەڕایەوە بۆ لای بازرگانەکە و وتی: بزانە من فریشتەیەکم لە ئاسمانی سێیەم، کاتێك یەکەمین دوعات کرد گوێمان لێ بوو دەرگاکانی ئاسمان دەنگیان لێوە دەهات، وتمان: شتێك ڕوویداوە، کاتێك دوعای دووەمت کرد دەرگاکانی ئاسمان کرانەوە و پریسکیان دەوەشاند وەك پریسکەی ئاگر، پاشان کە دوعای سێیەمت کرد جبیرل(عليه السلام) لە رووی ئاسمانەوە بۆ سەرمان دابەزی و دەیفەرموو: کێ دەگاتە هانای ئەو گیرخواردووە؟

داوام لە پەروەردگارم کرد کوشتنی بە من بسپێرێت، بزانە ئەی بەندەی خودا، هەر کەس ئەم دوعایەی تۆ لە تەنگانە و ناخۆشی و ناڕەحەتی و دابەزینی بەڵادا بخوێنێت خودا(سبحانه وتعالى) دەرووی لێدەکاتەوە، و یارمەتی دەدات. دەڵێت: بازرگانەکە بە سەلامەتی و بە بازرگانییەکەیەوە هاتەوە بۆ مەدینە و هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە و باسی دوعاکەی بۆ کرد و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: ((خودا(عز وجل) ناوە جوانەکانی خۆی فێرکردووی، ئەو ناوانەی گەر بانگی پێ بکرێت وەڵام دەدرێتەوە و گەر داوای پێبکرێت پێی دەدرێت))

## لە ئادابەکانی دوعا:

ئامادەبوونی دڵە، پێویستە دڵ بێئاگا نەبێت، لە پێغەمبەری خوداوە(صلى الله عليه وسلم) ریوایەتکراوە فەرموویەتی: (٠خودا(سبحانه وتعالى) وەڵامی دوعای بەندەیەك ناداتەوە لە دڵێکی بێئاگاوە بێت))[٦٢]

---

[٦٢] {البخاري ومسلم}.

هــەروەها لــە مەرجــەكانی دوعــا ئەوەیــە خــواردن و خواردنــەوەی حــەڵاڵ بێــت، پێغەمبەر(ﷺ) بە سەعدی فەرموو: ((كەسابەتت پـاك و حـەڵاڵ بكـە دوعـاكانـت وەڵام دەدرێنەوە))[٦٣]

**وتراوە:** دوعا كلیلی پێویستییە و ددانەكانی ئەو كلیلە لوقمەی حەڵاڵە.

**یەحیای كوڕی مەعاز دەیوت:** خودایە، چۆن داوات لێ بكەم و من لـە تـۆ یـاخیم؟ چۆن داوات لێ نەكەم و تۆ بەخشندەی؟

**وتراوە:** موسا(عليه السلام) بە پاڵ پیاوێكدا تێپەڕی دوعای دەكرد و دەپاڕایەوە، موسا(عليه السلام) فەرمووی: خودایە، گەر پێویستی ئەم كەسە بە دەستی من بوایە بۆم جێبەجێ دەكرد، خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ نارد و پێی فەرموو: من لە تۆ بە بـەزەییترم بـۆ ئـەو، بـەڵام داوام لێدەكات و مەڕی هەیە و دڵی لای رانەمەڕەكەیەتی، من وەڵامی بەندەیەك نادەمەوە و دڵی لە جێگەیەكی تر بێت، موسا(عليه السلام) ئەوەی بۆ پیاوەكە باس كرد، ئـەویش بـە دڵ خۆی بۆ خودا یەكلاكردەوە و خوداش پێویستییەكەی بۆ جێبەجێ كرد.

**بە جەعفەری صادق (رەحمەتی خودای لــێ بێــت) وتــرا:** بۆچـی دوعـا دەكـەین و وەڵامان نادرێتەوە؟

فەرمووی: چونكە داوا لە كەسێك دەكەن نایناسن.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خـودای لــێ بێــت) دەیــوت:** نەخۆشییەك لە یەعقوبی كوڕی لەیس بەدەركەوت هەموو پزیشكەكان لێی دەستەوسان بوون، پێی وترا: لە ویلایەتەكەی تۆدا پیاوچاكێك هەیە ناوی سەهلی كوڕی عەبدوڵایە، گەر ئەو دوعات بۆ بكات بەڵكو خودا(سبحانه وتعالى) وەڵامی دوعاكەی بداتەوە، سەهلی ئامادە كرد و پێی وت: داوا لە خودا(عز وجل) بكە بۆم، سەهل وتی: چۆن خودا دوعای من بۆ تۆ وەڵام دەداتەوە لە بەندیخانەكانی تۆدا كۆمەڵێك خەڵكی بێتاوان هەن؟! ئەویش هـەموو بەندییەكانی بەرەڵا كـرد، سـەهل فـەرمووی: خودایـە، وەك چـۆن زەلیلـی یاخیبوونـت نیشاندا عیززەتی گوێڕایەڵی نیشان بدەی و خەم و پەژارەی بڕەوێنی، خودا شـیفای بـۆ

---

[٦٣] {البخاري، وأحمد في مسنده}.

نارد، ئەویش ماڵێکی زۆری خستە بەردەمی سەهل بەڵام هیچی وەرنەگرت، پێی وترا: وەرتبگرتبایە بەسەر هەژاراندا دابەشت بکردبایە باشتر بوو، سەهل تەماشای لم و چەوی سارای کرد هەمووی زێڕ و جەوهەرات بوو، بە هاوەڵانی خۆی وت: کەسێك نموونەی ئەمەی پێ بدرێت لە کوێ ئاتاجە بە ماڵی یەعقوبی کوڕی لەیس؟!

**وتراوە "صالح المري" زۆرجار دەیوت:** هەر کەس ئالوودەی لێدانی دەرگاکەی ببێت دەرگاکەی بەزوویی بۆ دەکرێتەوە، رابیعە پێی وت: تا کەی تۆ ئەمە دەڵێی؟ کەی ئەو دەرگایە داخراوە تا لێی بدرێت بۆ ئەوەی بکرێتەوە؟ صالح وتی: شێخێك نەیزانی و ئافرەتێك زانی.

**"السري" دەڵێت:** ئامادەی دانیشتنێکی مەعرووفی کەرخی بووم، پیاوێك راستبوویەوە وتی: باوکی مەحفوز، داوا لە خودا بکە کیسە پارەکەم بۆ بگێڕێتەوە، دزراوە و هەزار دیناری تێدایە، مەعرووف بێدەنگ بوو، ئەویش دووبارەی کردەوە، ئەو هەر بێدەنگ بوو ئەویش سێبارەی کردەوە، مەعرووف وتی: چی بڵێم؟ بڵێم: ئەوەی لە پێغەمبەران و هەڵبژاردەکانی خۆت گرتووتەتەوە بیگێڕەوە بۆ ئەم پیاوە، پیاوەکە وتی: داوا لە خودای موتەعال بکە بۆم، ئەویش وتی: خودایە خۆت کامەیان باشە ئەوەی بۆ بکەی.

**لە لەیسەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: "عقبة بن نافع"**م بە کوێری بینی، پاشان بینیمەوە چاوی ساغ بوو، پرسیم: بە چی چاوەکانت بۆ گەڕایەوە؟ وتی: لە خەوندا کەسێك هاتە لام وتی: بڵێ: **"یا قریب یا مجیب یا سمیع الدعاء یا لطیفا لما یشاء"** چاوەکانم بۆ بگێڕەرەوە، منیش دوعاکەم خوێند و خودا(ﷻ) چاوەکانی بۆ گێڕامەوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** لە سەرەتای گەڕانەوەم لە "مەرو"ەوە بۆ نیسابوور چاوئێشەم لەگەڵ بوو، چەند رۆژێك بوو خەو نەچووبووە چاوەکانم، بەیانییەکەی وەنەوزمدا و گوێم لە دەنگێك بوو پێی وتم: ئایا خودا بەس نییە بۆ بەندەکەی ﴿**أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ**﴾ الزمر: ٣٦، بەئاگاهاتم و چاوئێشەکەم نەمابوو ئازارەکەم لە کۆڵ بووبوویەوە، لەدوای ئەوە چاوئێشەم تووشنەبووە.

**له محەمەدی کوڕی خوزەیمەوە دەگێڕنەوە وتویەتی:** کاتێك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کۆچی دوایی کرد له ئەسکەندەریە بووم، خەمێکی زۆرم خوارد.. له خەوندا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم بینی لەنجە و لاری دەکرد؟ وتم: باوکی عەبدولاّ ئەمە چ جۆرە ڕۆیشتنێکە؟ وتی: ڕۆیشتنی خزمەتکارێك له "دار السلام"دا، پرسیم: خودا(ﷻ) چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لێمخۆش بوو و تاجێکی لەسەرنام و جووتێك نەعلی زێڕینی پێدام و فەرمووی: ئەی ئەحمەد، ئەمە له پاداشتی ئەوەدا وتت قورئان کەلامی منە، پاشان خودا(ﷻ) فەرمووی: ئەی ئەحمەد بەو دوعانە لەبەرم بپاڕێوە کە لە **"سفيان الثوري"** پێت گەیشت و له خانەی دونیادا پێیان له من دەپاڕایەوە، منیش وتم: **"يا رب، بقدرتك على كل شيء اغفر لي كل شيء ولا تسألني عن شيء"** خودا فەرمووی: ئەی ئەحمەد، ئەوە بەهەشت بچۆ ناویەوە، منیش چوومە ناو بەهەشتەوە.

**وتراوە:** گەنجێك خۆی به پەردەی کەعبەدا هەڵواسی بوو و دەیوت: خودایە، تۆ هاوەڵێکت نییە بچین بۆ لای و وەزیرێکت نییە بەرتیلی پێ بدەین، گەر گوێڕایەڵیت بکەم بە چاکەی تۆیە و حەمد بۆ تۆیە، گەر له تۆ یاخی بم بە نەزانی منە و تۆش بەڵگەت هەیە لەسەرم، خودایە بۆ خاتر جێگیربوونی بەڵگەی خۆت لەسەر من و نەبوونی بەڵگە بەدەستی منەوە لێم خۆش ببە، گوێی له دەنگێك بوو وتی: ئەو گەنجە له ئاگر رزگاری بووە.

**وتراوە:** سوودەکانی دوعا: بریتییە لە دەرخستنی هەژاری لەبەردەم خودادا(ﷻ) ئەگینا پەروەردگار ئەوە ئەنجام دەدات کە خۆی دەیەوێت.

**هەروەها وتراوە:** دوعای خەڵکی بەگشتی بە گوفتارە و دوعای زاهیدان بە کردارە و دوعای عاریفان بە حاڵە.

**وتراوە:** باشترین دوعا ئەوەیە گەردەلوولی دڵتەنگی هەڵیدەکات.

**هەندێك دەڵێن:** گەر داوایەکت له خودا کرد و وەڵامی دایەوە داوای بەهەشت بکە لەوانەیە ئەو ڕۆژە ڕۆژی دوعای تۆ بێت.

**وتراوە:** زمانی سەرەتاییەکان بە دوعا پڕاوە و زمانی گەیشتووەکان(عاریفان بە خودا) لە دوعا لاڵ بووە.

به **"الواسطي" وترا دوعا بكات، وتی:** دەترسم گەر دوعام كرد پێم بوترێت: گەر داوای ئەوە بكەی لەلای ئێمە بە تۆ دراوە ئەوە تۆمەتبارمان دەكەی، گەر داوای ئەوەش بكەی بە تۆ نەدراوە ئەوە خراپ باسی ئێمەت كردووە، گەر رازیش بیت بەو شتانەی لە دێرینەوە بۆت بڕیار دراوە بە تۆی دەبەخشین.

**لە عەبدوڵای كوڕی مەنازیلەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** بۆ ماوەی پەنجا ساڵ دەبێت داوایەكم نەكردووە، نامەوێت هیچ كەسێكیش دوعام بۆ بكات.

**وتراوە:** دوعا پێپلەی گوناهبارانە.

**وتراوە:** دوعا نامە گۆڕینەوەیە، هەتا نامە گۆڕینەوە بوونی هەبێت هێشتا نێوان خۆشی ماوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** گەر گوناهكار گریا ئەوا نامەی بۆ خودا(ﷻ) رەوانە كردووە.

**هەندێكیان دەڵێن:** دوعا وازهێنانە لە گوناه.

**وتراوە:** دوعا زمانی تامەزرۆبوونە بۆ لای خۆشەویست.

**هەروەها وتراوە:** مۆڵەت لە دوعاكردن باشترە بۆ بەندە لە پێبەخشینی.

**"الكتاني" دەڵێت:** خودا(ﷻ) بۆیە زمانی بەندەیەكی باوەڕداری بە داوای لێخۆشبوون كرووەتەوە تاكو دەرگای لێخۆشبوونی لێ بكاتەوە.

**هەروەها وتراوە:** دوعا ئامادەبوونی دڵ پێویست دەكات، پێبەخشینیش خەرجكردن پێویست دەكات، مانەوە لە دەرگاكەدا تەواوترە لە دەركردن بە پێدان.

**هەروەها وتراوە:** دوعا رووبەڕووبەڕووبوونەوەی حەقە(ﷻ) بە زمانی حەیا.

**هەروەها وتراوە:** مەرجی دوعا وەستانە لەگەڵ بڕیارەكانی خودا بە وەسفی رازیبوونەوە.

**وتراوە:** چۆن چاوەڕوانی وەڵامدانەوە دەكەی لە كاتێك بە هەڵە و بێئاگایی رێگەكەت داخستووە؟!

**به هەندێکیان وترا:** دوعام بۆ بکە، وتی: بەسە بێگانەبوونت لەگەڵ خودا یەکێك دەکەی بە ناوەند لە نێوان خۆت و خودا.

**"عبدالرحمن بن أحمد" دەڵێت:** گوێم لە باوکم بوو دەیوت: ئافرەتێك هات بۆ لای **"تقي بن مخلد"** وتی: کوڕەم ڕۆمەکان بە دیلیان گرتووە، جگە لە پارچە زەوییەك هیچ شك نابەم و ناتوانم بیفرۆشم، گەر باسی ئەوە بکەیت یەکێك فیدیەکەی بۆ بدات، چونکە شەو و ڕۆژ خەو و ئارامیم لا هەڵگیراوە.

وتی: باشە تۆ بڕۆ تا لە کارەکەی ورد دەبمەوە بە پشتیوانی خودا.

دەڵێت: ئەویش سەریداخست و هەندێك لێوەکانی بزواند، ماوەیەکمان پێچوو ژنەکە هاتەوە و کوڕەکەی خۆی لەگەڵ بوو، دەستی بە دوعاکردن کرد بۆ **"تقي بن مخلد"** و دەیوت: کوڕەکەم بە سەلامەتی گەڕایەوە، چیرۆکێکی هەیە دەیەوێ بۆت بگێڕێتەوە، گەنجەکە وتی: من لە دەستی هەندێ لە مەلیکەکانی ڕۆمدا بووم لەگەڵ ژمارەیەك دیلی تر، کەسێکی هەبوو هەموو ڕۆژێك ئێمەی بەکاردەهێنا و ئیشی پێ دەکردین، دەیبردین بۆ سارا بۆ کارکردن، پاشان دەیهێنایینەوە و کۆتوزنجیر لە دەست و قاچماندا بوو، ڕۆژێك دوای مەغریب لەگەڵ ئەو پیاوەی چاودێری دەکردین لە کار دەهاتینەوە، کۆتوزنجیرەکە لە قاچ و دەستی من کرایەوە و بەربوویەوە بۆ سەر زەوی، ئەو ڕۆژ و کاتەی وەسف کرد هەمان ڕۆژ و کات بوو کە دایکی هات بۆ لای **"تقي بن مخلد"** و دوعای بۆ کرد، وتی: ئەو کەسەی چاودێری دەکردم هات بۆم و پێی وتم: کۆتوبەندەکەت شکاندووە، وتم: نەخێر، بەڵکو خۆی لە دەست و لاقم بەربوویەوە، ئەویش زۆر سەری سوڕما و هاوەڵانی خۆی بانگ کرد و ئاسنگەریان هێنا و کۆتوبەندیان کردمەوە، دوای ڕۆیشتنی چەند هەنگاوێك دیسان کۆتوبەندەکە لە دەست و لاقم بەربوویەوە، بۆیە لە کارەکەم زۆر سەریان سوڕما، و ڕاهیبەکانی خۆیان بانگ کرد و پێیان وتم: تۆ دایکت هەیە؟ وتم: بەڵێ، وتیان: دوعاکەی لەلای خودا گیرا بووە، خودا(ﷻ) ئازادی کردووی، بۆیە ئێمە ناتوانین کۆتوبەندت بکەین.

خواردن و پێویستی ڕێگەیان پێدام و ڕادەستی کەسێکیان کردم بمگەیەنێتە ناوچەی موسڵمانان.

٣٨

# هەژاری

((بە یەحیای کوڕی مەعاز وترا: هەژاری چییە؟ وتی: ترسی هەژارییە، وترا: ئەی دەوڵەمەندی چییە؟ وتی: ئاسایش بە خوداوە(سبحانه وتعالی)))

خودا(تعالی) دەفەرمویت: ﴿ لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ﴾ البقرة: ٢٧٣

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:** ((هەژاران بە پێنج سەد ساڵ(نیو ڕۆژ) بەر لە دەوڵەمەندان دەچنە بەهەشتەوە))

**لە عەبدوڵاوە(خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:** ((گەدا(المسکین) ئەو کەسە نییە دەگەڕێ بەسەر ماڵاندا و لوقمەیە دوان یان دەنکە خورمایەك یان دوو دەنکە خورمای دەست دەکەوێت، وترا: گەدا کێیە ئەی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم)؟

فەرمووی: ئەو کەسەیە شتێکی نییە بێنیازی بکات و شەرم دەکات داوا لە خەڵکی بکات، پێشی نازانن خێری پێ بکەن))[٦٤]

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** مانای فەرموودەکە: "شەرم دەکات داوا لە خەڵکی بکات" واتە لە خودا(سبحانه وتعالی) شەرم دەکات داوا لە خەڵکی بکات، نەك لە خەڵکی شەرم بکات.

[٦٤] {ریاض الصالحین للنووي}.

هەژاری دروشمی دۆستانی خودایە و پۆشاکی پاڵفتەکراوان و هەڵبـژاردەی حەقـە(ﷻ) بۆ تایبەتمەندان لە خۆپارێزان و پێغەمبەران(**علیهم الصلاة والسلام**).

هەژاران دەستەی هەڵبژاردەی خودان لەناو بەندەکانیدا و خەزنەی نهێنییەکانن لـەناو دروستکراوەکانیدا، خودا(ﷻ) بەوان پارێزگاری لە خەڵکی دەکات و بە بەرەکەتی ئەوان دەرگای ڕۆزیان لێدەکاتەوە.

هــەژارانی ئــارامگر ئــەهلی مەجلیســی خــودان لــە ڕۆژی دواییــدا، لــەو بارەیــەوە ڕیوایەتێك لە پێغەمبەری خـوداوە(ﷺ) دەگێڕنـەوە: لـە ئـیبن عومـەرەوە لـە عومـەری کوڕی خەتابەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) فـەرمووی: **پێغەمبەری خودا**(ﷺ) **فـەرمووی:** ((هەموو شتێك کلیلێکی هەیە، کلیلی بەهەشت خۆشەویسـتی هـەژاران و گەدایانـە، هەژارانی ئارامگر ئەهلی مەجلیسی خودان لە ڕۆژی دواییدا))

**وتراوە** پیاوێك دە هەزار درهەمی هێنا بـۆ ئیبراهیمـی کـوڕی ئەدهـەم ئـەویش لێـی وەرنەگرت و پێی وت: دەتەوێ بە دە هەزار درهەم ناوم لە دیوانی هەژاراندا بسڕییەوە، کاری لەو جۆرە ناکەم..

**"معاذ النسفي" دەڵێت:** خودا گەل و نەتەوەیەك بە کار و کردەوەکانیان تیانابات تا سووکایەتی بە هەژاران دەکەن و زەلیلیان دەکەن.

**هەروەها وتراوە:** گەر ویست و ئاواتی هەژاران تەنها فراوانبوونی ڕۆزی موسڵمانان و دابەزینی نرخ بێت ئەوەیان بەسە، چونکە هەژار ئاتاجە بە کڕین و دەوڵەمەنـد ئاتاجـە بە فرۆشتن، ئەمە بۆ ڕەشۆکییەکانە لە هەژاران، ئەی دەبێ بۆ تایبەتکراوان لە هەژاران چۆن بێت؟!

**پرسیار لە یەحیای کوڕی مەعاز کرا دەربارەی هەژاری، وتی:** ڕاستەقینەی هەژاری بریتییە لەوەی بەندە تەنها بە خوداوە بێنیاز بێت، نەرێتەکەشـی نـەبوونی هـیچ جـۆرە هۆکارێکە.

**ئیبراهیمی قەصار دەڵێـت:** هـەژاری پۆشـاکێکە ڕازیبـوون بەرهـەم دەهێنێـت گـەر بەندەی تێدا قووڵ بوویەوە.

ساڵی سێسەد و نەوەد و چوار یان پێنج لە "زوزن"ەوە هەژارێك هات بۆ لای مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(رەحمەتی خودای لێ بێت)، تەنها پۆشاکێك و مێزەرێکی بە سەرەوە بوو، هاوەڵانی بۆ شۆخی پێیان دەوت: ئەم پۆشاك و مێزەرەت بە چەند کڕیوە، ئەویش وتی: ((بە هەموو دونیا کڕیومە، خەڵکی وتیان بە هەموو دوارۆژ پێمان بفرۆشە وتم نایفرۆشم)).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** هەژارێك لە مەجلیسێك هەستایە سەرپێی و داوای شتێکی کرد و وتی: من سێ ڕۆژە برسیمە، هەندێ لە گەورە پیاوان لەو جێگەبوون هاواریان لێ کرد و پێیان وت: درۆ دەکەی، هەژاری نهێنی خودایە و ئەو نهێنییە لای کەسێك دانانێت هەڵیبگرێت و بیبات بۆ لای کەسانی تر.

**"حمدون القصار" دەڵێت:** کاتێك ئیبلیس و سەربازەکانی کۆدەبنەوە بە هیچ شتێك دڵخۆش نابن وەك دڵخۆشبوونیان **بە سێ شت:** پیاوێکی باوەڕدار باوەڕدارێك بکوژێت، و پیاوێك لەسەر بێباوەڕی بمرێت، و دڵێك ترسی هەژاری تێدا بێت.

**جونەید دەڵێت:** ((ئەی کۆمەڵی هەژاران، ئێوە بە خوداوە ناسراون و لەبەر خودا ڕێزتان لێ دەگیرێت، تەماشا بکەن چۆنن لەگەڵ خودا کاتێك لەگەڵی تەنها دەکەونەوە)).

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی هەژاری بۆ لای خودا**(ﷻ): ئایا ئەوە تەواوترە یان بێنیازبوون بە خوداوە؟ لە وەڵامدا وتی: گەر هەژاری بۆ لای خودا دروست بێت ئەوا بێنیازبوون بۆ لای خودا دروست دەبێت، گەر بێنیازبوون بە خوداوە دروست بێت دەوڵەمەندبوون بە خوداوە کامڵ دەبێت، بۆیە ناوترێت: کامیان تەواوترە هەژاری بۆ لای خودا یان دەوڵەمەندی بە خوداوە، چونکە دوو حاڵەتن تەواویی یەکێکیان بەویتریانەوەیە.

**پرسیار لە ڕوەیم کرا دەربارەی سیفەتی کەسی هەژار؟ وتی:** "بەردانی نەفسە لەناو حوکمەکانی خودادا(ﷻ)"

**وتراوە سیفەتی هەژار سێ شتە:** پارێزگاری پەنهانی و جێبەجێ کردنی فەرزەکانی و شاردنەوەی هەژارییەکەی.

**وتــرا** بــه ئــه‌بی ســه‌عیدی خــه‌راز: بــۆ نــاز و نیعمــه‌تی ده‌وڵه‌مه‌نــدان لــه هــه‌ژاران دواده‌که‌وێت؟ وتی: به هۆی سێ شته‌وه:

چــونکه ئــه‌وه‌ی لــه‌ناو ده‌ســتی ده‌وڵه‌مه‌ندانــه پــاك و حــه‌ڵاڵ نییــه و ده‌وڵه‌مه‌نــدان کۆمه‌کنه‌کراون، هه‌روه‌ها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ژاران ئه‌هلی به‌ڵا و ناخۆشین.

**وتراوه خودا** (ﷻ) **وه‌حی نارد بۆ موسا** (عليه السلام) **و پێی فه‌رموو:** کاتێــك بــه هــه‌ژاران گه‌یشتی گفتوگۆیــان له‌گــه‌ڵ بکــه و هــه‌واڵیان بپرســه وه‌ك چــۆن له‌گــه‌ڵ ده‌وڵه‌مه‌نــدان ئه‌نجامی ده‌ده‌ی، گه‌ر ئه‌و کاره ئه‌نجام نه‌ده‌ی هه‌موو ئــه‌وه‌ی فێــرم کــردووی بیخــه ژێــر خاکه‌وه.

**له "أبي الــدرداء"ه‌وه (خودا لێی رازی بێــت) ده‌گێڕنــه‌وه فه‌رموویــه‌تی:** گــه‌ر لــه کۆشکێك بــه‌ر ببمــه‌وه و هــه‌موو جه‌ســته‌م تێکبشــکێت لام خۆشــتره لــه دانیشــتن لای ده‌وڵه‌مه‌ندان، چونکه گــوێم لــه پێغه‌مبــه‌ری خــودا (ﷺ) بــوو ده‌یفــه‌رموو: ((ئاگــاداری دانیشــتنی مردووه‌کــان بــن، وتــرا: ئــه‌ی پێغه‌مبــه‌ری خــودا (ﷺ) مردووه‌کــان کــێن؟ فه‌رمووی: ده‌وڵه‌مه‌ندان))

**وترا به (ربيع کوری الخثيم):** نرخی شــتومه‌ك و خــۆراك بــه‌رز بووه‌تــه‌وه، ئــه‌ویش وتی: ئێمه سووکترین له‌وه‌ی خودا برسیمان بکات، خودا دۆستانی خۆی برسی ده‌کات.

**ئیبراهیمی کوڕی ئه‌ده‌هه‌م ده‌ڵێت:** داوای هه‌ژاریمان له خــودا کــرد خــودا رووبــه‌ڕووی ده‌وڵه‌مه‌ندی کردینه‌وه، به‌ڵام خه‌ڵکی داوای ده‌وڵه‌مه‌ندیان لێکرد رووبــه‌ڕووی هــه‌ژاری بوونه‌وه.

**به یه‌حیای کوڕی مه‌عاز وترا: هه‌ژاری چییه؟** وتی: ترسانه له هه‌ژاری.

وترا: ئه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ندی چییه؟ وتی: ئاسایشه به خوداوه.

**ئیبن کــوره‌ینی ده‌ڵێــت:** هــه‌ژاری راســتگۆ خــۆی لــه ده‌وڵه‌مه‌نــد بــه‌دوور ده‌گرێــت، چــونکه ده‌ترســێت ده‌وڵه‌مه‌نــدی رووی لــێ بکــات و هه‌ژارییه‌کــه‌ی لــێ تێکبــدات، هــــه‌روه‌ك چــۆن که‌ســـی ده‌وڵه‌مه‌نـــد خـــۆی لـــه هـــه‌ژار ده‌پارێزێـــت و ده‌ترســـێت ده‌وڵه‌مه‌ندییه‌که‌ی لێ تێکبدات.

**پرسیار لە ئەبو حەفص کرا:** هەژار چی هەیە پێشکەش بە پەروەردگاری بکات؟

وتی: جا هەژار چی تری هەیە پێشکەش بە پەروەردگاری بکات جگە لە هەژارییەکەی؟

**وتراوە:** خودا(ﷻ) وەحی بۆ موسا(ﷺ) نارد و پێی فەرموو: لە رۆژی دواییدا دەتەوێ چاکانت بە ئەندازەی چاکەی هەموو مرۆڤەکان بێت؟

فەرمووی: بەڵێ.

فەرمووی: سەردانی نەخۆش بکە و جلی هەژاران بدوورەوە، موسا(ﷺ) لە هەر مانگێکدا حەوت رۆژی دانا بەسەر هەژاراندا دەسوڕایەوە و جل و پۆشاکەکانی دەدوورینەوە و سەردانی نەخۆشی دەکرد.

## سەهلی کوڕی عەبدولا دەڵێت: پێنج شت لە جەوهەری نەفسن:

١. هەژارێك دەوڵەمەندنی نیشان بدات.

٢. برسییەك تێری نیشان بدات.

٣. دڵتەنگێك خۆشی نیشان بدات.

٤. پیاوێك دوژمنایەتی لەگەڵ پیاوێکی تر هەیە خۆشەویستی بۆ نیشان بدات.

٥. پیاوێك رۆژ بەڕۆژوو دەبێت و شەو شەونوێژ دەکات و لاوازی ناخاتە دەرەوە بۆ خەڵکی.

**بیشری کوڕی حافی دەڵێت:** باشترینی مەقامەکان دامەزرانە لەسەر هەژاری تا دەرگای گۆڕ.

**"ذو النون" دەڵێت:** نیشانەی تووڕەیی خودا لەسەر بەندەیەك ترسی بەندەکەیە لە هەژاری.

**شیبلی دەڵێت:** کەمترین نیشانەی هەژاری ئەوەیە گەر یەکێك لەوان هەموو دونیای پێبدرێت لەو رۆژەدا دەیبەخشێت، پاشان بەبیریدا دێت گەر شتێکم لابخستبایە لە هەژارییەکەمدا راستگۆ دەرنەدەچووم.

**گوێم له مامۆستا ئەبو عـەلی دەقـاق بـوو دەیـوت:** خـەڵکی لەسـەر هـەژاری و دەوڵەمەندیان قسەیان کرد و وتیان: کامیان باشترە؟

لـەلای مـن: پیاوێـك ئەوەنـدەی بەشـی دەکـات پێیبـدرێت و پاشـان لـەناو ئـەوەدا پارێزگاری لیّ بکرێت.

**ئیبن جەلا پرسیاری لێکرا** دەربارەی هەژاری بێدەنگ بوو تا دەوروبـەری چـۆڵ بـوو، پاشان ڕۆیشت و زوو گەڕایەوە و وتی: نزیکەی درهـەمێك پـارە لـە ماڵـدا بـوو بۆیـە شەرمم کرد لە خودا(ﷻ) قسە دەربارەی هەژاری بکەم، بۆیە ڕۆیشـتم و دەرمکـرد لـە ماڵەکەم، پاشان دانیشت و دەربارەی هەژاری قسەی کرد.

**"إبراهيم بن المولد" دەڵێت:** پرسیارم کرد لە ئـیبن جـەلا دەربـارەی هـەژاری: کـەی هەژار شایستە دەبێت بە ناوی هەژار؟

وتی: گەر کەمترین هەژاری لەسەر نەمابێت.

وتم: ئەوە چۆن دەبێت؟

وتی: گەر هەژاری هەبێت هەژار نییە، گەر هەژاری نەما هەژارە.

**وتراوە:** دروستی هەژاری: ئەوەیە هەژارەکە بە هیچ شتێك بێنیـاز نـەبێت جگـە لـەو کەسەی هەژارییەکەی بۆ لای ئەوە.

**عەبدوڵای کوڕی موبارەك دەڵێت:** دەرخستنی دەوڵەمەندی لە هەژاریدا لە هـەژاری باڵاترە.

**بەنانی مصری دەڵێت:** لە مەککە دانیشتبووم گەنجێك لەبەردەمم دانیشتبوو، کەسێك هات بۆ لای و کیسەیەك درهەمی خستە بەردەمی، ئەویش وتی: پێویستم پێی نییـە، وتی: دابەشی بکە بەسەر هەژاراندا، کاتێك دونیا تاریك داهات بینیم لە دۆڵێکی شاری مەککە داوای شتێکی دەکرد بۆ خۆی بیخوات(واتە هەمووی بەخشی بوو).

پێم وت: بۆ شتێکت بۆ خۆت هەڵنەگرت لەوەی لەلات بوو؟ وتی: نـەمزانی تـا ئـەم کاتە دەژیم..

**ئەبو حەفص دەڵێت:** باشترین شتێك بەندە بیکات بە وەسیلە بۆ لای مەولای خۆی(ﷻ) بریتییە لە بەردەوامی هەژاری بۆ لای خودا لە هەموو بارێکدا و پەیوەستبوون بە سونەتەوە لە هەموو کارێکدا و داوای خۆراك لە رێگەی حەڵاڵەوە.

**مورتەعیش دەڵێت:** پێویستە هەژار خەم و پەژارەی پێش هەنگاوەکانی نەکەوێت.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت: چوار کەس نموونەی سەردەمی خۆیان بوون:**

**یەکێك** نە لە براکانی و نە لە دەسەڵات هیچ شتێکی وەرنەدەگرت ئەو کەسەش یوسفی کوڕی ئەسبات بوو، لە باوکییەوە حەفتا هەزار درهەمی بە میرات بۆ بەجێما هیچی وەرنەگرت و رازیبوون بە کەم بوو بە کاڵای باڵای.

**یەکێکی تر** لە برایان و لە دەسەڵاتدارانی وەردەگرت ئەو کەسەش "أبو إسحاق الفزازي" بوو، لە برایانی وەردەگرت و دەیدا بەو برایانەی کەس بە هەژارییەکەیان نازانێت، ئەوەش لە دەسەڵاتدارانی وەردەگرت دابەشی دەکرد بەسەر خەڵکی "طرسوس"دا.

**سێیەم:** لە برایان وەریدەگرت بەڵام لە دەسەڵاتدارانی وەرنەدەگرت ئەو کەسەش عەبدوڵای کوڕی موبارەك بوو، لە براکانی وەردەگرت و لەسەری پاداشتی دەدایەوە.

**چوارەم:** لە دەسەڵاتدرانی وەردەگرت، بەڵام لە برایانی وەرنەدەگرت ئەو کەسە "**مخلد بن الحسين**" بوو، دەیوت: دەسەڵاتداران منەت ناکەن، بەڵام براکان منەت دەکەن.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت: لە ریوایەتێکدا هاتووە:**

((هەر کەس بۆ دەوڵەمەندێك لە پێناوی دەوڵەمەندییەکەیدا تەوازوع بنوێنێت دوو سێیەکی دینەکەی دەڕوات.

ئەوەش چونکە مرۆڤ دڵ و زمان و نەفسە، گەر بە نەفس و زمانی تەوازوعی بۆ دەوڵەمەند نواند دوو سێیەکی دینەکەی لەدەستداوە، گەر بە دڵیش باوەڕی بە گەورەیی دەوڵەمەندەکە بێت وەك چۆن بە زمان و نەفسی تەوازوعی بۆ نواند ئەوا هەموو دینەکەی دەڕوات.

**وتراوە: کەمترین شتێك پێویستە هەژار پێیەوە پابەند بێت چوار شتە:**

١. زانستێك بەڕێوەی ببات.

٢. وەرعێك بیگرێتەوە.

٣. یەقینێك هەڵیبگرێت.

٤. یادێك هۆگری بۆ دروست بکات.

**وتراوە:** هەر کەس هەژاری بۆ ئەوە بێت نـاو و ناوبـانگی پـێ بەدەسـت بهێنێـت بـە هەژاری سەردەنێتەوە، هەر کەسیش هەژاری بوێت بۆ ئەوەی بە شتێکی ترەوە جگە لە خودا خەریك نەبێت بە دەوڵەمەندی سەردەنێتەوە.

**"المزین" دەڵێت:** ڕێگەی گەیشتن بە خودا لە ژمارەی ئەستێرەکان زۆرتـر بـوون، لـە هەموو ئەو ڕێگانە تەنها ڕێگەی هەژاری ماوەتەوە و هەر ئەوەش دروستترین ڕێگەیە.

**"النوری" دەڵێت:** سیفەتی هەژار سکون و خامۆشییە لە باری نەبووندا و بەخشینە لە باری بووندا.

**پرسیار کرا لە شیبلی دەربارەی راستێتی هـەژاری وتـی:** ئەوەیـە بەنـدە بـە هـیچ شتێکی تر جگە لە خودا(ﷻ) بێنیاز نەبێت.

**مەنصوری کوڕی خەلەفی مەغریبی دەڵێت: "أبو سهل الخشاب الکـبیر"** پێـی وتم: هەژاری بریتییە لە هـەژاری و زەلیلی(بـۆ خـودا)، وتم: نـەخێر هـەژاری و عیززەت(بـە خـوداوە)، وتـی: هـەژاری و خاکوخۆڵ(تـەوازوع)، وتم: نـەخێر هـەژاری و عەرشـی مەزن(بەرزبوونەوە).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت: دەربارەی مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ):** ((هەژاری لە بێباوەڕی نزیك دەبێتەوە)) پرسیارم لێکـرا وتم: ئافـەتی شتێك و دژەکەی بەپێی چاکەکەی و ڕێزەکەیەتی، هەتا لە نەفسیدا باشتر بێت دژەکەی و ئافەتەکەی کەمتر دەبێـت، وەك ئیمـان، لەبـەر ئـەوەی بـاڵاترین خەسـڵەتە دژەکـەی بریتییە لە بێباوەڕی، لەبەر ئەوەی ترسی هەژاری بریتییە لە بێباوەڕی بە خودا بەڵگەی ئەوەیە باڵاترین وەسفی هەیە.

**مورتەعیش دەڵێت: جونەید وتی:** گەر بە هەژارێك گەیشتی بە نەرمونیانی پێشوازی لێ بکە، بە زانست رووبەڕووی مەبەرەوە، چونکە نەرمونیانی هۆگری بۆ دروست دەکات و زانست وەحشەتی پێ دەدات، پێم وت: ئەی باوکی قاسم ئایا زانست وەحشەت بۆ هەژار دروست دەکات؟

وتی: بەڵێ، هەژار گەر لە هەژارییەکەیدا راستگۆ بێت و تۆش زانستی خۆتی بەسەردا دابارێنیت وەك چۆن قورقوشم لە ئاگردا دەتوێتەوە ئاوا دەتوێتەوە.

**"مظفر القرمسيني" دەڵێت:** هەژار ئەو کەسەیە پێویستییەکی نییە بۆ لای خودا.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** ئەم قسەیە تەمومژاوییە، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی بەبێئاگایی دەیبیستن، خاوەنی ئەم قسەیە ئاماژە دەکات بە کۆتاهاتنی داوا و نەمانی هەڵبژاردن و رازیبوون بەوەی خودا بڕیاری لێ دەدات.

**ئیبن خەفیف دەڵێت:** هەژاری بریتییە لە نەبوونی موڵکداری و دەرچوون لە بڕیاری سیفەتەکان.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** هەژاری بۆ کەسێك دروست نابێت تا بەخشین لەلای خۆشەویستتر نەبێت لە وەرگرتن، سەخاوەت ئەوە نییە کەسی هەبوو بە نەبوو ببەخشێت، بەڵکو سەخاوەت ئەوەیە نەبوو بە هەبوو ببەخشێت.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** گەر گەورەیی تەوازوع نەبوایە بۆ خودا ئەوا کاتێك بە رێگەدا کەسی هەژار دەڕۆیشت بۆی هەبوو لەنجە و لار بکات(واتە فەخر بە خۆیەوە بکات)

**یوسفی کوڕی ئەسبات دەڵێت:** ماوەی چل ساڵە نەبووم بە خاوەنی دوو کراس.

**یەکێکیان دەڵێت:** لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی قیامەت هەستابێت، **وترا:** مالیکی کوڕی دینار و محەمەدی کوڕی واسع ببەن بۆ بەهەشت، تەماشام کرد بزانم کامیان پێشدەکەوێت، محەمەدی کوڕی واسع پێشکەوت، پرسیاری هۆی پێشکەوتنەکەیم کرد، پێم وترا: ئەو یەك کراسی هەبوو مالیك دوو کراسی هەبوو.

**"محمد بن الموحي" دەڵێت:** هەژار ئەو کەسەیە شتێك لە پێویستی خۆی لە هۆکارەکانەوە نابینێت.

**پرسیار لە سەهلی کوڕی عەبدولاّ کرا:** کەی هەژار پشوو دەدات؟

وتی: گەر تەنها ئەو کاتە ببینێت کە ئەو تێیدایە(واتە لە ئێستادا بژی و خەم و پەژارەی رابردوو و داهاتوو لە خۆی بکاتەوە))

**لە لای یەحیای کوڕی موعاز باسی هەژاری و دەوڵەمەندی کرا، وتی:** سبەینێ هەژاری و دەوڵەمەندی ناپێورێن، بەڵکو ئارامگرتن و شوکرکردن دەپێورێن، بۆیە دەوترێت: پاداشتی شوکر و ئارامگرتنەکەی بدرێتەوە.

**وتراوە خودا(ﷻ) وەحی نارد بۆ یەکێك لە پێغەمبەرانی(ﷺ) و پێی فەرموو:** گەر دەتەوێ بزانی رازیبوونی من لە تۆ چۆنە تەماشا بکە بزانە رازیبوونی هەژاران لە تۆ چۆنە.

**ئەبوبەکری زەقاق دەڵێت:** هەر کەس تەقوا لەگەڵ هەژارییەکەیدا نەبێت حەرامی رووت دەخوات.

**وتراوە:** هەژاران لە مەجلیسی سوفیانی سەوریدا دەتوت ئەمیرەکانن.

**ئەبوبەکری کوڕی تاهیر دەڵێت:** لە حوکمەکانی هەژار ئەوەیە حەزی لە دونیا نەمێنێت، گەر هەر دەبێت ببێت ئەوا حەزەکەی تەنها ئەوەندە بێت بەشی بکات.

**پرسیار لە ئەبویەکری مصری کرا** دەربارەی هەژاری راستگۆ وتی: ئەو کەسەیە هیچی نییە و مەیلیشی نییە.

**"ذو النون" دەڵێت:** بەردەوامی هەژاری بۆ لای خودا(ﷻ) لەگەڵ تێکەڵ کردن لەلام خۆشەویستترە لە بەردەوامی سەفا لەگەڵ خۆپەسەندی.

**"أبو عبدالله الحصري" دەڵێت:** ئەبو جەعفەری حەداد ماوەی بیست ساڵ هەموو رۆژێك بە دینارێك کاری دەکرد و بۆ هەژارانی خەرج دەکرد و بەڕۆژوو بوو، لە نێوان مەغریب و عیشادا دەڕۆیشتە دەرەوە و تەقەی لە دەرگای ماڵی هەژاران دەدا و دابەشی دەکرد.

**"النوری" دەڵێت:** وەسفی هەژار سوکنایی و ئارامییە لە باری نەبووندا و بەخشین و پێشخستنی کەسانی تر لەباری هەبووندا.

**"محمد بن علي الكتاني" دەڵێت:** لە مەککە گەنجێکمان لەگەڵ بوو پۆشاکی پوواو و رزیوی لەبەر بوو، نەدەهاتە ناومانەوە و لەگەڵمان دانەدەنیشت، خۆشەویستی ئەو گەنجە چووە ناو دڵمەوە، سەد درهەمم لە رێگەیەکی حەڵاڵەوە پێگەیشت و بۆم برد و لە لایەکی بەرماڵەکەیدا بۆم دانا و پێم وت: ئەمە لە روویەکی حەڵاڵەوە بەدەستم گەیشتووە لە هەندێ کار و پێویستی خۆتدا خەرجی بکە، بە چاوێکی بێزەوە تەماشای کردم، پاشان ئەوەی لە من شاراوە بوو دەریخست و وتی: ئەم دانیشتنەم لەگەڵ خودا(ﷻ) بە حەفتا هەزار دیناری حەڵاڵ کڕیوە دەتەوێ بمخەڵەتێنی و بەوەی هێناوتە لەدەستی بدەم، هەستا و فڕێیدا و پەرشوبڵاوی کردنەوە، هیچ خاوەن عیززەتێکم نەبینیوە وەك عیززەتی ئەو گەنجە کاتێك گوزەری کرد و هیچ زەلیلێکم نەبینیوە وەك زەلیلی خۆم کاتێك پارەکەم کۆدەکردەوە.

**ئەبو عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** ماوەی چل ساڵ نەمبوو زەکاتی سەرفیترە بدەم لە کاتێکدا لای تایبەتمەندان و لای خەڵکی بەگشتی جێگەی قبووڵ بووم.

**"أحمد الصغير" دەڵێت:** پرسیارم کرد لە عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەربارەی هەژارێك سێ رۆژ برسی دەبێت و دوای سێ رۆژ دەچێتە دەرەوە و بە ئەندازەی پێویستی خۆی شتێك داوا دەکات بەو کەسە چی دەوترێت؟

وتی: پێی دەوترێت هەژارکەوتووە دوای دەوڵەمەندییەکەی، بخۆن و بێدەنگ بن گەر هەژارێك لەو دەرگاوە بێتە ژوورەوە هەمووتان رسوا دەکات.

**پرسیار لە "الدقي" کرا** دەربارەی کەم ئەدەبی هەژاران لەگەڵ خودا(ﷻ) لە باری حاڵەکانیاندا وتی: ئەوە بریتییە لە بەربوونەوەیان لە حەقیقەتەوە بۆ زانست.

**"خير النساج" دەڵێت:** چوومە مزگەوتێکەوە هەژارێکی تێدا بوو، کاتێك منی بینی خۆی بە مندا هەڵواسی و وتی: گەورەم بەزەییەکت هەبێت بەرامبەرم تاقیکردنەوەکەی من زۆر گەورەیە.

وتم: تاقیکردنەوەکەی تۆ چییە؟

وتی: بەڵا و ناخۆشیم لەدەستداوە و لەسەر خۆشی و لەشساغی بەهێزبووم، تەماشام کرد شتێك لە دونیای بەڕوودا کرابوویەوە.

**"أبوبكر الوراق" دەڵێت:** پیرۆز بێت لە هەژاران لە دونیا و دوارۆژدا.

**لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرد وتی:** لە دونیادا سوڵتان داوای باج و سەرانەیان لێ ناکات لە رۆژی دواییشدا خودا لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکات.

٣٩

# تەصەوف

**(("الكنائي" دەڵێت: هەرکەس ئەخلاقی لە تۆ زۆرتر و باشتر بوو ئەوا سەفا و پاکێتی لە تۆ زیاتر و باشترە))**

سەفا(**الصفاء**-رۆشنی و پاڵفتەبوون) بە هەموو زمانێك پەسەندە و دژەکەی بریتییە لە لێڵی و ناڕوونی و سیفەتێکی ناپەسەندە.

**لە "أبي جحيفة"**ەوە**(خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت:** پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان رەنگی گۆڕابوو و فەرمووی: ((سەفای دونیا رۆیشت و لێڵی و ناڕوونی ماوەتەوە، مردن لە ئەمڕۆدا هەدیەی هەموو موسڵمانێکە))

**پاشان ئەم ناوە(الصفاء) بەسەر ئەم دەستەیەدا(صوفي) بڕا و دەوترێت:**

(**رجل صوفي**-پیاوێکی خاوەن سەفا و رۆشنی)، بە دەستەکەشیان دەوترێت: (**صوفية**)، هەر کەسیش دەگاتە ئەو سەفایە پێی دەوترێت: (متصوف)، دەستەکەشیان پێی دەوترێت (**المتصوفة**).

لە زمانی عەرەبیدا بۆ ئەم ناوە بەڵگەی پێوانە و داتاشین بوونی نییە، راستتر وایە ئەم ناوە وەك نازناو(لقب) وایە، قسەی ئەو کەسەش کە دەڵێت: لە (الصوف-خوری)ەوە هاتووە: لەبەر ئەوەی دەوترێت: (تصوف) کاتێك "صوف-خوری" لەبەر بکات، وەك چۆن دەوترێت: "تقمص" کاتێك "قميص-کراس" لەبەر بکات، ئەمەش روویەکی ترە، بەڵام ئەم دەستەیە تایبەت نەکراونەتەوە بە پۆشینی خووری.

هەر کەسیش دەڵێت لە ئەهلی **"صفة"**ی مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە پێی دەڵێین: دانەپاڵی **"صفة"** ناوی **"صوفي"** لێ داناتاشرێت..

ئەو کەسەش دەڵێت لە **"الصفاء"**ەوە وەرگیراوە دەڵێین: داتاشینی **"الصوفي"** لە **"الصفاء"** بەپێی زمان کارێکی دوور و نادروستە.

قسەی ئەوانەش کە پێیان وایە لە "الصف-ریز" وەرگیراوە وەك ئەوەی بە دڵیان لە ریزی یەکەمدا بن ماناکەی دروستە، بەڵام زمان ئەو داتاشینە لە "الصف" وەرناگرێت.

پاشان ئەم دەستەیە بەناوبانگترن لەوەی لە دیاریکردنیاندا پێویست بە پێوانەی وشە و داتاشینی شایستە بکات.

خەڵکی دەربارەی "تصوف" قسەی زۆریان کردووە و وتویانە ماناکەی چییە؟ و بە کێ دەوترێت **"صوفي"**؟

هەریەك گوزارشتی لە وشەکە کردووە بەو جۆرەی بۆی هاتووەتە پێش، کۆکردنەوەی هەموو گوزارشتەکان دەمانگەیەنێتە مەرامێکی پوخت.

## لێرەدا بە پشتیوانی خودا هەندێ لە ئاماژەی قسەکانیان دەخەینە روو:

**پرسیار لە ئەبو محەمەدی جەریری کرا دەربارەی تەصوف وتی:** بریتییە لە چوونە ناو هەرچی ئەخلاقی سونیانەیە و دەرچوونی لە هەرچی ئەخلاقی نزمە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی تەصەوف وتی:** ئەوەیە حەق(ﷻ) لە سیفەتەکانی خۆت بتمرێنێت(دەرتبهێنێت) و بە خۆیەوە زیندووت بکاتەوە.

**پرسیار لە حوسەینی کوڕی مەنصوور کرا دەربارەی تەصەوف وتی:** زاتێکی (کەسێکی) تاکوتەنهایە کەس قبووڵی ناکات و کەس قبووڵ ناکات(واتە کەسی صۆفی بەو جۆرەیە، وەك ئەوەی بڵێت خۆی بۆ خودا یەکلاکردووەتەوە).

**ئەبو حەمزەی بەغدادی دەڵێت:** نیشانەی سۆفی راستگۆ: ئەوەیە لە دوای دەوڵەمەندبوون هەژاری هەڵبژێرێت و لە دوای عیززەت زەلیلی دەست بۆ ببات و

لەدوای ناوبانگ خۆی بشارێتەوە، نیشانەی سۆفی درۆزنیش ئەوەیە: لە دوای هەژاری بە دونیا بێنیاز بێت و لە دوای زەلیلی ببێت بە خاوەنی عیززەت و لە دوای بێناوی ناوبانگ پەیدا بکات.

**پرسیار لە عەمری کوڕی عوسمانی مەکی کرا دەربارەی تەصوف وتی:** ئەوەیە بەندە لە هەموو کاتێکدا لەپێشترین کاری ئەو کاتە ئەنجام بدات(واتە بەهەمیشەیی باشترین و بالاترین و پێویستترین کار ئەنجام دەدات).

**"محمد بن علي القصاب" دەڵێت:** تەصەوف ئەخلاقێکی پڕ لە بەخشندەییە لە سەردەمێکی پڕ لە بەخشندەییدا دەرکەوتووە لە پیاوێکی بەخشندەوە لەناو دەستەیەکی بەخشندەدا.

**پرسیار کرا لە سمنون دەربارەی تەصەوف وتی:** ئەوەیە نەبیت بە خاوەنی هیچ شتێك و هیچ شتێکیش نەبێت بە خاوەنی تۆ.

**پرسیار لە ڕوەیم کرا دەربارەی تەصوف وتی:** ڕۆیشتنی نەفسە لەگەڵ خودا لەسەر ئەو شتانەی ئەو(ﷻ) دەیەوێت.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی تەصەوف وتی:** ئەوەیە لەگەڵ خودا بێت بەبێ پەیوەندی.

**ڕوەیمی کوڕی ئەحمەدی بەغدادی دەڵێت: تەصوف لەسەر سێ خەسڵەت بیناکراوە:**

١. دەستگرتن بە هەژاری و نیشاندانی هەژاری بۆ لای خودا(ﷻ).

٢. بەدەستهێنانی بەخشین و پێشخستنی کەسی بەرانبەر.

٣. وازهێنان لە دەستبۆبردن و هەڵبژاردن.

**مەعرووفی کەرخی دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە دەستبردن بۆ حەقیقەتەکان و بێهیوابوون لەوەی لەدەستی خەڵکیدایە.

**"حمدون القصار" دەڵێت:** هاوەڵی صۆفییەکان دەکەم چونکە ناشیرین لای ئەوان چەندین ڕووی بیانووی بۆ هەیە(واتە پاساو بۆ نەنگی و ناتەواوییەکانم دەهێننەوە و بۆم دەپۆشن).

**پرسیار لە "الخراز" کرا دەربارەی ئەهلی تەصەوف وتی:** دەستەیەك پێیاندرا تا ئاسوودەبوون و لێیانگیرایەوە هەتا فانیبوون، پاشان لە کۆمەڵێك نهێنی نزیکەوە بانگیان لێکرا: بە سەر ئێمەدا بگرین.

**جونەید دەڵێت:** تەصەوف سەرکێشییەکە رێکەوتنی تێدا نییە.

**هەروەها دەڵێت:** ئەوان کەسانی یەك خانەوادەن و خەڵکی بێگانە روویان لێناکات.

**هەروەها دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە زیکر و کۆبوونەوە و وەجد لەگەڵ گوێگرتن و کردار و شوێنکەوتن.

**هەروەها دەڵێت:** سۆفی وەك زەوی وایە هەموو پیسێکی دەکەوێتە سەر، بەڵام تەنها شتی جوانی لێ دێتە دەرەوە.

**هەروەها دەڵێت:** سۆفی وەك زەوی وایە هەموو چاك و خراپێك پێی لەسەر دادەنێن و وەك پەڵەهەورێك سێبەر بۆ هەموو شت دەکات و وەك باران ئاوی هەموو شت دەدات.

**هەروەها دەڵێت:** گەر سۆفییەکت بینی گرنگی بە رواڵەتی دەدا بزانە ناوەوەی ئەو کەسە وێرانە.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** سۆفی ئەو کەسەیە رشتنی خوێنی خۆی بە حەڵاڵ دەزانێت و موڵکی خۆی بە موباح دەبینێت.

**"النوری" دەڵێت:** سیفەتی سۆفی سوکنایی و ئارامییە لە نەبووندا و بەخشین و پێشخستنی کەسانی تر بە سەر خۆیدا لە هەبووندا.

**"الکتانی" دەڵێت:** تەصەوف ئەخلاقە هەر کەس ئەخلاقی لە تۆ زیاتر و باشتر بوو ئەوا سەفا و پاکێتی لە تۆ زۆرترە.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە ناڵە و نرکە لەبەردەم دەرگای خۆشەویستدا با دووریشخرابێتەوە.

**هەروەها دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە سەفای نزیکی دوای لێڵی دوورکەوتنەوە.

**وتراوە:** ناشیرنتر لە هەموو ناشیرینێك سۆفییەکی چرووکی دەستنوقاوە.

**شیبلی دەڵێت:** تەصەوف دانیشتن لەگەڵ خودا(ﷻ) بەبێ خەم و پەژارە.

**"أبو منصور" دەڵێت:** سۆفی ئەو کەسەیە خودا ئاماژەی پێ دەکات، هەموو خەڵکی ئاماژە بە خودا(ﷻ) دەکەن.

**شیبلی دەڵێت:** سۆفی لە خەڵك دابڕاوە و بە حەقەوە(ﷻ) پەیوەست بووە، وەك ئایەتی:﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ﴿٤١﴾﴾ طه: ٤١، لە هەرچی شت و کەسە جگە لە خۆی دایبڕی، پاشان پێی فەرموو:﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ الأعراف: ١٤٣

**هەروەها دەڵێت:** سۆفییەکان کۆمەڵێك منداڵی ژێر چاودێری حەقن(ﷻ).

**هەروەها دەڵێت:** تەصەوف تیشکێکی سوتێنەرە.

**هەروەها دەڵێت:** بریتییە لە باڵابوون لە بینینی گەردوون.

**رووەیم دەڵێت:** سۆفییەکان لە خێردان هەتا لە کۆتوبەندی زمان هەڵبێن، کاتێك کەوتنە ناو زاراوەسازییەوە خێریان تێدا نامێنێت.

**"الجريري" دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە چاودێری حاڵەکان و پابەندبوون بە ئەدەبەوە.

**"المزين" دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە ملدان و گەردنکەچبوون بۆ حەق.

**ئەبو تورابی نەخشەبی دەڵێت:** هیچ شتێك سۆفی لێڵ ناکات و هەموو شتێك بە سۆفی رۆشن دەبێتەوە.

**وتراوە:** سۆفی داوا ماندووی ناکات و هۆکار بێزاری ناکات.

**پرسیار لە "ذو النون" کرا دەربارەی تەصەوف وتی:** ئەوانە دەستەیەکن خودایان(ﷻ) بەسەر هەموو شتێکدا هەڵبژارد خوداش(ﷻ) ئەوانی بەسەر هەموو شتێکدا هەڵبژارد.

**"الواسطي"(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ئەم دەستەیە ئاماژەی تایبەت بە خۆیان هەبوو.. پاشان گۆڕا بۆ جووڵە و بزوان.. پاشان جگە لە حەسرەت شتێك نەمایەوە.

**پرسیار لە "النوري" کرا دەربارەی سۆفی وتی:** هەر کەسێك گوێ لە وەحی(قورئان و فەرمووده) بگرێت و فەرمانەکان جێبەجێ بکات و واز لە نەهیلێکراوەکان بهێنێت.

**ئەبو نەصری سەراج دەڵێت:** وتم بە **"الحصري"** سۆفی لەلای تۆ کێیە؟ وتی: ئەو کەسەیە زەوییەك(نیشتمانێك) لە ئامێزی ناگرێت و ئاسمانێك سێبەری بۆ ناکات(داینا پۆشێت).

**مامۆستا ئەبو قاسم(قوشەیری) دەڵێت:** ئاماژەی بە مەحو(سڕانەوە) کردووە.

**وتراوە:** سۆفی ئەو کەسەیە گەر دوو حاڵ رووی لێکرد یان دوو ئەخلاق-کە هەردووکیان باشن- روویان لێکرد هەمیشە باشترینیان هەڵدەبژێرێت.

**پرسیار کرا لە شیبلی: بۆچی سۆفییەکان بەم ناوە ناونراون؟**

**وتی:** لەبەر مانەوەی شتێکی کەم لە دەروونیاندا گەر ئەو شتە کەمە نەبوایە پەیوەست نەدەبوون بە ناوێکەوە.

**پرسیار کرا لە ئیبن جەلا مانای وشەی سۆفی چییە؟ وتی:** لە هەلومەرجی زانستدا نایناسین، بەڵام ئەوە دەزانین هەر کەس هەژار بێت و لە هۆکارەکان خۆیان دابڕیبێت و بەبێ شوێن لەگەڵ خودادا بێت و خودا(ﷻ) لە زانینی هەموو شوێنێك رێگەی لێ نەگرێت پێی دەوترێت سۆفی.

**هەندێکیان دەڵێن:** تەصەوف رووخان و بەربوونەوەی پلە و پایە و دوورکەوتنەوەیە لە هەر کار و کردەوەیەك دەبێتە هۆی رەشکردنی روخساری خۆ لە دونیا و دوارۆژدا.

**ئەبو یەعقوبی موزایلی دەڵێت:** تەصەوف حاڵێکە مەشخەڵە مرۆییەکانی تێدا دەپوکێتەوە.

**ئەبو حەسەنی سیروانی دەڵێت:** سۆفی ئەو کەسەیە لەگەڵ واریداتدایە(لە خوداوە) نەك لەگەڵ ئەوراد(لە موریدەوە).

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** باشترین قسەیەك لەم بارەیەوە وترابێت قسەی ئەو کەسەیە کە دەڵێت: ئەم رێگەیە تەنها بۆ کەسانێك شیاوە خودا بە رۆحیان سەرەنگوێلکەکان خاوێن دەکاتەوە، بۆیە ئەبو عەلی(رەحمەتی خودای لێ بێت) رۆژێك وتی: گەر هەژار تەنها رۆحێکی هەبێت و بیخاتە بەردەم سەگەکانی ئەم دەرگایە سەگێك تەماشای ناکات.

**"أبو سهل الصعلوكي" دەڵێت:** تەصەوف بریتییە لە پشتهەڵکردن لە بەرهەڵستی کردن.

**"الحصري" دەڵێت:** سۆفی دوای نەبوونی نابێتەوە بە بوون و دوای بوونی نابێتەوە بە نەبوون.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** ئەم قسەیەکە تەمومژی تێدایە، مانای قسەکەی: "نابێتەوە بە بوون دوای نەبوونی" واتە گەر لە دەرد و نەخۆشییەکانی فەنا بوو ئەوا ئەو دەرد و نەخۆشییانەی بۆ ناگەڕێتەوە، ئەو بەشەی قسەکەی کە دەڵێت: "دوای بوونی نابێتەوە بە نەبوون" واتە گەر بە حەقەوە سەرقاڵ بوو بە بەربوونەوەی خەڵکی بەرنابێتەوە و ڕووداوەکان کاری تێناکەن.

**وتراوە:** سۆفی لە نەفسی خۆیدا ڕۆچووە بە هۆی ئەوەی لە حەقەوە(ﷻ) بۆ ئەو دەرکەوتووە.

**دەوترێت:** سۆفی گۆڕانی بەسەردا نایەت، گەر گۆڕانی بەسەردا بێت لێڵ نابێت.

**"الخراز" دەڵێت:** لە مزگەوتی "قەیرەوان" بووم لە ڕۆژی هەینییدا، پیاوێکم بینی بە ناو ریزەکاندا دەسوڕایەوە و دەیوت: خێرێکم پێ بکەن من پیاوێکی سۆفی بووم و دواتر لاوازی رووی تێکردم و نەمتوانی بەردەوام بم.. منیش بەزەییم بە حاڵیدا هاتەوە و شتێکم پێدا، ئەویش پێی وتم: لێمگەڕێ، هاوار بە حاڵت.. ئەمە لەوە نییە.. خێرەکەی لێ قبووڵ نەکردم..

❁ ❁ ❁

٤٠

# ئەدەب

((فەرمووویەتی: هەر کەس نەفسی خۆی بە ئەدەب رامبهێنێت ئەو کەسە خودا بە ئیخلاصەوە دەپەرستێت..

وتراوە: کەماڵی ئەدەب تەنها بۆ پێغەمبەران و صدیقانە))

**خودا(ﷻ) دەفەرمویت:**﴿ مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى ﴿١٧﴾ ﴾ النجم: ١٧ وتراوە: ماناکەی پارێزگاری ئەدەبە لە خزمەتی خودادا.

**هەروەها خودا(ﷻ) دەفەرمویت:**﴿ قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا ﴾ التحريم: ٦، **لە تەفسیری ئیبن عەباسدا هاتووە:** واتە فێریان بکەن و ئەدەبیان دابدەن.

**لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((مافی منداڵ لەسەر باوکی ئەوەیە ناوێکی جوانی لێ بنێت و شیرێکی پاك و باشی پێبدات و بە جوانی ئەدەبی دابدات))

**لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەگێڕنەوە وتوویەتی:** هەر کەس نەزانێت مافی خودا(ﷻ) لەسەر خۆی چییە و بە فەرمانەکان و نەهییەکانی خۆی ئەدەب دانەدات ئەو کەسە لە ئەدەب کەنارگیر بووە.

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی:** ((خودا(ﷻ) بە جوانترین و باشترین ئەدەب ئەدەبی دادام))[٦٥]

---

[٦٥] {أخرجه السمعاني في أدب الإملاء}.

**راستەقینەی ئەدەب:** کۆبوونەوەی هەموو خەسڵەتە باشەکانە، "ئەدیب"یش ئەو کەسەیە هەموو خەسڵەتە باشەکانی تێدا کۆبووەتەوە، لەوێوە وشەی "المأدبة" وەرگیراوە وەك ناوێك بۆ کۆبوونەوەی گشتی.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** بەندە بە گوێڕایەڵی و عیبادەتەکانی دەگاتە بەهەشت بە ئەدەبیشی دەگاتە گوێڕایەڵی خودا(ﷻ).

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** کەسێکم بینی دەیویست لە نوێژدا دەستی درێژ بکات بۆ لابردنی شتێك لەسەر لووتی بەڵام بۆ پاراستنی ئەدەب توند دەستی خۆی گووشی..

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** مەبەستی بە کەسەکە خۆی بوو، چونکە لە نوێژدا ناتوانی کەسێك ببینیت دەستی خۆی بە توندی بگوشێت.

**مامۆستا ئەبو عەلی(رەحمەتی خودای لێ بێت)** پاڵی نەدەدا بە هیچ شتێکەوە، رۆژێك لەناو کۆمەڵێکدا بوو، ویستم پشتییەك بخەمە پشتییەوە چونکە بینیم هیچی بە پشتەوە نەبوو، بەڵام کەمێك لە پشتییەکە دوورکەوتەوە، وام گومان برد خۆی لە پشتییەکە بەدوور گرتبێت، چونکە عەبا و بەرماڵی بە شانەوە نەبوو، بەڵام وتی: نامەوێ شان دابدەم.

**"الجلاجلي البصري" دەڵێت:** یەکتاپەرستی پێویستکەرێکە ئیمان پێویست دەکات، هەر کەس ئیمانی نەبێت یەکتاپەرستی نییە، ئیمانیش پێویستکەرێکە شەریعەت پێویست دەکات، هەر کەس شەریعەتی نەبێت ئیمان و یەکتاپەرستی نییە، شەریعەتیش پێویستکەرێکە ئەدەب پێویست دەکات، هەر کەس ئەدەبی نەبێت شەریعەت و ئیمان و یەکتاپەرستی نییە.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** ئەدەب وەستانە لەسەر شتە باشەکان، وترا: ماناکەی چییە؟

وتی: بە ئەدەبەوە لە نهێنی و ئاشکراماندا مامەڵە لەگەڵ خودادا بکەین، گەر بەو جۆرە بیت دەبیتە کەسێکی ئەدیب با کەسێکی ئەعجەمیش بێت.

**"عبدالله الجريري" دەڵێت:** ماوەی بیست ساڵە لە تەنهایمدا و لە کاتی دانیشتندا لاقەکانم رانەکێشاوە، چونکە باشی ئەدەب لە خزمەتی خودادا لەپێشترە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** هەر کەس هاوەڵی مەلیکەکان بکات بەبێ بوونی ئەدەب نەزانینەکەی رادەستی کوشتنی دەکات.

**پرسیار لە ئیبن سیرین کرا** کام ئەدەب لە خوداوە(ﷻ) نزیکترە؟ وتی: مەعریفەی پەروەردگاری خودا و کارکردن بە گوێڕایەڵی ئەو(ﷻ) و حەمدکرنی لەسەر خۆشییەکان و ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** گەر عاریف ئەدەب لە خزمەتی خودادا واز لێ بهێنێت ئەوا لەگەڵ تیاچوان تیاچووە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** وازهێنان لە ئەدەب سەرئەنجامەکەی دەرکردنە، هەر کەس لەسەر فەرشی راخراو ئەدەبی خراپ بێت دەگەڕێنرێتەوە بۆ دەرگای ماڵەکە، هەر کەسیش لەبەر دەرگا ئەدەبی خراپ بێت دەگەڕێنرێتەوە بۆ خزمەتی ئاژەڵان(واتە بۆ ناو تەویلە).

**وترا بە حەسەنی بەصری:** خەڵکی لە زانستی ئەدەبدا قسەی زۆریان هەیە کامەیان لە دونیادا بەسوودتر و لە دواڕۆژدا باشترینە؟ وتی: فێربوون لە ئاییندا و زوهد لە دونیا و مەعریفە بەوەی مافی خودایە(ﷻ) لەسەر تۆ.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** هەر کەس بە ئەدەبی خودا(ﷻ) ئەدەب وەربگرێت دەبێت بە ئەهلی خۆشەویستی خودا.

**سەهل دەڵێت:** ئەم دەستەیە ئەوانەن داوای کۆمەکیان لە خودا کرد لەسەر فەرمانی خودا و ئارامگرتن لەسەر ئادابەکانی خودا(ﷻ).

**لە ئیبن موبارەکەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** ئێمە ئاتاجترین بە کەمێکی ئەدەب تا بە زۆرێك لە زانست.

**هەروەها دەڵێت:** لە کاتێکدا داوای ئەدەبمان کرد ئەدەبدادەرانمان لەدەست چوو.

**وتراوە: سێ خەسڵەت نامۆییان لەگەڵ نییە:**

١. خۆ دوورخستنەوە لە خەڵکی گومانناویی.

٢. ئەدەبی جوان.

٣. باش و گرتنەوەی ئازاری خۆت لە خەڵکی.

**کاتێك ئەبو حەفص هاتە ناو بەغدادەوە جونەید پێی فەرموو:** هاوەڵانی خۆت لەسەر ئەدەبی سوڵتانەکان ئەدەب داداوە، ئەبو حەفص پێی وت: ئەدەبی جوان لە ئاشکرادا ناونیشانی ئەدەبی جوانە لە ناوەوەدا.

**لە عەبدوڵای کوڕی موبارەکەوە وتوویەتی:** ئەدەب بۆ کەسی عاریف وەك تەوبە وایە بۆ کەسی سەرەتا.

**گوێم لە مەنصووری کوڕی خەلەفی مەغرییی بوو دەیوت:** بە کەسێك وترا ئەی بێ ئەدەب، ئەویش وتی: من بێ ئەدەب نیم، وترا: کێ ئەدەبی دادای؟ وتی: سۆفیگەری ئەدەبی دادام.

**"أبو النصر الطوسي السراج" دەڵێت:** خەڵکی لە ئەدەبدا سێ چینن: ئەهلی دونیا زۆربەی ئەدەبیان بریتییە لە زمانپاراوی و رەوانبێژی و لەبەرکردنی زانستەکان و ناوی مەلیکەکان و هۆنراوەکانی عەرەب.

ئەهلی ئایین زۆربەی ئادابیان بریتییە لە وەرزشی دەروونی و ئەدەبدادانی ئەندامەکانی جەستە و پارێزگاری لە سنوورەکانی خودا و وازهێنان لە حەزەکان.

بەڵام ئەهلی تایبەتی خودا زۆربەی ئادابیان بریتییە لە پاکی دڵ و دەروون و رەچاوکردنی نهێنییەکان و وەفا بە پەیمان و پارێزگاری لە کات و کەمی لاکردنەوە بە لای خوتوورەکانی ناوەوە و ئەدەبی جوان لە جێگەی داوا و کاتەکانی ئامادەبوون و مەقامەکانی نزیکبوونەوە.

**لە سەهلی کوڕی عەبدوڵاوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** هەر کەس نەفسی خۆی بە ئەدەب ژێردەستە کرد خودا بە ئیخلاصەوە دەپەرستێت.

**وتراوە:** کەماڵی ئەدەب تەنها بۆ پێغەمبەران و صدیقانە.

**عەبدوڵای کوڕی موبارەك دەفەرمویت:** خەڵکی قسەی زۆریان کردووە دەربارەی ئەدەب ئێمە دەڵێین: بریتییە لە ناسینی دەروون.

**شیبلی دەڵێت:** کرانەوە و زیادەڕەوی قسە لەگەڵ حەق(ﷻ) وازهێنانە لە ئەدەب.

**"ذو النون" دەڵێت:** ئەدەبی عاریف لەسەروو هەموو ئەدەبێکەوەیە، چونکە خودا ئەدەبدادەری دڵیەتی.

**هەیانە دەڵێت:** خودا(ﷻ) دەفەرمویت: هەرکەسم پابەند کرد بە هەستان بە ناوەکان و سیفەتەکانم ئەوا پابەندم کردووە بە ئەدەبەوە، هەر کەس حەقیقەتی خۆمی بۆ رۆشن بکەم پابەندی دەکەم بە دەرگاکەمەوە، هەر کامێکیانت دەوێ هەڵیببژێرە: یان ئەدەب یان بەزەیی.

**وتراوە:** رۆژێك ئیبن عەتا لەناو هاوەڵانیدا لاقەکانی راکێشا و وتی: وازهێنان لە ئەدەب لەناو ئەهلی ئەدەبدا ئەدەبە.

ئەوەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەم بەسەرهاتە ئەو ریوایەتەیە کە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(ﷺ) ئەبوبەکر و عومەری لە خزمەتدا بوو، عوسمان هاتە ژوورەوە پێغەمبەر(ﷺ) رانی خۆی داپۆشی و فەرمووی: چۆن لە پیاوێك شەرم ناکەم فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) هۆشداری دا دەربارەی حەیا و شەرمی عوسمان، لەگەڵ ئەوەش پێمان دەفەرمویت حاڵی لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر باڵاتر و پڕ لە سەفاتر بووە.

**جونەید دەفەرمویت** گەر خۆشەویستی دروست بێت مەرجەکانی ئەدەب بەردەبنەوە.(ئەمەیان لەناو دۆستاندایە)

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** گەر خۆشەویستی دروست بێت پێداگری لە خۆشەویست دەکات پابەندی ئەدەب بێت.(ئەمەیان لەگەڵ خودادایە)

**"النوري" دەڵێت:** هەر کەس لە کاتدا خاوەن ئەدەب نەبێت کاتەکەی دەبێتە هەڕەشە بۆ سەری.

**"ذو النون" دەڵێت:** گەر مورید لە بەکارهێنانی ئەدەب دەرچوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتووە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر ئەم ئایەتە: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾﴾ الأنبياء: ٨٣** دەیوت: ئەیوب نەیفەرموو: "ارحمني-ڕەحمم پێ بکە" چونکە ئەدەبی گفتوگۆی لەگەڵ خودادا پاراست.

هەر بەو جۆرە عیسا(عليه السلام) لە ئایەتەکەدا فەرمووی: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ﴾المائدة: ١١٨، هەروەها دەفەرموێت:﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ﴾المائدة: ١١٦، نەیفەرموو: "لم أقل-نەموتووە" هەموو ئەوانە ڕەچاوکردنی ئەدەبە لە خزمەتی خودادا.

**جونەید دەڵێت:** لە ڕۆژی هەینیدا یەکێك لە صاڵحان هات بۆ لام و پێی وتم: هەژارێکم لەگەڵ بنێرە ئاسوودەییەکم بخاتە دەروونەوە و شتێکم لەگەڵ بخوات، لامکردەوە هەژارێکم بینی تیایدا هەستم بە برسێتی کرد.. بانگم کرد و پێم وت: لەگەڵ ئەم پیاوەدا بڕۆ و خۆشییەك بخە دەروونییەوە، زۆری نەبرد پیاوەکە هاتەوە بۆ لام و پێی وتم: باوکی قاسم ئەو پیاوە تەنها یەك پاروی خوارد و ڕۆیشت، وتم: لەوانەیە قسەیەکی جەفائامێزت کردبێت، وتی: هیچم نەوتووە، لامکردەوە هەژارەکەم بینی دانیشتبوو، پێم وت: بۆچی خۆشی و سرووری تەواوت پێ نەبەخشی؟

وتی: گەورەم، لە کوفە دەرچووم و هاتم بۆ بەغداد هیچ شتێکم نەخوارد، کاتێك بانگت کردم دڵخۆش بوو، چونکە ئەوەم لە تۆوە بە کارێکی باش دەبینی بۆ خۆم، لەگەڵی ڕۆیشتم و لە ناوەوە دڵم ڕازی نەبوو، کاتێك لەسەر سفرەکەی دانیشتم پارووییەکی دایە دەستم و وتی: "بخۆ"، ئەوە لە دە هەزار درهەم لەلام خۆشتر بوو، کاتێك ئەوەم لێ بیست(واتە وشەی "بخۆ") تێگەیشتم کەسێکی هیممەت نزمە، بۆیە خۆم لادا لە خواردنەکەی، جونەید بە پیاوەکەی فەرموو: پێم نەوتی ئەدەبت لەگەڵی باش نەبووە، ئەویش وتی: ئەی باوکی قاسم، تەوبە دەکەم، بۆیە دیسان داوای لێکرد لەگەڵی بڕوات و دڵی ئاسوودە بکات.

٤١

# حوکمەکانی سەفەر

((ئەبو یەعقووبی سوسی دەڵێت: موسافیر لە سەفەرەکەیدا ئاتاجە بە چوار شت: زانستێك بەڕێوەی ببات.. و وەرعێك رایبگرێت.. و وەجدێك هەڵیبگرێت.. و ئەخلاقێك بیپارێزێت، چونکە لە ئەخلاقی پیاوان سەفەر دەکات))

**خودا(ﷻ) دەفەرمویت:﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ ﴾يونس: ٢٢**

**لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك سەردەکەوتە سەر پشتی حوشتر و بۆ سەفەر دەڕۆیشت سێ جار "الله أكبر"ی دەکرد و پاشان دەیفەرموو: (("سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا الى ربنا لمنقلبون"** پاشان دەیفەرموو: **"أللهم إنا نسألك في سفرنا هذا البر والتقوى ومن العمل ما ترضى، أللهم هون علينا سفرنا، أللهم أنت الصاحب في السفر والخليفة في الأهل، أللهم أعوذ بك من وعثاء السفر وكآبة المنظر وسوء المنظر في المال والأهل"** کاتێك دەگەڕایەوە لە سەفەرەکەی لەپاڵ خوێندنی ئەوانەدا ئەم چەند وشەی زیاد دەکرد: **"آيبون، تائبون، لربنا حامدون"))**[٦٦]

لەبەر ئەوەی زۆربەی پیاوانی ئەم دەستەیە لەسەر گرتنەبەری سەفەرن دەروازەیەکمان تایبەت کرد بە سەفەر، چونکە لە مەزنترین کارەکانی ئەوانە، ئەم دەستەیە جیاوازیان لە نێواندا هەیە، هەیانە نیشتەجێبوونی لە سەفەر پێ باشترە و تەنها بۆ جێبەجێ کردنی فەرز سەفەر دەگرنە بەر، وەك حەجکردن، زاڵ بە سەریاندا

[٦٦] {أخرجه مسلم في صحيحه}.

نیشتەجێبوونە، وەك جونەید و سەهلی كوڕی عەبدوڵا و ئەبی یەزیدی بوستامی و ئەبو حەفص و كەسانی تریش.

هەیانە سەفەری پێباشە و لەسەر سەفەركردن بەردەوام بوون تا لە دونیا دەرچوون، وەك ئەبو عەبدوڵای مەغریبی و ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم و كەسانی تر.

زۆربەیان لە سەرەتای بەرەوخوداچوونیان سەفەریان پێباش بووە، واتە لە سەرەتای لاوێتیانەوە سەفەری زۆریان كردووە، پاشان لە كۆتایی حاڵیانەوە لە سەفەركردن كەوتوون، وەك ئەبو عوسمانی حیری و شیبلی و كەسانی تر، بۆ هەریەك لەوانە بنچینە و بنەماگەلێك بوونیان هەیە و ڕێگەی خۆیانیان لەسەر بینا كردووە.

**بزانە سەفەر دوو بەشە:**

**سەفەر بە جەستە:** بریتییە لە گواستنەوە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر.

**سەفەر بە دڵ:** ئەوەش بریتییە لە بەرزبوونەوە لە سیفەتێكەوە بۆ سیفەتێكی تر، هەزاران كەس دەبینی بە جەستە سەفەر دەكات بەڵام كەمێكی زۆر كەم بە دڵ سەفەر دەكات.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** لە گوندی "فرخك"(گوندێكی سەر بە نیسابوورە) پیاوێك هەبوو یەكێك بوو لە پیاوانی ئەم دەستەیە، چەندین كتێبی لەسەر زمانی پیاوانی ئەم دەستەیە نووسی بوو، پرسیاریان لێكرد: ئایا سەفەرت كردووە؟ وتی: سەفەری زەوی یان سەفەری ئاسمان؟ سەفەری زەوی نەخێر، سەفەری ئاسمان بەڵێ.

**هەروەها لە "ئەبو عەلی"م بیست(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ڕۆژێك هەژارێك هات بۆ لام لە "مرو" بووم و پێی وتم: سەفەرێكی پڕ لە ئازار و دوورم بۆ لای تۆ گرتەبەر، مەبەستەكەم گەیشتن بوو بە تۆ، منیش پێم وت: تەنها یەك هەنگاو بەس بوو بۆ تۆ گەر لە نەفست خۆت بەدووربگرتبایە.

بەسەرهاتەكانیان لە سەفەردا جۆراوجۆرن بەپێی ئەوەی باسیمان كرد لە بەشەكانیان و حاڵەكانیان.

**ئەحنەفی هەمەدانی دەڵێت:** لە دەشت و سارادا تەنها بووم، زۆر شەکەت و ماندوو بووم، دەستم بەرز کردەوە و وتم: پەروەردگار، من لاوازی رۆژگارێکم، هاتووم بۆ میوانداری تۆ، کەوتە ناو دڵمەوە پێم بوترێت: کێ تۆی بانگهێش کرد بۆ ئەو میواندارییە؟

وتم: پەروەردگار ئەمە مەملەکەتێکە و مشەخۆریش لەخۆ دەگرێت؟ گوێم لە دەنگێك بوو لە پشتەوە، لام کردەوە بینیم پیاوێکی ئەعرابییە لەسەر حوشترێك، وتی: ئەی ئەعجەمی بۆ کوێ دەچی؟

وتم: بۆ مەککە، وتی: بانگهێشکراوی؟ وتم: نازانم، وتی: ئەی نەتبیستووە خودا دەفەرموێت:﴿مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ﴾ **آل عمران: ٩٧**، وتم: مەملەکەتەکە بەرینە و مشەخۆریش لەخۆ دەگرێت، وتی: بەڵێ، تۆ مشەخۆرەکەی، دەتوانی خزمەتی حوشتر بکەی؟

وتم: بەڵێ، لە حوشترەکەی دابەزی و بە منی بەخشی و وتی: بە سواری ئەمە بڕۆ.

**یەکێك لە هەژاران بە "الكتاني" وت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش پێی وت:** هەوڵبدە هەر شەوێك میوانی مزگەوتێك بیت، هەوڵبدە لە نێوان دوو مەنزیلەدا بمریت(ئەو شوێنەی کۆچی لێ دەکەی بۆ ئەو شوێنەی بۆی دەچیت).

**لە "الحصري" دەگێڕنەوە وتوویەتی:** دانیشتنێك لە هەزار حەج خێرترە.

مەبەستی بە دانیشتنێکە خەم و خۆزگە و پەژارەی بەندە لەسەر ئامادەبوونی دڵ کۆبکاتەوە.

سوێند بە خودا ئەوە لە هەزار حەج تەواوترە کە دڵی تێدا ئامادە نابێت.

**محەمەدی کوڕی ئیسماعیلی فەرەغانی دەڵێت:** بۆ ماوەی بیست ساڵ من و ئەبوبەکری زەقاق و کەتانی سەفەرمان دەکرد، تێکەڵ بە کەس نەدەبووین و لەگەڵ هیچ کەس کۆنەدەبووینەوە، کاتێك روومان لە شارێك دەکرد گەر پیاوێکی گەورەی تێدابوایە سەلاممان لێ دەکرد و تا شەو لە خزمەتیدا دادەنیشتین، پاشان دەگەڕاینەوە بۆ مزگەوت، کەتانی لە سەرەتای شەوەوە تا کۆتایی شەو نوێژی دەکرد و قورئانی

خەتم دەکرد، ئەبوبەکری زەقاق روو بـە قیبلـە دادەنیشـت، منـیش رادەکشـام و بـیرم دەکردەوە، پاشان رۆژمان لێ دەبوویەوە و هەڵدەستاین نوێژی بەیانیمان بە دەسـتنوێژی عیشاوە دەکرد، گەر یەکێك لەگەڵمان بوایە و بخەوتبایە لە هەر سـێکمان بـە باشـتر و چاکتر تەماشامان دەکرد.

**پرسیار لە روەیـم کـرا دەربـارەی ئـادابی سـەفەر، وتـی:** خـەم و پـەژارەی پـێش هەنگاوێکی نەکەوێت و لە هەر شوێنێك دڵی گیرسایەوە ببێتە شوێنی.

**لە مـالیکی کـوڕی دینـارەوە دەگێڕنـەوە وتوویـەتی:** خـودا(ﷻ) وەحـی نـارد بـۆ موسا(عليه السلام) و پێی فەرموو: دوو نەعلی ئاسن و گۆچانێکی ئاسـن بـۆ خـۆت دروسـت بکـە و پاشـان گەشـتی سـەر زەوی بکـە، لـە شـوێنەوارەکان وردببـەرەوە و پەنـد و ئامۆژگاری وەربگرە تا دوو نەعلەکەت تیادەچن و عەساکەت دەشکێت.

**وتراوە:** عەبدوڵا مەغریبی بە هەمیشەیی سەفەری دەکـرد و هـاوەڵانی خـۆی لەگـەڵ بوو، ئەو هەمیشە ئیحرامی بەستبوو، کاتێك ئیحرامی دەشکا جارێکی تر ئیحرامـی دەبەستەوە، **جلەکانی** پیس نەدەبوون و نینۆك و مووی زیادی نـەدەکرد، هـاوەڵانی لـە شەودا لەدواوەی دەڕۆیشتن، گەر یەکێکیان لە ڕێگە لایبدایـە بـانگی لـێ دەکـرد: لای راستت ئەی فلان، لای چەپت ئـەی فـلان، دەسـتی درێـژ نـەدەکرد بـۆ شـتێك دەسـتی مرۆڤی پێگەیشتبێت، خواردنەکەی رەگ و ریشکی هەندێ رووەك بوو، لە پێناوی ئـەو لە رەگەوە دەریان دەهێنا.

**وتراوە:** هەر هاوەڵێك پێی بڵێیت: هەستە با بڕۆین، بڵێت: بۆ کوێ؟ ئەوە هاوەڵت نییە.

**ئەبو عەلی ریباتی دەڵێت:** هاوەڵی عەبدوڵا مرووزیم کرد، بەر لەوەی مـن هـاوەڵی بکەم بەبێ خۆراك و بەبێ ولاخ رووی لە دەشت و سارا دەکرد، کاتێك هاوەڵیم کرد پێی وتم: کامیانت پێخۆشترە، تۆ ئەمیر بیت یان من؟ وتم: نـەخێر، بـەڵکو تـۆ ئـەمیر بـە، وتی: کەوابوو گوێڕایەڵ دەبیت؟ وتم: بەڵێ، توورەکەیـەکی هێنـا و خـواردنی تێکـرد و هـەڵیگرت، گـەر بموتبایـە بێنـە بـا مـن هـەڵیبگرم، دەیـوت: مـن ئـەمیرم و تـۆش گوێڕایەڵیت لەسەرە، شەوێك باران بەسەرماندا داباری، هەتا بەیانی بەسەرمەوە وەستا

و به قوماشێك ڕێگەی لە بارانەکە دەگرت بدات لە من، منیش بە خۆمم دەوت: خۆزگە بمردمایە و نەموتبایە تۆ ئەمیر بە.

**پاشان پێی وتم:** گەر هاوەڵی کەسێکت کرد بەو جۆرە هاوەڵی بکە من هاوەڵی تۆم کرد.

**گەنجێك هات بۆ لای ئەبو عەلی ڕۆزباری کاتێك ویستی بڕوات، وتی:** شێخ شتێکی هەیە بە منی بڵێت؟ ئەویش وتی: ئەی گەنج پیاوانی ئەم ڕێگەیە لەسەر مەوعید کۆنابنەوە و بە راوێژیش بڵاوەی لێ ناکەن.

**"المزين الكبير" دەڵێت:** ڕۆژێك لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا لەگەڵ ئیبراهیمی خەواص بووم، دووپشکێکم بینی بەسەر رانیدا دەڕۆیشت، هەستام بۆ ئەوەی بیکوژم، ڕێگری لێکردم و وتی: لێیگەڕێ، هەرچی شتە ئاتاجی دەرگامانە، ئێمە ئاتاجی هیچ شتێك نین.

**"أبو عبدالله النصيبي" دەڵێت:** سی ساڵ سەفەرم کرد دڕاوی خەرقەکەم پینە نەدەکرد و نەدەچووم بۆ شوێنێك بمزانیبایە دۆستێکی لێیە، و ڕێگەم نەدەدا بە هیچ کەس کۆڵی من هەڵبگرێت.

بزانن ئەم دەستەیە ئادابی ئامادەبوونیان لە تێکۆشانەکان تەواو کردووە و پاشان ویستوویانە شتێك بخەنە سەری، بۆیە حوکمەکانی سەفەریان خستووەتە سەری، ئەوەش وەك وەرزشێك بۆ دەروونیان، تا دەروونی خۆی لە دەقپێوەگیراوەکان دەرهێناوە و هەڵیان ناوە بۆ جیابوونەوە لە ناسراوەکان، بۆ ئەوەی لەگەڵ خودا بەبێ هۆکارەکانی پەیوەندی و بەبێ ناوەند بمێننەوە، لە سەفەرەکانیاندا هیچ بەشێك لە ئەورادی خۆیان وازلێنەهێناوە.

**دەڵێن:** روخسەت بۆ ئەو کەسەیە سەفەرەکەی پێویستە، ئێمە لە سەفەرەکانماندا نە کارمان هەیە و نە پێویستی.

**نەصرابادی دەڵێت:** جارێك لە دەشت و سارا لاوازی رووی لێ کردم، لە خۆم بێهیوابووم، چاوم کەوتە سەر مانگ، ئەو ڕووداوە لە ڕۆژدا بوو، بینیم لەسەر مانگ

نووسرابوو:﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ﴾ البقرة: ١٣٧، هەندێ هێزم بەبەردا هاتەوە، لەو کاتەوە ئەم قسانەم بە روودا کرایەوە.

**ئەبو یەعقووبی سوسی دەڵێت:** موسافیر لە سەفەرەکەیدا ئاتاجە بە چوار شت:

زانستێك بەڕێوەیان ببات و وەرعێك بیانگێڕێتەوە و وەجدێك هەڵیانبگرێت و هەڵیانبنێت، و ئەخلاقێك پارێزگاریان لێ بکات.

**وتراوە:** بۆیە سەفەر بە "سەفەر" ناونراوە چونکە لە ئەخلاقی پیاوان سەفەر دەکات.

کاتێك هەژارێك سەفەری بۆ یەمەن بکردبایە و جارێکی تر بگەڕابایەتەوە بۆ لای "کەتانی" فەرمانی دەکرد کۆچی لێبکەن، چونکە لەو کاتەدا ئەوانەی سەفەریان دەکرد بۆ یەمەن لە پێناوی دڵنەرمی و ئاسوودەییدا بوو(الرفق).

**وتراوە:** ئیبراهیمی خەواص هیچ شتێکی بۆ سەفەر لەگەڵ خۆی هەڵنەدەگرت، بەڵام هەمیشە دەرزی و دەزوو و دۆلکەیەکی پێ بوو، دەرزی و دەزووەکە بۆ دوورینەوەی جلەکانی تاکو عەرەتی دەرنەکەوێت و دۆلکەکەش بۆ ئاو و دەستنوێژ، ئەو دوو شتەی(دەرزی و دۆلکە) بە مانەوەی پەیوەندی و شانداد لەسەر زانراو دانەدەنا.

**عەبدوڵا رازی دەڵێت** لە **"طرسوس"** بە پێی پەتی دەرچووم، هاوەڵێکم لەگەڵ بوو، روومان لە هەندێ ئاوەدانی شام کرد، هەژارێك نەعلی بۆ هێنام لێم وەرنەگرت، هاوەڵەکەم پێی وتم: لەبەری بکە(واتە نەعلەکانی لێ وەربگرە)، چونکە زۆر شەکەت و ماندوو بووم، خودا -بە هۆی منەوە- بەم نەعلە دەرگای لە تۆ کردووەتەوە، وتم: تۆ چی دەڵێی؟ وتی: لە سەرەتای سەفەرەکەمانەوە تا ئێرە منیش نەعلەکانم لە پێ داکەندووە بۆ ئەوەی وەك تۆ وابم و رەچاوی مافی هاوەڵێکردن بکەم.

**وتراوە:** خەواص لە سەفەرێکدا سێ کەسی لەگەڵ بوو، لە ئاوەدانییەك مزگەوتێکیان دۆزییەوە و شەو تیایدا مانەوە، مزگەوتەکە دەرگای نەبوو، شەوێکی زۆر سارد بوو، ئەوانیش لێی خەوتن، کاتێك بەئاگاهاتن کەسێکیان بینی لە دەرگاکەدا بەپێوە وەستا بوو، لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرد، لە وەڵامیاندا وتی: ترسام سەرماتان بێت، بە درێژایی ئەو شەوە لەناو دەرگاکەدا بەپێوە وەستا بوو.

**وتراوه:** جارێکیان "کەتانی" داوای مۆڵەتی حەجی لە دایکی کرد ئەویش مۆڵەتیدا و بەڕێکەوت، لە دەشت و سارا جلەکانی میزی بەرکەوت، وتی: ئەمە بە هۆی ناتەواوییەکەوەیە لە حاڵمدا، بۆیە گەڕایەوە، کاتێك تەقەی دا لە دەرگای ماڵ خۆیان، دایکی وەڵامی دایەوە و دەرگاکەی بۆ کردەوە، بینی لە پشت دەرگاکەوەیە، پرسیاری هۆی دانیشتنەکەی لێ کرد لە پشتی دەرگاکەوە، وتی: لەو کاتەوەی تۆ لە ماڵەوە دەرچووی بڕیارمدا پشتی ئەم دەرگا بەجێنەهێڵم تا دەتبینمەوە.

**"إبراهيم القصار" دەڵێت:** سی ساڵ لە سەفەردا بووم دڵی خەڵکیم بەرانبەر هەژاران چاکدەکردەوە.

**وتراوە:** پیاوێك سەردانی داودی تائی کرد و وتی: باوکی سولەیمان، ماوەیەکی زۆرە نەفسم بۆ بینینت ململانێم لەگەڵ دەکات، ئەویش وتی: خراپ نییە، گەر جەستەکان ئارام بن و دڵەکان سوکناییان تێدا بێت بەیەکترگەیشتن ئاسانە.

**گوێم لە ئەبو نەصری سۆفی بوو، یەکێك بوو لە هاوەڵەکانی نەصرابادی دەیوت:** لە سەفەری دەریا لە عەمان بووم و برسێتی زۆری بۆ هێنابووم، بە بازاڕێکدا گوزەرم دەکرد، گەیشتمە چێشتخانەیەك بینیم کاوڕی برژاوی تێدایە، بە پیاوێکەوە نووسام و داوام لێکرد: لەو خواردنەم بۆ بکڕێت.

ئەویش پرسی بۆچی بۆت بکڕم؟ ئایا پیاوەتییەك یان قەرزێکت لەسەر من هەیە؟

وتم: هەر دەبێ لەوانەم بۆم بکڕی.

پیاوێك منی بینی وتی: ئەی گەنج تۆ خۆت لادە، ئەو کەسەی دەبێ شتت بۆ بکڕێت ئەو گەنجە نییە منم، حەزت لە چییە پێم بڵێ و هەرچی حەز لێ دەکەی بیڵێ.

ئەوەی ویستم بۆی کڕیم و ڕۆیشت.

**لە ئەبو حوسەینی میسرییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لەگەڵ **"الشجري"** ڕێکەوتین و بڕیارماندا لە تەرابولسەوە دەست بە سەفەر بکەین، چەندین ڕۆژ ڕۆیشتین هیچمان نەخوارد، کولەکەیەکم بینی فڕێدرابوو.. هەڵمگرت و دەستم بە خواردنی کرد، لامکردەوە بە لای هاوەڵەکەمدا هیچی نەوت، منیش کولەکەکەم فڕێدا و زانیم

ئیشەکەمی پێ ناخۆش بوو، پاشان پێنج دینارمان دەستکەوت، رووممان لە ئاوادانییەك کرد، وتم: هاوەڵەکەم هەرچۆنێ بێت شتێك بۆ هەردووکمان دەکڕێت بیخۆین، لەو ئاوەدانییە گوزەرمان کرد و هیچی نەکڕی، پاشان وتی: لەوانەیە بڵێی بە برسێتی دەڕۆین و شتێکت نەکڕی بیخۆین، دەیبینیت، لەسەر رێگەکەمان گەیشتینە گوندێك بە ناوی "یەهودیە" و رووممان تێکرد، هاوڕێکەم وتی: ئەم گوندە پیاوێکی هەژاری لێیە خاوەنی ماڵ و منداڵە، گەر روو لە ماڵەکەی بکەین بە ئێمەوە سەرقاڵ دەبێت، بۆیە پێنج دینارەکەی پێ دەدەین تاکو بۆ ئێمە و بۆ خانەوادەکەی خەرج بکات، کاتێك رووممان لە ماڵەکەی کرد پێنج دینارەکەی پێدا و خەرجی کرد بۆ ئێمە و خانەوادەکەی، کاتێك رۆیشتین پێی وتم: روو لە کوێ بکەین باوکی حوسەین؟ وتم: لەگەڵ تۆ دەڕۆم، وتی: نەخێر، تۆ لە قورعەدا ناپاکیم لێ دەکەی و هاوەڵێشم دەکەی، ئەو کارە مەکە، بۆیە نەیویست هاوەڵی بکەم.

**عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** لە سەردەمی گەنجێتیدا یەکێك لە هەژاران پێشوازی لێ کردم، کاریگەری زیان و برسێتی لەسەر جەستە و روخسارم بینی، بردمییە ماڵەوە و گۆشتی لێنرا و بە کەشکەوە و گۆشتی وشککراوەی پێدام، تریتەکەم دەخوارد و گۆشتەکەم دەست بۆ نەدەبرد بە هۆی گۆڕاوییەکەیەوە، بۆیە پارووییەکی خستە دەمم، منیش بە زۆر قوتم دا، پاشان لوقمەیە تری دەرخوارد دام زۆر پێی ناڕەحەت بووم، کە ئەوەی بینی زۆر شەرمەزار بوو، منیش لەبەر ئەو شەرمەزار بووم، بۆیە لە ماڵەکەی چوومە دەرەوە و بەرەو حاڵی سەفەر جۆشم خوارد، هەواڵم بۆ دایکم نارد دەمەوێت سەفەر بکەم، ئەویش رێگر نەبوو لە سەفەرەکەم و رازی بوو، لە قادسیەوە لەگەڵ دەستەیەك لە هەژاران بەڕێکەوتین، کەوتینە دەشت و سارا و وێڵبووین، ئەوەی پێمان بوو کۆتایی هات، کەوتینە باری تیاچوون، گەیشتینە ئاوەدانییەك لە ئاوەدانییەکانی عەرەب، هیچمان نەبینییەوە، ناچاربووین بە چەند دینارێك سەگێکیان لێ بکڕین، سەگەکەیان برژاند و پارچەیەکیان دا بە من، کاتێك ویستم بیخۆم لە حاڵی خۆم بێزم کردەوە، بیرم کردەوە ئەمە سزای شەرمەزاربوونی ئەو هەژارە بوو خزمەتی منی کرد، لە نەفسی خۆمدا تەوبەم کرد، رێگەکەیان نیشاندایین و رۆیشتین، حەجم کرد و پاشان گەڕامەوە داوای لێخۆشبوونم لەو پیاوە هەژارە کرد.

**٤٢**

# هاوەڵیکردن

**(("الجريري" دەڵێت: بۆ زانستی یەکتاپەرستی تەنها زمانی یەکتاپەرستی بوونی هەیە))**

**خودا (ﷻ) دەفەرمویت: ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾التوبة: ٤٠**

کاتێك خودا هاوەڵی بۆ ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی رازی بێت) جێگیر دەکات ئەوەش رۆشن دەکاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) سۆز و بەزەیی بۆ نیشانداوە و پێی فەرمووە: ((**لا تحزن إن الله معنا-دڵتەنگ مەبە، خودامان لەگەڵە**))

کەسی ئازادی مەرد بە بەزەییە بەرانبەر ئەوانەی هاوەڵی دەکەن.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** کەی بە خۆشەویستانی خۆم دەگەم؟

هاوەڵانی فەرموویان: دایك و باوکمان فیدات بێت بۆ ئێمە خۆشەویستانی تۆ نین؟

فەرمووی: ئێوە هاوەڵانی منن، بەڵام خۆشەویستانم دەستەیەکن منیان نەبینیوە و باوەڕیان پێهێناوم، من شەوقم زۆرترە بۆ ئەوان))[٦٧]

## هاوەڵیکردن سێ بەشە:

١. **هاوەڵی کەسێك لەسەرو خۆتەوە:** ئەمەیان لە راستیدا خزمەتکردنە.

[٦٧] {أخرجه الترمذي في صحيحه}.

**٢. هاوەڵێکردنی کەسێك لە خوار خۆتەوە**، ئەوەش سۆز و بەزەیی لەسەرت بۆ ئەوەی خوار خۆت پێویست دەکات، و لەسەر ئەویش تەبایی و رێز پێویست دەکات.

**٣. لەگەڵ هاوەڵێکردنی هاوتا و هاوشانی یەکتردا:** ئەمەش لەسەر ئیسار و جوامێری بیناکراوە، هەر کەس هاوەڵی شێخێکی کرد پلەی لە ئەو بەرزتر بوو، فێری دەکات چۆن واز لە بەرهەڵستی کردن بهێنێت و چۆن ئەوەی لە ئەو دەردەکەوێت رووپەکی جوانی بۆ ببینێتەوە و باوەڕ بە حاڵەکانی بهێنێت.

**هەندێ لە هاوەڵانی ئێمە پرسیاریان لە مەنصووری کوڕی خەلەفی مەغریبی کرد:** چەند ساڵ هاوەڵی ئەبو عوسمانی مەغریبیت کرد؟

سەرنجێکی پرسیارکەرەکەی دا و وتی: من هاوەڵێم نەکردووە، بەڵکو ماوەیەك خزمەتم کردووە.

گەر کەسێك لە خوار خۆتەوە هاوەڵی کردی ناپاکی لە مافی هاوەڵی کردن ئەوەیە ئاگاداری نەکەیەوە لەو ناتەواویانەی لە حاڵیدایە، بۆ ئەو مەبەستە "أبو الخیر التینانی" بۆ "جفر بن محمد بن نصیر"ی نووسی: گوناهی نەزانی هەژاران بە کۆڵی ئێوەوەیە، چونکە بە نەفسی خۆتانەوە خەریکبوون و ئەدەبدادانی ئەوانتان پشتگوێ خست و ئەوانیش لە نەزانیدا مانەوە.

بەڵام گەر هاوەڵی کەسێکت کرد لە پلە و پایەدا هاوتا و هاوشانی خۆت بوو پێویستە چاو لە نەنگییەکانی بپۆشیت، ئەوەی لێی دەردەکەوێت هەڵیبدەرە سەر رووپەکی جوان و هەتا دەتوانی لێکدانەوەی باشی بۆ بکەی، گەر لێکدانەوەیەکت بۆی نەبینییەوە ئەوا پێویستە بگەڕێیەوە بۆ تۆمەتبار کردنی نەفسی خۆت و لۆمەکردنی.

**ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری دەڵێت:** وتم بە ئەبو سولەیمانی دارانی: فلان کەس ناکەوێتە دڵمەوە..

ئەبو سولەیمان وتی: ناکەوێتە دڵی منیشەوە، بەڵام ئەی ئەحمەد، لەوانەیە خۆپەرستی لە دڵی ئێمەدا بێت و ئێمە لە صالحان نەبین بۆیە خۆشمان ناون.

**وتراوه:** پیاوێك هاوەڵی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی کرد کاتێك ویستی لێی جیاببێتەوه پیاوەکه پێی وت: گەر نەنگییەکت لە منـدا بینیـوه ئاگـادارم بکـه، ئیـبراهیم وتـی: هـیچ نەنگییەکم لە تۆدا نەبینییەوه، چونکه بـه چـاوی خۆشەویسـتی لێمڕوانیـت، بۆیـه هـەموو شتێکی تۆم لا جوان بوو، بۆیه بۆ نەنگی خۆت پرسیار لە کەسانی تر بکه جگه لە من.

**لە ئیبراهیمی کوڕی شەیبانەوه دەگێڕنەوه وتوویەتی:** هاوەڵی کەسێکمان نـەدەکرد بیوتبایه "نەعلەکانم".

**ئەبو ئەحمەدی قەلانسی دەڵێت:** هاوەڵی دەسـتەیەکم کـرد لـە بەصـره زۆر ڕێزیـان لێگرتم، جارێك وتم بە یەکێکیان: مێزەرەکەم لە کوێیه؟

ئەو قسەیه منی لەبەر چاویان خست.

**"الزقاق" دەڵێت:** ماوەی چل ساڵه هاوەڵی ئەوانه دەکەم، تـەنها سـۆز و بـەزەیی و نەرمونیانیم لێیان بینی بەرانبەر یەکتری یان بەرانبەر کەسانێك خۆشیان دەویستن، هەر کەس لەسەر ئەم ڕێگەیه تـەقوا و وەرعـی لەگـەڵ نـەبێت ئـەوه دەخـوات کـه بـه دەق حەرامکراوه.

**پیاوێك بە سەهلی کوڕی عەبدوڵای وت:** باوکی محەمەد، دەمەوێت هاوەڵیت بکەم، وتی: گەر یەکێکمان مرد ئەویترمان هاوەڵی کێ دەکات؟ وتی: الله، پێی وت: کەوابوو لە ئێستاوه هاوەڵی بکە.

**پیاوێك ماوەیەك هاوەڵی پیاوێکی کرد،** پاشان ویستی جیابوونەوه لە یەکێکیانەوه سەریهەڵدا، داوای مۆڵەتی لە هاوەڵەکەی کرد، وتی: بە مەرجێك هاوەڵی کەسێکی تر نەکەی مەگەر پله و پایەی لەسەرو ئێمه بێت، گەر ئەویش دیسان لەسەرو ئێمەوه بـوو هاوەڵی مەکه، چونکه یەکەمجار هاوەڵی ئێمەت کردووه، پیاوەکه ویسـتی جیابوونـەوه لە دڵمدا نەما(مەبەستی ئەوەیه تۆ دەبێت هاوەڵی کەسێك بکەیت هاوتای خۆت بێت، نه سەروتر، نه نزمتر، لـه هـاوەڵی بەرزەکـەدا ئـەو لـه تـۆ جیادەبێتـەوه، لـه هـاوەڵی نزمەکەدا تۆ لە ئەو جیادەبییەوه، لە هاوتاکەی خۆتدا مانەوه هەیـه کـه بریتییـه لـەو دەستەیەی لەگەڵیدا بووه).

**"الكنائي" دەڵێت:** پیاوێك هاوەڵی كردم، كەسەكە لەسەر دڵم گران بوو، شتێكم پێ بەخشی بۆ ئەوەی لە دڵمدا ئەو قورسییە نەمێنێت، بەڵام قورسییەكە نەڕەوایەوە.. كەسەكەم برد بۆ ماڵی خۆمان و پێم وت: پێیەكانت لەسەر روخسارم دەبنێ، بەڵام ئەو كارەی نەكرد، وتم: هەر دەبێ ئەنجامی بدەی، ئەویش ئەنجامی دا، بڕیارم دا پێیەكانی لەسەر روومەتم لا نەدا تا خودا ئەو قورسییە لە دڵم بەرانبەری لادەبات، كاتێك لە دڵم ئەوە سڕایەوە وتم: ئێستا پێیەكانت لا بدە.

**ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم** خەریكی دروێنە و باخ و بێستان دەبوو و پارەكەی بۆ هاوەڵانی خەرج دەكرد.

**وتراوە:** ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم لەگەڵ دەستەیەك لە هاوەڵانیدا بوو، بە رۆژدا كاری دەكرد و بۆی خەرج دەكردن، شەو لە شوێنێك كۆدەبوونەوە و بەڕۆژوو دەبوون(واتە پارشێویان بۆ رۆژوو دەكرد)، هەندێ جار لە گەڕانەوەی لە كار ئیبراهیم دوادەكەوت، شەوێك وتیان: وەرن بەبێ ئەو پارشێوەكەمان بكەین بۆ ئەوەی شەوێكی تر زوو بێتەوە بۆ لامان، بۆیە پارشێویان كرد و خەوتن، كاتێك ئیبراهیم گەڕایەوە بینی خەوتوون، وتی: ئەی گەدایان و هەژاران، لەوانەیە خواردنیان دەستنەكەوتبێت پارشێوی پێ بكەن، هەندێ ئاردی هێنا و شێلای و ئاگری كردەوە و پشكۆی گەشاندەوە، بەئاگاهاتن، بینیان فوو لە پشكۆ و ئاگرەكە دەكات، وتیان چی دەكەی؟

وتی: وتم لەوانەیە هیچ نەبووبێت پارشێوی پێ بكەن و خەوتبن.. پێمخۆش بوو كاتێك بەئاگا دێن نانەكە پێگەیشتبێت.

**هەندێكیان وتیان بە هەندێكی تریان:** تەماشا بكە ئێمە چیمان ئەنجامدا و ئەو چۆن مامەڵە لەگەڵ ئێمە دەكات.

**وتراوە:** گەر كەسێك هاوەڵی ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەمی بكردبایە سێ مەرجی لەسەر دەگرت:

خزمەتكردن و بانگدان بۆ ئیبراهیم بێت، دەستبردنی بۆ دونیا هەروەك دەستبردنی ئەوان وابێت بۆ دونیا.

ڕۆژێك یەكێك لە هاوەڵانی پێی وت: من ناتوانم بچمە ژێر ئەو مەرجانە؟

وتی: سەرسامم بە ڕاستگۆییت.

**یوسفی كوڕی حوسەین دەڵێت:** وتم بە **"ذي النون"**: هاوەڵی كێ بكەم؟

وتی: هاوەڵی كەسێك بكە ئەوەی خودا دەربارەی تۆ دەیزانێت بتوانیت لێی نەشاریتەوە.

**سەهلی كوڕی عەبدوڵا وتی بە پیاوێك:** گەر لەو كەسانەی لە دڕندە دەترسی هاوەڵیم مەكە.

**بیشری كوڕی حاریس دەڵێت:** هاوەڵی كەسی بەدكار گومانی خراپ بە چاكان دروست دەكات.

**لە جونەیدەوە باسكراوە وتوویەتی:** كاتێك ئەبو حەفص هات بۆ بەغداد كەسێكی لەگەڵ بوو سەری ڕووتابوویەوە، هیچی باس نەدەكرد، پرسیارم كرد لە هاوەڵەكانی ئەبی حەفص دەربارەی حاڵی ئەو پیاوە، وتیان: ئەو پیاوە سەد هەزار درهەمی بۆ ئەبو حەفص خەرجكردووە و سەد هەزار درهەمیشی قەرز كردووە و دیسان بۆی خەرج كردووە، ئەبو حەفص مۆڵەتی نادات تەنها یەك پیتیش لە دەمی دەربچێت.

**"ذو النون" دەڵێت:** بەتەبایی هاوەڵی خودا بكە، بەئامۆژگاری و چاكە هاوەڵی مەردوومان بكە، بە سەرپێچی كردن هاوەڵی نەفسی خۆت بكە، بە دوژمنایەتی كردن هاوەڵی شەیتان بكە.

**پیاوێك وتی بە "ذو النون" هاوەڵی كێ بكەم؟**

**وتی:** هاوەڵی كەسێك بكە گەر نەخۆش كەوتی سەردانت بكات و گەر خراپەیەكت بەرانبەری ئەنجامدا لێت ببورێت.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** درەخت گەر بۆ خۆی بڕوێت و كەسێك نەیڕوێنێت گەڵا دەكات و سەوز دەبێت، بەڵام بەر نادات، موریدیش هەر بەو جۆرەیە گەر مامۆستایەكی نەبێت پەروەردەی بكات هیچی لێوە پەیدا نابێت.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق دەیوت:** ئەم ڕێگەیەم لە "نەصرابادی"یەوە وەرگـرت، نەصرابادی لە شیبلی وەرگرت، شیبلی لە جونەیدی وەرگرت، جونەیـد لـە **"السـري"** وەرگرت، "السری" لە مەعرووفی کەرخی وەرگرت، مەعرووفی کەرخی لە داودی تـائی وەرگرت، داودی تائیش بە خزمەتی شوێنکەوتووان گەیشت بوو.

**هەروەها گوێم لـێ بـوو مامۆسـتا ئـەبو عـەلی دەیـوت:** هـەر کـات چـووبم بـۆ دانیشتنەکانی نەصرابادی پێشتر خۆم دەشۆری.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** منیش لە سەرەتای دەسـتپێکردنمەوە هـەرکات چـووبمە خزمەتی مامۆستا ئەبو عەلی خـۆم دەشـۆری مەگـەر بەڕۆژووبوومایـە، چـەندین جـار دەچـوومە دەرگـای قوتابخانەکـەی و لـە شـەرمدا دەگەڕامـەوە، گـەر جارێـك بـوێریم بکردبایە و بچوومایەتە قوتابخانەکەی کـە دەگەیشـتمە ناوەڕاسـتی قوتابخانەکـە شـێوە بێئاگاییەك لە شەرمدا رووی لێ دەکردم تەنانەت دەرزی بە لەشەمدا بکرابایە لەوانەیە هەستم پێ نەکردبایە، پاشان کە دادەنیشتم پرسیاری هیچ بابەتێکم لێ نەدەکرد، بەڵام ئەو هەموو ئەو شتانەی لە من روویانداوە باسی دەکرد، چەندین جار بەئاشـکرا ئـەوەم لێ بینیوە، زۆر جار لە ناخی خۆمدا بیرم دەکردەوە گەر لە سەردەمێکدابوومایە خـودا پێغەمبەرێکی رەوانە بکردبایە بۆ خەڵکی ئایا لە دڵمدا ئەوەندە شەرم و حـەیام دەبـوو بەرانبەری، وێنام نەدەکرد ئەوە رووبدات و لە درێژایی دانیشتنەکانم لە خزمەتی باسی ئەوەم نەدەکرد، لەو ماوەیەی لە خزمەتیدا بووم هەرگیز بەرهەڵستی کـردن بەرانبـەری بە بیرمدا نەهاتووە تا (رەحمەتی خودای لێ بێت) لە دونیا دەرچوو.

**"محمد بن النضر الحارثي" دەڵێت: خودا** وەحی بۆ موسا(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: بەئاگابە، هاوەڵ بۆ خۆت داوا بکە، هەر هاوەڵێك خۆشیت بۆ نەهێنێت وازی لێ بهێنە و هاوەڵی مەکە، چونکە دڵت رەق دەکات و ئەو دوژمـنی تۆیـە، زۆر یـادی مـن بکـە شایستە دەبیت بە شوکری من و چاکەی خۆمت بۆ زیاد دەکەم.

**"أبوبكر الطمستاني" دەڵێت:** لەگەڵ خودا هاوەڵی بکەن، گەر نەتانتوانی، هـاوەڵی ئەو کەسە بکەن هاوەڵی خودا دەکات تاکو بەرەکەتی هاوەڵی ئـەوان بتانگەیـەنێت بـە هاوەڵی خودا(عز وجل).

٤٣

# یەکتایی

> ((جونەید دەڵێت: گەر ژیری هۆشمەندان لە وەسێت بۆ کردن کۆتایی هات بۆ لای سەرسامی کۆتایی دێت))

خودا (ﷻ) دەفەرموێت: ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾﴾ البقرة: ١٦٣

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((پیاوێك لەوانەی پێش ئێوە جگە لە یەکتاپەرستی هیچ خێرێکی تری نەبوو، وتی بە خانەوادەکەی: گەر مردم بمسوتێنن و پاشان بهاڕن و ئەوجا لە رۆژێکی بارەشدا تۆزەکەم بە وشکانی و دەریادا پەرشوبڵاو بکەنەوە، ئەوانیش بەو جۆرەیان لێکرد، خودا بە بای فەرموو: ئەوەی لەگەڵ خۆت بردووتە بیگێڕەرەوە، بۆیە کەسەکە هاتەوە بەردەستی خودا، خودا پێیفەرموو: چی وای لێکردی ئەو کارە ئەنجام بدەی؟ ئەویش وتی: شەرمم کرد لە تۆ، بۆیە خودا لێیخۆش بوو))

**یەکتاپەرستی:** بڕیاردانە بەوەی خودا تاکوتەنهایە، زانست بەوەی شتەکە یەك بێت بریتییە لە یەکتایی.

**لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت:** "وحدتە-تەنهامکردەوە" کاتێك بە تاکوتەنهایی وەسفی بکەی، وەك دەوترێت: "شجعت فلانا" کاتێك بە ئازایەتی وەسفی بکەی، دەوترێت: (وحد یحد) کەوابوو ئەو (واحد) و (وحد) و (وحید)ە، وەك چۆن دەوترێت: (فرد) کەوابوو ئەو (فارد) و (فرد) و (فرید)ە.

ریشەی "أحد" بریتییە لە (وحد)ە، "واو"ەکە بووە بە هەمزە.

**مانای ئەوەی خودا(ﷻ) لەسەر زمانی زانست تاکوتەنها(یەك) بێت وتراوە:** ئەو کەسەیە نە دەتوانی بخەیە سەری نە دەتوانی لێی لاببەی، بە پێچەوانەی ئەو قسەت کە دەڵێیت: "إنسان واحد" چونکە بەبێ دەست و قاچیش هەر دەڵێی مرۆڤ، واتە دەتوانی شتێکی لێ هەڵبگریت، خودا(ﷻ) زاتی تاکوتەنهایە بە پێچەوانەی ناوی مرۆڤەوە کە کۆمەڵێك وەسف لەخۆ دەگرێت.

**هەندێ لە زانایان دەڵێن** مانای "واحد" بریتییە لە نەرێکردنی دابەشکردن لە خودی خۆیدا و نەرێکردنی لێکچوون لە ناو و سیفەتیدا و نەرێکردنی هاوەڵ لە کردار و دروستکراوەکانیدا.

## یەکتایی سێ بەشە:

**یەکتایی حەق(ﷻ) بۆ حەق** ئەوەش زانستی خودایە بەوەی تاکو تەنهایە وەك چۆن هەواڵیداوە و رایگەیاندووە.

**دووەم:** یەکتایی حەق(ﷻ) بۆ دروستکراوەکان، ئەوەش ئەوەیە خودا(ﷻ) بڕیاریداوە بەوەی بەندە یەکتاپەرستە و یەکتاپەرستی بەندەکەی ئەفرێنراوی ئەوە.

**سێیەم:** یەکتاپەرستی دروستکراوەکان بۆ حەق(ﷻ) ئەوەش زانستی بەندەکەیە بەوەی خودا(ﷻ) تاکوتەنهایە و بڕیاردان لەوەی ئەو(ﷻ) یەکە و هاوتا و هاوشانی بۆ نییە.

ئەمە پوختەیەکە لە مانای یەکتایی بە شێوەیەکی کورت و دیاریکراو.

## گوزارشتی پیاوانی ئەم دەستەیە لەسەر مانای یەکتایی جۆراوجۆرە:

**پرسیار لە "ذو النون" کرا دەربارەی یەکتایی، وتی:** ئەوەیە بزانیت توانا و دەسەڵاتی خودا لەناو شتەکاندا بەبێ تێکەڵبوونە و دروستکردنی شتەکان بەبێ چارەسەرە(واتە کارەکانی "کن فیکون"ە)، خودا هۆی دروستکردنی هەموو شتێکە، و هیچ هۆیەك بۆ بوونی خودا بوونی نییە، هەرچی تۆ لە بیری خۆتدا دەربارەی خودا(زاتی خودا) بیری لێدەکەیەوە خودا بەپێچەوانەی ئەوەوەیە.

**"الجريري" دەڵێت:** زانستی یەکتاپەرستی بریتییە لە زمانی یەکتاپەرستی.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی یەکتاپەرستی وتی:** بریتییە لە تەنهاکردنەوەی یەکتاپەرست بە هێنانەدی زانینی یەکتایی خودا بە کەماڵی یەکتایی خودا کە ئەو یەکەو لە کەس نەبووەو کەسی لێ نابێت، بە نەرێکردنی دژ و هاوشێوە بەبێ شوبهاندن و چۆناندن و وێناکردن و نموونانندن﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ۝١١﴾ **الشورى: ١١**.

**هەروەها جونەید دەڵێت:** کاتێك ژیری هۆشمەندان لە یەکتاپەرستیدا گەیشتە بنبەست دەگاتە سەرسامی.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی یەکتاپەرستی، وتی:** مانایەك وێناکردنی تێدا دەپووکێتەوە، و زانستەکانی دەکەونە ژێرییەوە، و خودا بەو جۆرەیە کە لە ئەزەلدا بووە.

**"الحصري" دەڵێت:** بنچینەکانی ئێمە لە یەکتاپەرستیدا پێنج شتە: هەڵگرتنی رووداو، و تەنهاکردنەوەی دێرین، و کۆچکردن لە برایان و جیابوونەوە لە نیشتمان و لەبیرچوونەوەی ئەوەی دەیزانێ و ئەوەی نایزانێت.

**مەنصووری کوڕی خەلەفی مەغریبی دەڵێت:** لە مزگەوتی مەنصوور بووم لە بەغداد، **"الحصري"**م بینی قسەی دەکرد دەربارەی یەکتایی خودا، دوو فریشتەم بینی بەرەو ئاسمان بەرزدەبوونەوە، یەکێکیان بەویتریانی وت: ئەوەی ئەو پیاوە دەیڵێت بریتییە لە زانستی یەکتاپەرستی، یەکتاپەرستیش شتێکی ترە، واتە لە نێوان بەئاگایی و نووستندا بووم.

**"فارس" دەڵێت:** یەکتاپەرستی بریتییە لە بەردانەوەی ناوەندگیر لەباری زاڵبوونی حاڵدا و گەڕانەوە بۆ ناوەندگیر لە باری حوکمەکاندا، و چاکەکان بەشەکانی بەدبەختی و بەختەوەری ناگۆڕێت.

**شیبلی دەڵێت:** یەکتایی لە راستەقینەدا سیفەتی خودایە، و لە رێوڕەسمیشدا پۆشاکی بەری کەسی یەکتاپەرستە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی یەکتاپەرستی تایبەت وتی:** ئەوەیە بەندە لەبەردەم خودادا تەخت بووبێت، هەڵسوڕانی تەگبیری خودایی لە گوزەرکردنی حوکمەکانی دەسەڵاتی خودا بەسەریدا گوزەر بکات لە شەپۆلەکانی دەریای یەکتایی خودادا بە فەنابوون لە نەفسی خۆی و بانگەوازی خەڵك بۆی و وەڵامدانەوەی بە راستەقینەی بوون و یەکتایی خودا لە حەقیقەتی نزیکی لە خوداوە بە رۆیشتنی هەست و جووڵەی بەندە، بۆ هەستان بە مافی خودا(ﷻ) لەوەی لێی داوا دەکات، ئەوەش بەوە دەبێت کۆتایی بەندە بێتەوە بۆ سەرەتای و وەك ئەو کاتەی لێ بێت بەر لەوەی ببێت.

**پرسیار لە "البوشنجی" کرا دەربارەی یەکتایی خودا وتی:** لە زاتدا ناشوبهێنرێت و سیفەتەکانی نەرێ ناکرێن.

**پرسیار لە سەهلی کوڕی عەبدوڵا کرا دەربارەی زاتی خودا(ﷻ) وتی:** زاتی خودا بە زانست وەسفکراوە، بە ئابلۆقەدان پەیی پێ نابرێت، و لە خانەی دونیادا بە چاوان نابینرێت، ئەو(ﷻ) بوونی هەیە بە حەقیقەتی باوەڕ بەبێ رادە و ئابلۆقەدان و تێکەڵبوون و توانەوە، لە رۆژی دواییدا خودا بە ئاشکرا دەبینرێت لە موڵك و دەسەڵاتیدا، دروستکراوەکانی لە زانینی حەقیقەتی زاتی خۆی بێبەش کردووە و بە ئایەتەکانی رێنموونیان دەکات بۆ لای خۆی، دڵان خودا دەناسن و ژیریەکان پەی بە خودا نابەن، باوەڕداران بە چاوان تەماشای خودا دەکەن بەبێ ئابلۆقەدان و پەیبردن بە کۆتایی.

**هەروەها جونەید دەڵێت:** بالاترین وشە لە یەکتاپەرستیدا ئەوەیە ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی رازی بێت) فەرموویەتی: پاکێتی بۆ ئەو خودایەی رێگەیەکی بۆ دروستکراوەکانی نەهێڵاوەتەوە بۆ گەیشتن بە ناسینی مەگەر بە دەستەوسانی لە ناسینی ئەو(ﷻ).

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** مەبەستی صدیق(خوا لێی رازی بێت) ئەوە نییە خودا ناناسرێت، چونکە لای ئەهلی ئەم رێگە دەستەوسانی دەستەوسانییە لە هەبوون نەك لە نەبوون، وەك کەسێك کە دایدەنیشێنن، بەڵام دەستەوسانە لە دانیشتن، دانیشتنەکە

بەری هەوڵ و کاری ئەو نییە، و دانیشتنەکەش تیایدا بـوونی هەیـە، هـەر بـەو جـۆرە کەسی عـاریف دەستەوسانە لە مـەعریفەکەی، مـەعریفەشی تێدایە، چونکە حاڵـەتێکی زەرووریـیە.

لای پیاوانی ئەم دەستەیە کۆتایی مەعریفە بە خودا(ﷻ) زەرووریـیە.

مەعریفەی بەدەستهێنراو لە سەرەتاوەیە، با مەعریفەیـەکی بەدەسـتهێنراویش بێـت ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی رازی بێت) بە شـتێکی دانـەناوە بـەراورد بـە مـەعریفـەی زەرووری، وەك چـرا لـە کـاتی هـەڵهاتنی خـۆر و پەرشـبوونەوەی تیشـك و روونـاکی بەسەریدا.

**جونەید دەڵێت:** ئەو یەکتاپەرستییەی سـۆفییەکانی پـێ تەنهاکـەوتووە بریتییـە لـە تەنهاکردنەوەی دێرین لە رووداو و دەرچوون لە نیشتمان و برینی پەتی خۆشویسـتراو و وازهێنان لەوەی دەیزانێ و نایزانێ، و حەق(ﷻ) جێگەی هەموو شتێك بگرێتەوە.

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** هەر کەس بکەوێتە ناو دەریـای یەکتاپەرسـتییەوە بە تێپەڕبوونی کات تینوێتی زیاد دەکات.

**جونەید دەڵێت:** زانستی یەکتاپەرستی لـە بـوونی ئـەو(ﷻ) جیـاوازە، بوونیشـی لـە زانستی جیابووەتەوە.

**هەروەها جونەید دەڵێت:** زانستی یەکتاپەرستی ماوەی بیست سـاڵە راخـەری خـۆی پێچاوەتەوە، خەڵکی تەنها قسە لە پەراوێزی ئەو زانستە دەکەن.

**پیاوێك بە حوسەینی کـوڕی مەنصـووری وت:** ئـەو حەقـە کامەیـە ئامـاژەی پـێ دەکەن؟ وتی: ئەو کەسەی هۆی هەموو شتێکە و هیچ شتێك هۆی ئەو نییە.

**بە شیبلی وترا** هەواڵمان پێ بدە دەربـارەی یەکتاپەرسـتی رووت و یـەکلابووەوە بـە زمانێکی رەوای تەنهاکەرەوەی خودا، ئەویش وتی: هاوار لەدەست تۆ.. هەر کەس بـە ئاماژە وەڵامی یەکتاپەرستی بداتەوە ئەو کەسە مولحیدە(لادەرە)، هەرکەس دەستی بۆ رابکێشێت کەسێکە بوونی خۆی و ئەوی ئاماژە پێداوە، هەر کەس ئاماژەی پێ بکات بەندەیەکی بتپەرستە، هەر کەس قسەی تێدا بکات کەسێکی بێئاگایە، هەر کەس لێی

بێدەنگ بێت کەسێکی نەزانە، هەر کەس ئەندێشەی ئەوەی لا دروست ببێت گەیشتووە کەسێکە هیچی بەدەستنەهێناوە، هەر کەس پێیوایە ئەو نزیکە ئەوا ئـەو دوورە لێـی، هەر کەس بینییەوە ئەوا بزری کردووە، هەموو ئەوەی بە ئەندێشە جیای دەکەنەوە و بە ژیریتان پێی دەگەن لە تـەواوترین مانـادا ئـەوە دەدرێتـەوە بـە سـەرتاندا و رووداوە و هەروەك خۆتان دروستکراوە.

**یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێت:** یەکتاپەرستی تایبەت ئەوەیە بە نهێنی و وەجد و دڵ و دەروونی وەك ئەوە وابێت لەبەردەم خودادا وەستاوە و تەگبیرەکانی خودا و بڕیارەکانی دەسەڵات بەسەریدا گوزەر دەکەن لە دەریای یەکتاپەرستی خودادا بەبێنیازبوون لە خۆی و ڕۆیشتنی هەستەکانی، هەستان بە مافی حەق(ﷻ) لەوەی لێی داواکردووە، ئەوکات بەو جۆرە دەبێت بەر لە گوزەرکردنی بڕیارەکانی خودا(ﷻ) بەسەریدا.

**وتراوە:** یەکتایی بۆ خودا سیفەتێکی دێرینە و دروستکراوەکان لەسەری مشەخۆرن.

**وتراوە:** یەکتاپەرستی لابردنی **"یاء"**ەکانە، نەڵێیت: **"لي و بي و معي و إلي**-بۆ من، بە من، لەگەڵ من، بۆ لای من" واتە کۆتاهاتن بە **"من"**.

**بــە ئەبوبــەکری تەمســـتانی وتــرا:** یەکتاپەرسـتی چـییە؟ وتـی: بریتییـە لـە: یەکتاپەرستی و یەکتاپەرست و یەکتا(خودا)، ئەم سیانەیە.

**ڕوەیم دەڵێت:** یەکتایی ئاساری مرۆیی و دارِنینی خواوەندییە.

**گــوێم لــە مامۆســتا ئــەبو عــەلی دەقــاق بوو(ڕەحمــەتی خــودای لــێ بێــت) لــە کۆتاییــەکانی تەمەنیــدا-کــە نەخۆشــی زۆری بــۆ هێنــا بــوو- دەیــوت: لــە** نیشـانەکانی پشـتیوانی کـردن پارێزگارییـە لـە یەکتاپەرسـتی لـە کاتـەکانی حوکمـدا، پاشـان-وەك لێکـدەرەوەی قسـەکەی خـۆی و ئامـاژە بـە حـاڵی خـۆی- وتـی: ئەوەیـە بـە گـازی دەسـەڵاتی خـۆی لـە تێپەڕانـدنی حوکمەکانیـدا پارچـە پارچـەت بکـات و تـۆش شوکرکار و حەمدکار بیت.

**شــیبلی دەڵێــت:** بــۆنی یەکتاپەرســتی نــەکردووە هــەر کــەس وا وێنــا دەکــات یەکتاپەرستی لەلایە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** یەکەمین مەقام بۆ ئەو کەسەی زانستی یەکتاپەرستی بینیوەتەوە و هێناویەتە دی بریتییە لە فەنابوونی یادی شتەکان لە دڵی و تەنهاکەوتنەوەی بە خوداوە(ﷻ).

**شیبلی بە پیاوێکی وت:** دەزانی بۆ یەکتاپەرستییەکەت دروست نییە؟

وتی: نەخێر.

وتی: چونکە بە خۆتەوە داوای خودا دەکەی.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** نیشانەی حەقیقەتی یەکتاپەرستی لەبیرچوونەوەی یەکتاپەرستییە، ئەوەش ئەوەیە بە تاك و تەنهایی پێیەوە راوەستابێت.

**دەوترێت:** خەڵکانێك هەن پەردەیان بۆ لادراوە، کردارەکان و رووداوەکان بە خوداوە(ﷻ) دەبینێت، هەیانە بە حەقیقەت پەردەی بۆ لادراوە هەستکردنی بە هەموو شتێك جگە لە خودا پووکاوەتەوە، ئەو بە نهێنی کۆبوونەوە بە پەنهان دەبینێت، و رووالەتیشی بە جیابوونەوە وەسف دەکرێت(واتە لە ناوەوە لە حاڵی کۆبوونەوەدایە و لە دەرەوە جیابوونەوە).

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی یەکتاپەرستی وتی:**

**وغنى لي من قلبي**

**وغنيت كما غنى**

**وكنا حيثما كانوا**

**وكانوا حيثما كنا**

(لە دڵەمەوە ئاوازی بۆ وتم، ئەو چۆن هاتە ئاواز منیش هاتمە ئاواز، ئەوان چۆن بوون ئێمەش وابووین، ئێمە چۆن بووین ئەوانیش وابوون)

**پرسیارکەرێك وتی: قورئان و ریوایەت تیاچوو؟**

وتی: نەخێر، بەڵام کەسی یەکتاپەرست باڵاترین یەکتاپەرستی لە نزمترین گوتار و ئاسانترینییەوە وەردەگرێت.

٤٤

# حاڵ و باریان لە کاتی دەرچوون لە دونیا

**((ئەوە دەزانی زیندووان زیندوون با بشمرن.. تەنها لە خانەیەکەوە دەچن بۆ خانەیەکی تر))**

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ﴾ النحل: ٣٢**، واتە بە دەروونێکی پاکەوە، بە بەخشینی هەموو شتێك بە خودا، بۆیە کاتی گەڕانەوەیان بۆ لای مەولایان(ﷻ) هیچ شتێك کۆڵی شانیان قورس ناکات.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((بەندە لە ئازار و مەستی سەرەمەرگدایە، جومگەکانی جەستەی هەندێکیان خواحافیزی لە هەندێکی تریان دەکەن، دەڵێن: "علیك السلام" ئیتر لێم جیادەبییەوە و لێت جیادەبمەوە هەتا رۆژی دوایی))

**دیسان لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت): ((پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشت بۆ لای گەنجێك لە سەرەمەرگدا بوو، فەرمووی:** حاڵت چۆنە؟ وتی: رجام هەیە لە لای خودا(ﷻ) و لە گوناهەکانم دەترسم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە دوو شتن لە دڵی هەر بەندەیەکی باوەڕداردا -لەم کات و حاڵەدا- کۆببنەوە خودا ئەوەی رجای دەکات پێی دەبەخشێ و ئەوەی لێی دەترسێت پەنای دەدات لێی))

بزانە حاڵی ئەهلی رێگە لە سەرەمەرگدا جۆراوجۆرە، هەندێکیان زاڵ بەسەریاندا هەیبەتە، و هەندێکیان زاڵ بەسەریاندا رجایە، هەندێکیان لەو حاڵەتەدا پەردەی بۆ لادراوە و سوکنایی و ئارامی و متمانەی جوانی بۆ پێویست بووە.

**"أبو محمد الجريري" دەڵێت:** لەسەرەمەرگدا لەلای جونەید بووم-کە رۆژی هەینی بوو لە هەمان کاتدا یەکەم رۆژی نەورۆز بوو- قورئانی دەخوێندەوە، قورئانی خەتم کرد، وتم: ئا لەم حاڵەتەدا قورئان خەتم دەکەی ئەی باوکی قاسم؟

وتی: جا چ کەسێك هەیە لەپێشتر بێت لە من بە خوێندنی قورئان لە کاتێکدا لاپەڕەی کار و کردەوەکانم دەپێچرێتەوە.

**"أبو محمد الهروي" دەڵێت:** ئەو شەوەی شیبلی مرد من لەلای مامەوە، بەدرێژایی ئەو شەوە ئەم دوو دێڕە هۆنراوەی دووبارە دەکردەوە:

**كل بيت أنت ساكنه**

**غير محتاج إلى السرج**

**وجهك المأمول حجتنا**

**يوم يأتي الناس بالحجج**

(هەر ماڵێك تۆ تیایدا نیشتەجێ ببیت ئاتاج نییە بە چرا، رووی پڕ لە هیوات بۆ ئێمە بەڵگەی دەستمانە لەو رۆژەی خەڵکی بەڵگەی خۆیان دەهێنن)

**دەگێڕنەوە "حمدون القصار"** وەسێتی بۆ هاوەڵانی خۆی کرد لە حاڵەتی مردندا لەناو ژناندا بەجێینەهێڵن.

**لە سەرەمەرگدا وترا بە بیشری حافی:** ئەی باوکی نەصر وەك ئەوەی ژیانت خۆشبوێت؟

وتی: رۆیشتن بۆ لای خودا(ﷻ) زۆر گرانە.

**وتراوە:** کاتێك هەندێ لە هاوەڵانی سوفیانی سەوری بۆ سەفەرکردن خواحافیزییان لە سوفیان دەکرد پێیان دەوت: کارێك، فەرمانێکت هەیە بۆت ئەنجام بدەین؟

دەیوت: گەر مردنتان بینییەوە بۆم بکڕن.

کاتێك مردن لێی نزیك بوویەوە دەیوت: کاتی خۆی خۆزگەمان بۆ دەخواست کەچی بینیمان زۆر گرانە.

**وتراوه:** کاتێك مردن له حه‌سه‌نی کوڕی عه‌لی نزیکبوویه‌وه ده‌ستی به گریان کرد، پرسیان بۆ ده‌گریت؟

وتی: ده‌چم بۆ لای گه‌وره‌یه‌ك نه‌مبینیوه؟

**کاتێك بیلال(خودا لێی رازی بێت) که‌وته سه‌ره‌مه‌رگ ژنه‌که‌ی وتی:** هاوار بۆ ئه‌م خه‌م و دڵته‌نگییه! بیلال فه‌رمووی: به‌ڵکو هاوار بۆ ئه‌م خۆشی و سرووره، سبه‌ینێ به خۆشه‌ویستان ده‌گه‌ینه‌وه، **محه‌مه‌د** و هاوه‌ڵانی.

**وتراوه:** عه‌بدوڵای کوڕی موباره‌ك له سه‌ره‌مه‌رگدا چاوه‌کانی کرده‌وه و پێکه‌نی و وتی: ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴿٦١﴾﴾ الصافات: ٦١

**وتراوه:** مه‌کحولی شامی هه‌میشه دڵته‌نگی زاڵ بوو به‌سه‌ریدا، له نه‌خۆشی مردنه‌که‌یدا و له سه‌ره‌مه‌رگدا رۆیشتن بۆ لای بینییان پێده‌که‌نی، له‌و باره‌یه‌وه پرسیاریان لێکرد وتی: بۆچی پێنه‌که‌نم ئه‌و دابڕانه‌ی بیرم لێ ده‌کرده‌وه نزیکبووه‌ته‌وه و به‌زوویی روو له‌و شتانه ده‌که‌م هیوا و ئاواتم بۆ ده‌خواست.

**ره‌وه‌یم ده‌ڵێت:** ئاماده‌ی سه‌ره‌مه‌رگی ئه‌بو سه‌عیدی خه‌راز بووم ئه‌م چه‌ند دێڕه هۆنراوه‌ی ده‌خوێنده‌وه:

**حنين قلوب العارفين إلى الذكر وتذكارهم وقت المناجاة للسر**

**أديرت كؤوس المنايا عليهم فأعفوا عن الدنيا كإعفاء ذي السكر**

**همومهم جوالة بمعسكر به أهل ود الله كالأنجم الزهر**

**فأجسامهم في الأرض قتلى بحبه وأرواحهم في الحجب نحو العلا تسري**

**فما عرسوا إلا بقرب حبيبهم وما عرجوا عن مس بؤس ولا ضر**

(حه‌نینی دڵی عاریفان بۆ لای زیکری خودایه، یادهێنانه‌وه‌یان له کاتی موناجتدا بۆ نهێنییه، پیاڵه‌ی مردن گه‌ڕایه‌وه سه‌ریان بۆیه دونیایان به‌خشی وه‌ك به‌خشینی که‌سی مه‌ست و سه‌رخۆش، په‌ژاره‌ی ئه‌وان له سه‌ربازگه‌یه‌کدا هات وچۆ ده‌کات که وه‌ك ئه‌ستێره دره‌وشاوه‌کان ئه‌هلی خۆشه‌ویستی تێدایه، جه‌سته‌یان له زه‌ویدا به

خۆشەویستییەکەی کوژراوە و رۆحەکانیان لە پەردەکاندا بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە، ئەوان تەنها لە نزیکی خۆشەویستەکەیانەوە ئارامیان بۆ دێت و لە هەژاری و زیان و ناخۆشی دونیا بەرزدەبنەوە)

**وترا بە جونەید ئەبو سەعید لەسەرەمەرگدا وەجدی زۆر بوو! وتی:** کارێکی سەیر نییە رۆحەکەی بە هۆی شەوقەوە فڕی بێت.

**یەکێك لە پیاوان کاتێك لە مردن نزیکبوویەوە وتی:** ئەی گەنج دەست بە پشتمەوە بگرە و خۆڵ بکە بە روخسارمدا، پاشان وتی: رۆیشتن نزیکبووەتەوە و لە گوناهان پاکنەبوومەتەوە و پاساو و بیانوویەکیش بۆ لای خودا شك نابەم و هێز و پەنایەکیش نییە پەنای بۆ ببەم، ئەی خودایە تۆ بۆ من بە، تۆ بۆ من بە، پاشان هاوارێکی کرد و مرد، ئەوانەی ئامادەبوون گوێیان لە دەنگێك بوو وتی: ئەو بەندەیە بۆ مەولای خۆی زەلیل و گەردنکەچ بوو، خوداش ئەوی قبووڵ کرد.

**یەکێك لە پیاوان لە سەرەمەرگدا بوو پێی وترا:** بڵێ: اللّٰه، وتی: تا کەی دەڵێن بڵێ اللّٰه لە کاتێکدا من بە خوداوە سووتاوم؟!

**پیاوێك دەڵێ:** لە لای مەمشادی دەینووری دانیشتبووم، هەژارێك هاتە ژوورەوە و وتی: السلام علیکم، هەموو سەلامەکەیان وەڵامدایەوە، وتی: ئایا شوێنێکی پاك هەیە مرۆڤ بتوانێت تیایدا بمرێت؟ ئەوانیش شوێنێکیان بۆ دەستنیشان کرد، لەو شوێنە کانییەك هەبوو، کەسە هەژارەکە دەستنوێژی لەسەر کانییەکە تازە کردەوە و چەندە خودا بیەوێت نوێژی کرد و پاشان لاقەکانی راکێشا و مرد.

**ئەبو عەباسی دەینووری** رۆژێك لە مەجلیسێکیدا قسەی دەکرد، ئافرەتێك بە هۆی وەجدەوە هاواری لێ بەرزبوویەوە، ئەبو عەباس پێی وت: بمرە، ژنەکە هەستایە سەرپێی و دەستی بە رۆیشتن کرد کاتێك گەیشتە دەرگای خانووەکە لای بە لای ئەبو عەباسدا کردەوە و وتی: پێشکەوتم، یەکسەر بەربوویەوە و مرد.

**یەکێك دەڵێت:** لە سەرەمەرگدا لەلای مەمشاد دەینووری بووم، پێی وترا: لەگەڵ نەخۆشییەکەت چۆنی؟

وتی: پرسیار له نەخۆشییەکه بکەن حاڵی لەگەڵ من چۆنه، پێیوترا: بڵێ **"لا إله إلا الله"** ئەویش رووی وەرچەرخاند بۆ دیوارەکه و وتی: هەموو بوونی خۆمم بۆ تۆ فانی کرد، ئەمه پاداشتی ئەو کەسەیه تۆی خۆشدەوێت.

**له سەرەمەرگدا به ئەبی محەمەدی دوبەیلی وترا: بڵێ: "لا إله إلا الله"**، وتی: ئەوه شتێکه پێشتر ناسیومانه و زانیومانه، هەر بەوەشەوه فانی بووین.

**له سەرەمەرگدا به شیبلی وترا: بڵێ"لا إله إلا الله" ئەویش وتی:**

**قال سلطان حبه أنا لا أقبل الرشا**

**فسلوه بحقه لم بقتلي تحرشا**

(دەسەڵاتی خۆشەویستییەکەی وتی من بەرتیل وەرناگرم، به حەقی ئەو پرسیاری لێ بکەن بۆ دەستدرێژی کرده سەرم و منی کوشت)

**دەڵێن:** کاتێك **"يحيى الأصطخري"** کەوته سەرەمەرگ له دەوری کۆبووینەوه، پیاوێك پێی وت: بڵێ: **"أشهد لا إله إلا الله"** ئەویش راستبوویەوه و دانیشت و دەستی یەکێك له ئێمەی گرت و پێی وت: بڵێ: **"أشهد لا إله إلا الله"**، پاشان دەستی یەکێکی تری گرت و به هەمان شێوه، تا شایەتانی بەسەر هەمواندا خستەڕوو و پاشان مرد.

**فاتیمەی خوشکی ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** کاتێك مردن له براکەم (ئەبو عەلی) نزیکبوویەوه، سەری له کۆشمدا بوو، چاوەکانی کردەوه و وتی: ئەوا دەرگاکانی ئاسمان کرانەوه، ئەوا بەهەشت خۆی رازاندەوه، ئەوه یەکێکه پێم دەڵێت: ئەی ئەبو عەلی تۆمان گەیاندە باڵاترین پله و پایه هەرچەند تۆ نەتدەویست، پاشان ئەم هۆنراوەی خوێندەوه:

**وحقك لا أنظر إلى سواكا بعين المودة حتى أراكا**

**أراك معذبي بفتور لحظ وبالحسد المورد من جناكا**

(به حەقی تۆ به چاوی خۆشەویستییەوه تەماشای هیچ کەسی تر ناکەم جگه له تۆ هەتا نەتبینم، دەبینم به ساردی سەرنج و حەسوودی هاتوو له نەیارەوه سزام دەدەی)

پاشان وتی: ئەی فاتیمە، دێڕی یەکەمیان ئاشکرایە، دێڕی دووەمیان تەمومژی پێوە دیارە.

**کاتێك ئەحمەدی کوڕی نەصر(رەحمەتی خودای لێ بێت)** لە مردن نزیکبوویەوە یەکێك پێی وت: بڵێ: "**أشهد لا إله إلا الله**" ئەویش تەماشای کرد و پێی وت: بێحورمەتی مەکە.

**یەکێك لە پیاوان دەڵێت:** پیاوێکی هەژاری غەریبم بینی، مێش دابوویە روخساری، منیش دانیشتم و مێشەکانم لێ دەردەکرد، چاوی کردەوە و وتی: تۆ کێی؟

من ئەوەندە ساڵە داوای کاتێك دەکەم تیایدا بگەمە خۆشی و سەفا بۆم رێنەکەوتووە جگە لە ئێستا، ئەوا تۆ هاتی و لێت تێکدام، بڕۆ، خوا رەحمت پێ بکات.

**"أبو عمران الأصطخري" دەڵێت:** ئەبو تورابم لە دەشت و سارا بینی بە پێوە مرد بوو، هیچ شتێك راینەگرتبوو.

**ئەبو نەصری سەراج دەڵێت:** هۆی مردنەکەی **"أبو الحسين النوري"** بیستنی ئەم دێڕە **هۆنراوە بوو:**

**لازلت أنزل في ودادك منزلا    تتحسر الألباب عند نزوله**

(بەردەوام لە سۆز و خۆشەویستی تۆدا مەنزڵگیری دەکەم، مەنزڵێك ژیری و هۆشی مرۆڤ لە کاتی پێتێخستنیدا حەسرەتی بۆ دروست دەبێت)

وەجد رووی لێکرد و رووی لە دەشت و سارا کرد و کەوت بەسەر بنکی قامیشی براودا کە وەك شمشێر تیژبوون، هەتا بەیانی بەسەریاندا دەڕۆیشت و ئەم هۆنراوەی دووبارە دەکردەوە و خوێن لە لاقەکانی دەڕۆیشت، پاشان وەك کەسێکی مەست بەربوویەوە و پێیەکانی برینیان کرد و کۆچی دوایی کرد.

**دەگێڕنەوە لە سەرەمەرگدا پێی وترا بڵێ:** "**لا إله إلا الله**" وتی: ئەی بۆ لای ئەو ناگەڕێمەوە؟!.

**وتراوه:** ئیبراهیمی خەواص لە مزگـەوتی"**الجامع**" لـە ڕەی نەخۆشـكەوت، نەخۆشـی سكچوونی لەگـەڵ بـوو، گـەر دانیشـتنێكی هەبوایـە دەچـووە نـاو ئـاو و دەسـتنوێژی دەگرت، جارێك چووە ناو ئاوێكەوە و گیانی دەرچوو.

**مەنصووری مەغریبی دەڵێـت:** لـە نەخۆشـییەكەی ئیبراهیمـی خەواصـدا یوسـفی كوڕی حوسەین سەردانی كرد، دوای ئەوەی ئەو چەند ڕۆژەی بەسـەری هـات كـە ڕۆژی وای بەخۆوە نەبینی بوو، ئەو لەگەڵ یوسف تێكەڵاوی نەبوو، كاتێك بینی بە خەواصی وت: حەزت لە شتێك هەیە؟

وتی: بەڵێ، پارچە جگەرێكی برژاو.

**ئـەبو قـاسمی قوشـەیری دەڵێـت:** لەوانەیـە مەبەسـتی بـە جگـەری بـرژاو بـوونی دڵێـك بووبێـت بەرانبـەر هـەژاران نـەرم و ناسـك بێـت، هـەروەها مانـای بـوونی جگـەرێك كـە بـۆ غـەریبان دەبـرژێ و هەڵدەقرچێت، چـونكە لەگـەڵ یوسـف غـەریب و نامۆ بوو.

**وتراوە:** هۆی مردنەكەی ئیبن عەتا ئەوە بوو جارێك ڕۆیشت بۆ لای وەزیر، ئەویش بە قسەی ڕەق مامەڵەی لەگەڵ كرد، ئیبن عەتا پێی وت: ئارام ببەوە ئـەی پیـاو، ئـەویش فەرمانی كرد بە خوفەكانی بەسەریدا بكێشن تا دەمرێت.

"**أبوبكر الدقي**" **دەڵێـت:** سـەرلەبەیانی لـەلای ئەبوبـەكری زەقـاق بـووین دەیـوت: خودایە، تا كەی من لێرە دەهێڵیتەوە؟!

نەكەوتەوە سبەینێ كۆچی دوایی كرد.

**ئەبو عەلی ڕۆزباری دەڵێت:** لەو دەشت و سارایە گەنجێكم بینی، كاتێك منی بینی وتی: ئایا ئەوەندەی بەس نییە بە خۆشەویستی عاشقی من بووە تا بـەرزی كردمـەوە، پاشان بینیم ڕۆحی خۆی دەبەخشی(واتە لە سەرەمەرگدا بوو)، پێم وت: بڵێ: "**لا إله إلا الله**"، ئەویش ئەم دوو دێڕە هۆنراوەی خوێندەوە:

**أيا من ليس لي عنه وإن عذبني بد**

**ويا من نسأل من قلبي منالا ماله حد**

(ئەی ئەو کەسەی گەر سزام بدەی هیچ چارێکم نییـە، ئـەی ئـەو کەسـەی لـە دڵـەوە شتێکی لێ داوا دەکەین رادە و سنووری بۆ نییە)

**بە جونەید وترا بڵێ: "لا إله إلا الله"** وتی: لەبیرم نەکردووە تاکو یادی بکەم، پاشان وتی:

**حاضر في القلب يعمره لست أنساه فأذكره**

**فهو مولاي و معتمدي ونصيبي منه أوفر**

(ئامادەی دڵ ئاوەدانی دەکاتەوە، لەبیرم نەکردووە تاکو یـادی بکـەم، ئـەو مـەولا و پشتیوانی منە و بەشم لەلای بەشێکی گەورەیە)

**عەبدوڵای کوڕی عەلی تەمیمی دەڵێت:** پرسیارم لە جەعفەری کوڕی نوصەیر کرد- کە خزمەتی شیبلی دەکرد- لە سەرەمەرگدا چیت لە شیبلی بینی؟

وتی: شیبلی وتی درهەمێك قەرزارم کە بە ستەم هاتووە بە لامدا، هەزاران درهەمم بۆ خاوەنەکەی کرد بە صەدەقە، هیچ شتێك لەسـەر دڵـم لـەوە گـەورەتر نییـە، پاشـان وتی: دەستنوێژم پێبگرە بۆ نوێژ، منیش دەستنوێژم پێگرت، لەبیرم چـوو دەسـتبخەمە ناو ریشییەوە، ئەو کاتە زمانی شکا بـوو، دەسـتی گـرتم و خسـتییە نـاو ریشـییەوە و پاشان مرد، جەعفەر گریا و وتـی: ئێـوە چـی دەڵـێن دەربـارەی پیاوێـك تەنانـەت لـە سەرەمەرگیشدا ئادابێك لە ئادابەکانی شەریعەتی لەبیرنەچووە!

**"المزين الكبير" دەڵێت:** لە مەککـە بووم(خـودا پارێزگـاری لـێ بکـات) بێزارییـەك رووی لێکردم بۆیە رووم لە مەدینە کرد، کاتێك گەیشتمە بیری مەیموونە گەنجێکم بینی درێژ راکشابوو، چوومە لای و بینیم لە سەرەمەرگدایە، پێم وت بڵێ: **"لا إله إلا الله"**، چاوەکانی کردەوە و وتی:

**أنا إن مت فالهوى حشو قلبي وبداء الهوى تموت الكرام**

(من گەر مردم ئارەزووی خۆشەویستی بووە بە کرۆکی دڵم، پایـەدارەکان بـە دەردی ئارەزوو دەمرن)

هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا و پاشان مرد، منیش شۆریم و کفنم کرد و نوێژم لەسەر کرد، کاتێك لە ناشتنی بوومەوە ئەو بێزارییەی رووی لێکردبووم نەما و گەڕامەوە بۆ مەککە.

**بە یەکێك لە پیاوان وترا:** حەزت لە مردنە؟ وتی: ڕۆیشتن بۆ لای کەسێك ڕجای خێری لێ دەکرێت باشترە لە مانەوە لەگەڵ کەسێك دڵنیا نیت لە شەڕەکەی.

**لە جونەیدەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە سەرەمەرگدا لای مامۆستام **"ئیبن کەرنەبی"** بووم، تەماشای ئاسمانم کرد، وتی: هێشتا، پاشان تەماشای زەویم کرد، وتی: هێشتا، واتە نزیکترە لەوەی تەماشای ئاسمان بکەی یان تەماشای زەوی بکەی، بەڵکو ئەو لەودیو (یاخود لەپێش) شوێنەوەیە.

**ئەبو یەزید لە سەرەمەرگدا وتی:** تەنها لە بێئاگاییدا یادی تۆم کردووە، تۆش لە کاتی ساردبوونەوەمدا گیانم دەکێشی.

**ئەبو عەلی ڕۆزباری دەڵێت:** ڕۆیشتمە شارێك کۆمەڵێك خەڵکم بینی کۆبووبوونەوە، وتیان: لە ناشتنی جەنازەی گەنجێکدا بووین گوێمان لە دەنگێك بوو دەیوت:

**كبرت همة عبد طمعت في أن يراكا**

(هیممەتی بەندەیەك ئەوەندە مەزن بوو تەماعی ئەوەی ئەوەی هەبوو بتبینێت)

ئەویش هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا بوو و گیانی سپارد بوو.

**وتراوە:** دەستەیەك ڕۆیشتن بۆ لای مەمشادی دەینووری لە نەخۆشی مردنەکەیدا، پرسیان: خودا چی لەگەڵ کردووی؟ ئەویش وتی: ماوەی سی ساڵە بەهەشتم بۆ دەخەنە روو تەماشام نەکردووە، لە کاتی گیانکێشاندا پێیان وت: حاڵی دڵت چۆنە؟ وتی: ماوەی سی ساڵە دڵی خۆم بزر کردووە.

**"الوجيهي" دەڵێت:** هۆی مردنەکەی ئیبن بەنان ئەوە بوو شتێك بە دڵیدا هاتبوو، سەری خۆی هەڵگرتبوو، لە سارای بەنی ئیسرائیلدا لەناو تۆز و ڕمڵدا بینیبوویانەوە، چاوەکانی کردبووەوە و وتبووی: چێژ و خۆشی وەربگرە، ئێرە شوێنی وەرگرتنی چێژ و خۆشی خۆشەویستانە و بەدوایدا ڕۆحی دەرچووبوو.

**ئەبو یەعقووبی نەهرجووری دەڵێت:** لە مەککە بووم، هەژارێك هات بۆ لام دینارێکی پێ بوو، وتی: سبەینێ من دەمرم، بە نیوەی ئەم دینارە قەبرێکم بۆ ئامادە بکە و نیوەکەی تری بۆ کفن کردنم، لە نەفسی خۆمدا وتم: ئەم پیاوە ئەقڵی تێکچووە، برسێتی حیجاز بەو دەردەی بردووە، بۆ سبەینێ هاتەوە و تەوافی کرد، پاشان لە جێگەیەك لەسەر زەویەکە راکشا، وتم: ئەو پیاوە دەیەوێ وا نیشان بدات دەمرێت، بۆیە چووم بۆ لای، دەستم لێدا و جووڵاندم بینیم مردووە، وەك چۆن فەرمانی کرد بوو بەو جۆرە ناشتم.

**وتراوە:** کاتێك لە سەرەمەرگدا حاڵی ئەبو عوسمانی حیری گۆڕا کوڕەکەی کراسەکەی خۆی دڕی، ئەبو عوسمان چاوی کردەوە و وتی: کوڕی خۆم، ئەو کارەت لە ئاشکرادا پێچەوانەی سوننەتە و لە ناوەوەش ریایە.

**وتراوە:** ئیبن عەتا لە سەرەمەرگی جونەیددا سەردانی کرد، سەلامی کرد، جونەید هەندێ لە وەڵامدانەوەی سەلامەکە دواکەوت، پاشان وەڵامی دایەوە، و وتی: ببوورە، لە خوێندنی ویردەکەمدا بووم، دواتر گیانی دەرچوو.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** هەژارێك هات بۆ لامان و مرد، منیش کفنم کرد و ناشتم و لە گۆڕەکەدا کفنەکەم لەسەر روخساری لابرد بۆ ئەوەی لەسەر خاك دایبنێم و خودا(ﷻ) بەزەیی بێتەوە بە غەریبییەکەیدا، چاوەکانی کردەوە و وتی: ئەی ئەبو عەلی رێزم لێ دەگری لە بەردەم کەسێکدا رێزی لێناوم؟

وتم: گەورەم لە دوای مردن زیندووبوونەوە؟!

پێی وتم: من زیندووم، هەر کەسێك خودای(ﷻ) خۆشبوێت زیندووە، سبەینێ بە پلە و پایەم تۆش سەردەخەم ئەی رۆزباری.

**دەگێڕنەوە ئیبن سەهل ئەصفەهانی وتی:** وەکو چۆن خەڵکی دەمرێت منیش دەمرم، نەخۆشکەوتنێك و سەردانی خەڵکی، دواتر بانگم لێدەکرێت و دەڵێن: ئەی ئەبو عەلی، منیش وەڵامیان دەدەمەوە.

رۆژێك بە رێگەدا دەڕۆیشت لەناکاو وتی: "بەڵێ" یەکسەر بەربوویەوە و گیانی سپارد.

**ئەبو حەسەنی موزەین دەڵێت:** کاتێك ئەبو یەعقووبی نەهرجووری بە نەخۆشی مردنەکەی نەخۆشکەوت لە سەرەمەرگدا پێم وت بڵێ: **"لا إلـه إلا الله"**، خەندەیەك کەوتە سەر لێوەکانی و وتی: مەبەستت منە؟

بە عیززەتی ئەو کەسەی مردن ناچێژێت تەنها پەردەی عیززەت لە نێوان من و خودادا ماوە، لەو ساتەوە کوژایەوە و خامۆش بوو، ئەبو حەسەنی موزەین دواتر ریشی خۆی دەگرت و دەیوت: بوودەڵەیەکی وەکو من شەهادەتی بە ئەولیاکانی خودا دەهێنا، ئای چ شەرمەزارییەکە! کاتێك ئەو رووداوەی دەگێڕایەوە دەستی بە گریان دەکرد.

**ئەبو حوسەینی مالیکی دەڵێت:** چەندینساڵی زۆر هاوەڵی **"خیر النساج"** بووم، هەشت رۆژ بەر لە مردنەکەی پێی وتم: من رۆژی پێنج شەممە لە کاتی مەغریبدا دەمرم، رۆژی هەینی بەر لە نوێژ دەمشارنەوە، ئەمەت لەبیردەچێتەوە، لەبیرت نەچێت.

**ئەبو حوسەین دەڵێت:** رۆژی هەینی لەبیرم چوو، گەیشتم بە کەسانێك هەواڵەکەیان پێدام، منیش رۆیشتم بۆ ئەوەی لەسەر جەنازەکەی ئامادە بم، خەڵکەکەم بینی دەگەڕانەوە و دەیانوت: دوای نوێژ دەینێژن.

من نەڕۆیشتم و ئامادەی جەنازەکەی بووم، جەنازەکەم بینی بەر لە نوێژ هێنایانە دەرەوە وەك چۆن ئەو باسی کردبوو، پرسیم کێ لە کاتی مردنەکەیدا ئامادە بوو، کەسێك وتی: بوورایەوە و پاشان هۆشی کردەوە و پاشان تەماشای سووچێکی ماڵەکەی کرد و وتی: بوەستە خودا عافییەتت پێ بدات، تۆ بەندەیەکی فەرمانپێکراوی و منیش بەندەیەکی فەرمانپێکراوم، ئەوەی فەرمانت پێکراوە لەدەستت دەرناچێت، بەڵام ئەوەی فەرمانم پێکراوە لەدەستم دەچێت، داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی تازەکردەوە و نوێژی کرد و پاشان راکشا و چاوەکانی لێکنا و گیانی سپارد، لەدوای مردنی لە خەوندا بینییان، پرسیاریان لێکرد: حاڵت چۆنە؟

وتی: مەپرسە، بەڵام لە دونیا پڕ لە ئازار و ئێشەکەی ئێوە رزگارم بوو.

**ئەبو حەسەنی حیمصی (خاوەنی کتێبی "بهجة الأسرار") دەڵێت:** کاتێك سەهلی کوڕی عەبدوڵا مرد، خەڵکێکی زۆر بەسەر جەنازەکەیدا دابارین، یەهودییەك لە شارەکەدا بوو، گوێی لە دەنگەدەنگەکە بوو، هاتە دەرەوە بزانێت چییە، کاتێك تەماشای جەنازەکەی کرد هاواری کرد و وتی: ئایا ئەوەی من دەیبینم ئێوە دەیبینن؟ وتیان: نەخێر، تۆ چی دەبینی؟

وتی: خەڵکانێك دەبینم لە ئاسمانەوە دادەبارێن و دەست بە جەنازەکەدا دەهێنن، پاشان شایەتمانی هێنا و موسڵمان بوو و موسڵمانێکی باشی لێ دەرچوو.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** لە مەککە بووم، رۆژێك بە دەروازەی بەنی شەیبەدا تێپەڕیم، گەنجێکی روخسار جوانم بینی مردبوو، سەیری روخساریم کرد بەڕوومەوە خەندەیەك کەوتە سەر روخساری و پێی وتم: ئەی ئەبو سەعید، ئایا دەزانی زیندووەکان زیندوون با بشمرن، تەنها لە خانەیەکەوە دەچن بۆ خانەیەکی تر.

**"الجريري" دەڵێت: پێمگەیشتووە لە سەرەمەرگدا بە "ذو النون"** وتراوە: وەسێتمان بۆ بکە، ئەویش وتی: سەرقاڵم مەکەن من سەرمسوڕماوە لە جوانی و باشی لوتفی خودا.

**لە سەرەمەرگدا پرسیار لە ئەبو حەفص کرا:** چ ئامۆژگارییەکمان دەکەی؟

ئەویش وتی: هێزم تێدا نییە قسەتان بۆ بکەم، پاشان هێزی بەرهاتەوە و پێی وترا: شتێك بڵێ لە تۆوە باسی بکەم، ئەویش وتی: ئامۆژگاریم: گەردنکەچی و زەلیلی بە هەموو دڵەوە لەسەر کەمتەرخەمی و ناتەواوییەکان.

٤٥

# ناسینی خودا

**((راوەستانی ماڵ لەسەر بنچینەکەیەتی، راوەستانی ئایینیش ناسینی خودایە(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى)))**

**خودا(تعالى) دەفەرمویێت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾ الأنعام: ٩١**، لە تەفسیردا هاتووە: واتە وەکو پێویست خوداتان نەناسی.

**لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:** ((راوەستانی ماڵ لەسەر بنچینەکەیەتی، راوەستانی ئایینیش بە ناسینی خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) و یەقین و ئەقڵێکی قەلاچۆکەرەوەیە، وتم: دایك و باوکم فیدات بێت ئەقڵی قەلاچۆکەر چییە؟ فەرمووی: دەستکێشانەوە لە یاخیبوون لە خودا و سووربوون و کۆشان لەسەر گوێڕایەڵی خودا))

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:**

**مەعریفە لەسەر زمانی زانایان** بریتییە لە زانست، هەموو زانستێك مەعریفەیە، هەموو مەعریفەیەکیش زانستە، هەموو کەسێکی زانا بە خودا عاریفە، هەموو عاریفێکیش زانایە، لای ئەهلی ئەم رێگەیە : مەعریفە سیفەتی ئەو کەسەیە خودای(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) بە ناو و سیفەتەکانی ناسیوە و پاشان بە مامەڵە و هەڵسوکەوتنی ئەو ناسینەی بەڕاستگێڕاوە، پاشان لە ئەخلاقی نزم و پەست و ئافەتەکانی پاکبووەتەوە، پاشان خۆی هەڵداوەتە بەر دەرگای خودا و بەدڵ ئیعتیکافی لەسەر کردووە، بۆیە خودا رووی لێکردووە و هەموو حاڵەکانی بەڕاستگێڕاوە، و خایلە و خوتوورەی دەروونی لێ بەدوورگرتووە و دڵی گوێ بۆ هیچ خایلە و خوتوورەیەك ناگرێت بانگی بکەن بۆ لای شتێك جگە لە خودا(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى)، کاتێك لە خەڵکی بێگانە بوو و لە ئافەتەکانی نەفسی

پاکبوویەوە و لە پاڵدانەوە و چاوتێبڕین خاوێن بوویەوە و لە پەنهانیدا بە بەردەوامی لە موناجاتدا بوو، و گەڕانەوەی لە هەموو چرکەیەکدا بۆ لای خودا بوو و لەلایەن ئەوەوە(ﷻ) نهێنی بڕیارەکانی خۆی تێگەیاند ئەو کەسە ناودەنرێت عاریف و حاڵەتەکەش بە مەعریفە ناودەبرێت.

بە پوختی چەندە لە نەفسی خۆی نامۆبێت ئەوەندە مەعریفەی بە پەروەردگار بۆ دروست دەبێت.

پیاوانی ئەم ڕێگە قسەی زۆریان هەیە دەربارەی مەعریفە، هەریەکەیان قسە لەوە دەکات بۆی دەرکەوتووە و لە کاتی خۆیدا بینیویەتەوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** لە نیشانەکانی مەعریفە بە خودا سەرهەڵدانی هەیبەتە لە خودا، هەر کەس مەعریفەی بە ئەو(ﷻ) زیاد بکات هەیبەت لێی زیاد دەکات.

**هەروەها گوێم لێ بوو دەیوت:** مەعریفە ئارامی بۆ دڵ پێویست دەکات وەك چۆن زانست سەکینەت پێویست دەکات، هەر کەس مەعریفەی زیاد بکات سەکینەتی زیاد دەکات.

**شیبلی دەڵێت:** هیچ پەیوەستبوونێك بۆ عاریف نەماوەتەوە، بۆ خۆشەویست سکاڵا نەماوەتەوە، بۆ بەندە بانگەشە نەماوەتەوە، بۆ خاوەن ترس لەنگەرگرتن نەماوەتەوە، بۆ هیچ کەسێکیش هەڵهاتن نییە لە خودا.

**پرسیار لە شیبلی کرا دەربارەی مەعریفە وتی:** سەرەتاکەی خودایە(ﷻ) و کۆتاییەکەشی کۆتایی نییە.

**ئەبو حەفص دەڵێت:** لەو کاتەوەی خودام ناسیوە نە حەق و نە باتڵ نەهاتوونەتە ناو دڵمەوە.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** ئەوەی ئەبو حەفص دەیڵێت: هەندێ تەمومژی لەسەرە، ئەوەی هەڵدەدرێتە سەری ئەم قسەیە: لای ئەهلی ئەم ڕێگەیە مەعریفە خودی بەندە لە خۆی بزر دەکات بە هۆی زاڵبوونی یادی حەق(ﷻ) بەسەریدا، بۆیە جگە لە خودا(ﷻ)

کەسێکی تر نابینێت و ناگەڕێتەوە بۆ لای شتێك یان کەسێك جگە لە خودا(ﷻ)، وەك چۆن ئەقڵ دەگەڕێتەوە بۆ دڵ و بیر و بیرکردنەوەی لەو شتانەی بۆی دێنە پێش یان لە ئێستادا رووبەڕووی دەبێتەوە عاریفیش هەر بەو جۆرە گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگارە، کاتێك تەنها بە پەروەردگارەوە سەرقاڵە ناگەڕێتەوە بۆ لای دڵی خۆی، چۆن مانا دەچێتە ناو دڵی کەسێکەوە کە دڵی بوونی نەمابێت، جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەو کەسەی بە دڵیەوە ژیاوە لەگەڵ ئەو کەسەی بە پەروەردگارییەوە(ﷻ) ژیاوە.

**پرسیار لە ئەبو یەزید کرا دەربارەی مەعریفە، وتی:**(( ﴿ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ﴾ **النمل: ٣٤**،(واتە مەلیك(ﷻ) دڵ داگیر دەکات و بوونی ناهێڵێت، وەك چۆن پادشاکانی دونیا کاتێك روو لە شار و ئاوەدانییەك دەکەن وێرانی دەکەن)

**قوشەیری دەڵێت:** ئەمە ئەو مانایەیە ئەبو حەفص ئاماژەی پێکردووە.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** بۆ خەڵکان حاڵی جۆراوجۆر هەیە، بەڵام عاریف حاڵی نییە، چونکە رێوڕەسم(ئاسار)ی سڕاوەتەوە و شوناسی بە شوناسی کەسێکی تر فەنابووە، و ئاساری بە ئاساری کەسێکی تر بزر بووە.

**"الواسطي" دەڵێت:** مەعریفە راست و دروست ناوەستێت لە بەندەدا بێنیازبوون بە خوداوە و نیشاندانی هەژاری بۆ لای سەریهەڵدابێت.

**مامۆستا قوشەیری(لەسەر ئەو قسەی "الواسطي") دەڵێت:** مەبەستی بەم قسەیە ئەوەیە: بێنیازبوون و نیشاندانی هەژاری لە نیشانەکانی ئاگاهی بەندە و مانەوەی رێوڕەسمەکانییەتی، چونکە هەردوو ئەو دوانە لە سیفەتەکانی ئەون، عاریف لە مەعریفەکەیدا سڕاوەتەوە، ئیتر چۆن ئەوەی بۆ راست و دروست دەبێت، لە کاتێکدا ئەو تیابردنی لە بوونی ئەو و نغرۆبوونی بینینی ئەودا(ﷻ) گەر نەگاتە بوون ئەوا هەموو هەستەکانی بە هەموو وەسفێکەوە ئەو هەیەتی لەکارکەوتوون.

**بۆ ئەو مەبەستەیە دیسان "الواسطي" دەڵێت:** هەر کەس خودا بناسێت دادەبڕێت، بەڵکو لاڵ دەبێت و قەلاچۆ دەکرێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ناتوانم سەنای تۆ بکەم))

ئەمە سیفەتی ئەو کەسانەیە ئامانجەکەیان باڵا بووە، بەڵام ئەوانەی لەو ئاستە نزمتر بوون قسەی زۆریان لە مەعریفە کردووە.

**"أحمد بن عاصم الأنطاكي" دەڵێت:** هەر کەس زیاتر خودا بناسێت زیاتر لێی دەترسێت.

**هەندێکیان دەڵێن:** هەر کەس خودا بناسێت بێزارە لە مانەوە و دونیای بەم هەموو بەرینییەوە لێ بەرتەسك دەبێتەوە.

**وتراوە:** هەر کەس خودا(ﷻ) بناسێت زیندەگی بۆ پاڵفتە دەبێت و ژیانی بۆ خۆش دەبێت و هەموو شتێك لێی دەترسێت و ترسی دروستکراوەکانی لەلا نامێنێت و بە خوداوە(ﷻ) هۆگری پەیدا دەکات.

**وتراوە:** هەر کەس خودا بناسێت حەزی شتەکانی نامێنێت، بۆیە دەبێت بە کەسێکی نامۆ و بێ ریشە.

**وتراوە:** مەعریفە شەرم و بەمەزنڕاگرتن پێویست دەکات، وەك چۆن یەکتاپەرستی رازیبوون و خۆڕادەستکردن پێویست دەکات.

**"ذو النون" دەڵێت: رۆحی** پێغەمبەران(**&**) لە مەیدانی مەعریفەدا پێشبڕکێیان کرد، رۆحی پێغەمبەری ئێمە(ﷺ) بۆ باخچەی گەیشتن بە خودا پێش رۆحی هەموو پێغەمبەران کەوت.

**"ذو النون" دەڵێت:** تێکەڵبوون لەگەڵ عاریف بۆ نزیکبوونەوەیە لە خودا بەرەوپێش هەڵتدەنێت و لە خراپەکانت چاودەپۆشێت، ئەوەش وەك خۆڕازاندنەوە بە ئەخلاقی خودا(ﷻ)

**پرسیار لە "بن یزدانیار" کرا:** کەی عاریف حەق(ﷻ) دەبینێت؟ وتی: کاتێك شایەتەکە دەربکەوێت و پەیبردنەکان پەکیان بکەوێت، و هەستەکان نەمێنن و رزگاربوون بپوکێتەوە.

**حوسەینی کوڕی مەنصوور دەڵێت:** گەر بەندە گەیشتە ماقامی مەعریفە خودا بە خایلە و خوتوورەکانی وەحی بۆ رەوانە دەکات و پارێزگاری لە نهێنی و پەنهانی دەکات تاکو جگە لە خوتوورەی حەق شتێکی تری پیادا گوزەر نەکات.

**هەروەها دەڵێت:** نیشانەی عاریف ئەوەیە لە دونیا و دوارِۆژ دەستی بەردابێت.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: ئامانجی مەعریفە دوو شتە:** سەرسامی و سەرگەردان بوون.

**"ذو النون" دەڵێت:** زاناترین کەس بە خودا ئەو کەسەیانە لە هەموویان زیاتر سەرسام و سەرگەردانە.

**پیاوێك بە جونەیدی وت: هەندێك کەس لە ئەهلی مەعریفەت دەڵێن:** وازهێنان لە کار و کردەوەی چاکە و بەندایەتی لە دەروازەی چاکە و تەقوایە؟

**جونەید وتی:** ئەوە قسەی کەسانێکە قسە لە وازهێنان لە کار و کردەوەی چاکە(عیبادەت) دەکەن، ئەو قسەیە لای من زۆر گەورەیە، ئەو کەسەی دزی دەکات و زینا دەکات حاڵی باشترە لەو کەسەی ئەو قسەیە دەکات، کەسانی عاریف بە خودا(ﷻ) کار و کردەوەی چاکەیان لە خوداوە(ﷻ) وەرگرتووە و بەو کارانەوە بۆ لای خوداش دەگەڕێنەوە، گەر هەزارساڵ بمێنمەوە گەردیلەیەك لە کاروکردەوەی چاکە کەم ناکەمەوە.

**بە ئەبو یەزید وترا:** بە چی ئەم مەعریفەت بەدەستهێنا؟

وتی: بە سکێکی خاڵی و جەستەیەکی رووت.

**ئەبو یەعقووبی نەهرجووری دەڵێت:** وتم بە ئەبی یەعقووبی سووسی: ئایا عاریف بۆ شتێك جگە لە خودا(ﷻ) خەم رووی لێ دەکات؟ وتی: بۆ شتێك جگە لە خودا(ﷻ) دەبینێت تا خەمی بۆ بخوات؟!

وتم: ئەی بە چ چاوێك تەماشای شتەکان دەکات؟ وتی: بە چاوی فەنا و تیاچوون.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** عاریف دەفڕێت و زاهید دەڕوات.

**وتراوە:** عاریف چاوەکانی فرمێسکی لێ دەڕوات و دڵی پێدەکەنێت.

**جونەید دەڵێت:** عاریف نابێت بە عاریف تا وەك زەوییەکی لێ نەیەت چاك و خراپ پێی لێ بنێن، هەروەها وەك هەورێکی لێ بێت سێبەر بۆ هەموو شتێك بکات، هەروەها وەك بارانێك ئەوەی بەر دەدات و بەرنادات ئاو بدات.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** عاریف لە دونیا دەردەچێت لە دوو شت تێر ناخوات: گریان بەسەر خۆیدا و سەنای بۆ پەروەردگاری(ﷻ)

**ئەبو یەزید دەڵێت:** زانینیان بە تیابردنی ئەوەی مافی خۆیانە و هەستان بەوەی مافی خودایە مەعریفەیان بەدەستهێنا.

**یوسفی کوڕی عەلی دەڵێت:** عـاریف نابێـت بـە عـاریفی راسـتەقینە تـا گـەر بـە ئەندازەی موڵکی سولەیمان موڵکی پێ بدرێت لە خودا بـۆ چـاوتروکانێکیش خـەریکی ناکات.

**ئیبن عەتا دەڵێت:** مەعریفە لەسەر سێ پایەیە: هەیبەت و حەیا و هۆگربوون.

بـە **"ذو النـون"** وتـرا بـە چـی پـەروەردگاری خـۆت ناسـی؟ وتـی: بـە پـەروەردگارم پەروەردگارم ناسی، گەر پەروەردگارم نەبوایە پەروەردگارم نەدەناسی.

**وتراوە:** زانا شوێنی دەکەون و عاریف هیدایەتی لێوە فێردەبن.

**شیبلی دەڵێت:** عاریف سەرنجی هیچ کەسی تر نادات جگە لە خودا و قسـەی هـیچ کەس جگە لە خودا بەسەر زمانیدا نایەت و هیچ کەس جگە لە خودا(ﷻ) بە پارێزەری نەفسی خۆی نازانێت.

**وتراوە:** عاریف بە یادی خوداوە هۆگر بووە و لـە خـەڵکی نـامۆ، هـەژاری خـۆی بـۆ خودا نیشانداوە و لە دروستکراوەکانی بێنیازی کردووە، بـۆ خـودا(ﷻ) زەلیـل بـووە و عیززەتی بەسەر دروستکراوەکانیدا پێ بەخشیوە.

**"أبو الطيـب السـامري" دەڵێـت:** مەعریفـە بریتییـە لـە هـەڵهاتنی حـەق بەسـەر پەنهانەکاندا بە بەردەوامی نوور.

**وتراوە:** عاریف لەسەرو ئەوەیە دەیڵێت، زاناش لە خوار ئەوەوەیە دەیڵێت.

**ئەبو سولەیمانی دارانـی دەڵێـت:** خـودا(ﷻ) لەسـەر جێگـەی نووسـتن بـۆ عـاریف دەرگایەك دەکاتەوە کە بۆ کەسانی تر لە شەونوێژدا نایکاتەوە.

**جونەید دەڵێت:** عاریف ئەو کەسەیە بە بێدەنگی گوزارشت لە حەق دەکات.

**"ذو النون" دەڵێت: بۆ هەموو شتێك سزایەك هەیە، سزای عاریف دابڕانییەتی لە یادی خودا(ﷻ).**

**ڕوەیم دەڵێت:** ریای عاریفان باشترە لە ئیخلاصی موریدان.

**ئەبوبەکری وەراق دەڵێت:** زاهیدان مەلیکانی دوارۆژن و هەژارانی عاریفانن.

**لە جونەید پرسیاری عاریف کرا؟ وتی:** ڕەنگی ئاو ڕەنگی دەفرەکەیەتی(واتە لەگەڵ دەمی ئێستای کاتی خۆیدایە).

**پرسیار کرا لە ئەبو یەزید دەربارەی عاریف؟**

**وتی:** لە خەوندا تەنها خودا دەبینێت، لە ئاگاهیدا تەنها خودا دەبینێت، تەنها لەگەڵ خودا تەبایە، و تەنها تەماشای خودا(ﷻ) دەکات.

**لە یەکێك لە گەورە پیاوان پرسیارکرا: بە چیدا خودات(ﷻ) ناسی؟**

وتی: بە بریسکانەوەیەك کە بە زمانی وەرگیراو لە جیاکردنەوەی باو بریسکاوەتەوە، هەروەها بە گوزارشتێك لەسەر زمانێکی بزربوو گوزەری کردووە.

ئەم کەسە ئاماژە دەکات بۆ وەجدێکی ئاشکرا و هەواڵ دەدات لە پەنهانێکی شاراوەی "ئەو ئەوە" بەوەی دەریخستووە و لای کەسانی تر تەمومژی بۆ دروست کردووە.

**پرسیار لە ئەبو توراب کرا دەربارەی سیفەتی عاریف؟**

**وتی:** ئەو کەسەیە هیچ شتێك لێڵی ناکات و هەموو شتێکی پێ ڕۆشن دەبێتەوە.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** عاریف نووری زانستی بۆ دەدرەوشێتەوە و بەهۆیەوە شتە سەیروسەمەرەکانی پەنهان دەبینێت.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت: عاریف** تیاچووە(نوقم بووە) لە دەریای بەدەستهێناندا، وەك پیاوێك دەڵێت: مەعریفە کۆمەڵێك شەپۆلی هەڵچوونە، بەرزدەبنەوە و نزم دەبنەوە.

**لە یەحیای کوڕی مەعاز پرسیاری عاریف کرا وتی:** پیاوێکی تێکەڵ و جیابووەوەیە، جارێکیان وتی: کاتی خۆی لەگەڵ خەڵکی بوو جیابوویەوە.

**"ذو النون" دەڵێت:** نیشانەی عاریف سێ شتە: ڕۆشنای مەعریفەتی ڕۆشنای وەرعی کپ ناکاتەوە، لە ناوەوە باوەڕی بە زانستێك نییە ئاشکرای حوکمی خودا هەڵیبوەشێنێتەوە، زۆری نیعمەتی خودا(ﷻ) لەسەری وای لێ ناکات پەردە هەڵبداتەوە لەسەر داپۆشراوی حەرامکراوەکانی خودا.

**وتراوە:** عاریف نییە ئەو کەسەی مەعریفە بەو شتەی لای ڕۆڵەکانی دوارۆژە وەسف بکات، چجای ئەوەی لای ڕۆڵەکانی دونیایە.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** مەعریفە لە سەرچاوەی بەخشندەیی و بەخشینی کۆشانەوە دێتە ئاراوە.

**پرسیار لە جونەید کرا دەربارەی قسەکەی "ذو النون" لەسەر عاریف کە دەڵێت:**

((ئا لەو جێگە بوو ڕۆیشت)) جونەید وتی: عاریف حاڵێك لە حاڵێکی تر بەندی ناکات، مەنزیلەتێك لە گواستنەوە بۆ مەنزیلەتێکی تر بێبەشی ناکات، ئەو لەگەڵ ئەهلی هەموو شوێنێکدا ئەوە دەنوێنێت کە ئەو تێیدایە، ئەوە دەبینێتەوە ئەوان بینیویانەتەوە، قسە لە نیشانەکانی دەکات تاکو سوودی لێ ببینن.

**محەمەدی کوڕی فەزڵ دەڵێت:** مەعریفە بریتییە لە حەیای دڵ لەگەڵ خودا(ﷻ).

**پرسیار لە ئەبو سەعیدی خەراز کرا:** ئایا عاریف دەگاتە جێگەیەك گریانی لێ دووربکەوێتەوە؟

وتی: بەڵێ، گریان لە کاتی ڕۆیشتنیانە بۆ لای خودا(ﷻ)، کاتێك بە ڕاستەقینەی نزیکی گەیشتن و چێژی گەیشتنیان لە چاکەی خوداوە بینی ئەو گریانەیان لێ دوور دەکەوێتەوە.

٤٦

# خۆشەویستی

((وتراوە: خودا وەحی بۆ عیسا(عليه السلام) رەوانە کرد و پێی فەرموو: من کاتێك تەماشای دڵی باوەڕدارێك دەکەم و خۆشەویستی دونیا و دوارۆژی تێدا نابینمەوە بە خۆشەویستی خۆم پڕی دەکەم))

**خودا(ﷻ) دەفەرموێت:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ المائدة: ٥٤

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((هەر کەس لیقای خودای پێخۆش بێت خودا لیقای ئەوی پێخۆش دەبێت، هەر کەسیش لیقای خودای پێخۆش نەبێت خوداش لیقای ئەوی پێخۆش نابێت))[٦٨]

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لە جبریلەوە(عليه السلام) لە پەروەردگارییەوە(ﷻ) فەرمووی:** ((هەر کەس سووکایەتی بە دۆستێکم بکات جەنگی دژ بە من راگەیاندووە، لە هیچ شتێك دوودڵیم نەبووە وەك دوودڵیم بۆ کێشانی گیانی بەندە باوەڕدارەکەم کە مردنی پێخۆش نییە و منیش نامەوێ بێزاری بکەم و هەر دەشبێ بمرێت، باشترین شتێك بەندەکەم بە هۆیەوە لە من نزیك ببێتەوە ئەو فەرزانەیە لەسەریم پێویست کردووە، بەردەوام بەندەکەم بە نەوافل لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشمدەوێت، هەر کەس خۆشمویست دەبم بە گوێ و چاو و دەست و پشتیوانی))[٦٩]

[٦٨] {الحديث أخرجه أحمد في مسنده والبخاري ومسلم في صحيحهما والترمذي والنسائي }.

[٦٩] {وقد روى الحديث برواية أخرى في صحيح البخاري(باب التواضع)}.

**له ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) له پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((گەر پەروەردگار(ﷻ) بەندەیەکی خۆشویست بە جبریل دەفەرموێت: ئەی جبریل من فلاّن کەسم خۆشدەوێت تۆش خۆشتبوێت، بۆیە جبریل خۆشیدەوێت، پاشان بانگی هەموو ئەهلی ئاسمانەکان دەکات خودا(ﷻ) فلاّن کەسی خۆشدەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت بۆیە ئەهلی ئاسمان خۆشیان دەوێت، پاشان قبوولّی لەسەر زەوی بۆ دادەنرێت، کاتێك خودا رقی لە بەندەیەك بوو-مالیك دەلّیّ- وادەزانم چی وت بۆ خۆشەویستییەکە هەمان شتی بۆ رقلێبوونەکەش فەرموو)) [٧٠]

خۆشەویستی حالّەتێکی بالاّیە، بەو حالّەتە خودا(ﷻ) شاهیدی بۆ بەندەکەی دەدات، و هەوالّ دەدات بە خۆشەویستی خۆی بۆ بەندەکەی.

خۆشەویستی لەسەر زمانی زانایان بریتییە لە ویست، مەبەستی ئەم دەستەیە لە خۆشەویستی بریتی نییە لە ویست، چونکە ویست پەیوەست نابێت بە دێرینەوە، مەگەر هەلّبدرێتە سەر ویستی نزیکبوونەوە و بە مەزنزانین بۆی.

ئێمە بۆ راستی ئەم بابەتە هەردوو بەرەکە بە پشتیوانی خودا دەخەینە روو، بۆیە خۆشەویستی حەق(ﷻ) بۆ بەندەکەی ویستی ئەوە بۆ پێدانی نیعمەتێکی تایبەتکراو لەسەری، وەك چۆن بەزەیی ئەو(ﷻ) بۆ بەندەکەی بریتییە لە ویستی نیعمەتپێدانی، بۆیە بەزەیی لە ویست تایبەتترە، خۆشەویستیش لە بەزەیی تایبەتترە، ویستی خودا بۆ گەیاندنی پاداشت و نیعمەت بە بەندەکەی پێی دەوترێت بەزەیی، ویستی خوداش بۆ ئەوەی بە نزیکی و حالّی بالاّ تایبەتی بکاتەوە پێی دەوترێت: خۆشەویستی.

گەر ویستی خودا پەیوەست بوو بە سزاوە پێی دەوترێت (تووڕەیی)، گەر پەیوەست بوو بە کۆی نیعمەتەوە پێی دەوترێت (بەزەیی) گەر پەیوەست بوو بە تایبەتی نیعمەتەوە پێی دەوترێت (خۆشەویستی)

**دەستەیەك دەلّێن:** خۆشەویستی خودا(ﷻ) بۆ بەندەکەی بریتییە لە مەدح و سەنای باشی خودا بۆی، بۆیە مانای خۆشەویستی خودا-لەسەر ئەم رایە- دەگەڕێتەوە بۆ کەلامی خودا و کەلامەکەشی دێرینە.

---

[٧٠] {ئەم فەرموودەیە بە گوزارەی تر لە "رياض الصالحين"دا هاتووە}.

**دەستەیەکیش دەڵێن:** خۆشەویستی خودا بۆ بەندەکەی لە سیفەتی کرداری خودایە، ئەوەش چاکەیەکی تایبەتکراوە بە باڵاکردن و بەرزکردنەوەی بۆ ئەو حاڵە، وەك **هەندێکیان دەڵێن:** بەزەیی خودا بە بەندەکەی نیعمەتێکە لەگەڵی، دەستەیە لە پێشین دەڵێن: خۆشەویستی خودا لە سیفەتە هەواڵییەکانە، وشەکە بەکاردەهێنن و لە لێکدانەوەی رادەوەستن.

بەڵام جگە لەمەی وترا کە ژنەوراوە لە سیفەتەکانی خۆشەویستی دروستکراو وەك مەیل بە لای شتێکدا و هۆگربوون پێیەوە، هەروەها وەك حاڵەتێك کە خۆشەویست لە خۆشەویستی دروستکراو دەیبینێتەوە دێرین(ﷻ) بەرز و باڵاترە لەو جۆرە مەیل و خۆشەویستییە.

بەڵام خۆشەویستی بەندە بۆ خودا(ﷻ) حاڵەتێکە لە دڵدایە وردترە لە گوزارشت.

ئەو حاڵەتە هەڵیدەنێت بۆ بە مەزنزانین و هەڵبژاردنی رازیبوونی ئەو و ئارامنەگرتن لەسەری، و گەشانەوەی بۆ لای و نائارامی بەبێ ئەو، بوونی هۆگری بە بەردەوامی یادی ئەو(ﷻ) لە دڵدا، خۆشەویستی بەندە بۆ خودا مەیل و وێنە و خەت لەخۆ ناگرێت، چۆن؟ راستەقینەی صەمەدییەت پاك و بێگەردبوونە لە پێگەیشتن و پەیپێبردن و ئابلۆقەدان، خۆشەویست بە وەسفی تیاچوون(نوقمبوون) لە خۆشویستراودا لەپێشترە بە وێنە و خەت وەسف بکرێت، خۆشەویستی بە وەسفێك وەسف ناکرێت و بە سنوور و رادەیەك دیاری ناکرێت رۆشنتر و نزیکتر بۆ تێگەیشتن لە خۆشەویستی و نوقمبوونێك لە گوفتارێکدا لە باری بەدیهاتنی تەمومژ، گەر ناڕوونی و تەمومژ زیادی دەکرد پێویستی بۆ لێکدانەی قسە بەردەبێتەوە.

گوزارشتەکانی خەڵکی دەربارەی خۆشەویستی زۆرن، لە زماندا قسەیان لە ریشەکەی کردووە، هەندێکیان دەڵێ: خۆشەویستی ناوێکە بۆ پاڵفتەی مەوەدەت، چونکە عەرەب بۆ زۆری سپێتی ددادن و بریقانەوەی دەڵێن: **"حبب الأسنان"**

**هەروەها وتراوە: "الحباب"** ئەو بڕەیە لە ئاو سەردەکەوێت لە کاتی بارینی بارانی زۆردا، لەسەر ئەمە **"المحبة"** بریتییە لە هاتنە کوڵی دڵ و هەڵچوونی لە باری تینوێتی و تامەزرۆبوون بۆ لیقای خۆشەویست.

**هەروەها وتراوە:** لە "**حباب الماء**"(**بفتح الحاء**) داتاشراوە کە بریتییە لە زۆری ئاو، بەوە ناونراوە چونکە خۆشەویستی کار و ئامانجی مەزنە لە دڵدا.

**هەروەها وتراوە:** داتاشینەکەی لە پێویستبوون و جێگیربوونەوەیە، دەوترێت: "أحب البعیر" ئەوەش ئەوەیە بە چۆکدا بێت و هەڵنەسێتەوە، وەك ئەوەی خۆشەویست لە یادی خۆشەویستەکەی جارێکی تر هەڵنەسێتەوە.

**وتراویشە "حب" لە "الحب-گوارە" وەرگیراوە**، بە گوارە ناوبراوە جا یان لەبەر پەیوەستبوونی بە گوێوە یان بە هۆی جووڵەی بەردەوامییەوە، هەردوو ماناکە بۆ خۆشەویستی دروستە.

**وتراویشە:** "**الحب**" و "**الحب**" وەك "العمر والعمر" وان.

**هەروەها وتراوە لە "الحبه"(بکسر الحاء) وەرگیراوە کە** بریتییە لە تۆوی بیابان، "**الحب**" بە "**الحب**" ناونراوە چونکە کرۆکی ژیانە وەك چۆن "**الحب**" کرۆکی رووەکەکانە.

**وتراویشە "الحب"** بریتییە لەو چوارپایە دارینەی مەرکانەی لەسەر دادەنرێت، "**المحبة**"ش لەو "**الحب**"ەوە وەرگیراوە چونکە شان دەداتە ژێر هەموو عیززەت و زەلیلییەك لە خۆشەویستەکەیەوە.

**هەروەها وتراوە** لە "**الحب**-دەفر"ەوە وەرگیراوە کە ئاوی تێدایە، چونکە ئەوەی تێیدایە لە ئامێز دەگرێت، تەنها ئەوەندەش دەگرێت کە پێی پڕ دەبێت، هەر بەو جۆرە گەر دڵ بە خۆشەویستی پڕ بوو هیچ شتێکی تر جگە لە خۆشەویستەکەی لە ئامێز ناگرێت.

## قسەی پیاوانی ئەم رێگە لەمەڕ خۆشەویستی:

**هەندێکیان دەڵێن:** "**المحبة**" بریتییە لە مەیلی بەردەوام لە دڵێکی سەرگەرداندا.

**وتراوەیشە:** "**المحبة**" هەڵبژاردنی خۆشەویستە بەسەر هەموو هاوەڵێکردنێکدا.

**وتراوە:** تەباییە لەگەڵ خۆشەویستدا لە ئاشکرا و پەنهاندا.

**وتــراوە:** ســڕانەوەی خۆشەویســتە بــە ســیفەتەکانی و جێگرتنــەوە و جێگیربــوونی مەحبووبە بە زاتی.

**وتراوە:** تەبایی دڵە بۆ داواکارییەکانی پەروەردگار.

**وتراوە:** بریتییە لـە ترسـی وازهێنـان لـە حورمـەت لەگـەڵ هەسـتان بـە راپەڕانـدنی خزمەت.

**ئەبو یەزیدی بوسـتامی دەڵێـت:** خۆشەویسـتی بـە کـەمزانینی زۆرە لـە خـۆت و بەزۆرزانینی کەمە لە خۆشەویستەوە.

**سەهل دەڵێت: "الحب"** بریتییە لـە دەسـتەملانبوونی گوێڕایـەڵی و جیابوونـەوە لـە سەرپێچی.

**پرسیار لە جونەید کـرا دەربـارەی "المحبـە" وتـی:** چـوونەژوورەوەی سـیفەتەکانی مەحبووبە وەك جێگرەوە بۆ سیفەتەکانی **"محب"**.

**جونەید** لێرەدا ئاماژە بە زاڵبوونی یـادی مـەحبووب دەکـات تـا وای لـێ دێـت زاڵ بەسـەر دڵـی **"محـب"**دا تـەنها سـیفەتەکانی **"محبـوب"**ە، و بێئاگـابوونی تـەواو لـە سیفەتەکانی خۆی و هەستکردن پێیان.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** خۆشەویستی بریتییە لە تەبایی.

**ئەبو عەبـدوڵای قورشـی دەڵێـت:** راسـتەقینەی مەحەبـەت ئەوەیـە ببەخشـی بـەو کەسەی خۆشتدەوێت و هیچ شتێك لە تۆ بۆ خۆت نەمێنێتەوە.

**شیبلی دەڵێت:** بۆیە مەحەبەت بە مەحەبەت ناونراوە چونکە هەرچی شتی ترە جگە لە مەحبوب لە دڵدا دەسڕێتەوە.

**ئـیبن عـەتا دەڵێـت:** مەحەبـەت بریتییـە لـە راسـتبوونەوەی لۆمـەکردنی خـۆ بـە بەردەوامی.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** مەحەبەت بریتییە لە چێژ، شوێنی حەقیقەتیش سەرسامییە.

**هــەروەها گــوێم لــێ بــوو دەیــوت: عیشــق بریتییــە لــە تێپەڕانــدنی ســنووری خۆشەویســتی، خــودا(ﷻ) بــەوە وەســف ناکرێــت ســنووری تێپەڕانــدووە بۆیــە بــە عیشــق وەسف ناکرێت، گـەر هەرچی خۆشەویستی خەڵکـە بـۆ تـەنها یـەك کـەس کۆبکرێتـەوە ناگاتــە رادەی ئــەو خۆشەویســتییەی خــودا شــایەنییەتی، بۆیــە ناوترێــت بەنــدە لــە خۆشەویســتی خــودادا ســنووری تێپەڕانــدووە، خــوداش بــەوە وەســف ناکرێــت عاشــق دەبێـت، بەنـدەش وەسـف ناکرێت بـەوەی عاشـقی سیفەتی خـودا دەبێـت، بۆیـە عیشـق نەرێکراوە، چونکە بۆ وەسفی حـەق(ﷻ) نەشـیاوە، نـە لـە خـوداوە بـۆ بەندەکـەی، نـە لـە بەندەوە بۆ خودا(ﷻ) دروست نییە لایەکی پێ وەسف بکرێت.

**شــیبلی دەڵێــت:** خۆشەویســتی ئەوەیــە غــیرەت هــەبێت یــەکێکی تــر وەك تــۆ مەحبووکەی تۆی خۆشبوێت.

**پرسیار لە ئـیبن عـەتا کـرا دەربـارەی خۆشەویسـتی وتـی:** نەمامێکـە لـە دڵـدا دەنێژرێت بەپێی گەورەبوونی بەری خۆی دەدات.

**نەصــرابادی دەڵێــت:** خۆشەویســتییەك خوێنڕشــتن رادەگرێــت و خۆشەویســتییەك خوێنڕشتن پێویست دەکات.

**"سمنــون" دەڵێــت:** ئەوانــەی خودایــان خۆشویســت گــەورەیی دونیــا و دوارۆژیــان بەدەستهێنا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((**المرء مع من أحب**-مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە خۆشیدەوێت)) ئەوان لەگەڵ خودان(ﷻ)

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** راستەقینەی مەحەبەت ئەوەیە کە بە جەفا کەم ناکات، و بە چاکەش زیاد ناکات، هەروەها دەڵێت: هەر کەس بانگەشەی خۆشەویستی خودا بکات و سنوورەکانی نەپارێزێت راستگۆ نییە.

**جونەید دەڵێت:** گەر خۆشەویستی راست و دروست بێت مەرجەکانی ئەدەب بەردەبنەوە.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەڵێت:** باوکێکی بەبەزەیی نابینیت لە گفتوگۆدا گـەورەیی و مــەزنی بداتــە پــاڵ کوڕەکــەی، خــەڵکی لــە گفتوگــۆ لەگــەڵی زیــادەڕەوی دەکــەن لــە گەورەکردنی، بەڵام باوکەکە بە ناوی خۆی ناوی دەهێنێت و دەڵێت: فلان.

**"الكتاني" دەڵێت:** مەحەبەت پێشخستنی داوای مەحبووبە بەسەر هەموو شتێکدا.

**بندار کوڕی حوسەین دەڵێت:** مەجنونی بەنی عامر لە خەوندا بینرا پێی وترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لێمخۆش بوو و منی کرد بە بەڵگە لەسەر خۆشەویستان.

**ئەبو یەعقووبی سوسی دەڵێت:** راستەقینەی خۆشەویستی ئەوەیە بەندە بەشی خۆی لە خودا و پێویستییەکانی بۆ لای لەبیربچێتەوە.

**حوسەینی کوڕی مەنصوور دەڵێت:** راستەقینەی مەحەبەت ئەوەیە لەگەڵ خۆشەویستەکەت راستببیتەوە بە خۆدارنین لە ئەوسافەکانت.

**بە نەصرابادی وترا:** هیچت لە مەحەبەت بەدەستنەهێناوە؟ وتی: راست دەکەن، بەڵام حەسرەتێکم هەیە، ئەوەتە تیایدا دەسووتێم.

**نەصرابادی دیسان دەڵێت:** مەحەبەت دوورکەوتنەوەیە لە خۆشی لە هەموو بارێکدا.

**محەمەدی کوڕی فەزڵ دەڵێت:** مەحەبەت بەربوونەوەی هەموو مەحەبەتێکە لە دڵدا جگە لە مەحەبەتی خودا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى).

**جونەید دەڵێ:** مەحەبەت بریتییە لە زیادەڕەوی لە مەیلدا بەبێ بەدەستهێنانی شتێك.

**دەوترێت:** مەحەبەت شڵەژانێکە لە دڵدا بە هۆی مەحبووبەوە سەرهەڵدەدات.

**هەروەها دەوترێت:** مەحەبەت تاقیکردنەوەیەکە لە مورادەوە دەکەوێتە دڵەوە.

**وتراوە:** خۆشەویستی سەرەتاکەی بێهیوای و کۆتاییەکەی کوشتنە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ):** (حبك لشيء يعمي ويصم-خۆشەویستیت بۆ شتێك کوێر و کەڕت دەکات) دەیوت: لە هەموو شتێك جگە لە ئەو وەك غیرەت لەسەری و لە هەموو مەحبووبێك وەك شکۆمەندکردنی ئەو کوێر دەبێت.

**حاریسی موحاسیبی دەڵێت:** مەحەبەت هەموو مەیلی تۆیە بۆ شتێك، پاشان پێشخستنی ئەو بەسەر خۆت و رۆح و ماڵدا، پاشان تەبایی لەگەڵی لە نهێنی و ئاشکرادا، پاشان زانستت بە کەمتەرخەمیت لە خۆشەویستی ئەو.

**"السري" دەڵێت:** مەحەبەت لە نێوان دواندا پێکنایەت تا یەکێکیان بەوی تریان نەڵێت: ئەی من(ئەو ببێت بەم).

**شیبلی دەڵێت:** موحیب کاتێك بێدەنگ دەبێت تیادەچێت، عاریف گەر بێدەنگ نەبێت تیادەچێت.

**وتراوە:** مەحەبەت: ئاگرێکە لە دڵدا هەرچی شتە جگە لە مەرامی مەحبووب دەسووتێنێت.

**وتراوە:** مەحەبەت بریتییە لە بەخشینی کۆشان، حەبیبیش ئەوەی دەیەوێت ئەنجامی دەدات.

**"النوري" دەڵێت:** مەحەبەت بریتییە لە لادانی پەردەکان و دەرخستنی نهێنییەکان.

**ئەبو یەعقووبی سوسی دەڵێت:** مەحەبەت راست و دروست ناوەستێت تا دەرنەچیت لە بینینی مەحەبەت بۆ بینینی مەحبووب بە تیاچوونی زانستی مەحەبەت.

**جونەید دەڵێت:** "السري" پارچە کاغەزێکی پێدام و پێی وتم: ئەمە بۆ تۆ لە حەوتسەد چیرۆك یان قسە باڵاتر و باشترە، بینیم ئەمەی تێدا نووسرا بوو:

**ولما ادعيت الحب قالت: كذبتني فمالي أرى الأعضاء منك كواسيا**

**فما الحب حتى يلصق القلب بالحشا وتذبل حتى لا تجيب المناديا**

**وتنحل حتى لا يبقى لك الهوى سوى مقلة تبكي بها وتناجيا**

(کاتێك بانگەشەی خۆشەویستیم کرد وتی درۆم لەگەڵ دەکەی، ئەی بۆ دەبینم ئەندامەکانی جەستەت پۆشتە دیارن، ئەوە خۆشەویستی نییە تا دڵ بە پەردەی دڵەوە نەنووسێت و سیس نەبیت تا نەتوانی وەڵامی بانگکەر بدەیەوە، و باریك و لاواز ببیت تا ئارەزووت نامێنێت جگە لە چاوێك کە پێی دەگریت و موناجاتی پێ دەکەی هیچت بۆ نەمێنێتەوە)

**ئیبن مەسرووق دەڵێت:** "سمنون"م بینی قسەی دەربارەی مەحەبەت دەکرد هەموو چراکانی مزگەوت شکان.

**"إبراهيم بن فانك" دەڵێت:** گوێم لە "سمنون" بوو لە مزگەوت دانیشتبوو قسەی دەکرد دەربارەی خۆشەویستی، باڵندەیەکی بچووك هات و لێی نزیکبوویەوە، پاشان زۆرتر لێی نزیکبوویەوە، بەردەوام نزیك دەبوویەوە تا لەسەر دەستی دانیشت، پاشان بە دەنووك دای لە زەوی تا خوێن لە دەنووکی هات پاشان مرد.

**جونەید دەڵێت:** هەموو خۆشەویستییەك بۆ مەرامێکە، گەر ئەو مەرامە نەما ئەو مەحەبەتە نامێنێت.

**وتراوە:** شیبلی لە خەستەخانە خەوێنرا و بەندکرا، دەستەیەك چوون بۆ لای لێی پرسین: ئێوە کێن؟

وتیان: ئێمە خۆشەویستانی تۆین ئەی ئەبوبەکر، ئەویش بەردبارانی کردن و وتی: گەر بانگەشەی خۆشەویستی من دەکەن ئارام بگرن لەسەر ئەم بەلایەی بەسەر مندا هاتووە، پاشان ئەم دوو دێڕە هۆنراوەی خوێندەوە:

**أيها السيد الكريم حبك بين الحشا مقيم**

**يا رافع النوم عن جفوني أنت بما مر بي عليم**

(ئەی سەروەری بەخشندە خۆشەویستی تۆ لەناو پەڕەی دڵدا نیشتەجێ بووە، ئەی ئەو کەسەی خەوت لە چاوانم هەڵگرتووە تۆ بەوەی بەسەر مندا گوزەر دەکات زانا و ئاگاداری)

**یەحیای کوڕی مەعاز نووسی بۆ ئەبو یەزید:** ئەوەندە پیاڵەی مەحەبەتی ئەوم نۆشی مەست و سەرخۆش بووم، ئەبو یەزید بۆی نووسییەوە: کەسێکی تر دەریای ئاسمانەکان و زەوی نۆشکردووە هێشتا تینوێتی نەشکاوە، زمانی لە تینوێتیدا هاتووەتە دەرەوە و دەڵێت: "هل من مزيد".

**وتراوە:** خودا وەحی بۆ عیسا(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: من کاتێك تەماشای ناو دڵی بەندەیەك دەکەم و خۆشەویستی دونیا و دوارۆژی تێدا نییە پڕی دەکەم لە خۆشەویستی خۆم.

**به خەتی مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بینیم نووسی بووی: لە هەندێ کتێبی دابەزێنراودا هاتووە:**((بەندەکەم، بە حەقی تۆ من تۆم خۆشدەوێت، بە حەقی من تۆش منت خۆشبوێت))

**عەبدوڵای کوڕی موبارەك دەڵێت:** هەر کەس شتێك لە مەحەبەتی پێدرا و بە ئەندازەی ئەوە خەشیەی پێ نەبەخشرا ئەو کەسە فریوی خواردووە.

**وتراوە:** مەحەبەت ئەوەیە شوێنەوارت دەسڕێتەوە.

**هەروەها** **وتراوە:** مەحەبەت سەرخۆشبوونێکە کە خاوەنەکەی نایەتەوە بەرهۆش تا مەحبووبەکەی نەبینێت.

ئەو مەستی و سەرۆخۆشبوونەی لە باری بینیندا بەرهەم دێت وەسف ناکرێت، بۆیە وتوویانە:

**فأسكر القوم دور كأسهم وكان سكري من المدير**

(سەرەی پیاڵەکەیان دەستەکەی مەست کرد، بەڵام مەستی من لە پیاڵەگێڕەوە(ساقی) بوو)

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق زۆرجار دەیوت:**

**لي سكرتان، وللندمان واحدة شيء خصصت به من بينهم وحدي**

(دوو مەستبوونم هەیە، بەڵام بۆ هاومەشرەبانم یەك مەستبوون هەیە، شتێکە لە نێوان هەموویاندا منی پێ تایبەتکراوە)

**مامۆستا ئەبو عەلی** کەنیزەکێکی هەبوو ناوی فیرووز بوو، خۆشی دەویست، چونکە زۆر خزمەتی کرد بوو، گوێم لێ بوو دەیوت: ڕۆژێك فیرووز ئازاری دەدام و زمانی لێ درێژ کردبووم، ئەبو حەسەنی قاری وتی بۆ ئەو پیاوە ئازار دەدەی؟ وتی: چونکە خۆشم دەوێت.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** بە ئەندازەی دەنکە ڕەشکەیەك خۆشەویستی لە عیبادەتی حەفتا ساڵ بەبێ خۆشەویستی لەلام خۆشەویستترە.

**وتراوه:** گەنجێك لە ڕۆژی جەژندا هات بۆ ناو خەڵكی و وتی:

**من مات عشقا فليمت هكذا لا خير في عشق بلا موت**

(هەر كەس بەهۆی عیشقەوە دەمرێت با بەم جۆرە بمرێت، خێر لە عیشقێكدا نییە مردنی لەگەڵ نەبێت)

لە بانێكی بەرزەوە خۆی هەڵدا خوارەوە و مرد.

دەگێڕنەوە لە هند پیاوێك عاشقی كەنیزەكێك بوو، كەنیزەكەكە سەفەری كرد، پیاوەكە بۆ خواحافیزی كەنیزەكەكە ڕۆیشتە دەرەوەی شار، یەكێك لە چاوەكانی فرمێسكی دەڕێژا و ئەویتریان وشك بوو، چل و هەشت ساڵ ئەو چاوەی داخست و نەیكردەوە وەك سزایەك بۆی، چونكە بۆ جیابوونەوە لە خۆشەویستەكەی نەگریا، لەو بارەیەوە وتراوە:

**بكت عيني غداة البين دمعا وأخرى بالبكا بخلت علينا**

**فعاقبت التي بخلت بدمع بأن غمضتها يوم التقينا**

(ئەو ڕۆژەی لەیەكتر جیابووینەوە چاوێكم گریا و فرمێسكی هەڵوەراند، بەڵام ئەویتریان نەگریا، بۆ ئەوەیان چرووك بوو بە ڕژانی فرمێسك سزام بەسەریدا سەپاند و ئەو ڕۆژەی بەیەكتر گەیشتینەوە نەمهێڵا تەماشات بكات)

**هەندێكیان دەڵێن:** لە لای **"ذي النون"** بووین، باسی مەحەبەتمان كرد، **"ذو النون"** وتی: بەسە باسی ئەو بابەتە مەكەن، نەفس نایبیستێ تا بانگەشەی بكات.

**یەحیای كوڕی مەعاز دەڵێت:** هەر كەس مەحەبەت بەسەر خەڵكانی نائەهلدا بڵاوە پێ بكات ئەوا لە بانگەشەیدا بانگەشە دەكات.

**وتراوە:** كەسێك بانگەشەی تیاچوونی خۆی كرد لە مەحەبەتی كەسێكدا، گەنجەكە پێی وت: ئەوە چۆنە، براكەم ڕوخساری لە من جوانترە و پێكەوتووترە؟ پیاوەكە سەری هەڵبڕی و لایكردەوە بە لای كەسێكی تردا كە ئەو كاتە لەسەر بانێك بوون، خۆی هەڵدایە خوارەوە و وتی: ئەمە پاداشتی ئەو كەسەیە بانگەشەی ئارەزووی ئێمە دەكات و تەماشای كەسێكی تر دەكات جگە لە ئێمە.

**"سمنون"** مەحەبەتی بەسەر مەعریفەدا پێشدەخست، بەڵام زۆرینەیان مەعریفە پێش مەحەبەت دەخەن.

**لای ئەوانەی گەیشتوونەتە راستەقینەی ماناکان مەحەبەت:** تیاچوونە لە تام و چێژدا، بەڵام مەعریفە بینینە لە سەرسامیدا، و فەنایە لە هەیبەتدا.

**ئەبوبەکری کەتانی دەڵێت: بابەتێك** لە مەوسمی حەجدا لە مەککە تاوتوێ کرا، گەورە پیاوان قسەیان لەبارەوە کرد، جونەید تەمەنی لە هەموویان بچووکتر بوو، پێیان وت: ئەی عێراقی تۆ چیت لەلایە بۆمان باس بکەی؟

ئەویش سەری داخست و چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و پاشان وتی: بەندەیەك لە خۆی دابڕاوە، و بە یادی پەروەردگارییەوە پەیوەست بووە، بە مافەکانی خودا راوەستاوە، و بە دڵ تەماشای دەکات، و نووری شوناسی ئەو سووتاندوویەتی، خواردنەوەی پیاڵەی خۆشەویستی خودای بۆ پاڵفتە بووە، خوداش پەردەی پەنهانی خۆیی بۆ لاداوە، کاتێك قسە دەکات بە خوداوە قسە دەکات، کاتێك گوزارشت دەدات لە خوداوە، گەر کەوتە جووڵە بە فەرمانی خوداوە، گەر ئارام بوو لەگەڵ خودا، ئەو بە خودا و بۆ خودا و لەگەڵ خودایە، هەموو پیاوان دەستیان بە گریان کرد و وتیان: زیادەیەك لەسەرو ئەم قسانەوە بوونی نییە، خودا کۆمەکت بکات ئەی تاجی عاریفان.

**وتراوە: خودا**(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ داود(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: ئەی داود من حەرامم کردووە لەسەر دڵان خۆشەویستی من و خۆشەویستی شتانی تری تێبچێت.

**خزمەتکارەکەی فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت:** میزی فوزەیل گیرا، دەستی بەرزکردەوە و وتی: خودایە بەو خۆشەویستییەی من هەمە بۆ تۆ ئەمە لە لاشەم دەربکە، کاتێك ئێوارە هات خودا شفای بۆ نارد.

**وتراوە:** مەحەبەت بریتییە لە پێشخستنی مەحبووب، وەك ژنەکەی عەزیز کاتێك کارەکەی گەیشتە بنبەست وتی:﴿ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ﴾ یوسف: ٥١

**له سه‌ره‌تاوه وتی:** ﴿مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٥﴾ یوسف: ٢٥، تاوانه‌كه‌ی به‌سه‌ر یوسفدا سه‌پاند، به‌ڵام له كۆتاییدا ناپاكییه‌كه‌ی به‌سه‌ر خۆیدا سه‌پاند.

گوێم له مامۆستا ئه‌بو عه‌لی ده‌قاق بوو ئه‌و قسه‌یه‌ی كرد.

**له ئه‌بو سه‌عیدی خه‌رازه‌وه ده‌گێڕنه‌وه وتوویه‌تی:** له خه‌وندا پێغه‌مبه‌ری خودام (ﷺ) بینی وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) داوای لێبوردنت لێ ده‌كه‌م، مه‌حه‌به‌تی خودا سه‌رقاڵی كردم له مه‌حه‌به‌تی تۆ، فه‌رمووی: ئه‌ی موبارەك، هه‌ر كه‌س خودای خۆشبوێت منی خۆشویستووه.

**وتراوه:** رابیعه‌ی عه‌ده‌وی له موناجاته‌كانیدا ده‌یوت: خودایه، ئایه به ئاگر دڵێك ده‌سووتێنی كه تۆی خۆشده‌وێت؟

بانگكه‌رێك بانگی لێكرد: ئێمه به‌و جۆره نابین، گومانی خراپمان پێ مه‌به.

**وتراوه: "حب"** دوو پیته **(حاء و باء)** ئاماژه تیایدا ئه‌وه‌یه: هه‌ر كه‌س خودای خۆشده‌وێت با له رۆح و به‌ده‌نی ده‌ربچێت.

**وه‌ك كۆده‌نگییه‌ك له نێوان به‌كارهێنانی پیاوانی رێگه:** مه‌حه‌به‌ت بریتییه له ته‌بایی، توندترین ته‌بایی بریتییه له ته‌بایی به دڵ، هه‌روه‌ها مه‌حه‌به‌ت نه‌رێكردنی جیاوازی پێویست ده‌كات، خۆشه‌ویست به هه‌میشه‌یی له‌گه‌ڵ خۆشه‌ویستی خۆیه‌تی، له‌و باره‌یه‌وه ریوایه‌تێك هاتووه: له ئه‌بی موسای ئه‌شعه‌رییه‌وه(خودا لێی رازی بێت) له پێغه‌مبه‌ری خوداوه(ﷺ) وترا: كه‌سێك ده‌سته‌یه‌كی خۆشده‌وێت و هێشتا پێیان نه‌گه‌یشتووه؟

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی:((مرۆڤ له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌سه‌دایه خۆشیده‌وێت))[٧١]

**ئه‌بو حه‌فص ده‌ڵێت:** زۆربه‌ی تێكچوونی حاڵ له سێ شته‌وه‌یه: لادانی عاریفان و ناپاكی خۆشه‌ویستان و درۆی موریدان.

---

[٧١] {سبق تخریجه}.

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** "لادانی عاریفان" بەرەڵاکردنی چاو و زمان و گوێ بۆ هۆکارەکانی دونیا و سوودەکانی.

"ناپاکی خۆشەویستان" هەڵبژاردنی ئارەزووی خەڵکییە بەسەر رازیبوونی خودادا(سبحانه وتعالى) لەوەی روویان لێ دەکات.

"درۆی موریدان" ئەوەیە یادی خەڵك و بینینی خەڵك زاڵ بێت بەسەر یادی خودادا(سبحانه وتعالى).

**"أبو علي ممشاد بن سعيد" دەڵێت:** کۆترێکی بنجیلە داوای خۆشەویستی لە کۆترێکی تر دەکرد لەسەر گومبەزەی سولەیمان(علیه السلام)، ئەویش مەیلی پێ نەدەدا، کۆترە نێرەکە پێی وت: بۆ مەیلم پێ نادەی گەر دەتەوێ ئەم گومبەزییەی سولەیمانت(عليه السلام) بۆ وەردەگێڕم..

**سولەیمان(عليه السلام) بانگی کرد و لێی پرسی: بۆ ئەو قسەیەت کرد؟**

ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(عليه السلام) عاشقان بە قسەکانیان ناگیرێن.

**سولەیمان(عليه السلام) فەرمووی:** راستدەکەیت.

٤٧

# شەوق

((پرسیار لە "ابن عطاء الله" کرا دەربارەی شەوق وتی: سووتانی هەناو و گڕگرتنی دڵ و پارچەپارچەبوونی جگەرە))

**خودا (ﷻ) دەفەرمویێت:** ﴿مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖ﴾ **العنکبوت: ٥**

**عەتای کوڕی سائب لە باوکییەوە دەڵێت:** عەماری کوڕی یاسر(خودا لێی رازی بێت) نوێژێکی سووك و کورتی پێکردین، وتم: باوکی یەقزان، ئاسانت کرد.. ئەویش وتی: بۆ ئەو کارە هیچم لەسەر ناکەوێت، چەند دوعایەکم تێدا خوێند لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست، کاتێك هەستا پیاوێك لە هاوەڵان شوێنی کەوت و پرسیاری دوعاکانی لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

**((أللهم بعلمك الغيب، وقدرتك على الخلق، أحييني ما علمت الحياة خيرا لي، وتوفني ما علمت الوفاة خيرا لي، أللهم إني أسألك خشيتك في الغيب والشهادة، وأسألك كلمة الحق في الرضا والغضب، وأسألك القصد في الغنى والفقر، وأسألك نعيما لا ينفد وقرة عين لا تنقطع، وأسألك الرضا بعد القضاء، وبرد العيش بعد الموت، وأسألك النظر إلى وجهك الكريم، وشوقا إلى لقائك في غير ضراء مضرة ولا فتنة مضلة، أللهم زينا بزينة الإيمان، أللهم اجعلنا هداة مهتدين))**

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** شەوق بریتییە لە گەشانەوەی دڵ بۆ لیقای خۆشەویست، بە ئەندازەی خۆشەویستی شەوق سەرهەڵدات.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت)** جیاوازی دەکرد لە نێوان "الشوق" و "الإشتياق-تامەزرۆبوون" و دەیوت: شەوق بەهۆی بە

یەکترگەیشتن و بینینەوە دادەمرکێتەوە، بەڵام "ئیشتیاق" بەهۆی بەیەکترگەیشتن و بینینەوە دانامرکێتەوە.

**نەصرابادی دەڵێت:** هەموو خەڵکی مەقامی شەوقیان هەیە، بەڵام مەقامی ئیشتیاقیان نییە، هەر کەس بکەوێتە حاڵی تامەزرۆبوونەوە تیایدا سەرگەردان دەبێت و شوێنەوار و ئارامی لە ئەو هەڵدەگیرێت.

**وتراوە:** ئەحمەدی کوڕی حامد هات بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەنازل و وتی: لە خەوندا بینیم لە ماوەی ساڵێکدا تۆ دەمری، ئایا خۆت ئامادە کردووە بۆ لە دونیادەرچوون؟

عەبدوڵای کوڕی مەنازل وتی: تۆ –بە هەواڵەکەت- ئێمەت بۆ ماوەیەکی زۆر دواخستووە، ئایا من تا ساڵێکی تر دەژیم.. هۆگریم بەم دێڕە هۆنراوەوە هەبوو کە لەو پیاوە سەقەفییەم بیست(مەبەستی ئەبو عەلی بووە):

**يا من شكا شوقه من طول فرقته   اصبر لعلك تلقى من تحب غدا**

(ئەی ئەو کەسەی بەهۆی درێژی دابڕانەوە شەوقەکەی سکاڵا دەکات، ئارامبگرە بەڵکو سبەینێ بگەی بەوەی خۆشتدەوێت)

**ئەبو عوسمان دەڵێت:** نیشانەی شەوق خۆشەویستی مردنە لەگەڵ ئاسوودەیی.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** رۆژێك داود(عليه السلام) بەتەنها رووی لە دەشت و سارا کرد، خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ نارد و پێی فەرموو: چییە ئەی داود دەتبینم تاکوتەنهایت؟

ئەویش فەرمووی: خودایە، شەوق بۆ لیقای تۆ بەسەر دڵمدا زاڵ بووە، ئەوەش وایکردووە لە خەڵکی دابڕێم، خودا وەحی بۆ کرد و پێی فەرموو: بگەڕێرەوە بۆ لایان، چونکە گەر بەندەیەکی یاخی بۆ لای من بهێنی لە لەوحی مەحفوزدا بە بەندەیەکی زانا و دانا تۆمارت دەکەم.

**وتراوه:** پیرەژنێك هەبوو، یەكێك لە خزمەكانی لە سەفەر گەڕانەوە، هەموو خۆشی و سرووریان دەربڕی بەڵام ئەو دەستی بە گریان كرد، پرسیان بۆچی دەگری؟

وتی: گەڕانەوەی ئەم گەنجە گەڕانەوە بۆ لای خودای بەبیرهێنامەوە.

**پرسیار لە ئیبن عەتا كرا دەربارەی شەوق وتی:** سووتانی هەناو و گڕسەندنی دڵ و پارچەپارچەبوونی جگەر.

**دیسان پرسیاری لێكرا دەربارەی شەوق و وتیان:** شەوق باڵاترە یان مەحەبەت؟ وتی: مەحەبەت، چونكە شەوقی لێ لەدایك دەبێت.

**یەكێك لە پیاوان دەڵێت:** شەوق كڵپەیەكە لە هەناوەوە سەرهەڵدەدات بەهۆی دابڕانەوە، كاتێك بەیەكترگەیشتن دادەمركێتەوە، گەر زاڵ بەسەر نهێنییەكاندا بینینی مەحبووب بێت شەوق ڕروویان لێ ناكات.

**بە یەكێكیان وترا: ئایا موشتاقی رووت لێ دەكات؟ وتی:** نەخێر، چونكە شەوق بۆ كەسێكە بزر و نادیار بێت، بەڵام ئەو هەمیشە ئامادەیە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)** لەسەر ئەو فەرموودەی خودا(ﷻ)﴿ **قَالَ هُمْ أُولَاءِ عَلَىٰ أَثَرِي وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ﴿٨٤﴾** ﴾ **طه: ٨٤** دەیوت: ماناكەی: شەوقم هەبوو بۆ لای تۆ، بەڵام بە وشەی **"الرضا"** شەوقەكەی داپۆشی.

**هەروەها گوێم لێ بوو (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** لە نیشانەكانی شەوق: ئاواتخواستنە بۆ مردن لەسەر راخەری عافییەت، وەك یوسف(عليه السلام) كاتێك هەڵدرایە ناو بیرەكە نەیفەرموو: **"توفني"** كاتێك خرایە بەندیخانە نەیفەرموو: **"توفني"**، كاتێك باوك و دایك و براكانی هاتن بۆ لای و كڕنووشیان بۆ برد و موڵك و نیعمەتی بۆ تەواو بوو فەرمووی: ﴿ **تَوَفَّنِي مُسْلِمًا** ﴾ **یوسف: ١٠١**.

**ئیبن خەفیف دەڵێت:** شەوق ئاسوودەیی دڵانە بە وەجد و خۆشەویستی لیقایە بە نزیكی.

**ئەبو یەزید دەڵێت:** خودا کۆمەڵێك بەندەی هەیە گەر لە بەهەشتدا لە بینینی خۆی بێبەشیان بکات پەنا و هانا بۆ خودا دەبەن لە بەهەشت وەك چۆن ئەهلی ئاگر پەنا و هانا دەبەن بۆ خودا لە ئاگر.

**حوسەین ئەنصاری دەڵێت:** لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی قیامەت هەستابوو، کەسێك لەژێر عەرشی خودادا بەپێوە وەستابوو، خودا(ﷻ) دەیفەرموو: ئەی فریشتەکانم، ئەمە کێیە؟

وتیان: خودا زاناترە لە ئێمە، خودا(ﷻ) فەرمووی: ئەوە مەعرووفی کەرخییە، بە خۆشەویستی من مەست و بێئاگا بوو تەنها بە لیقای من هۆشدەکاتەوە.

**لە هەندێ بەسەرهاتدا لە نموونەی ئەو خەونە وتراوە:** ئەوە مەعرووفی کەرخییە بە موشتاقی بۆ لای خودا(ﷻ) لە دونیا دەرچوو، خوداش سەیریکردنی رووی خۆی پێرەوابینی.

**"فارس" دەڵێت:** دڵی موشتاقان بە نووری خودا(ﷻ) رووناك بووەتەوە، کاتێك تامەزرۆبوونیان دەکەوێتە جووڵە ئەو نوورە نێوان ئاسمان و زەوی رووناك دەکاتەوە، فریشتەکان ئەوانە بۆ خودا دەخەنە روو، خوداش دەفەرموێت: ئەوانە موشتاقانی لیقای منن.. ئێوە بە شاهید بن من بۆ لیقای ئەوان موشتاقترم.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت:** ((أسألك الشوق إلى لقائك)) دەیوت: شەوق سەد بەشە، نەوەد و نۆی لای خودایە، بەشێکی بەناو خەڵکیدا بڵاوەی کردووە، خودا دەیەوێ ئەو بەشەش بۆ خۆی بێت، خودا غیرەت دەکات پارچەیەك لەو شەوقە بۆ کەسانێکی تر بێت جگە لە خۆی.

**وتراوە:** شەوقی ئەوانەی لە خوداوە نزیکن تەواوترە لە شەوقی بێبەشان.

**هەروەها وتراوە:** موشتاقان شیرینی مردن نۆش دەکەن لە کاتێکدا روویان لێ دەکات بەهۆی ئەوەی پەردەی لەسەر لادەدرێت بۆیان لە ئاسوودەیی و تام و چێژی شیرینتر لە هەنگوین.

**جونەید دەڵێت گوێم لە "السري" بوو دەیوت:** شەوق باڵاترین مەقامە بۆ عاریف گەر تیایدا دامەزرێت، گەر لە شەوقدا دامەزرا لە هەرچی شتی ترە بێئاگا دەبێت و خەریك دەبێت بەوەی بۆی موشتاقە.

**ئەبو عوسمانی حیری لەسەر ئەم ئایەتە:﴿فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَآتٍ﴾ العنكبوت: ٥ دەڵێت:** ئەمە سەرەخۆشییە بۆ موشتاقان، ماناکەی: من دەزانم تامەزرۆبوونی ئێوە بۆ من بەسەرتاندا زاڵە، من لیقای ئێوەم دیاریکردووە بە ماوەیەکی دیاریکراو، بەم نزیکانە بە من و ئەوەی بۆی موشتاقن دەگەن.

**وتراوە:** خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ داود(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: بە لاوانی بەنی ئیسرائیل بڵێ: بۆ خۆتان بە شتانێکەوە جگە لە من سەرقاڵ دەکەن، من موشتاقم بۆ دیداری ئێوە، ئەم جەفا و بێمەیلییەتان لە چییە؟!

**وتراوە:** خودا(عز وجل) وەحی بۆ داود(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: گەر ئەوانەی پشتم تێدەکەن بیانزانیبایە چەندە چاوەڕوانی ئەوانم و چەندە بەبەزەییم بەرانبەریان و چەندە شەوقم هەیە بۆ ئەوەی واز لە یاخیبوونەکانیان بهێنن ئەوا لە شەوقیاندا بۆ من دەمردن، و بۆ من بە خۆشەویستییەوە پارچە پارچە دەبوون، ئەی داود ئەمە ویستی منە بۆ ئەو کەسانەی پشتم تێدەکەن ئەی دەبێ ویستم چۆن بێت بۆ ئەوانەی رووم لێ دەکەن؟

**وتراوە:** لە تەوراتدا نووسراوە: ئێمە ئێوەمان موشتاق کرد، بەڵام ئێوە موشتاق نەبوون، ئێمە ئێوەمان ترساند و ئێوە نەترسان، ئێمە دەمانویست ئێوە بهێنینە گریان بەڵام نەگریان.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** شوعەیب هەتا کوێر بوو گریا، خودا(عز وجل) چاوەکانی بۆ گێڕایەوە، پاشان گریا هەتا کوێربوویەوە، خودا(عز وجل) دیسان چاوەکانی بۆ گێڕایەوە، ، پاشان گریا هەتا کوێربوویەوە، بۆیە خودا(عز وجل) وەحی بۆ نارد و پێیفەرموو: گەر ئەم گریانە لەپێناوی بەهەشتدایە ئەوا بەهەشتم بە تۆ بەخشی، گەر لە پێناوی ئاگردایە ئەوا پەنامدای لە ئاگر، شوعەیب فەرموو: نەخێر، بەڵکو بەهۆی شەوقەوەیە بۆ لای تۆ، بۆیە خودا وەحی

بـۆ نـارد و پێـی فـەرموو: لـەو پێناوەدایـە دە سـاڵ پێغەمبەرەکـەم و قسـەکەرەکەی خۆمم(موسا(عليه السلام)) بۆ کردی بە خزمەتکار.

**وتراوە:** هەر کەس موشتاق بێت بۆ لای خودا هەرچی شتە موشتاقی دەبێت.

**لە ریوایەتێکـدا هـاتووە:** ((بەهەشـت موشـتاقی سـێ کەسـە: عـەلی و عـەمار و سەلمان))

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** یەکێك لە گەورە پیاوان دەڵێت: من دەچمە بازاڕەوە و شتەکان بۆ من موشتاقن، بەڵام من لە هەموویان ئازادبووم.

**مالیکی کوڕی دینار دەڵێت:** لـە تەوراتـدا خوێندوومەتـەوە هـاتووە: تامـەزرۆمان کردن بەڵام ئێوە تامەزرۆ نەبوون، ئاهانگمان بۆ گێڕان سەماتان نەکرد.

**پرسیار لە جونەید کرا:** کاتێـك خۆشەویسـتێك دەگـات بـە مەحبووبەکـەی بۆچـی دەگری؟

وتـی: ئـەوە خۆشـی و سـروورە بـە مەحبووبەکەیـەوە، وەجدێکـە بـەهۆی تونـدی تامەزرۆبوون بۆی، پێمگەیشتووە دوو برا دەستیان کـردە گـەردنی یـەکتر و یـەکێکیان وتی: هاوار بۆ ئەم شەوقە، ئەویتریان وتی: هاوار بۆ ئەم وەجدە.

## ٤٨

# پارێزگاری لە دڵی گەورە پیاوان و وازهێنان لە جیاوازی لەگەڵیان

**((لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:((هەر گەنجێك رێز لە کەسێکی بەتەمەن بگرێت خودا لەو تەمەنەیدا کەسێکی بۆ دەنێرێت رێزی بگرێت))**

**خودا لە چیرۆکی موسا و "خضر"(علیهما السلام) دەفەرموێت:﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾﴾ الکهف: ٦٦**

**ئیمام قوشەیری دەڵێت:** کاتێك موسا(عليه السلام) ویستی هاوەڵی خزر(عليه السلام) بکات مەرجی ئەدەبی پاراست، یەکەمجار داوای مۆڵەتی هاوەڵێکردنی کرد، پاشان خزر(عليه السلام) بەمەرجی گرت لەسەری بەرهەڵستی نەکات لە هیچ شتێکدا و لە بڕیاردا رووبەڕووی نەوەستێتەوە، پاشان کاتێك موسا(عليه السلام) سەرپێچی لێکرد لە یەکەم جار و دووەم جاردا چاوپۆشی لێکرد، بەڵام لە سێیەم جاردا(سێ دواهەمین رادەی کەمی و یەکەمین رادەی زۆرییە) لێی جیابوویەوە و پێی فەرموو: ﴿هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾الکهف: ٧٨

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((هەر گەنجێك رێز لە کەسێکی بەتەمەن بگرێت خودا لەو تەمەنەیدا کەسێکی بۆ دەنێرێت رێزی بگرێت))[٧٢]

---

[٧٢] {حديث صحيح أخرجه الترمذي}.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** سەرەتای هەموو جیابوونەوەیەك سەرپێچییە، مەبەستی ئەوە بوو هەرکەس سەرپێچی لە شێخەکەی بکات لەسەر ڕێگەی ئەو نامێنێتەوە، و پەیوەندی نێوانیان کۆتایی پێ دێت با یەك شوێنیش کۆیان بکاتەوە، هەر کەس هاوەڵی شێخێکی کرد و پاشان بە دڵ بەرهەڵستی کرد ئەوا پەیمانی هاوەڵی کردنی هەڵوەشاندووەتەوە، و تەوبە لەسەری پێویستە، سەرباری ئەوەی هەندێ لە گەورەپیاوان دەڵێن: خراپ مامەڵەکردنی مامۆستایان تەوبەی بۆ نییە.

**"أبو عبدالرحمن السلمي" دەڵێت:** لە ژیانی شێخ و مامۆستامدا(أبي سهل **الصعلوكي**) رۆیشتم بۆ "مەرو"، بەر لە چوونەکەم رۆژانی هەینی سەرلەبەیانییەکەی دانیشتنی دەوری قورئان و خەتم کردنیان هەبوو، لە کاتی گەڕانەوەم بینیم ئەو دانیشتنە نەمابوو، لەو کاتەدا کرابوو بە دانیشتنی قسە بۆ **"أبي الغفاني"**، لەو بارەیەوە شتێك کەوتە دەروونمەوە و لە ناوەوە دەمووت: چۆن دەبێ دانیشتنی خەتمی قورئان بگۆڕن بۆ دانیشتنی قسە، بۆیە رۆژێك پێی وتم: ئەی باوکی عبدالرحمن خەڵکی چی دەربارەی من دەڵێن؟

وتم: دەڵێن: دانیشتنی قورئانی هەڵگرتووە و دانیشتنی قسەی لە جێگەی داناوە.. وتی: هەر کەس بە مامۆستاکەی بڵێ: بۆچی؟ هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە جونەید وتوویەتی: رۆژێك چووم بۆ لای **"السري"** فەرمانی پێکردم بە شتێك، منیش بەزوویی پێویستییەکەم بۆ جێبەجێ کرد، کاتێك گەڕامەوە پارچە کاغەزێکی دایە دەستم و وتی: ئەمە لە جێگەی ئەوەی پێویستییەکەت بەخێرایی بۆ جێبەجێ کردم، پارچە کاغەزەکەم خوێندەوە بینیم تیایدا نووسرا بوو: گوێم لە کەسێك بوو لە بیاباندا گۆرانی بۆ حوشترەکانی دەوت و دەیوت:

**أبكي وهل يدريك ما يبكيني    أبكي حذارا أن تفارقيني**

**وتقطعي حبلي وتهجريني**

(دەگریم، ئایا دەزانێت بۆ دەگریم، دەگریم بەهۆی ترسی ئەوەی لێم جیاببییەوە و حەبلەکەم بچڕێنی و کۆچم لیٚ بکەی)

**لە ئەبی حسەنی هەمەدانی عەلەوییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** شەوێك لای جەعفەری خولدی بووم، لەماڵەوە فەرمانم بە خانەوادەکەم کرد گۆشتی باڵندەم بۆ بکەنە ناو تەنوور، دڵم هەر لەلای بوو، جەعفەر پێی وتم: ئەمشەو لەلامان بمێنەرەوە، منیش بیانوویەکم بۆ هێنایەوە، گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، باڵندەکەیان لە تەنوورەکە هێنایە دەرەوە و لەبەردەمیان دانام، سەگێك لە دەرگاکە هاتە ژوورەوە و لە کاتی بێئاگایی ئێمەدا پڕیکرد بە باڵندە برژاوەکەدا و بردی، شتێکی کەم مابوو فەقیانەی کارەکەرەکەی لێگیرا و ئەویش رژا، کاتێك رۆژم لیٚ بوویەوە رۆیشتم بۆ لای جەعفەر، کاتێك چاوی پێمکەوت وتی: دڵی پیاوانی پارێزگاری لیٚ نەکرد، بۆیە خودا سەگێکی بەسەردا زاڵ کرد ئازاری بدات.

**شەقیقی بەڵخی و ئەبو تورابی** نەخشەبی رۆیشتن بۆ لای ئەبو یەزیدی بوستامی، سفرەیان بۆ هێنان_گەنجێك خزمەتی ئەبو یەزیدی دەکرد- هەردوو پێیان وت: ئەی گەنج لەگەڵمان بخۆ، وتی: من بەڕۆژووم، ئەبو توراب وتی: بخۆ پاداشتی رۆژووی مانگێکت بۆ هەیە، گەنجەکە نەیویست، شەقیق پێی وت: بخۆ پاداشتی رۆژووی ساڵێکت بۆ هەیە، گەنجەکە نەیویست، ئەبو یەزید وتی: ئێوە بانگی کەسێك دەکەن لەبەر چاوی خودا(ﷻ) بەربووەتەوە، دوای ساڵێك گەنجەکە دەستی کرد بە دزی و دەستیان بڕی.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی بوو دەیوت:** سەهلی کوڕی عەبدوڵا وەسفی پیاوێکی کرد کە نانەوایە لە بەصرە بەوەی دۆستی خودایە، پیاوێك لە هاوەڵانی سەهل ئەو قسەیەی بیست و بۆ دیداری ئەو پیاوە موشتاق بوو، بۆیە رووی لە بەصرە کرد و هات بۆ دوکانی نانەواکە، بینی نان دەکات و لەسەر عادەتی ئەوانەی نان دەکەن پەڕۆیەکی لەسەری بەستووە، لە نەفسی خۆیدا وتی: گەر ئەم پیاوە وەلی بێت نابێت بەبیٚ پەڕۆش قژی بە ئاگر بسووتیٚ، پاشان سەلامی لێکرد و پرسیاری شتێکی لێکرد، پیاوەکە وتی: تۆ منت بەکەم تەماشا کرد و سوود لە قسەکانم نابینی، بۆیە قسەی بۆ نەکرد.

**"أبو عبدالرحمن السلمي" دەڵێت:** "عبدالرحمن الرازی" گوێی لە ئەبو عوسمانی حیری بوو وەسفی **محەمەدی کوڕی فەزڵی بەڵخی** کرد، بۆ دیداری موشتاق بوو، بۆیە ڕۆیشتن بۆ سەردانی، **محەمەدی کوڕی فەزڵ**-وەك ئەوەی بیری لێ دەکردەوە- نەکەوتە دڵیەوە، گەڕایەوە و ئەبو عوسمان پرسیاری لێکرد: چۆنت بینی؟

وتی: بەو جۆرە نەبوو گومانم دەبرد، وتی: لەبەر ئەوەی بەکەم تەماشات کردووە، هەر کەسێك یەکێك بەکەم تەماشا بکات بێبەش دەبێت لە سوود لێ بینینی، ئەم جارە بەڕێزەوە بۆ لای بگەڕێرەوە، "عبدالرحمن" گەڕایەوە بۆ لای و سوودی لێ بینی.

**عومەری کوڕی عوسمانی مەکی حوسەینی کوڕی** مەنصووری بینی شتێکی دەنووسی، پرسی: ئەوە چییە؟

وتی: ئەوە بەرهەڵستی قورئانی پێ دەکەم، ئەویش دوعای لێکرد و کۆچی لێکرد، گەورەپیاوان دەڵێن: ئەوەی بەسەر حوسەینی کوڕی مەنصووردا هات دوای ماوەیەکی زۆر بە هۆی دوعای ئەو پیاوەوە بوو.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** کاتێك ئەهلی بەڵخ **محەمەدی کوڕی فەزڵیان** نەفی کرد لە شارەکەیان دوعای لێکردن و وتی: ((**أللهم امنعهم الصدق**-خوایە صدقیان لێ بگریتەوە)) لەدوای ئەوە کەسێکی صدیق لە بەڵخ پەیدا نەبوو.

**ئەحمەدی کوڕی یەحیای ئەبیوری دەڵێت:** هەر کەس شێخەکەی لێی ڕازی بێت حاڵی ژیانی بەشی ناکات بۆ ئەوەی مەزنی ئەو شێخە لە دڵیدا کۆتایی پێ نەیەت، کاتێك شێخەکەی دەمرێت خودا(ﷻ) پاداشتی ڕازیبوونەکەی بەسەردا دادەبارێنێت، هەر کەسیش دڵی شێخەکەی لێ بگۆڕێت لە ژیانی شێخەکەیدا حاڵی تێر و تەواو دەبێت بۆ ئەوەی شێخەکەی بەزەیی پیایدا نەیەتەوە، چونکە ئەوان لەسەر بەخشندەیی ڕاهاتوون، گەر شێخەکەی مرد پاداشت لەدوای ئەو نابینێتەوە.

## ٤٩

# بیستن

((سەهلی کوڕی عەبدولاّ دەڵێت: پێبیستن زانستێکە تایبەتکراوە بە خودا(سبحانه وتعالى) و تەنها ئەو دەیزانێت))

**خودا(ﷻ) دەفەرمویێت:** ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ﴾ الزمر: ١٧–١٨، "اللام" لە وشەی "القول"دا گشتگیری نیشان دەدات، بەڵگە لەسەری مەدح کردنیانە بە شوێنکەوتنی "أحسن-چاکترین"

**هەروەها خودا(ﷻ) دەفەرمویێت:** ﴿فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾﴾ الروم: ١٥، **لە** تەفسیردا هاتووە: بریتییە لە "بیستن".

بزانە بیستن لە هۆنراوە بە ئاوازی خۆش و سەدای بەچێژ-گەر گوێگرەکە لە قەدەغەکراو نزیك نەکاتەوە و ئەوەی شەرع بە ناپەسەندی دەبینێت گوێی لێ نەگرێت و رەشۆی ئارەزوو شل نەکات و نەچێتە ناو بەزم و بێئاگاییەوە- لە ریزی موباحەکانە.

جیاوازی لەوەدا نییە هۆنراوە لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) خوێنراوەتەوە، گوێی لێگرتووە و هۆنینەوەی بە ناپەسەند نەزانیوە، گەر گوێ لێگرتنی بەبێ ئاوازی خۆش دروست بێت ئەوا حوکمەکە ناگۆڕێت گەر بە ئاوازیشەوە بخوێنرێتەوە.

ئەمە ئاشکرای کارەکەیە، پاشان ئەو بیستنە حەزی چاکە و گوێڕایەڵی لە گوێگرەکەدا پێویست دەکات و ئەوەی خودا بۆ خۆپارێزانی ئامادە کردووە لە پلە و پایەی بەرز بەبیردەهێنێتەوە و هەڵیدەنێت بۆ خۆپارێزی لە هەڵە و تێکەوتن و پاکێتی حاڵی هاتوو بۆ سەر دڵ-کە لە ئاییندا پەسەندە و هەڵبژاردەی شەرعە- فەراهەم

دەكات، بەسەر گوزارەكانی پێغەمبەردا(ﷺ) شتگەلێك گوزەری كردووە كە نزیكە بە هۆنراوە هەرچەند پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی هۆنراوە نەبووە.

**لە ئەنەسەوە(خودا لێی رازی بێت)** ئەنصارەكان خەندەقیان هەڵدەكەند و دەیانوت:

**نحن الذين بايعوا محمدا     على الجهاد ما بقينا أبدا**

(ئێمە ئەوانەیان لەسەر جیهاد بەیعەتمان دا بە محەمەد(ﷺ) هەتا مابین لە ژیاندا و بۆ هەتاهەتایە)

**پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامیدانەوە و فەرمووی:**

**((أللهم لا عيش إلا عيش الآخرة   فأكرم الأنصار والمهاجرة))**

(خودایە هیچ زیندەگییەك نییە جگە لە زیندەگی دوارۆژ، خودایە رێزی یاریدەدەران و كۆچكەران بگرە)

ئەم گوزارشتە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەسەر كێشی هۆنراوە نییە، بەڵام نزیكە لە هۆنراوەوە.

پێشین و گەورەپیاوان گوێیان لە هۆنراوە گرتووە بە ئاوازەوە، لەوانەی لە پێشین بە موباحی دەبینێت:

مالیكی كوڕی ئەنەس و هەموو ئەهلی حیجاز ئاوازیان پێ موباحە، گۆرانی بۆ حوشتریش(**الحداء**) كۆدەنگیان هەیە لەسەری كە موباحە.

زۆرێك لە ریوایەت و بەسەرهات لەو بارەیەوە باسكراوە، لە ئیبن جورەیجەوە ریوایەت كراوە مۆڵەتی بە بیستن داوە، پێی وترا: گەر رۆژی دوایی هات و چاكە و خراپەكانت هێنران بیستنەكەت لە كام لەو دوانەیە، وتی نە لە چاكەكانە و نە لە خراپەكان، واتە لە موباحەكانە.

**ئیمامی شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت)** بە حەرامی نازانێت، لەناو خەڵكی رەشۆكیدا بە ناپەسەندی دەبینێت، گەر وتنی گۆرانی كرد بە پیشە و بە بەردەوامی گوێی بۆ دەگرت وەك خۆبێئاگا كردن شایەتی لێ وەرناگیرێت و پیاوەتی كەسەكە بەردەداتەوە، بەڵام ناچێتە ناو حەرامكراوەكانە.

قسەی ئێمە لەسەر ئەم جۆرە لە بیستن نییە، پیاوانی ئەم دەستەیە پلە و پایەیان بەرزترە لەوەی گوێ بۆ لەهو بگرن یان بەبێئاگایی دانیشن بۆ بیستن یان بە دڵ بیر لە ناوەرۆکی ژاوەژاو بگرن یان گوێ بۆ بابەتێکی ناشایستە بگرن.

**چەند ریوایەتێك لە ئیبن عومەرەوە** دەربارەی بیستن ریوایەت کراوە، هەر بەو جۆرە لە عەبدوڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبی تالبەوە، بە هەمان شێوە لە عومەرەوە(خودا لە هەموویان رازی بێت) دەربارەی گۆرانی بۆ حوشتر تا خێرایی رۆیشتنەکەی زیاد بکات.

لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) هۆنراوە وتراوە و نەهی لێ نەکردووە، ریوایەت کراوە پێغەمبەر(ﷺ) داوای کردووە هۆنراوەی بۆ بخوێننەوە.

ئەوەی بەناوبانگە ئەوەیە رۆیشت بۆ ژوورەکەی عائشە(خودا لێی رازی بێت) و دوو جاریە گۆرانیان دەوت و نەهی لە کارەکەیان نەکرد.

**لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت)** ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی رازی بێت) هات بۆ لای و دوو جاریە گۆرانیان دەوت بەوەی لە رۆژی **"بعاث"**دا ئەنصارەکان لەسەر یەکتر دەیانوت، ئەبوبەکر دوو جار فەرمووی: ئاوازی شەیتان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لێیانگەڕێ ئەی ئەبوبەکر، بۆ هەر گەل و نەتەوەیەك جەژنێك هەیە جەژنی ئێمەش ئەم رۆژەیە))[٧٣]

**هەروەها لە عائشەوە(خودا لێی رازی بێت): ((خزمێکی خۆی دا بە کەسێکی ئەنصاری، پێغەمبەر(ﷺ) هات و فەرمووی:** هەدیەی ئەم کچەتان کردووە؟

عائشە فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کەستان ناردووە گۆرانی(هۆنراوە بە ئاوازی خۆشەوە) بڵێت؟

عائشە فەرمووی: نەخێر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەنصارییەکان غەزەلخوێنیان تێدایە ئێوەش یەکێکتان بناردبایە بڵێت: **أتيناكم أتيناكم فحيونا نحييكم))**[٧٤]

(هاتین بۆ لاتان، هاتین بۆ لاتان، سڵاومان لێ بکەن و سڵاوتان لێ بکەین)

---

[٧٣] {أخرجه البخاري في صحيحه}.

[٧٤] {أخرجه ابن ماجة}

**له بەرائی کوڕی عازیبەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو:** ((بە دەنگتان قورئان جوان بکەن، چونکە دەنگی خۆش خۆشی قورئان زیاد دەکات))

**له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((هەموو شتێك خشڵ و رازانەوەی هەیە خشڵ و رازانەوەی قورئان دەنگ و ئاوازی خۆشە))[٧٥]

**دیسان له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((دوو دەنگ نەفرەتیان لێکراوە: دەنگی واوەیلا لە کاتی موسیبەتدا، لەگەڵ دەنگی زڕنا و دەهۆڵ لە کاتی خۆشیدا))

تێگەیشتن لە گوتارەکە موباحبوونی دەنگ و ئاوازەکانی تر دەگەیەنێت جگە لەو دوانە، ئەگەر وانەبێت تایبەتکردنەوەی ئەو دوانە پووچدەبێتەوە.

ریوایەتەکانی ئەم دەروازەیە زۆرن، زیاتر لەم برِە لە مەرامی پوختەکردن لامان دەدات، ریوایەتکراوە پیاوێك لە بەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

**أقبلت فلاح لها عارضان كالسبج**

**أدبرت فقلت لها والفؤاد في الوهج**

**هل علي ويحكما إن عشقت من حرج**

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** نەخێر))[٧٦]

دەنگی خۆش یەکێکە لەو نیعمەتانەی خودا لەناو خەڵکیدا بە کەسێکی دەبەخشێت، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُ﴾فاطر: ١، لە تەفسیردا وتراوە: لەوانە دەنگی خۆش.

---

[٧٥] {أخرجه عبدالرزاق في الجامع والضياء عن أنس وقال حديث صحيح}.

[٧٦] {وتراوە ئەم ریوایەتە دانراوە و دروست نییە بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە}.

خودا(ﷻ) زەمی دەنگی ناخۆشی کردووە و فەرموویەتی:﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾﴾ لقمان: ١٩

چێژوەرگرتن و تامەزرۆبوونی دڵ بۆ دەنگی خۆش و ئارامی و ئاسوودەیی بەو دەنگە جێگەی رەدکردنەوە و نەرێکردن نییە، منداڵ بە دەنگی خۆش خامۆش دەبێت و ئارام دەبێتەوە، حوشتر بە ئاوازی خۆش دووری رێگە و کۆڵی قورسی لەلا سووك و ئاسان دەبێت، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾﴾ الغاشية: ١٧

**"إسماعيل بن علية" دەڵێت:** لە کاتی نیوەڕۆیەکی گەرمدا لەگەڵ شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڕۆیشتم، لاماندایە شوێنێك کەسێکی تێدا بوو ئاوازی دەچڕی، فەرمووی: با بچین بۆ لای، پاشان فەرمووی: ئەم ئاوازە خۆشحاڵت دەکات؟

وتم: نەخێر، فەرمووی: هەستت نییە.

**هەروەها پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێت:** ((خودا(ﷻ) مۆڵەتی بە شتێك نەداوە وەك مۆڵەتی بە پێغەمبەرێك قورئان بە ئاوازی خۆشەوە بخوێنێتەوە))

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:** ((خودا مۆڵەتی نەداوە بە پێغەمبەرێك بە ئەنجامدانی شتێك وەك ئەو مۆڵەتدانەی بە پێغەمبەرێکی داوە بە دەنگی خۆش قورئان بخوێنێت و ئاشکرای بکات))[77]

**وتراوە: داود(ﷺ)** کاتێك زەبووری دەخوێندەوە جین و مرۆڤ و باڵندە و دڕندە گوێیان بۆ خوێندنەوەکەی دەگرت، لە دانیشتنێکیدا چوارسەد جەنازە هەڵدەگیرا کە بە هۆی بیستنی خوێندنەوەکەیەوە دەمردن.

**پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبو موسای ئەشعەری فەرموو:**((تۆ ئاوازێك لە ئاوازەکانی ئالی داودت پێدراوە))[78]

[77] {متفق عليه}.

[78] {متفق عليه}.

**مەعازی کوڕی جەبەل(خودا لێی ڕازی بێت) بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) فەرموو:** گەرم بزانیبایە گوێتگرتووە بە خۆشترین ئاواز بۆم دەڕازاندییەوە.

**"أبوبكر محمد بن داود الدينوري" دەڵێت:** لە دەشت و سارا بووم، ڕۆیشتم بۆ لای هۆزێك لە هۆزە عەرەبەکان، پیاوێك لەوان میوانداری لێ کردم، گەنجێکی ڕەشپێستم بینی بەسترابوویەوە، چەند حوشترێکم بینی لە تەنیشت ماڵەکەوە مرداربووبوونەوە، گەنجەکە پێی وتم: تۆ ئەمشەو میوانی و لە لای گەورەی من کەسێکی بەڕێزی، تکام بۆ بکە لای گەورەکەم، چونکە داوای تۆ ناگێڕێتەوە(داوای لێ بکات بۆ ئەوەی کۆتوبەندەکەی بکاتەوە).

منیش وتم بە خاوەن ماڵەکە: خواردنی ماڵی تۆ ناخۆم تا ئەو بەندەیە نەکەیەوە.

وتی: ئەو گەنجە منی ڕووبەڕووی هەژاری کردووەتەوە و ماڵ و سامانی تیابردووم.

وتم: چی کردووە؟

وتی: دەنگێکی خۆشی هەیە، منیش ژیانم لەسەر پشتی ئەم حوشترانەیە، باری قورسی لێناون و ئاوازی خۆشی بۆ وتوون تا ماوەی دووری سێ ڕۆژی بە یەك ڕۆژ پێ بڕیون، کاتێك بارەکەی لێ کردنەوە هەموویان مردن، بەڵام ئەوا بە تۆم بەخشی، کۆتوزنجیری بەندەکەی کردەوە، کاتێك ڕۆژمان لێ بوویەوە پێمخۆش بوو گوێم لە دەنگی بێت بۆیە داوام لێکرد ئاوازێکم بۆ بچڕێت، خاوەنەکەی فەرمانی بە گەنجەکە کرد ئاوازێك بۆ ئەو حوشترە بڵێت کە لەسەر بیرێك ئاویان پێ هەڵدەگۆزی، ئەویش ئاوازێکی بۆ وت، حوشترەکە پەتی چڕی و دەشت و سارای دایە بەر، پێموانییە ئاوازێکی لەوە خۆشترم لە تەمەندا بیستبێت، بۆیە بەڕوودا کەوتم تا خاوەنەکەی ئاماژەی بۆ کرد بێدەنگ بێت.

**پرسیار لە جونەید کرا:** بۆچی کەسێك ئارام و خامۆشە تا ئاوازێك دەبیستێ دێتە جۆش و خرۆش؟

وتی: کاتێك خودا(سبحانه وتعالى) قسەی لەگەڵ ڕۆحەکان کرد لە پەیماننامە مەزنەکەدا بە وتنی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ﴾ الأعراف: ١٧٢، خۆشی و شیرینی دەنگی خۆش چۆڕێنرایە

ناو رۆحەکانەوە، کاتێك لێرە ئاوازی خۆش دەبیستن ئەوەیان بیردەکەوێتەوە و دێنە جۆش و هەژان.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** بیستن لەسەر خەڵکی بەگشتی حەرامە بەهۆی مانەوەی حەزی نەفسیانەوە، بۆ زاهیدان موباحە، بەهۆی تێکۆشانیانەوە و بۆ هاوەڵانی ئێمە پەسەندە بە هۆی زیندەگی دڵیانەوە.

**حاریسی موحاسیبی دەڵێت:** سێ شت گەر فەراهەم بوون خۆشییان لێ وەربگرە، لە ئێستادا لەدەستمانداون: رووی خۆش لەگەڵ پارێزگاری و دەنگی خۆش لەگەڵ دیانەت و برایەتی باش لەگەڵ وەفاداری.

**پرسیار لە "ذو النون" کرا دەربارەی دەنگی خۆش وتی:** گوفتار و ئاماژەگەلێك خودا(ﷻ) پاکی و خۆشی و جوانی تێدا داناون.

**جارێکی تر پرسیاری لێکرا لەمەڕ بیستن وتی:** هاتوویەکی حەقە دڵ بەرەو لای حەق(ﷻ) هەڵدەنێت، هەر کەس بە حەق گوێی لێبگرێت دەگاتە ئەنجام، هەر کەسیش بە حەزەوە گوێی لێ بگرێت دەبێت بە زەندیق.

**جونەید دەڵێت:** رەحمەت لە سێ شوێندا بەسەر هەژاراندا دادەبارێت: لە باری بیستندا، چونکە ئەوان تەنها لە حەقەوە دەبیستن، و تەنها لە وەجدەوە دەدوێن، هەروەها لە کاتی خواردندا، چونکە تەنها لە کاتی برسێتیدا دەخۆن، سێیەمیش لە مەجلیسی زانستدا، چونکە تەنها سیفەتی دۆستانی خودا باس دەکەن.

**دیسان جونەید دەڵێت:** بیستن بۆ ئەوانەی بەدوایدا عەودالن فیتنەیە، پشوویەکە بۆ ئەوانەی رێیان لێی دەکەوێت.

**دیسان لە جونەیدەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** بیستن پێویستی بە سێ شتە: کات و شوێن و برایان.

**پرسیار لە شیبلی کرا دەربارەی بیستن وتی:** ئاشکراکەی فیتنەیە، و ناوەوەی پەند و ئامۆژگارییە، هەر کەس ئاماژەی ناسی بیستنی پەندی بۆ حەڵاڵ دەبێت، ئەگینا فیتنەی بەسەر خۆیدا هێناوە و رووبەڕووی بەڵا بووەتەوە.

**وتراوه:** بیستن تەنها بۆ ئەو کەسانە چاك و دروستە خاوەنی نەفسێکی مردوو و دڵێکی زیندوون، نەفسی بە شمشێری تێکۆشان سەربڕاوە و دڵی بە نووری تەبایی لەگەڵ خودا زیندوو بووەتەوە.

**پرسیار لە ئەبو یەعقووبی نەهرجووری کرا دەربارەی بیستن وتی:** حاڵێکە گەڕانەوە بۆ لای نهێنییەکان دەردەخات لەڕووی سووتانەوە.

**وتراوە:** بیستن لوتفی خۆراکی رۆحە بۆ ئەهلی مەعریفەت.

گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت: بیستن حەزە مەگەر لە شەرعەوە بێت، گەوجییە مەگەر لە حەقەوە بێت، فیتنەیە مەگەر لە پەندەوە بێت.

**دەوترێت: بیستن دوو بەشە:** بیستن بە مەرجی زانست و ئاگاهی، مەرجە خاوەنەکەی مەعریفەی بە ناوە جوانەکان و سیفەتەکان هەبێت، ئەگینا دەکەوێتە ناو بێباوەڕی رووتەوە، بیستن بە مەرجی بوونی حاڵە، لە مەرجی خاوەنەکەی فەنابوونە لە حاڵی مرۆیی و پاکبوونەوە لە حەزەکان بە یاساکانی حەقیقەت.

**ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری دەڵێت:** پرسیارم کرد لە ئەبو سولەیمان دەربارەی بیستن، وتی: لە دوو کەسەوە بیبیستم پێمخۆشترە تا لە یەك کەسەوە.

**پرسیار لە ئەبو حەسەنی نووری کرا دەربارەی سۆفی، وتی:** هەر کەسێکە بیستن(دەنگ و ئاواز) دەبیستێ و هۆکارەکان دەگرێتە بەر.

**رۆژێك پرسیار لە ئەبو عەلی رۆزباری کرا دەربارەی بیستن وتی:** خۆزگە سەربەسەر لێی رزگار بووینایە.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** هەر کەس بانگەشەی بیستن دەکات و دەنگی باڵندە و جیڕەی دەرگا و گڤەی با نابیستێ ئەوە کەسێکی هەژاری بانگەشەکەرە(واتە چێژ لەوانەش وەرناگرێت).

**جەعفەر دەڵێت:** ئیبن زەیری لە هاوەڵانی جونەید بوو، شێخێکی گەورە بوو، کەمجار لە شوێنی بیستندا ئامادە دەبوو، گەر لای خۆشبووایە مێزەرەکەی رادەخست و

دادەنیشت و دەیوت: سۆفی لەگەڵ دڵی خۆیەتی، گەر لای خۆش نەبوایە دەیوت: بیستن بۆ خاوەن دڵانە و تێدەپەڕی و نەعلەکانی هەڵدەگرت و دەڕۆیشت.

**پرسیار لە روەیم کرا دەربارەی وەجدی سۆفی لە باری بیستندا وتی:** کۆمەڵە مانایەك دەبیننەوە کە خەڵکانی تر لایان بزرە، ئەو مانانە ئاماژەیان بۆ دەکەن: بۆ لای ئەوە... بۆ لای ئەوە...، لە خۆشیدا دەکەونە باڵەتەپێ، پاشان پەردە دادەدرێتەوە و خۆشییەکەیان دەگۆڕێت بە گریان، هەیانە جلەکانی لەبەر خۆی دەدڕێت، هەیانە هاوار دەکات و هەیانە دەگری، هەر یەکەیان بەپێی حاڵ و پایەی خۆی.

**"الحصري" لە هەندێ قسەیدا دەڵێت:** پێویستە بەهەمیشەیی تینووی بێت، هەتا خواردنەوەی زۆرتر بێت تینوێتی زیاتر دەبێت.

**لە تەفسیری ئایەتی:** ﴿فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾﴾ **الروم: ١٥** هاتووە: ئەوە بریتییە لە بیستن لە حۆرلعەینەوە بە دەنگێکی خۆشی پڕ لە حەز و ئارەزوو دەڵێن: ((ئێمە نەمرین و هەرگیز مردن روومان لێ ناکات، ئێمە ناسك و نازدارین و هەرگیز پیری روومان لێ ناکات))

**وتراوە:** بیستن بانگە و وەجد مەبەستە[٧٩].

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** دڵی ئەهلی حەق دڵێکی ئامادەیە، بیستنەکانیشیان کراوەیە.

**مامۆستا ئەبو سەهلی سەعلوکی دەڵێت:** بیسەر(گوێگر) لە نێوان داپۆشین و جیلوەدایە، داپۆشین گڕسەندن پێویست دەکات، جیلوەش ئاسوودەیی و پشوو پێویست دەکات، داپۆشین جووڵە و بزوانی موریدانی لێ لەدایك دەبێت و جێگەی لاوازی و دەستەوسانییە، جیلوەش خامۆشی گەیشتووان(الواصلين)ی لێ لەدایك دەبێت کە جێگەی راستوەستان و دامەزرانە، هەر ئەوەش سیفەتی ئامادەبوونە و تەنها سیسبوونی تێدایە لەژێر هاتووەکانی هەیبەتدا، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ﴾ **الأحقاف: ٢٩**

---

٧٩ {(واتە: وەڵامدانەوەیە بۆ بانگی بیستنەکە)}.

**هەروەها ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت: بیستن لە سێ رووەوەیە:**

**روویەکی** بۆ موریدان و سەرەتاییەکانە بە هۆی ئەو بیستنەوە حاڵی بەرز و بڵند داوا دەکەن، فیتنە و ریابازی لێیان بەدوور ناگیرێت.

**دووەم:** بیستنی صادیقان کە داوای حاڵی زیادە دەکەن بەو بیستنە، ئەوەش بەپێی گونجاوی لەگەڵ کاتەکانیان.

**سێیەم:** بیستن بۆ ئەهلی راستوەستان و عاریفان، ئەمانە هەڵبژاردنیان بەسەر خودادا نییە لەو شتانەی روو لە دڵیان دەکات لە جووڵە و خامۆشی.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** هەر کەس بانگەشەی ئەوە دەکات لە کاتی بیستندا ژێردەستە بووە و جووڵەکانی لە ویستی ئەو بەدەرە ئەوە نیشانەی راستگۆییەکەی بریتییە لە کاریگەری لەسەر دانیشتوانی مەجلیسەکە کە تیایدا وەجد گرتوویەتی.

**"أبو عبدالرحمن" دەڵێت:** ئەم بەسەرهاتەم بۆ ئەبو عوسمانی مەغریبی باس کرد وتی: ئەوە نزمترینیانە، نیشانەی دروستی: ئەوەیە لە دانیشتنەکەدا هەموو ئەوانەی ئامادەن و ئەهلی حەقن پێیەوە هۆگر بن و ئەوانەش ئەهلی پووچین نامۆیی و وەحشەتیان بۆ دروست ببێت.

**بەنداری کوڕی حوسەین دەڵێت:** بیستن لە سێ رووەوەیە:

هەیانە بە حەز و سروشتی خۆی گوێدەگرێت، هەیانە بە حاڵەوە گوێدەگرێت، هەشیانە بە حەقەوە گوێدەگرێت، ئەو کەسەی بە حەز و سروشت گوێدەگرێت تایبەت و گشتی تێدا بەشدار دەبێت، چونکە چێژ وەرگرتن لە دەنگی خۆش لە هەویری مرۆڤدایە، ئەو کەسەی بە حاڵەوە گوێدەگرێت ئەوا رادەمێنێت لەوەی رووی لێ دەکات لە باسی سەرزەنشت یان گوتار یان گەیشتن یان کۆچکردن یان نزیکی یان دووری، یان پەژارە بۆ ئەوەی لەدەستی چووە، یان تینوێتی بۆ ئەوەی کە دێت، یان وەفا بە پەیمان، یان بەڕاستزانینی پەیمان، یان یادی نیگەرانی یان تامەزرۆبوون یان ترس و دابڕان یان دڵخۆشی دیدار یان ترسی جیابوونەوە یان شتانێکی تری هاوشێوەی ئەمانە.

ئەو کەسەش کە بە حەق دەبیستێ ئەوە بە خوداوە(ﷻ) و بۆ خودا دەبیستێ، ئەمان بەو حاڵانەی پێشوو کە تێکەڵە بە حەزە مرۆییەکان وەسف ناکرێن، چونکە ئەوانە هێشتا حاڵی ناتەواون، بەڵام ئەمان بە پاڵفتەی یەکتاپەرستیەوە دەبیستن، واتە بە حەقەوە دەبیستن نەك بە حەزەوە.

**وتراوە:** ئەهلی بیستن سێ چینن: رۆڵەکانی حەقیقەت لە بیستنیاندا دەگەڕێنەوە بۆ گفتوگۆی خودا(ﷻ) لەگەڵیان، جۆری دووەم بە دڵیان قسە لەگەڵ خودای خۆیان دەکەن بەو مانانەی دەبیستن، ئەوان لەوەی ئاماژەی پێدەکەن بۆ لای خودا داوای صدقیان لێ دەکرێت، سێیەم: کەسێکی هەژاری داڕنراوە لە پەیوەندییەکانی دونیا و ئافەتەکانی، بە پاکێتی دڵی خۆیانەوە دەبیستن، ئەمانە لە هەمووان زیاتر لە سەلامەتییەوە نزیکترن.

**پرسیار لە ئەبو عەلی رۆزباری کرا دەربارەی بیستن وتی:** پەردەلادانە لەسەر نهێنییەکان بە بینینی خۆشەویست.

پرسیار لە خەواص کرا مرۆڤ چییەتی لە بیستنی ئاوازی خۆش دێتە جۆش و خرۆش بەڵام بە بیستنی قورئان نابزوێت؟ ئەویش وتی: چونکە بیستنی قورئان هەژانێکە کەس ناتوانێ بەهۆی توندی زاڵبوونییەوە ببزوێت، بەڵام بیستنی دەنگ و قسە ئاسوودە کردنێکە و مرۆڤ تیایدا دەکەوێتە جووڵە.

**جونەید دەڵێت:** گەر موریدت بینی حەزی بە بیستن(بیستنی ئاواز و گۆرانی) بوو بزانە هێشتا پاشماوەی بەتاڵی تێدا ماوە.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** بیستن زانستێکە تایبەتە بە خودا و تەنها ئەو دەیزانێت.

**ئەحمەدی کوڕی موقاتیلی عەکی دەڵێت:** کاتێك **"ذو النون"** رۆیشتە ناو بەغدادەوە سۆفییەکان لێی کۆبوونەوە، شایەرێکیان لەگەڵ بوو، داوای مۆڵەتیان لە **"ذو النون"** کرد شتێك لەبەردەمیدا بڵێت، ئەویش مۆڵەتی دا، شایەرەکە بەم جۆرە دەستی پێکرد:

**صغير هواك عذبني فكيف به إذا احتنكا**

(ئارەزوویەکی کەم ئازارم دەدات، ئەی دەبێ چۆن بێت گەر زاڵ بێت بە سەرمدا)

دەڵێت: "**ذو النون**" هەستا و بە رووودا بەربوویەوە و دڵۆپی خوێن بە روخساریدا دەهاتنە خوارەوە و بەرنەدەبوونەوە بۆ سەر زەوی، پاشان یەکێك لەوانەی ئامادە بوو وەجدی بۆ هات و هەستایە سەرپێ، "**ذو النون**" وتی:﴿ **ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾** ﴾ **الشعراء: ٢١٨**، بۆیە پیاوەکە دانیشتەوە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر ئەم بەسەرهاتە دەیوت: "ذو النون"** دەیڕوانی بەسەر ئەو پیاوەدا، ئاگاداری کردەوە ئەوە مەقامی ئەو نییە، پیاوەکەش خاوەنی ویژدان بوو، ئەوەی لێ قبوولّ کرد و گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

**ئیبن جەلا دەڵێت:** لە مەغرب دوو شێخ هەبوون هاوەڵ و قوتابی زۆریان هەبوو، بە یەکێکیان دەوترا "**جبلة**" بەویتریان دەوترا "**رزيق**"، رۆژێك "رزيق" لەگەڵ هاوەڵانی سەردانی "**جبلة**" کرد، یەکێك لە هاوەڵانی "رزيق" شتێکی خوێندەوە، منداڵێك لە هاوەڵانی"**جبلة**" هاواری کرد و مرد، کاتێك رۆژیان لێبوویەوە"**جبلة**" بە "رزيق"ی وت: ئەو کەسە لە کوێیە دوێنێ بۆی خوێندین؟

با بۆمان بخوێنێت، ئەویش ئایەتێکی خوێندەوە و "**جبلة**" هاوارێکی لێ بەرزبوویەوە و ئەو پیاوەی ئایەتەکەی خوێند گیانی دەرچوو، بۆیە "**جبلة**" وتی: یەك بە یەك و ئەوەی یەکەمجار دەستی پێکرد ستەمکارترە.

لە ئیبراهیم مارستانی پرسیاری جووڵە و بزوان کرا لە کاتی بیستندا وتی: پێمگەیشتووە موسا(عليه السلام) لەناو بەنی ئیسرائیلییەکاندا چیرۆکێکی بۆ دەگێڕانەوە، یەکێکیان کراسەکەی بەر خۆی دڕاند، خودا(سبحانه وتعالى) وەحی بۆ موسا(عليه السلام) نارد و فەرمووی پێی بڵێ: دڵی خۆتم بۆ والا بکە و کراسەکەت مەدڕێنە.

**ئەبو عەلی مەغازلی لە شیبلی پرسی:** لەوانەیە ئایەتێك لە قورئان بە گوێمدا بدرێت پاڵم بنێت بۆ وازهێنان لە شتەکان و پشتهەڵکردن لە دونیا، بەڵام دواتر بگەڕێمەوە بۆ حاڵی پێشووم و بۆ ناو خەڵکی..

**شیبلی وتی:** ئەوەی بۆ لای خۆی رایکێشاویت بەزەیی بووە لە ئەوەوە بۆ سەر تۆ و لوتفی لەگەڵ کردووی، ئەوەش کە دەگەڕێیەوە بۆ لای نەفسی خۆت دیسان بەزەیی ئەوە بە تۆ، چونکە هێشتا بەتەواوی و دروستی خۆت دانەڕنیوە لە هەوڵ و هێزی خۆت بۆ رووکردنە ئەو(سبحانه وتعالى).

**ئەحمەدی کوڕی موقاتیلی عەکی دەڵێت:** شەوێکی مانگی رەمەزان لەگەڵ شیبلی لە مزگەوتێك بووم، لە پشتی ئیمامێکەوە نوێژی دەکرد و من لە تەنیشتییەوە بووم، ئیمامەکە ئەم ئایەتەی خوێند:﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾ الإسراء: ٨٦، هەناسەیەکی هەڵکێشا وتم رۆحی فڕیوە، بینیم دەلەرزی و دەیوت: بەم جۆرە گفتوگۆ لەگەڵ خۆشەویستان دەکرێت.. ئەم قسەیەی بەردەوام دووبارە دەکردەوە.

**جونەید دەڵێت:** رۆژێك چووم بۆ لای **"السري"**، بینیم پیاوێك لەلای بووراوەتەوە، پرسیم: چییەتی؟ وتی: گوێبیستی ئایەتێکی کتێبەکەی خودا(سبحانه وتعالى) بووە، وتم: جارێکی تر ئایەتەکەی بەسەردا بخوێنە، ئەویش خوێندی و پیاوەکە هۆشی کردەوە، لێی پرسیم: لە کوێوە ئەمە فێربووی؟

وتم: بەهۆی کراسەکەی یوسفەوە(عليه السلام) چاوی یەعقووب(عليه السلام) کوێربوو، پاشان بە کراسەکەی یوسف(عليه السلام) چاوی چاکبوویەوە، **"السري"** ئەو کارەی منی لا باش و پەسەند بوو.

**"عبدالواحد بن علوان" دەڵێت:** گەنجێك هەبوو هاوەڵی جونەیدی دەکرد، هەر کات شتێك لە زیکری ببیستبایە دەنگ و بروسکەیەك لێی دەدا، رۆژێك جونەید پێی وت: گەر جارێکی تر ئەوە بکەی نابێ هاوەڵیم بکەی.. بۆیە کاتێك شتێکی دەبیست رەنگی دەگۆڕا، بەڵام خۆی دەگرت، هەتا هەموو مووەکانی جەستەی بە دڵۆپێك لەو ئازارەی لە ناخیدا بوو گرژ دەبوون، رۆژێك هاوارێکی لێ بەرزبوویەوە و گیانی سپارد.

**ئەبو حەسەنی دەراج دەڵێت:** بڕیارم دا لە بەغداوە سەردانی یوسفی کوڕی حوسەینی رازی بکەم، کاتێك گەیشتمە "رەی" ویستمماڵەکەی بدۆزمەوە، پرسیارم لە هەر کەس دەکرد پێی دەوتم: ئیشت چییە بەو کابرا زەندیقە؟ سینەیان هێنامەوە

یەك، تا وام لێهات بمەوێت بگەڕێمەوە، ئەو شەوە لە مزگەوت مامەوە، پاشان وتم: هاتووم بۆ ئەم شارە و نەتوانم سەردانی بکەم! بۆیە بەردەوام پرسیارم کرد تا مزگەوتەکەیم دۆزییەوە، بینیم لە میحرابی مزگەوتەکەدا دانیشتووە، و پیاوێك لەبەردەمیدایە، و قورئانێکی پێیە و تێیدا دەخوێنێت، تەماشام کرد شێخێکی روخسار جوانی خاوەن ریشە، لێی نزیکبوومەوە و سەلامم لێ کرد، پرسی: لە کوێوە؟

وتم: لە بەغداوە، بۆ سەردانی تۆ هاتووم، وتی: گەر لە شارێك یەکێك بە تۆی بوتبایە: لەلام بمێنەرەوە تا خانوویەك و کەنیزەکێکت بۆ دەکڕم ئایا ئەوە رێگری لێ دەکردی لە سەردان کردنی من؟

وتم: گەورەم، خودا بە هیچ شتێك لەوەی تۆی دەیلێیت تاقینەکردوومەتەوە، گەر بەسەرم نەهاتبێت چۆن بزانم؟

وتی: پێت باشە شتێك بڵێیت؟

وتم: بەڵێ، بۆیە ئەم دێڕە هۆنراوەم بۆ خوێندەوە:

**رأيتك تبنى دائبا في قطيعتي ولو كنت ذا حزم لهدمت ما تبني**

(دەبینم هەمیشە دیواری دابڕان لە من دروست دەکەی، گەر خاوەنی ویست و لێبڕان بوومایە ئەوەی تۆ بینای دەکەی من دەمڕوخاند)

قورئانەکەی داخست و دەستی بە گریان کرد، ئەوەندە گریا ریش و پۆشاکەکەی بەری تەڕ کرد، تا بەزەییم بە حاڵیدا دەهاتەوە بە هۆی گریانی زۆرییەوە، پاشان پێی وتم: ئەی کوڕی خۆم، لۆمەی ئەهلی رەی مەکە لەسەر ئەو قسەی دەڵێن: " یوسفی کوڕی حوسەین زەندیقە"، لە دوای نوێژی بەیانییەوە تا ئێستا قورئان دەخوێنم فرمێسکێك بە چاومدا دانەباری، کەچی بە دێڕە هۆنراوەیەك چاوەکانم قیامەتی لە خۆی هەستاند.

**"الدراج" دەڵێت:** من و ئیبن قوتی مارین لە نێوان "بەصرە و ئەبلە"دا لەسەر رووباری دیجلە بووین، لەناکاو کۆشکێکی جوانمان بینی، دیمەنێکی سەرنجڕاکێشی هەبوو، پیاوێکی لەسەر بوو کەنیزەکێك لە بەردەمی گۆرانی بۆ دەوت و دەیوت:

**في سبيل الله ود كان مني لك يبذل**

**كل يوم تتلون غير هذا بك أجمل**

(له پێناوی خودادا سۆز و خۆشەویستییەك هەیە كە لە منەوە بە تـۆ دەبەخشـرێت، هەموو رۆژێك تۆ دەگۆڕێیت بەلاّم ئەوەشت هەر لێ جوانە)

گەنجێك لەو نزیكانە كوپەیەكی ئاوی پێ بوو گوێی لە گۆرانییەكەی بوو، وتی: ئـەی جاریە توو گیانی مەولاكەت ئەو دێڕە دووبارە بكەرەوە:

**كل يوم تتلون غير هذا بك أجمل**

ئەویش دووبارەی كردەوە، گەنجەكە وتی: بلێ، ئەویش جارێكی تر وتیەوە، ئەو گەنجە هـەژارە وتـی: سـوێند بـە خـودا، ئەمـە گـۆڕانی منـە لەگـەڵ حـەق، هـاوارێكی لـێ بەرزبوویەوە و گیانی دەرچوو، خاوەن كۆشكەكە وتی بە جاریەكە: تۆ لە پێناوی خودادا ئازادی، خەڵكی شاری بەصرە هاتن و نوێژیان لەسەر كرد و ناشتیان، خاوەن كۆشكەكە هەستایە سەرپێ و وتی: ئێوە من دەناسن.. ئێوە دەكەم بە شایەت هەرچی شتم هەیـە لەپێناوی خودادا دەیبەخشم و هەرچی كۆیلە و كەنیزەكم هەیە ئازادن، كراس و كەوا و مێزەرێكی بۆ خۆی جیاكردەوە و كۆشك و ماڵ و موڵكی كرد بـە صـەدەقە و لـەدوای ئەوە ئەو پیاوە نەبینرایەوە و شوێنەواری بزر بوو.

**"يحيى بن الرضا العلوي" دەڵێت:** لە كاتی تەوافدا گوێم لە ئەبو سولەیمانی دیمەشقی بوو بانگی دەكرد و دەیوت: "يا سعتر بري-ئەی رووەكی سـەعتەری بیابـان"، بەدوایـدا بینـیم بوورایەوە، كاتێك هۆشی كردەوە پرسیاری لێكرا وتی: وامدەزانی دەڵێم: **"اسع تر بري"**.

**عوتبەی غولام گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: "سبحان رب السماء**، خۆشەویسـتان لە ئازار و شەكەتیدان" عوتبە وتی: راست دەكەی، پیاوێكی تر ئـەو قسـەی بیسـت و وتی: درۆ دەكەی.. هەریەكەیان لەو شوێنەوە بیستی كە ئەوی تێدا بوو.

**ئەبو حەسەن عەلی كوڕی محەمەد دەڵێـت:** پرسـیار لـە روەیـم كـرا دەربـارەی ئـەو پیاوانەی ئەو پێیان گەیشتووە و بیسـتنیان هـەبووە، وتـی: وەك پەڵـە مـەڕێكیان لـێ دەهات گورگ تێیكەوتبێت.

**ئەبو سەعیدی خەراز دەڵێت:** عەلی کوڕی موفەقم لە بیستندا بینی دەیوت: راستم بکەنەوە، ئاوانیش بەرزیان کردەوە و بەپێوە راوەستا و پاشان وتی: من شێخ "زەفانم".

**وتراوە** شەوێك تا بەیانی **"الرقـي"** بـەپێوە دەوەسـتا و بەردەبوویـەوە بـۆ سـەر زەوی کاتێك ئەم دێڕە هۆنراوەی دەبیست:

**بالله فاردد فؤاد مكتئب ليس له من حبيبه خلف**

(بۆ خاتری خودا ئەو دڵە شـەکەتە بگێـڕەرەوە، چـونکە تـەنها ئـەو یادگارییـەی لـە خۆشەویستەکەیەوە بۆ بەجێماوە)

**عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی محەمەد دەڵێت:** گوێم لە باوکم بوو دەیوت: ساڵانێکی زۆر خزمەتی سەهلی کوڕی عەبدوڵام کرد، کاتێك گوێی لە زیکرێك، قورئانێك، یان شتێکی تر بوایە گۆڕانم تێدا نەدەبینی، کاتێك کەوتە دوارۆژەکانی تەمەنی ئەم ئایەتەی لەبەردەم خوێنرایەوە:﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ ﴾ **الحديد: ١٥** بینیم رەنگی گۆڕا و لاشەی کەوتە لەرزین، خەریك بوو بەربێتەوە، کاتێك گەڕایەوە بۆ حاڵی ئاگاهی خۆی پرسیاری ئەوەم لێکرد وتی: خۆشەویستەکەم، ئێمە لاوازبووین[٨٠].

**ئیبن سالم دەڵێت:** جارێکی تر بینیم ئەم ئایەتە لەبەردەمی خوێنرایەوە:﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ﴾ **الفرقان: ٢٦** حاڵی گۆڕا و خەریك بوو بکەوێت، لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد، وتی: لاوازی رووی لێکردم، سیفەتی پیاوی گەورە بەو جۆرەیە گەر هاتوویەك رووی لێ بکات با بەهێزیش بێت ئەو لە هاتووەکە بەهێزترە.

**"عبدالرحمن السلمي" دەڵێت:** چووم بۆ لای ئـەبو عوسمـانی مـەغریبی یـەکێك لـە بیرێك بە جەنجەڕ(خولخولۆکە) ئاوی هەڵدەگۆزی، ئەبو عوسمان وتی: باوکی عەبدورەحمان دەزانی ئەو خولخولۆکە چی دەڵێت: وتم: نەخێر، وتی: دەڵێت: الله، الله.

**عەبدوڵای کوڕی سەهل دەڵێت:** گوێم لە روەیم بوو دەیوت: لە عـەلی کـوڕی ئـەبی تالبەوە(خودا لێی رازی بێت) ریوایەت کراوە گوێی لە دەنگی ناقووس بوو، فـەرمووی بە هاوەڵانی: دەزانن ئەو دەنگە چی دەڵێت؟

---

[٨٠] {(واتە لاوازبووین ناتوانین وەك جاران حاڵی خۆمان بشارینەوە)}.

وتیان: نەخێر، فەرمووی: دەڵێت: **"سبحان الله! حقا إن المولی صمد یبقی-سبحان الله!** بە حەق خودا گەورە و پشتیوانە و دەمێنێتەوە"

**ئەحمەدی کوڕی عەلی کەرخی دەڵێت:** دەستەیە لە سۆفییەکان لە ماڵی حەسەنی قەزاز کۆبووبوونەوە، شایەریان لەگەڵ بوو دەیانوت و وەجدیان لێ دەهات، مەمشادی دەینووری هات بۆ سەریان، ئەوانیش بێدەنگ بوون، مەمشاد وتی: بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەوەی تیایدا بوون، گەر هەرچی بێئاگاکەری دونیایە کۆببێتەوە ناخی من داگیر ناکات و کەمێك لە برینەکانی من چارەسەر ناکات.

**ئەبو عەلی رۆزباری دەڵێت:** لەم رێگەیەدا گەیشتووینەتە جێگەیەك وەك تیژی شمشێر وایە، کەمترین شەکەتی روومان لێ بکات دەمانبڕێت و هەڵمان دەداتە ناو ئاگرەوە.

**"خیر النساج" دەڵێت:** موسای کوڕی عمران(عليه السلام) چیرۆکێکی بۆ هۆزەکەی گێڕایەوە، یەکێکیان هاواری لێ بەرزبوویەوە و موسا(عليه السلام) هەڕەشەی لێ کرد، خودا وەحی بۆ موسا(عليه السلام) نارد و پێی فەرموو: بە چاکەی من پێیان راکێشاوە و بە خۆشەویستی من نهێنییەکان دەردەخەن و بە وەجدی من هاوار دەکەن، بۆ هەڕەشە لە بەندەکانم دەکەی؟

**وتراوە:** شیبلی گوێی لە کەسێك بوو دەیوت: خەیار(الخیار) دە دانەی بە دانقێك(شەش یەکی درهەمێك)، شیبلی هاواری کرد و وتی: گەر خەیار(لە زمانی عەرەبیدا مانای چاکانیشی هەیە) دە دانەی بە دانقێك بێت ئەی دەبێ خراپان چەندی بە چەند بێت؟!.

**وتراوە:** کاتێك حورلعەینەکان لە بەهەشتدا گۆرانی دەڵێن: درەختەکان گوڵ دەکەن.

**پرسیار لە ئەبو سولەیمانی دارانی کرا دەربارەی بیستن وتی:** هەر دڵێك دەنگی خۆشی دەوێت ئەو دڵە لاوازە و پێویستی بە لایلایەیە وەك چۆن منداڵ پێویستی بە لایلایەیە بۆ ئەوەی چاوی بچێتە خەو، پاشان وتی: دەنگی خۆش هیچ نابانە ناو

دڵەوە، بەڵكو ئەوە دەبزوێنێت لەناو دڵدایـە، ئـیبن ئـەبی حـەواری دەڵێـت: سـوێند بـە خودا ئەبو سولەیمان راست دەكات.

**"الجريري" دەڵێـت:** كەسـانێكی رەبـانی بـن، واتـە لـە خـوداوە ببیسـتن و لـە خـوداوە قسە بكەن.

**پرسیار لە یەكێكیان كرا دەربارەی بیستن وتی:** تیشـكێكە دەدرەوشـێتەوە پاشـان خـامۆش دەبێـت، گورزەیەكـە لـە نـوور دەردەكـەوێت و بـزر دەبێـت، چـەندە شـیرینە چاوتروكانێك لەگەڵ خاوەنەكەی بمێنێتەوە!.

**وتــراوە:** بیســتن بەشــی هــەموو ئەنــدامێكی تێدایــە، ئــەوەی بەســەر چــاودا دادەبارێـت دەیهێنێتە گریان، ئەوەی روو لە زمان دەكات دەیهێنێتە هاواركردن، ئەوەی دەكەوێتە سەر دەست پۆشاك دەدڕێنێ و خۆی دەڕنێت، ئەوەی روو لە لاقەكان دەكات دەیهێنێتە سەما.

**هەروەها وتراوە:** یەكێك لە مەلیكەكانی عەجـەم مـرد، كـوڕێكی بچـووكی لـێ بەجێما، ویستیان بەیعەتی پێ بكەن وتیان: چۆن بگەینە ناسینی ژیـری و زیرەكـی ئەم منداڵە؟ پاشان لەسەر ئەوە رێكەوتن شایەرێك بهێنن شـتێك بڵێـت، گـەر بـە جوانی گوێی گرت داناییەكەی دەناسن، بۆیە شایەرێكیان هێنا، كاتێك شـایەرەكە شتێكی وت منداڵەكە پێكەنی، ئەوانیش لە بەردەمی منداڵەكەدا زەویان ماچ كرد و بەیعەتیان پێدا.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** ئەبو عەمری كوڕی نوجەید و نەصرابادی و دەستەیەك لە شوێنێك كۆبوونـەوە، نەصـرابادی وتی: من دەڵێم گەر دەستەیەك كۆبوونەوە یەكێكیان شتێك بڵێـت و ئـەوانیتر بێـدەنگ بن باشترە لەوەی غەیبەتی كەسێك بكەن.

**ئەبو عەمر وتی:** گەر تۆ سی ساڵ غەیبـەت بكـەی بـۆت باشـترە بیسـتنێك نیشـان بدەی كە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیـوت:** خەڵكی لە بیسـتندا سـێ جـۆرن: "متسـمع، و مسـتمع، و سـامع"، "متسـمع" ئـەو

کەسەیە بە کات(واتە لەناو کاتدا) گوێ دەگرێت، "مستمع" بە حاڵەوە گوێ دەگرێت، "سامع"یش بە حەقەوە دەبیستێ.

**چەندین جار لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاقم پرسی(رەحمەتی خودای لێ بێت):** شێوە داوایەك بۆ ئەوەی روخسەتی بیستنم پێ بدات، بەڵام دەیگێڕامەوە بۆ سەر ئەو شتەی پێویست بوو دەستی پێوە بگرم، پاش ماوەیەکی زۆر وتی: گەورەپیاوان دەڵێن: ((ئەوەی دڵت لەسەر خودا(سبحانه وتعالى) کۆدەکاتەوە خراپی تێدا نییە))

**لە ئیبن عەباسەوە(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) فەرمووی: خودا(ﷻ) وەحی نارد بۆ موسا(عليه السلام) و پێی فەرموو:** من دە هەزار بیستنم لە تۆدا دانا تا کەلامی منت بیست، هەروەها دە هەزار زمانم لە تۆدا دانا تا بتوانی وەڵامم بدەیەوە، خۆشەویسترین و نزیکترین شت بۆ لای من ئەوەیە گەر صەڵەوات لەسەر محەمەد(ﷺ) بدەیت.

**وتراوە:** یەکێکیان پێغەمبەری(ﷺ) لە خەوندا بینی فەرموو: لەمەدا(واتە لە بیستندا) هەڵە زۆرە.

**ئەبو حاریسی ئەولاسی دەڵێت:** لە خەوندا ئیبلیسم بینی-نەفرەتی خودای لێ بێت- لەسەر بانی ماڵێکی ئەولاسی بوو، منیش لەسەر بانێك بووم، لە لای راستییەوە دەستەیەکی لەگەڵ بوو، لەلای چەپیشییەوە دەستەیەکی لەگەڵ بوو پۆشاکی بەریان پاك بوو، وتی بە دەستەیەکیان: بڵێن، ئەوانیش وتیان و گۆرانیان چڕی، ئەوەندە ئاوازەکەی خۆش بوو دەمویست خۆم لە بانەکە هەڵبدەمە خوارەوە، پاشان پێی وتن: سەما بکەن، ئەوانیش بە جوانترین شێوە سەمایان دەکرد، پاشان بە منی وت: ئەی باوکی حاریس تەنها توانیومە ئەمە بهێنمە ناو ئێوەوە(واتە بیستن و سەماکردن).

**عەبدوڵای کوڕی عەلی دەڵێت:** شەوێك لەگەڵ شیبلی(رەحمەتی خودای لێ بێت) کۆبوومەوە شایەرێك شتێکی وت، شیبلی هاواری لێ بەرزبوویەوە و بە دانیشتنەوە وەجدی بۆ هات، پێی وترا: ئەی ئەبوبەکر چیتە لەناو ئەم دەستەیەدا دانیشتووی؟ ئەویش هەستایە سەرپێی و وەجد گرتی و وتی:

**لي سكرتان وللندمان واحدة شيء خصصت به من بينهم وحدي**

(دوو مەبەستبوونم هەیە و هاومەشرەبەکانم یەك مەستبوون، شتێکە لە ناویاندا منی پێ تایبەتکراوە)

**ئەبو عەلی ڕۆزباری دەڵێت:** چوومە کۆشکێکەوە گەنجێکی روخسار جوانم بینی راکشابوو و دەستەیەك بە دەوریدا بوون، پرسیاری حاڵیم کرد وتیان هاتووەتە ناو ئەم کۆشکە و گوێی لە کەنیزەکێك بووە ئەم هۆنراوەی خوێندووەتەوە و ئەویش هاوارێکی لێ بەرزبووەتەوە و مردووە:

**كبرت همة عبد طمعت في أن تراكا**

**أو ما حسب لعين أن ترى من قد رآكا**

(لێبڕانی بەندەیەك مەزن بوو کاتێك تەماعی ئەوەی هەبوو بتبینێت، ئایا بەس نییە بۆ چاوێك ئەو کەسە ببینێت تۆی بینیوە؟!)

۞ ۞ ۞

# دەروازەی پێنجەم

# کەرامەتی ئەولیا

((هەر کەس چل ڕۆژ ڕاستگۆیانە لە دڵەوە و دڵسۆزانە لەو کارەدا زوهد لە دونیا بکات کەراماتی بۆ دەردەکەوێت..))

# بەشی یەکەم

## کەرامەتی ئەولیا

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** دەرکەوتنی کەرامەت لەسەر دۆستانی خودا گونجاوە.

بەڵگە لەسەر گونجاوی کەرامەت ئەوەیە کارێکی وێناکراوە لە ئەقڵدا و رووداني نابێتە هۆی هەڵگرتن و سڕینەوەی ئەسڵێك لە ئەسڵەکان، بۆیە پێویستە خودا(ﷻ) بە توانا لەسەر بەدیهێنانی کەرامەت وەسف بکرێت، گەر ئەوە پێویست بوو کارێکە خودا(ﷻ) دەسەڵاتی بەسەریدا دەشکێت بۆیە هیچ شتێك(لەڕووی ئەقڵەوە) رێگە لە گونجاوییەکەی ناگرێت.

دەرکەوتنی کەرامەت نیشانەی راستگۆیی حاڵی ئەو کەسەیە کەرامەتەکەی لەسەر دەرکەوتووە، هەر کەس راستگۆ نەبێت دەرکەوتنی نموونەی ئەوانە گونجاو نییە، ئەوەی دەبێتە بەڵگە لەسەری پێناسەی دێرینە(ﷻ) بۆ جیابوونەوە تاکو جیاکاری بکات لە نێوان ئەو کەسەی حاڵی راستگۆیانەی هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی لەسەر پووچی و بێ بناغەییە، ئەمەش دیسان کارێکی وێناکراوە، ئەوەش بەوە دەبێت دۆستەکەی خودا تایبەت بکرێت بە شتێك کە لە بانگەشەی درۆزنەکەدا بوونی نییە، ئەو شتەش دۆستەکەی خودای پێ تایبەت دەکرێت بریتییە لە کەرامەت وەك ئاماژەمان پێکرد.

دەبێت ئەو کەرامەتە کارێك بێت هەڵوەشێنەری عادەت بێت لە رۆژانی داوادا، پشتیوانیکەری ئەو کەسە بێت بە ویلایەت وەسفکراوە لە مانای بەڕاستگۆ دەرکردنی حاڵیدا.

خەڵکێکی زۆر لە ئەهلی حەق قسەیان کردووە لەمەڕ جیاکاری نێوان کەرامەت و موعجیزە، ئیمام ئەبو ئیسحاق ئیسرافینی(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:

موعجیزەکان بەڵگەی راستگۆیی پێغەمبەرانن، بەڵگەی پێغەمبەرایەتی تەنها لای پێغەمبەر دەبینرێتەوە، وەك چۆن ئەقڵێکی دامەزراو کە ببێتە بەڵگە لەسەر زانابوونی زانایەك تەنها لای زاناکە دەبینرێتەوە.

**هەروەها دەڵێت:** دۆستانی خودا کەراماتیان بۆ هەیە وەك شێوە وەڵامدانەوەی دوعا، بەڵام ئەوەیان بۆ نییە کە لە رەگەزی موعجیزەی پێغەمبەرانە.

**ئیمام ئەبوبەکری کوڕی فۆرك(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** موعجیزەکان بەڵگەگەلێکی راستگۆیین، پاشان گەر خاوەنەکەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد ئەوا موعجیزەکان دەبنە بەڵگەی راستگۆیی قسەکەی، گەر خاوەنەکەی ئاماژەی بە ویلایەت کرد موعجیزە دەبێتە بەڵگەی راستگۆییەکەی و پێی دەوترێت کەرامەت و پێی ناوترێت موعجیزە با لە رەگەزی موعجیزەش بێت، ئەمەش وەك جیاکردنەوە نێوانیان.

**هەروەها(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** لە جیاکارییەکانی نێوان موعجیزە و کەرامەت: پێغەمبەران فەرمانیان پێکراوە بە دەرختننی، بەڵام شاردنەوە و داپۆشینی لەسەر دۆستی خودا پێویستە، پێغەمبەرەکە بانگەشەی بۆ دەکات و قسەی یەکلاکەرەوە بەو موعجیزەیە دەکات، بەڵام دۆستی خودا بانگەشەی بۆ ناکات و کەرامەتەکەی یەکلاکەرەوە نییە، بە هۆی بوونی ئەگەری ئەوەی دەگونجێ فێڵێکی شەیتان بێت.

**قازی ئەبوبەکری ئەشعەری(ناوازەی سەردەمی خۆی) دەڵێت:** موعجیزە تایبەتە بە پێغەمبەران(**علیه**)، بەڵام کەرامەت بۆ دۆستانی خودایە، وەك چۆن دەگونجێ کەرامەت بۆ پێغەمبەرانیش بێت، بەڵام ناگونجێ موعجیزە بۆ دۆستانی خودا بێت، چونکە لە مەرجی موعجیزە هاوملبوونی بانگەشەی پێغەمبەرایەتییە لەگەڵی، موعجیزە لە خودی خۆیدا موعجیزە نییە، بەڵکو لەبەر بەدەستهێنانی کۆمەڵێك وەسف بووە بە موعجیزە، گەر یەکێك لەو مەرجانە نەنگی و ناتەواوی رووی لێکرد نابێتە موعجیزە، یەکێك لەو مەرجانە: بانگەشەی پێغەمبەرایەتییە، دۆستی خودا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی ناکات، بۆیە ئەوەی لەسەری دەردەکەوێت موعجیزە نییە.

ئەمە ئەو قسەیە شانی لەسەر دادەین و فتوای پێ دەدەین و ئایینی خۆمانی لەسەر دادەمەزرێنین.

مەرجەکانی موعجیزە-هەمووی یان زۆرینەی- لە کەرامەتدا دەبینرێتەوە جگە لەو تەنها مەرجە، کەرامەت کارێکە گومانی تێدا نییە روویداوە، چونکە ئەوەی دێرین بێت بە هیچ کەسێکەوە تایبەت نەکراوە، کارێکە عادەت هەڵدەوەشێنێتەوە، و لە

ژیـانی دونیـادا رووده‌دات، بـۆ به‌نده‌یـه‌ك رووده‌دات وه‌ك تایبه‌تكردنـه‌وه و رێزلێنـان، كه‌مجارێكیش به ویست و دوعای دۆسته‌كه‌ی خودا رووده‌دات، هه‌ندێ جاریش روونادات بۆی، هه‌ندێ كاتیش به‌بێ ویستی ئه‌و رووده‌دات، فه‌رمان بـه دۆسـتی خـودا نـه‌كراوه خه‌ڵكی بانگ بكات بۆ لای خۆی، گه‌ر شتێك له‌و جۆره‌ی لێ ده‌ركـه‌وت-بـۆ ئه‌وانـه‌ی ئه‌هل و شایسته‌ن به‌و كاره- رێگه‌پێدراوه.

**ئه‌هلی حه‌ق جیاوازیان هه‌یه له دۆستی خودادا: ئایـا گونجـاوه بزانێـت دۆسـتی خودایه یان نه‌گونجاوه؟**

**ئیمام ئه‌بوبه‌كری كوڕی فۆرك(ره‌حمه‌تی خودای لێ بێت) ده‌ڵێت:** ئه‌و كاره گونجـاو نییه، چونكه ترسی لێ داده‌بڕێت و ئاسایش و پاڵدانه‌وه‌ی بۆ دروست ده‌كات.

**مامۆستا ئه‌بو عه‌لی ده‌قاق(ره‌حمه‌تی خودای لێ بێت)** ئه‌و كاره به گونجاو ده‌بینێت.

ئه‌وه‌ش ئه‌وه‌یه ئێمه لامان په‌سه‌نده و فتوای پێ ده‌ده‌ین.

زانینی ئه‌وه‌ی دۆستی خودایـه له‌سـه‌ر هـه‌موو دۆسـتێكی خـودا پێویسـت نییـه تـا پێویسـت بێـت هـه‌موو دۆسـتێكی خـودا بزانێـت دۆسـتی خودایـه، بـه‌ڵام ده‌گـونجێ هه‌ندێكیان ئه‌وه بزانن وه‌ك ده‌گونجێ هه‌ندێكیان نه‌یزانن، گه‌ر یه‌كێكیان زانی دۆسـتی خودایه ئه‌وا ئه‌و زانینه كه‌رامه‌تێكه بۆ ئه‌و و ئه‌وی پێ تایبه‌تكراوه.

مه‌رج نییه كه‌رامه‌تێكی تایبـه‌ت بـه دۆسـتی خـودا هـه‌مان كه‌رامـه‌ت بـۆ هـه‌موو دۆستانی خودا بێت، به‌ڵكو گه‌ر كه‌رامه‌تێكی ئاشكراش له دونیادا بـۆ دۆسـتی خـودا بـوونی نـه‌بێت نابێتـه تانـه له‌سـه‌ر دۆسـتایه‌تییه‌كه‌ی له‌گـه‌ڵ خـودا، بـه پێچـه‌وانه‌ی پێغه‌مبه‌رانه‌وه پێویسته هه‌ر پێغه‌مبه‌رێك موعجیزه‌یه‌كی تایبـه‌ت بـه خـۆی هـه‌بێت، چونكه پێغه‌مبه‌ر بۆ لای خه‌ڵكی هاتووه، خه‌ڵكیش پێویستیان به ناسـینی راسـتگۆی پێغه‌مبه‌ره‌كه هه‌یه، ئه‌وه‌ش ته‌نها له رێگه‌ی موعجیزه‌وه ده‌بێت.

حاڵی وه‌لی به پێچه‌وانه‌ی ئـه‌وه‌وه، چـونكه پێویسـت نییـه له‌سـه‌ر خـه‌ڵك و له‌سـه‌ر دۆستی خوداش بزانێت دۆستی خودایه.

ده لە هاوەڵان(خوایان لێ رازی بێت) پێغەمبەریان(ﷺ) بەڕاستزانینی لەوەی هەواڵی پێدان بەوەی ئەهلی بەهەشتن.

قسەی ئەو کەسانەش کە دەڵێن دروست نییە بزانن دۆستی خودان، چونکە لە ترس دووریان دەخاتەوە، ئەوان پێویستە لە گۆڕانی سەرئەنجام بترسن، وەڵامی ئەوەش بوونی هەیبەت و بەمەزنزانین و شکۆمەندکردنە بەرانبەر بە خودا(ﷻ) لە دڵیاندا زیاتر و زۆرترە لە زۆرێك لە ترس.

بزانە دۆستی خودا سوکنایی و ئارامی بۆ لای ئەو کەرامەتە نییە لەسەر دەستی پەیدا دەبێت، و سەرنجیشی نادات، لەوانەیە لە دەرکەوتنی کەرامەتدا هێزی یەقین و بەصیرەتی زۆرتریان بۆ پەیدا ببێت، بەهۆی دڵنیابوونەوەیان لەوەی ئەو کارە کاری خودایە و ئەوەش دەکەنە بەڵگەی راستێتی ئەو بیروباوەڕەی ئەوان پەیڕەوی لێ دەکەن.

**بە کورتی و بە پوختی** وتنی دەرکەوتنی کەرامەت لەسەر دۆستانی خودا پێویستە، ئەمەش بۆچوونی زۆرینەی ئەهلی مەعریفەیە، لەبەر زۆری ئەو هەواڵ و بەسەرهاتانەی دەربارەی کەرامەتی دۆستانی خودا هاتوون زانست پێیان-بەوەی لە دۆستانی خودا وەشاونەتەوە- دەبێتە زانستێکی بەهێز و شك و گومان دەسڕێتەوە، هەر کەس بچێتە ناو ئەم دەستەیە و هەواڵ و بەسەرهاتەکانیان لە رێگەی متەواتیرەوە بەدەست بهێنێت کەمترین گومان و تەمومژ لەلای نامێنێتەوە، لە بەڵگەکانی بوونی کەرامەت بۆ دۆستانی خودا:

دەقی قورئان لە چیرۆکی هاوەڵەکەی سولەیمان(علیه السلام):﴿ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾النمل: ٤٠، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەو پیاوە کە زانستی کیتابی هەبوو پێغەمبەر نەبوو.

**لە ئەمیری باوەڕدارانەوە عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێی رازی بێت) بەسەرهاتێکی دروست دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:** (ئەی ساریە، چیایەکە) ئەوەش لە کاتێکدا بوو لەسەر مینبەر لە رۆژی هەینیدا وتاری دەخوێند، دەنگی عومەر(خودا

لێی رازی بێت) لەو کاتەدا دەگاتە ساریە تا خۆی بپارێزێت لە فێڵی دوژمن کە دەیانویست پشتی چیایەکەی لێبگرن.

گەر بوترێت چۆن دەگونجێ کەرامەتێك لە دۆستێکی خودا بوەشێتەوە لە موعجیزەی پێغەمبەرێك زیاتر بێت؟ ئایا دروستە فەزڵی دۆستی خودا بدرێت بەسەر پێغەمبەرێکدا؟

ئەوا دەوترێت: ئەو کەرامەتانە پاشکۆی موعجیزەی پێغەمبەری مەزنمانە(ﷺ)، چونکە هەر کەس لە ئیسلامدا راستگۆ نەبێت کەرامەتی لەسەر دەرناکەوێت، کەرامەت بۆ هەر دۆستێکی خودا کە شوێنکەوتەی پێغەمبەرێك بووە لە ریزی موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە سەرژمێر دەکرێت، چونکە گەر ئەو پێغەمبەرە راستگۆ نەبوایە ئەوا کەرامەت لەسەر دەستی یەکێك لە شوێنکەوتوانی پەیدا نەدەبوو، بەڵام پلە و پایەی دۆستانی خودا ناگاتە پلە و پایەی پێغەمبەران(علیهم السلام) ئەمەش بەهۆی کۆدەنگی دامەزراو لەسەر ئەو راستییە.

**پرسیار لە ئەبو یەزیدی بوستامی کرا دەربارەی ئەو بابەتە وتی:** ئەوەی بۆ پێغەمبەران روودەدات وەك هیزەیەك وایە پڕ لە هەنگوین و تەنها یەك دڵۆپی دەکەوێتە سەر زەوی ئەو دڵۆپە بریتییە لە هەموو ئەوەی بۆ دۆستانی خودا روودەدەن، ئەوەش لەناو هیزەکەدایە وەك ئەوە وایە بۆ پێغەمبەرمان(ﷺ) ماوەتەوە.

# بەشی دووەم

## چەند باسێك لەسەر کەرامات و دۆستی خودا

### باسی یەکەم

ئەو کەرامەتانە هەندێ جار بۆی هەیە وەڵامدانەوەی دوعا بن، لەوانەشە دەرکەوتنی خواردن بێت لە کاتی برسێتی زۆردا، یان بەدەستهێنانی ئاو بێت لە کاتی تینوێتی زۆردا، یان ئاسانکاری بۆ بڕینی دوورییەك لە ماوەیەکی کەمدا، یان رزگاربوون بێت لە دەستی دوژمن، یان بیستنی گوتارێك لە بانگکەرێکەوە، ئەمانە و شتانی تر لە هونەری رەفتاری هەڵوەشێنەرەوەی واقیعی باو.

بزانە کۆمەڵێك شت هەن لە ئەمڕۆدا ناگونجێ ببنە کەرامەت بۆ دۆستانی خودا، ئەوەش بە زەرووڕەت یان نیمچە زەرووڕەت زانراوە، لەوانە لەدایکبوونی منداڵێك بەبێ دایك و باوك، هەروەها گۆڕینی بێگیانێك بۆ گیاندارێك یان بە ئاژەڵێك، نموونەی ئەمانە زۆرن.

### باسی دووەم

### گەر بوترێت: مانای وەلی چییە؟

ئەوا دەوترێت: دوو مانا لەخۆ دەگرێت: یەکەمیان لەسەر کێشی "فعیل" بێت بە مانای "فاعل"، وەك "العلیم و القدیر"، لەو بارەدا ماناکەی ئەوەیە: کەسێك گوێڕایەڵی و چاکەکانی بەردەوام بن و بەدوای یەکتردا بێن بەبێ ئەوەی خراپە و یاخیبوون بکەوێتە نێوانیانەوە.

دەگونجێ لەسەر کێشی "فعیل" بێت بە مانای "مفعول" وەك "قتیل" بە مانای "مقتول" و "جریح" بە مانای "مجروح"، ئەوەش ئەو کەسەیە خودا(ﷻ) بەبەردەوامی پارێزگاری و چاودێری و پاسەوانی لێ دەکات و رووبەڕووی شەرمەزاری ناکاتەوە بەهۆی خراپە و یاخیبوونەوە، بەڵکو کۆمەکی خۆی -کە بریتییە لە توانای چاکە و گوێڕایەڵی- بەردەوام بۆ رەوانە دەکات، خودا(ﷻ) دەفەرمویت:﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ الأعراف: ١٩٦

## باسی سێیەم

**گەر بوترێت: ئایا دۆستی خودا لە گوناھ مەعسوومە؟**

دەوترێت: وەك پێویستبوون(وجوب)-وەك چۆن بۆ پێغەمبەران پێویستە- نەخێر، بەڵام پارێزراو بێت تاکو بەردەوام نەبێت لەسەر گوناھان گەر لێرە و لەوێ ئافەتێك رووی لێکرد یان هەڵەیەکی لێوەشایەوە، ئەمەیان لە وەسفی دۆستانی خودادا بەدوور ناگیرێت.

**بە جونەید وترا: ئایا عاریف زینا دەکات ئەی ئەبو قاسم؟** ماوەیەك سەری داخست و پاشان سەری بەرز کردەوە و وتی:﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ۝٣٨﴾ **الأحزاب: ٣٨**

## باسی چوارەم

**گەر بوترێت ئایا ترس لەسەر دۆستانی خودا هەڵدەگیرێت؟**

**وتراوە:** زاڵ بەسەر گەورەپیاواندا بریتی بووە لە ترس، وەك پێشتر وتمان بوونی کەسانێك ترسیان لەسەر نەمابێت بەدوور ناگیرێت، بەڵام کارێکی زۆر دەگمەنە، **"السري"** دەڵێت: گەر یەکێك بچێتە ناو باخ و بێستانێك و دار و درەختی زۆری تێدا بێت و لەسەر هەر درەختێك باڵندەیەك بوونی هەبێت و بە زمانێکی رەوان پێی بڵێن: سەلامی خودات لێ بێت ئەی دۆستی خودا، گەر ئەو دۆستەی خودا لەوە نەترسێت فێڵێکی شەیتانە ئەوا ئەو کەسە فێڵی لێکراوە، نموونەی ئەمە لە بەسەرهاتەکانیان زۆرە.

## باسی پێنجەم

**گەر بوترێت: ئایا بینینی خودا(ﷻ) لەم دونیایەدا وەك کەرامەتێك بۆ دۆستی خودا گونجاوە؟**

وەڵامەکەی ئەوەیە: بەهێزترین را ئەوەیە گونجاو نییە، چونکە کۆدەنگی لەسەرە(واتە کۆدەنگی لەسەر ئەوەی لە دونیادا خودا نابینرێت) گوێم لە ئیمام

ئەبوبەكری كوڕی فۆرك بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) لە ئەبی حەسەنی ئەشعەرییەوە دەیگێڕایەوە لە كتێبی **"الرؤية الكبير"**دا وتوویەتی لەسەر ئەو بابەتە دوو را بوونی هەیە(بەڵگەكەی ئەم شوێنە ئەوەیە: كە دەڵێت: "دوو را بوونی هەیە"، كە دوو را بوونی هەبوو واتە رایەكیان ئەوەیە كە دەبینرێت هەرچەند رای كەمینەیە و شازە).

## باسی شەشەم

**گەر بوترێت: ئایا دەگونجێ ئێستا دۆستی خودا بێت و پاشان سەرئەنجامی بگۆڕێت بۆ شتێكی تر؟**

**وتراوە:** هەر كەس سەرئەنجامی باشی كردووە بە مەرجی دۆستایەتی لەگەڵ خودا مەرجێكی نەگونجاوی داناوە.

هەر كەسیش دەڵێت: لە ئێستا باوەڕدارێكی راستەقینە بێت-با ئەگەری گۆڕینی حاڵی لە داهاتوودا ئەگەرێكی كراوەش بێت- بەڵام بەدوور ناگیرێت لە ئێستادا دۆستی خودا بێت و صدیق بێت پاشان گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەمە ئەو بۆچوونەیە ئێمە هەڵیدەبژێرین.

دەشگونجێ لە كۆی كەرامەتی دۆستی خودا ئەوە بێت بزانێت سەرئەنجامێكی سەلامەت بەدەست دەهێنێت و سەرئەنجامی گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەم بابەتەش دەبێتە پاشكۆی ئەوەی وتمان دەگونجێ دۆستی خودا بزانێت دۆستی خودایە.

## باسی حەوتەم

**وتراوە: ئایا دۆستی خودا ترسی فێڵ و مەكری شەیتانی هەیە؟**

**وتراوە:** گەر لە خۆیدا نوقم بووبێت و بەهۆی حاڵییەوە هەستەكانی لەكاركەوتبن و بەوەی داگیری كردوون لەكاركەوتبن ئەوا ترسی ئەوەی لێ ناكرێت، بەڵام ئەوانەیان بەئاگان و ئامادەییان هەیە و هەستەكانیان لەكاردان ترسی فێڵ و مەكری شەیتانیان لێ دەكرێت.

## باسی هەشتەم

### گەر بوترێت: لەباری ئاگاهیدا چی زاڵە بەسەر دۆستی خودادا؟

دەوترێت: راستگۆیی لە جێبەجێ کردنی مافی خودا(ﷻ) پاشان بەزەیی و سۆزی بۆ خەڵکی لە هەموو بارەکانیدا، و والاکردنی بەزەیی خۆی بۆ هەموو خەڵکی، پاشان بەردەوامی لە شاندانە ژێر ئازارەکانیان بە رەوشت و ئاکاری جوان و شیرین، داوای چاکە لە خودا(ﷻ) بۆ ئەوان بەبێ ئەوەی خەڵکی داوای ئەو داوا و دوعایەی لێ بکەن، پەیوەستبوونی خەم و پەژارەی دۆستی خودا بە رزگارکردنی خەڵکەوە و وازهێنان لە تۆڵەسەندنەوە لێیان و خۆپارێزی لە رق و کینە لەسەریان و دەستکورتکردنەوە لە ماڵ و سامانیان و وازهێنان لە چاوبڕینە موڵك و سامانیان بە هەموو شێوەیەك، و گرتنەوەی زمان لە وتنی شتی خراپ لەسەریان و پۆشینی خراپە و نەنگییەکانیان و نەبوون بە نەیاری هیچ کەسێك لە دونیا و دوارۆژدا.

بزانە، مەزنترین کەرامەتی دۆستانی خودا بریتییە لە بەردەوامی کۆمەکی خودایی لەناو خێر و چاکەدا، و عیسمەت لە یاخیبوون و سەرپێچی، لەو ئاماژانەی قورئان دەربارەی عیسمەتی دۆستانی خودا دەیخاتە روو، ئەو ئایەتەیە دەربارەی سیفەتی مەریەم(علیها السلام) دەیخاتە روو لە کاتێك مەریەم پێغەمبەر نەبوو:﴿ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ﴾ زەکەریا پێی دەفەرموو:﴿ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ﴾ مەریەم دەیفەرموو:﴿ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾.

هەروەها ئایەتی:﴿ وَهُزِّيٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ ﴾ مريم: ٢٥،

ئەو وەرزە وەرزی خورما نەبوو، هەر بەو جۆرە چیرۆکی یارانی ئەشکەوت و ئەو کارە سەیروسەمەرەی لەوان روویدا، هەروەها چیرۆکی زیلقەرنەین و دەسەڵات و توانایەکی لەرادەبەدەر، بە هەمان شێوە ئەوەی لەسەر دەستی **"خضر"**(عليه السلام) روویدا لە کاری سەیر و سەمەرە، لە کاتێکدا پێغەمبەر نەبوو، بەڵکو یەکێك بوو لە دۆستانی خودا.

# چەند چیرۆکێك کە لەم بارەوە ریوایەت کراون

## ١. جورەیجی راهیب:

لەو چیرۆکانەی ریوایەت کراون لەم مەیدانەدا چیرۆکی جورەیجی راهیب، لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((تەنها سێ کەس بە منداڵی قسەیان کردووە: عیسای کوڕی مەریەم و منداڵێك لە سەردەمی جورەیجدا و منداڵێکی تر، عیسا چیرۆکەکەی دەزانن، جورەیجیش پیاوێکی عابید بوو لەناو بەنی ئیسرائیلییەکاندا، دایکێکی هەبوو، رۆژێك جورەیج نوێژی دەکرد دایکی تامەزرۆ بوو بۆ بینینی، بۆیە بانگی لێکرد و وتی: ئەی جورەیج، جورەیج وتی: پەروەردگار نوێژەکەم باشترە یان بچم بۆ لای دایکم؟

پاشان نوێژەکەی بەردەوام کرد و وازی لە دایکی هێنا، جارێکی تر هەمان شتی وت و دەستی بە نوێژ کردەوە، ئەوە لەلای دایکی گران بوو، بۆیە وتی: خودایە مەیمرێنە تا رووی ئافرەتی بێئابڕوو دەبینێت، ئافرەتێکی زیناکەر لە بەنی ئیسرائیلدا هەبوو، وتی: من جورەیج تووشی فیتنە دەکەم تاکو زینا بکات، بۆیە هات بۆ لای جورەیج، نەیتوانی فریوی بدات، شوانێك هەبوو شەوان پەنای بە خەڵوەتگاکەی جورەیج دەبرد، کاتێك شوانەکەی بینی هەوڵی لەگەڵ دا و زینای لەگەڵ کرد، و منداڵێکی لێی بوو، پاشان ئافرەتەکە وتی: ئەم کوڕەم لە جورەیجە.

بەنو ئیسرائیل هاتن بۆ جورەیج و خەڵوەتگاکەیان رووخاند و جنێویان پێدا، جورەیج نوێژی کرد و پاڕایەوە، پاشان بە دەستی خوڕییە منداڵەکە، ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئێستاش وەك ئەوەی لەبەرچاوم بێت کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەدەستی خوڕییە منداڵەکە و وتی: ئەی منداڵ باوکی تۆ کێیە؟

منداڵەکە وتی: شوانەکە، خەڵکەکە پەشیمان بوونەوە و وتیان خەڵوەتگاکەت بە ئاڵتوون بۆ دروست دەکەینەوە-یان فەرمووی بە زیو- ئەویش نەیویست و وەك خۆی بۆیان دروستکردەوە.

منداڵێکی تر: ژنێك منداڵێکی لەگەڵ بوو شیری پێ دەدا، گەنجێکی روخسار جوان و پێکەوتوو بە لایدا تێپەڕی، ژنەکە وتی: خودایە کوڕەکەم وەك ئەو گەنجە لـێ بکـەی، منداڵەکە وتی: خودایە وەك ئەوەم لێ نەکەی..

**ئەبو هورەیرە دەڵێت:** وەك ئـەوەی ئێـستا تەماشـای پێغەمبـەر(ﷺ) بکـەم کاتێـك باسی منداڵەکەی دەکرد کە شیری دەخوارد، پاشان ژنێك بە لایدا گوزەری کـرد وتیـان ئەوە دزی کردووە و زینای کردووە و سزا دراوە، ژنەکە وتی: خودایە، ئـەم کـوڕەم وەك ئەو ژنە لێ مەکە، منداڵەکە وتی: خودایە وەك ئەوم لێ بکە.

دایکی لەو بارەیەوە لێی پرسی وتی: ئەو گەنجە زۆردارێکە لە زۆردارەکان، ئـەو ژنـە کە دەڵێن زینای کردووە زینای نەکردووە، وترا: دزی کردووە دزی نەکردووە، ئەو هـەر دەڵێت: خودام بەسە. ئەم ریوایەتە لە سەحیحدا هاتووە[٨١].

## ٢. سێ کەسی ناو غارەکە:

هەر لەو چیرۆکانە چیرۆکی سێ کەسی ناو غارەکەیـە کـە ریوایـەتێکی دروسـتی بەناوبانگە:

**لە سالمەوە لە باوکییەوە فەرمووی:** پێغەمبەری خودا(ﷺ) **فەرمووی:** لەوانەی پێش ئێوە سێ کەس لە سەفەرێکدا بوون، شەو لە غارێکدا مانەوە، لە چیاکەوە گابەردێك بەربوویەوە و دەرگای غارەکەی لێ گرتن، وتیان هیچ شتێك رزگارتان ناکات مەگەر هەریەکەمان بە کردارێکی چاکەی خۆمان داوا لە خودا بکەین، یەکێك لە پیاوەکان وتی: من باوك و دایکم دوو کەسی پیر بوون بەر لە دایك و باوکم خواردنەوەم بە منداڵ و خانەوادەکەم نەدەدا، رۆژێك گەڕان بەدوای داردا دوایخستم، نەمتوانی زوو پێیان بگەم تا نوستن، شیرم بۆ دۆشی بوون پێیان بدەم، بۆم هێنان بینیم هەردووکیان خەوتوون، پێمخۆش نەبوو بەئاگایان بهێنم، پێشم خۆش نەبوو بەر لە ئەوان خواردنەوەکە بدەم بە منداڵ و خانەوادەکەم، بەپێوە وەستام و خواردنەوەکەیان بەدەستمەوە بوو چاوەڕوانی بەئاگاهاتنی ئەوانم دەکرد تا رۆژبوویەوە، هەردوو بەئاگاهاتن و خواردنەوەکەی خۆیان

[٨١] {أخرجه الحاكم في المستدرك وقال صحيح}.

خواردەوە، خودایە گەر ئەوەم لەپێناوی رووی تۆدا بووە دەروویەکمان لیٚ بکەرەوە، بەردەکە تەکانێکی دا، بەڵام نەیان دەتوانی لێیەوە بچنە دەرەوە.

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** یەکێکی تریان وتی: خودایە من کچێکی مامم هەبوو، خۆشەویسترین مرۆڤ بوو لەلام، ویستم لەگەڵی خەریکی کاری خراپ بم ئەو نەیویست، تا ساڵێك گرانی و نەبوونی رووی لێکرد، هات بۆ لام و سەد و بیست دینارم پێدا بە مەرجێك خۆی رادەستی من بکات، ئەویش ناچار خۆی رادەست کرد، تا توانام بەسەریدا شکا وتی: حەڵاڵ نییە بۆت ئەڵقەیەك لەدەست بکەی مەگەر بە مافی خۆی.. منیش بێزاریم لەو کارە بۆ دروست بوو و وازم لێهێنا لە کاتێکدا خۆشەویستترین کەس بووم لەلام و زێڕەکەشم(پارەکە) بۆ بەجێهێلا، خودایە گەر ئەو کارەم لەبەر رووی تۆ ئەنجامداوە دەروویەکمان لیٚ بکەرەوە، بەردەکە تەکانێکی تری دا، بەڵام نەیان دەتوانی لێیەوەی بچنە دەرەوە.

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ئەوەی سێیەمیان وتی: خودایە من کۆمەڵێك کرێکارم گرت و کرێکەیانم پێدان، جگە لە یەك دانەیان کرێکەی وەرنەگرت و رۆیشت، منیش کرێکەیم بۆ بەرهەم هێنا، پاش ماوەیەك هاتەوە بۆ لام و وتی: ئەی بەندەی خودا کرێکەم پیٚ بدە، منیش پێم وت: هەموو ئەو حوشتر و مەڕ و مانگا و بەندانە کە دەیانبینیت کرێکەی تۆیە، وتی: ئەی بەندەی خودا گاڵتەم پیٚ مەکە، وتم: من گاڵتەت پیٚ ناکەم، هەر هەموو ئەوانەی لە من وەرگرت و پێش خۆی خست و هیچی بەجێنەهێلا، خودایە، گەر ئەو کارەم لەپێناو رووی تۆدا ئەنجامداوە دەروویەکمان لیٚ بکەرەوە، بەردەکە تەکانێکی دا و لە غارەکە هاتنە دەرەوە و رۆیشتن[٨٢].

## ٣. چیرۆکی گایەکە:

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((پیاوێك گایەکی بارکرد بوو و پێش خۆی خستبوو، گاکە لای بە لای خاوەنەکەیدا کردەوە و وتی: من بۆ ئەمە دروست نەکراوم، من بۆ جووت دروستکراوم، خەڵکەکە وتیان: سبحان الله، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من باوەڕم بەمە هێناوە، من و ئەبوبەکر و عومەر)).

[٨٢] {حدیث صحیح متفق علیه}.

## ٤. باسی وەیسی قەرەنی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێیان رازی بێت):

**هەروەها لە نموونەی کەرامەت ئەو ریوایەتەیە باسی وەیسی قەرەنی** دەکات و ئەوەی عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێی رازی بێت) هەواڵیدا دەربارەی حاڵ و چیرۆکەکەی، پاشان گەیشتنی وەیس بە هەرەمی کوڕی حەیان، و سەلام کردنی هەریەکەیان لەویتریان بەبێ ناسینێکی پێشینە، هەموو ئەوانە کۆمەڵێك حاڵن عادەت هەڵدەوەشێننەوە، وازمان لە باسی ریوایەتەکەی وەیسی قەرەنی هێنا چونکە ریوایەتێکی بەناوبانگە.

لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و پاشان ئەوانەی دوای ئەوان ئەوەندە کەرامەت باسکراوە دەگاتە رادەی تەواتور.

زۆرێك لە کتێب لەو بارەیەوە دانراوە بە پشتیوانی خودا(ﷻ) بە کورتی ئاماژە بە هەندێك کەرامەت دەکەین، لەوانە: ئیبن عومەر لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا بە دەستەیەك گەیشت لەسەر رێگەکە وەستابوون، لە دڕندە دەترسان، ئەویش دڕندەکەی لەسەر رێگەیان دەرکرد، پاشان وتی: ئەوەی مرۆڤ لێی دەترسێت زاڵ دەکرێت بەسەریدا، گەر لە هیچ شتێك نەترسێت جگە لە خودا ئەوا هیچ شتێکی بەسەردا زاڵ نابێت، ئەم ریوایەتە ئاشکرا و ناسراوە.

## ٥. رۆیشتن بەسەر ئاودا:

**ریوایەتکراوە پێغەمبەر(ﷺ) "العلاء الحضرمي"** رەوانە کرد بۆ غەزایەك، بەشێك لە دەریا رێگەی نەدا بگاتە شوێنی خۆی، بە ناوی مەزنی خودا داوای لە خودا کرد و بەسەر ئاوەکەدا رۆیشتن.

## ٦. ئەو عەسایەی وەکو چرایەك بە گڕ هات:

**ریوایەتکراوە "عتاب بن بشير و أسيد بن خضير"**(خوایان لێ رازی بێت) لە شەودا لای پێغەمبەر(ﷺ) هاتنە دەرەوە، سەری عەسای یەکێکیان وەك چرا دەستی بە گڕان کرد.

## ٧. ئەو قاپەی تەسبیحاتی دەکرد:

**ریوایەتکراوە** لەبەر دەستی سەلمان و ئەبو دەردادا قاپێك هەبوو، تەسبیحاتی دەکرد و هەردووکیان گوێیان لە تەسبیحاتەکەی بوو.

## ٨. ئەو کەسەی سوێند لەسەر خوا بخوات خوا سوێندەکەی ناخات:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ریوایەتکراوە فەرموویەتی:** ((زۆرێك لە قژهەڵچووی تۆزاوی کە تەنها دوو پۆشاکی کۆنی لەبەردایە و شوێن و جێگەی حەوانەی نییە، گەر سوێند بخوات لەسەر خودا خودا سوێندەکەی ناخات))[٨٣] جیاکاری نەکرد لە نێوان شتێك و شتێکی تردا لەوانەی سوێندی لەسەر خودا(ﷻ) پێ دەخوات.

## ٩. بەهۆی زهد لە دونیا کەرامات دەردەکەوێت:

**سەهلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت:** ((هەر کەس چل رۆژ راستگۆیانە و لە دڵێکی موخلیصەوە لەو کارەیدا زوهد لە دونیا بکات، کەراماتی بۆ دەردەکەوێت، هەر کەس بۆی دەرنەکەوێت ئەوە بە هۆی نەبوونی راستگۆییە لە زوهدەکەیدا)).

**بە سەهل وترا: چۆن کەرامەتی بۆ دەردەکەوێت؟**

وتی: هەرچی بوێت وەریدەگرێت وەك دەیەوێت و چۆنی بوێت.

## ١٠. گرمەی هەور:

**لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((پیاوێك کاتێك گوێی لە گرمەی هەورێك بوو قسەی دەکرد، گوێی لە هەورەکە بوو دەیوت: باخچەی فلان کەس ئاو بدە، هەورەکە رۆیشت بۆ باخچەکە و بارانەکەی خۆی بەسەردا خاڵی کردەوە، پیاوەکە شوێنی هەورەکە کەوت، بینی پیاوێك لە باخچەکەدا بە پێوە وەستاوە، پرسی: ناوت چییە؟ وتی: فلانی کوڕی فلان، هەمان ئەو ناوە، وتی: چی بە بەرووبوومی ئەم باخچەیە دەکەی کاتێك دەیکەیەوە؟

---

[٨٣] {أخرجه الترمذي}.

وتی: بۆ ئەو پرسیارە دەکەی؟

وتی: من دەنگێکم لە هەورەکەوە بیست دەیوت: باخچەی فلان کەس ئاو بدە، وتی: بەهۆی ئەوەی دەیلێیت: من بەرەکەی دەکەم بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خۆم و خانەوادەکەم و بەشێکی دەگێڕمەوە بۆ باخچەکە(واتە بۆ خزمەت کردنی) و بەشێکی تری بۆ هەژاران و ڕێبواران))

## ١١. ماڵی دڕندە:

**ئەبو نەصری سەراج دەڵێت:** ڕۆیشتین بۆ "توستەر"، لە ماڵەکەی سەهلی کوڕی عەبدولڵادا خانوویەکم بینی خەڵکی ناویان نابوو "ماڵی دڕندە"، دەربارەی ئەو ناوە پرسیارمان لە خەڵکی کرد، وتیان: دڕندە دێن بۆ لای سەهل، ئەویش دەیانباتە ئەو خانووەوە و میوانداریان لێ دەکات و گۆشتیان پێ دەدا و پاشان بەرەڵایان دەکات.

**ئەبو نەصر دەڵێت:** هەموو ئەهلی "توستەر"م بینی لەسەر ئەو قسەیە کۆدەنگیان هەبوو و بە ناڕاستیان نەدەزانی و ئەوان ژمارەیەکی زۆر بوون.

## ١٢. سینییەك لە خواردن:

**حەمزەی کوڕی عەبدولڵا دەڵێت:** چووم بۆ لای ئەبو خەیری تیناتی، لە ناوەوە بڕیارم دابوو سەلامێکی لێ بکەم و بێمە دەرەوە و نانی لا نەخۆم، کاتێك لەلای هاتمە دەرەوە و ماوەیەك ڕۆیشتم بینیم لە دوامەوەیە و سینییەکی هەڵگرتووە و خواردنی لەسەرە، وتی: ئەی گەنج ئەمە بخۆ، ئێستا لە بڕیارەکەی خۆت ڕزگارت بووە.

ئەبو خەیری تیناتی بەناوبانگ بوو بە کەرامات.

## ١٣. شێریش لە کەسێك دەترسێت کە بە پاککردنەوەی دڵ خەریکە:

**ئیبراهیمی ڕەقی دەڵێت:** جارێك بڕیارم دا بچم سەلامێك لە ئەبو خەیری تیناتی بکەم، نوێژی مەغریبی کرد سورەتی "الفاتحة"ی بە ڕێك وپێکی و دروستی نەخوێند، لە نەفسی خۆمدا وتم: سەفەرەکەم بەفیڕۆ چوو، کاتێك سەلامم دایەوە چوومە دەرەوە

بۆ هەڵگرتنەوەی دەستنوێژێکی تر، دڕندەیەك بەرەو رووم هات، گەڕامەوە بۆ لای ئەبو خەیر و وتم: شێرێکم بۆ هات، هاتە دەرەوە و هاواری لە شێرەکە کرد و وتی: مـن پـێم نەوتی پەلاماری میوانەکانی من نەدەی؟!

شێرەکە چەمایەوە و منیش دەستنوێژەکەم شۆری، کاتێك گەڕامەوە بۆ لای وتی: بە راستکردنەوە و پاككردنەوەی رووالەتەوە خۆتان خەریك کـرد بۆیـە لـە شـێر دەترسـن، ئێمەش بە راستکردنەوە و پاككردنەوەی دڵەوە خەریك بووین بۆیە شێر لێمان دەترسێت.

## ١٤. دۆزینەوەی شتە بزر بووەکان:

**وتراوە:** جەعفەری خولـدی ئەنگوسـتیلەیەکی هـەبوو کەوتـە نـاو رووبـاری دیجلـەوە، دوعایەکی ئەزموونکراوی هەبوو بۆ ئـەو شـتانەی بـزری دەکـردن، دوعاکـەی خوێنـد، ئەنگوستیلەکەی لە ناو کۆمەڵێك کاغەزدا بینییەوە لە کاتێکدا هەڵیدەدانەوە.

ئەبو نەصری سەراج دەڵێت ئەو دوعایەی جەعفەر بریتی بوو لە: ((**یـا جـامع النـاس لیوم ریب فیه اجمع علي ضالتي**))

**ئەبو نەصری سەراج دەڵێت:** ئەبو تەیبی عەکی دوعاکەی پـێ نیشـاندام کـە لـەناو هەندێ پەڕەی پەرشوبڵاودا بزربووبوو، ئەو دوعای خوێند و دۆزییەوە.

## ١٥. هەر کەس تەنها خودا دەبینێت:

**پرسیارم لە ئەحمەد تابرانی سەرەخسی کرد (رەحمەتی خودای لێ بێت) و وتم:** ئایا شتێکت لە کەراماتت بینیوە؟

وتی: لە سەردەمی ویست و سەرەتای کۆشانمەوە لەوانەیە بۆ بەردێك بگەڕابام خۆمی پێ پـاك بکەمـەوە نەمدەبینییـەوە، شـتێکم لـە هـەواوە دەسـت بـۆ دەبـرد دەمبـینی گەوهەرە، خۆمم پێ پاك دەکردەوە و فڕێم دەدا.

پاشان وتی: چ ترسێك لە کەرامەتدا بوونی هەیە؟ مەبەست لێی: زیادبوونی یەقینـە لە یەکتاپەرسـتیدا، هـەر کـەس تـەنها خـودا دەبینێـت-وەك بەدیهێنـەری گـەردوون-یەکسانە لای کاری ئاسایی یان هەڵوەشێنەری عادەت وەك کەرامەت ببینێت.

## ١٦. ڕەشپێستی هەژار:

**ئەبو حەسەنی بەصری دەڵێت:** لە عەبادان پیاوێکی ڕەشپێستی هەژار هەبوو رووی لە کەلاوە و وێرانە دەکرد، شتێك خواردنم لەگەڵ خۆم هەڵگرت ڕۆیشتم بۆ بینینی، کاتێك چاوم پێی کەوت خەندەیەك کەوتە سەر روخساری، بەدەست ئاماژەی بۆ زەوی کرد، بینیم هەموو زەوی بوو بە زێڕ، پاشان وتی: ئەوەی لەلاتە بیهێنە، منیش ئەوەی هێنابووم پێمدا، کارەکەی زۆر سەرسامی کردم و هەڵهاتم.

## ١٧. داوای لێبوردن لە زانستدایە:

**ئەحمەدی کوڕی عەتای ڕۆزباری دەڵێت:** لە خۆپاککردنەوە و دەستنوێژگرتندا زیادەڕەویم هەبوو، شەوێك سینەم هاتەوە یەك بەهۆی ئەو هەموو ئاوەی بە خۆمدا دەکرد و دڵم سوکنایی بۆ نەدەهات، وتم: خودایە داوای لێبوردنت لێ دەکەم، گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت: داوای لێبوردن لە زانستدایە، لەو کاتەوە ئەو زیادەڕەویەم نەما.

**گوێم لە مەنصوور مەغریبی بوو دەیوت:** ڕۆژێك ئەحمەدی کوڕی عەتای ڕۆزباریم بینی لە بیاباندا لەسەر زەوی دانیشتبوو، زەوییەکە ڕیخی مەڕ و مالاتی لەسەر بوو، ئەویش بەبێ بەرماڵ دانیشتبوو، وتم پێی: ئەی شێخ ئەم شوێنە ڕیخی مەڕ و مالاتە، وتی: فەقیهان جیاوازیان هەیە لە پیسی ڕیخی مەڕ و مالاتدا.

## ١٨. ئەو کەرەی هاتە گۆ:

**ئەبو سولەیمانی خەراس دەڵێت:** ڕۆژێك سواری گوێدرێژێك بووبووم، مێش و مەگەز ئازاریان دەدا، ئەویش سەری دادەخست و دەسوڕاند، منیش بە دارێك دەمدا بە سەریدا، کەرەکە سەری هەڵبڕی و وتی: لێم بدە، تۆش لەسەرت دەدرێتەوە.

**"الحسين" دەڵێت:** وتم بە ئەبی سولەیمان کەرامات لەسەر دەستت روویداوە؟

وتی: بەڵێ، وەك چۆن لێم دەبیستی.

## ١٩. ماسییەکی سیّ رەتلّ:

**لە ئیبن عەتاوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** گوێم لە ئەبو حوسەینی نووری بوو دەیوت: شتێك لە دلّمدا بوو دەربارەی کەرامات، قامیشێکم لە چەند منداڵێك وەرگرت و لە نێوان دوو بەلەمدا وەستام، پاشان وتم: بە عیززەتی تۆ(واتە خودا) گەر ماسییەکم بۆ دەرنەهێنیت سیّ رەتلّ بێت خۆم لەم رووبارەدا دەخنکێنم، دەڵێت: ماسییەکم بۆ هاتە دەرەوە سیّ رەتلّ بوو. **ئەو هەواڵە گەیشتە جونەید وتی:** حوکمەکەی ئەوە بوو مارێك بهاتبایەتە دەرەوە و بیگەستبایە.

## ٢٠. بۆ خودا سەرم بتاشە:

**ئەبو جەعفەری حەداد مامۆستای جونەید دەڵێت:** لە مەککە بووم، پرچم درێژ بوو، مەقەستم پیّ نەبوو قژمی پیّ ببڕم، چووم بۆ لای سەرتاشێك-کە خێرم تێدا دەبینی- پێم وت: لەبەر خودا ئەم مووانەم لیّ دەکەیەوە؟

وتی: بەڵیّ و بەڕێزەوە، پیاوێکی دونیایی لەبەردەست بوو ئەوی بەڕێکرد و منی دانا و سەری تاشیم، پاشان کیسەیەکی پێدام درهەمی تێدا بوو، وتی: هەندیّ پێویستی خۆتی پیّ جێبەجیّ بکە، منیش لێم وەرگرت و بڕیارم دا یەکەمین شتێك خودا بۆمی دەنێرێت بە ئەوی ببەخشم، دەڵێت: چوومە ناو کەعبە، یەکێك لە هاوەڵانم پێشوازی لیّ کردم و پێی وتم: یەکێك لە برایانت لە بەصرەوە هاتوون و کیسەیەکیان بۆ هێناوی کە سێسەد دیناری تێدایە، دەڵێت: کیسەکەم هەڵگرت و بردم بۆ سەرتاشەکە، و پێم وت: ئەمە سیّ سەد دینار لە هەندیّ پێویستی و کاروباری خۆتدا خەرجی بکە، سەرتاشەکە پێی وتم: ئایا شەرم لە خۆت ناکەی ئەی پیاو، بە من دەڵێی بۆ خودا سەرم بتاشە و پاشان کرێی لەسەر وەربگرە، بڕۆ لەم ناوە مەوەستە خودا لێت ببوورێت.

## ٢١. لە ئیمانەکەی ترساوە:

**ئیبن سالم دەڵێت:** کاتێك ئیسحاقی کوڕی ئەحمەد کۆچی دوایی کرد سەهلی کوڕی عەبدوڵا رۆیشتە ناو خەڵوەگاکەی و پێچراوەیەکی تێدا بوو کە دوو بۆتە(کەمۆڵە)ی

شووشەی تێدا بوو، لە یەکێکیاندا شتێکی سووری تێدا بوو، لەویتریاندا شتێکی سپی، پارچەیە زێڕیشی بینییەوە لەگەڵ پارچەیە زیـو، دەڵێـت: دوو پارچـەکەی هەڵدایـە نـاو دیجلەوە و ئەوەی لەناو دوو بۆتەکەدا بوو تێکـەڵی کـرد بـە خـۆڵ، ئیسـحاق کـە مـرد قەرزدار بوو، ئیبن سالم دەڵێت: وتم بە سەهل، چـی لـەناو ئـەو دوو بۆتـەدا بـوو، وتـی: یەکێکیان گەر بە ئەندازەی درهەمێکت بکردبایە بەسـەر مسـقالێك مسـدا دەبـوو بـە ئاڵتوون، ئەویتریان گەر بە ئەندازەی مسقاڵێکت بکردبایە بەسـەر چـەندین مسـقاڵ لـە تەنەکەدا دەبوو بە زیو، وتم: چی دەبوو گـەر قەرزەکـەی بـەو ڕێگەیـە بگێڕابایـەوە بـۆ خاوەن قەرزەکان؟

سەهل وتی: ئەی دۆست لە ئیمانەکەی ترساوە.

## ٢٢. دیجلە داویانە لە یەك:

**لە "النوري"ەوە دەگێڕنەوە** شەوێك دەردەچـێت بـۆ سـەر رووبـاری دیجلـە، دەبینێـت هەردوو بەری دیجلە داویانە لە یەك، ئەویش دەگەڕێتەوە دەڵێت: بە عیززەتی تۆ منیش (هەروەك خەڵکی) بە بەلەم دەپەڕیمەوە.

## ٢٣. لەگەڵ ئەوە بە بۆت ڕوودەدات:

**ئـەبو نەصـری سـەراج دەڵێـت:** "وەجیهـی" بەسـەرهاتێکی لـە محەمـەدی کـوڕی یوسوفەوە بۆ بـاس کـردین و وتـی: ئـەبو تـورابی نەخشـەبی خـاوەنی کـەرامات بـوو، ساڵێك لەگەڵی سەفەرم کرد، چل کەسی تری لەگەڵ بوو، جارێك برسـێتی زۆر داگـیری کردین، ئەبو توراب لە ڕێگەکە لایدا و مـۆزی بـۆ هێنـاین و خواردمـان، گـەنجێکمان لەگەڵ بوو نەیخوارد.

ئەبو توراب وتی: بخۆ..

گەنجەکە وتی: ئەم حاڵەی من تێیدام وازهێنانە لە زانراوەکان، ئێسـتا تـۆ بـووی بـە زانراوی من، بۆیە لێرە بەدواوە هاوەڵێت ناکەم.

ئەبو توراب وتی: لەگەڵ ئەوە بە بۆت ڕوودەدات.

## ٢٤. باڵندەش بە هەوادا دەفڕێت:

**ئەبو نەصری سەراج لە ئەبی یەزیدەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی:** ئـەبو عـەلی سـندی هات بۆ لام(ئەبو یەزید مامۆستای ئەبو عەلی بوو) گۆزەیەکی پێ بوو ئاوی تێدا بوو، ئاوەکەی لە گۆزەکە دەڕێژا و دەبوو بە گەوهەر، وتم: ئەمەت لە کوێوە بەدەستهێنا؟

وتی: لەو ناوچەیە ڕێم لە دۆڵێك کەوت، دۆڵەکە وەك چرا دەگڕا و ڕۆشن دەبوویـەوە، منیش ئەمەم هەڵگرت.

وتم: ئەو کاتە چۆن بوو کە لەو دۆڵەدا بووی؟

وتی: کاتێك بوو تیایدا لە حاڵی خۆم ساردبووبوومەوە.

وترا بە ئەبو یەزید: فلاّن کەس لە یەك شەودا دەگاتە مەککە!

وتی: شەیتان لە ساتێکدا لە خۆرهەڵاتەوە دەگاتە خۆرئاوا لە نەفرەتی خودادا.

پێیان وت: فلاّن لەسەر ئاو دەڕوات، و بە هەوادا دەفڕێت، وتی: باڵندەش بە هـەوادا دەفڕێت و ماسیش بەسەر رووی ئاودا دەڕوات.

**سەهلی کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت:** مەزنترین کەرامەت ئەوەیـە ئاکـارێکی ناپەسـەندی خۆت بگۆڕیت.

## ٢٥. ئاو دەگۆڕێت بۆ زێڕ و زیوو:

**ئیبن سالم دەڵێت:** گوێم لە باوکم بوو دەیوت: پیاوێك هـەبوو نـاوی **"عـبدالرحمن بـن أحمد"** بوو هاوەڵی سەهلی کـوڕی عەبـدوڵای دەکـرد، ڕۆژێـك پێـی وت: هەنـدێ جـار دەستنوێژ دەگرم بۆ نوێژ ئاوەکە لە دەستم جاری دەبێت و دەگۆڕێت بۆ زێڕ و زیوو.

سەهل وتی: دەزانی منداڵ کاتێك دەگری زڕزڕە دەدەنە دەستی تاکو ژێر ببێتەوە.

## ٢٦. ناندان بە چۆلەکەیەك:

**جەعفەری کوڕی محەمەد دەڵێت جونەید بۆی گێڕامەوە و وتی:** ڕۆژێك ڕۆیشـتم بـۆ لای **"السري"** پێی وتم: چۆلەکەیەك هەموو ڕۆژێك دێت وردە نانی پێـدەدەم و لەسـەر

دەستم دەیخوات، یەکێك لە ڕۆژەکان دانەئەبەزی بۆ سەر دەستم، لە ناخی خۆمـدا بـیرم کردەوە: هۆیەکەی چی بێت؟ بیرم کەوتەوە خویّم بە بەهاراتـەوە خـواردووە، بـە خـۆمم وت: لێرە بەدواوە نایخۆم و تەوبەی لیّ دەکەم، یەکسەر دابەزی بۆ سەر دەستم و دەستی بە خواردن کرد.

## ٢٧. ئەو دارە کوتەی درێژ بوو:

**ئەبو عەمری ئەنماتی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:** لەگەڵ مامۆستاکەم لە دەشـت و سـارا بووین، باران دایگرتینەوە، ڕۆیشتینە مزگـەوتێك و تیایـدا ماینـەوە، سـەقفەکەی بـە لێزمە تکەی دەکرد، بۆیە سەرکەوتینە سەرەوە، دارمان پیّ بوو دەمانویسـت سـەرەوە چاك بکەین تاکو تکـە نـەکات، دارەکـە کـورت بـوو بەسـەر بانەکـەدا نەدەگەشـتەوە، مامۆستاکەم پێی وتم: بیکشێنە، منیش کشاندم، بۆیە لە هـەردوو بـەرەوە گەیشـتەوە بەسەر دوو دیوارەکەدا.

## ٢٨. هەر حەقیقەتێك شەریعەتی لە دواوەیە:

**"الرقي" دەڵێت:** گوێم لە ئەبوبەکری دەقاق بوو دەیوت: بە سارای بەنی ئیسـرائیلدا گوزەرم دەکرد، هات بە خەیاڵمدا زانستی حەقیقەت جیایە لە شەریعەت، بانگکـەرێك لـە بـن دارێکـەوە بـانگی لێکـردم: هـەر حەقیقـەتێك شـەریعەتی لـە دواوە نـەبێت بێباوەڕییە.

## ٢٩. جارێکی تر دووبارەی مەکەرەوە:

**یەکێکیان دەڵێت: لەلای "خیر النساج" بووم، پیاوێك هات بۆ لای و وتـی:** ئـەی شێخ دوێنیّ تۆم بینی پارچە چنراوەکەت بە دوو درهەم فرۆشت، منیش شوێنت کـەوتم و دەسـتم بـۆ مێزەرەکـەت بـرد و دوو درهـەم کەوتـە نـاو دەسـتمەوە، دەڵێـت: "خـیر النساج" دەستی بە پێکەنین کرد و دەستی بۆ دەستی برد و کردییەوە و دوو درهـەمی تێکەوت، پاشان وتی: بڕۆ شـتێکی پـیّ بکـڕە بـۆ خانەوادەکـەت، بـەڵام جـارێکی تـر دووبارەی مەکەرەوە.

### ٣٠. تەشتێکی زێڕ:

**ئەحمەدی کوڕی محەمەدی سولەمی دەڵێت:** ڕۆژێـك ڕۆیشـتم بـۆ لای **"ذو النـون"** لەبەردەمیدا تەشتێکی زێڕم بینی کە ئاگر و عەنبەر بە دەوریدا گڕی سەند بـوو، پێـی وتم: تۆ لەوانەی لە باری کرانەوەدا ڕوو لە مەلیکان دەکەی، پاشان درهەمێکی پێـدام، هەتا گەیشتمەوە بەلْخ لەو درهەمەم خەرج کرد.

### ٣١. دوازدە ڕۆژ ڕۆیشتم هیچم نەخوارد:

**لە ئەبو سەعیدی خەرازەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە هەندێك لە سەفەرەکانمدا، سێ ڕۆژ جارێك شتێکم بۆ دەردەکەوت، لێیم دەخوارد و بەشی دەکردم.

جارێکیان سێ ڕۆژ گـوزەری کـرد هـیچ شـتێکم بـۆ نـەهات، بۆیـە لاوازی ڕووی لێکردم و دانیشتم، گوێم لە دەنگێك بـوو دەیـوت: کامیانـت پـێ خۆشـە: نـاردنی هۆکارێـك بـۆت یـان پێـدانی وزە و هێـز؟ وتم: وزە و هێـز، لـەو کاتـەوە هەسـتامە سەرپێی، دوازدە ڕۆژ ڕۆیشتم هیچم نەخوارد و لاوازی ڕووی لێ نەکردم.

### ٣٢. لەبەر چاوم بزر بوو:

**مورتەعیش دەڵێت:** گوێم لە خەواص بوو دەیوت: چەندین ڕۆژ لە دەشت و سارا وێڵ بووم، کەسێك هات بۆ لام و سەلامی لێ کردم و وتی: وێـڵ بـووی؟ وتم: بـەڵێ، وتـی: ڕێگەت پێ نیشان بدەم؟ چەند هەنگاوێك لە پێشمەوە ڕۆیشت، پاشان لەبەر چـاوم بـزر بوو، بینـیم کەوتوومەتـەوە سـەر ڕێگەکـە، لـە دوای ئـەوە وێـڵ نـەبووم و برسـێتی و تینوێتی لە سەفەردا ڕووی لێ نەکردووم.

### ٣٣. مردوو لەسەر تەختەشۆرەکە پێدەکەنی:

**"الرقي" دەڵێت ئـیبن جـەلا پێـی وتم:** کاتێـك بـاوکم مـرد لەسـەر تەختەشـۆرەکە پێدەکەنی، کەس بوێری ئـەوەی نـەبوو بیشـۆرێت، دەیـانوت زینـدووە، تـا یـەکێك لـە هاوەڵانی هات و شۆردی.

## ٣٤. كاتێك خواردنی دەخوارد لاواز دەبوو:

**مونەیحی-هاوەڵی سەهلی كوڕی عەبدوڵا- دەڵێت:** سەهل تا حەفتا ڕۆژ خۆی لە خواردن دەگرتەوە و ئارامی دەگرت، كاتێك خواردنی دەخوارد لاواز دەبوو، كاتێك خۆی برسی دەكرد بەهێز دەبوو.

## ٣٥. بە قوڕ دەرگاكەم لێبگرە:

**"أبو عبيد البسري"** لە یەكەم ڕۆژی ڕەمەزانەوە دەچووە ژوورەوە و بە ژنەكەی دەوت: بە قوڕ دەرگاكەم لێبگرە، هەر شەوێك لەتە نانێكم لەو كلاوڕۆژنەوە بۆ بخە خوارەوە، ڕۆژی جەژن دەرگاكەی دەكردەوە و ژنەكەی دەهاتە ژوورەوە، دەیبینی سی نان لە سووچێكی ژوورەكەدا دانراوە، نە خواردوویەتی و نە خواردوویەتەوە و نە خەوتووە، ركاعەتێك نوێژی لەدەست نەچووبوو.

## ٣٦. پەنهانم لە پەروەردگارەوە دەیبیست:

**ئەبو حاریسی ئۆلاشی دەڵێت:** سی ساڵ زمانم تەنها گوێی لە پەنهانم دەگرت، پاشان حاڵم گۆڕی(بەرزبوویەوە)، سی ساڵ پەنهانم تەنها لە پەروەردگارەوە دەیبیست.

## ٣٧. لە كۆتاییەكانی تەمەنیدا:

**عەلی كوڕی سالم دەڵێت:** لە كۆتاییەكانی تەمەنیدا سەهلی كوڕی عەبدوڵا دەست و لاقەكانی گرمۆڵە دەبوون، كاتێك كاتی نوێژ دەهاتە بەرەوە دەست و لاقەكانی دەكرانەوە، كە تەواو دەبوو لە فەرزەكە دەست و لاقی وەك خۆی لێدەهاتەوە.

## ٣٨. لە دەریادا كەشتییەكە تێكشكا:

**عەلی كوڕی عیمرانی واسیتی دەڵێت:** لە كەشتییەكدا بووین، لە دەریادا كەشتییەكە تێكشكا، من و هاوسەرەكەم كەوتینە سەر لەوحێك، ئا لەو كاتەدا ژنەكەم منداڵی بوو، ژنەكە هاواری لێكردم و وتی: خەریكە دەمرم لە تینوێتیدا، وتم: ئەو(ﷻ) حاڵمان دەبینێت، سەرم بەرز كردەوە، پیاوێك لە هەوادا زنجیرێكی ئاڵتوونی

بەدەستەوە بوو، گۆزەیەك لە یاقووتی سووری پێوە بەسترا بوو، وتی: ها بخۆنەوە، دەڵێت: گۆزە ئاوەکەم گرت و لێمان خواردەوە، بینیم لە میسك بۆنخۆشتر و لە بەفر ساردتر و لە هەنگوین شیرینتر بوو، وتم: تۆ کێی خودا رەحمت پێ بکات؟

وتی: بەندەیەکی مەولای تۆم، پرسیم: بە چی بەمە گەیشتووی؟

وتی: ئارەزووی خۆم لە پێناوی رازیبوونی ئەودا وازلێهێناوە، ئەویش لە هەوادا دایناوم، پاشان لەبەرچاوم بزر بوو و نەمبینییەوە.

## ٣٩. چاوەڕوانی مۆڵەت دەکەم:

**"ذو النون" دەڵێت:** گەنجێکم لەلای کەعبە بینی رکوع و سوژدەی زۆری دەبرد، لێی نزیکبوومەوە، و پێم وت: تۆ زۆر نوێژ دەکەی، وتی: چاوەڕوانی مۆڵەت دەکەم لە باوکمەوە بۆ رۆیشتن. دەڵێت: بینیم کاغەزێك بەسەریدا بەربوویەوە و تیایدا نووسرا بوو: لە "العزیز و الغفور"ەوە بۆ بەندە صادقەکەم، برۆ تۆ خودا لە هەرچی گوناهی پێشتر و دواترت خۆشبووە)).

## ٤٠. پیاوێکی کوێر:

**یەکێك لە پیاوان دەڵێت:** لە شاری مەدینەی پێغەمبەر بووم(ﷺ) لەگەڵ دەستەیەك لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئایەت و کەراماتمان دەکرد، پیاوێکی کوێر لە نزیك ئێمەوە گوێی گرتبوو، لێمان نزیکبوویەوە، و وتی: هۆگریم بە قسەکانتانەوە بۆ دروست بووە، بزانن من منداڵێك و ژنێکم هەیە، دەچم بۆ بەقیع دار و چیلکە کۆدەکەمەوە، رۆژێك چوومە دەرەوە، گەنجێکم بینی کراسێکی کەتانی لەبەر بوو، نەعلەکانی بە دەستەوە بوو، وامزانی وێڵ بووە و رێگەی لێ بزر بووە، رۆیشتم تا کراسەکەی لەبەر بکەمەوە، پێم وت: جلەکانت لەبەر بکەوە، وتی: لەژێر پارێزگاری خودادا برۆ، بەڵام من بۆ دووەم جار و سێیەم جار داواکەم دووبارە کردەوە، گەنجەکە وتی: هەردەبێ لەبەری بکەمەوە؟ وتم: هەر دەبێ لەبەری بکەیەوە، لە دوورەوە ئاماژەی بۆ چاوم کرد هەردوو چاوم بەربوونەوە، پێم وت: بۆ خاتری خودا تۆ کێیت؟ وتی: ئیبراهیمی خەواصم.

## ٤١. حووتی دەریا:

**"ذو النون" دەڵێت:** سەردەمێك لە كەشتییەكدا بووم، پارچە گەوهەرێكم دزی، پیاوێكی تریان تۆمەتبار كرد، وەك بەزەییەك بەرانبەری وتم: لێیگەڕێن، گەنجێك عەبایەكی لە خۆی ئاڵاند بوو، سەری لە عەباكەوە دەرهێنا، هەمان تۆمەتم ئاراستەی گەنجەكە كرد، گەنجەكە وتی: ئەو تۆمەتە دەدەیە پاڵ من؟

خودایە سوێند دەخۆم لەسەرت هەرچی حووتی ئەم دەریایە هەریەكەیان گەوهەرێك بهێنێت، دەڵێت: رووی ئاوەكە بە حووت گیرا و هەریەكەیان گەوهەرێكی بە دەمەوە بوو، پاشان گەنجەكە خۆی هەڵدایە ناو ئاوەكە و بەرەو كەنارەكان پەڕییەوە.

## ٤٢. كەسێكی نەصرانی:

**لە ئیبرۆاهیمی خەواصەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** جارێكیان رۆیشتم بۆ دەشت و سارا، كەسێكی نەصرانیم بینی پشتێنێكی لەناوقەد بەستبوو، داوای هاوەڵی لێ كردم، حەوت رۆژ رۆیشتین، پێی وتم: ئەی راهیبی حەنەفی ئەوەی لەلاتە لە كرانەوە بیخە روو، ئێستا زۆرمان برسییە، وتم: خودایە لەلای ئەم بێباوەڕە رسوا و شەرمەزارم نەكەی، خوانێكم بینی نان و برژاو و خورما و كوپەیە ئاوی لەسەر بوو، خواردمان و خواردمانەوە و حەوت رۆژی تر رۆیشتین، پاشان من پێم وت: ئەی راهیبی نەصارا ئەوەی لەلاتە بیهێنە، ئێستا سەرەی تۆیە، خۆیدا بەسەر عەساكەیدا و دوعای كرد، دوو خوانم بینی كە زۆرتر لەوەی من داوام كرد لەسەری بوو، دەڵێت: سەرسام بووم و حاڵم گۆڕا، نەمویست لێی بخۆم، زۆری لێكردم، بەڵام بە گوێم نەكرد، وتی: بخۆ دوو مژدەت پێ دەدەم:

**یەكەمیان: "أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا رسول الله"**، پشتێنەكەی كردەوە.

**دووەمیان:** من وتم: خودایە گەر ئەم بەندەیە لەلای تۆ خاتری هەیە ئەو دوو خوانەم بۆ رەوانە بكە، بۆیە خودا رەوانەی كرد، هەردوو خواردمان و رۆیشتین بۆ حەج، لە مەككەساڵێك ماینەوە، پاشان كۆچی دوایی كرد و لە بەتحا ناشتمان.

## ٤٣. چوونمان بۆ بيت المقدس:

**"محمد بن المبارك الصوري" دەڵێت:** لەگەڵ ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بووم لە ڕێگەی چوونمان بۆ بيت المقدس، نزیکی چێشتەنگاو لە بن دارێکی هەناردا دانیشتین، لە قەدی هەنارەکەوە گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت: ئەی باوکی ئیسحاق ڕێزدارمان بکە بەوەی هەنارێکمان لێبکەیەوە و بیخۆی، ئیبراهیم سەری داخست و سێ جار وتی: ئەی موحەمەد ببە بە تکاکاری، من گوێم لێ بوو، هەستایە سەرپێی و دوو هەناری کردەوە، خۆی یەکێکیانی خوارد و ئەویتریانی دا بە من کە ترش بوو، درەختەکە نزم بوو، کاتێك لە بيت المقدس گەڕاینەوە بە پاڵ دارهەنارەکەدا گوزەرمان کرد و بینیمان بالای بەرزبووە و هەنارەکەشی شیرینە، و هەموو ساڵێك دوو جار بەری دەدا، درەختەکەیان ناونا "دارهەناری عابیدان"، عابیدان روویان لە سێبەرەکەی دەکرد.

**"جابر الرحبي" دەڵێت:** خەڵکی شاری "رەحبە" زۆربەیان باوەڕیان بە کەرامەت نەبوو، حەوت ڕۆژ ڕێگەم بڕی و ڕۆیشتم بۆ ئەو شارە، پرسیم: ئەوانە لە کوێن دۆستانی خودا بەدرۆ دەخەنەوە؟

دەڵێت: لەدوای ئەوە وازیان لێهێنام.

## ٤٤. یەکێك لە پیاوان "خچر"ی(علیه السلام) بینی:

**مەنصوور مەغریبی دەڵێت:** یەکێك لە پیاوان **"خضر"ی(علیه السلام)** بینی پێی وت: ئایا کەست لەسەرو خۆتەوە بینیوە؟

وتی: بەڵێ، "عبدالرزاق بن همام" لە مەدینە فەرموودە دەگێڕێتەوە و خەڵکی بە دەوریدا دادەنیشن و گوێی لێدەگرن. مەنصوور دەڵێ: گەنجێکم لەو شوێنەدا بینی سەری لەسەر ئەژنۆی دانابوو، پێم وت: "عبدالرزاق" فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە بۆ گوێی لێ ناگری؟

وتی: ئەو لە مردووەوە دەگێڕێتەوە، من لە خودا بزر نیم.. وتم: گەر تۆ بەو جۆرەی من کێم؟ سەری بەرزکردەوە و وتی: تۆ برای من مەنصوور مەغریبیت، زانیم خودا کۆمەڵێك بەندەی هەیە من نایانناسم.

## ٤٥. به هەوادا وەك باڵندە دەڕۆیشت:

**وتراوە:** ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم هاوەڵێکی هەبوو پێی دەوترا: **"یحیی"** لە ژوورێکدا خودای دەپەرست قادرمەی بۆ سەرەوە نەبوو، گەر بویستبایە خۆی پاك بکاتەوە و دەستنوێژ هەڵبگرێت دەهات بۆ لای دەرگای ژوورەکە و دەیوت" **ولا حول ولا قوة إلا بالله"** و بە هەوادا وەك باڵندە دەڕۆیشت، خۆی پاك دەکردەوە و دەستنوێژی هەڵدەگرت، کاتێك دەیویست بگەڕێتەوە دەیوت: **"ولا حول ولا قوة إلا بالله"** و دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی.

## ٤٦. وەڵامی ئەوەی دەدامەوە کە پێویستم بوو:

**"أبو جعفر الحذاء" لە شیراز دەڵێت:** لەلای ئەبو عومەری ئیستەخری ئەدەبم وەردەگرت، گەر خایلە و خوتوورەیەك بە دڵمدا گوزەری بکردبایە دەهات بۆ لام و وەڵامی ئەوەی دەدامەوە کە پێویستم بوو بەبێ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم، پاشان پرسیارم لێ دەکرد و وەڵامی دەدامەوە، پاشان نەمتوانی بچم بۆ لای، بۆیە هەر کات پرسیارێك لەسەر بابەتێك لەلام دروستببوایە لە ئیستەخرەوە وەڵامی دەدامەوە و بەوەی دەهاتە سەر دڵم قسەی لەگەڵ دەکردم.

## ٤٧. بەدوای چرادا گەڕاین:

**یەکێك دەگێڕێتەوە و دەڵێت:** هەژارێك لە ماڵێکی تاریکدا کۆچی دوایی کرد، کاتێك ویستمان بیشۆرین بەدوای چرادا گەڕاین، لە تاقێکەوە ڕۆشناییەك هەڵقوڵا و هەموو ماڵەکەی ڕۆشن کردەوە، ئێمەش شۆردمان، کاتێك تەواوبووین ڕۆشناییەکە نەما و وەك ئەوەی شوێنەکەی بوونی نەبووبێت.

## ٤٨. گەر کەسێك حاڵی لەگەڵ خودا بەم جۆرە بێت:

**ئادەمی کوڕی ئەبی ئیاس دەڵێت:** لە عەسقەلان بووین، گەنجێك دەهات بۆ لامان و سەردانی دەکردین، و قسەی لەگەڵ دەکردین، کاتێك تەواو دەبووین هەڵدەستا دەستی

بـه نوێـژ دەکـرد، دەڵێـت: ڕۆژێـك خواحـافیزی لێکـردین و وتـی: دەمـەوێ بچـم بـۆ ئەسکەندەریە، منیش لەگەڵی بۆ خواحافیزی چوومە دەرەوەی شار و چەند درهەمێکی کەمم پێدا، بەڵام لێی وەرنـەگرتم، منـیش زۆرم لێکـرد، ئـەویش پـڕ مشـتێك ڕەملـی هەڵگرت و لەگەڵ ئاوی دەریا تێکەڵی کرد و وتی: بخۆ، بینـیم هەویرێکـە بـە شـەکری زۆرەوە، وتی: گەر کەسێك حاڵی لەگەڵ خودا بـەم جـۆرە بێـت ئایـا ئاتـاج دەبێـت بـە درهەمەکانی تۆ؟

## ٤٩. یەهودییەك قەرزێکی لەلام بوو:

**ئیبراهیمی ئاجری دەڵێت:** یەهودییەك قـەرزێکی لـەلام بـوو، هـات بـۆ لام و داوای قەرزەکـەی کـردەوە، مـن لـەو کاتـەدا لای وەجـاخی کـورەی ئاگرەکـە دانیشـتبووم، یەهودییەکە وتی: ئەی ئیبراهیم ئایەتێکم نیشان بدە لەسەری موسڵمان ببم..

وتم: موسڵمان دەبی؟

وتی: بەڵێ، وتم: کراسەکەت دابکەنە، کراسەکەی داکەند، لوولم کرد، پاشان جلەکانی خۆمم بە دەوریدا لوول کرد و خستمە ناو ئاگرەکەوە، پاشان خۆم چوومە ناو کورەکەوە لە ناوەڕاستی ئاگرەکەدا جلەکانم دەرهێنا و هاتمە دەرەوە و لە دەرگایەکی تر جیـا لـەو دەرگایەی لێـی چـوومە ژوورەوە هاتمـە دەرەوە، جلـەکانم وەك خـۆی وابـوو، ئـاوی لـێ دەچـۆڕا، بـەڵام جلـەکانی ئـەو لـەناو ئەوانـەی منـدا سـووتابوون، بۆیـە یەهودییەکـە موسڵمان بـوو. لـە ڕۆژی تەرویـەدا حـەبیبی عـەجمی لـە بەصـرە بینـرا، کەچـی ڕۆژی عەرەفە لە عەرەفات بوو.

## ٥٠. هەڕەشەیان لێ دەکرد

**:ئەحمەدی کوڕی محەمەدی فـەرەغانی دەڵێـت:** عەباسـی کـوڕی موهتـەدا ژنێکـی هێنا، لە شەوی زاوایەتیدا پەشیمانی ڕووی لێکرد، کاتێك دەیویست لێی نزیك ببێتەوە هەڕەشەیان لـێ دەکـرد، بۆیـە نـەیتوانی بچـێتە لای، و هاتـە دەرەوە، دوای سـێ ڕۆژ مێردی ئەو ژنە پەیدا بوو.

**ئیمـــامی قوشـــەیری دەڵێـــت:** ئەمـــە کەرامـــەتێکی راســـتەقینەیە، خـــودا ئـــەوەی زانست(شەریعەت) داوای دەکات ئەوی لەسەر پاراست.

## ٥١. چیاکە کەوتە لەرزە:

**وتراوە:** فوزەیلی کوڕی عەیاز لەسەر چیایەك لە چیاکانی مینا بوو وتی: گەر دۆستێك لە دۆستەکانی خودا فەرمان بەم چیایە بکات بکشێت ئەوا دەکشێت، دەڵێـت: چـیاکە کەوتـە لەرزە، پێی وت: ئارام بە، من ئەوەم لێ داوا نەکردی، بۆیە چیاکە ئارام بوویەوە.

## ٥٢. هەر ئەو نانە بووکە لە بەصرە دەمخوارد:

**عبدالواحدی کوڕی زەید لە ئەبی عاصمی بەصری پرسی:** کاتێك حـەجاج نـاردی لەدووت چیت دەکرد ؟ وتی: لە ژوورەکەی خۆ بووم کاتێك تەقەیان لە دەرگا دا، هاتنـە ژوورەوە، پاڵێکیان پێوە نام بینیم لەسەر چیای **"أبي قبيس"**م لە مەککـە، عبدالواحـد لێی پرسی: ئەی لە کوێوە خواردنت بۆ دەهات؟

وتـی: پیرەژنێـك سـەردەکەوت بـۆ لام و لـە کـاتی بەربانگمـدا دوو پارچـە نـانی بـۆ دەهێنام، ئەوەش هەر ئەو دوو پارچە نانە بوو لە بەصرە دەمخوارد.

**عبدالواحد دەڵێت:** ئەو پیرەژنە دونیا بوو، خودا فەرمانی پێکرد بوو خزمەتی ئـەبو عاصم بکات.

## ٥٣. بەئەندازەی ئەوەی دەیبەخشی بەسەری دادەباری:

**وتراوە:** عـامری کوڕی قەیس مانگانە بەشی خۆی لە "بيت المـال" وەردەگـرت، هـەر کەس بەرەو رووی دەهات شتێکی پێدەدا، کاتێك دەگەڕایەوە ماڵەوە درهەمی بەسەردا دەڕژا بە ئەندازەی ئەو درهەمانەی بەخشیبوونی.

## ٥٤. بەرەکەتی درهەمێك:

**ئەبو عەمری زوجاجی دەڵێـت:** چـوومە لای جونەیـد، دەمویسـت بچـم بـۆ حـەج، درهەمێکی ئەسڵی پێدام، منیش لەناو مێزەرەکەمدا بەتونـدی هـەڵمگرت، دەچـوومە

هەر ماڵێك دۆست و هاوەڵم دەبینییەوە و پێویستم بە درهەمەکە نەبوو، کاتێك حەجم کرد و گەڕامـەوە بـۆ بەغـداد و چـوومەوە بـۆ لای جونەیـد دەسـتی درێـژکرد و وتـی: بیهێنە، منیش درهەمەکەم پێدایەوە، پرسی: چۆن بوو؟

وتم: بڕیارەکە جێبەجێکراو بوو.

## ٥٥. شوێنی نووستن بە چوار سووچی ژوورەدا سووڕایەوە:

**ئەبو جەعفەری ئەعوەر دەگێڕێتـەوە دەڵێـت:** لـەلای "ذو النـون" بـووم باسـی گوێڕایەڵی شتەکانمان دەکرد بۆ دۆسـتانی خـودا، وتـی: لـە جۆرەکـانی گوێڕایـەڵی ئەوەیە بەو شوێنی نووستنە بڵێم بە چوار گۆشەی ئەم ژوورەدا بسووڕێتەوە، پاشان بگەڕێتـەوە بـۆ جێگـەی خـۆی، دەڵێـت: شـوێنی نووسـتنەکە بـە چـوار سووچـی ژوورەکەدا سووڕایەوە و گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، گەنجێك لـەوێ بـوو دەسـتی بـە گریان کرد هەتا مرد.

## ٥٦. توورەگەی خورما:

**وتراوە:** وەصلی ئەحدەب ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾ **الذاريات: ٢٢** وتی: ڕۆزییەکەم لە ئاسمانە و من لە زەویدا بەدوایدا دەگەڕێم! سوێند بە خودا هەرگیز داوای ناکەم، دوو ڕۆژ ڕۆیشتە وێرانەیەك و تیایدا مایەوە، بەڵام هیچی بۆ نەهات، بارەکەی لێ توندبوویەوە، لە ڕۆژی سێیەمدا توورەکەیەك(پوشێك) خورمای بۆ ڕەوانەکرا، برایەکی هەبوو نییەتی لەو بەهێزتر و باشتر بوو، ڕۆیشت لەگەڵی، خورماکەیان بوو بە دوو توورەکە(دوو پووش)، ئەوان بەردەوام بوون لەو ژیانەیان تا مردن لەیەکتری جیاکردنەوە.

## ٥٧. مارێك چی دەکا:

**یەکێك دەڵێت:** رووم لە باخ و بێستانێك کرد ئیبراهیمی کـوڕی ئەدهـەم پارێزگـاری لێدەکرد، خەو چوونە چاوەکانی لەو کاتەدا مارێك هەڵمی نێرگس لە دەمیدا بوو دەیدا بە روخساری ئیبراهیمدا.

## ٥٨. بازنەیەکی کێشا و ئاوی لێهەڵقولاَ:

**وتراوە:** دەستەیەك لە سەفەرێکدا لەگەڵ ئەبو ئەیوبی سجستانیدا بوون، ئاویان لێبڕا، ئەبو ئەیوب وتی: شتێکم لێ شاراوەتەوە کە لەسەری دەژین؟

وتیان: بەڵێ، ئەبو ئەیوب بازنەیەکی کێشا و ئاوی لێهەڵقولاَ، تێرمان لێ خواردەوە، کاتێك ڕۆیشتین بۆ بەصرە بۆ حەمادی کوڕی زەیدی باس کرد، **عبدالواحدی کوڕی زەید دەڵێت:** ئەو ڕۆژە من لەگەڵی بووم.

## ٥٩. درختێکی هەمە چەشن:

**"بكر بن عبدالرحم" دەڵێت:** لە دەشت و سارا لەگەڵ **"ذي النون"**دا بووین، لە **"أم غیلان"** ڕۆیشتینە بن دارێك، وتمان ئەم شوێنە چەند خۆشە گەر خورمای تازەپێگەیوی تێدابوایە، **"ذو النون"** بزەیەك کەوتە سەر لێوەکانی و پرسی: حەزتان لە خورمایە؟ دارەکەی لەرزاند و وتی: سوێندت لێ دەخۆم بەو کەسەی تۆی هێناوەتە بوون و تۆی دروست کردووە ئەی درەخت پێویستە خورمای تازەمان بۆ بەربدەیەوە، پاشان هەژانی، خورمای تازە پێگەیو بەربوویەوە، و لێمان خوارد و تێرمان خوارد، پاشان نووستین و بەئاگاهاتینەوە و درەختەکەمان لەرزاند گەزۆی بەسەرماندا داباراند.

## ٦٠. دۆستێك لە دۆستەکانی خودا:

**ئەبو قاسمی نەهاوەندی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:** من و ئەبوبەکری وەراق و ئەبی سەعیدی خەراز بە قەراغ دەریایەکدا دەڕۆیشتین بەرەو **"صیدا"**، لە دوورەوە کەسێکمان بینی، یەکێکمان وتی: دانیشن، ئەو پیاوە دەبێت دۆستێك بێت لە دۆستەکانی خودا، دەڵێ: زۆری نەخایاند گەنجێکی روخسار شیرین و جوان هات، قەڵەم و کاغەزی پێ بوو، ئەبو سەعید لای بەلایدا کردەوە -بە باشی نەبینی قەڵەم و کاغەزی هەڵگرتووە- پێی وت: ئەی گەنج ڕێگەی بەرەو خوداچوون چۆنە؟

گەنجەکە وتی: ئەی ئەبو سەعید، دوو ڕێگە هەیە بۆ چوون بۆ لای خودا، **ڕێگەیەکی تایبەت** و **ڕێگەیەکی گشتی**، ڕێگە گشتییەکە ئەوەیە تۆ لەسەری دەڕۆی، ڕێگە

تایبەتەکەش وەرە با فێرت بکەم، پاشان بەسەر ئاوەکەدا ڕۆیشت تا لەبەر چاومان بزر بوو، ئەبو سەعید بە سەرسامی مایەوە لەوەی بینی بووی.

## ٦١. کوڵەکە دەبێت بە زێر و زیو:

**جونەید دەڵێت:** هاتم بۆ مزگەوتی "شۆنزیٚ" دەستەیە هەژارم بینی قسەیان لە ئایەت(کەرامەت) دەکرد، یەکێکیان وتی: پیاوێك دەناسم گەر بەم کۆڵەکەیە بڵێت نیوەت ببێت بە ئاڵتوون و نیوەکەی ترت بە زیو بەو جۆرەی لیٚ دێت، جونەید دەڵیٚ: بینیم کۆڵەکەکە نیوەی بوو بە زیو و نیوەکەی تری بە ئاڵتوون.

## ٦٢. دڕندەیەکی گوێڕایەڵ:

**وتراوە:** سوفیانی سەوری لەگەڵ شەیبانی راعی حەجی کرد، سوفیان وتی بە شەیبان: ئەو دڕندەیە دەبینی؟

شەیبان وتی: مەترسە، شەیبان گوێی گرت و لێی نەوی، دڕندەکە کەوتە کلکەلەقیٚ و پاڵکەوتن، سوفیان وتی: ئەم ناوبانگە چییە؟ شەیبان وتی: گەر ترسی ناوبانگم نەبوایە کۆڵەکەی خۆم لیٚ دەنا هەتا دەگەیشتینە مەککە.

## ٦٣. دونیا چۆن مسەخەر دەبێت:

دەگێڕنەوە کاتێك **"السري"** بازرگانی وازلێهێنا خوشکەکەی لە پارەی چنین بۆی خەرج دەکرد، ڕۆژێك دواکەوت، **"السري"** پرسی: بۆ دواکەوتیت؟

وتی: چونکە چنراوەکەم کەس نەیدەکڕی، دەیانوت تێکەڵە، بۆیە **"السري"** لە خواردنەکەی نەخوارد، ڕۆژێك خوشکەکەی هات بۆ لای بینی پیرەژنێك گسکی ژوورەکەی دەدا و هەموو ڕۆژێك دوو کولێرەی بۆ دەهێنێت، خوشکەکەی زۆر دڵتەنگ بوو، سکاڵای بردە لای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەو بارەوە پرسیاری لە **"السري"** کرد، لە وەڵامیدا وتی: کاتێك نەمویست خواردنی دەستی ئەو بخۆم، خودا دونیای بۆ تەرخان کردم تاکو خواردنم بۆ بهێنێت و خزمەتم بکات.

## ٦٤. له روخساریدا شوێنەوارێك دەبینرا:

**محەمەدی کوڕی مەنصووری تووسی دەڵێت:** لەلای شێخ مەعرووفی کەرخی بووم، دوعای بۆ کردم، بۆ سبەینێ گەڕامەوە بۆ لای لە روخساریدا شوێنەوارێك دەبینرا، یەکێك پێی وت: باوکی مەحفوز، دوێنێ لەلات بووین ئەم شوێنەوارە لە روخساری تۆدا نەبوو، چی روویداوە؟

وتی: پرسیار دەربارەی شتێك بکە پەیوەندی بە تۆوە هەیە، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە خودا پێمان بڵێ چی روویداوە، وتی: دوێنێ نوێژی ئێوارەم لێرە کرد، حەزم دەکرد تەوافێکی ماڵی خودا بکەم، رۆیشتم بۆ مەککە، و تەوافم کرد، پاشان مەیلی ئاوی زەمزەمم هەبوو تاکو لێی بخۆمەوە، لەسەر دەرگاکە خلیسکام و کەوتم و روخسارم بریندار بوو.

## ٦٥. باڵندە لەسەر دەستی دادەنیشت:

**وتراوە:** عەتبەی غولام دادەنیشت و دەیوت ئەی وەرشان(جۆرێکە لە باڵندە) گەر بۆ خودا(ﷻ) لە من گوێڕایەڵتری وەرە و لەسەر دەستم دابنیشە، باڵندەکە دەهات و لەسەر دەستی دادەنیشت.

## ٦٦. ئاوەکە ماسییەکی بەرەو رووم هەڵدا :

**ئەبو عەلی رازی دەڵێت:** رۆژێك بە لای فوراتدا تێپەڕیم نەفسم حەزی لە ماسی تازە بوو، ئاوەکە ماسییەکی بەرەو رووم هەڵدا، پیاوێك لەو جێگە پەیدا بوو وتی: پێتخۆشە بۆت ببرژێنم؟

وتم: بەڵێ، دەڵێت: برژاندی و منیش دانیشتم خواردم.

**وتراوە:** ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە هاوەڵی دەستەیەکدا بوو، درندەیەك هاتە پێشیان، وتیان: ئەی ئەبو ئیسحاق درندە هاتووەتە پێشمان، ئیبراهیم هات و وتی: بە شێرەکە، گەر فەرمانت پێکراوە بە شتێك دەربارەی ئێمە بیکەی فەرموو ئەنجامی بدە، ئەگینا بگەڕێرەوە، شێرەکە خۆی هێنایەوە بەریەك و دوورکەوتەوە و ئەوانیش رۆیشتن.

## ٦٧. دڕنده و مێرووویەك:

**"حامد الأسود" دەڵێت:** لەگەڵ "الخواص" لە دەشت و سارا بووین، لەلای دارێك ماینەوە دڕندەیەك رووی لێکرد، تا بەیانی چوومە سەر دارەکە و خەوم لێنەکەوت، ئیبراهیمی خەواص لەژێر دارەکەدا نووست و دڕندەکە لە سەریەوە تا لاقەکانی بۆنی پێوە دەکرد، پاشان رۆیشت.

بۆ شەوی دووەم لە مزگەوتی دێیەك ماینەوە، مێروویەك لە سەقفەکەوە کەوتە خوارەوە و بەسەریدا بەربوویەوە و ئیبراهیم ناڵە و نرکەیەکی کرد، وتم: ئەمە زۆر سەیرە، دوێنێ لە شێرەکە ترسی نەبوو، ئێستا بۆ مێروویەك ناڵە و نرکە دەکات، ئیبراهیم وتی: ئەو شەوە تیایدا بە خوداوە(ﷻ) بووم، بەڵام ئەم شەو من تێیدا بە خۆمەوە بووم.

## ٦٨. هاڕاوەی دار دەبێت بە ئارد:

**لە "عطاء الأزرق"ەوە دەگێڕنەوە** ژنەکەی دوو درهەمی پێدا لە پارەی ئەو چنینەی ئەنجامیدابوو، تاکو ئاردیان بۆ بکڕێت، ئەویش لەماڵەوە دەرچوو، گەیشت بە کەنیزەکێك دەگریا، پێی وت: چیتە؟

وتی: گەورەکەم دوو درهەمی پێدام بچم شتێکی بۆ بکڕم، هەردووکیم ون کردووە، دەترسم لێم بدات، **"عطاء"** هەردوو درهەمەکەی پێدا و تێپەڕی، رۆیشت لە دوکانی برادەرێکی دانیشت کە کاری دارتاشی دەکرد، **"عطاء"** حاڵی خۆی و ترسی خراپی مامەڵەی ژنەکەی بۆ باس کرد، برادەرەکەی وتی: ئەم دارە هاڕاوە ببە، بەڵکو بۆ داگیرسانی تەنوور سودێکی لێ ببینن، چونکە شتێکی ترم لا نییە بتوانم کۆمەکی تۆی پێبکەم، ئەویش هاڕاوەی مشارەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە و دەرگای ماڵەکەی کردەوە و گوێنووەکەی فڕێدایە حەوشەکە و دەرگای حەوشەکەی داخست و گەڕایەوە بۆ مزگەوت تا کاتی داهاتنی تاریکی، بۆ ئەوەی ئەوان بخەون و ژنەکە زمانی لێ درێژ نەکات، کاتێك گەڕایەوە و دەرگاکەی کردەوە بینی نان دەکەن، وتی: ئەم ئاردەتان لە کوێ بوو؟

وتیان لەو گوێنووە ئاردەی تۆ هێناتەوە و لە حەوشەکە داتنا، هەموو کات لەم ئاردەمان بۆ بکڕە، ئەویش وتی: وا دەکەم گەر خودا بیەوێت.

## ٦٩. بانگکەرێك بانگی لێکردم:

**ئەبو جەعفەری کوڕی بەرەکات دەڵێ:** لە خزمەتی هەژاراندا دادەنیشتم، خودا دینارێکی بۆ رەوانە کردم، ویستم بۆ هەژارەکان خەرجی بکەم، پاشان بە خۆمم وت: لەوانەیە پێی ئاتاج بم، ئێشی ددان هێرشی کردە سەرم، ئەوەیانم دەرهێنا، دانەیەکی تریان کردییە ئێش، ئەوەشم دەرهێنا، بانگکەرێك بانگی لێکردم و وتی: گەر دینارەکەیان پێ نەدەی دان لە دەمتدا نامێنێت..

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** ئەم ئاگادارکردنەوە لە دەروازەی کەرامەت گەورەتر و تەواوترە لە بەربوونەوەی درهەمێکی زۆر بە سەریدا و هەڵوەشانەوەی عادەت.

## ٧٠. جەوەندەیەکی[٨٤] سەیر:

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:** عامری کوڕی قەیس هات بۆ شام، جەوەندەیەکی پێ بوو گەر بویستبایە دەستنوێژ هەڵبگرێت ئاوی تێدابوو، گەر بویستبایە بخواتەوە شیری تێدا بوو.

## ٧١. باڵندەیەك هاتە قسە:

**عوسمانی کوڕی عاتیکە دەڵێت:** لە خاکی رۆم لە غەزادا بووین، والییەکە سریەیەکی بۆ شوێنێك رەوانە کرد، رۆژێکی بۆ هێرش بردن و بەیەکتر گەیشتنەوە دیاریکرد، رۆژەکە هاتە بەرەوە و سریەکە پێشنەکەوت و دیارنەبوو، لەو کاتەدا ئەبو موسلمی خەولانی نوێژی دەکرد و رمەکەی وەك سیترە[٨٥]، بە زەویدا لە بەردەمی خۆی چەقاندبوو، باڵندەیەك هات و لەسەر رمەکە نیشتەوە و وتی: سریەکە سەلامەتە و غەنیمەتی زۆریان بەدەستهێناوە و فلان رۆژ دەگەڕێنەوە بۆ لاتان.

---

[٨٤] {(جەوەندە دەفرێکە لە پێستی ئاژەڵان دروست دەکرێت و لە کوندە بچووکترە)}.

[٨٥] {(سیترە بەربەستێکە نوێژکەر لەبەر سوژدەکەیدا دایدانێت بۆ دیاریکردنی سنووری شوێنی نوێژەکەی)} .

ئەبو موسلم وتی بە باڵندەکە تۆ کێی ڕەحمەتی خودات لێ بێت؟

وتی: من خەمڕەوێنی دڵی باوەڕدارانم.

## ٧٢. ئەو دەریاکە ووشکی کرد:

**لە یەکێکیانەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت:** لە کەشتییەکدا بووین پیاوێکی نەخۆشمان لەگەڵ بوو کۆچی دوایی کرد، ئێمەش شۆردمان و کفنمان کرد و ویستمان هەڵیبدەینە دەریاوە بەڵام دەریاکە ئاوەکەی دابەزی و وشکی کرد، لە کەشتییەکە دابەزین و قەبرێکمان بۆ هەڵکەند و ناشتمان، کاتێك لە کارەکەمان تەواو بووین ئاو جارێکی تر بەرزبوویەوە و کەشتییەکە بەرزبوویەوە و دەستمان کردەوە بە ڕۆیشتن.

## ٧٣. ئەو کیسەی پڕبوو لە درهەم :

**وتراوە:** لە شاری بەصرە خەڵکی برسێتی و سیاساڵیان (گرانی) بەسەردا هات، حەبیبی عەجمی بە نەسیئە(دواخستن) خواردنی کڕی و بەسەر هەژاراندا دابەشی کرد، کیسەکەی خۆی خستە ژێر سەری، کاتێك هاتن داوای قەرزەکەیان لێکرد کیسەکەی کردەوە و بینی پڕە لە درهەم و قەرزەکەی لێدایەوە.

## ٧٤. ڕەمڵ گۆڕا بۆ دینار:

**وتراوە:** ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ویستی سواری کەشتییەك ببێت بەڵام وتیان سوارت ناکەین تا دینارێکمان پێ نەدەی، ئەویش دوو رکات نوێژی لە قەراغ دەریاکە ئەنجامدا و پاڕایەوە و وتی: خودایە ئەوانە شتێکم لێ داوا دەکەن کە نیمە، ڕەملی بەردەمی گۆڕا بۆ دینار.

## ٧٥. چاوەکانی چاکدەبوونەوە:

**خزمەتکارەکەی ئەبی موعاویە ئەسوەد (کە ناوی أبو حەمزە نەصر بوو) دەڵێت:** ئەبو موعاویە چاوەکانی کوێر بووبوون، کاتێك دەیویست قورئان بخوێنێت قورئانەکەی دەکردەوە و چاوەکانی چاکدەبوونەوە، کاتێك قورئانەکەی دادەخست چاوەکانی کوێردەبوونەوە.

## ٧٦. لەسەر رووباری دیجلە بەپێ دەپەڕێتەوە:

**ئەحمەدی کوڕی هەیسەم دەڵێت:** بیشری حافی پێی وتم: بڵێ بە مەعرووفی کەرخی گەر نوێژت کرد دێم بۆ لای، دەڵێت: منیش پەیامەکەم گەیاند و چاوەڕوانی بووم، نوێژی نیوەڕۆمان کرد نەهات، نوێژی عەصر و مەغریبمان کرد نەهات، لە نەفسی خۆمدا وتم: سبحان الله! نموونەی بیشر شتێك دەڵێت و پاشان جێبەجێی ناکات، دروست نییە ئەو کارە بکات، لای سەرچاوەی ئاوی مزگەوتەکەوە چاوەڕوانیم کرد، دوای ڕۆیشتنی بەشێك لە شەو بینیم لەسەر رووباری دیجلە بەپێ دەپەڕێتەوە، منیش خۆمدا بەسەر دەست و قاچیدا و وتم: دوعام لە لای خودا بۆ بکە، وتی: ئەمەم بۆ بپۆشە و باسی مەکە، منیش هەتا مرد باسم نەکرد.

## ٧٧. پیاوێك لە تەواف:

**قاسمی جورعی دەڵێت:** پیاوێکم لە تەواف بینی دەیوت: خودایە، پێویستییەکانی هەموانت جێبەجێ کرد، بەڵام پێویستی منت جێبەجێ نەکرد.

پێم وت: بۆ هەر ئەم دوعایە دەکەی؟

وتی: بۆت باس دەکەم، ئێمە حەوت کەس بووین لە وڵاتی جیاجیاوە دەرچووین بۆ جیهاد، رۆم بە دیلی گرتین، ئێمەیان برد بۆ ئەوەی بمانکوژن، حەوت دەرگام بینی لە ئاسمانەوە کرانەوە، لە بەردەم هەر دەرگایەکدا جاریەیەکی جوان وەستابوو، یەکێك لە ئێمە برا پێشەوە و لە گەردنی درا، یەکێك لە جاریەکانم بینی لە ئاسمانەوە دابەزی و پۆشاك و دەستماڵی پێ بوو رۆحەکەی وەرگرت، بەو جۆرە تا لە گەردنی شەش کەسمان درا، گەیشتە سەرەی من هەندێ لە پیاوانی رۆم منیان بەخشی، جاریەکە وتی: چ شتێکی مەزنت لەدەستچوو ئەی مەحرووم!بەدوایدا دەرگاکان داخران، من ئەی برام خەمبار و نارەحەتی ئەوەم کە لەدەستمچوو.

**قاسمی جورعی دەڵێت:** پێموایە لە هەر شەشیان باشتر بوو، چونکە شتێکی دەبینی ئەوان نەیاندەبینی، و لەسەر شەوق لەدوای ئەوان کاری دەکرد.

## ٧٨. دۆزینەوەی کیسەیەك:

**ئەبوبەکری کەتانی دەڵێت:** لە ڕێگەی مەککە بووم، کیسەیەکم بینییەوە پڕ بوو لە دیناری بریقەدار، وا تێگەیشتم هەڵیبگرم و بچم بەسەر هەژارەکانی مەککەدا دابەشی بکەم، بانگکەرێك بانگی لێکردم و وتی: گەر هەڵیبگری و بیبەی هەژارییەکەت لێ دەگرینەوە.

## ٧٩. کاسێکی شووشەی سپی:

**عەباسی شەرقی دەڵێت:** لە ڕێگەی مەککە لەگەڵ ئەبی تورابی نەخشەبی بووین، لە ڕێگەکە بەرەو لایەك لایدا، یەکێك لە هاوەڵانی وتی: من تینوومە، بە دەستی کێشای بە زەویدا کاسێکی شووشەی سپی(کە جوانتر لەوەم لە تەمەندا نەبینی بوو) هاتە دەرەوە، لێیخواردەوە و ئێمەش لێمان خواردەوە، کاسەکەمان پێ بوو تا مەککە، ڕۆژێك ئەبو توراب پێی وتم: هاوەڵانت دەربارەی ئەم شتانە چی دەڵێن کە خودا ڕێزی بەندەکانی خۆی پێدەگرێت(واتە دەربارەی کەرامات)؟

وتم: هەرکەسێکم بینی بێت باوەڕی پێهێناوە. وتی: هەرکەس باوەڕی پێی نەبێت بێباوەڕ بووە، من پرسیاری ڕێگەی حاڵت لێ دەکەم.

وتم: پێموانییە قسەیەکیان لەو بارەیەوە هەبێت.

وتی: با، هاوەڵانت بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەو کارە فریودانە لە حەقەوە، کارەکە بەو جۆرە نییە، فریودان لە حاڵی سوکنایی و ئارامیدایە بۆ ئەو کارە، بەڵام هەر کەس ئەوە داوا نەکات و سوکنایی و ئارامی بۆ لای نەبێت ئەوە پلە و پایەی ڕەبانییە.

## ٨٠. دەستم دەوەستێ و ناجووڵێت:

**ئیبن جەلا دەڵێت:** لە بەغداد لە ژوورەکەی **"السري"** بووین، کاتێك شەو گوزەری کرد، کراسێکی پاك و شەرواڵ و عەبای لەبەرکرد و نەعلەکانی لەپێ کرد و هەستا بچێتە دەرەوە، وتم: بەم کاتە بۆ کوێ دەچی؟

وتی: دەچم بۆ سەردانی فەتح مەوصلی، کاتێك بە شەقامەکانی بەغـدادا تێدەپـەڕی عەسعەسی شەو(پاسەوان) گرتیان و بردیان و بەندیان کرد، ڕۆژ بوویەوە فەرمانکرا بـە لێدانی لەگەڵ ئەوانەی بەندکرابوون، کاتێك جەلادەکە دەستی بـەرزکردەوە لێـی بـدات دەستی وەستا و نەیتوانی قەمچییەکە بوەشێنێت، بە جەلادەکە وترا: لێیدە.

ئەویش وتی: لە تەنیشـتمەوە کەسـێك وەسـتاوە دەڵێـت: لێـی مـەدە، بۆیـە دەسـتم دەوەستێ و ناجووڵێت.

سەرنجی پیاوەکەیان دا بینیان فەتح مەوصلییە، بۆیە لێیان نەدا.

## ٨١. دینار و درهەم بەسەرماندا دباری:

**سەعیدی کوڕی یەحیای بەصری دەڵێت:** دەستەیەك لـە قـورەیش لای **"عبدالواحـد بن زید"** دادەنیشتن، ڕۆژێك هاتن بۆ لای و پێیان وت: ئێمە لە تەنگەلانی و پێویستی و برسێتی دەترسین، سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی: خودایە، مـن داوات لێدەکـەم بە ناوی بەرز و بڵندت کە هەر کەست بوێ لـە دۆسـتانت ڕێـزی لـێ دەگـری، و بەنـدە هەڵبژاردەکانی خۆتی پێ فێر دەکەی ڕۆزییەکمان لەلای خۆتەوە بـۆ ڕەوانـە بکـە تـاکو پەیوەنـدی شـەیتان لـە دڵمـان و دڵـی هاوەڵانمـان بـبڕی، تـۆ **"الحنـان المنـان القـدیر الإحسان"**یت، خودایە ئەم ساتە، ئەم ساتە.

دەڵێت: سوێند بە خودا تەقەتـەقێك لـە سـەقفەکەوە هـات، پاشـان دینـار و درهـەم بەسەرماندا دباری، **"عبدالواحد بن زید"** وتی: بە خودا(ﷻ) بێنیـاز بـن لـە هەرچـی شتە جگە لە ئەو، ئەوان ئەو دینار و درهەمیان برد، بەڵام **"عبدالواحـد"** هیچـی لـێ هەڵنەگرت.

## ٨٢. سۆفییەکی غەریب:

**"الکتانی" دەڵێت:** سۆفییەکم بینی، کەسێکی غـەریب بـوو نەمدەناسـی، ڕۆیشـتە بەرەوە لە کەعبە و وتی: پەروەردگار، من نازانم ئەوانە(واتە تەوافکەران) چی دەڵـێن، پێی وترا: سەیری ئەو پەڕەیە بکە، دەڵێت: پەڕەیەك بە هەوادا فڕی و بزربوو.

## ٨٣. حەزم لە ماسییە:

**عەبدوڵای کوڕی جەلا دەڵێت:** رۆژێك دایکم وتی بە باوکم حەزم لە ماسییە، باوکم رۆیشت بۆ بازاڕ و ماسییەکی کڕی، منی لەگەڵ بوو، وەستا تا کەسێك بۆی هەڵبگرێت، منداڵێك هات و وتی: مامە بۆت هەڵبگرم؟

وتی: بەڵێ، هەڵیگرت و لەگەڵمان هات، گوێمان لە بانگ بوو منداڵەکە وتی: بانگوێژ بانگیدا، پێویستم بەوەیە خۆم پاکبکەمەوە و نوێژ بکەم ئەگەر رازی دەبیت، ئەگینا ماسییەکەت بۆ هەڵدەگرم و لەگەڵت دێم، منداڵەکە ماسییەکەی دانا و رۆیشت.

باوکم وتی: ئێمە لەپێشترین لەم ماسییەدا تەوەکولمان بە خودا بێت و دایبنێین و بچین نوێژەکەمان بکەین، چووینە مزگەوتەکە و نوێژەکەمان کرد، منداڵەکەش هات و نوێژی کرد، کە هاتینە دەرەوە ماسییەکە لە شوێنی خۆی بوو، منداڵەکە هەڵیگرت و لەگەڵمان هات بۆ ماڵەوە، باوکم ئەوەی بۆ دایکم باس کرد، دایکم وتی: پێی بڵێ با لەگەڵمان بمێنێتەوە و نانمان لەگەڵ بخوات، ئێمەش داوامان لێکرد بمێنێتەوە، منداڵەکە وتی: بەڕۆژووم، پێمان وت: بۆ بەربانگ بێتەوە بۆ لامان، وتی: گەر لە رۆژێکدا یەك جار حەماڵیم دەست بکەوێت نامەوێت بیکەم بە دوو جار، بەڵام ئێستا دەچم بۆ مزگەوت تا ئێوارە و دواتر دێم بۆ لاتان، ئەوەی وت و رۆیشت..

کە ئێوارەمان لێهات منداڵەکە هات و خواردنمان خوارد، کاتێك تەواوبووین شوێنی دەستشۆرینمان نیشاندا، بینیمان حەزی بە تەنهاییە، بۆیە لە ژوورێکدا بەجێمان هێڵا، کاتێك شەو هات هەستا و دەستی بە عیبادەت و پاڕانەوە کرد.

## ٨٤. زیخ و چەو دەبێت بە زێر:

**سەعیدی کوڕی یەحیای بەصری دەڵێت:** چووم بۆ لای عبدالواحدی کوڕی زەید لەبەر سێبەرێك دانیشتبوو، پێم وت: گەر داوا لە خودا بکەی رۆزیت بۆ بەرین بکات رجام وایە دوعاکەت قبووڵ بکات، لە وەڵامدا وتی: پەروەردگارم زاناترە بە بەرژەوەندی بەندەکانی، پاشان هەندێ زیخ و چەوی لە زەوی هەڵگرت و وتی: خودایە، گەر بتەوێ

بیکەی بە زێڕ دەتوانی و ئەنجامی دەدەی، سوێند بە خودا بینیم لە دەستیدا بوو بە زێڕ، هەڵیدا بۆ من و وتی: تۆ خەرجی بکە، خێر لە دونیایەکدا نییە بۆ دوارۆژ نەبێت.

## ٨٥. لەسەر تەختەشۆرەکە پەنجەی گرتم:

**ئەحمەدی کوڕی مەنصوور دەڵێت:** مامۆستام ئەبو یەعقووبی سوسی پێی وتم: "فەرید"م شۆری، لەسەر تەختەشۆرەکە پەنجەی گرتم، وتم کوڕی خۆم دەستم بەربدە، من دەزانم تۆ نەمردووی، بەڵکو گواستنەوەیەکە لە خانەیەکەوە بۆ خانەیەکی تر، یەکسەر دەستی بەردام.

## ٨٦. راستت کرد کوڕی خۆم:

**ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەڵێت:** گەنجێکی خاوەن ویستی چاك و باش هاوەڵی کردم، گەنجەکە پاش ماوەیەك مرد، دڵم زۆر پێیەوە خەریك بوو، من شۆردنەکەیم گرتە دەست، کاتێك دەستم بە شۆرینی کرد، بە شۆرینی چەپی دەستم پێکرد، ئەویش دەستی گرتم و بردی بۆ لای راستی، وتم: راستت کرد کوڕی خۆم من هەڵەم کرد.

## ٨٧. هەموو خۆشەویستێکی خودا زیندوون:

**ئەبو یەعقووبی سوسی دەڵێت:** لە مەککە موریدێك هات بۆ لام، وتی: مامۆستا، من سبەینێ نیوەڕۆ دەمرم، ئەم دیناره بگرە بە نیوەی قەبرێکم بۆ بکەنە و بە نیوەکەی تری کفنم بکە، بۆ سبەینێ هات و تەوافی ماڵی خودای کرد، پاشان دوورکەوتەوە و مرد، منیش هەستام بە شۆرینی و کفنم کرد و لە گۆڕەکەی ناشتم، لە گۆڕەکەدا چاوی کردەوە، منیش وتم: ئایا ئەمە زیندووبوونەوەیە لەدوای مردن؟

وتی: من زیندووم، هەموو خۆشەویستێکی خودا زیندووە.

## ٨٨. چاککبونەوەی نەخۆشێك:

**ئەبو عەلی کوڕی وەصیف دەڵێت:** رۆژێك سەهلی کوڕی عەبدوڵا باسی زیکری کرد و وتی: کەسی یادکەری خودا بەراستەقینە گەر بیەوێت مردوو زیندوو بکاتەوە

دەتوانێت زیندووی بکاتەوە(بە مۆڵەتی خودا)، دەستی خستە سەر نەخۆشێك لەبەر دەستی دانرابوو یەکسەر چاکبوویەوە و هەستایە سەرپێی.

### ٨٩. پەڵە هەورێك بە سەریەوە:

**بیشری کوڕی حاریس دەڵێت:** عەمری کوڕی عەتەبە نوێژی دەکرد و پەڵە هەورێك بە سەریەوە بوو، دڕندەکان بە دەوروبەریدا کلکیان دەلەقاند.

### ٩٠. من پێویستم بە چوار درهەم بوو:

**جونەید دەڵێت:** چوار درهەم لە گیرفانمدا بوو چووم بۆ لای **"السري"**، پێم وت: ئەم چوار درهەمەم بۆ هێناوی، وتی: مژدەت لێ بێت ئەی گەنج، تۆ سەرکەوتن و رزگاری بەدەست دەهێنیت، من پێویستم بە چوار درهەم بوو، دوعام کرد و وتم: ((خودایە بە کەسێکدا بۆم رەوانە بکە لەلای تۆ رزگاری و سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت)).

### ٩١. شێرێ ئاسکێکی بۆ هێنان:

**ئەبو ئیبراهیمی یەمانی دەڵێت:** لەگەڵ ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بە قەراغ دەریایەکدا دەڕۆیشتین، بەردەوام بووین تا گەیشتینە دارستانێك لە قامیش، داری وشکی زۆری لێ بوو، لەو نزیکەوە قەڵایەك هەبوو، وتمان بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم گەر ئەم شەو لەم جێگەیە بمێنینەوە و لەم دارانە بسووتێنین، وتی: وا بکەن، لە قەڵاکەدا بەدوای ئاگردا گەڕاین و ئاگرمان کردەوە، نانمان پێ بوو دەرمان هێنا و دەستمان بە خواردنی کرد، یەکێك لە ئێمە وتی: چەند باش بوو گۆشتمان پێبوایە لەسەر ئەم پشکۆیانە بمانبرژاندبایە، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی: خودا توانا و دەسەڵاتی ئەوەی هەیە گۆشت دەرخواردی ئێوە بدات، دەڵێت: ئێمە لەو قسانەدا بووین شێرێك ئاسکێکی کرد بە ژووردا، کاتێك لە ئێمە نزیکبوویەوە وەستا و گەردنی لەسەر زەویەکە راکێشا، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم هەستا و وتی: سەریببڕن، ئەوا خودا گۆشتی دەرخواردان، ئێمەش سەرمانبڕی و برژاندمان و لێمان خوارد، شێرەکەش بەپێوە وەستابوو تەماشای ئێمەی دەکرد.

## ٩٢. شیرێکی سپی هەڵقوڵا:

**"حامد الأسود" دەڵێت:** حەوت رۆژ لەسەر یەك حاڵ لە دەشت و سارا لەگەڵ ئیبراهیمی خەواص بووم، لە رۆژی حەوتەمدا لاوازی رووی لێکردم، لای بە لامدا کردەوە و وتی: چیتە؟

وتم: لاوازی رووی لێکردووم، وتی: کامیان بەسەر تۆدا زاڵە: ئاو یان خواردن(واتە تینوێتی یان برسێتی)؟

وتم: ئاو، ئەویش وتی: ئاو لە دواتەوەیە، لامکردەوە سەرچاوەیەکی ئاو وەك شیرێکی سپی هەڵقوڵا بوو، لێم خواردەوە و دەستنوێژم لێ هەڵگرت، ئیبراهیم تەماشای دەکرد و نزیك نەدەبوویەوە.

کە هەستامە سەرپێ ویستم هەندێکی لێ هەڵبگرم ئیبراهیم وتی: دەست هەڵبگرە، ئەوە ئاوێك نییە لێی هەڵبگری.

## ٩٣. تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خودا:

**زەیتوونە (کارەکەری حوسەینی نووری و ئەبو حەمزە و جونەید) دەڵێت:** رۆژێکی سارد بوو، بە حوسەینی نووریم وت: شتێکت بۆ بهێنم؟

وتی: بەڵێ، وتم: چیت دەوێ؟

وتی: نان و شیر، منیش بۆم برد، خەڵوزی لەبەردەمدا بوو یەك یەك وەریدەگێڕان، دەستی خۆی بەوانەوە خەریك دەکرد، دەستی بە خواردنی نان و شیرەکە کرد و بە دەستیدا شیرەکە دەچۆڕا و دەستی رەشیی خەڵوزەکەی پێوە بوو، لە دەروونی خۆمدا وتم: چەندە دۆستەکانی تۆ قێزەونن ئەی پەروەردگار، یەکێ پاك و خاوێنم تێدا نەبینینەوە، بۆیە لەلای هاتمە دەرەوە، ژنێك پێمەوە لکا و وتی: بوخچەیە پۆشاکم دزراوە و بردوومیان بۆ لای شورتە، هەواڵی ئەوە بە نووری بدە، نووری هاتە دەرەوە و وتی: دەست بۆ ئەو ژنە مەبەن، چونکە ئەوە دۆستێکە لە دۆستەکانی خودا(ﷻ)، شورتەکە وتی: چی بکەم ژنەکە بانگەشە دەکات؟

دەڵێت: کەنیزەکێك هات بوخچە داواکراوەکەی پێ بوو، لەو جێگەدا نووری بەرپەرچی ژنەکە(زەیتوونە)ی دایەوە و وتی: لەدوای ئەوە دەڵێیت چەندە دۆستەکانت قێزەونن، دەڵێت: وتم ئەوا تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خودا(ﷻ).

## ٩٤. مەدینە دەبینم:

**خەواص دەڵێت:** لە یەکێك لە سەفەرەکانمدا تینووم بوو، لە تینوێتیدا بەربوومەوە، لە ناکاو ئاو پرژێنرا بە دەم و چاومدا، بینیم پیاوێکی روخسار جوان سواری ئەسپێکی مارۆ بووە، ئاوی دەرخوارد دام و وتی: وەرە پاشکۆم، ئەو کاتە لە حیجاز بووم، بە ماوەیەکی زۆر کەم، پێی وتم: چی دەبینی؟

وتم: مەدینە دەبینم، وتی: دابەزە و سەلامی من بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بگەیەنە، پێی بڵێ: **"خضر"**ی برات سەلامت لێ دەکات.

## ٩٥. پیرێك لە نێوان ئاسمان و زەویدا هاتە خوارەوە:

**موزەفەری جەصاص دەڵێت:** من و نەصری خەڕات شەوێك لە شوێنێك ماینەوە، شتێکمان دەربارەی زانست(شەریعەت) باس کرد، خەڕات وتی: کەسی یادکەری خودا(ﷻ) لە سەرەتای یادەکەیەوە دەبێت بزانێت خودا(ﷻ) یادی ئەوی کردووە بۆیە ئەو یادی خودا دەکات، واتە بە یادی ئەو یادی خودا(ﷻ) دەکات، دەڵێت: من لەگەڵی پێچەوانە بووم، خەڕات وتی: گەر **"خضر"** لێرە بوایە شایەتی دروستیی ئەو قسەی منی دەدا، دەڵێت: لەناکاو پیرێك لە نێوان ئاسمان و زەویدا هاتە خوارەوە و رووی لە ئێمە کرد و سەلامی کرد و وتی: تۆ راست دەکەی، کەسێك یادی خودا دەکات بە چاکەی یادی خودا بۆ ئەو یادی خودا دەکات، زانیمان ئەو کەسە **"خضر"**ە(علیه السلام).

## ٩٦. رۆیشتن بەسەر ئاودا:

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** پیاوێك هات بۆ لای سەهلی کوڕی عەبدوڵا و وتی: خەڵکی دەڵێن تۆ بەسەر ئاودا دەڕۆی، وتی

پرسیار لە بانگوێژی گەڕەکەکە بکە، ئەو پیاوێکی صالحە و درۆ ناکات، دەڵێ: پرسیارم لێکرد، بانگوێژەکە وتی: ئەوە نازانم، بەڵام هەندێ ڕۆژ بۆ دەستنوێژگرتن دەچووە لای حەوزەکە گەر من نەبوومایە بەردەبوویەوە ناو حەوزەکە و تیایدا دەخنکا.

**مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق دەڵێت:** سەهل بەو جۆرە بوو خەڵکی باسی دەکرد(مەبەستی حاڵی ڕۆیشتنە بەسەر ئاودا)، بەڵام خودا(ﷻ) دەیەوێت دۆستەکانی خۆی داپۆشێت، بۆیە گفتوگۆی بانگوێژەکە و حەوزەکەی کرد بە پۆشەرێك بۆ حاڵی سەهل، ئەگینا سەهل خاوەنی کەرامات بوو.

**نزیك بەم مانایە لە ئەبو عوسمانی مەغریبییەوە دەگێڕنەوە و دەڵێت:** بە نووسینی ئەبو حوسەینی جورجانی بینیومە دەڵێت: جارێك ویستم بچم بۆ مصر، هات بە بیرمدا سواری کەشتی ببم، پاشان هات بە بیرمدا لەوێ بناسرێم، بۆیە لە ناوبانگ ترسام، کەشتییەکە تێپەڕی، بۆم دەرکەوت دەبێت بەسەر ئاوەکەدا بڕۆم، ڕۆیشتم و گەیشتمەوە بە کەشتییەکە و چوومە ناوی و خەڵکی سەیری منیان دەکرد، بەڵام هیچ کەس لەوانە نەیوت ئەو کارەی تۆ هەڵوەشاندنەوەی عادەتە یان نە، لەوەوە زانیم دۆستی خودا داپۆشراوە با کەسێکی بەناوبانگیش بێت.

## ٩٧. پێویستی بە سەرئاو و هەرچەند دانیشتنەکە درێژەی بکێشابا:

**لەو حاڵانەی لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بەچاو بینیومە ئەوە بوو:** میزەچرکێی لەگەڵ بوو، مەسینەیەکی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت لە ڕێگەی ڕۆیشتن بۆ مەجلیسەکەی، لە ڕێگە چەندین جار ئاتاج دەبوو بە لادان و ڕۆیشتن و هاتنەوە، کاتێك لەسەر کورسییەکە دادەنیشت قسەی دەکرد پێویستی بە سەرئاو و پاکبوونەوە نەبوو هەرچەند کاتی دانیشتنەکە درێژەی بکێشابایە، ئەمەمان چەندین ساڵ لێ بینی، لە ژیانیدا بە بیرماندا نەهات ئەو کارەی هەڵوەشێنەری عادەتە، بەڵام دوای مردنی خودا ئەو زانینەی بە ڕوودا کردمەوە و تێیگەیشتم.

نزیك بەم بەسەرهاتە لە سەهلی کوڕی عەبدوڵاوە دەگێڕنەوە کە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا گرمۆڵەبوونی دەست و لاقەکانی رووی لێکرد بوو، بەڵام لە کاتی

نوێژەکانـدا هێزیـان تێدەهاتـەوە و بـە پێـوە نوێـژەکانی دەکـرد. ئـەوەی بەناوبانگـە "عـبدالله الوزان" شەلەلی هەبوو، لەباری بیستندا کە وەجدی لێـدەهات هەڵدەسـتایە سەر پێ و گوێی دەگرت.

## ٩٨. ونبووەکەمان بۆ بگێڕەوە:

**ئەحمەدی کوڕی حـەواری دەڵێـت:** لەگـەڵ ئـەبو سـولەیمان حـەجم کـرد، جەوەنـدەی ئاوەکەم بزر کرد و بەبێ ئاوماینەوە، ڕۆژێکی زۆر سارد بوو، ئەبو سولەیمان وتـی: **"یا راد الضـالة و یـا هـادي مـن الضـلالة اردد إلینـا الضـالة**-ئـەی ئـەو کەسـەی بزربـوو دەگێڕییەوە و لە وێڵبووندا خەڵکی هیدایـەت دەدەی ونبووەکـەمان بـۆ بگێـڕەوە"، لـە ناکاو کەسێك بانگی کرد: کێ جەوەندەیەکی بزر کردووە؟

دەڵێت: وتم: مـن.. لێم وەرگرتەوە، ئێمە بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن، بە هۆی سەرمای زۆرەوە خۆمان بە فەروو داپۆشی بوو، کەسێکمان بـینی دوو پۆشـاکی زۆر تـەنکی بـە جەستەوە بوو لە ئەرەقە هەڵڵژەنرا بوو، ئەبو سولەیمان وتی: وەرە شتێك لەم پۆشاکانەت پێ بدەین کە لە بەرماندایە، پیاوەکە وتی: ئەی ئەبو سولەیمان ئاماژە بە زوهد دەکەی بۆ من لە کاتێکدا تۆ بۆخۆت سەرماتە؟

من ماوەی سی ساڵە بەم دەشت و بیابانـەدا گەشـت دەکـەم نـە گـەرمام بـووە و نـە سەرما، خودا لە کاتی سەرمادا هاڵاوێك لە خۆشەویستی خۆی دەکات بە بەرمدا و لە هاویندا چێژی فێنکی خۆیم دەکات بە بەردا.. ئەو قسانەی کرد و ڕۆیشت.

## ٩٩. دڕندەیەکی بە وەفا:

**خەواص دەڵێت:** جارێکیـان لـە دەشـت و سـارا بـووم، بـەناو ڕووبارێکـدا پەڕیمـەوە، ڕۆیشتم تا گەیشتمە درەختێك، نزیك بە درەختەکە ئاوێك هەبوو، لـەو شـوێنە لامـدا، بینیم دڕندەیەکی گەورە بەرەو لای من هات، مـنیش خۆم رادەست کرد، کە لێم نزیـك بوویەوە بینیم دەشەلێ، دەنووزایەوە و لە بەردەمم خۆی پاڵخست، دەستی خسـتە نـاو کۆشمەوە، سەرنجم دا دەستی ئاوساوە و کیم و خـوێنی تێدایـە، پارچـە دارێکـم هێنـا و

شوێنی کیمەکەم بۆ هەڵدڕی، پارچە پەڕۆیەکم لە دەستی بەست، دوای ئـەوە هەسـتا و ڕۆیشت، پاش ماوەیەکی کەم بینیم گەڕایەوە و دوو بێچووی خۆی لەگەڵە و کلکیان بۆ دەلەقاندم و کولێرەیەکیان بۆ هێنابووم.

## ١٠٠. بۆ یارمەتی دۆستی خودا پەنا بۆ دوژمنی خودا دەبەن:

**ئەحمەدی کوڕی ئـەبی حـەواری دەڵێـت:** محەمـەدی کـوڕی سـەماك(ئیبن سـەماك) نەخۆش کەوت، ئێمەش میزەکەمان برد بۆ لای پزیشك، پزیشکەکە پیاوێکی نەصرانی بوو، دەڵێت: لـە کاتێکـدا ئێمـە لـە نێـوان "حـیرە" و "کوفـە"دا بـۆ لای پزیشـکەکە دەڕۆیشتین گەیشتین بە پیاوێکی روخسار شیرینی بۆن خۆشی پۆشـاك جـوان و خـاوێن، پێی وتین بۆ کوێ دەچن؟

وتمان دەچین بۆ لای فلان پزیشك تاکو میزی ئیبن سەماکی نیشان بدەین.

پیاوەکە وتی: سبحان الله.. بۆ یارمەتی دۆستی خودا پەنا بۆ دوژمنی خودا دەبەن.. ئەوەی هێناوتانە فڕێیدەن، بچنەوە بۆ لای ئیبن سەماك و پێی بڵێن: دەست بخاتە سەر شوێنی ئازارەکە و بڵێت:﴿وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ﴾الإسراء: ١٠٥، پاشان لەبەر چاومان بزر بوو.

گەڕاینەوە بۆ لای ئیبن سەماك و ئەو هەواڵەمان پێدا، دەسـتی خسـتە سـەر شـوێنی ئازارەکە و ئەوەی ئەو پیاوە وتی ئەویش خوێندی، یەکسـەر چـاکبوویەوە و وتـی: ئـەو پیاوە "**خضر**"(عليه السلام) بووە.

## ١٠١. هاتە دڵم بێم پێشوازیت بکەم:

**"عبدالرحمن بن محمد" دەڵێت:** مامم بۆی گێڕامـەوە و وتـی: لـە مەجلیسـی ئـەبو یەزیدی بوستامیدا دانیشتبووین وتی: هەستن پێشوازی بکەین لە یەکێك لە دۆسـتانی خودا(تعالى) ئێمەش لەگەڵی راستبووینەوە، کاتێك گەیشتینە بەر دەرگاکە "ئیبراهیمـی کوڕی شەیبەی هوروی"مان بینی، ئەبو یەزید پێی وت: هاتە دڵم بێم پێشوازیت بکەم و شفاعەتت بۆ بکەم لای پەروەردگارم، ئیبراهیمی کوڕی شەیبە وتی: گەر شفاعەت بۆ

هەموو مرۆڤەکان بکەی هێشتا زۆر نییە، ئەوانە پارچە قورێکن، ئەبو یەزید لە وەڵامەکەی سەرسام ما.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** کەرامەتی ئیبراهیم لە بچووك کردنەوەی ئەوەدا(شفاعەت) لە کەرامەتی ئەبو یەزید تەواوتر بووە بەهۆی ئەو فیراسەتەی هەیبووە و ئەو راستگۆییەی لە حاڵیدا بووە دەربارەی شفاعەت.

## ١٠٢. سەرەتای تەوبە:

**سالم مەغریبی** پرسیاری لە "**ذو النون**" کرد دەربارەی سەرەتای تەوبەکەی، ئەویش وتی: ویستم لە میسرەوە بەرەو هەندێ گوند دەربچم، لە رێگەدا و لەو دەشت و سارایە لە بن دارێك خەوم لێکەوت، دواتر چاوم کردەوە، و بینیم باڵندەیەکی کوێر لە هێلانەکەی کەوتووەتە خوارەوە، زەویەکە شەقی برد و دوو دەوری(دەفر) لێ هاتە دەرەوە، یەکێکیان زێڕ و ئەویتریان زیو، لە یەکێکیاندا کونجی هەبوو، ئەویتریان ئاوی تێدا بوو، باڵندەکە لەمە و لەوەشی دەخوارد. وتم: ئەمە بەسە بۆ من، تەوبەم کرد و گەڕامەوە، لە دەرگای خودا راوەستام تا خودا -ﷻ- قبوڵی کردم.

## ١٠٣. تووشی شەلەل بوو:

**وتراوە:** عبدالواحدی کوڕی زەید تووشی شەلەل بوو، کاتی نوێژ هاتە بەرەوە و پێویستی بە دەستنوێژ بوو، پرسی: کێ لێرەیە؟

کەس وەڵامی نەدایەوە، ئەویش ترسی تیاچوونی نوێژەکەی لێنیشت، وتی: خودایە لەم کۆتوبەندە من بکەرەوە تا دەستنوێژەکەم بگرم، پاشان خۆت چۆنت پێخۆشە وام لێبکە، دەڵێت: چاکبوویەوە تا دەستنوێژی هەڵگرت پاشان گەڕایەوە بۆ ناو جێگەکەی و وەك خۆی لێهاتەوە.

## ١٠٤. گوێدرێژە گوێرایەڵەکە:

**ئەبو ئەیوبی حەماڵ دەڵێت:** کاتێك عەبدوڵای دەیلەمی سەفەری دەکرد و لە شوێنێك لایەدا دەیچرپاند بە گوێی گوێدرێژەکەیدا و دەیوت: دەمویست بتبەستمەوە، بەڵام ئێستا

ناتبەستمەوە، لەم سارایەدا بەرەڵات دەکەم بۆ ئەوەی بلەوەڕێی، هەر کات ویستمان سەفەر بکەین وەرەوە.. بۆیە هەر کات رۆیشتنیان دەستپێدەکرد گوێدرێژەکە دەگەڕایەوە.

## ١٠٥. پۆشاکێکی هەبوو:

**وتراوە عەبدوڵا دەیلەمی** کچەکەی بەشوودا، پێویستی بەوە بوو شتومەکی بۆ رێکبخات، پۆشاکێکی هەبوو بە دینارێك دەکڕدرا، بردی بۆ بازاڕ، خرایە مەزاتەوە نرخەکەی گەیشتە سەد دینار، ئەویش بەو پارەیە کچەکەی بەرێکرد.

## ١٠٦. مێزەرێکی کورت:

**ئیبن شەمیل دەڵێت:** مێزەرێکم کڕی بینیم کورتە، داوام لە پەروەردگارم کرد بە ئەندازەی قۆڵێك بۆم درێژ بکات، خودا دوعاکەی گیرا کردم و بۆی درێژ کردم، گەر داوای زیاترم بکردبایە خودا بۆی زیاد دەکردم.

## ١٠٧. وەڵامی ئەو دوعایەی نەدایەوە:

**وتراوە:** عامری کوڕی قەیس داوای لە خودا کرد خۆپاککردنەوە و دەستنوێژی لە زستاندا لەسەر ئاسان بکات، دەچووە سەر ئاو و لە گەرمیدا ئاوەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا، داوای لە خودا کرد حەزی ئافرەتی تێدا نەهێڵێت وای لێهات هیچ باکێکی بە ئافرەت نەبوو، داوای لە خودا کرد لە نوێژەکانیدا شەیتان لە دڵی قەدەغە بکات وەڵامی ئەو دوعایەی نەدایەوە.

## ١٠٨. من "خضر"ی براتم:

**بیشری کوڕی حاریس دەڵێت:** چوومە ماڵەوە پیاوێك لەوێ بوو، پرسیم: تۆ کێی بەبێ مۆڵەتی من هاتوویە ناو ماڵەکەم؟

وتی: من "خضر"ی براتم، داوام لێکرد دوعام بۆ بکات، فەرمووی: خودا گوێڕایەڵی خۆی لەسەر تۆ ئاسان بکات، وتم: بۆم زیاد بکە، وتی: خودا داتبپۆشێت.

## ١٠٩. به دەوری تۆدا حەفتا هەزار فریشتە هەیە:

**ئیبراهیمی خەواص دەڵێت:** لە یەکێك لە سەفەرەکانمدا شەوێك لەسەر رێگەی مەککە رووم لە وێرانەیە کرد، بینیم دڕندەیەکی زۆر گەورەی تێدایە، لێیترسام، لەناکاو بانگکەرێك بانگی کرد: خۆڕاگربە، بە دەوری تۆدا حەفتا هەزار فریشتە هەیە و پارێزگاریت لێ دەکەن.

## ١١٠. دزێك دەستی وشك بوو:

**جەعفەر دوبەیلی دەڵێت:** "النوري" رۆیشتە ناو ئاوێکەوە، دزێك هات و پۆشاکەکانی برد، زۆری نەبرد دزەکە گەڕایەوە و پۆشاکەکانی هێنایەوە، بەڵام دەستی وشك بووبوو، "النوری" وتی: پۆشاکەکەی بۆ گێڕاینەوە تۆش (ئەی خودایە) دەستی بۆ بگێڕەوە، هەر لەو جێگەدا کەسەکە دەستەکانی چاکبوونەوە.

## ١١١. پەیمانەکەت بپارێزە:

**شیبلی دەڵێت:** ماوەیەك بڕیارم لەسەر خۆ دابوو تەنها حەڵاڵ بخۆم، لەو دەشت و سارایە دەسوڕامەوە، درەختێکی هەنجیرم بینی، دەستم درێژ کرد دەنکێکی لێ بخۆم، درەختەکە بانگی لێکردم، پەیمانەکەت بپارێزە، لە بەری من مەخۆ، چونکە من موڵکی پیاوێکی یەهودیم.

## ١١٢. ئاوەکە لە بیرەکەوە بۆ بەرزبووبوویەوە:

**عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** لەسەر رێگەی حەجکردنم لە بەغدا لامدا، دەستەبژێرێکی سۆفیم لەگەڵ بوو، چل رۆژ بوو نانم نەخواردبوو، نەچووم بۆ لای جونەید، لە بەغدا دەرچووم و تا گەیشتم بە ناوچەی زەبالە ئاوم نەخواردەوە، لەو ماوەیەدا لەسەر دەستنوێژبووم، ئاسکێکم بینی لەسەر بیرەکە ئاوی دەخواردەوە، منیش تینووم بوو، کە لە بیرەکە نزیکبوومەوە ئاسکەکە پشتی هەڵکرد، بینیم ئاوی بیرەکە زۆر لە خوارەوەیە، رۆیشتم و وتم: خودایە، ئەی گەورە و سەردارم قەدر و رێزی

ئەو ئاسکەم نییە لەلات؟(واتە ئەو ئاوەکەی لە بیرەکەوە بۆ بەرزبووبوویەوە)، گوێم لـێ بوو لە دواوە بانگکەرێك بانگی کرد و وتـی: تۆمـان تـاقیکردەوە و ئارامـت نـەگرت، بگەڕێوە و ئاو لە بیرەکە هەڵگۆزە، گەڕامەوە بۆ سەر بیرەکە و بینیم پڕبـووە لـە ئـاو، ئاوم لێ خواردەوە و دەستنوێژم پێهەڵگرت و جەوەنـدەی ئاوەکـەم لـێ پـڕ کـرد، هـەتا مەدینە ئەو ئاوە کۆتایی پێ نەهات.

## ١١٣. گەر ئارامت بگرتبایە ئاو لەژێر پێیەکانت هەڵدەقوڵا:

**کاتێك پاراوبووم گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت:** ئاسکەکە بەبێ دۆلکە و پەت رووی لەبیرەکە کرد، بەڵام تۆ دۆلکە و پەتت هەڵگرتبوو، کە لە حەج گەڕامەوە رۆیشـتم بـۆ مزگەوتی گەورەی بەغداد، کاتێـك چـاوی جونەیـد کەوتـە سـەرم وتـی: گـەر ئارامـت بگرتبایە ئاو لەژێر پێیەکانت هەڵدەقوڵا، تەنها ساتێك ئارامت بگرتبایە.

## ١١٤. ئەوەی لەدەستم چووە بۆم بگێڕەوە:

**محەمەدی کوڕی سەعیدی بەصری دەڵێـت:** لەسـەر یـەکێك لـە رێگـەکانی بەصـرە دەڕۆیشتم پیـاوێکی ئـەعرابیم بـینی سـواری حوشـترێك بـوو بـوو، لامکـردەوە بینـیم حوشترەکەی مردار بوویەوە، و پیاوەکـە و بارەکـەی کەوتنـە خـوارەوە، گـوێم لـێ بـوو ئەعرابییەکە دەیوت: ئەی هۆکـاری هـەموو هۆکارەکـان، ئـەی مـەولای ئـەو کەسـەی داوات لێ دەکات، ئەوەی لەدەستم چووە بۆم بگێـڕەوە، ئـەو حوشـترە مـن و بارەکـەی هەڵگرتبوو، لەناکاو حوشترەکە هەستایەوە و بارەکە و پیاوەکەی لەسەر بوو.

## ١١٥. ئەو داڵەی گۆشتی فڕاند:

**وتراوە:** شیبلی مرووزی حەزی لە گۆشت بوو، بە نیو درهەم گۆشتی کڕی، داڵێك لـە رێگە لە دەستی فڕاند، شیبل چووە مزگەوتێك نوێژ بکات، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ژنەکەی گۆشتی بۆ ئامادە کردبوو، پرسی: ئەم گۆشتە لە کوێوە؟

وتی: دوو داڵ بە ئاسمانەوە شەڕیان بوو ئەم گۆشتەیان لـێ بەربوویـەوە، شـیبل وتـی: حەمد بۆ ئەو خودایەی "شیبل"ی لەبیرنەچووە، هەرچەند شیبل زۆر ئەوی لە بیردەچێت.

## ١١٦. لەناكاو جوانووەكە[٨٦] بەرزبوويەوە:

**ئیبن عوبەیدی بوسرایی لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە:** ساڵێك ڕۆیشتووە بۆ غەزا، لەناو سریەیەكدا دەردەچێت، ئەو جوانووەی لە سریەكەدا لەژێریدا دەبێت دەمرێت، بۆیە دەكەوێتە پاڕانەوە و دەڵێت: پەروەردگار ئەم جوانووەت لێ دەخوازم تا دەگەڕێمەوە بۆ ئاوەدانی "بوسرا" واتە دێیەكەی، لەناكاو جوانووەكە بەرزبوویەوە، كاتێك غەزای كرد و گەڕایەوە بۆ "بوسرا" دەڵێت: كوڕی خۆم زینەكە لەو جوانووە دابگرە، چونكە ئەو جوانووەم خواستووە، دەڵێت: كە زینەكەم لێكردەوە جوانووەكە كەوت بە زەویدا و مرداربوویەوە.

## ١١٧. پیاوێكی كفندز:

**وتراوە:** پیاوێك كفندز بوو، ژنێك كۆچی دوایی كرد، دزەكە لەگەڵ خەڵكەكەدا نوێژی كرد بۆ ئەوەی گۆڕەكەی بزانێت، كاتێك شەو داهات گۆڕەكەی هەڵدایەوە، ژنەكە وتی: سبحان الله، پیاوێك خودا لێیخۆش بووە كفنی ژنێك دەدزێت خودا لێیخۆش بووە! پیاوەكە وتی: با وا دابنێین تۆ خودا لێت خۆشبووە، بەڵام من لە كوێوە؟

ژنەكە وتی: خودا لە من و هەموو ئەوانە خۆشبووە نوێژیان لەسەر كردم، تۆش لەوانە بووی نوێژت لەسەر كردم، دزەكە دەڵێت: وازم لێ هێنا، و خۆڵەكەم دایەوە بەسەریدا، پاشان پیاوەكە بە باشترین تەوبە تەوبەی كرد.

## ١١٨. ددانەكان شوێنی خۆیان گرتەوە:

**نیعمانی كوڕی موسای حیری دەڵێت:** دوو پیاو بوو بە شەڕیان یەكێكیان پیاوی سوڵتان بوو ئەویتریان ڕەعیەت بوو، پیاوە ڕەعیەتەكە دەستدرێژی كردە سەر پیاوی سوڵتان و دوو ددانی پێشەوەی شكاند، پیاوەكەی سوڵتان خۆی بە پیاوەكەی تردا هەڵواسی و دەستی گرت و وتی نێوانی من و تۆ ئەمیر بڕیاری لێ دەدات، هەردوو بە پاڵ "**ذي النون**"دا تێپەڕین، خەڵكی پێی وتن: بچن بۆ لای ئەو شێخە، ئەوانیش

[٨٦] {(جوانوو بێچووی ماینە و تازە پێگەیشتووە)}.

ڕۆیشتن بۆ لای و ئەوەی ڕوویدابوو بۆیان باس کرد، "**ذو النون**" ددانەکانی هەڵگرت و تفی دەمی خۆی لێدا و گێڕایەوە بۆ دەمی پیاوەکە لە هەمان شوێنی خۆیاندا، پاشان لێوەکانی جووڵاند و بە مۆڵەت و بڕیاری خودا ددانەکان شوێنی خۆیان گرتەوە، پیاوەکە دەستی بەناو دەمیدا دەهێنا و هیچ شوێنێکی لە ناو دەمی بە بۆشی نەبینییەوە و دانەکانی لە جێگەی خۆیان بوون.

## ۱۱۹. گوێدرێژەکە هەستایە سەرپێ:

**ئەبو سیرەی نوخەعی دەڵێت:** لە یەمەنەوە پیاوێك بەڕێکەوت، لە ڕێگە گوێدرێژەکەی مرداربوویەوە، ئەویش دەستنوێژێك دەگرێت و دوو ركات نوێژ دەکات و دەڵێت: خودایە من بۆ تێکۆشان لە پێناوی تۆ و ڕازیبوونی تۆدا بەڕێکەوتووم، من شایەتی دەدەم تۆ مردوو زیندوو دەکەیەوە و ئەوانەی لە گۆڕدان بەئاگایان دەهێنی، خودایە منەتی کەسم مەهێنە سەر، ئەمڕۆ داوات لێ دەکەم ئەم گوێدرێژەم زیندووبکەیەوە، گوێدرێژەکە هەستایە سەرپێ و گوێیەکانی دەلەقاند.

## ۱۲۰. من "خضر"م:

**ئەبوبەکر هەمەدانی دەڵێت:** چەندین ڕۆژ لە دەشت و سارای حیجازدا مامەوە و هیچم نەخواردبوو، حەزم لە پاقلەی گەرم و نانی "**باب الطاق**"(شارێك بووە لە عێراقی ئەو سەردەمە) دەکرد، وتم: من لە دەشت و سارای حیجازم و لە نێوان من و عێراقدا ماوەیەکی دوورودرێژ هەیە، هێشتا بیرکردنەوەکەم تەواو نەبووبوو ئەعرابییەك لەدوورەوە بانگی کرد: پاقلەی گەرم و نان، چووم بۆ لای و پێم وت: ئایا پاقلەی گەرم و نانت لەلایە؟

وتی: بەڵێ، نان و پاقلەی دەرهێنا و پێی وتم: بخۆ، منیش خواردم، پاشان وتی: بخۆ، منیش زۆرترم خوارد، پاشان وتی: بخۆ، منیش زیاترم خوارد، کاتێك لە جاری چوارەمدا پێی وتم: بخۆ، وتم: بە حەقی ئەو کەسەی تۆی بۆ لای من ڕەوانە کرد پێم نالێی تۆ کێی؟

وتی: من "**خضر**"م، دوای ئەوە لێم بزر بوو و نەمبینییەوە.

## ١٢١. پیاوێکی ئەعرابی:

**ئەبو جەعفەری حەداد دەڵێت:** هاتم بۆ ئاوەدانی **"الثعلبية"** بینیم وێران بووە، بۆ حەوت ڕۆژ دەچوو هیچم نەخوارد بوو، چوومە ژێر گومبەزییەك، دەستەیەك خۆراسانی هاتن کە زۆر شەکەت و ماندووبوون خۆیان هەڵدایە دەرگای گومبەزییەکە، لەناکاو پیاوێکی ئەعرابی بە سواری حوشترێك هات خورمای هەڵدایە بەردەمیان، ئەوانیش بە خواردنی خورماوە خەریك بوون و فەرموویان لە من نەکرد و ئەعرابییەکەش منی نەبینی، پاش ماوەیەك ئەعرابییەکە گەڕایەوە و پێی وتن: ئایا کەسی ترتان لەگەڵە؟ وتیان: بەڵێ، ئەو پیاوە لە ناوەوەی گومبەزییەکەدا، دەڵێت: ئەعرابییەکە هاتە ژوورەوە و پێی وتم: تۆ کێی؟

بۆ قسەت نەکرد؟

کاتێك ڕۆیشتم یەکێك هاتە بەردەمم و پێی وتم: کەسێکت بەجێهێڵاوە خواردنت پێنەداوە، بۆیە نەمتوانی بڕۆم، ڕێگەکەشم زۆر دوور کەوتبووەوە و ماندوو بووم، چونکە چەندین میل لە ئێوە دووربووم.. خورمایەکی زۆری خستە بەردەمم و ڕۆیشت، پیاوەکانی ترم بانگ کرد و پێکەوە خورماکەمان خوارد.

## ١٢٢. حوشترێك قسەی لەگەڵ کردم:

**ئەحمەدی کوڕی عەتا دەڵێت:** حوشترێك قسەی لەگەڵ کردم، لە ڕێگەی مەککە کۆمەڵێك حوشترم بینی کۆڵ و باریان لەسەر بوو، گەردنیان لە شەودا درێژکشابوو، وتم: سبحان الله! کێ دەتوانێ ئەم کۆڵ و بارە قورسانە لە جێگەی ئەو حوشترانە بگوێزێتەوە، یەکێك لە حوشترەکان لای بە لای مندا کردەوە و وتی: بڵێ: جل الله، منیش وتم: جل الله.

## ١٢٣. خودایە، ئەم ئافرەتە ڕەش بکە:

**"أبو ذرعة الجنی" دەڵێت** ئافرەتێك فێڵێکی لێکردم و پێی وتم: وەرە ژوورەوە و سەردانی نەخۆشێك بکە، منیش چوومە ژوورەوە، ئافرەتەکە دەرگاکەی داخست..

سەرنجمدا کەسم لە ژوورەوە نەبینی، زانیم تێکەوتووم، وتم: خودایە، ئەم ئافرەتە رەش بکە، ئافرەتەکە رەشهەڵگەڕا، ئافرەتەکە سەرسام ما و دەرگاکەی کردەوە و منیش هاتمە دەرەوە، لە خودا پاڕامەوە و وتم: خودایە، بیگێڕەوە بۆ حاڵی یەکەمجاری خۆی، خودا گێڕایەوە بۆ سەر رەنگی یەکەمجاری.

## ١٢٤. هەر ئێستا لە ئەنبار بووم:

**خەلیل صەیاد دەڵێت:** کوڕەکەم(**محەمەد**) لێمان بزر بوو، دڵتەنگییەکی زۆر رووی لێکردین، هاتم بۆ لای مەعروفی کەرخی و وتم: ئەی باوکی مەحفوز، کوڕەکەم بزر بووە و دایکی زۆر پەرێشانە بۆی.

وتی: چیت دەوێ؟

وتم: داوا لە خودا بکە بۆمان بگێڕێتەوە.

وتی: خودایە ئاسمانی ئاسمانی تۆیە، و زەوی زەوی تۆیە، و ئەوەی لە نێوان ئەو دوانەدایە بۆ تۆیە، **محەمەد**مان بۆ بگێڕەوە.

خەلیل دەڵێت: هاتم بۆ دەروازەی شام(یەکێك لە دەروازەکانی بەغداد بوو روو بە شام) بینیم بەپێوە وەستاوە، لێم پرسی: **محەمەد** تۆ لە کوێ بووی؟

وتی: باوکە هەر ئێستا لە ئەنبار بووم.

**مامۆستا ئەبو قاسم(قوشەیری) دەڵێت:** بزانە بەسەرهاتەکانی ئەم دەروازەیە لە هەژماردن نایەن، زیاتر لەوەی باسمان کرد لە پوختەی بابەتەکە دوورمان دەخاتەوە، ئەوەندەی باسمان کردووە بەسە بۆ باوەڕ و قەناعەت.

# دەروازەی شەشەم

# خەونی ئەم دەستەیە

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:**

**هەر کەس لە خەوندا بمبینێت ئەوا بە حەق منی بینیوە، شەیتان ناتوانێ خۆی بکات بە من.**

# خەونی ئەم دەستەیە

خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمویت:﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾یونس: ٦٤، وتراوە ئەو مژدەیە بریتییە لە خەونی خۆش، کەسەکە خۆی دەیبینێت یان پێوەی دەبینن.

لە "أبی الدرداو"(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پرسیارم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد دەربارەی ئایەتی:﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پێش تۆ کەس پرسیاری لێ نەکردم، ئەوە بریتییە لە خەونی خۆش کەسێك دەیبینێت یان پێوەی دەبینن.

**لە ئەبی قەتادەوە(خودا لێی رازی بێت) دەڵێت:** پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((خەونی خۆش(**الرؤیا**) لە خوداوەیە، خەونی ناخۆش(**الحلم**) لە شەیتانەوەیە، گەر کەسێك لە ئێوە خەونێکی بینی پێی بێزار بوو(لای ناپەسەند بوو) با تف بکات بە لای چەپیدا و پەنا بگرێت بە خودا لە شەیتان بەو جۆرە زیانی پێ ناگات))

**لە ئیبن مەسعوودەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:** ((هەر کەس لە خەوندا من ببینێت، ئەوا منی بینیوە، شەیتان ناتوانێت بچێتە شێوەی منەوە))

مانای ئەو فەرموودەیە ئەوەیە ئەو خەونە بینینێکی راستەقینەیە و تەئویلەکەی راستەقینەیە، خەون جۆرێکە لە کەرامات، راستەقینەی خەون کۆمەڵێك خوتوورەیە دادەبارێنە سەر دڵ و کۆمەڵێك حاڵە لە خەیاڵدا وێنە دەکرێن گەر خەوتنەکەی هەموو هەستکردنەکان لە خۆیدا نغرۆ نەکات، مرۆڤ لە ئاگاییدا ئەندێشەی بۆ دروست دەبێت وەك ئەوەی بینینی راستەقینە بێت، لەگەڵ ئەوەش وێناکردن و ئەندێشەیەکە لە مرۆڤەوە و لە دڵیدا بڕیاری لێدراوە، کاتێك هەستکردنی دەرەکیان لێ جیادەبێتەوە ئەو ئەندێشانە رووت دەبنەوە لە زانراوەکان بە هەست و زەروورەت، بۆیە ئەو حاڵەتە لای خاوەنەکەی بەهێز دەبێت، کاتێك بەئاگا دێت ئەو حاڵانە لاوازی روویان لێ دەکات، ئەو حاڵانەی وێنای کردوون سەرباری حاڵی هەستکردنی بە بینینەکان و بەدەستهێنانی زانستی زەرووری.

**نموونەی ئەو کەسەی خەوتووە و خەون دەبینێت:** وەك ئەو کەسە وایە لەبەر ڕۆشنایی چرایەکدایە لە تاریکییەکی زۆردا، کاتێك خۆری لێ هەڵدێت تیشکەکەی زاڵ دەبێت بەسەر ڕۆشنایی چراکەدا، ئەو کات ڕۆشنایی چراکە بەراورد بە ڕۆشنایی خۆر زۆر کز و لاواز دەبێت.

نموونەی حاڵی خەوتن وەك ئەو کەسە وایە لەبەردەم ڕۆشنایی چراکەدایە و نموونەی حاڵی کەسی بەئاگا وەك ئەو کەسە وایە ڕۆژی لێبووەتەوە، کەسی بەئاگا ئەوەی لە باری خەوتنیدا وێنای کردووە دەهێنێتەوە یادی خۆی.

پاشان ئەو قسە و خوتوورانەی کە دێنە سەر دڵی لە کاتی خەوتنیدا جارێك لەوانەیە لەلایەن شەیتانەوە بێت و جارێك لە لایەن ئەندێشەکانی دەروون و جارێکیش لەلایەن فریشتەوەیە، جارێکیش ناساندنی ئەو حاڵانەیە لە دڵیدا لەلایەن خوداوە، **لە ڕیوایەتێکدا:** ((ڕاستترینتان لە خەوندا ئەو کەسەتانە لە هەمووتان ڕاستگۆتر بێت))

## بزانە خەون چەند بەشێکە:

**خەونی بێئاگایی**، و **خەونی عادەت** و **خەونی پەسەند**، خەو -لەبەر ئەوەی وەك مردن وایە- جۆرێك لە ناپەسەندی تێدایە(مەبەست پێی زیادەڕەوی لە خەودا)، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: ((خەو برای مردنە))

خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرمویت:﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ﴾ الأنعام: ٦٠

هەروەها دەفەرمویت:﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا﴾الزمر: ٤٢

**وتراوە:** گەر خێر لە خەوتندا هەبوایە بەهەشت خەوی تێدا دەبوو.

**وتراوە:** کاتێك خودا لە بەهەشتدا خەوی هەڵدایە سەر ئادەم حەوای لێ هاتە دەرەوە، هەموو بەڵا پێشهاتووەکانی بە هۆی حەواوە بووە.(ئەم قسەیە جێگەی لەسەر وەستانە و ناتوانین بەڕەهایی وەریبگرین)

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی ڕۆزباری بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** کاتێك ئیبراهیم بە ئیسماعیلی(علیهما السلام) فەرموو:﴿يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ

﴿ أَذْبَحُكَ ﴾ الصافات: ١٠٢، ئیسماعیل فەرمووی: باوکە گیان ئەمە سزای کەسێکە لە خۆشەویستەکەی خۆی خەتووە و بێئاگا بووە، گەر تۆ نەخەوتبای فەرمانت پێ نەدەکرا بە سەربڕینی کوڕەکەت.

**وتراوە: خودا وەحی بۆ داود (ﷺ) ڕەوانە کرد و پێی فەرموو:** هەر کەس بانگەشەی خۆشەویستی من دەکات کاتێك شەو داهات لە من بێئاگابێت و بخەوێت لەگەڵ من درۆی کردووە.

خەوتن دژی ئاگاهییە(واتە دژی زانینە)، بۆ ئەو مەبەستە **شیبلی وتوویەتی:** وەنەوزێك ڕسوایی هەزار ساڵە.

**دیسان شیبلی دەڵێت:** خودا تەماشای خەڵكی کرد و فەرمووی: هەر کەس بخەوێت بێئاگایە، هەر کەسیش بێئاگابێت بێبەشە.

شیبلی بۆ خۆی خوێی دەکردە چاوەکانییەوە تا خەوی تێنەزێت.

**وتراوە:** مورید خواردنی کاتی برسێتییە و خەوی زاڵبوونە بەسەریدا و قسەی بەپێی زەرووڕەتە.

**وتراوە:** کاتێك ئادەم لە خزمەتی خودادا نووست پێی وترا: ئەوە حەوا بۆ ئەوەی ئارامیت بۆ بێت لەگەڵی، ئەمە سزای ئەو کەسەیە لە خزمەتی خودادا خەوی لێدەکەوێت.

**هەروەها وتراوە:** گەر دڵت لە خزمەتی خودادا ئامادە بوو مەخەوە، چونکە خەو لە خزمەتی خودادا بێئەدەبییە، گەر دڵیشت ئامادە نەبێت ئەوا تۆ لە ئەهلی پەشیمانی و زیانۆمەندیت، کەسێکیش لە بەڵا و ناخۆشیدا بێت خەوی لێ ناکەوێت، بەڵام ئەهلی تێکۆشان خەوەکەیان صەدەقەیەکە لە خوداوە بۆ ئەوان، خودا شانازی دەکات بە بەندەیەکەوە گەر لە سوژدەکەیدا خەوی لێبکەوێت، و دەفەرموێت: سەرنجی ئەو بەندەم بدەن خەوتووە و ڕۆحی لای منە و جەستەی لەبەردەستمدایە.

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** واتە ڕۆحی لە جێگەی موناجاتدایە و جەستەی لەسەر ڕاخەری عیبادەت.

**وتراوە:** هەر کەس لەسەر پاکێتی(دەستنوێژ) بنوێت مۆڵەت بە رۆحی دەدرێت تەوافی عەرش بکات و سوژدە بۆ خودا(ﷻ) ببات، خودا(ﷻ) دەفەرمویت:﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۝٩﴾ النبأ: ٩

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت:** پیاوێك سکاڵای حاڵی خۆی کرد لە لای یەکێك لە گەورەپیاوان دەربارەی خەوی زۆر، ئەویش پێی وت: برۆ شوکری خودا بکە لەسەر عافییەت، زۆر نەخۆش هەیە بە هۆی ئازارەوە خەو ناچێتە چاوانیان.

**وتراوە:** هیچ شتێك بە ئەندازەی خەوی کەسی یاخی لە خودا ئازاری شەیتان نادات، دەڵێت: کەی بەئاگا دێت و هەڵدەستێت بە یاخیبوون لە خودا..

**هەروەها وتراوە:** باشترین حاڵی کەسی یاخی ئەوەیە بخەوێت، ئەو کات گەر کات لە بەرژەوەندی ئەو نەبێت لە دژیشی نابێت.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** شاهی کەرەمانی فێری شەونخونی(واتە شەو نەخەوتن) بووبوو، جارێکیان خەو زاڵ بوو بەسەر چاوەکانیدا و خودای(ﷻ) لە خەوندا بینی، دوای ئەوە زۆری لە خۆی دەکرد تاکو بخەوێت، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، ئەویش بە دێڕێك هۆنراوە وەڵامیدایەوە:

**رأيت سرور قلبي في منامي     فأحببت التنعس والمناما**

(سرووری دڵی خۆم لە خەوەکەمدا بینی، بۆیە وەنەوز و خەوم پێخۆشە)

**وتراوە:** پیاوێك دوو قوتابی هەبوو، دوو قوتابییەکە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، یەکێکیان وتی: خەو باشترە، چونکە مرۆڤ لەو حاڵەتەدا لە خودا یاخی نابێت، ئەویتریان وتی: ئاگاهی باشترە چونکە لەو حاڵەتەدا خودا دەناسێت.

هەردوو هاتن بۆ لای مامۆستاکەیان ئەویش پێی وتن: تۆ کە خەوت پێ باشترە لە ئاگاهی مردن باشترە بۆت لە ژیان، بەڵام تۆ کە ئاگاهیت پێ باشترە لە خەوتن ژیان بۆ تۆ باشترە لە مردن.

**وتراوه پیاوێك جاریەیەكی كڕی، كاتێـك شـەو داهـات وتـی:** جێگەیـەك رابخـە، جاریەكە وتی: ئەی گەورەی من، تۆ گەورەیەكت هەیە؟

وتی: بەڵێ، جاریەكە وتی: ئایا گەورەكەت دەخەوێت؟

وتی: نەخێر، جاریەكە وتی: ئەی تۆ شەرم ناكەی دەخەوی و گەورەكەت ناخەوێت؟!

**وتراوە:** كچەكەی سەعیدی كوڕی جوبەیر بە باوكی وت: بۆ ناخـەوی؟ ئـەویش وتـی: دۆزەخ ناهێڵێت بخەوم.

**وتراوە:** كچەكەی مالیكی كوڕی دینار بـە بـاوكی وت: بـۆ ناخـەوی؟ ئـەویش وتـی: باوكت لە خەوی شەو دەترسێت.

**وتراوە:** كاتێك رەبیعی كوڕی خەیسەم كۆچی دوایی كرد كچێك بە باوكی خـۆی وت: ئەو كۆڵەكەی لە ماڵی جیرانەكەماندا بوو بۆ كوێ برا(واتە بۆ دیارنەما)؟

باوكی وتی: ئەوە جیرانە صاڵحەكەمان بـوو لـە سـەرەتای شـەوەوە تـا كۆتاییەكـەی بەپێوە بوو، كچی جیرانەكە وایزانی بوو كۆڵەكەیە و لە ماڵەكەیاندایە، چونكە كچەكە تەنها بە شەودا سەر دەكەوتە سەر بانەكەیان و لەو كاتانەدا ئەوی بەپێوە بینی بوو.

**هەندێكیان دەڵێن:** هەندێ مانا لە خەوندا هەیە لە ئاگاهیـدا بـوونی نییـە، لەوانـە تیایدا بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەگات، هەروەها بە خزمەتی هاوەڵان و پێشـینان، هەموو كەسانە لە ئاگاهیدا نابینرێن، بە هەمان شێوە خودا(ﷻ) لە خەوندا دەبینێت، ئەمەش تایبەتمەندییەكی زۆر مەزنە.

**وتراوە:** ئەبوبەكری ئاجری خودای(ﷻ) لە خەوندا بـینی و پێـی فـەرموو: داواكـەت چییە بیكـە، ئـەویش وتـی: خودایـە، لـە هـەموو یاخیـانی ئومـەتی پێغەمبـەر(ﷺ) خۆشبییت، خودا(ﷻ) فەرمووی: من لەپێشترم بە تۆ بـۆ ئـەو كـارە، داواكـاری تـرت چییە بیڵێ.

**"الكتانی" دەڵێت:** لە خەوندا بە خزمەتی خودا(ﷻ) گەیشتم، پێی فەرمووك: هەر كەس بە شتێك خۆی بۆ خەڵكی جوان بكات و خودا پێچەوانەی ئەوە لە ئەودا ببینێت ئەوا خودا ئەو كەسە ناشیرین دەكات.

**دیسان کەتانی دەڵێت:** پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە خەوندا بینی وتم: دوعام لە لای خودا بۆ بکە دڵم نەمرێنێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەموو رۆژێك چل جار بڵێ: **"یا حي، یا قیوم، لا إله إلا أنت"**))

حەسەنی کوڕی عەلی(خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت) لە خەوندا عیسای(عليه السلام) بینی و پێی وت: دەمەوێت مۆرئەنگوستیلەیەك دروست بکەم، چی لەسەر بنووسم؟ فەرمووی لەسەری بنووسە: **"لا إله إلا الله الملك الحق المبين"** چونکە ئەوە لە کۆتایی ئینجیلدایە.

**لە ئەبی یەزیدی بوستامییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** خودام(عز وجل) لە خەوندا بینی، لێم پرسی رێگەی هاتن بۆ لای تۆ چۆنە؟

فەرمووی: نەفست وازلێبهێنە و وەرە.

ئەحمەدی کوڕی خەزرەوەی لە خەوندا پەروەردگاری بینی پێی فەرموو: ئەی ئەحمەد، هەموو خەڵکی داوام لێ دەکەن جگە لە ئەبو یەزید ئەو داوای خۆم دەکات.

**یەحیای کوڕی سەعیدی قەتان دەڵێت:** پەروەردگارم لە خەوندا بینی و وتم: پەروەردگارم، زۆرم داوا لێکردی وەڵامت نەدامەوە، خودا(سبحانه وتعالى) فەرمووی: ئەی یەحیا من پێمخۆشە گوێم لە دەنگت بێت.

**بیشری کوڕی حاریس دەڵێت:** لە خەوندا ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالبم(خودا لێی رازی بێت) بینی، پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئامۆژگاریم بکە، ئەویش فەرمووی: چەندە بەزەیی دەوڵەمەندان بەرانبەر هەژاران بۆ گەیشتن بە پاداشتی خودا چاك و باشە، باشتریش لەوە وێڵبوونی هەژارانە لە دەوڵەمەندان وەك متمانەیەك بە خودا(سبحانه وتعالى) وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران زیاتر ئامۆژگاریم بکە، ئەویش فەرمووی:

**قد كنت ميتا فصرت حيا وعن قريب تصير ميتا**

**عز بدار الفناء بيت فابن بدار البقاء بيتا**

(تۆ مردبووی بووی بە زیندوو، بەم نزیکانە دەبیت بە مردوو، لە خانەی تیاچووندا خانەیەك دەگمەنە، بۆیە لە خانەی مانەوەدا خانوویەك بینا بکە)

**وتراوە:** سوفیانی سەوری لە خەوندا بینرا پێی وترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟

ئەویش وتی: رەحمی پێکردم، پێی وترا: ئەی حاڵی عەبدوڵای کوڕی موبارەك چۆنە؟

وتی: ئەو لەوانەیە هەموو رۆژێك دوو جار دەچێت بۆ لای پەروەردگاری.

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** مامۆستا ئەبو سەهلی سەعلوکی لە خەوندا مامۆستا ئەبو سەهل زوجاجی بینی، مامۆستا زوجاجی لەوانە بوو دەیوت: گوناهی گەورە هەرگیز خودا لێی نابورێت، لێی پرسی خودا چی لەگەڵ کردی؟ ئەویش وتی: کارەکە لێرە زۆر ئاسانتر بوو لەوەی گومانمان بۆی دەچوو.

**حەسەنی کوڕی عاصمی شەیبانی لە خەوندا بینرا پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لە کەسی بەخشندەوە تەنها چاوەڕوانی بەخشندەیی دەکرێت.

لە خەوندا یەکێکیان بینی پرسیاری حاڵیان لێ کرد، ئەویش وتی:

**حاسبونا فدققوا ثم منوا فأعتقوا**

(دادگاییان کردین و وردەکارییان تێدا بەکارهێنا، پاشان منەتیان بەسەرماندا کرد و ئازادیان کردین)

**حەبیبی عەجمی لە خەوندا بینرا پێی وترا:** ئەی حەبیبی عەجمی تۆ مردی؟ وتی: ئەوە زۆر دوورە، عوجمەکە لادرا و لە نیعمەتدا مامەوە.

**وتراوە:** حەسەنی بەصری رۆیشتە مزگەوتێکەوە بۆ ئەوەی نوێژی مەغریب بکات، بینی ئیمامەکەیان حەبیبی عەجمییە، لە دواوەی نوێژی نەکرد، چونکە ترسا بە هۆی عوجمە(لەکە)ی زمانییەوە ئایەتەکان جوان دەرنەبڕێت، لەو شەوەدا خەونێکی بینی یەکێك پێی وت: بۆ لە دوای ئەو پیاوەوە نوێژ ناکەی؟

گەر نوێژت لە دوایەوە بکردبایە خودا لە هەرچی گوناهی تۆیە خۆش دەبوو.

**مالیکی کوڕی ئەنەس لە خەوندا بینرا پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: بە وشەیەك لێم خۆش بوو کە عوسمانی کوڕی عەفان(خودا لێی رازی بێت) لە کاتی جەنازەی کەسێکدا دەیفەرموو، ئەویش: **"سبحان الحي الذي لا يموت"** بوو.

**لەو شەوەدا حەسەنی بەصری تێدا مرد** لە خەوندا بینیان دەرگاکانی ئاسمان کرانەوە و بانگکەرێك بانگی کرد: دەزانن حەسەنی بەصری دێت بۆ لای خودا و خودا لێی رازییە.

**ئەبوبەکری کوڕی ئەشکیب دەڵێ**: مامۆستا ئەبو سەهلی سەعلوکیم لە حاڵێکی زۆر باشدا لە خەوندا بینی و پێم وت: ئەی مامۆستا بە چی بەم حاڵەتە گەیشتی؟ وتی: بە گومانی باشم بە پەروەردگارم.

**وتراوە:** جاحیز لە خەوندا بینرا، لێیان پرسی خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی:

**فلا تكتب بخطك غير شيء   يسرك في القيامة أن تراه**

(بە خەتی خۆت تەنها شتێك بنووسە لە رۆژی دواییدا بە بینینی دڵخۆش ببیت)

**وتراوە:** جونەید لە خەوندا ئیبلیسی بە رووتی بینی، پێی وت: تۆ شەرم ناکەی لە خەڵکی؟

ئیبلیس وتی: ئەوانە مرۆڤ نین، مرۆڤ ئەوانەن لە مزگەوتی شۆنزێن، لاشەیان لاواز کردووم و جگەریان سووتاندووم، جونەید دەڵێت: کە رۆژم لێ بوویەوە رۆیشتم بۆ مزگەوتی شۆنزیێ دەستەیەکم بینی سەریان خستبووە سەر ئەژنۆیان بیریان دەکردەوە، کاتێك منیان بینی وتیان: قسەی ئەو پیسە فریوت نەدات.

**لە دوای مردنی نەصرابادی لە مەککە لە خەوندا بینییان و پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: سەرزەنشت کرام وەك سەرزەنشتی گەورەپیاوان، پاشان بانگیان لێکردم: ئەی باوکی قاسم ئایا دوای بەیەکترگەیشتن جیابوونەوە هەیە؟

وتم: نەخێر ئەی **"ذا الجلال"**، هەر کە نرامە ناو گۆڕەکەوە بە خودای تاك و تەنها گەیشتم.

**لە خەوندا "ذو النون" بینرا و پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: لە دونیادا سێ پێویستیم لە خودا داوا دەکرد هەندێکی بۆ جێبەجێ کردم، رجام وایە ئەوەی ماوەتەوە پێم ببەخشێت، داوام لێ دەکرد پایەی ریزوانم پێ ببەخشێت، و خۆیم پێ ببەخشێت و لە جێگەی یەکێك لەوانەی بڕیاریداوە سزای بدات من سزا بدات و یادکردنی بە زمانی هەتاهەتاییم پێ ببەخشێت.

**وتراوه:** له خەوندا و لەدوای مردنی شیبلی بینرا و پێی وترا: خودا(ﷻ) چی لەگەڵ کردی؟

وتی: داوای بەڵگە و بورهانی لێ نەکردم لەسەر بانگەشەکان جگە لەسەر یەك شت، رۆژێك وتم: هیچ زیانۆمەندییەك بە ئەندازەی لەدەستدانی بەهەشت و چوونە ناو ئاگر گەورە نییە، پێم وترا: ئەی چ زیانۆمەندییەك لە زیانۆمەندی لەدەستدانی خودا گەورەترە؟

**گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی بوو دەیوت: "الجريري"** لە خەوندا جونەیدی بینی لێی پرسی: حاڵت چۆنە ئەی باوکی قاسم؟

وتی: هەموو ئەو ئاماژانە نەمان و هەموو گوزارشتەکان کۆتاییان پێهات، تەنها ئەو تەسبیحاتە مایەوە بەیانیان ئەنجامان دەدان.

**"الباجي"** دەڵێت: شەوێك حەزم لە شتێك بوو لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی کەسێك بڵێت: ئایا جوانە بۆ کەسێکی ئازادی خاوەن ویست خۆی زەلیل بکات بۆ کۆیلە، لە کاتێکدا ئەوەی ئەو دەیەوێت لە مەولاکەیەوە بەدەستی دەهێنێت؟!

**ئیبن جەلا دەڵێت:** چوومە شاری مەدینەی منەوەرە زۆرم برسی بوو، رۆیشتم بۆ لای گۆڕی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتم: من میوانی تۆم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بێئاگاییەکم بەسەردا هات و لە خەوندا پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی و کولێرەیەکی پێدام، لە خەونەکەدا نیوەیم خوارد کە بەئاگا هاتم نیوەکەی ترم بەدەستەوە بوو.

**یەکێکیان دەڵێت:** پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە خەوندا بینی دەیفەرموو: سەردانی "ئیبن عەون" بکەن، چونکە ئەو خودا و پێغەمبەری(ﷺ) خۆشدەوێت.

**وتراوە:** عوتبەی غولام لە خەوندا حورلعەینێکی لە شێوەیەکی زۆر جواندا بینی، حورلعەینەکە وتی: من عاشقی تۆم، تەماشا بکە کارێك ئەنجام نەدەی من و تۆ لەیەکتر دابڕێت، عوتبە وتی: دونیام بە سێ تەڵاق تەڵاقداوە و نایگێڕمەوە تا بە تۆ دەگەم.

**مەنصوور مەغریبی دەڵێت:** پیاوێکم لە وڵاتی شام بینی کەسێکی خاوەن شانوشکۆ بوو، ئەوەی زاڵ بوو بەسەریدا گرژبوون بوو، پێم وترا: گەر دەتەوێ ئەم پیاوە لەگەڵت کراوە بێت پێی بڵێ: خودا حۆرلعەینت پێ ببەخشێت، ئەو بەو دوعایە لێت رازی

دەبێت، لەو بارەیەوە پرسیارم کرد وترا: لە خەوندا حۆرلعەینی بینیوە، هێشتا لە دڵیدا ماوەتەوە، منیش رۆیشتم سەلامم لێکرد و وتم: خودا حۆرلعەینت پێ ببەخشێت، پیاوەکە لەگەڵم کرایەوە.

**وتراوە:** ئەیوب سوختیانی جەنازەی کەسێکی یاخیبووی بینی، رۆیشتە ئەشکەوتێکەوە تا ناچار نەبێت نوێژی لەسەر بکات، یەکێك لە خەوندا مردووەکەی بینی پێی وت: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: خودا لێم خۆش بوو و فەرمووی: بڵێ بە ئەیوب سوختیانی﴿ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّيٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ﴾الإسراء: ١٠٠

**وتراوە:** ئەو شەوەی مالیکی کوڕی دیناری تێدا مرد لە خەوندا بینرا وەك ئەوەی دەرگاکانی ئاسمان کرابنەوە و یەکێك دەیوت: ئاگادار بن مالیکی کوڕی دینار بووە بە دانیشتوانی بەهەشت.

**یەکێکیان دەڵێت:** ئەو شەوەی داوودی تائی تێدا مرد لە خەوندا بینیم فریشتەکان سەردەکەوتن و دادەبەزین، پرسیم: ئەم شەو چ شەوێکە؟

وتیان: ئەو شەوەیە داوودی تائی تێدا مردووە، بەهەشت خۆی رازاندووەتەوە بۆ دانیشتوانەکەی بە هۆی هاتنی رۆحی ئەوەوە.

**مامۆستا ئەبو قاسمی قوشەیری دەڵێت:** لە خەوندا مامۆستا ئەبو عەلی دەقاقم بینی لێم پرسی: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: بۆ لێخۆشبوون لێرە ترسی گەورە نییە، کەمترین پلەی ئێرە ئەوەیە بە "فلان" دراوە، ئەوە و ئەوەی پێدراوە.

لە خەوندا بۆم دەرکەوت ئەو فلانەی ناوی هێنا بە ناحەق کەسێکی کوشتبوو.

**وتراوە:** کاتێك **"کرز بن وبرة"** کۆچی دوایی کرد لە خەوندا بینرا وەك ئەوەی ئەهلی گۆڕستان لە گۆڕەکانیان هاتبنە دەرەوە و پۆشاکی سپی نوێیان پۆشی بێت، وتراوە: ئەمە چییە؟

له وەڵامدا وترا: ئەهلی ئەم گۆڕستانە پۆشاکی تازەیان پۆشیوە بۆ پێشوازی کردنی **"كرز بن وبرة"**.

**له خەوندا یوسفی کوڕی حوسەین بینرا پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لێمخۆش بوو، پێی وترا: به چی؟ وتی: چونکه هەرگیز کاری گرنگم بە کاری شۆخی تێکەڵ نەدەکرد.

**له خەوندا ئەبو عەبدوڵای زەڕاد بینرا پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: رایوەستاندم و هەرچی گوناهێك لە دونیادا ئەنجامم دابێت دانم پیادانا لێمخۆش بوو، جگە له یەك گوناه شەرمەکەم باسی بکەم، له ئارەقەدا رایوەستاندم تا گۆشتی روخسارم بەربوویەوە..

پێیوترا: ئەو گوناهە چی بوو؟

وتی: رۆژێك تەماشای کەسێکی جوانم کرد، شەرمم کرد باسی بکەم.

**ئەبو سەعیدی شەحام دەڵێت:** ئەبو تەیب سەهل سەعلوکیم لە خەوندا بینی پێم وت: ئەی شێخ، وتی: واز له وشەی شێخ بهێنە، وتم: ئەی ئەو حاڵانەی کە موشاهەدەت کرد؟

وتی: هیچ سوودی نەبوو، وتم: چی لەگەڵ کردی؟ وتی: خودا لێمخۆش بوو بەو پرسیارانەی خەڵکی رەشۆکی دەیانکرد و وەڵامم دەدانەوە.

**ئەبوبەکری رەشیدی فەقیه دەڵێت:** محەمەدی تووسی مامۆستام لە خەوندا بینی پێی وتم: به **"أبي سعيد الصفار المؤدب"** بڵێ:

**وكنا على أن لا نحول عن الهوى فقد،**

**وحياة الحب حلتم، وما حلنا**

**تشاغلتم عنا بصحبة غيرنا**

**وأظهرتم الهجران ما هكذا كنا**

**لعل الذي يقضي الأمور بعلمه**

**سيجمعنا بعد الممات كما كنا**

(کاتی خۆی بڕیارمان وابوو له خۆشەویستی یەکتر لانەدەین، بەڵام ئێوە هەڵتانوەشاندەوە و ئێمە هەر وەك خۆمان ماوین، بە هۆی هاوەڵی کەسانی ترەوە لە ئێمە سەرقاڵبوون و کۆچتان نیشاندا و ئێمە بەو جۆرە نەبووین، بەڵکو ئەو کەسەی بە زانستی خۆی بڕیارەکان دەردەکات لە دوای مردن کۆمانبکاتەوە وەك چۆن بووین لەگەڵ یەکتر)

**دەڵێت:** بەئاگاهاتم ئەوەم بۆ ئەبو سەعیدی صافار گێڕایەوە، وتی: هەموو رۆژێکی هەینی سەردانی گۆڕەکەیم دەکرد ئەم جومعەیە نەمتوانی سەردانی بکەم.

**یەکێکیان دەگێڕێتەوە وتوویەتی:** لە خەونـدا پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی و دەستەیەك لە هەژاران لە دەوری دانیشتبوون، کاتێك لەو حاڵەتەدا بوو دوو فریشتە لە ئاسمانەوە دابەزین، تەشتێك بە دەستی یەکێکیانەوە بوو، مەسینەیەکیش بە دەستی ئەویتریانەوە بوو، تەشتەکە خرایە بەردەم پێغەمبەری خودا(ﷺ) و دەستی شۆری، پاشان دوو فریشتەکە فەرمانیان کرد هەموو هەژارەکان دەستیان شۆری، پاشان تەشتەکە خرایە بەردەم من، یەکێکیان بەویتریانی وت: ئاو مەکە بە دەستیدا، چونکە ئەم کەسە لە ئەوان نییە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا لە تۆوە ریوایەت نەکراوە فەرمووتە: ((مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە خۆشیدەوێت؟)) فەرمووی: با، منیش وتم: دەی من تۆم خۆشدەوێت، و ئەو هەژارانەم خۆشدەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئاو بکە بە دەستیدا ئەویش لەمانە.

**لە یەکێکیانەوە دەگێڕنەوە دەیوت:** هەمیشە عافییەت، عافییەت، پێیوترا: مانای ئەم دوعایە چییە؟ وتی: لە سەرەتای گەڕانەوەم بۆ لای خودا حەماڵ بووم، رۆژێك فەردە ئاردێکم دەگواستەوە، لە شوێنێك پاڵمدایەوە پشوویەك بدەم، لەبەرخۆمەوە دەموت: ئەی پەروەردگار، گەر هەموو رۆژێك بەبێ ماندبوون دوو کولێرەت پێدابام بەشی منی دەکرد، لەناکاو دوو پیاو بوو بە شەڕیان، منیش چوومە پێشەوە ناوبژییان بکەم، یەکێکیان شتێکی کێشا بە سەرمدا کە دەیویست بیکێشێت بەسەر ئەویتردا، روخسارم خوێناوی بوو، شورتە هات و هەردووکیانی برد، کاتێك منی بینی خوێناوی بووبووم منیشی لەگەڵ خۆی برد وای گومان برد من لەگەڵیان شەڕم کردووە، لەوێ هەڵیدامە ناو بەندیخانە، ماوەیەك مامەوە هەموو رۆژێك دوو کولێرەیان پێ دەدام،

شەوێك لە خەونمدا کەسێکم بینی پێی وتم: تۆ داوای دوو کولێرەت کرد هەموو ڕۆژێ بەبێ ماندبوون، بەڵام داوای عافییەتت نەکرد، ئەوەی داوات کرد پێتدرا، بەئاگاهاتم و وتم: عافییەت، عافییەت، بینیم لە دەرگای بەندیخانەکە دەدەن، وتیان: کوا عومەری حەماڵ؟ بەریاندام و رزگاریان کردم.

**لە "کەتانی"یەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** پیاوێك لە هاوەڵانمان تووشی چاوئێشە بووبوو، وتیان: بۆ چارەسەرێکی ناکەی؟

وتی: بڕیارمداوە چارەسەری نەکەم تا خۆی چاکدەبێتەوە، دەڵێت: لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی یەکێك بڵێت: گەر ئەو سووربوون و لێبڕانەی بۆ هەموو ئەهلی دۆزەخ بوایە هەموویانمان لە ئاگر رزگار دەکرد.

**لە جونەیدەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی قسە بۆ خەڵکی دەکەم، فریشتەیەك بەسەرمەوە وەستا و وتی: ئەو شتە چییە لە هەموو شت زیاتر لە خودا پێی نزیکدەبنەوە؟

منیش وتم: کردارێکی شاراوە بە ترازوویەکی تەواو و سەرڕاست، دەڵێت: فریشتەکە رۆیشت و دەیوت: قسەیەکی زۆر دروست بوو، سوێند بە خودا.

**پیاوێك بە عەلای کوڕی زیادی وت:** لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی تۆ ئەهلی بەهەشت بیت، وتی: لەوانەیە شەیتان فێڵێکی لە ژوورسەردا بووبێت و منیش خۆم لێ پاراستبێت، ئێستا پیاوێکی دیاریکراوی هەڵبژاردووە تاکو مەرامەکەی خۆی بهێنێتە جێ و گومڕام بکات.

**وتراوە لە خەوندا "عطاء السلمي" بینرا پێی وترا:** تۆ حوزن و دڵتەنگییەکی زۆرت هەبوو، خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: سوێند بە خودا ئەو حوزن و دڵتەنگییە پشوویەکی دوورودرێژ و خۆشییەکی هەمیشەیی بۆ بەدەستهێنام، پێی وترا: تۆ لە چ پلەیەکدای؟ وتی:﴿مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ﴾النساء: ٦٩

**وتراوە ئەوزاعی لە خەوندا بینرا وتی:** لێرە هیچ پلەیەك بە ئەندازەی پلەی زانایان بەرزتر نییە، لە دوای ئەوان پلەی دڵتەنگان.

**ناجی دەڵێت:** لە خەوندا پێم وترا: هەر کەس لە ڕۆژییەکەیدا متمانەی بە خودا هەبێت ئەخلاقی باشی خۆی زیاد دەکات و لە خەرجکردندا دەروونی بەخشندە دەبێت و لە نوێژدا وەسوەسەی زۆر کەم دەبێت.

**وتراوە لە خەوندا زوبەیدەی(ژنی هاروونە ڕەشید) بینرا پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: لێمخۆش بوو، وترا: بەو خەرجی و بەخشینە زۆرەی لە ڕێگەی مەککە ئەنجامت دا؟

وتی: نەخێر، پاداشتی ئەو خەرجیانە گەڕانەوە بۆ سەر خاوەنەکانیان، بەڵام خودا بە نییەتەکەم لێمخۆش بوو.

**لە خەوندا سوفیانی سەوری بینرا پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: یەکەمین هەنگاوم نایە سەر پردی سیرات، دووەم هەنگاو لە بەهەشت بووم.

**ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری دەڵێت:** لە خەوندا جاریەیەکم بینی جوانی لەو جۆرەم هەرگیز نەبینی بوو، ڕوخساری نووری لێ دەدرەوشایەوە، وتم: چەندە ڕوخسارت نوورانییە! وتی: ئەو شەوەت لەبیرە تیایدا دەگریای؟

وتم: بەڵێ، وتی: ئەو شەوە هاتم و فرمێسکەکانی تۆم هەڵگرتەوە و هێنام بە ڕوخسارمدا و ڕوخسارم بەم جۆرەی لێهات.

**وتراوە:** لەخەوندا یەزیدی قورشی بەخزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)گەیشت، قورئانی بەسەردا خوێندەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئەمە خوێندن، ئەی کوا گریان؟

**جونەید دەڵێت:** لە خەوندا دوو فریشتەم بینی لە ئاسمانەوە هاتنە خوارەوە، یەکێکیان پێی وتم: صدق چییە؟

وتم: وەفاکردنە بە پەیمان، ئەویتریان وتی: ڕاست دەکات، پاشان بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان.

**لە خەوندا بیشری حافی بینرا، پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لێمخۆش بوو، و پێی فەرمووم: ئەی بیشر شەرم ناکەی لە من ئەو هەموو ترسەت لە من هەبوو؟!

**وتراوە:** ئەبو سولەیمانی دارانی لە خەوندا بینرا پێی وترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: لێمخۆش بوو، هیچ شتێك بە ئەندازەی قسە و ئاماژەی ئەم دەستەیە زیانی پێنەگەیاندم.

**عەلی کوڕی موفەق دەڵێت:** ڕۆژێك بیرم دەکردەوە لە گوزەرانی خانەوادەکەم و ئەو هەژارییەی تێیکەوتوون، لە خەوندا پارچە کاغەزێکم بینی تێیدا نووسرا بوو: ((بسم الله الرحمن الرحیم، ئەی کوڕی موفەق، لە هەژاری دەترسی و من پەروەردگارتم؟!))

کاتی بەرەبەیان پیاوێك هات بۆ لام و کیسەیەك پارەی پێدام پێنج هەزار دیناری تێدا بوو، پێی وتم: بیگرە ئەی یەقین لاواز.

**جونەید دەڵێت:** لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی لەبەردەم خودادا(ﷻ) رایانوەستاندم، خودا پێی فەرمووم: ئەی باوکی قاسم، ئەم قسانەت لە کوێ هێنا کە دەتوتن؟ وتم: تەنها حەقم دەوت، خودا(ﷻ) فەرمووی: راست دەکەی.

**ئەبوبەکری کەتانی دەڵێت:** لە خەوندا گەنجێکم بینی، هەرگیز لەوە جوانترم نەبینی بوو، پرسیم: تۆ کێی؟

وتی: تەقوا، وتم: لە کوێ نیشتەجێ دەبی؟

وتی: دڵی هەموو کەسێکی دڵتەنگ، پاشان لامکردەوە ژنێکی رەشم بینی هەرگیز لەوە نامۆترم نەبینی بوو، پرسیم تۆ کێی؟

وتی: پێکەنین، وتم: لە کوێ نیشتەجێ دەبیت؟

وتی: هەموو دڵێکی خۆشحاڵی بەزمچی، دەڵێت: بەئاگاهاتم و بڕیارمدا تەنها لە زاڵبوونی پێکەنیندا پێبکەنم.

**عەبدوڵای کوڕی خەفیف دەڵێت:** لە خەوندا پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی وەك ئەوەی پێم بڵێت: هەر کەس ڕێگەی خودا بناسێت و بیگرێتە بەر، پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە خودا سزایەکی دەدات سزای هیچ کەسی بەو جۆرە نەدابێت.

**لە خەوندا شیبلی بینرا، پێی وترا:** خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: ئەوەندە لەسەر کار و کردەوەکانم دادگایی کردم و وردبوویەوە تا بێهیوابووم، کاتێك منی بینی بێهیوابووم بە رەحمی خۆی داپپۆشیم.

**ئەبو عوسمانی مەغریبی دەڵێت:** لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی کەسێك بڵێت: ئەی ئەبو عوسمان لە هەژاریدا لە خودا بترسە، با ئەندازەی دەنکە کونجییەکیش بێت.

**وتراوه:** ئەبو سەعیدی خەراز کوڕێکی هەبوو بەر لـە خـۆی کۆچـی دوایـی کـرد، لـە خەوندا بینی پێی وت: کوڕی خۆم ئامۆژگاریم بکە.

وتی: باوکە گیان، ترسنۆکانە مامەڵە لەگەڵ خودا مەکە.

وتی: کوڕی خۆم بۆم زیاد بکە.

وتی: باوکە گیان سەرپێچی لە خودا مەکە لەوەی فەرمانی پێکردووی.

وتی: زیاترم بۆ باس بکە.

وتی: کراسێك لە نێوان خۆت و خودادا دامەنێ.

لە دوای ئەو خەونە ئەبو سەعید سیساڵ کراسی لەبەر نەکرد.

**وتراوە:** یەکێکیان لە دوعاکانیدا دەیوت: خودایە، شتێك زیان بـە تـۆ ناگەیـەنێت و قازانج بە ئێمە دەگەیەنێت لێمان مەگرەوە، لە خەونـدا بـینی وەك ئـەوەی پێـی وتـرا: تۆش ئەو شتەی زیانت پێ دەگەیەنێت و سوودت پێ ناگەیەنێ وازی لێ بهێنە.

**لە ئەبو فەزڵی ئەصفەهانییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) لـە خەوندا بینی، وتم:** ئەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) داوام لـە خـودا بـۆ بکـە ئیمـانم لـێ وەرنەگرێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە کارێکە لە لای خودا کۆتایی پێهاتووە.

**لە ئەبو سەعیدی خەرازەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** لە خەوندا ئیبلیسم بـینی، عەسـاکەم هەڵگرت لێیبدەم، پێم وترا: ئەو لەوە ناترسێت، ئەو لە نوورێك دەترسێت لە دڵدا بێت.

**یەکێکیان دەڵێـت:** دوعـام بـۆ رابیعـەی عـەدەوی دەکـرد، لـە خەونـدا بینـیم دەیـوت: هەدیەکانت لەسەر سینی نوورین کە بە دەسماڵی نوورین داپۆشراون بۆمان رەوانە دەکرێن.

**لە سەماکی کوڕی حەربەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:** چاوەکانم لەدەستدا، لە خەوندا بینـیم وەك ئەوەی کەسێك پێم لێت: بچۆ بـۆ سـەر رووبـاری فـورات، خـۆتی تێـدا نـوقم بکـە، و چاوەکانت بکەرەوە، منیش کە بەئاگاهاتم ئەو کارەم ئەنجامدا و چاوەکانم بۆ گەڕانەوە.

**وتراوە:** لە خەوندا بیشری حافی بینرا پێی وترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: کاتێك پەروەردگارم(ﷻ) بینی پێی وتم: مەرحەبا ئەی بیشر، ئەو رۆژەی تـۆم مرانـد کەسـێك لەسەر زەویدا نەبوو لە تۆ خۆشەویستر بێت لەلام.

# دەروازەی حەوتەم

## وەسیەت بۆ موریدان و سەرنج و مەشخەڵ

خودا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:

﴿ ولا تطيع من اغفلنا قلبه عن ذكرنا ﴾

الكهف: ٢٨

# بەشی یەکەم

## وەسیّت بۆ موریدان

**مامۆستا قوشەیری دەڵێت:** کاتێك هەندێك لە ژیان و رەوگەی ئەم دەستەیەمان باس کرد و چەندین دەروازەی مەقامەکانمان خستە پاڵی، ئێستا دەمانەوێت ئەم رسالەیە(پەیام) بە وەسیّت بۆ موریدان کۆتایی پێبهێنین، داوامانە لە خودا(ﷻ) کۆمەکیان بکات بۆ بەکارهێنان و کارپێکردنی، و ئێمەش بێبەش نەکات لە هەستان پێی و پیادەکردنی و خودا(ﷻ) نەیکات بە بەڵگە لەسەرمان.

❖ **یەکەمین مەقامی مورید لەسەر ئەم رێگەیە پێویستە لەسەر صدق بێت،** بۆ ئەوەی بیناکەی لەسەر بنچینە و بنەڕەتێکی راست و دروست دابمەزرێنێت، گەورەپیاوان دەڵێن: ئەوانە بۆیە نەگەیشتن، چونکە بنەڕەتەکانیان پشتگوێخست.

**هەر بەو جۆرە گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** پێویستە سەرەتاکەی بە راستکردنەوەی بیروباوەڕ لە نێوان خۆی و خودا(ﷻ) دەست پێبکات، بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد لە گومان و تەمومژ، خاڵی لە گومڕایی و بیدعە، دەرچوو لە بەڵگەی یەکلاکەرەوە و بورهانی گومانبڕەوە.

❖ **ناشیرینە بۆ مورید خۆی بداتە پاڵ مەزهەبێك لە مەزهەبەکان بەشێك نەبێت لەم رێگەیە،** خۆدانە پاڵی کەسی سۆفی بۆ مەزهەبێك لە مەزهەبە لەیەکتر جیاوازەکان جگە لە رێگەی سۆفیگەری، هیچی تر نییە جگە لە بەری نەزانینی بە مەزهەبەکانی ئەهلی ئەم رێگەیە، پیاوانی ئەم رێگەیە بەڵگەکانیان لە هەموان بەهێزتر و ئاشکراترن و رێساکانی مەزهەبەکانیان بەهێزترن لە رێساکانی هەموو مەزهەبەکانی تر.

خەڵکی یان خاوەنی گواستنەوە و ریوایەتن، یان خاوەنی ژیری و بیرکردنەوەن.

پیاوانی ئەم دەستەیە لەم دوو رێگەیە بەرزبوونەتەوە، ئەوەی بۆ خەڵکی نادیارە بۆ ئەوان روون و ئاشکرایە، ئەوەی لە مەعریفە بۆ خەڵکی بە مەبەستگیراوە ئەوان لە

خوداوه(ﷻ) بەدەستیان هێناوە، ئەوان ئـەهلی ویصالـن(گەیشـتن بـە دیـدار) و خـەڵکی ئەهلی ئیستدلالن(بەڵگەهێنانەوە).

هەموو سەردەمێکی ئیسلام گەورەپیاوێکی ئەم دەستەیەی تێدایە، ئەوانەی زانسـتی یەکتاپەرستیان هەیە و ئیمامەتی ئەم دەستەیە دەکەن زانایان خۆیان رادەسـتکردوون و تەوازوعیان بۆ نواندوون و لە فەڕ و بەرەکەتی ئەوان بەهرەمەند بوون.

گـەر پیـاوانی ئـەم رێگەیـە تایبەتمەنـدی و بەهرەمەنـدیان نەبوایـە کارەکـە بـە پێچەوانەوە دەبوو.

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەلای شافیعی بوو(خوایـان لـێ رازی بێـت) شـەیبانی راعی هات، ئەحمەد(رەحمەتی خودای لێ بێت) وتی:** ئەی باوکی عەبدوڵا(مەبەسـتی ئیمامی شافیعییە) دەمەوێت ئەم شوانە لەسەر کەمی زانستەکەی بـەئاگا بهێـنم، بـۆ ئەوەی هەندێك بە زانستەوە خەریك بێت.

شافیعی وتی: وا مەکە.

**بەڵام ئەحمەد سووربوو لەسەر بڕیارەکەی خۆی و وتی بـە شـەیبان:** چـی دەڵێیـت دەربارەی کەسێك لە شەو و رۆژێکدا یەکێك لە پێنج نوێژەکەی لەبیربچـێت و نـەزانێت کامیانی لەبیرچووە، چی پێویست دەبێت لەسەری ئەی شەیبان؟

**شەیبان وتی:** ئـەی ئەحمـەد، ئـەوە دڵێکـە لـە خـودا بێئاگـابووە، پێویسـت ئەوەیـە ئەدەبدابدرێت تاکو جارێکی تر لە مەولای خۆی بێئاگا نەبێت..

**ئەحمەد بوورایەوە.. کاتێك بەئاگاهات، ئیمـامی شـافیعی(رەحمەتی خـودای لـێ بێت) پێی وت:** من پێم نەوتی ئەو کەسە مەجووڵێنە.

**شـــەیبانی راعـــی** کەسـێکی نەخوێنـدەوەری ئـەم رێگەیـە بـوو، گــەر حـاڵی نەخوێندەوارەکەیان بەم جۆرە بێت دەبێ گومان بە ئیمامەکانیان چی بێت؟!

**دەگێڕنەوە فەقیهێك** لە فەقیهە گەورەکان ئەڵقەی زانستەکەی بەپاڵ ئەڵقەی زیکـری شیبلییەوە بوو لە مزگەوتی مەنصوور، بەو فەقیهـەیان دەوت ئـەبو عیمـران، ئەڵقـەی زانستەکەیان بە هۆی قسەی شیبلییەوە پەکی دەکەوت..

**هـاوەڵانی ئـەبو عیمـران پرسـیاری حـەیزیان لـە شـیبلی کـرد** و دەیانویست شەرمەزاری بکەن، ئەویش قسەی خـەڵکی لـەو بابەتـەدا خسـتەڕوو و جیاوازییـەکانی ئاماژە پێکرد..

**ئەبو عیمران هەستا و سەری شیبلی ماچ کرد و وتی:** ئەی ئەبوبەکر لەم بابەتـەی تۆ باست کرد دە شت فێربووم کە لە هیچ جێگەیەك نەمبیستوون، لە کۆی ئـەوەی تـۆ وتت تەنها سێ خاڵم لەلا بوو.

**وتراوە:** فەقیهی مەزن ئەبو عەباسـی کـوڕی سـورەیج بـەپاڵ دانیشـتنێکی جونەیـدا گوزەری کرد(خودا رەحم بە هەردووکیان بکات)، گوێی لە قسەکانی جونەید بوو، پێـی وترا(واتە بە ئەبو عەباس) چی دەڵێیت دەربارەی ئەو قسانەی جونەید؟

وتی: نازانم چی دەڵێت، بەڵام پێموایە ئەو قسانە هێز و پێزێکیـان هەیـە لـە هێـز و پێزی قسەی دەمبەتاڵ ناچێت.

**بە عەبدوڵای کوڕی سەعید وترا:** تۆ قسە لەسەر قسەی هەموو کەس دەکەی، لێرە پیاوێك هەیە پێی دەوترێت جونەید، تەماشـایەکی بکـە بزانـە بەرهەڵسـتی قسـەکانی دەکەی یان نە؟ ئەویش لە ئەڵقەیەکیدا ئامادە بوو..

**پرسیاری یەکتاپەرستی لە جونەید کرد** ئەویش وەڵامیدایەوە، عەبدوڵا سەرسام ما و وتی: ئەوەی وتت بۆم دووبـارە بکـەرەوە؟ ئـەویش دووبـارەی کـردەوە بـەڵام نـەك بـە گوزارشتەکەی یەکەمجاری..

**عەبدوڵا وتی:** ئەمە شتێکی تر بوو نەمبیستبوو، جارێکی تر بۆم دووبارە بکەرەوە؟ جونەید بە گوزارشتێکی تر بـۆی سـێبارە کـردەوە، عەبـدوڵا وتـی: نـاتوانم ئـەوەی تـۆ دەیڵێی لەبـەری بکـەم، جـارێکی تـر بۆمـان بڵێـرەوە، جونەیـد وتـی: گـەر ڕێگەکـەت بگرتبایەتە بەر بۆم دەوتییەوە، عەبدوڵا هەستا و دانی بە گەورەیی زانستی "جونەید" و بەرزی شان و شکۆیدا نا.

گەر بنچینە و بنەڕەتەکانی ئەم دەستەیە راستترین بنچینە و بنەڕەت بن و پیاوانیانی ئەم ڕێگەیە لە مەزنان بن و زاناکانیان زاناترین کەس بن ئەوا ئـەو موریـدەی بـاوەڕ و

متمانەی بە ئەوان هەیە: گەر ئەهلی سلوك و سەرکەوتن بێت بۆ لای مەبەست و مەرامەکانی ئەوان بەشداری دەکات لەوەی ئەوانی پێ تایبەت بووە لە پەردەلادان لەسەر نهێنی و پەنهانەکان و ئاتاج نابێت بە مشەخۆری لەسەر کەسانێکی تر کە لە دەرەوەی ئەم دەستەیەوەن، گەر دەیەوێت رێگەی شوێنکەوتن(چاولێگەری) بگرێتەبەر و سەربەخۆ نییە لە حالّی خۆی، و دەیەوێت لە نیشتمانی تەقلیدەوە بەرز ببێتەوە تا دەگاتە تەحقیق ئەوا پێویستە چاو لە پێشینی خۆی بکات و لەسەر رێگەی ئەم دەستەیە بڕوات، چونکە ئەمان لەپێشترن بە ئەو تا کەسانی تر.

**شیبلی دەڵێت:** گومانت چییە بە زانستێك زانایان دەزانن تۆمەتی تێدایە؟!

**هەروەها جونەید دەڵێت:** گەر بزانم لە شوێنێکی ژێر ئەم ئاسمانەدا خودا زانستێکی هەیە باڵاتر و بەنرختر لەم زانستە کە ئێمە لەگەڵ هاوەڵان و برایانمان قسەی لێ دەکەین هەوڵم دەدا خۆمی پێ بگەیەنم و دەمکردە مەرام و مەبەستی خۆم و رووم لێ دەکرد.

❖ **کاتێك مورید باوەڕی لە نێوان خۆی و خودا(ﷻ) دادەمەزرێت پێویستە زانستی شەریعەت بەدەست بهێنێت**، جا یان بە تەحقیق یان بە پرسیارکردن لە ئیمامان تاکو بتوانێت فەرزەکانی پێ بەجێبهێنێت، گەر فتوای زانایان جیاوازی لە نێواندا بوو با رێگەی دەرچوون لە جیاوازی بگرێتە بەر، چونکە روخسەت بۆ لاوازان و خاوەن پێویستی و سەرقاڵییەکانە.

کەسانی ناو ئەم دەستەیە کارێکی تریان نییە جگە لە هەستان بە مافی خودا(ﷻ)، بۆیە وتراوە: گەر هەژار(مەبەستی سۆفی) لە پلەی حەقیقەت دابەزی بۆ پلەی روخسەت لە شەریعەت ئەوا گرێبەستەکەی لەگەڵ خودا هەڵوەشاندووەتەوە و پەیمانەکەی شکاندووە لە نێوان خۆی و خودادا(ﷻ).

❖ **پاشان پێویستە مورید لە خزمەتی شێخێکدا خۆی ئەدەب دابدات**، گەر مامۆستای نەبێت هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، ئەوە ئەبو یەزیدە دەڵێت: هەر کەس مامۆستایەکی نەبێت ئیمامەکەی بریتییە لە شەیتان.

**هەروەها گوێم لە مامۆستا ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیوت:** درەختێك گەر خۆڕسك بڕوێت و کەسێك نەینێژێت نە گەڵا دەگرێت و نە بەر دەدات، موریدیش هەر بەو جۆرەیە، گەر مامۆستایەکی نەبێت هەنگاو بە هەنگاو ڕێگەکەی لێ وەربگرێت ئەو کەسە بەندەی ئارەزووەکانی خۆیەتی و رزگاری بەدەست ناهێنێت.

❖ **پاشان گەر سلوکی دەوێت لەدوای هەموو ئەوەی ئاماژەمان پێکرد پێویستە لە هەموو هەڵە و گوناه و خراپەکانی تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خودا(ﷻ)، هەموو هەڵە و خراپەکان وازلێبهێنێت:** ئەوەی پەنهانە و ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەی بچووکە و ئەوەی گەورەیە، سەرەتا هەوڵبدات ئەوانەی مافیان پێشێلکراوە مافیان بۆ بگێڕێتەوە و گەردنی خۆی لەلایان ئازاد بکات، هەر کەس نەیارەکانی خۆی رازی نەکات لەسەر ئەم ڕێگەیە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت و هیچ شتێك بە روویدا ناکرێتەوە.

❖ **بەم جۆرە ڕێگە دەگرنەبەر، پاشان دەست دەکات بە بڕینی پەیوەستبوونەکان و سەرقاڵییەکانی**، چونکە بینای ئەم ڕێگەیە لەسەر خاڵیبوونەوەی دڵە.

**شیبلی لە سەرەتای سلوکەوە دەیوت بە "الحصري":** گەر لە جومعەیەکەوە بۆ جومعەیەکی تر کە دێی بۆ لام شتێکی تر جگە لە خودا هات بە بیر و خەیاڵتدا حەرامە لەسەرت لەلام ئامادە ببیت.

**گەر ویستی لە پەیوەستبوونەکان بێتە دەرەوە ئەوا سەرەتاکەی:** پێویستە لە ماڵ و سامان بێتە دەرەوە، چونکە ماڵ و سامان ئەو شتەیە لە حەق(ﷻ) لایدەدات، هەر موریدێك هاتبێتە ناو ئەم رەوگەوە و پەیوەندی لەگەڵ دونیا هەبووبێت ئەو پەیوەندییە بەزوویی دەیگێڕێتەوە بۆ ناو ئەوەی لێیەوە هاتووە، کاتێك لە ماڵ و سامان هاتە دەرەوە پێویستە لەسەری لە پلە و پایە بێتە دەرەوە، چونکە سەرنجدانی پلە و پایە ڕێگرێکی گەورەی سەر ئەم ڕێگەیە.

گەر قبووڵکردن و رەدکردنەوەی خەڵکی لەلای مورید یەکسان نەبێت هیچی لێوە بەرهەم نایەت، بەڵکو گەورەترین زیان بۆ ئەو سەرنجدانی خەڵکییە بۆ ئەو بە چاوی

مەزنی و بەفەڕبوون پێی بە هـۆی مایەپووچـی خـەڵکی لـەم مەیدانـەدا، ئـەو هێشـتا ویستی نەهاتووەتە راستە ئیتر چۆن دەبێتە کەسێکی خاوەن فەڕ و بەرەکەت؟!

دەرچـوون لــە خۆشەویســتی پلــە و پایــە لەســەریان پێویســتە، چــونکە ژەهرێکــی کوشندەیە بۆ ئەوان.

جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەو کەسەی خودای(ﷻ) دەوێت لەگـەڵ ئـەو کەسـەی پلـە و پایەی دونیایی یان دوارۆژی بۆ خۆی دەوێت.

# بەشی دووەم

## چەند سەرنجێکی ورد لەمەڕ مامۆستا و شاگرد

کاتێـــك موریـــد لـــە خۆشەویســـتی مـــاڵ و پلـــە و پایـــە هاتـــە دەرەوە پێویســـتە گرێبەستەکەی لە نێوان خۆی و خودا(ﷻ) راستبکاتەوە و سەرپێچی لە شێخەکەی نەکات لە هەموو ئەو شتانەی بۆ ئەو ئاماژەی پێ دەکات، چونکە سەرپێچی مورید لە سەرەتای رێگەوە زیانێکی زۆر گەورەیە، چونکە سەرەتای دەستپێکردنی حاڵی بە درێژایی تەمەن درێژ دەبێتەوە.

لة مةرجي طويَرايةلَي بؤ شيَخةكةي ئةوةية:

لە دڵیدا بەرانبەر بە شێخەکەی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك بوونی نەبێت، گەر بە خایله و خوتوورەی موریددا تێپەڕی لە دونیادا یان لە دوارۆژدا بەها و نرخێکی هەیە یان لەسەر ئەم راخەری زەوییە کەسێك هەیە لەخوار ئەوەوە ئەوا لە ویستدا هەنگاوێکی بە دروستی بۆ هەڵناگیرێت، چونکە پێویستە بکۆشێت، نەك بۆ ئەوەی رێز و قەدرێك بۆ نەفسی خۆی بەدەست بهێنێت.

پاشان پێویستە مورید پارێزگاری لە هەموو نهێنییەکانی خۆی بکات و لای هیچ کەس باسیان نەکات جگە لای شێخەکەی، گەر هەناسەیەك لە هەناسەکانی لە شێخەکەی بشارێتەوە ئەوا ناپاکی لە هاوەڵێتی کردووە، گەر سەرپێچی لێوەشایەوە لەوەی شێخەکەی ئاماژەی پێکردووە پێویستە بە زووترین کات لەبەردەمیدا دانی پیادا بنێت، پاشان خۆی رادەستی ئەو سزایە بکات شێخەکەی بۆی دەردەکات لەسەر تاوان و سەرپێچییەکەی، جا سزاکە یان بە سەفەرێك دەبێت پێویستە بیگرێتە بەر یان هەر شتێکی تر شێخەکەی بە گونجاوی ببینێت.

بۆ مامۆستایان دروست نییە چاوپۆشی لە هەڵە و تێکەوتنەکانی موریدانیان بکەن، چونکە ئەوە بەفیڕۆدانی مافی خودایە، هەتا مورید خۆی لە هەرچی پەیوەندییە دانەڕنێت بۆ شێخەکەی دروست نییە شتێك لە ئەزکاری فێر بکات،

بەڵکو پێویستە لەلایەن شێخەکەیەوە مووریدەکە ئەزموون بکرێت، گەر دڵی شاهیدی دا بۆ مووریدەکە بە دروستی سووربوون و لێبڕانی ئەو کات لەسەری بەمەرج دەگرێت رازی بێت بەوەی لەسەر ئەم رێگەیە رووی لێ دەکات لە جۆراوجۆری هونەرەکانی قەزای خودایی، ئەو کات پەیمانی لێ وەردەگرێت لەسەر ئەم رێگەیە لانەدات بەهۆی ئەو زیان و زەلیلی و هەژاری و نەخۆشی و ئازارانەوە رووی لێ دەکەن، هەروەها پەیمانی لێ وەردەگرێت بە دڵ لانەدات بە لای سووك و ئاساندا و پەنا نەبات بۆ روخسەت لە کاتی برسێتی زۆر و هاتنە بەرەوەی زەروورەتەکاندا، هەروەها پەیمانی لێ وەردەگرێت پشوو و پاڵدانەوە هەڵنەبژێرێت و هەست بە تەمبەڵی نەکات، چونکە وەستانی موورید لە ساردبوونەوەی خراپترە.

**جیاوازی نێوان ساردبوونەوە و وەستان ئەوەیە:** ساردبوونەوە پاشگەزبوونەوەیە لە ویست و دەرچوونە لێی، بەڵام وەستان خامۆشییە لە رۆیشتن بە حەڵاڵ کردنی حاڵەتەکانی تەمبەڵی.

هەر مووریدێك لە سەرەتای بەرەوخوداچوونییەوە ویستی بوەستێت هیچ شتێکی لێوە بەرهەم نایەت(هیچی لێ سەوز نابێت)

کاتێك شێخەکەی ئەزموونی کرد پێویستە لەسەری زیکرێك لە زیکرەکانی فێر بکات بەو پێیەی شێخەکەی دەیبینێت و پێی چاکە، فەرمانی پێ دەکات ئەو ناوە(ناوی خودا) بە زمان یاد بکات، پاشان فەرمانی پێ دەکات دڵی لەگەڵ زمانی لەو یادەدا هاوتا بکات، پێی دەڵێت: لەسەر ئەم زیکرە بەردەوام و خۆڕاگر بە وەك ئەوەی بەهەمیشەیی و بەدڵ لەگەڵ پەروەردگارت بیت، هەتا دەتوانی تەنها ئەو ناوە بەسەر زمانتدا جاری ببێت، پاشان فەرمانی پێ دەکات بە هەمیشەیی لە دەرەوەیدا لەسەر خاوێنی بێت(واتە لاشەی پاك بێت و دەستی بەدەستنوێژ بێت)، خەوتنەکەی زاڵبوونی خەو بێت بەسەر چاوەکانیدا و خواردن پلە بە پلە کەم بکاتەوە تا لەسەر ئەوە بەهێز دەبێت، فەرمانی پێ ناکات بە یەکجار واز لە عادەتەکانی بهێنێت، چونکە لە ریوایەتێکدا هاتووە: ((ئەو کەسەی زیاد لە توانای خۆی لە وڵاخەکەی دەنێت نە زەوی پێ دەبڕێت و نە پشتی وڵاخەکەی دەمێنێت))

پاشان فەرمانی پێ دەکات بە هەڵبژاردنی خەڵوەت و کەنارگیری، لەو حاڵەتەدا ئەوپەڕی هەوڵ دەدات خایلە و خوتوورەی ناخی خۆی و هەموو ئەو شتانەی دڵی سەرقاڵ دەکەن کۆتایی پێ بهێنێت.

**بزانە**، لەو بارەدا و لە سەرەتای بەرەو خوداچوونی موریدەوە زۆر کەم دەتوانێت خۆی لە وەسوەسەی بیر رزگار بکات، بەتایبەت گەر لە دڵی موریدەکەدا زیرەکی و هۆشمەندی بوونی هەبێت، زۆر کەم لە موریدان لە سەرەتای بەرەو خوداچوونیان لەم حاڵەتی وەسوەسەیە رزگاریان دەبێت.

ئەمە تەنها بۆ موریدانێکی دەگمەنە، بەڵام چارەسەری زۆرینەیان بەوە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ بەڵگە و تێڕامان لە ئایەتەکان بە مەرجی بەدەستهێنانی زانستی ئوسوڵ بە ئەندازەی پێویستی داواکراوی مورید.

**بزانە**، لەم دەروازەیەوە بۆ موریدانی تایبەت کۆمەڵێك بەڵا بوونیان هەیە، ئەوەش چونکە کاتێك تەنهادەکەونەوە لە شوێنی زیکرەکەیان یان لە کاتی مەجلیسی بیستندا یان لە بوارەکانی تردا نەفسی کۆمەڵێك خایلە و خوتوورەی لا دروست دەبێت و شتی ناپەسەند و خراپ دێت بە بیریدا، لەو بارەدا بەوە رزگاریان دەبێت بزانن خودا پاك و بێگەردە لە هەموو ئەوانە و هیچ گومانێکیان نییە لەوەی ئەو شتانە پووچ و بێبنەمان، بەڵام بەردەوامیش دەبن، و ئازاریان بەو حاڵەتە زیاد دەکات، تا دەگاتە رادەیەك دەبێتە دژوارترین جنێو و ناشیرینترین قسە و خراپترین خایلە، بە جۆرێك مورید ناتوانێ ئەوانە بەسەر زمانیدا گوزەر بکات و لای کەس بیدرکێنێت، ئەمە دژوارترین دۆخە تێیدەکەون و بۆیان دێتە پێش.

پێویست لەو کاتەدا ئەوەیە هیچ لاکردنەوەیەکیان بە لای ئەو خایلە و خوتوورانەدا نەبێت و بەردەوام بن لە یادی خودا و پاڕانەوە لەبەر خودا بۆ لادانی ئەو دۆخە ئەوان تێیکەوتوون.

ئەو خایلە و خوتوورانە لە وەسوەسەی شەیتانەوە نین، بەڵکو خایلەکانی دەروونن، گەر بەندە بە گوێ پێنەدانیان رووبەڕوویان بوویەوە ئەو حاڵەتە کۆتایی پێ دێت.

لە ئادابەکانی مورید بەڵکو لە فەرزەکانی حاڵی مورید پەیوەست بێت بە شوێنی خەڵوەتەوە، و دەست بە سەفەر نەکات تا رێگەکە وەرینەگرێت، هەر بەو جۆرە بەر لە

گەیشتنی دڵ بە پەروەردگار سەفەر دەست پێ ناکات، چونکە سەفەرکردن لە کاتێکدا کاتی خۆی نەبێت ژەهرێکی کوشندەیە، هیچ کام لەوانەی لە کاتی ناکاتدا سەفەریان دەست پێکردووە نەگەیشتوون بە مەرامی خۆیان.

گەر خودا خێری بوێت بۆ مورید لە سەرەتای دەستپێکردنەوە دامەزراوی دەکات، گەر شەڕ چارەنووسی مورید بێت دەیگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتووە لە پیشە و حاڵی پێشووی، گەر خودا میحنەتی بۆ موریدەکە دیاری کردبێت لە نامۆیی و سەرگەردانیدا وێڵی دەکات.

ئەمە گەر مورید شیاو بێت بە گەیشتن، گەر موریدەکە گەنج بوو ڕێگەکەی بریتییە لە خزمەت لە ئاشکرایدا بە هەژاران، ئەو لەسەر ئەم ڕێگەیە پلە و پایەی لە خوار ئەوانەوەیە، ئەو و نموونەکانی وەك ئەو لەسەر پابەندبوون بە ئاشکرا و دەرەوە رادەوەستن و ئەوپەڕی بەشیان لەسەر ئەم ڕێگەیە بەڵگە و نیشانەگەلێکە بەدەستی دەهێنن و سەردانی چەند شوێنێکە گەشتی بۆ دەکەن، و لیقای چەند شێخێکە بە ئاشکرای سەلام، ئەوان ئاشکرا و رووالەت دەبینن و ئەوەی لەم دەروازەدایە لە گەشت و گەڕان بەوەندە دەوەستن، ئەمانە پێویست بۆیان بەردەوامی سەفەرکردنە، تا پشوو و پاڵدانەوە سەریان پێ نەکێشێت بۆ هەستان بە قەدەغەکراوەکان، گەر مورید پشوو و پاڵدانەوەی بینییەوە ئەو کەسە لە شوێنی فیتنەدایە.

گەر مورید لە سەرەتاوە کەوتە ناو کۆمەڵی هەژاران و هاوەڵان ئەو کارە زیانی زۆری پێ دەگەیەنێت، گەر کەسێك بەو کارە تاقیکرایەوە با ڕێگەکەی بریتی بێت لە ڕێزی گەورەپیاوان و خزمەتی هاوەڵان و وازهێنان لە جیاوازی و سەرپێچی و هەستان بەوەی پشوو و ئارامی هەژاری تێدایە و کۆشان بۆ ئەوەی دڵی شێخەکەی لێ بێزار و نامۆ نەبێت.

پێویستە لە هاوەڵی کردنی لەگەڵ هەژاراندا بە هەمیشەیی نەیاری نەفسی خۆی بێت، نەبێتە سەرخەری نەفسی خۆی دژ بە ئەوان، پێیوابێت هەریەك لەوانە مافێکی پێویستیان لەسەر ئەو هەیە و پێی وانەبێت ئەو مافێکی لەسەر ئەوان هەیە.

پێویستە مورید سەرپێچی و جیاوازی لەگەڵ کەس نەبێت، گەر بیشزانێت خۆی لەسەر حەقە و حەق لەلای ئەوە با بێدەنگ بێت، هەمیشە تەبایی بۆ هەموان نیشان دەدات.

هەر موریدێك پێکەنین و تووڕەیی و موجادەلەی تێدا بێت هیچی لێوە بەرهەم نایەت.

گەر مورید لەناو دەستەیەك لە هەژاراندا بوو جا یان لە سەفەردا یان لە نیشتەجێبووندا پێویستە لە ئاشکرایدا جیاوازی و سەرپێچی لەگەڵ ئەوان نەبێت، نە لە خواردن و نە لە رۆژ و نە لە خامۆشی و نە لە جوولەدا، بەڵکو بە نهێنی و لە دڵیدا لەگەڵیان جیاواز دەبێت، لەگەڵ خودا(ﷻ) پارێزگاری لە دڵی دەکات، گەر ئاماژەیان پێکرد بە خواردن پاروویەك یان دوو پاروو دەخوات، حەزی دەروونی تێر ناکات.

زۆری ئەوراد لە ئاشکرادا لە ئادابی موریدان نییە، پیاوانی ئەم دەستەیە لە تەنهاییدا سەرقاڵی خۆ خاڵیکردنەوەن لە خایلە و خوتوورە، هەروەها خەریکی چارەسەر کردنی ئەخلاقی خۆیانن و بێئاگایی لە دڵیان دەردەکەن، نەك سەرقاڵبوون با کار و کردەوەی زۆرەوە، ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەن فەرزەکان و سوننەتی فەرزەکانە.

بەڵام زیادکردنی نوێژە سوننەتەکان بەردەوامبوونی یادی خودا بە دڵ تەواوتر و کاملترە بۆ ئەوان.

سەرمایەی هەموو موریدێك هەڵگرتنی ئازاری هەموو کەسێکە بە دروونێکی دڵاوە، هەروەها رووبەڕووبوونەوەی ئەوەی رووی لێ دەکات بە رازیبوونەوە و ئارامگرتن لەسەر زیان و هەژاری، و وازهێنان لە پرسیار و بەرهەڵستی لە کەم و زۆری ئەوەی بەشی ئەوە.

هەر کەس نەتوانێ لەسەر ئەوە ئارام بگرێت با بگەڕێتەوە بۆ بازاڕ، چونکە ئەو کەسەی حەز لە شتێك دەکات کە خەڵکی حەزی لێ دەکەن پێویستە لەسەری حەزەکەی بەدەست بهێنێت لەو رێگەوە خەڵکی بەدەستی دەهێنن، لە ماندووبوونی دەست و بازوو و ئارەقەی نێوچاوان.

گەر مورید پەیوەست بوو بە بەردەوامی زیکرەوە و خەڵوەتی هەڵبژارد گەر لە خەڵوەتەکەیدا شتێکی بینییەوە پێشتر نەیبینی بوو جا یان لە خەودا یاخود لە ئاگاهیدا یان لە نێوان خەو و ئاگاهیدا لە بیستنی گوتارێك یان بینینی مانایەك کە هەڵوەشێنەری عادەت بێت پێویستە هەرگیز بەوەوە خەریك نەبێت و پاڵنەدات بەلایەوە، و پێویستە چاوەڕوانی ئەوە نەکات هاوشێوەی ئەوەی بۆ دووبارە ببێتەوە، چونکە هەموو ئەوانە سەرقاڵبوونە لە حەق(ﷻ).

لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا پێویستە شێخەکەی ئاگادار بکاتەوە تاکو دڵی لەو بینینانە خاڵی ببێتەوە.

پێویستە لەسەر شێخەکەی نهێنییەکەی بشارێتەوە، و باسی نەکات بۆ کەسانی تر، و لەبەرچاوی ئەو شتانە بچووك بکاتەوە، چونکە هەموو ئەوانە تاقیکردنەوەن و پاڵدان بە لایانەوە فێڵ و فریوخواردنە، پێویستە مورید ئاگاهی لەوە هەبێت و سەرنجی لانەدا بە لایاندا و هەوڵ و لێبڕانی لەسەرو ئەو شتانەوە بێت.

بزانە زیانبەخشترین شت بۆ مورید هۆگربوونیەتی بەوەی بۆی هەڵدەدرێتە ناو نهێنی و پەنهانییەوە لە نزیکبوونەوەی حەق(ﷻ) بۆ ئەو، و منەتکردنی بەسەریدا بەوەی تایبەتم کردووی بەوە و لە هاوشانەکانی خۆت جیامکردوویەوە، گەر مورید واز لەوانە بهێنێت خودا(ﷻ) لە نزیکترین کاتدا دەرگای بەرینتری بەڕوودا دەکاتەوە و پەردەلادان لەسەر حەقیقەت بەڕوویدا والآ دەبێت.

باسی ئەم رستەیە(نزیکبوونەوەی حەق(ﷻ) لە مورید) و جێگیرکردن و سەلماندنی چەندین کتێبی پێویستە.

**لەو حوکمانەی پێویستە مورید پێیەوە پابەند بێت:** گەر کەسێکی نەبینییەوە لە دەوروبەری خۆی تاکو ئەدەبی دابدات پێویستە کۆچ بکات بۆ لای ئەو کەسەی لەو سەردەمەدا بۆ ئیرشاد کردنی موریدان دانراوە، پاشان لەلای بمێنێتەوە و دەرگای ماڵەکەی بەجێنەهێڵێت تا کاتی مۆڵەتدانی.

**بزانە**، پێشکەوتنی ناسینی خاوەن ماڵ بەسەر سەردانی ماڵەکەدا پێویستە، گەر ناسینی خاوەن ماڵ نەبوایە سەردانی ماڵەکە پێویست نەدەبوو، ئەوانەی دەچن بۆ حەج و پاشان زیارەتی ماڵی خودا دەکەن بەبێ مۆڵەت و ئاماژەی شێخەکانیان سەفەرەکەیان چالاکی و حەزی دەروونە و بەناو ناوی ئەم رێگەیان لە خۆیان ناوە، و سەفەرەکەیان لەسەر بنچینە و بناغەیەك نییە.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەو راستییە ئەوەیە هەتا سەفەری زیاتر بکەن شپرزی و پەرتەوازەیی دڵیان زیاتر دەبێت، گەر ئەوانە هەنگاوێك کۆچیان لە نەفسی خۆیان بکردبایە لە هەزار سەفەر بۆ ئەوان باشتر بوو.

هەروەها لە مەرجی سەفەر گەر سەردانی کەسێکی کرد بە ئەدەب و رێزەوە بچێتە لای و بە حەیا و شەرمەوە تەماشای بکات، گەر شێخەکە بۆ خزمەتێك ئەوی دیاری کرد ئەو کارە بە نیعمەتێکی گەورە بزانێت.

# بەشی سێیەم

## چەند باسێك لە مەشخەڵەکانی ڕێگە

### باسی یەکەم

**نابێت مورید باوەڕی وابێت عیسمەت بۆ گەورەپیاوان بوونی هەیە**، بەڵکو پێویست ئەوەیە بیانداتە دەست خۆیان و حاڵی خۆیان، بۆیە پێویستە گومانی باشیان پێ ببات و رادە و سنووری خۆی لەگەڵ خودا(ﷻ) بزانێت لەو کارانەی ئاراستەی دەکرێت، زانست بەسە بۆی لە جیاکردنەوەی ئەوەی پەسەندە و ئەوەی ناپەسەندە.

### باسی دووەم

**هەر موریدێك شتێك لە دونیا یان خایلەیەکی دونیا لە دڵیدا مابێت ناوی "ویست" بۆ ئەو مەجازە نەك حەقیقەت.**

گەر لە دڵیدا هەڵبژاردن بوونی هەبوو لەوەی لێی دێتە دەرەوە لە زانراوەکانی و بیەوێت تایبەت بێت بەجۆرێك لە جۆرەکانی کاری چاکە یان کەسێکی دیاریکراو ئەوا ئەو کەسە لە حاڵەکەیدا زۆرلەخۆکردنی تێدایە، ئەو کەسە بە خایلەکانی بەخێرایی دەگەڕێتەوە بۆ دونیا، چونکە مەبەستی موریدەکە لە سڕینەوەی پەیوەستبوونەکان هاتنەدەرەوە بووە لێیان نەك هەوڵدان بۆ کاری چاکە.

ناشیرینە بۆ مورید لە زانراوی سەرمایەکەی و بژێوییەکەی بێتە دەرەوە پاشان ببێتە بەندەی پیشەیەك.

پێویستە بوون و نەبوونی ئەوەی لەلا یەکسان بێت، تاکو لە پێناویدا لە هەژارێك دوورنەکەوێتەوە و کەسێکی پێ تەنگلان نەکات با کەسەکەش مەجووسی بێت.

## باسی سێیەم

**قبووڵکردنی دڵی گەورەپیاوان بۆ مورید راستگۆترین شاهیدە بۆ بەختەوەری ئەو،** هەر کەس دڵی گەورەپیاوێك لە گەورەپیاوان رەدی بکاتەوە گومانی تێدا نییە سەرئەنجامی ئەوە دەبینێت، با ماوەیەکیشی پێ بچێت، هەر کەس بە وازهێنان لە خزمەت کردنی گەورەپیاوان شەرمەزار بوو ئەوا نیشانەی بەدبەختی لێ بەدەرکەوتووە، ئەوەش هەڵەی تێدا نییە.

## باسی چوارەم

**سەختترین ئافەت لەسەر ئەم رێگەیە بریتییە لە هاوەڵی تازەپێگەیشتووان،** هەر کەس خودا بە یەکێك لەوانە تووشی کرد -بە کۆدەنگی پیاوان- بەندەیەکە خودا(ﷻ) سووك و شەرمەزاری کردووە، بەڵکو لە خۆی بەوانەوە خەریکی کردووە، با خاوەنی هەزاران هەزار کەرامەت بێت.

وا دابنێ گەیشتووەتە پلەی شوهەدا -لەبەر ئەو ریوایەتەی ئاماژەیەکی ئەوەی تێدایە- ئایا ئەو دڵە دروستکراوێك داگیری نەکردووە؟

**سەختتر لەمە:** سانایی ئەو کارەیە(واتە هاوەڵی تازەپێگەیشتووان) لەسەر دڵ تا بە کارێکی سووك و ئاسانی دابنێت، خودا(ﷻ) دەفەرمویێت:﴿وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ۝١٥﴾ النور: ١٥

**"الواسطي"(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** گەر خودا سووکی بەندەیەکی ویست دەیخاتە ناو ئەو بۆگەنی و لاکەتۆپیوانەوە.

**"فتح الموصلي" دەڵێت:** هاوەڵی سی گەورەپیاوم کرد لە ئەبدال سەرژمێر دەکران هەموویان لە کاتی جیابوونەوەدا وەسێتیان بۆ کردووم و پێیان وتم: خۆت لە تێکەڵی تازە پێگەیشتووان بپارێزە.

هەر کەس لە حاڵەتی هاوەڵی تازەپێگەیشتوان بەرزبوویەوە بۆ حاڵەتی فیسق و ئاماژەیدا بەوەی ئەو کارە لە تاقیکردنەوەی رۆحەکانە و زیان ناگەیەنێت، ئەوەش

لە وەسوەسەی قسەی هەندێ کەس دەکرێتە بەڵگە و گێڕانەوەی هەندێ بەسەرهات لە گەورەپیاوانەوە و ئەو نەنگی و ئافەتانەی لێیان دەوەشێتەوە، پێویستە ئەوانە پەردەیان بە سەردا بدەن، ئەو جۆرە کارانە هاوشێوەی هاوەڵدانان و هاوتای بێباوەڕین.

**با مورید خۆی لە دانیشتن لەگەڵ تازەپێگەیشتوان بپارێزێت** و تێکەڵیان نەبێت، چونکە کەمێك لەو کارە دەروازەی شەرمەزاری بە رووی کەسەکەدا دەکاتەوە و سەرەتای حاڵی کۆچکردنە، پەنا دەگرین بە خودا لە سەرئەنجامی خراپ.

## باسی پێنجەم

**لە ئافەتی مورید ئەو حەسوودییە شاراوەیە** بەرانبەر براکانی دەچێتە دەروونییەوە و کاریگەربوون بەوەی خودا(ﷻ) هاوتا و هاوشێوەکانی ئەوی پێ تایبەت دەکات لەسەر ئەم ڕێگەیە و ئەوی لێ بێبەش دەکات.

با بزانێت شتەکان ڕۆزی و بەشن، بەندە بە بوونی حەق(ﷻ) بۆ ئەو لە هەموو ئەو شتانە بێنیاز دەبێت و ئەوەی بەوانی بەخشیوە بەخشندەیی و نیعمەتەکانیەتی.

ئەی مورید، ئەوەی لە خەڵکی تر دەیبینی بەخشینەکانی خودا بووە بە پلە و پایەی، تۆ ببە بەو کەسەی لە خزمەتی خۆیدایە، چونکە نەجیبان لە گەیشتوانی ئەم ڕێگەیە بە خودا لەسەر ئەو ڕەوگەیە بەردەوام بوون.

## باسی شەشەم

**بزانە گەر مورید توانی پێشخستنی هەموو بەسەر هەموودا (پێشخستنی هەموو خەڵکی بە سەر هەموو ئەوەی ئەو لەلایەتی) بەدەستبهێنێت ئەوا برسی و تێر بەسەر خۆیدا پێشدەخات**، دەبێت بە قوتابی هەر کەسێك شێخایەتی لێ بەدەردەکەوێت، با بیشزانێ ئەو لەو کەسە زاناترە، ناشگاتە ئەو پلەیە تا لە هەموو هەوڵ و هێزێکی خۆی نەیەتە دەرەوە، گەیشتنی بەوە بە چاکە و منەتی خودا دەبێت.

## باسی حەوتەم

**ئادابـەکانی موریـد لـە بیسـتندا:** لـە بیسـتندا هـەرگیز موریـد بـە هەڵبژاردن(بـە ویسـتی خـۆی) جووڵـە و لـەرزین ناکـات، گـەر هـاتووی جووڵـە و بـزوان هاتـە سـەری و هێزی بەسـەریدا نەدەشـکا ئـەوا بـە ئەنـدازەی زاڵبـوونی ئـەو هـاتووە عـوزری بـۆ هەیـە، گــەر زاڵبوونەکــە لەســەری رەوایــە و پێویســتە دابنیشــێت و خــامۆش بێــت، گــەر جووڵەکــە بــەردەوام بــوو بــە چــێژی وەجــدەوە بــەبێ زاڵبــوون و زەروورەتــی جووڵــە بیسـتنەکەی دروسـت نییـە، گـەر دەقـی بـەو کـارەوە گرتبـوو ئـەوا بـە دواکـەوتووی دەمێنێتـەوە و شـتێك لـە حەقیقـەتی بـۆ دەرناکـەوێت، ئامـانجی حـاڵی ئـەو کەسـە لـەو کاتەدا خۆشیدانە بە دڵی خۆی.

**بە کورتی جووڵە لە هــەموو جووڵاوێـك وەردەگرێـت** و لـە حـاڵی کەمدەکاتـەوە، کەسەکە مورید بێت یان شێخ، مەگەر بە موژدەیەك لە کاتەوە بێت یان بە زاڵبوونێـك لە جیاکردنەوە دایبڕێت.

گـەر موریـدێك بـوو شـێخ ئامـاژەی پـێ دەکـرد بجووڵێـت ئـەوا لەسـەر ئاماژەکـەی ئـــەو دەجووڵێـــت خـــراپ نییـــە گـــەر شـــێخەکە لەوانـــە بـــوو حـــوکمی بەســـەر هاونموونەکانیدا هەبوو.

بەڵام گەر هەژاران ئاماژەیان پێکرد بە کۆمـەکی لـە جووڵـەدا ئـەوا بـۆ هەسـتانەوە یارمەتیان دەدا، لە هەستانیش بە جووڵە گەر ناچار بوو بە رەچاوکردنی پارێزگاری لـە دڵیان و دروست نەبوونی نامۆیی لە نێوانیان.

پاشـان راسـتگۆیی ئـەو لـە حاڵێـدا رێگـری دەکـات لـە دڵـی هـەژاران داوای یارمـەتی لێ بکەن.

**فڕێدانی خەرقەش(پۆشاکی دڕاو و پینەکراو):** مافی موریدە نەگەڕێتەوە بۆ شـتێك بە تەواوی لێی هاتووەتە دەرەوە، مەگەر شێخەکەی ئاماژە بکات بۆ گەڕانەوە سەری، لەو بارەدا بە دڵ وەك خواستنێك نییەتی لێ دەهێنێت، پاشان لێی دێتـە دەرەوە بـەبێ ئەوەی دڵی ئەو شێخە بڕەنجێنێت.

گــەر لــەناو دەســتەیەکدا بــوو عادەتیــان فڕێــدانی خەرقــە بــوو، و زانــی بــۆی دەگەڕێنــەوە، گــەر شــێخێك بــوونی نــەبێت حــەیا و حورمــەت لێــی پێویســت بێــت و ڕێگەی ئـەم موریـدە نەگەڕانـەوە بێـت بـۆ خەرقـە باشـترە بـۆی یارمـەتیان بـدات لەسـەر فڕێدانی، پاشـان شـایەر دەیکاتـە هـۆنراوە گـەر گەڕانـەوە بـۆی، گـەر فڕێـی نـەدەدا ئـەوا دروسـتە بـۆی گـەر زانـی عـادەتی ئـەو دەسـتەیە گەڕانەوەیـە بـۆی کاتێـك فڕێـی دەدەن، ناشـیرینی بریتییــە لــە ســونەتی گەڕانــەوەیان بــۆ خەرقــە نــەك لــە سەرپێچــی لێیــان لەســەر ئــەوەی لەپێشــتر فڕێدانــە لەســەر تــەبایی و پاشــان وازهێنــان لــە گەڕانــەوە بۆی.(بابـەتی خەرقـە(جلی کـۆن و پینـەدار) یـەکێك بـوو لـە سـیمای سـۆفییەکانی ئـەو سەردەمە، ئێستا ئەو دیاردەیە نەماوە و کۆتایی پێهاتووە)

مورید هەرگیز خۆی رادەستی شایەر[٨٧] ناکات و داوای دووبارەکردنەوەی لیّ ناکـات، چونکە راستگۆیی حاڵی شـایەرەکە هەڵـدەنێت بـۆ دووبارەکردنـەوە و کەسـانی تـریش هەڵدەنێت بۆ کرانەوە.(شایەر کەسێك بووە بە ئاوازەوە هۆنراوەی خوێندووە)

هەر کەس بە مریدێك خۆی فەڕدار بکات ستەمی لە موریدەکە کردووە چونکە لەبەر کەمی هێزی زیانی پیّ دەگەیەنێت، پێویستە لەسەر مورید هۆکارەکـانی خۆدەرخسـتن وازلێبهێنێت.

## باسی هەشتەم

**گەر موریدێك بە پلە و پایە موبتەلا بوو یان بـە زانراوێـك تووشـبوو یـان بـە هاوەڵی تازەپێگەیشتوویەك تاقیکرایەوە یان مەیلی ئافرەتێك رووی لیّ کـرد یـان خۆخەواندن لە زانراوێك، شێخێکیش نەبوو ڕێگەیەکی پـیّ نیشـان بـدات و لـەو کارانە رزگاری بێت لەو بارەدا سەفەر و گۆڕینی شوێنی بۆ حەڵاڵ دەبێت، بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتە لە نەفسی خۆی تێکبدات.**

هیچ شتێك بە ئەندازەی بەدەستهێنانی پلە و پایە بەر لە خامۆشـبوونی مرۆییبـوون زیان بە موریدان ناگەیەنێت.

---

[٨٧] {(شایەر کەسێکە هەندێ بەند و هۆنراوەی لەبەرە و بە ئاواز و دەنگەوە دەیانڵێتەوە)}.

**هەروەها لە ئادابەکانی مورید: ئەوەیە زانستی مورید پێش موجاهەدەی نەکەوێت،** ئەو کاتێك ژیانی پیاوانی ئەم دەستەیە فێردەبێت و هەوڵی وەستان دەدات لەسەر ناسینی بابەت و پرس و حاڵەکانیان بەر لە بەدەستهێنانی ئەو مانانە بە تێکۆشان و مامەڵە لەگەڵ نەفسی خۆی ئەوا خۆی رووبەرووی مەترسی کردووەتەوە، بۆیە **گەورەپیاوان دەڵێن:** گەر عاریف قسەی لە مەعاریف(زانراو) کرد و ئەوانیش نەیانزانی ئەوا پێویستە باسی تێکۆشانیان بۆ بکات نەك مەعریفە.

هەر کەس زانستەکەی زاڵ بوو بەسەر تێکۆشانەکەیدا ئەو کەسە خاوەنی زانستە نەك خاوەنی سلوك.

## باسی نۆیەم

**هەروەها لە ئادابی موریدان: خۆیان نەخەنە بەر خۆناساندن و سینگ دەرپەڕاندن و بەدەستهێنانی قوتابی و مورید،** چونکە گەر مورید بوو بە موراد بەر لە خامۆشبوونی مرۆییبوونی و بەربوونەوەی ئافەتەکانی ئەوا ئەو موریدە لە حەقیقەت بێبەشە، و ئاماژە و فێرکردنەکەی سوودی بۆ کەس نابێت.

## باسی دەیەم

**گەر مورید خزمەتی هەژارانی دەکرد ئەوا خایلە و خوتوورەی هەژاران پەیامنێری ئەوانن بۆ لای ئەو،** نابێت ئەوەی ناوەوەی مورید بڕیاری لێ دەدات لە خزمەتی پاك و چاك و بەخشینی تین و توانا سەرپێچی لێ بکات.

## باسی یازدەهەم

**گەر ڕێگەی مورید خزمەتی هەژاران بوو پێویستە ئارام بگرێت لەسەر جەفای ئەو دەستەیە بەرانبەر بە ئەو،** باوەڕی وابێت ئەو ڕۆحی لە پێناو خزمەتکردنیان دەبەخشێت، و پاشانیش لەسەر کارەکەی حەمدی ناکەن و ناوی چاکەی ناهێنن، لەو بارەدا داوای لێبوردنیان لێ دەکات بۆ کەموکورتی و کەمتەرخەمییەکانی و داندەنێت بە تاوانی نەفسی خۆیدا تاکو دڵیان بهێنێتەوە جێگەی خۆی.

گەر زانی ئەو جارِی پاکە و خراپەیەکی نییە و ئەوان جەفایان بەرانبەری زۆرتر دەبێت ئەوا پێویستە خزمەت و گەشتی زیاتر بکات.

**گوێم لە ئیمام ئەبوبەکری کورِی فۆرك بوو دەیوت:** گەر ئارام ناگریت لەسەر چەکوش بۆ خۆت کردووە بە سندان(ئەو دەزگایەی ئاسنی لەسەر دەکوتن).

## باسی دوازهەم

**بینای ئەم کارە لەسەر پارێزگارییە لە شەریعەت و دەستگرتنەوە لە حەرام و شوبهە و پارێزگاری هەستەکان لە قەدەغەکراوەکان و ژماردنی هەناسە لەگەڵ خودا بۆ دوورکەوتنەوە لە بێئاگایی،** دەنکە کونجییەك لە باری پێویستدا بۆ خۆی بە حەڵاڵ نابینێت ئیتر چۆن لە باری ئاسای و کاتی پشوودانداا دەستی بۆ دەبات؟

پێویستە مورید بە بەردەوامی لە تێکۆشاندا بێت و واز لە حەزەکانی بهێنێت، هەر کەس لەگەڵ حەزەکانی تەبابێت پاکێتییەکەی لەدەست دەدات.

ناشیرنترین سیفەت لە موریددا گەرِانەوەیە بۆ حەزێك لەبەر خودا(ﷻ) وازیلێهێنا بێت.

## باسی سیازدەهەم

**پێویستە مورید پەیمانەکانی لەگەڵ خودا(ﷻ) پارێزگاری لێ بکات،** چونکە پەیمانشکاندن لەسەر رێگەی ویست وەك پاشگەزبوونەوە وایە لە ئایین لای ئەهلی زاهیر.

نابێت مورید -هەتا دەتوانێت- پەیمانێك بە ویستی خۆی لەگەڵ خودا(ﷻ) ببیستێت، چونکە لە پابەند کردنەکانی شەرعدا هەموو بەرینییەك بوونی هەیە، خودا(ﷻ) دەربارەی سیفەتی دەستەیەك دەفەرموێت:﴿ **وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا** ﴾ الحديد: ٢٧

## باسی چواردەهەم

**هەروەها پێویستە مورید هیوا و ئاواتەکانی کورت بن**، کەسی هەژار ڕۆڵەی کاتی خۆیەتی(واتە ئەو کاتەی تیایدا دەژی، نەك بیرکردنەوە لە رابردوو و داهاتوو).

گەر تەگبیرێکی بۆ داهاتوو هەبوو و دەیویست سەرێك بکێشێتە ناو کاتێکەوە کە کاتی ئەو نییە و ئاواتێك بخوازێت بۆ داهاتوو ئەوا ئەو موریدە هیچی لێوە بەرهەم نایەت.

## باسی پازدەهەم

**هەروەها پێویستە مورید زانراوێکی(زانراو شتێکی مادی پشتی پێ دەبەستێت) نەبێت با کەمیش بێت بەتایبەت گەر لەناو هەژاراندا بێت**، چونکە تاریکی زانراوەکە نووری کات(ئێستا) دەکوژێنێتەوە.

## باسی شازدەهەم

**هەروەها لەسەر مورید پێویستە بەڵکو ڕێگەی سالیکانی ئەم مەزهەبەیە: واز لە قبوولکردنی بەخشین و نەرمونیانی ژنان بهێنێت**، ئیتر چۆن دەبێت هەوڵی ڕاکێشان و بەدەستهێنانی ئەوە بدات؟

لەسەر ئەمە گەورەپیاوانی ئەم ڕێگەیە ئامۆژگارییان پێشکەش کردووە و وەسێتەکانیان جێبەجێ کراوە.

هەر کەس ئەمە بە کەم ببینێت لە زووترین کاتدا تیایدا رسوا دەبێت.

## باسی حەڤدەهەم

**پێویستە مورید لە ڕۆڵەکانی دونیا خۆی بەدوور بگرێت**، هاوەڵی ئەوانە ژەهرێکی ئەزموون کراوە، چونکە ئەوان سوود لەم دەبینن و ئەم بەوان کەم دەکات، خودا(ﷻ) دەفەرموێت:﴿ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا ﴾ الكهف: ٢٨

زاهیدانماڵ لە کیسە دەردەهێنن وەك نزیکبوونەوە لە خودا(ﷻ)، ئەهلی سەفاش خەڵك و زانراو لە دڵ دەردەکەن وەك بێنیازبوون بە خوداوە(ﷻ).

## خاوەنی ئەم کتێبە ئیمامی قوشەیری( رەحمەتی خودلی لیٚ بیٚت ) دەڵێت:

ئەمە باسی دەستەیەك لە گەورەپیاوانی ئەهلی ئەم ڕێگەیە بوو.

مەبەست لە باسکردنیان ئەوە بوو نیشانی بدەین چەندە شەریعەتیان بەمەزن ڕاگرتووە و چۆن ڕێگەی نەفسڕاهێنانیان گرتۆتە بەر و شوێنی سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوتوون، خۆیان لە ئادابی نەفسنزمی بەدوورگرتووە، لەسەر ئەوە کۆدەنگیان هەیە هەر کەس لە مامەڵە و موجاهەدە خاڵی بێت و کارەکەی لەسەر وەرع و تەقوا بینا نەکردبێت ئەوا لەوەی بانگەشەی بۆ دەکات درۆی بەدەم خوداوە کردووە و تووشی فیتنە بووە و خۆی تیابردووە و ئەو کەسەش لا بەلای پووچییەکانی ئەودا دەکاتەوە خۆی تیابردووە.

گەر بە وردی شوێنی ئەوە بکەوین لەوانەوە گوازراوەتەوە و هاتووە لە قسە و گوزارەکانیان و ژیان و بەسەرهاتیان لەم کتێبەدا جێگەی نابێتەوە و تووشی شەکەتی دەبین، ئەم بڕەی باسمان کرد خوێنەر بێنیاز دەکات، کۆمەك و یارمەتی هەر لەلای خودایە.

بەڵام ئەو گەورەپیاوانەی ئێمە پێیان گەیشتووین و هاوچەرخیان بووین -با نەشمانتوانیبێت بە خزمەتیان بگەین- وەك: مامۆستای شەهید، زمانحاڵی ئەم کاتە و ناوازەی سەردەمی خۆی **"أبو علي الحسن بن علي الدقاق"**، هەروەها شێخ و تاقانەی کاتی خۆی **"أبو عبدالرحمن السلمي و أبو الحسن علي بن جهضم**(جیرانی مەککە) و **أبو العباس القصار**(لە تەبرستان) و **أحمد الأسود**(لە دەینوور) و **أبو القاسم الصيرفي**(لە نیساپوور) و **أبو سهل الخشاب الكبير** (لە نیساپوور) و **منصور ابن خلف المغربي و أبو سعيد الماليني و أبو طاهر الخوزندي"**(قدس الله أرواحهم)، گەر بە باسکردنیانەوە خەریکبین و بەدرێژی قسە لە ئەحواڵیان بکەین، ئەوا لە مەبەستی پوختە لەم کتێبەدا دەردەچین.

۞ ۞ ۞

# کۆتـایی

**مـامۆستا** قوشەیری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:

ئەمە وەسێتی ئێمەیە بۆ موریدان، داوا لە خودای بەخشندە دەکەین کۆمەکیمان بکات و نەبێت بە بەڵایەك بەسەرمانەوە.

لە سەرەتای چوارسەد و سی و هەشتی کۆچییەوە لە نووسینەوەی ئەم پەیامە بوومەوە، داوامە لە خودا نەبێت بە بەڵگە بەسەرمانەوە و بە خراپـە بۆمـان نەنووسـێت، بـەڵکو هۆکارێك بێت بۆ رزگاربوونمان، هەموو چاکەیەك لە خوداوەیـە و خـاوەنی لێبـووردن و لێخۆشبوونە.

**والحمد لله، وصلواته وبركاته ورحمته على رسوله سيدنا محمد النبي الأمي وآله الطاهرين، وصحبه الكرام المنتخبين وسلم تسليما كثيرا.**

❂ ❂ ❂

**شەوی هەینی ١٤/٤/٢٠١٦ لە وەرگێڕان و پێداچوونەوەی ئەم کتێبە بوومەوە، حەمد و سەنا بۆ خودای موتەعال و درووود و سەلامیش بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).**

**عبدالكريم فتاح.**
**سلێمانی**

# ناوەرۆك



## دەروازەی یەكەم

## زانستی یەكتاپەرستی ( ١٥ - ٣٢ )

# دەروازەی دووەم

## باسی پیاوانی ڕێگە و ژیان و قسەکانیان لە بەمەزنڕاگرتنی شەریعەت. ( ٣٣ - ١٣٦ )

# دەروازی سێیەم

## زاراوەکانی تەصەوف ( ١٣٧ - ٢٠٠ )

## دەروازەی چوارەم

## حاڵەکان و مەقامەکان ( ٢٠١ - ٥٨٠ )

# دەروازەی پێنجەم

## کەرامەتی ئەولیا ( ٥٨١ - ٦٣٨ )

# پوختەی

# (مدارج السالكين)

## بەكوردی

نووسینی

ابن قيم الجوزية

وەرگێڕانی

مامۆستا عبدالكريم فتاح

# کتێبی

# (الوابل الصیب)

## (لێزمە باران، و بالاَکەری وتەی جوان)

## بەکوردی

نووسینی

**ابن قیم الجوزیة**

وەرگێڕانی

**ماموّستا عبدالکریم فتاح**

# (شەرحی)

# (حیکمەتەکانی ئیبن عەتا)

نووسینی

مامۆستا عبدالکریم فتاح

# کەسایەتی نموونەیی و ناوازەی

# پێغەمبەری خوا

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

دانانی

عوسمان نووری توپباش

حەسەن حەمەکەریم

کردوویە بە کوردی

# (ئیمامی غەزالی)
# لەحەوت پەیامدا

- أيها الولد
- كيمياء السعادة
- حكمة في مخلوقات الله
- منهاج العارفين
- منقذ من الضلال
- قسطاس المستقيم
- فيصل التفرقة

وەرگێڕانی

مامۆستا عبدالكريم فتاح

# ( حارسی موحاسبی )

## له سێ کتێبدا

- اداب النفوس.
- رسالة المسترشدين.
- التوبة و احكامها.

وەرگێڕانی

مامۆستا عبدالكريم فتاح

# پوختەی

# جلاء الافهام

( في صلاة والسلام على خير الأنام )

## بەكوردی

نووسینی

**ابن قيم الجوزية**

وەرگێڕانی

**مامۆستا عبدالكريم فتاح**

